# لەهەواری
# یادەوەرییەکانمدا



بیرەوەری

حاجی مەمۆ

2013

ناوی کتێب: لە هەواری یادەوەرییەکانمدا
© نووسەر: حاجی مەمۆ
بابەت: یادەوەریی، ئەزموون و ڕەخنە
دیزاینی ناوەوە: ڕزگار شێخانی
ژمارەی سپاردن: ٢٢٧، ساڵی ٢٠١٣
چاپ: کوردستان

ناوەڕۆک

له پێشه‌وه ده‌مه‌وێ قامک له‌سه‌ر ئه‌و سێ خاڵه دابنێم.

1) من هه‌تا ده‌مرم مه‌ست و حه‌یرانی گیانی ئه‌و مرۆڤه به‌ده‌گمه‌نه‌ی به‌رۆکی جه‌سته‌ی (**ئارام**)م، که له‌ژێر ساباتی ئه‌ندێشه، کاریگه‌ریی که‌سایه‌تی بێنمونه‌ی ئه‌و، له پاییزی ساڵی ١٩٧٥دا، سه‌رله‌نوێ به‌گه‌ر کاروانی خه‌باتی کۆمه‌ڵه که‌وتمه‌وه. زۆرجاران زیاتر له نزیکه‌وه هه‌ڵسوکه‌وتم له‌گه‌ڵ کردووه و له بارودۆخێکی سه‌ر به گۆبه‌ند چاکتر ئاشنای بووم. له په‌نا به‌رخوردی ئانوساتی بوێرانه‌ی ئه‌و رۆژانه‌ی ئه‌و له ده‌می رۆژانی ته‌نگانه‌ی کۆمه‌ڵه‌دا. ئه‌و سه‌رخۆشی به‌رخۆدان، به‌رانگژبوونه‌وه‌ی زۆرداری و کۆڵنه‌دانی کردمه‌وه. بۆیه به ئه‌رکی سه‌رشانی خۆمی ده‌زانم، هه‌ر که‌سێک زێده‌ڕۆیی به‌رانبه‌ر ئه‌و که‌سایه‌تییه‌ی ناو کاروانی سیاسه‌تی کوردان، له‌وان رۆژانی سه‌ختی حوکمڕانی به‌عس، له ساڵی ١٩٧٥ دا بکات. به‌پێی ئاگاداری و به‌شداری خۆم بێمه وه‌ڵام.

2) من یه‌ک به خۆم به‌رانبه‌ر ئه‌وه دۆش داده‌مێنم و به‌خۆداچوونه‌وه و گومان، نیگه‌رانی و ئاوڕدانه‌وه له رابردوو، گه‌مارۆم ده‌دا و به‌رۆکم ده‌گری، که ده‌بینم خه‌ڵکی خاوه‌ن قوربانی و ماندووبوون، هه‌ر وه‌ک چۆن له به‌رانبه‌ر به هه‌ند وه‌رنه‌گرتن، رێز له خه‌بات و ئه‌زموونی رابردووی خۆیان، ته‌قه‌ی سه‌ریان دێت. دوور له گیانی ویژدانێکی زیندوو، به‌وپه‌ڕی بێمنه‌تی و ملهوڕانه رێز له قوربانیدان و فیداکاریی گیانبازانه‌ی هه‌تا هاوڕێیه‌کانیان له رۆژه سه‌خته‌کان ناگرن. له‌گه‌ڵ ناشیرینی کار و کرده‌وه پراکتیکییه‌کانی هه‌نوکه‌ییان، بێحورمه‌تی به‌رانبه‌ر سه‌روه‌رییه‌کانی رۆژانی دژواری تێکۆشانی، سه‌ربازه گومبووه‌کانی نموونه‌ی **ئارام** ده‌که‌ن.

3) له شانی نووسینه‌که‌مدا، چه‌ند پرسیارێکی خۆم و وه‌ڵامه‌کانی هاوڕێی سه‌ره‌تای کاروانی رۆژانی خه‌باتی **ئارام**، له ساڵی ١٩٧٥ - ١٩٧٦، **ته‌ها باراوی** له‌بیرکراو ده‌خه‌مه به‌رچاوتان. لێره‌یشه‌وه داوای لێبووردن له ناوبراو و هه‌موو خوێنه‌ران ده‌که‌م که هه‌م له نووسینه‌وه‌ی ده‌مه‌ته‌قێیه‌که‌ی ئه‌ودا (به‌بێ ئه‌وه‌ی هه‌تا ده‌ستکاری ئیملای نووسینه‌که‌ی بکه‌م) و هه‌میش له سه‌رجه‌می نووسینه‌که‌ی خۆمدا، له به‌کارهێنانی وشه‌کانی، کاک، و به‌رێز، جه‌ناب، هاوڕێ و هه‌ڤاڵ، خۆم لاداوه، به‌بێ ئه‌وه‌ی هیچ پاساوێک بهێنمه‌وه، چونکه وا ده‌زانم ستایلی نوسین به موجامه‌له‌ی به‌رهه‌مێزی وشه، شیرین نابێ.

**ئارام و هەندێ باسوخواسی ئێرە و ئەوێ**

بێگومان سەنگی مەحەکی هەر راستییەک، لە گێڕانەوەی هەر باسوخواسێکدا، بەتایبەت سەبارەت بەو ڕووداوانەی مرۆڤ سەروسەکوتێکی لەگەڵدا هەبووە، یاخود قسەکردن لەسەر مرۆڤ، کەسێکی بەژیان نەماو و شەهید.. بەڕای من لەپاڵ هەر بەڵگە و ئاگاداربوونێکی مەیدانی، لە بەرانبەر یادی ڕووداوەکانی ڕۆژانی بەسەرچوو، خۆ لە قەرەدانی کەراکتێری کەسایەتی **شاسوار جەلال** کارێکی وا ئاسان و بێ سەرئێشە نییە. گێڕانەوەکانم لەژێر ناوی یادەوەری شەخسی خۆمە، مایەی ئەوەم هەیە کە ڕای تایبەتی خۆم بێژم. بەڵام ئەگەر بەندە یەکلایەنە پرکێشی ئەوەم کردبێت کە گوایە مێژووی کۆمەڵە لە دروستبوونەوە تا هەڵوەشاندنەوەی دەنووسمەوە! ئەتۆ بڵێی مێژوو بەبێ بەڵگە و هەر جۆرە دیکۆمێنتێکی باوەڕپێکراوەوە بنووسرێتەوە! یاخود بە بیستن و خوێندنەوەی گێڕانەوەکانی ئێرە و ئەوێ، دواتر دەستکاریکردنیان بەپێی میزاج، دەبێ بە مێژوو لە قەڵەم بدرێ؟ ناوەڕۆکی نووسینی ڕۆشن و گەش، هەرگیز پشت بە گێڕانەوەی بەرسیبەری دەستی دووەم و سێیەم نابەستێت، بەتایبەت بەبێ ناوهێنانی سەرچاوەیان!

چیرۆکی دروستکردنی "کۆمەڵەی مارکسی- لینینی"ی کوردستان، لایەنی گەشەکردنی چەندایەتی و تەتەڵەکردنی چلۆنایەتی، بە سەروەری و نوشستییەکانییەوە، بۆ بارودۆخێک دەمانگێڕێتەوە، کە ئەو ڕێکخستنە بە نهێنی و لە دەروازەی خەباتی ژێرزەمینیی لە ناوخەڵکێکی (نەتەوەیەک)ی دەڵەمەی لێوانلێو لە دواکەتویی چەکەرەی کردووە. شیرازەی ڕێکخستنەکانی وەک تەونی جاڵجاڵۆکە لە بازنەیەکی تەسکوتریسکی بەرمەیدان بە گاگۆڵە کەوتووەتە سەرپێیان. ئەو ڕێکخستنەیش بە هەمان دەردی ئەوانەی ئەو زەمان و زەمینە، بە هەرجۆرە گەشەکردن و هەنگاونانێکی سروشتی و ئاسایی نەکەوتووەتە سەرپێیان. دەیان سەربازی گوم لەو کاروانە جێپەنجەیان بەسەر ئاراستەکانەوە هەبووە. بۆیە هەر هەوڵدانێک بۆ گێڕانەوەی ڕووداوەکان بە تاکە کەس تێری مێژوو نوسینەوە ناکات.

دیارە پێوەندیبوون بە کۆمەڵە و خەباتی ئەو زەمان ١٩٧٠-١٩٨٥، مایەی ناسینی کۆڵانە تاریک و قوڕاوییەکان بوو. گەورەترین جوامێری و چاونەترسی، بوێری ئەوێ ڕۆژگار بووە کە بەشێک لە کەسانی تاکوتەرای ناو شارەکان خۆیان لە قەرە داوە. ئەو بەدەنگهاتنی من لەسەر ئەو ناحەقییانەی بەرانبەر **ئارام** کراوە و دەکرێ، بە هیچ جۆرێک لەو هەست و نەستانەم کەم ناکاتەوە.

ئەوانەی لەوان ڕۆژاندا، لەگەڵ دروستبوون و سەرهەڵدانی سەرەتای کۆمەڵەی مارکسی _ لینینی بوونە لە کوردستانی باشوردا. هێشتا بە دەیانیان لە ژیاندا ماون، دڵنیام

لەگەڵ مندا، لە خوێندنەوەی یادەوەری ئەو ڕۆژانەدا، موچڕک بە گیانیاندا دەگوزەرێ. بەتایبەت ڕێکخستنێک لەوان ڕۆژاندا، لە ئەنجامی هەرجۆرە بەیەک هەڵشاخانێکی ئابووری، کۆمەڵایەتی، هەتا سیاسی و ئایدیۆلۆژی تەندروست، دروست و ئاسایی لە دایک نەبوبێت! کۆمەڵەیەک بە نهێنی، لە ئەنجامی کۆبوونەوەی دەستەیەک ڕۆشنبیری وردەبورژوای نەتەوەیەکی پچڕ پچڕی شپرزەی دواکەتوی ریزی حیزبێکی شکستخواردوی زەمان و زەمینی بەیانی یازدەی ئازاری ساڵی ١٩٧٠ی عیراقی بەردەستی بەعس هەڵتروکابێت. لەگەڵ ئەو بەرزەفڕیی ئەمڕۆکەی بەرسێبەری دەسەڵات، دەسکەوتی مشە، هەرگیز یەکنایەتەوە، دوا ئەنجامی چارەنووسی کۆمەڵە بۆخۆی وەڵامێکی هەر جۆرێکی ئەو خەیاڵپلاوییەن. نازانم لە چ چاوتروکانێکی سەرتاسەری باڵای کۆمەڵە، بەرپەرچدانەوەی بابەتی و خۆیی باری دژواری کۆمەڵی کوردی بووە لە کوردستاندا ؟ کوا ئەنجامی ئەو بەرپەرچدانەوە بابەتی و خۆییانە! وەک شاهیدێکی زیندوو کە ئەو ڕۆژانە بە بیر خۆم دەهێنمەوە، من لەگەڵ بەشێکی زۆری هەوراز و نشێوەکانی ئەو ڕێکخستنە هەژاوم. واتە ڕۆژانی دەستپێکی ئەڵقە ڕۆشنبیرییە سەرەتاییەکان لە سنوورێکی هێجگار سنووردراری ناو ئەو توخمە خوێندەوارە گەنجانەی ریزەکانی باڵی (م. س) ی هەڵوەشاوەی پارتی ئەوێ ڕۆژێ بوو. بگرە لە هیچ شارێکی گەورەی وەک سلێمانی، کەرکووک، هەولێر و خانەقین و هەتا بەغدادی پایتەختیش ژمارەی بەشداربووەکانی ناو ئەو ئەڵقە ڕۆشنبیرییانەی هەریەکەیان نەگەیشتوونەتە (٥٠) بەشداربوو.

خۆ بەسەرچیخبردن بۆ خودی مرۆڤ خۆی، لەلایەن کەسەوە بەری لێ ناگیرێت. لە هەر خوێندنەوەیەکی سەرلەبەری چیڕاوکەی کۆمەڵە هەتا دەمی سەرلەگۆڕنانیشی لەگەڵ ئەو دەستەواژەیەی (یەکەم ئەزموونی سەلماندنی بیری کوردستان) هەڵناکات. بەپێی گێڕانەوەی ڕۆژمێری کۆمەڵە، کەس ناتوانی خوێنەر لەگەڵ خۆی سەرچیخ ببات! بۆنموونەیش **برایم جەلال** وەک ئەوەی بەوە ئاگادار نەبێت کە لەگەڵ خۆی ناکۆک کەوتووتەوە، ئەو لەلایەک بە ئاشکرا نەیاری خۆی لەگەڵ بیرکردنەوەکانی کۆمەڵە لە سەردەستی **ئارام** و هاوڕێیەکانیدا لە ساڵی ١٩٧٥ ەوە تاکۆتایی ١٩٧٧، نەشاردووتەوە، کە گوایە **ئارام** هەڵگری بیری توندڕەوی کرێکاران و ڕەنجدەران بووە، ئەو بە پرۆلیتاریا ناوی بردووە، گوایە ئەو برادەرانە گەرەکیان بووە کۆمەڵە و شۆڕش، جڵەوی سەرکردایەتیکردنی بەدەست توخمە رابەرەکانی ئەم چینەوە بێت. دوو فاقبوونی ئەو مەزەندەیە (کۆمەڵە یەکەم ئەزموونی سەلماندنی بیری کوردستانی پێشکەوتووخوازی

موتوربەکراو بەبیروئایدیای کریکاران و رەنجدەران)ل/١٠ی کتێبی چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە، لەگەڵ سوچداردەرهێنانی **ئارام** و هاورێیەکانی لنگاوقووچ دەکەوێتەوە.

**لە خوێندنەوەیەکی هێمنانەی کتێبی (چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە) دا، لەنوسینی برایم جەلال سەبارەت بە ئارام، ئەو سەرنج وتێبینییانەی خۆم تۆمار دەکەم:**

من دڵنیام ئەگەر **برایم جەلال** تەنیا لە بەرگی یادەوەرییەکانی خۆیەوە، بە هەناسەیەکی هێمنانەی مرۆڤدۆستانە، خەبات و قوربانیدانەکانی خۆی، بنەماڵەکەی لە ریزەکانی کۆمەڵە و یەکێتیدا بنووسیبایەوە، دەیتوانی کەلێنێک لە مێژووی خانووە قوراوییەکەی کۆمەڵە بگرێ، چونکە لە هەموو حاڵەتێکدا کۆمەڵە وجوودی نەماوە و لە بەرچاوان رەشبووەتەوە، نەوەی نوێ بەو شەرەشەقەی بەرۆکی خەباتی رۆژە سەختەکانی مێژووی کۆمەڵە ناسیارنین و بەشێکیان خۆشیانی پێوە ماندوو ناکەن و ئەوەندە تامەزرۆی دەرکەوتنی ئەو راستییانە نین.

**برایم** وەک ئەوەی لە سەنگەری پێشەوەی داکۆکیکردن لە بۆدییە بەجێماوەکەی (نەماوی) کۆمەڵە بێت، بێبەزەییانە زیادەرۆیی بەرانبەر سەروەرییەکانی سیمبۆلە هەرە بەگیان زیندووەکەی رۆژانی لیقەومانی ١٩٧٥ – ١٩٧٧ ی کۆمەڵە دەکات.

لێرە بەدواوە لەگەڵ یەک بەیەکی ئەو پەرەگراف و دەستەواژانە دەکەومە قۆشمە، یەک بەیەکیان وورد دەکەمەوە و را و سەرنجی خۆمیان سەبارەت دەڵێم، کە **(ئارام)**ی نەمری پێ سوچدار کراوە!

**خاڵێکی گرنگ**

**(سەرکردایەتی کۆمەڵە مەگەر مەرجەکانی سەرکردایەتی لەدەسدا، یان لەبەندیخانە ئیعتراف بکات یان شەهید ببێ یان بەکۆبونەوەی ٣/٢ ی ئەندامانی بەشدار بن) ل/٢٧**

**برایم جەلال** لە لای خۆیەوە، خۆی بە داکۆکیکارێکی بێ ئەملاوئەولای سەرکردایەتی کۆنی (ئەو برادەرانەی زیندان) کۆمەڵەی پێش ١٩٧٥ دەردەخات، ئەو مەرجەی سەرەوەیشی لە هەمان کاتدا کردووەتە قەڵای پاراستن و سوچدارکردنیان. کە هەر بە خۆی لە زۆر شوێنی کتێبەکەیدا، هەندێکیان وەک سەرکردە و بنکردە بە معترف دەخوێنێتەوە، لە راستیشدا، هەر هەموویان ئیعترافیان بەلانی کەم لەسەر خۆیانەوە کردوە.

ئەگەر لەسەر هاوڕێیەکانیشیان نەکردبێت. کەچی بۆ لەدەستدانی مافی ئەندامێتی ئەوانە بەدوای بەربوونیان چاوی دەنوقێنن و مێش میوانی نییە. بەڵام بۆ (**ئارام**)ێک، هاوڕێیەکانی کە بە دەستپێشکەرییەکی بوێرانە، بەدەگمەنی ئەوێ ڕۆژێ، هوریێنە دەهۆنتەوە کە گوایە، **ئارام** و چەند هاوڕێیەک لەو ڕۆژانەدا مافی دەربازکردن و گرتنەوەی شیرازەکانی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەیان نەبووە، لەخۆرایی خۆیان بەسەر کۆمەڵەدا سەپاندووە! بەو بیانوە سەیرەی کە گوایە **ئارام** ئەو دەمە پێوەندییەکی بە کۆمەڵەوە نەبووە!

لە مەیدانی شەرعی ئەو کتێبەدا، لە چەندان شوێندا بانێکە و دوو هەوا. بە ختوخۆرایی دەستپێشکەری و ماندووبوونی **ئارام** لە ڕۆژگارێکی دژواردا مایە پوچ هەڵدەسەنگێنێ! خۆزگە لەسەر ئەو کەسەیش (**نەوشیروان**) کە خۆی لە یادەوەرییە چاپکراوەکانی نووسیویەتی، کە ئەو بۆ ماوەی چەندان ساڵ لە وڵاتی نەمسا پێوەنییەکی بە ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەوە نەبووە، دواتر کە لە بەرگی پێشمەرگە، لە پەراوێزی جاڕدانی شۆڕشی نوێدا، گەڕاوەتەوە کوردستان، لەگەڵ مەرگی (**ئارام**)دا، لە چاوترووکانێکدا دەبێتە سکرتێر و کاراکتێری ئەو کۆمەڵەیە، **برایم** لە سەرلەبەری کتێبەکەیدا، لەو بارەیەوە نوقەی لێ نایەت!

**برایم** بەم زۆرلەخۆکردنەی کە گوایە (**ئارام**) لە ساڵی ١٩٧٥ هیچ پێوەندییەکی بەکۆمەڵەوە نەمابوو. هەموو ویژدانێکی زیندووی ئازار داوە، چونکە هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە نەداوە لە هۆنینەوەی ئەو تۆمەتە بێ بناغەیەدا. من وەک شاهیدێکی زیندوو، بە ئاگاداری دوو لە ئەندامانی هەڵسوڕاوی ئەو دەمی کۆمەڵە، کە لە ژیاندان: **ئەرسەلان بایز و ئەنوەر شاکەلی**، کە ئەو دەم سەرپەرشتی ئەو هێڵی ڕێکخستنەی منیان دەکرد، لە ساڵی ١٩٧٤ _ ١٩٧٥. واتە لە ناوچەکانی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلوول (چۆمان، گەڵاڵە و حاجی ئۆمەران) ئەڵقەی پێوەندییەکی تاکە کەسی نەپساوەی ڕێکخراوەیی بەردەوامم بە **شاسوار جەلال** _ ەوە هەبووە کە زۆرتر بۆ پاراستنی ئەو هاوڕێیە بوو، چونکە ئەو زەمانە لە ئەمانەتی عدلییە و ئەوقاف بەرێوەبەری کاروباری ماڵی و ئیداری بوو، لە لایەن " **صالح یوسفی**"ی نەمر جێگای بایەخ بوو. هەر بۆ بەڵگەیەکی دیکەیش. لەو ڕۆژانەی هاوڕێیانی کۆمەڵە کە لە دەوروبەری بنکەکانی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلوول بوون، واتە ڕۆژانی دەمی ئاشبەتاڵی ١٩٧٥. هاوڕێیانی کۆمەڵە ( ئەوانەی لە شاخ بوون) لە سەروکاری خۆسازدان بووین تاکو بەرەو ناوچەی (ماوەت) بکەوینە ڕێ، بە مەبەستی درێژەپێدانی موقاوەمەت و تەسلیم نەبوونەوە بە ڕژێمی بەعس. هەر ئەو(**عەباس**)ە چووەتە لای **شاسوار جەلال** لە (بابەکراوە) و ئەو بڕیارەی لەگەڵ باس کردووە و ئەو پێشنیازەیشی پێ

ڕاگەیاندووە کە ئەو چەردە پارەیەی لە لایەتی تەسلیمی ئەو هاوڕێیانەی بکات کە بەرەو ناوچەی ماوەت دەچن. **شاسوار** بە پێکەنینەوە وەڵامی داوەتەوە و گوتوویەتی.. هەست و نەستم لەگەڵ ئێوەیە و تەنیا ڕێگای ڕاست و دروست هەر موقاوەمەتکردنە. من خۆم بە هۆی مشوورخواردنی خێزانەکەم، کە بڕیاری کۆمەڵە بوو، هەموو هاوڕێیە خێزاندارەکان لە پێشەوە مشووری خاووخێزانەکانیان بخۆن بۆ پەیداکردنی شوێنی ئەمینی داڵدەدانیان، پاشان بگەنە ناوچەی ماوەت. جارێ ناتوانم لە تەکتان بم، هەرچەندە دڵنیا نیم، ئەندامێکی سەرکردایەتی کۆمەڵە سەرپەرشتی ئەو کاروانەی ئێوە بکات کە بە پێ بۆ ئەوێ دەچن! هەر وایش بوو، کەسی سەرکردایەتیی کۆمەڵە لەگەڵ ئەو کاروانە نەهات و بە بیانوی مرومۆکردن بۆ پەیداکردنی هەواداری ئەم و ئەو بۆ موقاوەمەت، خۆیان بە سواری ماشێن گەیاندە ناوچەی پێنجوێن و لەوێیش هەر بڕیاری ئاشبەتاڵیان پەسند کرد و وەڵامیان بۆ ئەو هاوڕێیانەی بە هەزار دەردەسەری گەیشتبوونە ماوەت، ئەوانیش تەسلیم بونەوە. بۆ مەسەلەی پارەکەیش، **شاسواری** بیرگەش و بلیمەت، خاوەن پێشبینی دروست، گوتی: "من هەرگیز لە بەردەمی گەلەکەم، خۆم بۆ پارە ڕوو زەردی زەمان و داهاتوو و مێژوو ناکەم! با ئەوانەی پارەی لەو جۆرە لەلای خۆیانە، ئەوەی بەردەستی خۆیانتان بدەنێ!" دواتر زۆرتر لەوبارەوە دەدوێم.

ئێتر نازانم ئەو ( شەهید ئارامیش وەک هاوڕێکانی تری لە ڕیزەکانی کۆمەڵەدا نەما) یەی ل٣٣. ناو کتێبەکەی **برایم** بە بێ هیچ بەڵگەیەک لەکوێ هاتووە! چۆن جورئەتی ئەو هەڵبەستنەی کردووە! گەورە و بچووکی ئەوێ ڕۆژگاری هاوڕێیانی کۆمەڵە، خەڵکی بەئاگا و ئاگاداری ئەو ڕۆژگارە، هەموو بەو ڕاستییە ئاشنان. ئەگەر دەستپێشکەریی بەجەرگانەی **ئارام** و هاوڕێیەکانی نەبوایە، بەدوای بەجێهێشتنی دەواری شڕوشەقی کۆمەڵەی پاش ئاشبەتاڵ، لەلایەن بە کۆمەڵی سەرکردایەتییەکەی و چوون بۆ ئێران. کێ بون ئەو تێکۆشەرانەی کۆمەڵەیان لە دەمی هەڵوەشانەوە، تەفروتونابوون ڕزگار کرد، سەرلەنوێ گیانی ڕێکخراوەیی، موقاوەمەتییان بەبەردا کردەوە؟ **برایم** ڕەنگبێ هەر لە دڵی خۆیدا، بە خۆی گوتبێت، مادام چارەنووسی کۆمەڵە هەر نەمان بووە، ئەو برادەرانە نەدەبوو، ئاوا خۆیان ماندوو بکەن.!

**برایم جەلال** بۆ مەبەستی پەردەپۆشکردنی سوچبار و لەکەداردەرهێنانی **ئارام** و هاوڕێیەکانی لەوان ڕۆژاندا، لەسەر دەمی **خاڵە شەهاب** لە زیندانی "ئەبوغرێب"دا، خۆی باسی ئەوە دەکات کە **شاسوار جەلال و سالار عەزیز و مەلا بەختیار و ئازاد هەورامی،** ئەوانیش فرمانی گرتنیان لەلایەن دامودەزگاکانی ڕژێمەوە هەبووە. بەڵام دیارە ئەوان وڵات

و هاوڕێ و کۆمەڵەیان بۆ قەدەر بە جێ نەهێشتوە، چاونەترسانە بڕیاری شاندانە بەر سەرچڵی، دژوارییەکانی ئەو ڕۆژگارەیان داوە. من نازانم **برایم** تا چەند بەو ڕاستییە دەزانی کە **خاڵە شەهاب** و کۆمەڵە لەپاش ١٩٧٥ بۆ مەیسەرکردنی چوونەدەرەوەی سەرکردایەتی کۆنی کۆمەڵە بۆ شام، لەبەر دەمی تەنگەژەیەکی ڕێکخراوەیی ریزەکانی خوارەوەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەیش بوون، بەپێی عەقڵپێداشکانی خۆیان، بازنەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵەیان فراوانتر کردووە، کۆمیتەیەکی سەرکردایەتی (کۆمیتەی هەرێمەکان _ ئەستێرەی سوور) نوێیان بڕیار لێ داوە، کە **برایم جەلال** کەموزۆر باسی ناکات، کۆمیتەکە لەم برادەرانە پێکهاتبوو (**عەلی بچکۆل**/ کەرکووک، **عومەرسەید عەلی** و **ئاسۆ شێخ نوری**/ سلێمانی، **جەعفەر عەبدولواحید**/ هەولێر، **ئەنوەر زۆراب**/ بەغداد) کە **جەعفەر عەبدولواحید** بە لێپرسراوی کۆمیتەکە دانراوە و ئەویش **ئەرسەلان بایزی** لە شوێنەکەی خۆی کردووەتە لێپرسراوی هەولێر[1] و لەپاڵ **عەلی بچکۆل**، کە ڕێکخستنەکانی کەرکووکی تەسلیمی **ئازاد هەورامی** و **ئەبو شەهاب** کردووە. **ئاسۆی شێخ نوری**/یش هەر زوو بە هۆی گرفتی خزمایەتی لە سلێمانی گیراوە،بەلام **علی بچکۆل** و **عومەری سەیدعلی** بەرەو ئێران ڕۆیشتوون، بەدوای گیران و تەسلیمکردنەوەیان، لە زیندانی ئێرانی بە برادەرانی دیکەی گیراوی سەرکردایەتی کۆمەڵە گەیشتوون.

بە کورتی بەهۆی پەلەپڕوسکێی ئەو مەسئولانەی کۆمەڵە بۆ ئەوەی نەکەونە بەردەستی بەعس، زۆربەی ئەندامانی کۆمیتەی کۆن، (**شەهاب، فەرەیدوون، جەعفەر، ئاوات**) بێجگە لە **حەمەی سەعی مەلا عەباس** کە ئاگادار نەکردرابووەوە و هەرزوو گیراوە. بە دوو کاروان بەرەو ئێران ڕۆیشتوون. بە جۆرێک شپرێوی، پاشەگەردانی ڕێکخراوەیی، لەبەریەکترازانی شیرازەکانی ڕێکخستن سەرتاپای گیانی کۆمەڵەی گرتبووەوە. بەتایبەت دوای شەپرەلێدانی ڕێکخستنەکانی بەغداد، ئیعترافکردنەکان لەسەر یەکتری، تەشەنەکردنی بۆ ڕێکخستنەکانی سلێمانی، کەرکووک، هەولێر وخانەقین. کۆمەڵە توشی شۆک هاتووە و بێ سەر ماوەتەوە. بەداخەوە **برایم جەلال** خۆی لە قەرە نەداوە، دیزەبەدەرخۆنەکردنی ئەو ڕاستیانە، بەڵگەیەکی دیارن کە یاخود **برایم** پێیانەوە ناسیار نەبووە، گێڕانەوەکانی پشتی بە هەندێ زانیاری ئێرە و ئەوێی پچڕ پچڕی نادروست بەستووە، یاخود ئەوەتە بۆ مەبەستی نادیار بێدەنگەی لێ کردوە.

---

[1] پاشان کە ئەرسەلانیش بە مەسەلەی ئیعتراف لەسەرکردنەکەی خۆی زانیوەتەوە، عبدالرزاقی لە جێگای خۆی داناوە.

ئیتر **برایم** لەو پێودانگەدا، وەک ئەوەی هەنگی لە دارا دۆزیبێتەوە، یەکسەر لەبری هەڵسەنگاندنی کاری جوامێرانەی **شاسوار جەلال** و هاوڕێیەکانی بۆ گرتنەوە، هەڵستاندنەوەی کۆمەڵە، هاتووە یەکلایەنە و بێ بەڵگە، **ئارام** و هاوڕێیەکانی بە **هەڵگری** ڕەوتی (عیراقچی) ناوزەد کردووە! و نوسیویەتی:

(شاسوار جەلال ناسراو بە _ شەهید ئارام _ کەدوای ئاشبەتاڵ و گرتنی زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵە لە ١٩٧٥ دا، کۆمیتەی هەرێمەکانی دامەزراند. شەهید ئارامیش وەک هاوڕێکانی تری لەریزەکانی کۆمەڵەدا نەما، بەڵام گرتنی بەکۆمەڵی ئەندامانی سەرکردایەتی و سکرتێری کۆمەڵەی بەهەڵ زانی بۆ دروستکردنی کۆمیتەی هەرێمەکان و کۆکردنەوەی زۆربەی ئەندامە کۆنەکانی خاوەن ڕەوتی عراقچێتی لە ناویدا.)ل/٣٢

لە پێشەوە خوێندنەوەی ئەو دەستەواژە بێسەروبەرە و ناوەرۆک چروکە، هەموو ساختمانی فەنتازیای "**برایم جەلال**"ـە بە ئامانجی پلارگرتنە **ئارام** و هاوڕێیەکانی. کە هیچ بنەمایەکی بەرچاوی نییە تاکو خوێنەر قەناعەت بکات! و بەپێی ئەو توانجەی **برایم**، **ئارام** و هاوڕێیەکانی تاوانبارن لەوەی لەدوای کەوتنە زیندانی سەرکردایەتی ڕێکخستنەکە، وەک بەرزەکی بانان دەستیان بەخۆدا شۆڕنەکردووتەوە و بۆی دەرنەچوون، مەیدانبازی عیراقچێتییان کردووە!

**برایم** هەروەک چۆن بێبەڵگە، لەخۆڕایی شەڕی یەکێکی دیکە بە **ئارام** دەفرۆشێ، ئاواش هاتووە لەبری دوو برادەری بە ژیان زیندوو (**فوئاد قەرەداغی** ئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی _ ناوەند _ و **ئەشرەف شێخ شەرەف** ئەندامی کۆمیتەی سلێمانی لەساڵی ١٩٧٠) کە دوو ئەندامی ئەڵقەکانی سەرەتایی کۆمەڵەی (م. ل) بوون. سەبارەت بە بیرکردنەوە و هەڵویستیان، بەبێ هیچ سەرچاوەیەک لەبری ئەوانیشەوە قەزاوەت دەکات! هیوادارم خۆیان سەبارەت بەو زانیارییە قسەی خۆیان بکەن.

پەرتەوازەیی ڕێکخراوەیی بەرسێبەری سەرکردایەتییەکی سەرەتایی، ناسەقامگیری کۆمەڵە بەدوای کارەساتی ئاشبەتاڵی خەباتی چەکداری ساڵی ١٩٧٥. یەک وەرچەرخانی گەورە و نوێ بوو لە مێژووی ئەو ڕێکخراوە، کە پێویستی بە بەرێوەبەراتییەکی بەجورئەتی نوێی داهێنەر، لە نموونەی **ئارام** بوو، نەوەک هەر لە بواری ئایدیۆلۆژی (م. ل) کادرێکی داهێنەر بوو لە ریزەکانی کۆمەڵەدا، بگرە **شاسوار جەلال** بەو پراکتیکە بەرمەیدانیبوونە بوێرانەیەی، کە دەستپێشکەری کردووە لە گرتنەئەستۆی ئەرکی

بەڕێوەبردنی کۆمەڵە لە زەمەنی ئەزمەی ڕێکخراوەیی و فیکری و بەجێهێشتنی لەلایەن تەواوی سەرکردایەتییەکەی، بەڵگەیەکی ئاشکرایە بۆ ئەوەی **ئارام** بەم هەنگاوەی، ئەوەی ساغ کردەوە کە لە هەموو ئاسەوارێکی پاشخانی سیاسی، ئیتکالیەتی پشتبەستن بە سەرکردایەتی کلاسیک، حازربەدەست و ناوقوتی دەرەکی ڕزگاری ببوو. خاوەنی ئیرادەیەکی شۆڕشگێرانەی جەسوور بوو. بێگومان ئەو ئاراستەیە بە هەموو کەسێکی دیماگۆگ، خەوتوو لەسەر خەرمانی هەمبوو، قووت نادرێ. دەمێنێتەوە سەر ئەوەی **برایم جەلال** هەر لە ختوخۆرایی ئاراستەی عیراقچێتی بە مل (**ئارام**)دا هێناوە.

ئەگەر بە وورردی بە گوزارشتی ئەو زاراوە (بە هەڵە تێگەیشتوو و بە هەڵە لەشوێنی خۆیدا بە کار نەهاتوو) هێمنانە تاووتوێ بکردایە، تەنیا ئەو وتار و نووسینانەی بخوێندایەوە کە لەو بارەیەوە نووسراون، نەدەکەوتە ئەو هەڵەیەوە. من لێرەدا ڕاڤەی عیراقچێتی بۆ کەس ناکەم، تەنیا ئەوە دەڵێم، بوونە ئەندامی پەرلەمانی عیراق و خۆپێوەبادانی (بەدوای ٢٠٠٤ ـەوە لەلایەن **برایم جەلال**ەوە) ئەگەر بە چەند حۆقە تای تەرازوی عیراقچێتی (کە بەخۆرایی بەدوای دەیان ساڵ لە شەهیدبوونی لەلایەن **برایم جەلال**ـەوە بۆ **ئارام** هەڵدەبەسترێ) نەبوونی **ئارام** لە گۆڕەکەیشەوە نەباتە تاقی ئاسمانەوەو لەسەرەوەی هەمووانەوە نەشەکێتەوە! ئەوە هەر جۆرە ئیستیقامەیەکی ئەو کەسانە دەخاتە ژێر پرسیارەوە، کەسایەتییان لەنگ دەکات. چونکە ئەوە **ئارام** لە ڕووی سیاسی و ڕاستگۆیی بیروباوەرەکەی بە مارکسیزم _ لینینزم، بۆ ئەو ڕۆژە شرۆڤەی مەسەلەکانی کردووە و خەڵکانی بێسەواد درکیان بە جەوهەرەکەی نەکردووە.

من لە بواری ئەوەدا نیم، بە زیادیشی دەزانم بەدوای دەیان ساڵ لە ژیان نەمانی (**ئارام**) دا، لە جیاتی ئەو جۆری کوردستانی بوونی (موزایەدەکارانە) یاخود نەبوونی ڕاڤە بکەم. چونکە تەنیا زیندووکردنەوەی کۆمەڵە، سازدان و ناردنە شاخی مەفرەزە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە، وەک یەکەم چەخماخەی موقاوەمەتی شۆڕشگێرانەی خەڵکی کورد، بە ڕووی ڕژێمی داگیرکەری بەعس، ئەوجا دەرکردنی ئۆرگانی نوێی کۆمەڵە (ئاڵای شۆڕش) لە شاخ و بەزمانی کوردی، پێشکەشکردنی خوێن و گیانی خۆی بەو خاک و خەڵکە، گەواهی ناڕەوایی، پوچەڵبوونەوەی هەموو جۆرە گومان و بوختان بۆکردنێکە.

(**شاسوار جەلال کەپاشان بە شەهید "ئارام" ناسرا. لەبەر ئەوەی ڕەوتی کۆمەڵە لەگەڵ بۆچوونی ئەودا ناگونجێ.)ل/٤٦**

**برایم**. چ لەم دەستەواژەیە و چ لە ئەوەی پێشووتر دا، بە بەردێک دوو لە کەسایەتی جیاواز و دیارەکانی ڕەوتی کۆمەڵە دەکوتێ. واتە **شاسوار** و **نەوشیروان**. بەڵام بە

شێوەیەکی مەکرۆیانە وەک یەک لە قەپانیان نادات، بگرە پاساو بۆ وازهێنانی **نەوشیروان** لە کۆمەڵە و دوورکەتنەوەی دەهێنێتەوە، کە **نەوشیروان** خۆی راشکاوانە و بەوپەڕی بێمنەتی و بە جورئەتەوە لە کتێبی "لە کەناری دانوبەوە بۆ خری ناوزەنگ" باسی دەکات. بەڵام بۆ ئەوەی **شاسوار** کە هەرگیز نە وازی لە کۆمەڵە هێناوە و نە دووریش کەوتووتەوە و بە ژیانیش نەماوە، بوختانی ئەوەی بۆ هەڵبەستووە کە گوایە: (رەوتی کۆمەڵە لەگەڵ بۆچوونی ئەودا ناگونجێ)ل٤٦ لە کۆمەڵە نەمابوو. بەبێ ئەوەی زەحمەت بداتە بەر خۆی، لە ئاسمانە فەنتازیاوییەکەی بەڵگەیەکمان بۆ بهۆنێتەوە.

من دەپرسم، دەبێ **برایم** کامە رەوتی کۆمەڵەی مەبەست بێت؟ من بەوەش دەزانم **برایم** لە لای خۆیەوە رەوتی کوردستانی بوونی کردووەتە کراسەکەی عوسمان، نالوجیکییانە شەڕی (**ئارام**) ی نەمری پێ دەکات! ئەو خەڵکانەی لەوان رۆژانی بەر لە ساڵی ١٩٧٥ دا، لەگەڵ رێکخراوی کۆمەڵە هەژاون، هێشتا ژمارەکیان بە ژیان ماون، مەسەلەی کوردستانی بوونی کۆمەڵە لەساڵی ١٩٧٢ ەوە لە بەرنامەی کۆمەڵە تاووتوێ کراوە، ئەو برادەرانەی لەگەڵ بۆچوونی زاڵی ناوکۆمەڵە نەبوون بە رۆژی ئاشکرا پاشەکشەیان کردووە، لە کۆمەڵە کشاونەتەوە، بەڵام **برایم** بەزۆری زۆردارەکی بوختانی یەکلایەنی و بێبەڵگە لە ملی (**ئارام**)دەنێ. بەو تاوانبارکردنە بەدوای دەیان ساڵ لەژیاندانەمانی لە ناو دەواری کۆمەڵە شاربەدەری دەکات، بگرە ئەگەر بۆی بکرایە لە گۆڕەکەیش ئێسک و پرووسکی دەردەهێنا و فرمانی لەسێدارەدانی بۆ دەردەکرد!

بۆ ئاگاداری **برایم جەلال**، یەکەم رەوتی رەخنەگرانە لە کۆمەڵە لە دەمی ساڵی ١٩٧٥دا، بە ئاشکرا رەوتەکەی **ئیبراهیم خەلیل**[2] بوو، کە هەتا ناوی خۆیشیان بە (کۆمەڵەی رەنجبەران) ناوزەد کردبوو. **برایم جەلال** لە گێڕانەوەی سەربردەی ئەو برادەرانەیشدا، خوێنەر هەڵەتە دەکات، سەری لێ دەشێوێنێ. کە فڕی بەسەر دروستییەوە نییە، چونکە **برایم خەلیل** و هاوبیرەکانی لە بارودۆخی پاش ئاشبەتاڵ دا، تەنگەژەی رێکخراوەیی، ئایدیۆلۆژی ریزەکانی کۆمەڵەیان بە وجوودی **خاڵە شەهاب**، سەرکردایەتی کۆنی کۆمەڵە تەقاندبووەوە، ئەوەیش یەکێک لەو هۆکارە بنەڕەتییانەی، کە ئەو سەرکردایەتییە لەبری چارەسەرکردنی کێشە ناوخۆییەکان، بەیەکەوە دانیشتن بۆ پاراستنی شیرازەکانی رێکخستن، جڵەوی بەڕێوەبردنی کۆمەڵەیان (بەبیانوی خۆگەیاندنە شام) تەسلیم بە قەدەر کرد، سەری خۆشیان کردە قوربانی. کەچی (**ئارام**)ی خۆڕاگر، بە حەوسەڵەی

---

[2] ئیبراهیم خەلیل خۆی و چەندان برادەری لە بەرگی پێشمەرگەییدا لە ناوچەی هەڵەبجە لە هەڵمەتێکی هێزەکانی رژێم جوانەمەرگ کرا.

شۆڕشگێری بە پێچەوانەی خەملێندانەکانی **برایم جەلال** ، لەو دەرفەتی شالاوی ڕاوەدوونان، گرتنی بەردەستی بەعس سەرباری فەرمانی گرتنی، **ئارام** ئیلتزامی تەواوی بە کۆمەڵە و ڕێبازەکەی هەڵبژاردووە، لە کاتی لیقەومان وەفاداری خۆی بۆ کۆمەڵە ساغکردووەتەوە. بگرە یەکەم شتێک کە **ئارام** لە کۆمەڵەدا کردویەتی، ڕچەی ناوی زل و دێی ویرانی شکاندووە، ئەو ناوە درێژوکانییەی کۆمەڵەی بۆ کۆمەڵەی مارکسی لینینی کوردستانی عیراق کورت کردووەتەوە و کە لە سەرەتاوە بیروباوەڕی ماوتسی تۆنگی لەگەڵ تێهەڵکێش کرابوو. جورئەتی **ئارام** لەوەیشدا دەرکەوتوە، بۆ دەستپێکردنی قۆناغێکی نوێ لە ژیان و خەباتی کۆمەڵەدا، ڕاپۆرتی شوباتی نووسیوە، لە بەرگی هەڵسەنگاندن و بەخۆداچوونەوە، دیاریکردنی ڕاشکاوانەی ئەرکی چینایەتی و نیشتمانی کۆمەڵە لەو قۆناغەدا. بەلام بە بیرکردنەوەی ساغکراوە و سترکتوری نوێی ڕێکخراوەیی کە دیارە بەکەسانێکی هەڵگری زەخیرەی پڕ لە گۆشەگیری، پابەندەی کۆنینەی سەرکردایەتی لەمێژینە و خاوەن خەرمانی کەلەکەبووی خامۆشی و خەوشەکانی ئاراستە سەقەتەکانی کورد مایەی قبوڵکردن نەبووە.

خوێنەر کە لاپەرەی ٤٦ ی کتێبەکەی **برایم** بەشێنەیی دەخوێنێتەوە، بەدوای ئەو دەستەواژەیەی کە بە ناحەق هەوڵی لەکەدارکردنی کەسایەتی **ئارام** دەدات، بۆ نەگونجانی لەگەڵ ڕەوتی کۆمەڵە! یەک دەسرازە ڕستەو وشەی بێسەروبەری ڕیزکراو بەدوای یەکترییەوە دەبینێ کە تەنیا بۆ پڕکردنەوەی لاپەرەکەیە، هیچ پێوەندییەکی بە بابەتەکەوە نییە. لە جیهانی فەنتازیای **برایم جەلال** دا، هۆنینەوەی ناڕاست بۆ شەهید کەخۆی لە ژیاندا نەماوە، شتێکی زۆر ڕەواو ئاساییە. هەروەک نوسیویەتی:

> **(شەهید ئازادعبدولمەجید _ ئازاد هەورامی _ بێ ئەوەی ئاگاداری کۆمیتەی شارەکان بکا، خۆی ونکردوتەنانەت شوێنی حەشارگەکەی خۆی لای کەسمان ئاشکرا نەکردبوو، تاشالاوی گرتن دامرکایەوە، ئەوسا زانیمان کەلەشاری کۆیە لای خوالێخۆشبووی برای خۆیَ حەشاردراوە کەناوی مامۆستا -هۆشمەند- بوو،شەهید ئازادنەگەڕایەوە بۆکۆمیتەی شارەکان ، پاشان لەمانگی ١_ ١٩٧٦ شەهید ئارام _ شاسوار جەلال _ پێوەندی پێوەکردبوو، قایلی کردبوو، کەلە کۆمیتەی هەرێمەکان کار بکات.)ل/٧٦**

نازانم **برایم** چ بەڵگەیەکی هەتا بۆ قەناعەت پێکردنی خۆی دۆزیوەتەوە، بە خوێنەری ناڵێت! چونکە ئەو برادەرانە **(ئارام و ئازاد هەورامی)** هەردووکیان بەژیان نەماون. ئەوەش

لەنزیکەوە پێیان ئاشنا بوبێت، پێ لەسەر ئەوەدادەگرێت کە پێوەندی دۆستایەتی، هاورێیەتی ئەو دووانە بۆ هاوخەباتیان لە یەکێتی قوتابیانی کوردستان و لاوان گەڕاوەتەوە، لەدوای ساڵی ١٩٧٥ یشەوە، لەشاروشاخدا هاورێ و هاوسەنگەری گیانی بەگیانی یەکتر بوونە.

(بۆیە کۆمیتەی شارەکان بۆ جاری دووەم لە _ عبدالرزاق لە هەولێر، ئەحمەد کرێکار و حەمید شورتە لە کەرکوک، ئیحسان نەجم و بەندە لە سلێمانی _ پێکهات)ل/٧٦

سەبارەت بەوەیش کە خۆی لەلایەن خۆیەوە کردووەتە پێشقاولی کۆمیتەیەکی دەستکرد بە ناوی (کۆمیتەی شارەکان) کە رەنگبێ لێی تێکچووبێت کە زیاتر (کۆمیتەی ئاگر) ی ناو شاری کەرکوک بێت، چونکە ئەو ناوانەی ریزی کردوون بە خۆیشییەوە، هەموویان سەر بە رێکخستنی ناوچەکانی کەرکووکن، تاکە یەک برادەری شاری سلێمانی، هەولێر، بەغداد و خانەقین بە خۆوە نەگرتووە، ئەوە کۆمیتەی هەموو شارەکانی کوردستان نەبووە، بەڵکو (کۆمیتەی هەڵمەت) بووە و بەشێکی ئەندامەکانی بە ژیان ماون لە نموونەی (**سالار و برایم موسەور و دلێر سەرسپی**.) _ **عەباس مەحەمەدیش** ناراستەوخۆ سەرەتا لە رێگای **عەزیز مەحمود و جەماڵەڕەش** پێوەندی پێیانەوە هەبووە بۆ ئەو هێڵەی خۆیان (جیا لە کۆمیتەی رەسمیی شاری هەولێر) لە ناوچەکانی هەولێر و بادینان و بەغداد کە راستەوخۆ لەلایەن **ئارام** سەرپەرشتی دەکران و هەرگیز **برایم جەلال** ناوی (کۆمیتەی هەڵمەت) ی نەهێناوە، چونکە خۆی پێی ناسیار نەبووە، ئەو کۆمیتەیەی هەڵمەت بوو لە ١٩٧٨ ـەوە بنیادی سەرکردایەتی ناوخۆی کۆمەڵە وُ راستەوخۆ سەرپەرشتی تێکرای رێکخستنەکانی ناوەوەی کردووە، بەو پێیەی بەندەش وەک نوێنەری رێکخستنەکانی هەولێر و بادینان تێیدا بەشدار بووم، هەرگیز لە کۆن و نوێ ناوی لەو جۆرەی (کۆمیتەی شارەکان) م نەبیستووە، **هەتا ئەحمەد کرێکاریش** کە **برایم جەلال** ناوی هێناوە لەو کۆمیتەیەی خۆی، ئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی ناوخۆ وەک نوێنەری کەرکوک و بەرپرسیاری کۆمیتەی ئاگر بوو، هەرگیز رۆژێک لە رۆژان باسی لەو کۆمیتەیە نەکردووە، تەنیا جارێک **حەمە** چاوشین، یادی بەخێر کە ئەودەم بەرپرسی کۆمیتەی سەرکردایەتی ناوخۆ بوو لەکۆتایی ١٩٧٨، بە بیرم دێتەوە لە ماڵەکەی خۆیدا لە گەرەکی شەکرەکەی شاری سلێمانی، راپۆرتێکی پیشاندام کە **برایم جەلال** لە شاخەوە لەسەرناوەندی کۆمەڵەی نووسیبوو، بۆی باس کردم و لەو رۆژەوە بەو ناوە ناسیار بووم.

**برایم جەلال** بەبێ ئەوەی ئاگای لەوەبێت لە قسەکانی خۆی لە گێڕانەوەکانیدا، تووشی ناڕاست دەرهێنانی خۆی هاتووە! لەلایەک بەبێ هیچ بەڵگە و سەرچاوەیەک بۆ ئەو گێڕانەوەیە، بە زانیارییەکی دروستکراو ئەو بوختانەی داڕشتوە و نووسیویەتی: (شاسوار جەلال _ شەهید ئارام _ کە فەراشەکەی خۆی زمانی لێدابوو.)ل/٧٨

بەبێ ئەوەی هیچ ڕوونکردنەوەیەک و بەدوواچوونێک بەسەر ئەو گێڕانەوە سەقەتە بدات، بلەز بەسەریدا بازدەدا و پێمان ناڵی ئەو فەڕاشە نەگبەتەی، کە **برایم** لەخۆرایی ئەو تاوانە گەورەیەی بۆ هۆنیوەتەوە، ئەندامی کۆمەڵە بووە، یاخود لەسەر گزی و گەندەڵی و عەگال لەسەرنەکردن، زمانی لە **شاسوار جەلال** داوە! کەچی دواتر بەبێ ئەوەی ئاگای لەوە بێت، ئەو گێڕانەوەی شەرمەزار دەکا و لەسەرزاری **خاڵە شەهاب** نووسیویەتی: **شاسوار جەلال** فرمانی گرتنی هەبووە و بەعسییەکان پێیان زانیوە کە یەکێکە لە هاوڕێیە ئەساسییەکانی کۆمەڵە و ئیعترافی لەسەر کراوە. دواتریش لەو بابەتە دەدوێم.

(بەلێنم پێدا کەخۆی و شاسوار جەلال پاش هەفتەیەک لە سلێمانی دەرکەین.)ل/٧٨

خوێنەر کە ئەم ڕستەیە دەخوێنێتەوە، بەتایبەت ئەوانەی بە بارودۆخی ئەوی ڕۆژێی ١٩٧٥ بەدواوە ناسیارنین، بەو ڕوداوانە شارەزاییەکیان نییە، بە ئاسانی بەو بەرزە فرییەی **برایم جەلال** لەوە دەگەن، کە خۆی لەو ڕۆژەدا مەسئولی سازدانەوەی شیرازە پچڕپچڕبووەکانی کۆمەڵە بووە، توانایەکی ئەوەندە فراوانی هەبووە کە هەتا **شاسوار جەلال** هانای بۆ هێناوە کە لەگەڵ **سالار عەزیز** ڕەوانەی شاخ _ یان بکات، وەک ئەوەی خۆیان ئەوەندە دەمچەفت بوو بن، لە ناو شاری سلێمانی گیریان خواردبێت! بەڵام **برایم** بەخت یاری نەبووە لەوەی خۆیشی بکاتە خاوەن و پەیداکەری وەکرێکی خۆشاردنەوەی چەندان لەو برادەرانەی کۆمەڵە کە لە ڕاوەدوونان، مەترسی گرتن لە ناو شاری سلێمانی خۆیان شاردبووەوە، دەبوو فەنتازیایەکی لەمجۆرەیش بهۆنێتەوە! چونکە ئەوە هەر خۆی بووە لە ڕێگای **تەها باراوی** فرسەتی بۆ خولقاوە بە نهێنی **ئارام** ببینێ.[3]

**شاسوار جەلال** ئەو ڕۆژە نەوەک هەر لە ناو شاری سلێمانی دەیان هاوڕێی ئانوساتە تەنگانەکانی ناو ریزەکانی کۆمەڵەی بە دەوروبەر کۆببوەوە، بەڵکو لە سەرتاپای شارەکانی دیکەیش بە چەندان خەت و ختوت پێوەندی ڕێکخراوەییان پێ بەستبوو. دیارە هەموو ئەو

---

[3] دەقی دیدەنی لەگەڵ تەها باراوی لە پاشکۆی ئەو نووسینەدا بڵاو کراوەتەوە.

وەختەیش کە لە ناو شاری سلێمانیدا مابووەوە[4] **ئارام** بوو شەووڕۆژی بەسەر یەکەوە نابوو بۆ ڕاپەڕاندنی ئەرکە قورس و زۆروزەبەندەکان، کە لە زۆر لاوە برادەران هاوکار و دەستباری بوون.[5] دواتر ئەگەر **برایم** ئەوەندە سوورە لەسەر کۆمیتەیەی شارەکان و گوایە شیرازەکانی ڕێکخستنی بە دەوروبەرەوە بووە بۆ باسی تاکە یەک لەو برادەرانە ناگێڕێتەوە کە لەوان ڕۆژاندا، بە موختەفی لە ناو شاری سلێمانی دەژیان، ئەو کۆمیتەیە وەکرێکی بۆ پەیدا کردوون، بۆ خۆی جارێک لەو کۆبونەوانەی لەگەڵ **شاسوار** و برادەرەکانی دیکە وەک خۆی باسی دەکات! لەسەر سفرەی خۆی کۆی نەکردوونەتەوە! هەمیشە هەر بە خۆی، وەک خۆی دەیگێڕێتەوە، چووەتە سەر سفرەی ئەوانەوە! چونکە لەو ڕۆژەدا هەموو دۆست و هاوڕێیانی کۆمەڵە هەتا ئاشکرا نەببون _ لەپێشەوە ماڵەکەی خۆیان بۆ ئەو برادەرە موختەفییانە کردبووە وەکو لە نموونەی مامۆستا **عزیز، جمالەڕەش، ئاوات قارەمانی، تەها باراوی، دلێری سەید مەجید، لەتیفی شێخ عمر.. هتد.** ئیتر بۆ دەبێ هەڵسوڕاوێکی وەک **برایم جەلال** لە دووتوێی کۆمیتەی شارەکان بەخت یاری نەبوبێت، لەو ژیانی مەرگەساتەی ئیختفای هاوڕێیان، پشکێکی بەر نەکەوتبێت!

لە لاپەڕە ٨٠-٨١ ی کتێبی **چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە** دا، چەندان جاری بەدوای یەکترییەوە، سرکردنی **سالار عەزیز** و نەمانی **شاسوار جەلال** لە کۆمەڵە دووبارە و دووبارە کراوەتەوە، وەک ئەوەی **برایم** بیەوێ ناراستبوونی ئەو گێڕانەوەیە بۆ خوێنەر بەم چەندبارەکردنەوە ساغ بکاتەوە! (لەو کاتەدا لەکۆمەڵە سرکرابوو، مەقاڵەکەشی شاسوار لە ریزەکانی کۆمەڵە نەمابوو.)ل/٨٠

لێدانەوەی قەوانی سرکردنی **سالار**، نەمانی **شاسوار** لە کۆمەڵەدا، بەبێ بەدەستەوە بوونی هەر بەڵگە و نیشانەیەک، ئەگەر بۆ ترشوخوێکردنی گێڕانەوە بێسەروبەرەکەی نەبێت، بۆ ئەوەیە کە دەمراستبوونی خۆی لە کۆمەڵە دەربخات، هەروەک چۆن ئێستا لەناو دووبەرگی کتێبەکەیدا، دوای دەیان ساڵ بەسەرچوون، نەمانی کۆمەڵە، بە هەڕەشەوە نووسیویەتی:

---

[4] ئەگەر برایم بە بەرچاوییەکی ڕوونەوە کتێبەکەی شێخ مەحەمەد سولەیی (ئارام و سەرروەرییەکانی) بخوێندایەوە، نەدەکەوتە ئەو سنگ دەرپەڕاندنە بەخۆڕاییە.

[5] من نامەوێ ناوی هەموو ئەوانە بنووسمەوە کە لەو دوو بەرگە کتێبەی ناوم هێناوە بەیان کراوە. _ خوێنەر بۆی هەیە بپرسێ، بۆ لە یەک لەو شوێنانە ناوی برایم جەلال نابینرێ کە ئەو کات بە ئازادی لە شار سوڕاوەتەوە، ئەو دەمە لە هەموو ئەو بینەوبەردانە مێش میوانی نەبووە!

(هەرگیز بۆ نەجمەدین و هەم شاسوار و کەسی تریش نیە، لەخۆیانەوە و بەبڕیارێکی سەرپێی خۆیان، خۆیان بکەنە سەرکردایەتی ڕێکخستنی کۆمەڵە)ل/٨٠

هەڕەشەکەی ناو کتێبەکە[6] لە لایەن **برایم جەلالەوە**، وەک تاوانێکی چاولێنەپۆشراو تۆمەتی ئەوەی داونەتە پاڵ کە دەڵێ:

(چونکە بەهیچ جۆرێ ئەو شەرعیەتەیان نیە، ویێشم ڕاگەیاندن کە ئەو کارەی ئەوان، جگە لە پیلانێکی تێکدەرانەی ڕیزەکانی کۆمەڵە، هیچی تر نیە)ل/٨٠

بەڵێ گێڕانەوەکان هەر لە زڕەخەون دەکات، کە بۆ خۆی دەمراست و کەس نازانێ چارەنووسی کۆمیتەی شارەکان بە قودرەتی چ دەسەلاتێک هەڵترووکاوە، دوایی چی لە شوێن شین بووە! کەچی ئەوپلانەی **شاسوار** و هاوڕێیەکانیشی، کەوتنەوە سەرپێیانی کۆمەڵەی لێ کەوتووتەوە.
بێگومان ئەگەر **برایم** وەک مرۆڤێکی ویژدان زیندوو، پەرێزی یادەوەرییەکانی ئاوا بەپەرش و بڵاوی نەگێڕایەوە، لەبری تۆمەت درووستکردن بۆ **ئارام**، لەپاڵ دەستپێشکەری **شاسوار** و هاوڕێیەکانی بۆ سازدانەوەی کۆمەڵە، ئەویش بە هێمنی و شێنەیی دەستپێشکەرییەکانی خۆی لەبری ئەو (کۆمیتەی شارەکان) بە ووردی بۆ خوێنەر بگێڕایەوە _ ئەگەر شتێکی لەو جۆرە لە مەیداندا وجوودی هەبوە_ بەدڵنیایەوە ئاوا تەنگەتاو نەدەبوو، خزمەتێکی بە نووسینەوەی ئەو مێژووە دەکرد. چونکە هەم **شاسوار** و هاوڕێیەکانی، هەتا **برایم جەلال**یش لەوێ ڕۆژگاری بەسەرچوودا، ئەرکێکی گران و پڕ لە شۆڕشگێرییان کەوتبووە ئەستۆ لە فریاکەوتنی شاندانە ڕاستکردنەوەی کۆستی کۆمەڵە، کە هەر وەک خۆی _ **برایم** _ نوسیویەتی:

(پاش ڕۆیشتنی زۆربەی ئەندامانی سەرکردایەتی بۆ ئێران و گیرانی زۆربەی ئەندامە پێشکەوتووەکانی کۆمەڵە/.../ ڕاستە چەند هێلێکی ڕێکخستنی کۆمەڵە بەهۆی گرتنی لێپرسراوەکانیانەوە تێکچوون/.../کە بەهەڵە دەزانن سەرکردایەتی وولاتیان بەجێ هێشتووە و شاڵاوی گرتنیش بەردەوامە..)ل/٨٠

---

[6] ئەوە تەها باراوی وەک شاهیدێکی زیندووی ئەو دیدەنییەی برایم جەلال لەتەک شاسوار دا، دەیگێڕتەوە کە هەرگیز برایم لە بەرانبەر شاسوار جەلالدا، لەو جۆرە قسانەی بەسەرزاردا نەهاتووە.

دیسانەوە **برایم** زۆر بە نیوەناچلی، هەر تەنیا بۆئەوەی **ئارام** و هاوڕێیەکانی بە ناراست پشتراست بکاتەوە، وێنەیەکی ناتەواوی ئەوێ ڕۆژێی ڕێکخستنەکان وێنەدەگرێ! لەلایەک دەلێ، کە گوایە تەنیا چەند هێلێکی ڕێکخستن، لێپرسراوەکانیان گیراون، لەو لایشەوە دان بەرۆیشتنی سەرکردایەتی کۆمەلە، بەردەوامی شالاوی گرتن دەنێ.

**ئارام** و هاورێیەکانی دوور لە تۆمەتەکانی **برایم جەلال**، لەودەمەی کۆمەلە سەرتاپای لە ئەزمەدا بوو، ئەزمەی نەمانی سەرکردایەتییەکەی، کێشەی ڕێکخراوەیی و ئایدیۆلۆژی[7] و شالاوی گرتن بە هۆی ئیعترافە زنجیرەییەکانی بەشێکی ئەندامە گیراوەکان، ئەو چەپکە هاوڕێیەی ڕۆژی تەنگانەی کۆمەلە بەرابەری **شاسوار**، وەک هەر ئەندامێکی دلسۆز، سەربلند و مولتەزیم بە ڕێبازی کۆمەلە، سەرباری فرمانی گرتن و ڕاوەدوونان، لەپێناوی کۆمەلەدا، ژیانی ئیختفایان هەلبژاردووە، بە ئەرکی مێژوویی خۆیان ڕابوون و کۆمەلەیان لە سەرەمەرگ قوتار کرد. دەبوو برایم ئەگەر شاباشیشی نەدەکردن، ئاوا بێمنەتانە سووکایەتی بەرۆکی ڕقوقینەیەکی پەنگخواردووی پێنەکردوویانە، مەفهومەکانی مرۆڤی شۆڕشگێری سووک و ڕیسوا نەکردایە. چونکە هێشتا خەلکێکی زۆر بە ژیان ماون کە ناکرێ، ناتوانن لەئاست ئەو ناحەقییانە بەرانبەر **ئارام** کردوویەتی بێدەنگەی لێ بکەن و تۆمەتە یەکلایەنەکانی **برایم** بڕ بکات! ئەگەر ئەو گێڕانەوە ناتەواوانە سەروسەودایەکی لەگەل ڕاستی هەبووایە، دەبوو ئەو کۆمیتەیەی (کۆمیتەی شارەکان) شوێنی کۆمیتەی هەرێمەکانی بگرتایەوە، **ئارام** و هاوڕێیەکانی لە سووچێکی کەشتیی نەجاتدەری **برایم**دا تێکەل بەوان ببونایەوە و **برایم** و هاوبیرەکانی شوێنی **ئارام** و هاوڕێیەکانیان بگرتایەوە! نەک بە پێچەوانەوە کە بە خشکەیی، سەرباری ئەو هەموو تۆمەت و قسەلۆکدانە پال **ئارام** و هاوڕێیەکانی و لەبری هانابردن بۆ ئامۆژگاری **خالە شەهاب**، خۆی و کۆمیتەی شارەکان تێکەل بە کۆمیتەی هەرێمەکان دەکاتەوە، تۆمەتە ناراستەکان وەک شیرەبەفرینە ڕەش دەبنەوە!

هەر لە لاپەڕەی ٨٠ دا، **برایم جەلال** ئەو برادەرانە بەپێی ئەو بڕگانە دادگایی دەکات کە نووسیویەتی: **بەم بەلگانەی خوارەوە**.

- **ئەو کارە تەنیا لە هەلپەرستەکان دەوەشێتەوە.**

---

[7] برایم کەموزۆر خۆی لە قەرەی ئەم کێشانە نەداوە.

- پێکهێنانی کۆمیتەیەکی تر، مانای دوو کەرت کردنی کۆمەڵەیە و شان بەشانی شاڵاوەکانی ڕژێمی عیراقی دەبنە ماکی هەڵتەکاندنی کۆمەڵە.
- ئێوە کە ئێستا لە دەرەوەی ریزەکانی کۆمەڵەن و لە هیچ لایەک و لەلایەن هیچ ئەندامێکی کۆمەڵەوە هەڵنەبژێردراون بەو ئەرکە هەستن، ئەم کارەتان مانای خۆداسەپاندنی بەزۆرەملی بەسەر کۆمەڵە دەگەیەنێ و باش دەزانن کە هەموو خۆداسەپاندنێک و بیرێکی داسەپێنەرانە، لەلایەن کۆمەڵەوە پەسەند ناکرێ.) ل/٨١

سەیری وشەکانی (هەلپەرستان، شان بە شانی شالاوەکانی رژێمی عیراقی "مەبەستی بەعسە" و هەڵنەبژێردراون، خۆداسەپاندن). بۆ روومەت ناشیرینکردنی ئەو کتێبە، خەباتی **برایم جەلال**، قوربانیدانەکانی بەرانبەر کەسایەتییەکی خۆشەویستی وەک **ئارام** زۆر قورسە، لە قوتووی هیچ بەقالێکیش جێی نابێتەوە. چونکە **ئارام** بەژیانی هەڵپەرست نەبووە، بۆ مافی مرۆڤی کورد و کوردستانییەتی کەرکوک پەنجەی لە چاوی بەعسییەکان ناوە.[8] ئەگەر **شاسواریش** هەلپەرست بووایە، دەبوو لەو رۆژە تەنگ و دژوارانەی بەسەر کۆمەڵە هاتن لە ساڵی ١٩٧٥دا،لەدەمی رۆیشتنی سەرکردایەتی کۆمەڵە، دەبوو بێدەنگەی لێبکات، سنگی خۆی نەداتە بەر راستکردنەوەی کۆمەڵە و هەڵگیرساندنی خەباتی چەکداری نوێی شاخەکان.

ئەوە هەموو جوامێری ناو کتێبەکەی **برایم جەلالە**، کە بەوپەڕی بێ بەرپرسیارێتی، بوێریی **ئارام** لە رووبەڕووبونەوەی دەسەلاتی بەعسی دڕندە و ڕاستکردنەوەی کۆمەڵە لە گلان و پاش ئەو هەموو ساڵە و شەهیدبوونی (**ئارام**)ی سیمبۆلی شۆڕشگێڕیی کوردان و یەکێک لە تێکۆشەرانی کۆمەڵە، لە پەراوێزی کۆنەڕقی کەڕەسیساوییدا، خەباتی ئەو مرۆڤە (بە شان بەشانی شالاوەکانی رژێمی عیراقی) دەخوێنێتەوە! مەگەر هەر لە سێبەری لانکە شڕوشپڕێو و دواکەتووەکەی فەرهەنگی کۆمەڵی کوردەواریدا، جێگای ئەو گاڵتە بێتامانە ببێتەوە، بە یەکێکی نەخۆش قبوڵ بکرێ! دەنا لەکوێ و بە چ پێوەرێک مرۆڤ ئەوەندە ویژدانپووت دەبێ، کە سیمبۆلەکانی خەباتی بەرخۆدان و قوربانی، بەخۆڕایی لەکەدار بکات و سووکایەتی بە سەرورەرییەکانی ڕێکخستنەکەی خۆیەوە بکات!

---

[8] بەندە وەک شاهیدێکی زیندوو، ئەندامێکی شاندی یەکێتی قوتابیانی کوردستان لە کۆنگرەی نیشتمانی قوتابیانی عیراق لە بەغدادی پایتەخت، لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٠دا هەر ئەو شاسوار جەلالە نەترسە، لە هۆلی خولد پەنجەی بە رووی بەعس هەڵشەقاند، بۆ داکۆکیکردن لە کوردستانیبوونی کەرکوک، بۆ رازی نەبوون بە خواستەکانی بەعس، بەوپەڕی جورئەتەوە بڕیاری بەجێهێشتنی ئەو کۆنگرەیەی جاڕ دا، هەموو نوێنەرە کوردەکان بەدوای شاسوار جەلالەوە کۆنگرەکەمان بەیەکجاری جێهێلا.

من له **برایم** دەپرسم که تۆ ئەوەنده به خۆت رافەرمووه، لەپاڵ ئەو هەموو ناحەقییەی بەرانبەر **ئارام** بڵێی و،بە هەڵپەرست ناوزەدی بکەی، دەستپێشکەرییەکەی لە گرتنەوەی کۆمەڵەدا، بە کارێکی (شان بەشانی بەعسییەکانی) لە قەڵەم بدەی ، **ئارام** بە خۆداسەپاندن و خاوەن بیری داسەپێنەرانە بزانی! ئەدی چلۆن چلۆنییەک ئەو پشی پشییەت بۆ دیدار و کۆبوونەوە لەگەڵ ئەو مرۆڤە کردووە! ئەگەر سەرکردایەتی **ئارام** بۆ رزگارکردنی کۆمەڵە و تێپەڕاندنی ئەو رێکخستنە لە دەمی تەنگانەدا، بە ناشەرعی و هەڵنەبژێردراو بخوێنیتەوە! کامانەن ئەو سەرکردانەی کۆمەڵە هەتا ساڵی ١٩٧٨ی خەباتی شاخ، لە رۆژە ئاسایی و هێمنەکانی ژیانی کۆمەڵە ١٩٧٠ _ ١٩٧٥، بە بەراورد لەگەڵ رۆژانی لێقەومانی کۆمەڵە لە پاییزی ١٩٧٥دا، بە شەرعی و هەڵبژاردنەوە کۆمەڵەیان بەڕێوە بردووە!

ئەگەر **برایم** لە گێڕانەوەکانی ناو کتێبەکەیدا، چ مافێکی بە خۆی داوە کە گوایە (کۆمیتەی شارەکان) ی بە دەستەوە بووە، ئەوە ئەو مافەیشی بە **ئارام** بدایە، دڵنیام کتێبەکەی رووگەش دەکرد. ئەوجا هەر رەخنە و پتک و پلارێکی لە شێوازی کارکردنی **ئارام**، بیرکردنەوەکانی بگرتایە، ئەوە مافی تەواوی خۆی بوو.

**(لەلایەن هیچ ئەندامێکی کۆمەڵەوە هەڵنەبژێردراون بەو ئەرکە هەستن) ل/٨١**

وروژاندنی مەسەلەی هەڵبژاردن لە بارودۆخی رۆژانی خەباتی ژێرزەمینی ، بەتایبەت بۆ رۆژە تەنگەتاو و پڕ تەنگەژەکانی ساڵی ١٩٧٥، ئەگەر تەنیا مایەی بیانووگرتن بە **ئارام** و هاوڕێیەکانی نەبێت ، بۆ هیچی دیکە نییە، چونکە بە دڵنیاییەوە ئەو خۆی باش بەو راستییە ناسیارە و بۆ پێمان ناڵێ، لەپێش ئەوساڵەوە و هەر لە دروستبوونی کۆمەڵەوە، هەتا دەمی کۆبوونەوەی فراوانی کادرەکانی کۆمەڵە لە شاخ و ساڵی ١٩٧٨ لەکوێ، کەی و لەسەر دەستی کێ هەڵبژاردن کراوە، کامە سەرکردایەتی لەلایەن ئەندامانی کۆمەڵەوە بە هەڵبژاردن بووە! هەتا ئەگەر لەگەڵ فەنتازیای (کۆمیتەی شارەکان) خۆیەوە، هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەوکۆمیتەیەشی بکردایە پێشقاولی پلارگرتنە **ئارام**، بێگومان **برایم** وەک رچەشکێنێکی مێژوویی لە سەرتاپای ئەزموونی خەباتی ژێرزەمینی ناوی دەردەکرد! هەر لەلاپەڕە ٨١ دا، هەر بە ناوی خۆیەوە فەرمان دەبەخشێتەوە. گوایە، فەرمانی بۆ **دلێری سەید مەجید** _ کە هێشتا لە ژیاندایە _ دەرکردووە

**(منیش پێم راگەیاند.. کەبە هیچ جۆرێ ئەتایپ ونەرۆنیۆ و نەناوی هیچ کەسیان نەداتێ)ل/٨١**

خۆهەڵکێشانی ناو ئەو کتێبە، وای پیشان دەدات کە گوایە دەستی بە رووی (**ئارام**)ەوە ناوە کە خۆیشی بە شوێنی ئەو شتانەی نەزانیوە، چونکە لە بنەڕەتەوە لەلایەن هاوڕێیانی (**ئارام**)ەوە پەیدا کراون، ئەوان شتەکانی خۆیان پێچاپکردوە.

ئەم بڕیاردانەی ناو کتێبەکە زۆر بڕ ناکات، **برایم** زوو پەشیمان دەبێتەوە و لەسەر دیتنی **شاسوار** قایل دەبێ! و دواتر بەبێ بەڵگە جێبەجێ نەبوونی دیتنی **ئارام**، بۆ ئەوە دەگێڕتەوە، کە گوایە:

(بەڵام تاپاش تەسلیم کردنەوەی شەهید شەهاب وهاوڕێکانی.... وەڵامیان نەبوو) ل/٨١

دیارە ئەو زەمانە خۆی شوکور **هیچ** مەترسییەک لەسەر **برایم جەلال** نەبووە، وبە ئازادی خۆی سوڕاوەتەوە، **ئارام** و **هاوڕێیەکانیشی** لە موختەفی، ژیانی نهێنی ئەو ماڵ و ئەو ماڵ جێیان پێ جێ نەبووە. بەبێ ئەوەی **برایم** ئەو ڕۆژە ناخۆشانە بە بیر خۆی بهێنێتەوە، ناحەقی بەرانبەر **شاسوار** دەگێڕێتەوە کە گوایە هەتا لەوە دڵنیا نەبووە برادەرانی سەرکردایەتی کۆنی کۆمەڵە تەسلیم بەعیراق کراونەتەوە، **ئارام** ئامادەیی دیتنی **برایم جەلال** ـ ی نەبووە!

(**ئارام**)ێک هەمیشە شەووڕۆژی نابووە سەر یەکتری، شەونخوونی بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ **هاوڕێیان** کردووە، دەشێ داوای دیتنی **هیچ هاوڕێیەکی** ڕەتکردبێتەوە، بەتایبەتی کە زانیبێتی، ئەو **هاوڕێیە** لە ریزەکانی ریکخستنە، ئەو ڕۆژەیش بۆ دۆزینەوەی ئەندامێکی پچڕاوی کۆمەڵە، **ئارام** و **هاوڕێیانی** دیکە سەدویەک سەرکێشییان کردووە! بەلام ئەوەندە هەبووە بۆ (**ئارام**)ی بلیمەت بەس بووە، یەکجار برادەرێک ببینێت، بەتەواوی لەو برادەرە بگات، بیناسێ کە چەندی لەباردایە. **ئارام** زوو لە هەموو خۆهەڵکێشانێک دەگەیشت، بۆی شاگەشکە نەدەبوو، بگرە وەختی زێڕینی خەباتی ژێرزەمینی خۆیشی بەو جۆرە کەسانەوە خەریک نەدەکرد، ئەو بە تەواوی لە لۆجیکی خۆپاراستن، بە نهێنی خەڵک دیتن گەیشتبوو. وەختی خۆی بەخۆڕایی نەدەچواند.

**برایم** جەلال بە **هەناسەیەکی** پچڕ درێژە بە گێڕانەوەی چیرۆکی دیتنی **ئارام** دەدا، لەبری شیتاڵکردنەوەی سیناریۆی سەربردەی دەربازکردنی **خاڵە شەهاب** و هاوڕێیەکانی لە پێنجوین بە ئەنجامێک بگەیەنی، بە خوێنەر ناڵێ، بۆ **خاڵە شەهاب** رازی نەبووە لەسەر ئەو پلانەی دەربازکردنیان. بگرە لێرەوەیش، خۆی لە سەرێکەوە دەکاتە پاڵەوانی خەمخۆری قوتارکردنیان، لە سەرەکەی دیکەوە بەبێ بەڵگە، **خاڵە شەهاب** قەرزاربار دەکاتەوە کە گوایە:

(بەداخەوە شەهید شەهاب دژی ئەو رایە ببوو، تەنانەت لەرێگاش مەڤاڵ عەلی بچکۆڵ ویستبووی خۆی لە سەیارەکە هەڵداتە خوارەوە دیسان شەهید شەهاب قایل نەبوو.) ل/٨٢

بەبێ ئەوەی سەرچاوەی ئەو سەربردەیە بۆ خوێنەر دیاری بکات! و خێرا بابەتەکە دەپێچێتەوە و بۆ درێژەپێدانی گێڕانەوەکانی خۆی سەبارەت بە دیتنی سیناریۆی بێ ئەکتەر، دەنوسێ:

(ئێستا ئیتر دڵنیابوون _ شاسوار و هاوڕێیەکانی _ لە گرتنی هەڤالآنی سەرکردایەتی و دەربازنەبوونیان، بۆیە _ ئارام _ دەیەوێ یەکتر ببینین) ل/٨٢

گومانی **برایم جەلال**، دڵەراوکێیەکانی لە بەرانبەر کاری لە کردەنەهاتوی ئەو زەمان و زەمینی **ئارام** و هاوڕێ جەربەزەکانی، ئەگەر بەو رقە ئەستورەی کە هەتا هەنووکەش خۆی لێی رزگار نەبووە لەلایەک، چاونوقاندنی یەکلایەنەی لە بەجێهێشتنی کۆمەڵە، خۆدانە دەست قەدەرێکی نادیار لەلایەن سەرکردایەتی ئەو ڕێکخستنەوە. بۆ ئەوە مرۆڤ پەلکێش دەکات کە کۆمەڵەی دوای **ئارام** نەکەوتبێتە ناو ئەپارتمانێکی شوشەیی بەرۆکی دەسکەوتە زۆروزەبەندەکانی، زەمەنێکی ئاسایی و نیمچە دیموکراتی بەرگی کوردی نوێ! **برایم** بە بێدەنگبوونی یەکێک نەبووە بۆ لە گۆڕنانی کۆمەڵە و کۆتاییهێنان بەو سیناریۆیە!

دەستپێکی بەشی هەرەزۆری سەرووەرییەکانی کۆمەڵە، لە هەنگاوی بوێرانەی **ئارام** و هاوڕێیەکانی ڕێچکەی گرتووە، بەسەر یەک رووبار خوێنی گەشی لاو و مرۆڤی کورد تێپەڕیوە، کە گروندی خەباتی چەکداری، یەکێتیی نیشتمانی لەسەر دامەزراوە و کەوتووتە سەرپێیان. ئەوە برایم لەبری هەموو لایەک بە ناحەقیکردن لەو سەرووەرییە قەرزەکان بۆ **ئارام** و هاوڕێیەکانی دەژمێری! ئەمڕۆ، کە **ئارام**، بەشێکی زۆر لە هاوڕێیەکانی بە ژیان نەماون . ئەتۆ بڵێی مێژوو بەرانبەر خەباتی پڕ قوربانیی **ئارام** و هاوڕێیەکانی ئەوەندە دڵڕەق بێت، لە کانیاوی وشککراوەی تژی لە بەندوباڵۆرە، بیەوێ تینوێتی نەوەکانی ئێستا و داهاتوو لە ئاست قوربانی **ئارام** بشکێنێ!

دواتر **برایم جەلال** لەلای خۆیەوە، هەر بۆ خۆی کەوتووتە هۆنینەوەی نەخشەرێگایەکی ناو تاریکایی، لەپێناوی مشتوماڵکردنی مەزەندەکانی لە قەرزاردەرهێنانی **ئارام** لەسەرێک، قیتکردنەوەی خۆی لە بەرانبەر کەسایەتی (**ئارام**)دا لە سەرێکی دیکەوە، بەبێ ئەوەی تاکە یەک بەڵگە و نیشانەیەکی راست و درووستی ئەو کۆنووسە ئامادەکراوەی ناو بەرگی ئەو کتێبە بۆ خوێنەر دەربخات! یاخود شایەدحاڵێکی (یەکێک لەو

هاورێیانەی بۆکۆمیتە داتاشراوەکەی ناو دڵی خۆی، ناوی ریز کردوون و هێشتا چەندانیان لە ژیاندان) لەسەر هەبوونی نەخشەرێگایەکی لەم جۆرە لەنێوان **ئارام** و خۆیدا ناونووس بکات! کە مایەی پشتراستکردنەوەی مەزەندەکانی بێت. هەر بۆنموونە تەواوی لاپەڕەی ۸۳ ی لەژێر ناوی _ **دلۆاکانی ئارام و دلۆاکانی بەندە** _ بە زنجیرەیەک خاڵ پڕ کردووتەوە. بە دڵنیاییەوە ئەو خاڵانەی بەناوی **ئارام** ریزی کردوون، فریان بەسەر بیروبۆچوونەکانی (**ئارام**)ەوە نییە و لە باوەشی خەملینە سادە و ساکارەکانی هەنووکەی خۆیەتی _ برایم _ ن. چونکە ئەو رۆژە بەشێکی زۆری **هێڵە**کانی رێکخستنی کۆمەڵە لە تێکڕای شارەکانی کوردستان (سلێمانی و هەولێر و کەرکووک و خانەقین و بەغداد) بەدەوری دەستپێشکەرییەکەی **ئارام** و هاورێیەکانی کۆببوونەوە، لەپێناوی سەرلەنوێ کەوتنەوە سەرپێیانی کۆمەڵە. دواتر هەر لەناو شاری سلێمانی کۆمیتەی هەڵمەت لە دایک بووە کە کەموزۆر **برایم جەلال** پێی نەزانیوە (لێرە **سالار** و **مەلا بەختیار** و **برایم سەر سپی** و **دلێری سەید مەجید** و **دلێرئەحمەد** پڕ زانیاری ترن.) ئەمەیش زۆرتر رەنجی دوابەدوای لەبارچوونی ئەو کۆمیتەیەی هەرێمەکان بوو، کە خاڵە شەهاب لە پێش رۆیشتنەکەی خۆیەوە دایینابوو، بۆ سەرپەرشتی کۆمەڵە. برایم جەلال دیارە بەو راستییانەی نەزانیوە، چونکە کەموزۆر باسی نەکردووە.

لەگەڵ هەموو ئەو راستییانەیشەوە، ئەوە گریمان ئەو خاڵانەی **برایم جەلال** بەناوی **شاسوار** و خۆیەوە، لەوێ رۆژەوە بە دەستکاری لەناو فریزەری داتایەکی مێشکتەڕی (زیندوو) پاراستونی و هەنووکە بە نوویی لەو فریزەرە دەریهێناون. لە بەراوردێکی لوجیکیانەی نێوان خاڵەکانی **شاسوار** و **برایم**/دا، تای تەرازوی سەنگ بە لای کامەوەیە؟

**برایم** لە پەراوێزی کۆماری رقوقینەی قەتماخەگرتووی دەیان ساڵەی بەر رەوتی تۆڵەسەندنەوەی (سەرکاغەز) لە یەکێکی دیکەی نادیار لە بەرگی (**ئارام**)ی نەمردا، بە درەنگ وەختی کە تەنیا روومەتی خەباتی خۆی پێ ناشیرین کردووە. بگرە لەو سێبەرەیشەوە، زۆر بێمنەتانە رێکخستنەکانی کۆمەڵە **بە** (خت مائل)ل/۸۳ تۆمەتبار دەکات، بەبێ ئەوەی سەرەداوێکی ئەو خەت مایلییەمان بۆ دەربخات، تەنیا ئەوە نەبێت دیسانەوە قەوانی سواوەی ئەوەی لێداوەتەوە، کە گوایە **شاسوار** و **نەجمەدین** (سالار) ئەو رۆژە پێوەندییەکیان بە کۆمەڵەوە نەمابوو!

راستە **شاسوار جەلال** لە هەڵسوکەوتی رۆژانەدا، تا بڵێی مرۆڤێکی خاکی و سادە بوو، گوێی لە گەورە و بچوک دەگرت. ئەوەندەی من **شاسوار**م ناسیبێت کە دواتر وەک **ئارام** بووە سیمبۆلی شۆڕشگێری ناو خەڵکی کورد، هەرگیز **برایم جەلال** لەوێ رۆژ بەو تێزانەی

ناو بەرگی کتێبەکەی هەنووکەی، لە ئاست **ئارام** بڕی نەکردووە، نەوەک بەو مانایەی **ئارام** ڕوحزڵ و خۆ بە گەورەزان لە ئاست هەر کەسێک خۆی خوێندبێتەوە، بەڵکو ئاستی هوشیاری و مەعریفی شاسوار ئەوەندە بڵند و فراوان بوو، هەموو یەکێکی خاوەن سەرەتایەکی ڕۆشنبیری، توانای ئەوەی نەبووە لە تەکیا مەلە بکات.

(شاسوار لەو خاڵەی دوایی من گرژ بوو و وا تێگەیشت، کە من مەبەستم لە گومانکردن لەوە بوو)ل/٨٤

ئەوەش ڕاست نییە، لە قسەی ئەندامێکی کۆمەڵە گرژ بووبێت، چونکە **ئارام** بڕوایەکی بەتینی بە خۆی، فەلسەفەکەی خەباتی هەبوو. ئینسانی خۆش دەویست، قوربانی بۆ خۆشی خەڵک دەدا، هەرگیز بەتەنگ خۆشیی زاتی خۆیەوە نەبوو، هەر لەو ڕێبازەیشدا شەهید بوو. ئەگەر **ئارام** لە قەناعەتەوە شتێکی بە دڵ نەبووبێت، ئەوە نەوەک گرژبوون دەرەقەتی نەهاتووە، بگرە بەوپەڕی جورئەتەوە، وەڵامی بۆ هەموو کات، تەنگەژە، گفتوگۆیەک پێ بووە. **ئارام** ڕای خۆی لە کەس و لەبەر خاتری کەس نەشاردووەتەوە، بەوپەڕی ڕووگەشی، دەم بە پێکەنینەوە قسەی خۆی کردووە، چونکە لە جیهانی کەسایەتی **(ئارام)**دا، نە مانۆڕ وجودی هەبووە، نە هەر بیروباوەڕێکی خۆی لە کەس شاردووەتەوە، هیچ قسە و کارێکی نهێنی و شاردنەوەی لە هاوڕێیانی خۆی تێدا نەبووە.

**برایم** دیسانەوە بۆ قوتارکردنی بەخشکەیی خۆی لەو هەموو قسەوقسەلۆکانەی بۆ **(ئارام)**ی ڕایەڵکردووە، هاتووە بە مانۆڕێکی سواوە، نووسیویەتی: (بڕیارماندا کە جارێکی ترو بەئامادەبوونی ژمارەیەکی تریش لەهەردوولا پێکەوە دانشین) ل/٨٤

کەچی بۆ بەختی خۆی، بەدرێژایی باسوخواسەکانی کتێبەکەیدا، ئەو گفتەشی وەک چەندان گفتی ئێرەوئەوێی لەبیرچووەتەوە، خەبەرێک لە دانیشتنی داهاتووی لەگەڵ **شاسوار جەلال** بە ئامادەبوونی هاوڕێیەکانی دیکەوە نادات!

**برایم** لێرەوەیش، سەبارەت بە **عبدالرزاق**، کە شەهید بووە، خۆی لە ژیاندا نەماوە، وەک خەفییەی خۆی، (خت مائلی) کۆمیتەی شارەکان، لەناو کۆمیتەی هەرێمەکان ناوی دەزڕێنێ، لەسەرزمانی ئەو هەواڵ لە دەرچوونی ڕاپۆرتێ شوبات دەدات. نووسیویەتی:

(ڕۆژی ١٥_ ١_ ١٩٧٦ شەهید (هێشتا لەژیاندابووە) عبدولرەزاق کە بەئاگاداری کۆمیتەی شارەکان لە کۆمیتەی هەرێمەکانیشدا کاری دەکرد، _ کە وانییە و عبدالرزاق هەر زوو دەستبەرداری ئەندامێتی کۆمیتەی هەرێمەکان بووە _ ئاگاداری کردین کە کۆمیتەی هەرێمەکان بە تەمای ئەوەن بەم نزیکانە بڵاوکراوەیەکی ناوخۆ دەرکەن لەشێوەی مانیفێستێک.. ) ل/٨٤

دووفاقەکەوتنی **برایم جەلال** بە زەقی دەرکەوتووە، ئەو لە کاتێکدا، **شاسوار** و هاورێیەکانی، گوایە بەوە بەدناو دەکات کە خت مائل/یان لەناو ئەوهێڵەی رێکخستنەکانی **برایم** داناوەتەوە! کەچی لێرەدا خۆی بە زمانی خۆی دانی بەوە ناوە کە گوایە **عبدالرزاق** _ ی بە دەست ناردووەتە ناو کۆمیتەی هەرێمەکان، لەو رێگایەوە بە کاروچالاکییەکانیان ئاسیار بووە!

**(کۆمیتەی شارەکان بۆ رێگرتن لەدەرکردنی یەکەم دەستەگوڵی کۆمیتەی هەرێمەکان کەبەمانیفێستی کۆمیتەی هەرێمەکان و پاشان _ ئاش _ ئاڵای شۆڕش و پاشتر شەهید ئارام ناو دەبرا) ل/٨٥**

لەو پەرەگرافە شێواو، تێکەڵوپێکەڵەدا، **برایم** چەند مەبەستێکی دەروونی رقاوی خۆی ئاوێتەی یەکتری کردووە، کە زۆرتر بە زیان بۆ خۆی گەڕاوەتەوە. جارێ کۆمیتەی هەرێمەکانی کۆمەڵە، **شاسوار جەلال هیچ** بەیاننامە _مانیفێست_ یان دەرنەکردوە، بەڵکو ئەوەی بڵاویان کردووەتەوە راپۆرتی شوباتە کە بۆ جاری چەندەم بە هەڵە دووبارەی دەکاتەوە. ئەوجا ناوەڕۆکی ئەو راپۆرتە بەدڵی **برایم** نەبووە، ئەوە شتێکی دیکەیە، بەڵام بۆ هەنووکە بە ئانەئامێز باس بکرێت! پاشان _ مانیفێستی _ کۆمیتەی هەرێمەکان چ پێوەندییەکی بە رێکخراوی ئاڵای شۆڕشەوە هەبووە! کە هەریەکەیان لە زەمان و زەمینی خۆیان قەوماون و نزیکەی دە ساڵانیان نێوان بووە، (**شاسوار جەلال**)یش بە جەستە لە ژیاندا نەماوە، تەنیا دوو لە ئەندامانی کۆمیتەی هەرێمەکان لەگەڵ (ئاڵای شۆڕش)دا هەڵوێستیان وەرگرتووە، لە کۆمەڵە جیابوونەتەوە. کەسیش نکوڵی لەوە ناکات کە ئەو راپۆرتە لەلایەن **شاسوارەوە** نوسراوە. (ئاڵای شۆڕش)یش هەرگیز ئەو راپۆرتەی بە موڵکی خۆی نەزانیوە، تەنیا شەڕفرۆشتنی درەنگوەختی _ دەیان ساڵ بەسەرچوو _ نەبێت، چیترە!

**(ئێمە پێمان ووت.. کەپتر لە٣ ساڵە ئەو ئەندامەی کۆمەڵەیە و هەرگیز ئەم ناقایلبوونەی بۆ ناوی کۆمەڵە دەرنەبڕیوە، بۆیە ئەوە رای شاسوارە،) ل/٨٧**

**برایم** لە هەر شوێنێک خشتێک لە دیواری ئەپارتمانە قوراوییەکەی بەردەستی بە رێکەوت و نارێکەوتی گێرانەوەکانی دەرپەڕیبێت، ئەوە یەکسەر سوچەکەی بۆ **شاسوار** گێڕاوەتەوە. جارێ دڵنیام **برایم جەلال** خۆیشی بەوە دەزانی کە **شاسوار** ئەوەندە دەمچەفت و

دەستەپاچە نەبووە، کە راو و بۆچوونەکانی بە پەنادزە لە رێگای هاورێیەکانی دەربخات! ئەوجا **ئازاد هەورامی** لە کەسی نەشاردووتەوە کە هاورێ، شوێنکەوتووی بیروکرداری **ئارام** بووە. چونکە لەو رۆژەدا **ئارام** بۆ مەسەلەی ئایدیۆلۆژی، پێشبینییە سیاسی، هەڵسەنگاندنەکانی ئەو دەمە پێشرەو، رێگا پیشاندەری هەمووان بووە. دواتر نازانم بۆ دەبێ **برایم** ئاوەها بە رەهایی بنووسێ: (پتر لە ٣ ساڵە ئەو ئەندامە) و (هەرگیز ئەم ناقابیلبوونەی بۆناوی کۆمەڵە دەرنەبڕیوە).

دەبێ ئەو زانیاری، دڵنیابوونەی لە چ سەرچاوەیەکی ئەرشیفی نهێنییەکانی کۆمەڵە وەرگرتبێت! یاخود بەپێی بڕوابوونە زیادەڕۆییەکەی بە خۆی، وەک ئەوەی **برایم جەلال** لەبری سەرکردایەتی کۆمەڵە، هەرلە نووکەوە بە مێژوی بە ئەندامبوونی هەموو هاورێیەکی کۆمەڵە، را و بۆچوونەکانیان ئاگادار بووە!

> (بەتایبەتی ئەوانە کەهەم نەجمەدین و هەم شاسوار زمانیان لێدراوە لەلایەن رژێمەوە بڕیاری گرتنیان هەیە.) ل/٨٩

**برایم** لێرەوەیش بەبێ ئەوەی ئاگای لە خۆی و کتێبەکەی بێت، کەوتووەتە فاولێکی دیکەوە. ئەوەی لەبیر نەماوە کە هەر خۆی پێشتر لە لاپەڕە ٧٨ دا نووسیویەتی: (٢ ــ شاسوار جەلال کە فەراشەکەی خۆی زمانی لێدابوو).

نازانم خوێنەر باوەڕ بە قسەی کامە گێڕانەوەی ناو ئەو کتێبە بکات! بەناوی **"خاڵە شەهاب"**ـەوە گەمە لە ئاوی لێڵدا دەکات و من کە هێشتا لە ژیاندام و لە زیندانی (الفضیلیە) سەردانی **خاڵە شەهابم** کردووە کە بۆ خۆی ئەو رۆژە موجازەفەیەکی سەرچڵانە بوو. (کە لە یادەوەرییەکانی بەناوی لە هەواری یادەوەرییەکانمدا، بەدرێژی گێڕاومەتەوە و لەو گێڕانەوەدا هاتووە:

> "بەهاری ساڵی ١٩٧٦بوو شاسوار بۆ جاری دووەم لە رێگای جمالەڕەش بەدوایدا ناردم کە بچم لە ژیانی موختەفیدا، لە سلێمانی سەردانی بکەم. شەو لە خزمەتیدا بوم، رایسپاردم کە بچمە بەغداد، سەردانی برادەران لە زیندان بکەم ــ کە هێشتا لەژێر لێکۆڵینەوە بوون ــ **ئارام** پەیامێکی کورتی بۆ خاڵە شەهاب و سەرکردایەتی گیراوی کۆمەڵە نووسیبوو، ئامۆژگاری کردم کە دوایی بچوککردنەوەی و پێچانەوەی بە نایلۆنی تەنک، بیخەمە ناوــ عروگ ــ کوبەی برنجەوە. ئەوە بوو کە چوومە بەغداد بە هاورێتی مەحەمەد زاهیر ــ بە ژیان ماوە، ئەو دەمە قوتابی زانکۆ و دۆستێکی کۆمەڵە بوو ــ بۆ رۆژی موواجەهە

بەیەکەوە لەگەڵ کەسوکاری زیندانییەکان چووینە ناو زیندانی (الفضیلیە)، من یەکەم جار لەگەڵ برادەران ئەرسەلان بایز و عومەر سەید عەلی _ کە هەردووکیان لە ژیاندا ماون _ دانیشتم، نیازی سەردانی خۆمم پێ گوتن بۆ دیتنی خاڵە شەهاب و مامۆستا جەعفەر عەبدولواحید. من خۆراکەکەی خۆم بۆ ناردن، دواتر لە فرسەتێک، لە پەنایەک لەگەڵ هەردووکیان دانیشتم و بەزاریش، پەیامەکەی شاسوارم پێ ڕاگەیاندن کە بریتی بوو لەوەی. _ من ئەو کات بەوە ناسیار نەبوم، کۆمیتەی هەرێمەکان وەک سەرکردایەتی مەیدانی کۆمەڵە درووست بووە، دەستپێکی کارەکانی بە نووسین و بڵاوکردنەوەی هەڵسانگاندنێکی ئانوساتی ئەو زەمانی کۆمەڵەیە، ڕەخنەگرتنی لە سەرکردایەتی کۆمەڵەیشی فەرامۆش نەکردووە. _ لەو دیدارەدا خاڵە شەهاب لەپێشەوە پێی گوتم. کە زۆر خراپم کردووە هاتوومەتە سەردانیان، ڕەنگبێ لە دەرچوون، بگیرێم. بۆیە ناتوانن بە نووسین هیچ شتێک بە مندا بنێرنەوە، بەڵکو تەنیا بە دەم پێی گوتم.. شاسوار و هاوڕێیان خۆیان سەرپشکن لەوەی خۆیان چی بە ڕاست دەزانن، ئەوە بکەن. چونکە ئەوە ئەوانن سنگی خۆیان داوەتە بەر ئەو ئەرکە قورسە، داواکارین تا پێیان دەکرێ، خۆیان لە گرتن بپارێزن. ئەمە تەواوی پەیامە زارییەکەی خاڵە شەهاب بوو. جەعفەر عەبدولواحیدیش ئەوەندەی خستە سەری.. کە برادەران دەستکراوەن لە ڕەخنەگرتن لە ئێمە و من دەستخۆشییان لێ دەکەم.

ئیتر من بۆ ڕۆژی دوایی یەکسەر ڕێگای گەڕانەوەم بردەوە سلێمانی، **شاسوارم** دیتەوە. تەواوی ئەو موجازەفەیەم بۆ گێڕایەوە، هەستا ماچی کردم و گوتی.. ئەگەر هەرشتێک ببووایە، ئەوە لە پێناوی ئەو پەیامە بوو. دەبێ لەمەودوا زۆر ئاگاداری خۆت بێت ، ئەوەندە سەردانی ئێرە مەکە، من خۆم دواتر لە ڕێگای عەزە (**مامۆستا عەزیز مەحمود**) و **یونسەوە** (لە گەراجەکەی **جەماڵەڕەش** کاری دەکرد) نامەت بۆ دەنووسم.

بە کورتی.. سەربڵندی، ڕاستگۆیی **ئارام** لە چیراوکەی تەمەنی ژیانیدا، بەوە دەسرازەی گرتووە، کە هەرگیز بەرانبەر بە کۆمەڵە و هاوڕێیەکانی بێوەفا، سپلە نەبووە، لە سەرتاپای کاروانی خەباتکردنیدا، دوور بووە لە هەر جۆرە پراکتیکێکی فرسەتتەلەبی، پاشقولگرتن لە هاوڕێیەکانی خۆیدا.. لە ژیان و تێکۆشاندا، بێمنەت بووە، هەرگیز پێویستی بە مانۆری پاشەملە، گیانی پیلانگێڕان لە برادەرەکانی نەبووە. چونکە ئەوە بۆ بەختی کۆمەڵە بوو، لەو ڕۆژگارە (**شاسوار**)ێک سەرهەڵبدات، بە پشتیوانی و دەستباری هاوڕێیەکانی، شان بداتە ژێر باری ئەو بارە قورسەی ئەو ڕۆژەی زیندووکردنەوەی کۆمەڵە. دەبوو **برایم جەلال** ئەگەر ستایششی نەدەکرد، بەرانبەر کەسایەتی **ئارام** بێدەنگی هەڵبژاردایە! تا کتێبەکەی لەهەمو لەیەکەوە ڕووی مەجلیسی هەبووایە.

**(بەداخەوە شاسوار جەلال لەهەمو بەلێنەکانی خۆی پەشیمان بۆوە، بابڵێم پێچەوانەی بەلێنەکانی رەفتاری کرد..) ل/٩١**

**برایم جەلال** بە ملنانی لاسارانە، لە سەروەرییەکانی خەباتی **شاسواردا**، لەناو کولەکەی دڵە پڕ لە رقوقینەکەی بەرانبەر کەسێک (لە بەرگی **ئارام/دا**) هەر لە خۆیەوە، بێبەڵێنی بۆ خولقاندووە! بەدوای ئەو دەیان ساڵەوە بە ڕستەیەکی بوختان ئامێز، گەرەکیەتی بەر لە بەرهەمی چڕوپڕی ئەو رۆژەی **ئارام** بگری. لە بەرانبەر کۆماری بەرهەمی سەرکەتنە خەیاڵییەکانی خودی خۆیەوە قەرزباری بکاتەوە! ئەوەی رۆژێک **شاسواری** ناسیبێت، جارێک بە رێکەوتیش لەتەکیا هەڵسوکەوتی کردبێت، دەزانی **برایم جەلال** بەرانبەربە _ بێ بەلێنی _ **شاسوار** چەند ناحەقی کردووە، بگرە قێز لەو تۆمەتە ناراستە دەکاتەوە. ئەگەر **برایم** بەوردی ئەو دیدەنی، وشانەی ئەو جوتیار و **هاولاتییانەی** بخوێندایەوە کە بەدوای دەیان ساڵی شەهید **(ئارام)**ـەوە **گوتوویانە**، لە دووبەرگی کتێبی _ **ئارام** و **بزووتنەوەی** شۆڕشگێری کورد _ بڵاو کراوەتەوە، **مەحەمەد سولەیی** ئامادەی کردووە، ئەوە نەدەکەوتە بوختانی لەم جۆرەوە.

**برایم جەلال** بەبێ ئەوەی کەسێک ئەو مافەی پێ دابێت، **هاتووە** لە خۆیەوە لەبری سەرکردایەتییەک (کە کۆمەڵە و خەبات و باوەشی نەتەوەکەی و خاکەکەی بۆ قەدەر جێ هێشتووە) بە بیانوی خۆگەیاندنە شام و **مام جەلال**. لەبری دەربازکردنی گیانی خۆیان لە گرتن _ کە ئەنجامەکەی زۆر خراپتر کەوتوونەتە داوەوە و بە مەرگی سەربەرزانەی **خاڵە شەهاب و جەعفەر وئەنوەر** تەواو بووە _ درەنگە شەڕی **ئارام** و **هاوڕێیەکانی** دەکات کە سەرباری فرمانی گرتن، راوەدوونان، لەبری تێکڕای ئەو سەرکرداتییەی بە دەستەجەمعی ولاتیان بە جێ **هێشتوە**. **ئارام** مەردانە کۆڵی نەداوە، لە سەرەتا ژیانی ئیختفای _ لەپێناوی گرتنەوەی شیرازە لەبارپەکترازاوەکانی رێکخستنی کۆمەڵە _ باوەشی ولات و نەتەوەکەی خۆی هەڵبژاردوە، بەبێ هەر جۆرە کۆمەکێکی بیانی دیاریکراو، تەنیا بە جەستە و بیروباوەڕی پۆلایینی خۆیان، بوونەتە پەرژینی پاراستنی کۆمەڵە و بەرخۆدان بە رووی رژێمی بەعس لە ١٩٧٥، دوایی زەمینەخۆشکردن، سازدانی مەفرەزە سەرەتاییەکانی خەباتی چەکداری، ناردنە دەرەوەیان _ شاخ _، پاش دڵنیابوون لە کەوتنەوە سەرپێیانی رێکخستنەکانی کۆمەڵە لەناو شارەکانی کوردستاندا، **ئارام** و **هەموو هاوڕێیە** موختەفییەکان بە تاک تاک و جوتە چونەتە شاخ، بوێرانە سەرپەرشتی شار و شاخیان کردووە، یەک جۆخینی تژی لە هەڵوێست و کۆڵنەدانیان بۆ کۆمەڵە، نەتەوەی کورد کردووەتە سەرمایە، خەڵکانی دیکە هاتوونەتە سەر ئەو بەرهەمەوە.

(من تەنیا کورتەیەک لە بەیانی ١٦ لاپەڕە خورشیدیەکەی ٨ ی _ شوباتی _ ١٩٧٦ دەخەمە بەردەمی خوێنەر،) ل/٩١

حەز دەکەم خوێنەر ئەو دەستەواژەی پێش ئەم چەند رستەیەی سەرەوەیش بە وردی بخوێنێتەوە، کە نووسیویەتی:

(ئەگەر هەر کەسێک کەمێک لە دیسپلین گەیشتوو، کەمێ لە رەوشتی سیاسی و کەمێکیش لە هەستی نەتەوایەتی و رێ و رەسمی کۆمەڵایەتی گەیشتوو، بکەوێتە هەڵسەنگاندنی بەیانی شوبات...) ل/٩١

برایم هەر وەک بە خۆی رەوا بینیوە، بەخۆڕایی خەڵک بەبێ پرینسیپ، ناتێگەیشتوو لەو ئەخلاقە سیاسییەی خۆی دایهێناوە و کەم هەستی نەتەوایەتی بەر تەرازوی بەردەستی فەرموودەکانی و کۆلەوار لە تێگەیشتنی رێوڕەسمی کۆمەڵایەتی بەرعەرشی کتێبەکەی خوێندووتەوە، دەبێ ئاگای لەوەیش بێت، کورد بەرانبەر ئەو کەسانەی بۆ خۆیان هەموو شتێک رەوایە، بۆ خەڵکی دیکە بڤەیە، جوانی نەخش کردووە کە دەڵێ: (تفی سەرەو هەوراز هەر بە رووی خاوەنەکەی دەکەوێتەوە.)

بە هەموو پێوەرێک، ئارام لە ریزی پێشەوەی ئەو تاکوتەرایانەیە کە لەناو قوتابخانەی سیاسەتچییەکانی کوردەواری، بە خاوەن پرینسیپ، داهێنەری رەوشتی سیاسی مولتەزیم، هاودەنگی خەڵک، رچەشکێنی چڵەپۆپەی هەستی نەتەوایەتی رزگاربوو لە پاشەگەردانی رەگەزپەرستی، خۆ بەگەورەزانی بێناوەرۆک لە لایەک، هەڵگری بە ناوی ئالای عەدالەتی رێوڕەسمی کۆمەڵایەتی پێشکەوتووخوازی بووە. بەڵام چی دەکەی بۆ بەختی کەچی خەڵکی کورد، کەسانێک موزایەدە بە نوێخوازی، نوێبوونەوە دەکەن، بە قسەی سەری زمان و بنی زمانیان، لە عەلەیی سەرکردایەتییەکی تژی لە خامۆشی و خەوشن، کەچی لە پراکتیکدا بۆ ئەو سەرکردایەتییە کەوا سووری بەرلەشکرن، بەڵام بۆ دەستپێشکەری مێژوویی ئارام و هاوڕێیەکانی لە داهێنانی نەخشەرێگایەکی نوێ بۆ پەیدابوون و ساغبوونەوەی نازناوی سەرکردە لەناو جەرگەی کوڕی خەباتدا، ریزەکانی کۆمەڵانی خەڵکی ستەمدیدە، بەتایبەت لە دەمی تەنگەژە و لێقەوماندا، لە مەلیک زیاتر دەکەونە بەرەی دژایەتیکردنی رەوتی مێژووی بەسەرچوونی گوزارشتی سەرکردایەتی ناو قوتبی سەرهەڵگیراو، بە هەزارویەک دوعا بەرگری لێ دەکەن، هەموو هەوڵدانێکی داهێنەرانە لە قاو دەدەن!

بەگوێرەی شەرعی ناوکتێبی ناوبراودا، ئەو هەڵسەنگاندنە بەجورئەتانەی راپۆرتەکەی شوبات کە زۆر نا ئەمینانە بە بەیانی شوبات ناوزەدی دەکات، کە دیارە **ئارام** خۆی نووسیویەتی. بەگوێرەی .مەزەندەکانی **برایم** ئەوە هەڵەیەکی مێژووییە، دەبوو **ئارام** و هاورێییەکانی لەو رۆژە ناهەموارەی مێژووی کۆمەڵە بێدەنگەیان کردبایە، لەبری ئەو هەڵسەنگاندنە نوێیە مێژووییەی راپۆرتی شوبات، مانیفێستی پیرۆزباییان بۆ ئەو سەرکردایەتییەی کۆمەڵە کە ولاتییان بە جێهێشت، بنووسییایە. کۆمەڵە و خەبات، خاکی ولاتییان بۆ دەستبەتاڵی **برایم جەلال** چۆڵ بکردایە! بەپێچەوانەوە ئەوەی سەرەواوێکی شۆرشگێری لە هەناو بێت، بای تاڵەموویێک راستگۆیی لە مێشکدا میوان بێ، یەک دڵۆپ دڵسۆزی بۆ قوربانی دەستوەکەرانەی ئەو دەستپێشکەرییەی **ئارام** و **هاورێیەکانی** لە ژیاندنەوەی کۆمەڵە هەبێ. ئەو هەڵسەنگاندنە بابەتییە رچەشکێنەی مێژووی تژی لە دەست بەخۆدا شۆرکردنەوە هەبێت، دەزانێ کە ئەم برادەرانە چ سەرەتایەکی مژدەدەرانەی هەڵهاتنی ئاسۆی چرای نوێی زەحمەتکێشانییان هەڵکردبوو، کە بە شەهیدبوونی **ئارام** بەرەو کزی و کوژانەوە چوو!

دەمێنێتەوە سەر ئەوەی منیش وەک خوێنەرێک ئەوە بەبیر **برایم جەلال** بهێنمەوە، کە ئەگەر ئەوەندە لە خۆی دڵنیایە لەوەی، کە راپۆرتی شوبات، بەیانی شوباتە و ئەو بەیانە لەو رۆژە نگریسەی ئینقلابە خوێناوییەکەی ٨ ی شوباتی بەعسییەکاندا دەرچووە و ناوەرۆکەکەی بە مەزەندەی خۆی شی دەکاتەوە، دەبوو بە ئەمانەتەوە چەند لاپەرەیەکی وەک بەڵگە بە کۆپی بخستایە بەرچاوی خوێنەر و لە فریزەری مێشکی خۆیەوە بە دەستکاریکردنەوە مامەڵەی بە سەروەری خەڵکی دیکەوە نەکردایە. هەر ئەو کارەی لێرەدا، ئەو گوتانەی ئیبن خەلدونی شەرمەزار کردووە، ٬٠ بۆ پێشەکی کتێبەکە وەک کلکردنە چاوی خوێنەرەوە سوودی لێ وەرگرتووە.

پاشان مەگەر هەر لە قوتیی ژەنگاویی چیراوکەی کوردەواری جیگای بێتەوە، ئەتۆیەکی خاوەن خەبات و قوربانیدان، بە خۆت زابفەرموی بەبێ هەر جۆرە بەڵگەیەک بە جۆرەها وشەی ناجۆری وەک: (درێژدادڕ، بێتام، پێوەنانی دەیان درۆ و دەلەسەی شاخ وباڵدار و.. متد)، لە شیکردنەوەی ناوەرۆکی راپۆرتی شوبات، خوێنەر دەستخەرۆ بکەی، کە بەزۆری ئاگادارییەکیان لەو راپۆرت و بەسەرهاتانەی ئەو رۆژە نییە! هەر لە لاپەرەکانی ٩١_ ٩٥ دا، لەپاڵ بەراوردکردنی خۆی (کۆمیتەی شارەکان کە بەدانپێدانانی خۆی تێکەڵ بەو رێکخستنە بونەتەوە کە **ئارام** سەرپەرشتی کردوە) لەگەڵ کۆمیتەی هەرێمەکانەوە بۆ شیکردنەوەی راپۆرتی شوبات کوتی کردووە. دیسانەوە **برایم جەلال** چەندان جار قەوانی کۆمەڵەنەبوونی (**ئارام**)ی بێبەڵگەی لێداوەتەوە. دیارە لە مەنهەجی نووسین ئەوەی شتێکی بێبەڵگە دووبارە

بکاتەوە و زۆری بڵێتەوە، نیشانەی ناراستی و هەتا باوەڕبوونی خاوەنەکەیەتی بە شێوازی نووسینی میکاڤیلییانەیە. بەڵگەی گومان خستنە سەر سەرلەبەری گێڕانەوەکانی ناو ئەو کتێبە لەلای خوێنەر دەخوڵقێنێ.

(ئاش لەساڵی ١٩٨٦ سەبارەت بەهەڵوێست وەرگرتنی سەرکردایەتی کۆمەڵە و یەکێتیی بەرامبەریان، تاوانی لە ڕێ لادان و هەڵفریواندن و کردنە جاش وپیاوی ڕژێمی دەیان پێشمەرگەی ..) ل/٩٥

لە پێشەوە بە داوای بووردنەوە، من ئاگام لەوە هەیە، کە ڕێکخراوی ئاڵای شۆڕش هیچ پێوەندییەکی بە کەسی (**ئارام**)ـەوە نییە. تەنیا ئەوە نەبێت هەولدانێکی نیوەناچڵ بووە بۆ سەرلەنوێ ژیاندنەوەی بیروباوەڕە گەشەکانی **ئارام** و زیندووکردنەوەی سەروەرییەکانی کۆمەڵە. لێرە، تا ڕادەیەک لە بابەتەکەی خۆم دەردەچم، بەلام ناچارم بۆ ئەو شێواندن و گێڕانەوەی ناراستی لە دروستبوونی ئاڵای شۆڕش بە دەنگ بێم، تاکو لەو بارەوەیش خوێنەر سەرچیخ نەبردرێ.

بەراستی کە مرۆڤی تێکۆشەر بگاتە ئەو ئاستەی لەبەر خاتری خاتران، هەناسەی پەنگخواردووی پڕ لە ڕقوقینەی بەسەر تێکڕای ئەندامەکانی ڕێکخراوێک بپرژێنێ! دەبێ چ لە ئاست ریزکردنی ئەو تۆمەتانەی ریزیکردوون: (لەڕێ لادان، هەڵفریواندن، کردنەجاش، پیاوی رژێم..) کە بەگۆترە و دوور لە هەر راستییەک جلیت کراون.

جارێ هەڵسوکەوتی نامەسئولانەی لانی زاڵی ناو کۆمەڵەی بەر هەمێزی باوەڕنەبوون بۆ هەر ئازادییەک، پێشێلکردنی زەقی گیانی دیموکراتی لە ریزەکانی کۆمەڵەدا، بەتایبەت بەدوای کۆنفرانسی سێیەمەوە، بە هەناسەیەکی لەخۆباییبوون و لوتبەرزانە، لەلایەن ئەو سەرکردایەتییە دەست رۆیشتووەی ئەوێ رۆژێ. ئەوجا بەربەرەکانیکردنی هەر پێشمەرگە و کادر و هاوڕێیەکی کۆمەڵە، کە خاوەن هەڵوێستی شۆڕشگێرانە بوون و نەبوونە کۆیلە و گوێڕایەڵی ئەو سەرکردایەتییەی لە دوا مەنزڵ کۆمەڵەی لە گۆڕ نا، لەلای **برایم** بەو ریزە وشە ناجۆرانەی سەرەوە گۆڕدراوەتەوە. داڕشتنی قسەوقسەلۆکی بێسەروبەری دوور لە هەر جۆرە راستییەک، روومەتی کتێبەکەی پێ جوان نەکردووە. دیارە کە مرۆڤ لانس وەرگری لە تۆمەتبارکردنی ناریالیستیانەی خەڵک، تامی هەرچەشنە لوجیکێک لە دەست دەدات. ئەوانە بیانەوێ و نەیانەوێ، بە خەباتکردنی راستگۆیانە و مەفهومی شۆڕشگێری نامۆن کە رێز لە ماندووبوون، قوربانی خەڵکانی دیکە ناگرن، بگرە بە زۆری زۆردارەکی

خۆیان پێدا شۆڕ کردووتەوە.[9] بەڵام دەبێ ئەوەبڵێم هەوڵدانی هاوڕێیە جەربەزەکانی ئاڵای شۆڕش لەپاش دەستپێشکەرییەکەی **ئارام**، لە شاخ و شاردا، یەکەم هەنگاوی ڕچەشکێنی مێژوویی بوو بە ڕووی سەرەتای دیاردەکانی گەندەڵی لە شاخ، باوەڕنەبوون بە ئازادیی مرۆڤ، پێشێلکردنی گیانی دیموکراتی و مافی مرۆڤ، گەمەنەکردن بە سەروەرییەکانی خەباتی چینایەتی و نیشتمانی، شەڕی نگریسی کوردکوژی ناوخۆ و سەودانەکردن لەگەڵ داگیرکەرانی کوردستان، زۆر دیاردەی تر.. لەو هەڵسەنگاندنەدا فاکتەکانی سەرنەکەوتنی ئەو هەوڵدانە دەستنیشان کراوە.

لێرەدا بۆ دڵنیابونی **برایم جەلال** لە بەسەرچیخچونە ناهەموارەکەی سەبارەت بەو جۆرە پێناسەکردنەی ئاڵای شۆڕش و هاوڕێیەکانی، هیما بۆ ئەو هەڵوێستە جوامێرییە درەنگ وەختەی **فەرەیدوون عەبدولقادر** دەکەم کە لە شانی ئەو وتارەی بەناوی (هاوڕێ و هاوسەنگەرم!) لە باوەشی کتێبی (کۆمەڵە لە سێدارەوە بەرەو ڕاپەڕین)ل/٦٦-١٣٥ بە ڕاشکاوی و ئازایانە داوای بووردن لەو برادەرانەی ئاڵای شۆڕش دەکات کە چەند بەخۆرایی ئازاریان داون و بە ناحەق مامەڵەیان لەگەڵ کردوون. من لەلای خۆمەوە سوپاسی ئەو هەڵوێستە جوامێرانەی دەکەم. خۆزگە بەرپرسەکانی دیکەی تراژیدیای ئازاردەرەکانی سەرەکیش ئەوەندە جورئەتان دەبوو، دانیان بەو ڕاستییە دەهێنا و لەو لاساری و لووتبەرزییەی ڕابردوویان پەشیمانی و داوای بووردنیان بۆ مێژوو تۆمار دەکرد..

> **(کۆمیتەی هەرێمەکان بەکاریگەری شاسوار بڕوایان بە هەڵگیرساندنی شۆڕشێکی نوێ هەبوو، بەڵام شۆڕشێکی توندڕەوی چەپ دژ بە داگیرکەر، کەرژێمی عیراقە ولەهەمانکاتدا دژی دەرەبەگایەتی کوردستان)ل/٩٦**

**برایم** لەو دەستەواژەیەدا، دروست توندڕەوی ڕەقوتەقی ناسراوی خۆی لە ملی **ئارام** و **هاوڕێیەکانی** شەتەک داوە. یەکلایەنە، بەبێ بەڵگە **ئارام** بە توندڕەو دەخوێنێتەوە! لە کاتێکدا هەر لە خودی ناو ئەو کتێبەدا، زۆر بە ڕاشکاوی دان بە توندڕەوییەکەی خۆی دادەنێ. کادرێکی زمانزان و ئاگادار و شارەزا لە جیهان و سیاسەتی عەرەبانی وەک د. **فوئاد مەعسووم** کە پێشتر مەلایی بووە، پێ قووت نادرێ کە بووەتە یەکێتی، یەکێک لە دەستەی دامەزرێنەرانی ئەو ڕەوتە. دەبوو هەر _ جەلالییەکی _ وەک خۆی لەو پۆستەدابێت!

بەڵێ بیرکردنەوەی کۆمەڵە بەرابەرایەتی **ئارام**، هەرگیز نکۆڵی لە هەڵگیرساندنی خەباتی چەکداری بە هەناسەیەکی نوێ نەکردووە، دەنگ و سەنگی ئەو بیرکردنەوەیەیش،

---

[9] بەدواداچوونی ئەو باسوخواسانە بە تێروتەسەلی بۆ بەشی دووەمی (ئەزموونی ئاڵای شۆڕش) دەمێڵمەوە.

بووە مایەی هەڵگیرساندنی شۆڕشی نوێ لە شاخەکانی کوردستاندا. بەڵام چی لەگەڵ **برایم جەلال** دەکەی کە لە روانگەی بیرکردنەوەی بەردەسەلاتی ئەمڕۆکە بە بەسەرهات، رووداوەکانی بەر لەنزیکەی ٣٥ ساڵان بازی داوە و حوکم دەدات! ئێمە نابێ بە چاوی ئەمڕۆکە دەستکاری بەرمەبەستی تۆڵەسەندنەوە لە جۆری بیرکردنەوەی رابردووو سەیر بکەین، چونکە ئەو رۆژانەی **برایم** باسی دەکات، بە چاوی ئێستاکێ **ئارام** قەرزار دەکاتەوە، ئەوە بیرکردنەوەی زەمان و زەمینی ئەودەمی خۆی بوو. **ئارام** کە بە پێچەوانەی تۆمەتە نادرووستەکان. کەسێکی لە هەمووان زیاتر هێمن و لەسەرخۆ و بەحەوسەڵە و دووربین بوو، سەبارەت بە توندرەوی بیرکردنەوەی ریزەکانی کۆمەڵە، **ئارام** هەمیشە دوژمنی باوککوژەی توندرەوی بوو، چونکە بەردەوام ئەو گوزارشتەی لینینزمی دەگوتەوە، کە توندرەوەی و راسترەوی دوو دیوی یەک پارەی دژایەتی کردنی بیری راستەقینەی مارکسیزم- لینینزم/ن بەڵکو تێکڕای کۆمەڵە ئەوە بیرکردنەوەی بوو. ئیتر هەنوکە **برایم** خۆیمان لێدەکات بەکۆترەباریکەی ئەنتی ئەو بیرکردنەوە، بەراستی بانێکە و سەد هەوا!

نازانم بۆ **برایم** هەنووکە ئەوەندە نیگەرانە لە چەپبوونی ئەوێ رۆژێ! ئاوا بووەتە خەمخۆر و داکۆکیکار لە دەرەبەگایەتی، کە دەبێ دەرەبەگایەتی کوردی چ شارستانییەت و کۆشک و تەلارێکی یەک لە سەدی نموونەی ئەو کۆشک و تەلارانەی مەسئولە زلەکانی ئێستای بەرسێبەری دەسەلاتی کوردییان بۆ نەوەکان کردووەتە میرات!

**(شاسوارجەلال لە ٧ _ ٨ دێی دەوروبەری قەرەداغ سەرپەرشتی بەڕێوەبردنی چەند دەستەیەکی چەکداری دەکرد و بە بنکەی سوور ناو دەبرا..) ل/٩٦**

جارێ لە پێشەوە ئەوە مایەی عەیبە نییە کە لە چەند گوندێکدا هاتوچۆی کردبێت، چونکە سەردەم و زروفەکە ئەوەی گەرەک بووە و دواتر بۆ ئاگاداری **برایم جەلال** و چەقبەستنە لاسارییەکەی، **ئارام** بەشێکی زۆری ناوچەکانی گەرمیان و قەرەداغ و شاباژێر و شارەزوور و هەتا بناری قەندیل گەڕاوە، لەو کاتەی مەفرەزە سەرەتاییەکانی خەباتی چەکداری لەوپەڕی بێئیمکاناتی سەربازی، بێ هەر جۆرە پشتوانییەکی دەرەکی، بە ژمارە کەم لە بەرانبەر هێزی مشەی پڕ چەک، بە ئیمکاناتی بێشوماری رژێمی بەعس کە ئەو رۆژە داروبەردی کوردستانی داگیر کردبوو، مۆڵگەی بەعس شار و گوندی گرتبووەوە. ئا لەوێ رۆژاندا، **ئارام** وهاوڕێیەکانی تەنیا بە پشتبەستن بە بڕوای پۆڵایینی خۆیان، لەبری بوێرییەکی بە دەگمەنی مێژووی خەباتی کورد، وەفاداری بۆ کۆمەڵە و هاوڕێیەکانی زیندانەکانی بەعس. ترادیشونێکی شۆڕشگێڕی نموونەییان تۆمار کردووە. لەو پێناوەدا

سەرلەنوێ حەماسەتیان خولقاندوە. بەڵێ ئەو دەستە چەکدارییانەی کۆمەڵە بە رابەرایەتی **ئارام** و فەلسەفەکەی بووە، بەڵام نەوەک هەر لە ناوچەیەکی دیاریکراوی قەرەداغ کە بە چاوپێهەڵنەهاتنەوە، **برایم** گەرەکیەتی لە ناو دووبەرگی کتێبەکەی بەری ئەو راستییە بگرێت! راستە **ئارام** لەدوا وەرزەکانی تەمەنی خەباتی پێشمەرگایەتیکردنیدا، لە هەندێ گوندی ناوچەی قەرەداغ بە چەندان حەشارگەی مانەوەی بۆ خۆی کردبووە شوێنی راپەراندنی ئەرکە قورسەکانی رێنماییکردنی مەفرەزە چەکدارەکانی کۆمەڵە، یەکێتی لە سەرتاپای ناوچەکان. ئەوجا لەپێناوی بەتەنگەوە هاتنی ئەرکەکانی تەنزیمی ناو شارەکان و نووسین، بەدواداچوون، خوێندنەوەی پۆستەکانیان، خۆئامادەکردن بۆ دامەزراندن، دەرکردنی ئۆرگانی (ئاڵای شۆرش) کۆمەڵە. پاشان فریاکەوتنی ئەرکی شۆرشی چەکداری، یەکێتی نیشتمانی کوردستان سەرباربوو. کە **برایم** خۆی لێ نەبان کردووە، بگرە ئەوەندە بە بەرچاوتەسکی نوسیویەتی: (... چەند دەستەیەکی چەکداری دەکرد).

لێرەدا لەگەڵ سەرلەبەری گێرانەوەکانی خۆیشی دەکەوێتە دژەکردار، لە بیری چووەتەوە کە **شاسوار** بەرپرسی یەکەمی کۆمیتەی هەرێمەکانی کۆمەڵە بووە، ئەندامی مەکتەبی سیاسی یەکێتی، بەرپرسی یەکەمی سەرکردایەتی ناوخۆی یەکێتی و شۆرش بووە، نەوەک هەر سەرپەرشتێ کار و بەرێوەبەری ئەو چەند مەفرەزەی قەرەداغ. کە بۆ مێژوو ئەو گروندەی **ئارام** و هاورێییەکانی لە ناوچەکانی قەرەداغ لەبری ئەو مەفرەزانەی **ئارام** لە قەرەداغ بەرێوەی دەبردن، بووە کوانوی هەڵگیرسانەوەی شۆرشی نوێ، پەیدابونی ئومێد و هیوای سەرکەوتن  بە خەباتی ئەو دەستە پێشمەرگانە. کە بە حەقیقەت هەر ئەو بنکە و دەستە چەکدارییانەی **ئارام** سازی دابوون، لە زۆربەی ناوچەکان رێنمایی دەکردن، بوونە ناوکی هێزی بنەرەتی کۆمەڵە، یەکێتی، گەشەکردنی شۆرش کە زۆربەی کوردستانی گرتەوە.

دەبێ ئەوەیش لە **برایم** بپرسین کە هەر لە خۆیەوە بۆ **(ئارام)** ی هەڵبەستوە، کە گوایە ناوچەی قەرەداغی بە بنکەی سوور ناوبردوە! پێملن ناڵێ **ئارام** لەکوێ ئەوەی گوتوە! لە چ سەرچاوەیەکی وەرگرتوە و بۆ ناوی نەبردووە! هەروەها بۆ ئاگاداری، **ئارام** بە گەورەیی خۆی، بلیمەتی بیرکردنەوەکانی. هەتا لە ژیاندا بوو بە پێچەوانەی ئەوانەی بەرێکەوتی زەمانە، لە سێبەری لەشکر و هێزی چەکدار و ئیمکاناتی دەرەکی و ناوەکی بێشوماری شۆرش، پاڵەسووی سێبەران سەرەتا وەک پێخۆر، دواتر قۆستنەوەی فرسەتتەلەبی لە دەمی ناکۆکییەکان، خۆراپێشکردنی مەکرۆیانە و مانۆری زیرەکی قۆستنەوە و بەکارهێنانی قوربانی و بەرهەمی خەڵکانی دیکەوە، نازناوی سەرکردەبوونی بێناوەرۆکیان بۆ خۆیان قورخ کردووە. وەک بەرزەکی بانان بەو پلەوپایە ناز و نیعمەتی سەر رووی زەمینیان بۆ

خۆیان دابین کردووه، خۆیانی پێ بادەدەن، دەسەڵات بە کار دەهێنن بۆ بەردەوامی هەر چۆنێکی سەرکردەیی بوونیان و شاباشکردنیان لەلایەن خەڵکی بۆرەپیاو و ماستاوچی.
کەچی **ئارام** لەبڕی عەقلێکی خاوەن مەعریفەیەکی فراوان، بوێرییەکی کەم وێنەی مێژوویی، لە بارودۆخێکی هێجگار ناهەمواری رووبەرووبونەوەی رژێمی بەعس، سەرەتاییترین هێزی پێشمەرگەی دەوروبەر، لەوپەڕی بێئیمکاناتی ناوەکی، نەبوونی هەر جۆرە پشتیوانی، کۆمەکێکی دەرەکی. **ئارام** لە ناو کۆمەڵانی خەڵکی رەشورووتی بەلەنگاز، لە ناوەوەی کوردستان، لەسەر ئەرزی واقیع سەرکردەبوونی خۆی ساغ کردبووەوە و کەس پێی نەبەخشی بوو. هەرگیز هەتا خۆیشی لە ژیاندا بووە، بەوە رازی نەبووە، کەس بەسکرتێر و سەرکردە و مەسئول، کارەکتێری سەرەکی کۆمەڵە، یەکێتی، شۆڕش ناوی بهێنن. بە پێشوازینەچوونی پلە و پایەی ئەندام مەکتەب سیاسیبوونی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە ساڵی ١٩٧٧دا. هەڵە کەسەمابۆنەکردنی بە هەر روویەکەوە بێت، مانەوەی لەو چەند گوندەی **برایم جەلال** وەک تانە و پلار بە کاری دەهێنێ، ئەگەر بەڵگەی سەربڵندی و بیرکردنەوەی قوڵی **ئارام** نەبێت، شتێکی دیکەی ئەوتۆ نییە. دیارە لە فەرهەنگی ئەو/دا، مانەوە و بنکەدانانەوەی سەرکردەیەکی مێژووکرد، بۆ خەڵکانی دیکە لە شوێنێکی دیاریکراو ئاساییە، بەڵام بۆ (ئارام)ی کوفر و نەکردەیە.
**برایم جەلال** لە پەراوێزی بیرکردنەوەی سێبەر و سایەی ژیانێکی ئاسایی، بەردەسەڵاتی کوردی ئەمڕۆدا، هاتوە زۆر بە سادە و ساکاری، مامەلە لەگەڵ کار و بیرکردنەوەی راستگۆیانەی رۆژانی لیقەومان، پڕ گرێکوێرەکانی نیوەی دووەمی حەفتاکانی **ئارام** و **هاوڕێیەکانی** دەکات. لەو چاوپەنایەیەوە ناحەقی هەتا لە مێژووی خۆی و تێکڕای کۆمەڵە دەخەملێنێ.
بەڵێ لەوێ رۆژاندا، کۆمەڵە، هاوڕێیە جەربەزەکانی لە شار و شاخدا، هەموو پشت و پەنای ئەو بیرکردنەوەی **ئارام** و **هاوڕێیەکانی** بوون. کە **برایم** ئەمڕۆ لەلای خۆیەوە نکۆڵی لێ دەکات و دەنووسێ کە گوایە ئەودەمە لە ریزەکانی کۆمەڵە دوو راوبۆچون هەبوە، سەبارەت بە کۆکردنەوەی خەڵک بۆ شۆڕش و چۆنیەتی هێزی پێشمەرگە!

(رایەکیان کە هی شەهید ئارام و سالار عەزیز بوو... کە پێویستە ئەم جارە شۆڕشی چینی کرێکاران و جوتیاران شۆڕشگێر بێ، دەبێ هەوڵ بدرێ بنکەی سوور دابمەزرێنرێ و لەناوچەی رزگارکراو خەباتی چینایەتی بەرپا بکرێ و کۆمەڵە بەتەنیاسەرکردایەتی بکات.) ل/١٠٨

بۆ ئەمانەتی مێژوو، دەبوو لە پێشەوە کە ئەو دەستەواژەیەی بە ئارەزووی بیرکردنەوە بێسەروبەرەکانی خۆی دارشتوتەوە، هەر هیچ نەبوایە، ئاماژەی بەو سەرچاوەیە بکردایە

که ئەم رایە بە ناوی **ئارام** و **هاوڕێیەکانی** دەگێڕتەوە! دواتر قوڵی لێ هەڵماڵیوە، لەبری ئەوان، ئەوەشی خستووەتە سەر و دەڵێ:

**(رایان وابوو، کە نابێ هاوکاری لەگەڵ _ عەلی عەسکەری، عومەر دەبابە، د. خالید، رەسول مامەند و کەسانی تری ناسراوی شۆڕشی ئەیلولدا بکرێ ...) ل/١٠٨**

من یەکێکم لەو هاوڕێیانەی ئەوێ ڕۆژانی کۆمەڵە، بە ڕۆژی ئاشکرا هەنووکەیش شانازی بە بیروباوەڕە ڕاستگۆ و بوێرەکانی ئەو دەمی **ئارام** و هاوڕێیەکانی دەکەم، بەلام نەوەک بەو دەستکاریکردن، شێواندنە پڕ ڕقوقینەیەی **برایم جەلال** مەبەستییەتی. چونکە ئەوە **تەها باراوی** وەک شاهیدێکی مەیدانی ئەوێ ڕۆژێ، لەو دیدەنییەی لە پاشکۆی ئەو نووسینە بڵاو بووتەوە، بە ڕاشکاوی بیر و کرداری مەیدانی **ئارام** دەگێڕتەوە، کە دروست بە پێچەوانەی ئەو قسانەی سەرەوەیە، یەکەمجار بوو لەسەر دەستی **ئارام**، برادەرانی بزووتنەوە **(عەلی عەسکەری و دکتۆرخالید و رەسول مامەند)** یەکەم جۆزەرەی هاوپەیمانی و نیمچەبەرەیی مەیدانی لەبری سەرکردایەتی ناوخۆی ولات لەنێوان کۆمەڵە، بزووتنەوە دامەزراوە. ئیتر نازانم **برایم** ئەو رایەی خۆی، کە (نابێ هاوکاری) برادەرانی بزووتنەوە بکرێ، بۆ ئاوا لە هیچ و خۆڕایی لە مل **ئارام** ناوە! کە نە خۆی لەوێ وجودی هەبووە و نەباس لە سەرچاوەیەک دەگێڕتەوە..!

بەڵێ **ئارام** بە هەناسەیەکی نوێ بەری لە خەباتی شۆڕشگێرانە گرتبوو. هەوڵی داهێنانی ستروکتورێکی پڕ بەپێستی قوربانی سەر ئێسک و پروسکی خەڵکی ستەمدیدەی رەشوڕووتی کوردی دەدا. هەموو جۆرە کۆپی کردنێکی ڕابردووی لێوانلێو لە فەشەل و قوربانی بەخۆڕایی لە قاو دەدا. **ئارام** بڕوایەکی تەواوی بە فەلسەفەی خەباتی چینی کرێکاران و زەحمەتکێشان هەبوو کە ئەمە نمانامەی ئەساسی دروستبوون و کەوتنە سەرپێیانی کۆمەڵە بوە. هەتا لەسەر دەستی **خالە شەهاب** و هاوڕێیەکانی. دیارە **برایم** ئەو ڕۆژەش بەهەڵە و ڕێکەوت بەگەر ئەو رەوتە کەوتووە، مافی تەواوی خۆیەتی، ئەگەر تەنیا بە ناوی خۆیەوە بینووسییایە، ئەو سەرەتایانەم قبووڵ نەبووە، نەوەک بەبێ ئەوەی وەکالەتی کەسی لە گیرفان بێت، بە ناوی کەسانی وەک، **عبدالرزاق و شازاد سائب و جەمال تایەر و فەیسەڵ تاڵەبانی و ئیحسان نەجم** را و بۆچوونە تازەکانی ئەمڕۆکەی هەرزان فرۆش بکات!

لە درێژەی خەملێندانەکانی ناو ئەو کتێبەوە، لەو بارەیەوە لەسەری ڕۆیشتووە و نووسیویەتی: (خەباتی چینایەتی بەڕیا بکرێ و کۆمەڵە بەتەنیا سەرکردایەتی بکات.) ل/١٠٨

ئەگەر ئەمە بیر و نووسینی **ئارام** بووە، بۆ **برایم** جوانتر نەبوو سەرچاوە و شوێنەکەی دیاری بکات! ئاوا بە گۆترە دەستکاری بیرکردنەوەکانی **ئارام** نەکات! چونکە بیری **ئارام** و نووسینەکانی لە دەمی راپەڕاندنی ئەرکەکانی کۆمەڵە، خەباتی چەکداری شتێکی تەلەسم و عەنتیکە نەبووە لە خەڵکی بشارتەوە، خەڵکانی وەک **برایم جەلال** بەدوای دەیان ساڵ بەسەر شەهیدبوونەکەی، بە مەزەندە و دەستکاریکردنەوە ئاشکرای بکەن. **ئارام** بە رۆژی ئاشکرا بانگی خۆی داوە، لەوەی کار بۆ ئەوە دەکات، کۆمەڵە ببێتە ناوکی پارتی پێشڕەوی کرێکاران و زەحمەتکێشانی نەتەوەکەی بۆئەوەی درێژە بەبەفیڕۆدانی قوربانییەکانی نەدرێ و لەلایەن بورژواکانەوە مامەلە بە خەبات و تواناکانیان نەکرێ و هەروەها بەردەوام ئەوەشی دوپات کردووەتەوە کە میللەتی کورد هێشتا لە قۆناغی رزگاری نیشتمانی دایە، بەجێگەیاندنی ئەو ئەرکە نیشتمانی، نەتەواتییە لە ئەستۆی بەرەیەکی یەکگرتووی ریزەکانی خەڵکی نەتەوەکەمان دایە، کە تێیدا هێزە وردەبورژوا و بورژوازی و جوتیارییەکان بەشدارن. ئەو ئەرکە قورسە بەتەنیا بە پارتی پێشڕەوی کرێکاران و زەحمەتکێشان مەیسەر نابێت، ئەوە قۆناغێکی مێژوییە دەبێ پێیدا تێپەڕین و ئامرازی پارتی پێشڕەویش بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکەکانی قۆناغەکە، هەبوونی لەشکری خەڵکە، واتە هێزی پێشمەرگەی شۆڕشگێڕ. ئەوانە پوختەی بیرکردنەوەکانی ئەوێ رۆژێی **ئارام** بوون. بەلام چ لەگەڵ شەرپێفرۆشتنی هەنووکەیی دەکەی کە لە بەرگی ئاڵوگۆڕییە ئایدیۆلۆژی، سیاسی و نەمانی **ئارام**، **هەڵوەشاندنەوەی** خودی کۆمەڵە قەزاوەتی ناحەقی دەکرێ! خۆزگە بە ئەمانەتەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ گێڕانەوەکانی ئەو سەردەم دەکرا، بەپێی عەقلییەتی داشکان، بیرکردنەوەی ئەم سات و زەمینە گۆڕاوە، بیرکردنەوەکانی (**ئارام**)ی ورد نەدەکرایەوە، بۆ مەبەستی شاراوە، نەدەشێواندرا!

**(کاک ئارام هەر لەیەکەم رۆژی چوونە دەرەوەی لەناو شارەوە، چووە دۆڵی قەرەداغ و خۆی لەسنوری ٨ ـ ٩ دێ یەکدا قەتیس کرد و کەوتە سەرپەرشتیکردنی مەفرەزەکانی ئەو ناوچەیە،) ل١٠٩/**

جارێ بۆ ئاگاداری ئەو برادەرە، وەک **تەها باراوی** دەیگێڕتەوە، **ئارام** یەکەمجار کە ژیانی موختەفی شاری جێهێلاوە، نەچووەتە ناوچەی قەرەداغ، بەڵکو لە دۆڵی جافایەتی گیرساوەتەوە، لە شانی مەفرەزە سەرەتاییەکانی ئەودەمی کۆمەڵە، کارنامەی خەباتی شاخ و شاری ئیدارەداوە. هەر لەوێیش دیداری لەگەڵ برادەرانی بزووتنەوە (**عەلی عەسکەری** و هاورێکانی ) بووە، دانیشتنەکانی پێکهێنانی سەرکردایەتی ناوخۆی ولاتی لەگەڵ سازداون،

بە چەندان مانگ لەو ناوچانە سوڕاوەتەوە و هەتا لە ناوچەی سەفرە و زەرون، کۆرسێکی سیاسی بۆ کادرەکانی کۆمەڵە کردوتەوە، خۆیشی لەپاڵ هاوڕێیەکانی دیکە، وانەی تێدا گوتووتەوە. پاشان بە مانگ جەولەی بە ناوچەکانی نزیک بە هەڵەبجە، شارەزور، شارباژێر کردووە. مەفرەزە چەکدارییەکانی شاخ، خەتوختوتی ڕێکخستنەکانی ئەو ناوچانەی بەسەرکردووەتەوە. لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٧یشدا جەولەیەکی دووروودرێژی بە بناری قەندیل، دۆڵی باڵەیی/دا کردووە، **ملازم عومەری** بە ژیان زیندوو هاودەمی بووە، لەو ناوچانە لەگەڵ مەفرەزە و هێزەکانی پێشمەرگە کۆبووەتەوە، ڕێنمایی کردوون، لە نزیکەوە چاوی بە هاوڕێیانی کۆمەڵە، **محمود سەیدە و عەولا ڕەش و قادر خەباتی** پێشمەرگەی دێرین، **پیرۆت نەبی و عەلی کۆیلە و تەیبەڕەش** کەوتووە. جێگای خۆیەتی ئەم بەسەرهاتەی خودی **ئارام** لەو ناوچانە بگێڕمەوە، تاکو **برایم** دڵی ئاوبخواتەوە:

> **"هێزێکی گەورەی یەکێتی لە گوندەکانی باڵەیی _ دەورووبەری ماونان و کەڵێتە _ بە بەشداری ئارام کۆبونەتەوە، ئێوارەکەی خەبەریان پێ دەگات، کە بەیانی هێزێکی گەورەی ڕژێم لە هەموو لایەکەوە پەلاماریان دەدات. بۆ شەوەکەی هەموو مەسئولە عەسکەرییەکانی ئەو هێزەی یەکێتی کۆدەبنەوە، هەریەکەیان بە ئارەزووی خۆیان، لەبری تەگبیری شەو هەڕوگیف دەکەن. ئەو دەڵێ من فلانە گرد دەگرم، سەربازەکانی دوژمن قڕدەکەم، ئەوی دیکەیان دەڵێ، ئەوێ باسکی دەگرم و هێزی ڕژێم تارومار دەکەم.. بە تەگبیری شەو قسەیەک بۆ ئارام ناهێڵنەوە.. بەیانی پێش خۆرەتاو بەپەڵەپڕووسکێ ئارام لە خەو بێ دێدار دەکەنەوە و خەبەری دەستپێکردنی هێرشی دوژمنی پێڕادەگەیەنن، پێی دەڵێن، تەگبیر چییە؟ ئارام _ یش بە بێ ئەوەی خۆی تەنگەتاو بکات، بە ئەسپایی دەڵێ، تەگبیر تەگبیری شەوە. _من ئەو زانیاری و بەسەر هاتەم لەدەمی تەیبەڕەش، قادر خەبات و چەندانی دیکە بیستوە".**

ڕاستە **ئارام** لە ڕووی جەستەوە، لەڕ و لاواز و چاوکزێکی چاویلکە لەچاو بووە، بەڵام مرۆڤێکی ریالیست، حازرنووکتە، هەمیشە دەم بە خەندە و ڕووگەش بووە. لەگەڵ دەوروبەرەکەی خۆی سادە، فیز و نازی بەسەر کەسەوە نەکردووە، هەرگیزیش لە خەبات و ماندووبوونی بێوچانی شەو و ڕۆژی شاخ و گوندی کوردستان بێزار، پەشیمان و بێ حەوسەڵە و قزگە تەسک نەبووە. توڕەوتوندی بە خۆڕایی و بێمونەسەبەی میوان نەبووە. بۆ جارێکیش فێڵی لە کەس نەکردووە، ڕاشکاوانە ڕای لە بەرانبەر هەموو کەسێک چ دۆست و چ نەیار، دوژمن دەربڕیوە. دوژمنی فشەکردن، خۆبادان بووە، ڕقی لە بەستنی فیشەکدانی زۆر، لە شانکردنی تفەنگی جوان و کەشخە بووە، جلوبەرگەکەی لەگەڵ

پێشمەرگەی ئاسایی جودا نەکراوەتەوە، بۆ خۆبانەدان بەسەر خەڵکی ڕەشوڕووت. هەرگیز لە بنکە و بارەگای تایبەتی بەرسیبەری دەسرازەیەک حیمایەی دەست و پێوەند خۆی نەدیوەتەوە، بەڵکو لە زۆربەی ئەو ڕۆژە سەختانەدا، بە ژمارەیەک پێشمەرگەی تاکوتەرا جولاوەتەوە، بەڵام بەوپەڕی وریایی و گورجوگۆڵی لە چالاکی خۆی نەکەوتووە. بە جۆرێک ڕژێم بۆ سەری هیچ مەسئولێکی شۆڕش لەو ڕۆژەدا خەڵاتی بە پارە جاڕ نەداوە، بەڵام بۆ سەری **ئارام**، هەروەک **تەها باراوی** بۆی گێڕاومەتەوە، ٥٠٠٠٠ دیناری تەرخان کردووە. ئەگەر قسەکانی **برایم جەلال** سەروسوکتێکیان لەگەڵ ڕاستی هەبوایە، دەبوو **ئارام** هەر بەزوویی لەو ٨ - ٩ گوندەی قەرەداغ تێدا بچووبایە، کە بۆ ڕێکەوتیش هەر لەو گوندانە بە ئاسانی شەهید کرا! چ لەگەڵ پێشهاتی نەخوازراو دەکەی، **ئارام** و **فوئادی مستەفا سوڵتانی** کە هەڵسوڕای سەرەکی کۆمەڵەی کوردستانی ئێران، بە ئاسانی شەهید دەبن، گەندەخۆر و بۆرەپیاوی بەرسیبەران دەکەونە سەر ڕەوسەی بەرهەمەکانی خەبات و قوربانیدانیان، بەبێ ئەوەی قەدرزانین، خوێندنەوەی بەر ویژدانێکی زیندوو بە بەرچاویانەوە بێت.

**برایم جەلال** ئەگەر تۆزێک حەوسەڵەی هەبوایە، بای سەرەداوێک خۆی لە شەڕی کۆنەڕقی بەسەرچووی تۆڵەسەندنەوەیەکی درەنگوەختی، پاش دەیان ساڵی بە جەستەنەمانی **ئارام**، خۆی دوور بگرتایە و بە هێمنی، چاوڕوونییەکی مرۆڤدۆستانە، ئەو دوو بەرگە کتێبەی لەلایەن **مەحەمەد سولەیی** لەسەر **ئارام** بە ناوی (**ئارام** و بزووتنەوەی شۆڕشگێڕی کرد) ئامادە کراوە کە بەشی زۆری یادەوەریی هاوڕێیان، بیرەوەری ئەو خەڵکە ڕەشوڕووتەی ئەو گوندانەیە، کە بە هەر شێوەیەک بێت، بە دیداری ئەو کەڵە پیاوە شاد بوونە. زۆر نزیک بوو **برایم** بەسەر شالاوی ڕقوقینەی قەتماخەگرتووی کۆنینە باز بدات، بە چاوی ڕەخنەگرێکی زەمان و زەمینی خۆی، بیروباوەڕەکانی تاووتوێ بکات، ڕێگای بە خۆی نەدەدا وا بەخۆرایی بەگژ قولەی قافی خەباتی **ئارام** دا بچێتەوە.

(نە شەهید عەلی عەسکەری بەوە قایل بوو، کە ئارام ڕۆڵی سکرتێری بگێڕێ و نە ئارامیش بە عەلی عەسکەری) ل/١٠٩

**برایم جەلال** کە نە خۆی لەوێ بووە، نە باس لە هیچ سەرچاوەیەک دەگێڕێتەوە بۆ ئەم قسە بێ ئەسل وئەساسە، بەڵکو تەنیا لە دەستی دووەم وسێیەم بیستوویەتی. دەنا ئەوە کەسێکی وەک **تەها باراوی** بە ژیان زیندوو و ئامادە لەو دانیشتنەی نێوان برادەرانی

کۆمەڵە و بزووتنەوە،[10] کە **ئارام** و **عەلی عەسکەری** بەشدار بوون، دروست بەپێچەوانەی هەڵبەستنەکەی **برایم** بووە.

لە گێڕانەوە بێ سەرچاوەکانی **برایم** دا، **عەلی عەسکەری** زۆر ناکۆک و نەیار بووە لەگەڵ **ئارام**، کە فڕی بەسەر راستییەوە نییە. لەنێوان ئەو دووەدا، پێوەندییەکی پڕ لە ریزگرتنی بەرانبەری یەکتری هەبووە، ئەوە **عەلی عەسکەری** بووە، بۆ یەکەمجار پێشنیازی ئەوەی کردووە کە **ئارام** وەک سکرتێری سەرکردایەتیی ناوخۆی یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان لە ناوەوەی وڵات دیاری بکرێت. تاکە شتێک لەسەری کۆک نەبوونە، مەسەلەی ئامر هەرێمی سەربازی ناوچەکانی سلێمانی بووە.

هیوادارم خوێنەر بە خۆی ئەو گێڕانەوانەی **تەها باراوی** کە خۆی لەو شوێنە، لەناو کۆبوونەوەکان بووە، لەگەڵ ئەوەی **برایم جەلال** کە خۆی لەوێ نەبووە، بەراورد بکات، تاکو رووی راستی ئەو بەسەرهاتانەی بەراستی بۆ دەرکەوێت.

(لە سەرەتاوە سەبارەت بە باڵادەستی کۆمەڵە لەناو مەفرەزە سەرەتاییەکان لە ناوچەکاندا، بەتایبەت لە ناوچەی قەرەداغ و هەڵەبجە و شارباژێڕ، برادەرانی کۆمەڵە کە کرابوونە ئەندامانی سەرکردایەتی ناوخۆی یەکتری _ ئارام، سالار، مەلا بەختیار، عومەر عەبدوڵلا، تالیب رۆستەم _ نەک هەر ئیلتزامیان بە بڕیاری کاری هاوبەشی و بەرەیی نەدەکرد، بەڵکو دانیان بە رابەری سەرکردایەتی نوێنەرانی بزوتنەوە _ عەلی عەسکەری، د خالید سەعید، رەسول مامەند، تایەر عەلی والی، سەعدی گچکە _ نەدەنا) ل/١٠٩،١١٠

**برایم جەلال** بۆ ئەو باسوخواسانە کە بەبێ هیچ سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە، وەک ئەوەی بە زەنگی دۆزینەوەیەکی نوێ، سەبارەت بە رووداوەکانی دەیان ساڵی لەمەوبەر، بەڵام لە زەمان و زەمینی هەنووکەدا، گوێچکەی خوێنەر بە دەستکاریکردنی ئەو هەواڵانەی لەم و لەوی بیستووە، پڕ دەکات و بێدادی **ئارام** و هاوڕێیەکانی لەو رۆژەدا، **هەنووکە** لە قاودەدات.

جارێ تێکۆشەرە ناوهێنراوەکانی ئەو سەروبەندە، لە برادەرانی کۆمەڵە، کەسانی وەک **ملازم عومەر** و **سالار** و **مەلا بەختیار** دەژین، دەکرێ بەرانبەر ئەو گێڕانەوە ناراستانە گوێیان لێ بگیرێت. من یەک بە خۆم هەر وەکو، **برایم جەلال** لەو شوێنە بە پراکتیک لەناو

---

[10] بڕوانە (پرسیارەکانی عەباس و وەڵامەکانی تەها باراوی) لە دوا بەشی ئەم کتێبەدا. تەها باراوی لە سوید دەژی، قسە و گێڕانەوەکانی ئامی هیچ جۆرە بەرژەوەندییەکی کاتی و بەرساباتی دەستکەوتی مشەی بە دەمەوە نییە، تەنیا لە بەرۆکی ویژدانێکی زیندوو دەخوێندرێتەوە.

رووداوەکان نەبووم، ئەوانە شاهیدی زیندوون و حەق وانییە بێدەنگەی لێ بکەن. تەنیا ئەوە نەبێت من لە ساڵی ١٩٧٧ لە دەمی خودی **ئارام** خۆیم بیستووە کە برادەرانی کۆمەڵە لە پێوەندییەکی هەڤاڵانەدان لەگەڵ برادەرانی بزووتنەوە، رەنگبێ وردە موشکیلەی ئێرەوئەوێ هەبێت کە بە زەمەن چارەسەردەبێت. بۆ مێژوو، هەر هەموو برادەرانی بزووتنەوە، هەتا **ئارام** لە ژیاندا بووە، دۆستایەتییەکی پتەو و هاوسەنگیان هەبووە، هەر **ئارام** ئامۆژگاری ئێمە و خەتەکانی دیکەی رێکخستنی ناو شارەکانی کردووە، کە هەریەکە و لەو ناوچانەی چالاکیمان، دەبێ هەموو هاوکارییەکی ئەو برادەرانەی بزووتنەوە بکەین.

هەرلێرەوەیش **برایم** لەگەڵ سەرلەبەری گوتەکانی خۆی یەک نایەتەوە، کە پێشتر زۆر بە لاساری دەڵێ، **ئارام** لەو چەند گوندەی قەرەداغ گیری خواردووە، گوایە تەنیا سەرپەرشتی ئەو چەند مەفرەزەیەی قەرەداغی کردووە! کەچی ئەم قسانەی خۆی لەبیرچووەتەوە و لەو رستانەی پێشەوە، باس لە نامولتەزیمیی ئەو مەفرەزانەی هەڵەبجە و شارباژێریش دەکات کە کۆمەڵە بوونە و **ئارام** رێنمایی کردوون.

بۆ ئەوەی **برایم** بە تێکرای ئەو هەڵگێرانەوانەی خۆی دابچێتەوە، جارێ لە پێشەوە کە کۆمەڵە بە دەستپێشکەری **ئارام** مەفرەزە سەرەتاییەکانی ناردووەتە دەرەوە، کە هەموویان ئەندام، لایەنگر و دۆستی کۆمەڵە بوون و لە شاخ، سنووری چالاکییەکانی خۆیان جێگیر کردووە. برادەرانی بزووتنەوە نەچووبوونە شاخ و هەرکە بریاری چوونە شاخیشیان داوە، هەر لەپێشەوە پێوەندییان بە (**ئارام**)ەوە کردووە و لەگەڵ **ئارام** و کۆمیتەی هەرێمەکان دانیشتوون، تەشکیلاتی سەرکردایەتی ناوخۆی وڵات، هەرێم و مەفرەزەی جۆربەجۆریان پێکەوە ناوە.

**(تەنانەت تا شەهید بوونی ئارام لە قەرەداغ بەشداری یەک کۆبونەوەی سەرکردایەتی ناوخۆی یەکێتی نەکرد.)ل/١١٠**

من یەک بە خۆم سەرباری ئەوەیش کە ئەم هەواڵەیش هیچ سەرچاوەیەکی پشتراستکردنەوەی لە هەمێزدا نییە، بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا دەپرسم: **برایم جەلال** مەبەستی لە کامە کۆبوونەوەی سەرکردایەتی ناوخۆی یەکێتییە؟ ئەوەی لەنێوان کۆمەڵە و بزووتنەوەدا کراوە، یان وا دیارە زۆرتر مەبەستی لەو کۆبوونەوانەی دۆڵی گۆستێیە کە بە بەشداری **مام جەلال** کراوە و **ئارام** بەشداری تێدا نەکرد. چونکە ئەو ئەگەر مەبەستی ئەوە بێت کە بە بەشداری برادەرانی بزووتنەوە بووە، ئەوە **برایم** لە بیری نەماوە کە پێشتر خۆی باس لەو کۆبوونەوانە دەکات کە لەنێوان کۆمەڵە (**ئارام** و **هاورێیەکانی**) و

بزووتنەوە (**عەلی عەسکەری** و **هەڤاڵەکانی**) لە شارباژێر کراوە و تێیدا بەشێکی زۆری ئۆرگانەکانی یەکێتی پێکهێنراوە.

**(بەڵام هاوڕێیانی کۆمەڵە شەهید شاسوار _ ئارام _ و نەجمەدین عەزیز _ سالار _، و حیکمەت محەمەد _ مەلا بەختیار _ و ئازاد عبدولمەجید _ عادل _ ئەمانە جگە لەوەی کە نەناسراو خاوەنی رابردوویەکی سیاسی، پێشمەرگانە نەبوون، و هەمووشیان ناوی خۆیان گۆڕی بوو)ل/١١١**

سەبارەت بە **ئارام** قسەم هەیە. **سالار** و **مەلا بەختیار** بۆخۆیان زیندوون. دەبێ پێوەرەکانی **برایم** دەربارەی؛ نەناسراو، رابردووی سیاسی و پێشمەرگەیی چی و چی بێ! چ پێوەندییەکی بە ناوگۆڕینەوە هەیە!

بە دڵنیاییەوە **برایم جەلال** دەزانێ کە خودی کۆمەڵە، نە ئەو هێزە ناسراوەی ناو کۆمەڵی کوردی بووە و نە خاوەن ئەزموونی خەرمانی رەوسەیەکی سیاسی تژی لە زیوان بووە و نە لەشکر و هێزی پێشمەرگەی هەڵوەشاوەی لێوانلێو لە پاشەگەردانی بووە. ئیتر بەپێی شەرعی ئەمرۆکەی ئەوبرادەرە، ئەو کادر و سەرکردانەی کۆمەڵە، کە لەو رۆژگارە سەختەدا، شانیان داوەتە بەر سەرلەنوێ سازدانەوەی رێکخستنەکانی کۆمەڵە، هەڵکردنی مۆمێکی سەرەتایی خەباتی چەکداری و لەدایکبوونی مەفرەزە سەرەتاییەکانی پێشمەرگایەتی. لە نموونەی **ئارام** و هاوڕێیەکانی خەڵکی عەیار بیستوچواری ناسراو، رابردوویەکی درێژوکانی سیاسەتچی و ساڵانێکی زۆری پێشمەرگایەتی نەبوون. نەدەبوو ئەم کارە بکەن. رەنگبێ هێشتا لەبیر و مەزەندە کۆن و نوێیەکانی ئانوساتی هەنووکەیی، سەرکردەبوون بە چەندان باتمانی سەرەنوێڵکی (سەرگوفەکدانی) قوتابخانەی کلاسیکی سیاسەتچییەکانی کوردەواری لەقەپان بدرێ . وا دیارە هەر دەبێ ناسراوی، رابردووی کەلەکەبووی سەر جۆخینی کوزری گەندەڵی، دەسرازەی پێشمەرگایەتی سەپانی پۆشێ، چرکی بە کاروانی خەباتی کوردانەوە گرتبێت. هەرگیز لە باوەشی نوێبوونەوە، لەقاودانی قەتماخەی برینەکانی جەستەی کۆمەڵی کوردی ئەو جۆرە سەرکردایەتییە، خەڵکی نوێ شانسی هەناسەدانی نییە!

راستە **ئارام** و بەشێک لە هاوڕێیەکانی خاوەن عەشیرەت و تەکیە و کورەدەسەڵاتدار و بنەماڵەی بەناوبانگی هەمێزی کۆمەڵێکی دواکەتوو نەبوون، تاکو ئەو ناسراوەی مەبەست بن. راستە ئەو برادەرانە لە سێبەری مامەڵە و مانۆڕی هەڵگێڕووەرگێڕی مەیدانی نەگبەتییەکانی کورد، رابردوویەکی ئەوتۆیان نەبوو. راستە لە بواری پێشمەرگایەتی لە هەموو شەڕ و نەبەردە سەربازییە دۆڕاوەکانی دۆزی کورد، چیرۆکی پاڵەوانبازی پڕ فشەی ناو کەندوی نەبینراویان لە باوەش نەبوو. بەڵام **ئارام** و ئەو برادەرانە ئەندامێکی

ساده، بوێری ریزەکانی کۆمەڵە و کۆمەڵی ستەمدیدەی کورد بوون. لەگەڵ رەوتی سیاسەتی حیزبە قەومییەکانی کورد کەوتبوونە گاگۆڵەکردن، بەکوێرەوەرییە زۆروزەبەندە ناهەموارەکانی ئەو رەوتە ئاشنا بوون. بەڵام **ئارام** بیروباوەڕی خۆی، کە بەبێ پێچوپەنا هەڵقوڵاوی رێبازی مارکسیزم _ لینینیزم بوو، لە پەراوێزی ئەو حیزبایەتییە سەقەتەدا جیا کردبوەوە، لە خەمی داهێنانی رێبازێکی نوێی دامەزراو، بەسترکتورێکی تازەی هەمێزی ئێش و ئازارەکانی خەڵک بوو. **ئارام** بە بیری وردی خۆی، هەر جۆرە کۆپیکردنێکی ئەزموونی بیرکردنەوەی ئەم و ئەو و لاساییکردنەوە و رەدوکەوتنی بیرکردنەوەی نۆرمی بەسەرچوی حیزبی کوردی رەتکردبووەوە. **ئارام** بە عەقڵێکی تازەهەڵقوڵاوی بەر خواستەکانی خەباتی نوێی خەڵک بۆ خەڵک بیری دەکردەوە، زۆر لە پێشەوەی ئەو زەخیرەیە بوو کە هەتا بە دەورووبەری خۆیەوە کۆ بووبوونەوە، پێویستی بە ساڵانێکی زۆر بوو، تاکو بەشێک لەو هاوڕێیانە بەو سەرمەشقە بیرکردنەوە رابهێنێ. **ئارام** دوور لە پێزانینی **برایم جەلال** رابڕدوویەکی سیاسی دە ساڵەی لەناو خەباتی قوتابیان و لاوان، مەیدانی رۆشنبیری و رۆژنامەگەری هەبوو. **ئارام** بە چەندان زمانی بیانی (روسی وئینگلیزی و عەرەبی و فارسی و ئازەری و ڤێتنامی) ناسیاربوو. بەڵێ راستە **ئارام** پێشمەرگەیەکی رەقوتەقی رووتەڵە بوو، دەرچووی هیچ ئەزموونێکی سەرقاپەداخراوی پێشمەرگایەتی کوردۆلۆژی نەبوو. بەڵێ **ئارام** لە رۆژی ئەزمە و لێقەومان سەرییەهەڵدا، بە رووی جەبەروتی هێزی بێشوماری بەعس، و بە دەستباری هاوڕێیە جەربەزەکانی مەفرەزە سەرەتاییەکانی چەکداری نارده شاخ، مژدەی لەدایکبوونی نوێیان بە گوێی خەڵکدا چرپاند. **ئارام** لەو مەیدانانەدا سەرکردەبوونی خۆی بۆ دۆست و دوژمن ساغ کردەوە. ئیتر ئەوە هەر **برایم جەلالە** بۆ بەختی کەچی خۆی، ئەو خەبات و ماندوو بونەی، بەخۆرایی و بێئەنجام بەدوای دەیان ساڵی لە ژیاندانەمان، ملی لە بەرملی لووتکەیەکی لەمجۆرە ناوە.

لە هەڵوەستەیەکی دیکەی تێرامانی قسەوقسەڵۆکەکانی **برایم جەلال** بۆ پەلاماربردنە سەر خەرمانی بیرکردنەوە و نووسینەکانی ئەو رۆژەی (**ئارام**)دا. بە هەموو توانای خۆی بۆ ناوزەدکردنی یەکلایەنییەی **ئارام** بە عیراقچی، هەڵگری بیرکردنەوەی لەم جۆرە، دەستی بۆ پەرەگرافێکی نوسینێکی **ئارام** بردووە کە لە ئۆرگانی کۆمەڵەدا، (ئاڵای شۆڕش) ژمارەی یەکەم بڵاو کراوەتەوە و دەڵێ:

**(سەبارەت بەوەی کە شۆڕشەکەمان بریتی نیە لە بزووتنەوەیەکی تەسکی نەتەوەیی گەلی کورد، بەڵکو شۆڕشی دیموکراتی گەلی عیراقە، و لە کوردستانەوە بەهۆی تەقینەوەی ناکۆکیەکانەوە و هەروەها لەسایەی باش هەڵکەوتنی خاکی کوردستانەوە دەستی پێ کردووە!)ل/١٦٠**

**برایم** وەک ئەوەی نەخش و نیگاری مەزەندە سەرچیخچووەکانی خۆی هەرزانفرۆش بکات، لێرەوەیش لە پێشەوە، ئەو گوتانەی خۆی بەبیر دەهێنمەوە کە هەر لەو کتێبەدا باسی دانانی یەکەم ئێزگەی دەنگی شۆڕشی عیراق لەسەر خاکی کوردستان دەگێڕتەوە، گوایە خۆی بەڕێوەبەری بووە. ئێزگەکە هەر لە یەکەم ڕۆژەوە لە سێبەری مەسئولبوونی خۆی، بەناوی ئێزگەی دەنگی شۆڕشی عیراق بووە. کەچی دەنگی لێوە نەهاتووە! و کەسیش تۆمەتی بۆ هەڵنەبەستوە.

ئەوەیش لە کەش و هەوای ئەوێ ڕۆژێ، ئەو نوسینەی **ئارام** بخوێنێتەوە، لە مانای سیاسەتکردنی ئەو ڕۆژەی **ئارام** دەگات، چونکە **ئارام** لە بنوبۆتکەوە، بای تۆزقاڵێک باوەڕی بە فشەکردنی سیاسەتی (ناوی زل و دێی وێران) نەبووە، هەمیشە لەگەڵ دەوروبەرەکەیدا، ریالیستیانە ئاوڕی بۆ هەموو لایەک داوەتەوە، گوتەکانیشی لە هەڵسوکەوتی سیاسی ورد کردووتەوە.

**برایم** کە ئێستاکە بەو تیزەی باوەڕی پێی هەیە، نووکی ڕەخنەکانی لەو نوسینانەی **ئارام** تیژ کردووە، بۆ عیراقچی بونی **ئارام** بانگاشە دەکات! وەک ئەوەی هەنووکە **ئارام** لە پەرلەمانی عیراقدا، خەڵات کرابێت، لەسەر ئەو عیراقچیبوونەی بە ئەندام پەرلەمانی عیراقی بە خانەنشینی شاباش کرابێت، چەفیە و عەگالی لەسەر نرابێت و بۆ یادگاری وێنەی گیرابێت!

**(شاسوار جەلال _ ئارام _ هەتا شەهید بوونیشی، نەبەو سەرکردایەتیەی یەکێتی قایلبوو، کەپێش هاتنەوەی مام جەلال لەسەری ڕێککەوتبوون لەگەڵ بزووتنەوەدا)ل/١٦٤**

نازانم **برایم** چۆن چۆنییەک لەبری **ئارام** ئەمە دەڵێت! چونکە **ئارام** لەپێش گەڕانەوەی مام **جەلالیش** بۆناوەوەی کوردستانی باشوور، بە هاوکاری برادەرانی بزووتنەوە، سەرکردایەتی ناوخۆی وڵاتی بۆ یەکێتی دامەزراندوە، چالاکانە لە بەڕێوەبردنی بەشداربووە. پاشان بە دژکەوتنی لەگەڵ ئەو قسانەی رابردووی کە گوایە **ئارام** (کۆمەڵە) و **عەلی عەسکەری** (بزووتنەوە) ناتەبا و ناکۆک بوونە ، ئەوەی ئێستاکە نووسیویەتی.. **(کە پێش هاتنەوەی مام جەلال لەسەری ڕێککەوتبوون لەگەڵ بزووتنەوەدا)**

**برایم جەلال** بە قورسایی ئەو کتێبە، بەردەوام هێما بۆ ئەوە دەکات کە خۆی لە وردودرشتی کۆمەڵە و شەرەفی یەکەم ئەندامبوونی بەدوای سێ ڕۆژ لە جاڕدانی کۆمەڵە _ وەک **فوئاد قەرەداغی** کەخۆی لەژیاندایەو یەکێک لە ئەندامەکانی دەستەی دامەزرێنەر

بوە، دەیگێڕتەوە.. کۆمەڵە کەپێکهات نەچارێ بۆدرا، نەهیچ بەیاننامەیەکیش بەبۆنەی دامەزراندنییەوە دەرچوە. _ (١٩٧٠_ ١٩٧٦) وکەچی لەلای برایم دامەزراندنی (سەرکردایەتی ناوخۆی ولاتی ینک) لە شاخەکان، یەکەم ئیزگەی دەنگی شۆڕشی عیراق، یەکەم مەفرەزەی شۆڕشی نوێ لە بناری قەندیل و چی و چیتر، خۆی بڕیاردەری سەرەکی بووە، خۆی قەڵەمڕەوی دانەری نەخشەکان بووە! بەڵام (وەک خۆی دەڵێ) سەبارەت بەهۆو فاکتەری گیرخواردنی ئارام لە هەشت نۆ گوندی قەرەداغ، برایم لە هەمبانەی ئەوهەموو زانیارییانەیدا، وشەیەک ناڵێ بۆ! کە ئەمە هەتا هەنووکەیش لەناو کەندووی داخراوی نهێنییە بڤەکان، کەسێک قسەیەکی لەبارەوە نەکردووە، هیوادارم ئەو برادەرانەی ئەو زەمانە، لەوبارودۆخە جەنجاڵە ناسیارن ، بەدوای دەیان ساڵی بەسەرچوو، لەو بارەیەوە قسەی خۆیان بکەن، چونکە درەنگ و زوو رووی راستییەکانی نەچونی ئارام بۆ کۆبوونەوەکانی دامەزراندنی سەرکردایەتی نوێی یەکێتی لە سەرسنوورەکان دەردەکەوێ، وەک دەیان تەلەسمی ناو دۆزی سیاسەتی کوردی ناهێڵرێتەوە. بێگومان ئەوەی ئارام بە جۆری سەرکرداتییەکەی یەکێتی (لەسەر سنوورەکان) و ئەو میتۆدانەی لەسەری دامەزرێنراوە، بە بیرکردنەوە، بە کەشوهەوای بەرمەیدانیبوونی کۆمەڵە، یەکنەهاتووتەوە، نیگەرانی بۆ هێناوەتە پێشەوە. چونکە یەکێک لە خاڵە سەرەکییەکانی بەرنامەی کاری ئارام وەک شۆڕشگێڕێکی داهێنەر، هەڵوەشاندنەوەی سترکتوری پێکهاتەی سەرکردایەتی کلاسیک (کۆنینەی)، هەڵوەشاندنەوەی ئەو میتۆدە بەسەرچووە بوو. ئارام تەنیا دڵی بە سەرکردایەتییەک ئاوی دەخواردەوە، کە لەناو ریز و هەمێزی ژان، دەردەسەرییەکانی بەرمەیدانیبوونی کۆمەڵانی ستەمدیدەی خەڵکەوە لە دایک دەبوو. نەوەک بە بڕیاری حازرەکی، دوور لەو واقیعە و بەپێی خەملینە لەمێژینە بەسەرچوەکانی نقومی ژێرباری گردێک لە فەشەل و پاشەگەردانی. ئارام وەک برایم جەلال دەفەرموێ:

**(لەناوچەی قەرەداغ و لەسنوری ٨ _ ٩ گوندی ناوچەکە دوور نەکەوتەوە، بەو هیوایەی ناوکی لەشکری شۆڕشگێڕ لەوێ دروست بکات.)ل/١٦٤**

بەڵێ ئارام یەکێک لە هەوڵە ئەساسییەکانی بۆ دروستکردنی لەشکری شۆڕشگێڕی نوێی کوردستان بوو، لە قولایی خاکی ولاتەکەی، دوور لە دەستتێوەردانی دەرەکی سەر سنورەکانی کوردستانی داگیرکراودا، کە ناوکەکەی لەناو جەرگەی کۆمەڵانی خەڵکی رەشوڕووت بڕسکێ و گەشە بکات. بەڵێ هەر ئەو سەرەتا هێمن و بە حەوسەڵەیەی ئارام بوو لە سەرپەرشتیکردنی مەفرەزە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە، دوایی بووە مایەی دامەزرانی

لەشکری یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان. بە دڵنیایەوە ئەگەر شەهیدبوونی بەسەردا نەهاتایە، ئەو ناوکە شۆڕشگێڕە سەرەتاییەی **ئارام** نەخشەرێگای بۆ دانابوو، بە ئاقار و ئاراستەیەکی زۆر تێروتۆکمەتر، ڕێگای گەشەکردنی سروشتی دەگرت.

**(شاسوار جەلال و نەجمەدین عەزیز و حیکمەت محەمەد لە سەرانی ناوەوە هەر لە یەکەم پێکگەیشتنیان کێشە ناوخۆییەکانی کۆمەڵەیان قووڵتر و سەختتر کرد.)ل/١٨١**

بنووسی کتێبی **چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە** هەر وەک بە پانتایی ئەو کتێبە لە بورجی عالی دانیشتبێت، چۆنی کەیف و ماشای هێنابێت، ئاوا جڵەوی سەربردەکانی سووڕاندووەتەوە! بە جۆرێک ئەو لە چەندان شوێنی ئێرە و ئەوێی ناو دوو بەرگی ئەم کتێبەدا، دەڵێ ئەورۆژە **شاسوار جەلال** کۆمەڵە نەبووە، **سالار** لە کۆمەڵە سڕکراوە! کەچی لەو ڕستەیەی سەرەوە تەنیا بۆ سوچدار دەرهێنانیان، ئەو گوتانەی خۆی لەبیر چوەتەوە، بە_ سەرانی ناوەوە _ بەناوە ئەسلییەکەی خۆیان وەک سەرکردەی کۆمەڵە دەیانخوێنێتەوە! هەر لەو ڕستەیەی سەرەوەدا، ئەوە بۆ یەکەمجارە، لەو کتێبەدا، باس لە هەبوونی کێشە ناوخۆییەکانی کۆمەڵە دەکات کە پێشتر، لە سەرەتای گێڕانەوەکانییەوە کەموزۆر خۆی لە قەرە نەداون، بە لێفەیەکی ئەستوور لە خوێنەری شاردوونەتەوە. دەبوو لێرەیشدا بای سەرەقەڵەمانەیەکی ئەو ناوهێنانە، هەندێک لەو کێشە ناوخۆیانەی کۆمەڵە لە رابردووو، ئەوەی **ئارام** و **سالار** (هەر لە یەکەم بەیەکگەیشتنیان کێشە ناوخۆییەکانی کۆمەڵەیان قوڵتر و سەختنر کرد.) بۆ خوێنەر تاووتوێ بکردایە، تاکو مرۆڤ بکاریبایە، زیتر لە رۆڵی **ئارام** و **سالار** بگەیشتایە، کە چۆن چۆنییەک ئەو کێشە ناوخۆییانەیان _ قوڵتر و سەختتر کردووە _ . دەبێ بمبوورن ئەگەر لێرەدا وەک شاهیدێکی زیندوو پرکێشی ئەوراستییەی ئەورۆژە بکەم. **سالار** و **مەلا بەختیار** بۆ هەنووکە هەرچییەک بن و لەبن چ دەوارێکی دەسەڵاتدار و بێدەسەڵات بن، لە پراکتیکی سەرجەلەی خەبات و هەڵسوکەتیان، بە هەر شێوەیەک کەوتوونەتەوە، بۆ من مەترەح و جێگای پرسیار نییە و خۆیان لێی بەرپرسیارن. بەڵام من لێرەدا بۆ ئەو هەموو ناحەقییەی **برایم جەلال** لە گێڕانەوەکانی، لەوان رۆژاندا ئەو دوو مرۆڤە گیانبازە، نموونەی فیداکاری و کۆڵەکەیەکی پتەوی دەستباری **ئارام** بوون بۆ خزمەتکردن بە کۆمەڵە، بەرپاکردنی مەفرەزە سەرەتاییەکانی خەباتی چەکداری بوون و سەرچاوەیەکی زیندووی نوسینەوەی ئەو مێژووە جەنجال و سەر بەگۆبەندەن.

(شاسوار جەلال، کە بڕوای بە کۆبوونەوەکە نەبوو، بەشداریشی تێدا نەکرد و لە بەری قەرەداغ نەجولا،)ل/١٨٢

**برایم** لە خولانەوەی خۆیدا، بەناو گێژەلوکەی بیرومەزەندەکانی خۆیەوە سوور دەخواتەوە، بەرۆکی شەڕفرۆشتنەکانی بە **ئارام** بەرنادات و بەناوی ئەوەوە (بڕوای بەکۆبونەوەکە نەبوو) ی بەخۆزگە گۆترەکانی خۆی لە ملی **ئارام** شەتەک دەدات! کە کەس نازانێ، بۆ و لە چ خۆڕادیتنێکەوە لەسەر ئەم لاسارییە سووورە! مادام بەناوی (**ئارام**)ەوە هەموو ئەو قسانە بەبێ بەڵگە دەکات، دەبوو جورئەتی ئەوەیشی هەبووایە کە هەر هیچ نەبوایە، خوێنەری بە پاساوێکی ئەو بڕوانەبوونەی **ئارام** بە کۆبوونەوەی لەم جۆرە ئاشنا بکردایە!

بۆ دڵنیایی **برایم جەلال**، **ئارام** کە بەشداری کۆبوونەوەی ناوبراوی نەکردووە ـ سەرباری ناردنی نوێنەرەکانی کۆمیتەی هەرێمەکانی کۆمەڵە لە بەشداریکردنی کۆبونەوەکە ـ بێگومان هۆکاری سەرقاڵی خۆی هەبووە. بەڵام من هەنووکە فالگرەوەی دەرخستنی بیرکردنەوەکانی ئەو ڕۆژەی **ئارام** نیم، مەزەندەکانی خۆم لەو بارەیەوە کە دواتر پێی ناسیار بووم، لە هەڵێک و لە زەمان و زەمینی گونجاوی خۆی دەخەمە ڕوو.

**ئارام** هەر هەڵوێستێکی هەبووبێت لە بەشدارینەکردنی ئەو کۆبوونەوانە، بەربەست و کۆسپ و تەگەرە جۆراوجۆرەکان هەر چییەک بوو بن، (**ئارام**)ی سەربڵند هەرگیز لە بەرانبەر هیچ کەس و هێز، سەرکردەیەکی دەستڕۆیشتووی ئەو ڕۆژگارە، نەچەماوەتەوە و لاری لەوە نەبووە، بەوپەڕی باوەڕ و باوەڕبەخۆبوونەوە، بە دەرخستنی بیروڕایەکانی، بەرنامە، نەخشەرێگای کارکردنی ڕاستگۆ و بە وەفا بووە، سڵی لە هیچ نەکردووە. ئەوەندە ڕەوشت بەرز، بیرتیژ و بە حەوسەلە بووە، هەمیشە لەگەڵ نەیارە فیکرییەکانی، خۆی لە شەڕی لابەلای دۆڕاو، نا زروری لاداوە.

**ئارام** کە مرۆڤێکی دنیادیتەی بیروباوەڕ گەش بوو، هەر هەنگاوێکی ناوە، چاک و خراپییەکانی لێکداوەتەوە، بەرژەوەندی گەل و ناسنامەی کۆمەڵە، سام و هەیبەتی خەباتی شۆڕشگێڕی لەو ڕۆژەدا لە بەرچاو بووە، لەسەرەوەی هەموو قازانج و پلەوپایەیەکی کەسی خۆی داناوە. بەڵام چ دەکەی لەگەڵ شەهیدبوونی ناوەختی ڕێکەوت، کتوپڕی ئەو کەڵە مرۆڤە هەست بەرزە، نەبوونی کەساتییەکی دیکەی هاونموونەی خۆی کە لەو بارودۆخە ناهەموارەی خەباتی سەختی چەکداری، هەتیومانەوەی کۆمەڵە، شوێنەکەی **ئارام** پڕ بکاتەوە! کە دواییش بە وجودی **برایم**، هەموو لایەک ئەنجامەکەیمان دیتەوە، ئەو "کۆمەڵە"یە لەسەردەستی ئەوانەی سواری ڕەوتی ڕووداوەکان بوون، بەزیندوویتی لە

گۆڕنرا و! برایم ورتەیەکی لە دەم نەهاتە دەرەوە، خۆ ئارام و بەشێک لە هاوڕێیەکانی لەمێژ بوو بە جەستە نەمابوون، بەشێکی دیکەشیان کە لاکەوتوو و پەراوێز کرابوون، هەندێکیش لەناو دەستکەوت و پلەوپایەی زەمانە نقوم بوون. بانێکە و سەد هەوا!

**ئارام** بە قوربانیدان و راستگۆییەکەی لە بەر رۆشنایی بیروباوەڕی خەڵکانی وەک **هۆشی منەی ڤێتنامی** و **جیڤارای** ئەمریکای لاتینی و بە رەتکردنەوەی خۆشیی کەسایەتی خۆیان لە ژیان و شاندانە بەر سەختترین خەباتی شۆڕشگێڕانە و بەلاوە نانی هەر پلەوپایەیەکی رووکەشی سێبەری دەسەلات و حوکمی ولات، وانە و نموونەی مەیدانی دژواری شۆڕشگێڕی خوڵقاند. **ئارام** هەر وەک ئەوەی وێنەیەکی کەسانی دانسقەی وەک **جەنەراڵ جیاب** و **نیلسۆن ماندێلای** نموونەی دەگمەنی مرۆڤایەتی بووبێت، سەرخۆشی کورسی حوکم، پارەپولی بێژمار و دەسرازە کۆشک و تەلاری زاقوزریق، کەژاوەی سەیارەی پڕ لە حیمایە و دەستوپێوەند نەبوو. بەڵکو **ئارام** بە سادە و ساکارییەکەی، هەستە رەشوڕوتییەکەی، کەسایەتییە تژی لە مەعریفە و خاوەن عەقڵە گەش و بەکارهاتووەکەی، سیمبۆلی شۆڕشگێری خەڵکێکی ستەمدیدەی خۆشی لەخۆنەدیو بوو. بە شەهیدبوونە تەنیابارییەکەی لە مەیدانی موقاوەمەتدا، ئەو سیمبۆلبوونەی خۆی بۆ مێژوو کردە میرات بۆ نەوەیەکی زیندووی سەرلەنوێی مێژوو و خوڵقێنەر کە مایەی شانازی هەموو مرۆڤێکی ویژدان زیندووە.

**برایم جەلال** لە پانتایی درێژەی گێڕانەوەکانی ناو کتێبەکەیدا، لەهەرکوێیەک فرسەتی بۆ خوڵقابێت، درێخی نەکردووە لە دەرخستنی خۆی، هەر کە باسی هێناوەتە سەر رێکخستنی شارەکان _ بەناوی کۆمیتەی شارەکان لەساڵی ١٩٧٥ بەدواوە _ خەرمانێکی خەیاڵی و بێبەرهەمی قیت کردووەتەوە، جارێک لەو جارانە، باسوخواس نابەتەوە سەر رۆڵی یەکێک لەو تێکۆشەرانەی _ چ بەژیان زیندوون و چ ئەوانەی شەهید بونە _ کە لە پەراوێزی دەستوەکەرییەکانی خۆی ناوی ریزکردون.

هەتا رۆژی دەرچوونەکەی خۆی بۆ شاخ، هەمیشە لەناو شارەکاندا، خۆی وەک سێکوچکەی قوناگردان خوێندوتەوە، لە پەنای فرسەتهێنان لە دەرچوونی برادەران _ **ئارام** و هاوڕێیەکانی _ لە شارەوە بۆ شاخ نووسیەیەتی:

(لە دوای چوونە دەرەوەی شاسوار جەلال و نجمەدین عەزیز و حیکمەت محەمەد کەریم و ئازاد عبدلمەجید، رێکخستنەکانی کۆمەڵە هێڵەکانی سەربەکۆمیتەی هەرێمەکان و کۆمیتەی شارەکان روبەروی چەند هاوڕێیەک کرانەوە، لەوانە عبدالرزاق لە هەولێر و ئەحمەد کرێکار و حەمید پۆلیس لەکەرکوک و شازاد سائیب و جەمال تایەر و بەندە لەسلێمانی.)ل/٢١٠

هەمو ئەو هاوڕێیانەی ناوی هێناون، بەپێی زانیاری من لەوێ ڕۆژاندا، تەنیا بۆمەبەستی خۆشکردنی ناراستی هەواڵی _ ئەو بەندەیە کە خۆی **برایم جەلال** دەگەیەنی _ لێرەدا خەبەرێک لە کەوتنی ناوی **ئەبو شەهاب** _ ئەندام کۆمیتەی شارەکان کە پێشتر لە سەرجەلەی گێڕانەوەکانی ناوی هێناوە _ نادات و لەبیری چوەتەوە کەباسی چونە شاخی ئەویش بکات.

پاشان هەر بەپێی ئاگاداری من، برادەران **سالار** و **مەلا بەختیار** و **دلێر سەرسپی** کە بەژیان ماون، لەو بارەوە زانیاری زۆرتریان هەیە و لەبری ئەوان قسەناکەم. بەلام لەبارەی ئەو برادەرانەی دیکەوە کە ناویانی ریزکردوە.. **عبدالرزاق** لەدوای نەچوون و پێوەندی نەکردنی بە کۆمیتەی هەرێمەکان وەک ئەندام لەو کۆمیتەیە و گیرانی لەگەل بەشیکی زۆری ئەندامانی رێکخستنی کۆنی کۆمەڵە لە هەولێر، هەتا ماوەی چەندان سالان لەو رێکخستنانە دوورکەوتوتەوە، خەریکی کاسبی بووە و دواتر لەگەل ئەو هێڵەی **کۆسرەت رەسول** تێکەڵ بە ڕێکخستنەکانی هەولێری کۆمیتەی شەهید **برایم عەزۆ** بوەتەوە. سەبارەت بە "**شازاد سائیب**"یش، دیارە **برایم** ئاگای لەو پەیڤانەی خودی **شازاد** نییە کە بەر لە کۆچی دواییکردنەکەی، کەنالی کوردسات دیداری لەگەل کردووە، خۆی وەک مرۆڤێکی رەوشت بەرز و راستگۆ، بە دەمی خۆی ئەوەی گێڕاوەتەوە کە ئەو لە خۆشەویستی **مام جەلال** و **شاسوار جەلال**، لە پێوەندییەکی شەخسی دابووە بە کۆمەڵە، هیچ رۆڵێکی لەناو رێکخستنەکاندا نەبووە، تەنیا لەو رۆژانەدا لە رووی لوجیستیکی هاوکاری **ئارام**، کۆمەڵە بووە. خودی **حەمە قەرەداغی** وەک شاهیدێکی زیندوو ماوە کە من لە رێگای ئەوەوە بۆ گەیاندنی پەیامەکانی **ئارام** لەساڵی١٩٧٦ لە دادگای سلێمانی، **شازادم** دیتوە و راسپاردەکانی (**ئارام**)م پێگەیاندوە. دواتر بۆ **جمال تایەر**/یش کە هێشتا **برایم سەرسپی** زیندووە _ یەکەم لێپرسراوی کۆمیتەی **هەڵمەت** _ لەناو شاری سلێمانی کەدیارە **برایم جەلال** لەپێناوی ئاشکرانەبوونی ناراستی قسەوقسەلۆکەکانی کەموزۆر ناوی ئەو کۆمیتەیە ناهێنێ کە لە کۆتایی ساڵی١٩٧٦ دروست بووە، سەرپەرشتی و گرتنەوەی تێکڕای خەتوختوتەکانی نەوەک هەر ناو سلێمانی، بەڵکو هەتا.ناوچەکانی دیکەیشی لە ئەستۆ بووە _ بەبێ ئەوەی نکۆڵی لەوە بکەم کەچەندان هاوڕێ و هێڵی پەرەوازەی ئێرەوئەوێ هەبوون کە هێشتا نەدۆزرابونەوە ، بۆ **حەمید پۆلیسیش** من زانیارییەکم لە لا نییە، بەلام تێکۆشەری خەباتی ژێرزەمینی ئەوان رۆژان، **ئەحمەد کرێکار** لە نزیکەوە ئاگادارم کە لە ساڵی ١٩٧٨ ەوە، وەک لێپرسراوی کۆمیتەی ئاگر لە کەرکووک، ئەندامی کۆمیتەی سەرکردایەتی ناوخۆی رێکخستنی شارەکان بووە.

له بەردەوامی خوێندنەوەی کتێبی (چەپکێک لەمێژووی کۆمەڵە)، له لاپەڕەکانی ٢٦٢ _ ٢٦٨ دا، بۆ بەسەروبالدا هەلگوتنی خۆی، لەپال (ئارام)ـەوە، پەلاماری هاوڕێی گیانی بەگیانی **شاسوار** وگەلێک له تێکۆشەرەکانی ئەوێ رۆژ، مامۆستا **عەزیز مەحمود** دەدا، ئەویشی بەدەردی **ئارام** بردووه که گوایه له چەند گوندێکی ناوچەی قەرەداغ دوور نەکەوتووتەوه! لێرەدا من تەنیا دوو دیمەنی بەرانبەر یەکتری لەو پەیڤە سەیروسەمەرانەدا دەخوێنمەوه.. لەو رۆژانەی **برایم جەلال** بۆ پێشمەرگایەتی له شار دەرچووه، هیچ خەبەرێک لەو ڕێکخستنانەی بەرقەلەمرەوی خۆی بەدوای مەرگی (**ئارام**)یشەوه نادات! و ئەوجا هەر لەگەل دەرچوونی بۆ ئەو شاخانه، یەک لەشکر پێشمەرگه بەدەوری خۆیەوه دەبینی، هێزەکانی دوژمن له بەرەکانی رزگارکردنی کوردستان، چنگ لەسەرچنگ تارومار کردووه، کوردستانی لێ پاککردوونەتەوه! کەچی له دیمەنەکەی دووەمدا، **ئارام و عەزیز مەحمود** و هاوڕێیەکانیان، وەک دوو کەلاکەوتووی رووت و ڕەجال له پەنادیواری چەند کوێره دێیەکی قەرەداغ، له کون و قوژبنان خۆیان شاردووەتەوه، کەس پێی نەزانیون. هەر بۆنموونه بەناوی (**مام رۆستەم**)ـەوه مانۆڕێکی سەربازی خۆیمان بۆ دەگێڕێتەوه که دوژمن لەبەر هەبوونی خۆی لەو ناوچەیه، ژیانی لەو پێشمەرگانه تال کردووه که بەدەوروبەرییەوه بوون، ناچار داوایان لێ کردووه **برایم** له ناوچەکەیان دوور بکەوێتەوه، تاکو لەم ڕاوه _ شێره _ رزگاریان بێت.

(لەنێوان بیروبۆچونی کۆمیتەی هەرێمەکانی عیراقچی پاشماوەی ناکۆکیەکانی سالانی ١٩٧١ و ١٩٧٢ که خۆی له ئارام و سالار وبەختیاردا، دەنواند. و لەنێوان سەرکردایەتی کۆمەلەی گیراو وکۆمیتەی شارەکانی کۆمەلە،)ل٢٧٤/٢٧٥

تەواوی هەموو لاپەڕەکانی ئەو کتێبه، مەگەر وشه و رسته بەتال و بێناوەڕۆکی ئێره و ئەوێی لێ دەرچێت، ئەو تۆمەتی عیراقچییەتەی بەبێ هیچ بەلگه و نیشانەیەک کردووەته بنیشتەخۆشه، بەردەوام دووپاتی دەکاتەوه، تاکه جارێکیش بۆ رووسپیکردنی کتێبەکەی، هێما بۆ سەرچاوەیەک ناکات.

من ئەوەندەی (**ئارام**)م لەسالی ١٩٦٩ تا ١٩٧٧ له شار و شاخدا دیتوه. **ئارام** هەمیشه بیروباوەڕی خۆی له کەس نەشاردوتەوه، هەموو جارێ دەیگوت:

"ئێمه دەبێ له خۆمانەوەو بۆ حەز و ویستی یەکلایەنەی خۆمان، بەبێ دیراسەکردن، دوور له چاولێکەری، رەدووکەوتنی کوێرانەی ئێره و ئەوێ، کۆپیکردنی ئەزموونی ئەم ولات و ئەو نەتەوه خۆمان سەرخۆش نەکەین. بەلکو تەنیا له ئەنجامی تۆژینەوەیەکی ئایدیۆلۆژی، ئابووری، فاکتەی سیاسی، رەهەندەکانی مێژوویی، هەتا جوگرافی، سایکۆلۆژییەوه، لەسەر مەسەله

چارەنووسسازەکانی وەک کوردستانیبوون پێ داگرین. بەڵام نەوەک بەو مانایەی کەسێکی نەیاری ئەو تێزە گەمارۆ بدرێ، هەناسەی لەبەر ببڕێن، چونکە ئەویش بۆ راست و دروستی باوەڕبوونەکانمان، جێگای ریزگرتن ومافی تەواوی دێباتی لەو بارەیەوە هەیە لە دەربڕینی ئازادانەی رای ئاشکرای خۆی." و زۆرجاریش دەیگوت: "ئەو هەویرە ئاوی زۆری گەرەکە."

**برایم** لەو دەستەواژەیەی سەرەوەدا کە دەڵێ: "سەرکردایەتی کۆمەڵەی گیراو و کۆمیتەی شارەکانی کۆمەڵە"، خۆی دەهێنێتە ئاست بڕیاردانی سەرانی کۆمەڵە و بەشداری دەکات، لە بڕیاردان لەسەر مەفرەزە سەرەتاییەکان! بەبێ ئەوەی نموونەیەک لەو بەشداریکردن و بڕیارانە لەناو کتێبەکەی دەربخات. تاکو لەو بۆڕبۆڕینەی خۆی، لەگەڵ **ئارام** قۆشمەی بکردایە، بەفیعلییش **برایم جەلال** لەو قۆشمەیەدا بەئەنجام لە **(ئارام)** ی بردەوە! ئەو کۆمەڵەیەی **ئارام**، سەرلەنوێ سازی کردەوە، خۆی و بەسەدان هاوڕێی کردە قوربانی، بە یەک بڕیاری خێرا و بەبێدەنگی **برایم** هەڵوەشێنرایەوە، هەموو لایەک سفر بە دەست، بێجگە لە شەهیدەکان، سەرسەلامەت و بە کۆمەڵێک دەستکەوت بۆی دەرچوون.

لە دوا وێستگەی بە خزمەتگەیشتنی بیروباوەڕە رەسەنەکانی **(ئارام)** دا، کە لە کتێبی ناوهێنراودا، **برایم جەلال** لە ئاست مانگەشەوی یادەوەرییەکانی **(ئارام)** دا دەستەوەستانە، تەنیا لەسەر گوفەکی رقوقینەیەکی پەنگخواردووەوە، شەڕی بەسەرچووی کۆنەڕق دەفرۆشێ. دەگەمە خاڵی کۆتایی، جارێ لێرەدا بەو ڕستە بێ ناوەڕۆکانەی ناو خودی ئەو کتێبە کۆتایی بە خوێندنەوەکەی خۆم دەهێنم..

(بەڵگەش، ئاڵوگۆڕی ئەو نامانەی نێوان من و ئارام و کۆمیتەی هەرێمەکانە.)ل/٢٧٥

لە پەراوێزیش تەئکیدی دەکاتەوە و دەنووسێ (سەیری نامەکانی نێوان شەهید ئارام و بەندە بکە لە پاشکۆی کتێبەکەدا.)ل/٢٧٥

---

بەڵام کە خوێنەر هەموو لاپەڕەکانی ئەو کتێبە دەخوێنێتەوە و چەند جارێکی دیکە لەگەڵ من، بەسەریان دادەچێتەوە، دەگاتە هەمان مەزەندەوە کە رەنگبێ پاشکۆی ناوبراوی کتێبەکە مشک خواردبێ! یاخود لە دەمی کۆبەستنی تێکرای کتێبەکەوە، لە لایەن ئەو فەڕاشەی زمانی لە **شاسوار جەلال** دابوو، وەک تۆڵەسەندنەوە، ئەم پاشکۆیەی کتێبەکەی قرتاندوە!

## سەرجەلەی ناسیاری و هاوڕێیەتیم لەگەڵ ئارام دا..

ئەوەندەی بیر و هۆشم یارمەتیم بدات، خوێنەر دەبەمەوە ژێر ساباتی یادەوەرییەکانم لەوان ڕۆژانەی بابایەکی هەرزەکاری دەستوپێسپی، لە سەرەتای تەمەنی گەنجێتیدا بووم ، وەک هەرزەکارێک لەناو گەمەی جەنجالی سیاسەتچییەکاندا، هەنگاو بە هەنگاو لە هەواری یەکەم ناسین بە کەسایەتی ئەوێ ڕۆژانی خۆم لەگەڵ **شاسوارجەلال**، دواتر لە بەرۆکی ئەڵقەرۆشنبیرییەکانی سەرەتایی کۆمەڵەوە، بە ئاشنابوونێکی زۆرتری هاوڕێیانەی ئەو مرۆڤە، ئەوجا کەوتنە ژێر کاریگەریی ئەفسوناوی دەمولوتفی شەوێکی ژیانی موختەفیی **ئارام** لەناو شاری سلێمانیدا ڕاڤەدەکەم. من نایشارمەوە بە درەنگەوە لە بەژنوباڵای بەدەگمەنی بیر و فەلسەفەی خەباتی (مارکسیزم-لینینیزم)ی **ئارام** گەیشتم. ئەوەیش زۆرتر بۆ ئەو تامەزرۆییەی تێکۆشان، بۆ نەتەوەکەم و سەرخۆش بە کەشوهەوای بەستەزمانانەی خۆم دەگێڕمەوە. کە تەنیا مایەی سوولێبونەوە، سەرەڕۆیی منداڵکارانەی تەمەنێکی پڕ لەشپرزەیی دروستبونی کەسایەتی دەلەمەیی و دەمدەمی دوور لە هۆشیاری ئەودەمی خۆم شۆڕدەبێتەوە.

جیهانی نائاسایی **ئارام** لە پێشەوە، لەگەڵ کۆمەڵێک هاوڕێی جەربەزە، لەو ڕۆژانەوە دەستی پێکردووە، کە بوێرانە ڕچەی چیراوکەیەکی کەرەسیسەهەڵهاتووی قوتابخانەی سەرانی کۆنەپارێز و بەتەنگەوەبوونی، گیانی خۆیان لە کاروانی تێکۆشانی کوردان شکاندوە. کە گوایە نابێ سەرکردە، لە هەموو جۆرە ڕووبەڕوو بونەوەیەک سەرچڵی بکات، بەرانگژی مەترسییەکان ببێتەوە ـ کەچی **ئارام** لەبەرانبەر جەبەروتی ڕژێمی بەعس، بەری لە خەبات گرتووە، لەبری زیندووکردنەوەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە، نەخشەرێگای سەرەتاتکێی موقاوەمەتی سەرلەنوێی بۆ نەتەوەیەکی ستەمدیدە داڕشتوە..

ساڵی ١٩٦٩ بوو، بۆ یەکەمجار لە کۆنفرانسی ناوخۆیی یەکێتیی قوتابیانی کوردستاندا/ لقی هەولێر، بە دیداری **شاسوارجەلال** گەیشتم. شاسوار بە هاوڕێتی **فازیلی مەلا مەحمود**، (سەرۆکی یەکێتی قوتابیانی کوردستان) و **ئازاد تەیب**، وەک ئەندامانی سکرتاریەتی ئەو دەمی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان، سەر بە باڵی مەکتەبی سیاسی. لەگەڵ **جەمیل ڕەنجبەری** بەرپرسی لقەکە، کۆنفرانسەکەیان بەڕێوەدەبرد. ئەو کۆنفرانسە لەو دەمی تەمەنی ئێمەی خوێنگەرم، تازە فەرێککردووی دەمڕیان، بەسەرهاتێکی نوێ بوو. بەگوێرەی زۆربەی بەشداربووەکانەوە، ئەوە یەکەم کۆبونەوەی فراوانی لەو چەشنە بوو، تێدا بەشداربین و ببینین. لەو ڕۆژەدا بەبێ ئەوەی ئێمەی گەنج و بێئەزموون، کە تەنیا دڵسۆزی و کۆششی بێپەروا هەموو سامانی تێکۆشانە پیشەیی و سیاسییە سەرەتاییە بێ

پەناوپێچەکانمان بوو. بەبێ ئەوەی بە مانۆڕی سەرکارەکانی پارتی (باڵی م. س لە هەولێر بزانین و لێی تێبگەین) بۆ مێژوو دواتر بەندە لە ڕێگای **مەحەمەد سلێمان**/ی خزمم پێی ئاشنا بووم، ماوەیەک بوو چەپکێک لە کادر و ئەندامە ئەکتیڤ و خورتەکانی ریزەکانی پارتی لەناو شاری هەولێردا، بە یاداشتێکی تێروتەسەل سەبارەت بە کاروکردەوە ناشیرین و گەندەلییە بێشومارەکانی مەسئولە سەرەکییەکان، لە نموونەی **مەلاماتۆر** و **لەتیف بەرزنجی** و **حەمەئەمین فەرەجی** پارێزگار و دەستوپێوەنەدەکانیان، کەوتبوونە هەڵوێستوەرگرتن. ئەو دەمیش وەڵامدانەوەی ئەو مەسئولانە، بەدوای هەڕەشە و ترساندن، تەنیا سزادانی تەجمیدکردن و دوورخستنەوەی ئەوگرووپە بوو. (ئەو ناوانەی لە بیر ماون.. **عەبدوڵلا پەشێو، حەیدەر هەمزە، مەحەمەد مەنگوڕی، مەحەمەد سلێمان، جلال فتح الله، محمود سلمان، عەزە گورگە**.. هتد) دیارە بەشێکی ئەوقوتابیە گورجوگۆڵانەی ئەودەم کە ئامادەی ئەڵقەلەگوێی، بەردەوام کۆیلە و کوڕەعاقلەکەی حیزب نەبون. لەلایەن بۆرەپیاوەکانی ئەو مەسئولانەی لەپێشەوە ناوم بردوون، بە گومانی لایەنگری، هاوڕێتی لەگەڵ ئەو برادەرانەی سزادرابون ـ بەبێ ئەوەی ئەو قوتابیانە بەخۆیان پێی بزانن و تەنیا سوچەکەیان لەچایخانەی وەسمان بەیەکەوە دادەنیشتن ـ جێگای ڕەزامەندی نەبوون، لەگەڵ ڕەوتی پاشەگەردانی و گەندەلی سەرکەلاکی خەباتی خەڵک یەکنەدەهاتنەوە، ئەو زاتە سمێلسۆرە ملۆزمانەی حیزب، مانۆڕی ئەوەیان دارشتبوو، چەندان قوتابی چالاکی وەک (**محسن، حەمەدئەمین، ئازاد، مهدی، عەباس، جوهر، هوشیار، جەلال، خوناو، کوردستان**.. هتد بەلاوە بنرێن و نەبنە نوێنەری کۆنفرانسی گشتیی عیراق، کە لە هۆلی خولد لە بەغداد گیرا و کۆنفرانسی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان کە دوایی بە هۆی دەرچوونی بەیانی ١١ی ئادار هەر نەبەسترا. بەڵێ کوڕە عاقلەکانی حیزب لەو کۆنفرانسەدا، لەپاڵ چاوسوورکردنەوە لە هەندێک و دانەخۆرەکردنی چەند قوتابییەکی دیکە، گەرەکیان بوو هەروا بە چاوبەستەکی مانۆڕەکە تێپەڕێنن. بەپێی خواستی لیستی ناوی پێشنیازکراوی حیزب کە ئەوەندە لەخۆڕادیتە بوون، ناوە ویستراوەکانی ئەو قوتابییانەیان خوێندەوە، بە تەزکییە پەسند بکرێت و پێویست بە هەڵبژاردن ناکات. بەلام لێرەدا چەند قوتابییەک پەنجەمان بەرزکردەوە، کەچی **جەمیل رەنجبەر**، کە دوایی بە خۆی بۆی گێرامەوە فرمانی پێکرابوو، کە لە ریزی برادەرانی بەرێوەبەری کۆنفرانسەکە دانیشتبوو، دەنگی هەڵبڕی و رێگای قسەکردنی لەو قوتابییانە گرت، تاکو رای خۆیان بڵێن. بەکورتی گەرەکی بوو بە خشکەیی پێشنیازەکەی حیزب بپەڕێنێتەوە! بەلام لەناو ئەو برادەرانەی سکرتارییەتی قوتابیان، **شاسوار جەلال** کەوتە قسە و زۆر بە هێمنی و قەناعەتەوە، بەری لەو تێپەڕاندنە بلەزە گرت، بواری بۆ ئەو قوتابییانە خۆش کرد، کە ئەوانیش رای خۆیان بڵێن. ئەوەبوو

بەندە، **موحسن و حەمەدئەمین** قسەمان کرد. مادام ئەوە کۆنفرانسی قوتابییانە، وا باشترە بۆ بەرژەوەندی حیزبیش کە زۆربەمان رۆڵەی ئەو حیزبەین، بەبێ دەستتێوەردان، لێرە لەناو کۆی قوتابیانی ئامادە، هەڵبژاردن بکرێت. دیاربوو ئەوە بۆ ئەو برادەرانەی بەرێوەبەر بەس بوو، لەناو خۆیان کەوتنە فسکەفسک، بەدوای چەند چرکەیەکەوە، دیسانەوە **شاسوار** کەوتە قسەکردنەوە. و گوتی: "**برادەرینە بە هۆی گوێگرتنمان لە خوێندنەوەی راپۆرتەکانی کار و چالاکیی ناو قوتابیانی هەولێر، جێهەنجەی کۆمەڵێک قوتابی گورجوگۆل دیارە، دەبێ گوێ لە دەنگ و را و بۆچوونەکانیان بگرین، ئێمە هەردوو پێشنیاز دەخەینە دەنگدانەوە، ئەوەی جەمیل رەنجبەر (لیستەکەی حیزب) و ئەوەی ئەو چەند قوتابییە.**" ئیتر ئەو کوڕە عاقڵانەی حیزب دەستێکیان کەوتە پێش و دەستەکەی دیکەیان کەوتە پاش، بە ناچاری و بە نابەدڵی ملکەچی ئەو بڕیارە بون.

هەڵبژاردنەکە کرا و ئەنجامەکەی لەلایەن **شاسوار جەلالەوە** راگەیەنرا، بۆ برادەرانی حیزب دەرکەوت کە مانۆڕەکەیان فاشیل بوو، دەنگی قوتابییەکان بردییەوە و دواتریش زۆربەی نوێنەرەکان هەر لەو قوتابییانە هەڵبژێردران کە بەکوڕە گوێڕایەڵەکان نەدەژمێردران. من بەدوای چەندان ساڵ لە عەقلپێداشکانی **شاسوارجەلال** گەیشتم کە بە چ جۆرە زیرەکی و ژیرییەک بووە مایەی لەبارنەبردن، مایەپوچدەرنەهێنانی خەباتی ئێمەی قوتابی دەستوپێسپی، ئەوقوتابییانەی تەنیا دڵسۆز و راستگۆبوون لە تێکۆشاندا، پاکی و دڵسۆزییان هەر لە قەڵبەزەی هەڵقولاوی بەر ئەو جۆگەلە ئاوە سازگارەی دەکرد، کە بۆ تێنوێتی شکاندنی بەیاری وشکوبرینگی خەباتگێران خۆیان هەڵدەکوتی. بۆ بەندە و ئەوانەی دیکەیش، یەکەم وانەی لێفێربوونی سەرمەشقی تێگەیشتنی دیموکراتییەت بوو. هەر لێرەیشدا دەسرازەی هۆش و بیرم بە لای خۆشویستنی **شاسوار**، رێچکەی بەستووە.

هەر لەکۆتایی ساڵی ١٩٦٩دا، نوێنەرانی هەڵبژاردراوی لقی **هەولێری** (ی. ق. ک)، بە لێپرسراوێتی **جەمیل رەنجبەر**، بۆ بەشداریکردن لە کۆنگرەی یەکێتیی نیشتمانیی قوتابیانی عیراق، لە هەولێرەوە بەرەو بەغدادی پایتەخت بەرێکەوتین. ئەوجارەیان لە کەوشوهەوای ئەو کۆنگرەیەدا، زۆرتر لە نزیکەوە بە دیداری **شاسوار جەلال** گەیشتین، بەتایبەت لە رۆژانی کۆنگرەدا، لە هۆلی خولد. هەمیشە دەوروبەری **شاسوار** قەرەبالغ بوو، هەموومان بە تاسە و پەرۆشەوە، گوێمان لە پەیڤەکانی دەگرت. ئەویش وەک مرۆڤێکی خاکی و بە حەوسەلەی روحسووک، بۆ وەلامدانەوەی پرسیار، روونکردنەوەی سەرنجەکان و رەواندنەوەی تەمومژی مەترسی و نیگەرانییەکانمان حازربەدەست بوو. لەو کۆنگرەیەی قوتابیانی سەر بە رژێمی بەعس، **شاسوار جەلال** وەک بزێوترین نوێنەری قوتابیانی کوردستان، لە رووبەڕووبونەوەی هزر و ڕاڤەی رەگەزپەرستانەی نوێنەرە بەعسییەکان،

له سه‌پاندنی ئه‌و بیروڕایانه‌ی خۆیان گه‌ره‌كیان بوو. **شاسوار** له ریزی پێشه‌وه‌ی ئێمه‌دا بوو، یه‌كسه‌ر ده‌هاته وه‌لام، بواری تێپه‌ڕاندنی بڕیاره شۆڤێنییه‌كانی ئه‌وانی نه‌ده‌دا، به ئاره‌زووی خۆیان شتمان به‌سه‌ردا بسه‌پێنن، له نموونه‌ی كوردستانینه‌بوونی كه‌ركووك و ناوچه‌كانی دیكه‌وه. راسته له كۆنگره‌كه‌دا، كۆنترۆلی هۆڵه‌كه، هێنان و بردنی لیژنه‌كان، هاتوچۆی نوێنه‌ره‌كان به ده‌ست جه‌ندرمه‌كانی رژێمه‌وه بوون، به‌لام هه‌ڵوێستی چاونه‌ترسانه‌ی تێكڕای نوێنه‌ره كورده‌كانی ناو كۆنگره، سه‌رسامی كردبوون، به‌تایبه‌ت كه‌سانی وه‌ك **شاسوار**، **فازیلی مه‌لامحمود**، **عه‌زیز مه‌حمود**، **یاسین ئه‌نوه‌ر** كه‌ركووكی، **جه‌عفه‌ر عه‌بدولواحید**، **انیس صابر حكیم**. وه‌ك مرۆڤێكی كوردپه‌روه‌رو ولاتپارێز، له‌گه‌ڵ هه‌موو جۆره هه‌ڕه‌شه و چاوسووركردنه‌وه‌یه‌كی نوێنه‌ره به‌عسییه‌كان، بوونه رابه‌ری به‌رێوه‌بردنی ئه‌و كۆمه‌ڵه قوتابییه‌ی كورد له كۆنگره‌كه‌دا. بۆ تۆزقالێك سه‌باره‌ت به خواست و مافه ره‌وایه‌كانی قوتابیانی كوردستانی سه‌ودایان نه‌كرد.

له‌بیرمه ئه‌و ده‌مه‌یش **شاسوار جه‌لال** سیمبۆلی گورجوگۆڵی بوو، له گفتوگۆ و دیباته‌كانی نێوان عه‌ره‌ب و ئێمه‌ی كورددا، به‌رده‌وام رێنمایی ده‌كردین كه نه‌ترس و هێمن بین. ئێوارانیش كه بۆ پشوو بۆ شوێنی حه‌وانه‌وه‌مان ده‌گه‌ڕاینه‌وه، هه‌میشه سه‌ری لێنه‌ده‌بڕین، به‌رده‌وام له‌گه‌ڵمان خه‌ریك بوو، سه‌رجه‌می ئاریشه‌كانی ناوكۆنگره‌ی بۆ شی ده‌كردینه‌وه، به شێوازه پڕ له هێمنی و حه‌وسه‌له‌كه‌ی، وانه‌ی به‌ره‌نگاربونه‌وه‌ی فێر ده‌كردین، كوڵنه‌دانی بێوچانی بۆ راڤه ده‌كردین. ئه‌و رۆژه‌م هه‌رگیز له‌بیر ناچێته‌وه، كه گرژی و مشتومڕه‌كانی ئێمه و نوێنه‌رانی عه‌ره‌ب له‌و كۆنگره‌یه‌دا گه‌یشتبووه ترۆپكی له‌یه‌كترازان، له‌گه‌ڵ دوا كاته‌كانی مانه‌وه‌مان له هۆڵی خولد. راسته سه‌ره‌تا **فازلی مه‌لامحمود** به‌ناوی سه‌رجه‌می نوێنه‌رانی قوتابیانی كوردستان، به هه‌نگاوی بوێرانه چووه به‌رده‌می مایكی به‌رێوه‌بردنی كۆنگره‌كه، تاكو دوا په‌یامی ئێمه‌ی قوتابیانی كورد به كۆنگره‌كه رابگه‌یه‌نێ. هه‌ر چه‌نده مرۆڤێكی تابلێی قسه‌زان و چاونه‌ترس بوو، به‌لام كه ئینفعالی ده‌كرد قسه‌ی بۆ نه‌ده‌هات، به‌دوای هه‌ندێ وشه‌ی پچڕپچڕ نوتقی ته‌واو گیراو، لێره‌دا **شاسوار** هه‌ر زوو له‌شوێنه‌كه‌ی خۆیه‌وه رابوو، گه‌رماوگه‌رم مایكه‌كه‌ی گرته ده‌ست، له‌به‌رده‌م تێكڕای ئه‌ندامانی كۆنگره و نوێنه‌ره‌كانی به‌عس، به‌ده‌نگێكی دلێرانه و زولال، ئه‌و په‌یامه‌ی راگه‌یاند، كه ئێمه‌ی نوێنه‌رانی یه‌كێتیی قوتابیانی كوردستان، به‌وپه‌ڕی ئیختیار و ئاره‌زووی خۆمانه‌وه، بڕیارماندا كه له‌و كۆنگره‌یه بكشێینه‌وه، هیچ جۆره ئیلتزامێكمان بۆی نابێت، چونكه كۆنگره‌كه سوور بوو له‌سه‌ر به كوردستان نه‌خوێندنه‌وه‌ی كه‌ركووك و خانه‌قین و ژه‌نگار وشێخان.. هتد

گوتەکانی **شاسوار** لەو شوێنە، لە بەردەم نوێنەرەشۆڤینییەکانی بەعس، لە پایتەختی دەسەڵاتە خوێناوییەکەیان. بە گوێچکەی هەموو لایەک، بیستنی دەنگێکی نوێی بەرخۆدانی کوردان بوو. گوتنەوەی ئاوازی موقاوەمەتی بەگوێدا چرپاندین. بەرەنگاربونەوە و کوڵنەدانی لەناو دڵ و مێشکمان چاند.

بەدوای وەرزی ساڵی نوێی خوێندنی ١٩٧٠ بەندە بوومە قوتابیی زانکۆ لە بەغداد. لێرە بەدواوە نزیکتر و زۆرتر بە جیهانی **شاسوار جەلال**، ئەو ئینسانە بێفیز و بێنازە ئاشنا بووم. کە دیارە هاوڕێتی **عزیزمحمود** و **یاسین ئەنوەر**، پردی بەهێزی ئەو ئاشنایەتییە بوو. ئەو مرۆڤە بە پێچەوانەی زۆربەی خەڵکانی دیکەوە، بەبێ جیاوازی شار، زاراوەی پەیڤین، پۆشتەیی، یان رووتەڵەیی، هەموو ئینسانێکی خۆش دەویست و دەستی هاریکاری بۆ درێژ دەکرد. هەر لە سەرەتای ئەو رۆژەوە وەک من دیتبێتم، بەدەگمەن یەکێک بووبێت، کە لەگەڵ رابواردنی جەستەیی، خواردنەوەی مەیخانە و رازاندنەوەی مێزی مەیخۆری، لە شانی رەوشت بەرزیی کۆمەڵایەتیی ئەو یەکنەدەهاتەوە. نەوەک بەو مانایەی باوەڕێکی ئایدیایی هەبووبێت، بەڵکو ئەوە سوخەت و ئاکاری تایبەت بە خۆی بوو. من بەدوای ساڵان لەوە تێگەیشتم، **شاسوار جەلال** لەو مەیدانەیشدا، لە سۆنگەی کەسایەتی هەڵکەوتووی بەدەگمەنی خۆی، گەرەکی نەبووە بە چاولێکەری ئەم و ئەوی رەفیقەکانی، لاسایی ئێرە و ئەوێ هەڵسوکەوت بکات.. زۆر دژی کۆپیکاریی ئەزموونی خەڵکانی دیکە بوو. هەمیشە تایبەتمەندی شێوازی داهێنەرانەی خۆی لەژیاندا چەپکەگوڵی یەخەی بووە .

کۆتایی ساڵی ١٩٧٠ لەلایەن قوتابییان **عەزیز مەحمود** و **یاسین ئەنوەر** کە دوا ساڵی خوێندنی زانکۆیان بوو، دەنگۆی دامەزراندنی رێکخستنێکی نوێی چەپ بە گوێمدا چرپێنرا، لە هەمان کاتدا بە هۆی ناسیاوی کۆنینەمان لەگەڵ **ئەرسەلان بایزیش** کە ئەو دەمە لە ساڵی سێیەمی خوێندنی زانکۆدا بوو، لە لایەن ئەویشەوە باسی لەدایکبوونی کۆمەڵەم بۆ کرا. ئەوە بوو لەپێناوی پاراستنی نهێنییەکان، بۆیەکەمجار لەلایەن **نەریمان محمود** خانەقینی لە چایخانەیەکی میللی بەرانبەر قاوەخانەکەی (المربعە) بە رەسمی بۆ کارکردن و چوونە ریزی کۆمەڵەوە رێکخرام. بەڵام بۆ ماوەیەکی کورت، دواتر خرامە بازنەیەکی رۆشنبیری لەگەڵ خودی **شاسوار جەلال** کە ئەودەمە ماڵەکەی لە گەرەکی (المسبح) بوو. ماوەیەک هەر دوو هەفتەی جارێک لەو ماڵەدا، بۆ دوو سەعات وەک شاگردێک بابەتەکانی ئەو بازنە رۆشنبیرییانەی کۆمەڵەی بۆ شیدەکردمەوە، چونکە ئەو دەمەیش **شاسوار** خاوەن بیر و هوشیارییەکی زەنگین بوو. من لە شانی ئەودا بە سەرەتاکانی مارکسیزم ــ لینینیزم کەوتمە گاگۆڵەکردنەوە، دەتوانم ئێستاکەیش بەدوای ئەو هەموو ساڵەوە، لە پاش شەهیدبوونەکەی، لە گۆڕنانی ئەو کۆمەڵەیەی **ئارام** و دەیان و سەدان هاوڕێ، بۆی بوونە

سووتەمەنی. ئەو چەند سەرەواوەی لە بەردەستی **شاسوار**، لەبری ئەو ماوەی لە لای ئەو لە ئەڵقەی رۆشنبیری کۆمەڵە فێری بووم و لێی تێگەیشتم، بوەهەوێنی ساختمانی هۆشوبیروباوەڕم ، لە پانتایی هەموو ئەزموونی داهاتووم، دڵسۆزی و پاکی، بە هەڵوێستبوون و نەترسی، دەستپێشکەری و قوربانیدان، کۆڵنەدان و دەستبەخۆدا شۆڕنەکردنەوەی سێبەری بەعس، لەپاڵ سەرەتاکانی ئەو رۆشنبیرییەی لە **ئارام** فێری بووم، بۆ من گەنجینەیەکی لەبنەهاتوو بوون و پێیەوە ئاسودە و سەرفرازم . چونکە ئەڵقە رۆشنبیرییەکانی کۆمەڵە، لە سەرەتادا زۆر بە جیددیی هاوڕێیان خەریکی خۆپەروەردەکردن و فێربوون بوون. بەڵام لە نموونەی **شاسوار** زۆر نەبوون، کە مەبەستییان خۆفێرکردن، دیراسەکردنی قوول و تێگەیشتنی مەنهەجی، فیربوونی مەعریفی بوو. کاریگەری کەسایەتی جیهانە گەورەکەی ئەو، مژدانەی هەڵهێنانی ئاسۆیەکی نوێی ئەو رۆژەی بەرچاوی من بوو.[11] دەتوانم بڵێم؛ لەوێ رۆژەوە کەسایەتی **شاسوار** منی لەناو باوەشی زرەخەونی دەوروبەرم راچڵەکاند.

ئەو دەمانە **شاسوار** وەک رۆژنامەنووسێک لە رۆژنامەی هەفتانەی هاوکاری دەستبەکار بوو، کە مرۆڤی سەربڵندی کورد، **حیلمی عەلی شریف** بەرێوەی دەبرد. کە من بەدوای ئەو جارانەی سەردانی ئۆفیسی رۆژنامەکەم کردووە، لە نزیکەوە بە دیداری ئەو ئینسانە کوردێزان، هێمن و ورد و زیرەکە گەیشتووم، لە بیرمە کە دووجاران لە شانی **شاسوار** خۆیەوە بووە، بە چاکی بەوە ئاشنا بووم کە **حیلمی عەلی شریف** چەند پیاوێکی بە مەعریفە و خاوەن سەلیقەیەکی چەند تەڕ و ناسکە و چەند خۆشلوتف و شارەزا لە زمان و ئەدەبیاتی کوردییشە، ئەوەندەیش سادە و خاکییە. لەو بارەوە کاریگەری بەسەر ئاسۆی بیرکردنەوە و پراکتیکی رۆژانەی **شاسوار** داناوە. لەگەڵ ئەوەیش **حیلمی عەلی شەریف** و **شاسوار جەلال** لە پانتایی بیرکردنەوە دوو کەسی جیا بوون، **شاسواری**ش ئەو دەمە هەواداری بیروباوەڕی ماویزم بوو، کەچی **حیلمی** باوەڕی بە ماویزم نەبوو. من بەدوای دەیان ساڵی بە جەستە نەمانی **شاسوار جەلالی** نەمر، لەوە گەیشتووم کە ئەو رۆڵە بە دەگمەنەی خەڵکی کورد، لە هەمێزی باوەڕی بە فەلسەفەی خەباتی چینە بەلەنگازەکانەوە، نموونەکانی کەسایەتی بەئەزموونی ناو کۆمەڵی کوردیش کاریگەری خۆیان بەسەر بەرجەستەبوونی ئەو کەساتییە دانسقەیەی کاروانی خەباتی **شاسوارەوە**

---

[11] راستە ئەودەم من لەو ئاستەدا نەبووم بۆ هەزمکردنی بەشێکی ئەو زانیارییە بەرفراوانانەی ئەو، بەڵام جۆری باسوخواسەکانی ئەو بوو، گروندی ئەو بیروباوەڕەیان لە لام بنیاد ناوە و هەتا هەنوکەیش لەگەڵیاندا دەژیم.

هەبووە، کە **حیلمی عەلی شریف** لەو بوارەدا بەشێکی زۆری بەرکەوتوە و بەیەکەوە کتێبەکانی (کیم ئیل سۆنگیان) یان وەرگێڕاوە بۆ سەر زمانی کوردی و بە یارمەتی سەفارەتی کۆریای باکوور بە چاپیان گەیاندوە.[12] وەک دەڵێن قافی هاتووە، بەدوای خوێندنەوەی گەلێ یادەوەری، سەبارەت بە خەباتی چەکداریی کوردان لە کوردستانی رۆژهەلاتدا و ئاشنابوون بە بالای بڵندی شۆڕشگێری ماندوونەناسی نەمر (**مەلا ئاوارە**)وە، بەوەئاشنابوم کە **شاسوار** لەپاڵ خۆشەویستی بۆ **هۆشی مەی ڤێتنامی**، **هۆگری دیوێکی** زیندووی هەڵسوکەتی کەساتییەکی کەموێنەی وەک **مەلائاوارە** بووە. وانەکانی خەباتی دژواری رۆژەسەختەکانی ئەو بۆ **شاسوار** نمانامەیەکی زیندوو بووە، لە رۆژە تەنگەکانی ١٩٧٦ _ ١٩٧٧دا و داهێنەرانە و بەشێوازێکی گونجاوی نوێ، لە ژیانی رۆژانەی مەرگەساتی ئەو دەم، دەرسی لێ وەرگرتوە ولەرۆژەسەختەکانی پێشمەرگایەتی١٩٧٦-١٩٧٧ پیادەی کردووە. بەتایبەت شێوازی خەباتە پارتیزانییەکەی. چونکە ئەگەر بۆ رووخسار و ناوەرۆکی ئاکارەکانی **مەلا ئاوارە** و **شاسواردا بگەڕێینەوە** و بەقەد یەکتریان بگرین، ئەوە زۆر بە ئاسانی خاکیبوون و ئەزیەتبارنەکردنی خەڵکی گوندی و باوەڕبوون بە رێکخستنی خەڵک، خۆئامادەکردن و دابینکردنی کەرەستەکانی خەباتی چەکداریی درێژخایەن و پشتبەستن تەنیا بە خەڵکی رەشوڕووت و چەوساوە و هتد... لەیەکچوونێکی زۆر لەنێوان ئەو دوو کەساتییە سیمبۆلبوونەی چەپکەرایی ناو هەناوی کۆمەڵی دواکەوتووی کوردی دەبینرێ. دەمێنێتەوە ئەوەیش بڵێم، کە ئەوەندەی بە بیرم دێتەوە، **شاسوار** ناوی **مەلا ئاوارەی** وەک شۆڕشگێرێکی زەمانوزەمینی خۆی دەناسی، هەمیشە سۆزی شۆڕشگێری بەرانبەری هەبوو. یەکێک لە سوخەتە هەرە شیرینەکانی **شاسوار** ئەوەبوو، کە لەگەڵ یەکێک دادەنیشت، سەرەتا لە نزیکەوە گوێی دەگرت، هەتا قسەی خۆتی نەبیستایە، قسەی خۆی نەدەکرد. بە دڵ لەگەڵ خەڵک تێکەل دەبوو. لەوێ رۆژانی ساڵی ١٩٧١ کە بەندە قوتابییەکی رووتەلەی ئەوێ دەمی بووم، سەری مانگان کە **شاسوار** مووچەکەی وەردەگرت، زۆربەی جاران بە **هاوڕێتی عەزیز مەحمود** و **یاسین ئەنوەر**، بۆ خۆشترین ریستورانت داوەتی دەکردین. دەیگوت با ئێوەی قوتابی بەلەنگازیش ژەمە خواردنێکی تێروپڕ بخۆن. زۆر چاکم لە بیرە لەو رۆژانەی ژیانی بەغداد، **شاسوار** بە پێچەوانەی هەموومان، زۆرکەم بەدەرەوە بوو، بە دەگمەن **هاتووچۆی** باڕی شەوانەی دەکرد، بەڵکو وەختی خۆی لەگەڵ خوێندنەوە و دیراسەکردن دەگوزەراند. بەهرەیەکی پڕ زیرەکی لە زمانفێربوون و تێگەیشتنی زانستی، تیوری و مەعریفی هەبوو. لە ژیانی

---

[12] ئەم زانیارییەم زادەی سەرنجی خوێندنەوەی رەشنووسی یادەوەرییەکانمە لەلایەن فوئاد قەرەداغییەوە.

ڕۆژانەیشدا خاکی و سادە دەژیا. ئەوەندەی من **ئەو شاسوارە** بێنازەم ناسیبێت، کەم مرۆڤی ئەوەندە نەرمونیانم لە خەباتکردن دیوە، زۆر درەنگ، یاخود لەخۆڕایی تووڕە نەدەبوو، گەر تووڕەیش ببوایە، لە جێگای خۆی تووڕە دەبوو، بەڵام بەپێچەوانەی بەشێکی زۆری مەسئولە حیزبییەکانی کۆن و نوێی حیزبی کورد، هەرگیز پەیڤی ناشیرین و جنێوی بازاڕی، تانە و نەشتەر بەسەر زمانییەوە نەبوو.. **شاسوار** لە گاڵتەکردن و قسەی خۆش نموونەی کەم بووە، بەڵام لە دەمی گاڵتەکردنی دووڵایەنە و بەس. من کە سوخەتەکانی هێمنی و لەسەرخۆیی پشوودرێژانەی، بەتایبەت وەختی ناخۆش و لێقەومانی تەنگانەی١٩٧٦ بە بیر خۆم دەهێنمەوە، لە سوخەت و ئاکاری ڕۆژانەی هەڵسوکەوتی هەندێک لەوانەی ڕۆژێک لە ڕۆژان خۆیان بە هاوبیر و هەڵگری پەیامە پیرۆزەکەی **ئارام** خوێندووتەوە، موچڕکی شەرمندەیی بەهەمو جەستەمدا گوزەردەکات. ئەو ئاکارە سەرەتاییانەی مرۆڤ، ناسنامەی هەڵسوکەوتی ناو ئەو خەڵکە بوو کە بۆیان سووتا و گیانی خۆیان لەپێناویاندا بەخت کرد.

**شاسوار** ئینسانێکی بوێر و بە جورئەت بوو، بەڵام نەوەک بە هەڵەشەیی و هەڕوگەفی خۆگێڤکردنەوە، شتەکانی تێکەڵوپێکەڵ نەدەکرد، هەر شتەی لە شوێن و زەمانی خۆیدا هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکرد. لەپاڵ چاونەترسییە کەموێنەکەی، مرۆڤێکی هەناسەدرێژ و بە حەوسەلە بوو، دوژمنی باوککوژەی خۆویستی و خۆپارێزی ترسنۆکانە بوو. ئازایەتی ئەو لە ڕووبەڕووبونەوە دەردەکەوت، هیچ ڕەشەبای هەڕەشەوگوڕەشەیەکی بەرسێبەری دەسەڵاتی ملۆزمانە دەرەقەتی نەدەهاتن، لەوەی باوەڕبوونەکەی تووشی لەرزۆکی بکەن، یاخود بە دەمچەورکردن و مانۆڕی مەکرۆیانە لێی زەوت بکەن. خۆشەویستی بۆ چینە چەوساوەکانی نەتەوە و وڵاتەکەی ئەوەندە بە بڕشت بوو، لەدەمی تەنگانەدا، هەرگیز بیری دەربازکردنی گیانی تایبەتی خۆی پێینەوێراوە.

لە باوەشی ئەو خۆشەویستی و ڕێزگرتنە ڕاستگۆیانەی بە هاوڕێ، برادەرەکانی و دەوروبەری دەبەخشی، زێدەڕۆیی ناکەم، ئەگەر بڵێم لە ئەزموونی ژیانی خۆمدا زۆر بە دەگمەن هاوچەشنی دەبینم. چونکە بەندە لە ڕێگای خودی ئەوەوە بە جیهانی ڕۆژنامەگەری ئاشنابووم، چ بە هاندان بۆ خوێندنەوە و دەستگرتن لە چاککردنەوەی ڕەشنووسەکانی و هەوڵدانم بۆ بڵاوکردنەوە، یارمەتیدانم بۆ کارکردن لە ڕۆژنامەی هاوکاری و ڕۆژانەی برایەتی، ئەو دەم لە بەغداد.

ساڵی ١٩٧٤ کە بەشێکی بەرچاوی هاوڕێیانی کۆمەڵە، بە بنکردایەتی و سەرکردایەتییەوە، بەشداری خەباتی چەکدارانەی خەڵکی خۆمان کرد. پێوەندییەکی ڕێکخراوەیی و هاوڕێیەتییەکی لە جاران گەرموگوڕترمان هەبوو. ئەو جارانەی چ بۆ

کۆبوونەوە، یاخود سەردانی برادەرانە، دەچووومە بنکەکەیان لە **بابەکراوەی** تەنکیشی دەربەندی رایات، زۆربەی جاران بە پیادەیی و بەجووتە ملی ڕێگامان دەگرت، هەتاکو دەگەیشتینە هەواری حەوانەوەی لە ئاقاری گوندی (زینویێ شێخی)، بەدەم ڕێگاوە قسەکانی خۆمان دەکرد. ئەو ئینسانە گەورەیە ئەو دەمەیش، سەرباری ئەوەی کە لە بواری مەعریفی و هۆشیاری ئایدیۆلۆژی، بواری ڕێخکراوەیی و رامیارییەوە، زۆر لە پێشەوەی من بوو، کەچی گەلێکی لە لاناسایی بوو، کە من بۆ کاری ڕێکخستن لەگەڵی کۆ دەبمەوە، بەڵکو هەمیشە لەسەر خەبات و کۆڵنەدان هانی دەدام. هەر بە هاوکاری و هەولدانی ئەویشەوە، بەندە لە مامۆستایی کردنەوە، گوازرامەوە بەشی ئێزگەی دەنگی کوردستان.

هەنووکەیش لە بیرم نەچووە، لە ساڵی ١٩٧٥، لەدوای خۆتەسلیمکردنەوەمان بە دەسەلاتدارانی بەعس، من چومەوە بەغداد و دواساڵی خوێندنەکەم بە کۆتا هێنا. چەند جارێک لەگەڵ **شاسوار** ڕێکەوتی یەکترمان کرد، منیش وەک ئەو بۆ ئەو خۆتەسلیمکردنەوەمان بە رژێم نارازی بووم، ئەوەم بۆ درکاند کە نیازم هەیە واز لە کۆمەڵە بهێنم. زۆری هەول لەگەڵ دام ئەوکارە نەکەم، کۆمەڵە بێجگە لە خەباتی شۆڕشگێڕانە، **هیچ** ڕێگایەکی دیکەی لەبەردەم نییە، لەو ماوەیەی داهاتودا کۆمەڵە پێ دەنێتە ڕۆژانی خۆساغکردنەوە و وەرچەرخان. وا باشترە بە ڕاپۆرتێک را و سەرنجە رەخنەگرانەکەم بەرز بکەمەوە. ئەوە بوو راپۆرتێکی توندم بە زمانی ئەودەمی (توندڕەوانەی سیاسی خۆم بۆ لیژنەی سەرپەرشتی کۆمەڵە نووسی، هەنووکەیش لەبیرم نەچووە لە رەستورانتەکەی بەشی ناوخۆی (دارالطلبە) لە (الباب المعضم) تەسلیم بە **برایم حسین** (حاکم برایم)م کرد، کە ئەودەمە لەبری ئە‌ەر(فەرهاد) شاکەلی ببوە ڕێکخەرم لە ناو ڕێکخستنەکانی کۆمیتەی بەغداد. من دواتریش **هیچ** وەلامێکی راستەوخۆم وەرنەگرتەوە، بەیەکلایەنی بۆ ماوەیەک لە کۆمەڵە (تەنزیماتی بەغداد) دابڕام کەزۆر بەخێر بۆم گەڕایەوە، چونکە ئەو برادەرانەی لە بەغداد لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانی رژێمەوە گیران، نزیکەی پێنج شەشێکیان ئیعترافیان لەسەر بەندەیش کردبوو، بەلام هەر ناوی یەکەمی منیان بە چاکی دەزانی، تەنیا یەکێکی هەولێرییان بەناوی کۆنی باوکم و خۆم (عەباس شێخ مەحەمەد) ی گوتبوو. هەروەها شوێنی حەوانەوەشمیان نەدەزانی. ئیتر نەگیرام و مێش میوانم نەبوو. **ئەرسەلان بایز** بە ژیان ماوە، ئەو دەمە ئەرکی بەڕێوەبردنی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی لە پارێزگای هەولێر خرابووە سەرشانی، وەک ناسیاوی کۆن و رەفیقی لەمێژینە، زۆری لەگەڵ هەولدام، کە بگەڕێمەوە ناو شیرازەکانی ئەو ڕێکخستنەی هەولێر، رۆڵی خۆمی تێدا ببینم، بەلام بەو دڵەڕاوکێ و گومانە پڕ نیگەرانییەی لە لام پەیدا

ببوو، ئامادەی ئەوکارە نەبوم. لێرەیشەوە بە هۆی دوورەپەرێزیم لە ڕێکخستنەکان، بەڵام وەک دوو هاوڕێ بە تەنیا یەکترمان دەدیت، هەتا لە دەمی ڕاکردنەکەی هەتا ڕۆیشتنەکەی بۆسلێمانی، لە ماڵەکەی ئێمە خۆی شاردبوەوە و ئەو دەمە من بۆ سەربازی ڕەوانەی _ المسیب _ کرابووم. لەگەڵ شاڵاوی ئیعترافاتەکان نەگیرام.

هەر دوو هەفتە دەبوو، وەک کارمەندی کۆمپانیای مریشکەوانی باکوور لە هەولێر دەستبەکار بووم لە مانگی ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٧٥، **ئارام** لە ڕێگای **عەزیز مەحمود** پەیامێکی کورتی بۆ ناردبووم، لە دەوام بووم **قادر مەولوودی** کارمەندی دواجن پێیڕاگەیاندم، **عزیز** لە فلانە شوێن چاوەڕوانی تۆیە. بەدوای دیتنی مامۆستا لە بەردەم ئۆرزدی هەولێر، وەرگرتنی پەیامەکەی **ئارام**، بەبێ ئەوەی بۆ هیچ بیانویەک خۆم بگرخێنم، لە چوونە سلێمانی و دیداری **ئارام** خۆم بدزمەوە، هەر بەزوویی لەگەڵ مامۆستا بۆ سلێمانی بەڕێکەوتم. سەرباری ئەو بارودۆخەی بەسەر کۆمەڵە هاتبوو، تامەزرۆی دیداری **ئارام** بووم، بە ئەرکی سەرشانی خۆم زانی، لەو جۆرە بارودۆخە دژوارەدا بەدەنگییەوە بچم. بۆ شەوەکەی هەر لە ماڵی **عزیز** لە گەڕەکی سابونکەران، شەودرەنگ بە دیتنی **ئارام** گەیشتمەوە، بەڵام ئەوجارەیان بە نهێنی و لەژیانی خەباتی موختەفیدا. لەبیرم ناچێتەوە، **ئارام** بەهاوڕێتی **عزیز** لێمان بەژوورکەوتن، کە من و یادی بەخێر دایکە کلۆلەکەی مامۆستا بەیەکەوە دانیشتبووین. **ئارام** جلێکی مورادخانی زستانەی لەبەر بوو، بەو شەوە لە بەرچاوی مندا، هەر لە تەلەسمێکی شاراوەی جیهانێکی بێسەروبن دەچوو. دەموچاوێکی گەشی پڕ لە خەندە و بە ڕوومەت، سەرباری ئەوەی تووشی بارگرانی ناهەمواری کۆمەڵە ببوو. پاش چاکوچۆنی و پرسین لە جۆری ژیانم و کەسوکارم، بە دڵێکی کراوەی تژی لە میهرەبانی بەرخۆدانی هەمیزی کۆڵنەدان، باسوخواسەکانی مەبەستی ئەو یەکتردیتنەی بۆ ڕاڤە کردم. هەر لە سەرەتاوە بەوە دەستی پێکرد و لە پێشەوە بەدەنگێکی هێمن، هەناسەیەکی درێژ سەرجەلەی ئاریشە ناوەکییەکانی کۆمەڵەی بۆ شی کردمەوە. ئەوجا گوتی عەباس لە لای ئێوە لە هەولێر وشەی (نوچ) نەدان بوەتە مژدانەی پێشەنگی کارنامەمان، دەبێ بەر لەنوچدان بگرین، نەسرەوتن بکەینە خاڵی وەرچەرخان لە کاروانی پرکۆسپ و تەگەرەی بێشوماری تێکۆشانمان، ئێمە دەستەیەک لە ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمان لەو ڕۆژەدا، دیارە قەدەرمان بەوە ناونووس کردووە، کە بازووی مەردانەی لێ هەڵمالین، لێنەگەڕێین کۆمەڵە لەناو کەلێنی دەستان بەربێتەوە. دانیشتنەکەمان دووبەدوو، هەتا سەعات چواری بەیانی بوو، بەبێ ماندووبوون، زۆربەی کات ئەو قسەی دەکرد. باسەکان هەمە چەشن بوون. شێوازی قسەکانی ئەوەندە کاریگەر بوون، منی لە هەموو هەستونەستێکی خۆویستی دابڕاند بوو، بە جۆرێک تێکەل بە گوێگرتن و سەربۆلەقاندنی

کردبووم، بەبێ ئەوەی بە خۆم بزانم، لەسەر ئەو نەخشەرێگایەی بۆی وێنا کردبووم، خۆم تەسلیمی کردبوو. پێشتریش من ئەو مرۆڤەم خۆش دەویست، بەڵام لەو تاوەدا، هەستم کرد جۆری ڕیزگرتن و خۆشەویستییەکەم، بۆ دۆخی پێوەندییەکی گیانی بەگیانی گەشەی کردووە. لە دڵەوە بە یەک بەیەکی قسەکانی، بە جۆرێک پەرچی کردبووم، لە قووڵایی دڵمەوە پێیانەوە شاگەشکە ببوم، دوور لە هەر نیگەرانییەک، گوێنەدان بە هەر جۆرە مەترسییەک، بۆ بڕیاردانی بەپەلەی ژێر کاریگەری جیهانە ئەفسوناوییەکەی پەلکێشی کردم، لە ئامادەیی خۆم بۆ هەر ئەرکێک، ئەو بۆمی دیاری بکات. هەنووکە کە ئەو بەسەرهاتە دەگێڕمەوە، موچرکێکی تەزیو سەرتاپای جەستەمی تەنیوەتەوە. بەراستی دەمم تەتەلە دەکات، وشەکانم لە ئاست ئەو دەمی هەڵوێستی نەترسانەی **ئارام**، ڕوتەلەیەکی دەستوپێسپیی وەک خۆم سەرەتاتکێی یاخیبوونێکی دیکەم بۆ دەهۆننەوە. بەڵام بە وجودی **(ئارام)**ێکی دیکەی بیر و جەستەی ماندونەناسی بێپەروا لە خۆویستی. ئێستاکێ دەزانم لەو جۆرە مرۆڤانەی وەک **ئارام** پەرجوون، زۆر بە درەنگ پەیدا دەبنەوە. ئاخر چ دەکەی لەگەڵ مەرگ و چارەنووس، خەڵکێک کە هەنووکە بونەتە پێشقاولی دەستکەوتەکان، لەوێ ڕۆژێ بەسواری فڕۆکە بەرەوهەندەرانیان قوچاند. ڕۆژگارەکە دژوار بوو، سێبەری دەسەڵاتی خوێناوی بەعس بەسەر رووخساری زۆربەی خەڵکەوە دەبینرا، نوزەی موقاوەمەتی ڕووبەڕووبونەوە کەوتبوە قولایی بەرەو لەبیرچونەوە. لەوێ ڕۆژاندا،بەژمارەکەمبون ئەوانەی ، بەرگەی شاڵاوی پەلامارەکانی بەعس/یان گرت، زۆربەی خەڵکەکەش بە هەر بیانوێک بێت، دەستیان بۆ گوریسی نەجاتدانی پێستی خۆیان درێژکرد، بە دەستەجەمعی ڕەدووی قوتارکردنی خۆیان کەوتن، بەبێ ئەوەی ئەو فەنتازییە بە کەناری قوتاربوونیان بگەیەنێ. لەو بارودۆخەی ئەنگوست لەچاونانی بەعسدا، **(ئارام)**ی سەرپەڕ سەری هەڵدا، ئەو **(ئارام)**ەی وەک حەبلی نەجات، شان بەشانی دەیان هاوڕێی ڕۆژی تەنگانە، فریای کۆمەڵە و سەرلەنوێ کۆکردنەوەی شیرازە پچڕ پچڕبووە دەربازبووەکانی بەربەرانپیلی ئیعترافات، ڕاوەدوونان و گرتن لەلایەن دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێم، من چەند جاری ُدیکەش **(ئارام)**م بە ژیانی موختەفی و پێشمەرگایەتی ناوخەڵک دیتەوە. بەڵام ئەو شەوە بۆ من هەنووکەیش لە خەونێکی بێکۆتا لە چیراوکەی ژیانمدا دووبارە و دووبارە دەبێتەوە. **ئارام** لەگەڵ بەرەبەیاندا، خۆی کۆکردەوە، دیار بوو ژوانی چوونە شوێنێکی دیکەی ئیختفای هەبوو، بەبێ ئەوەی **عەزە** و دایکی بەخەبەر بهێنێ[13] کە لە هەیوانە جامخانەکەی بەردەمی ژوورەکە، لە پرخەی خەوێ

[13] هەرچەندە عەزە، شەو بە خۆشیی **ئارام** گفتی دابوو کە بەیانی پێش ڕۆیشتنی، بهێ سەروپێمان بۆ

بوون.. من هەتا بەردەرگای دەرەوەیش، کردنەوەی بە ئەسپایی چووم، **جەمالەڕەش** کە لە بەردەرگا بوو، لەدوورەوە ناسیمەوە، تارمایی سەیارەکەی لەو سەرەوە، لە کۆلانێکی کشومات، لە چاوتررووکانێکدا لەگەڵ **ئارام** لە بەرچاوانم بزر بوون، بەلام لەناو دڵ و دەروونم، ئێستاکەیش گیانەکەیان زیندووە، بە بەرچاومەوە بەجووتە (**ئارام** وجمالەڕەش) تێدەپەڕن و بزر نابن.

ئیتر وام دەزانی نۆبەتی شکاندنی سەرخەوێکی حەسانەوەی منە، بەلام ئەوەندەی لەسەر جێگاکە جنگلم دا، خەو لە چاوانم زڕا بوو، چونکە تازە بە هۆش خۆم هاتبوومەوە، من چ بەلێنێکم بە **ئارام** داوە، لەبری خەوتن، بەراوردی قسەکانم دەکردەوە، ئەتۆ بڵێی من لەو رۆژانەدا، شتێکم بۆ مەبەستەکانی **ئارام** وکۆمەڵە ی سەرلەنوێ لە دایک بوەوە بۆ بکرێت..! نازانم کات چەند گوزەرا بوو، هەستم کرد دایکی **عزیز** سەرەدیقانێم لەگەڵ دەکات، بزانی لە لەخەوزڕان تەواو بوومە! ئەوە بوو لەگەڵ کوڕە خۆشی لە خۆ نەدیوەکەی، خۆمان کۆ کردەوە و مالئاواییم لێ کردن و یەکسەر بەرەو هەولێر گەڕامەوە.

ئامۆژگارییەکانی **ئارام** لەپێشەوە بۆ بەندە نمانامەی هەنگاوهەڵگرتنم بۆ بەرگەرتن لە کاروباری رێکخستنێکی هێشویی سەرلەنوێ، هەڵقولاو لەناو ریزی خەڵکانی رەشوڕووت، چینی کرێکار و زەحمەتکێشەکان. گۆش کراو بە فەلسەفەی خەباتی شۆڕشگێڕانە (بیروباوەڕی سۆسیالیستی زانستی). چەقی رێنماییەکانی بۆ بەندە بریتی بون. خۆخەریککردن و خۆبەستنەوە تەنیا و تەنیا بە گیانی تاودانی رێکخستن، دوورکەوتنەوە لە هەڵەپاسی، زماندرێژی، خۆدەرخستن، نهێنی نەپاراستن، دوورەپەرێزی لە خەڵکانی فشەچی، پاراستنی بلاوکراوە و راپۆرتەکان لە شوێنی تەقەت و دوورەدەستی ئەم و ئەو. هەتا **ئارام** لە ژیاندا بوو، لە نزیک و دوور چاوی بە سەرمانەوە بوو، هەتا ئەوکاتەی ئەو ئامۆژگاری و رێنماییانەمان پیادە دەکرد. بۆ مێژوو دەیگێڕمەوە، لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٦ ەوە ئێمە شێوە رێکخستنێکی نوێی تا رادەیەک پۆلایینمان لە هەولێر و دەوروبەری دروست کردبوو. بەدوای ساڵی ١٩٧٨، نەمانی بەدواداچوونەکانی **ئارام**، بڕەبڕە لەگەڵ فراوانبوونی ریزەکانی رێکخستنی کۆمەڵە، بەربەرەللاکردنی رێکخستن بۆ وەرگرتنی هەموو یەکێک، ئەو سەرەتایانە کاڵبونەوە و بەخشکەیی لەناوچوون..

مەبەستی سەرەکی **ئارام**، لە گرتنە ئەستۆی باری قورسی رۆژانی تەنگانەی کۆمەڵە، ئەوە بوو بەراستی ئەو رێکخستنە لە رووی بنیادی رێکخراوەیی، بە سترکتورێکی نوێ بنیاد بنێتەوە، کە بە هیچ جۆرێک لە فۆرمیشدا، لە روخساری حیزبەکانی دیکەی کۆن و

---

بهێنی، بەلام **ئارام** رازی نەبوو، گوتی عەزە من وەک تۆ کوشتەی سەرۆیی نیم و بۆخۆتان بیخۆن.

نوێی کورد نەکات. بۆ مێژوو ئەوەیش لە خودی **ئارام** دەگێڕمەوە. ئەو مرۆڤە بلیمەتە ئەو دەمیش، لە رووی ئایدیۆلۆژییەوە درکی بەوە کردبوو، کە مارکسیزم _ لینینیزم لە دەمی بە قەیران تێپەڕیندایە، بۆیە دەبێ کۆمەڵە هەنگاو بە هەنگاو بەرەی خۆی بە وریایی لەو ئاوی شێلوێی قەیرانەکە دەر بکات. **ئارام** بە رۆژی ئاشکرا بانگی ئەوەی دەدا، کە کۆمەڵە دەبێ لە تەنگەژەی نێو ئەزموونەکانی بزاڤی کۆمۆنیستی، وابەستە و گرێدراوی هیچ لایەک نەبێت. لەو بارەیەوە هەمیشە ئەزموونی ڤیێتنامییەکانی بە نموونە دەهێنایەوە. **ئارام** بە پراکتیک کۆمەڵەی لە هەڵگری ئەندێشەی بیری ماویزم رزگار کرد. ئەوەیش لە باوەشی راپۆرتی شوباتدا هاتووە، کە **ئارام** خۆی نووسیویەتی و بۆ بیروڕا وەرگرتن بەناو ریزەکانی ئەو دەمی رێکخستن بڵاو کراوەتەوە. ئەو راپۆرتەی لووتکەی هەڵوێست و بیروراکانی (**ئارام**)ی بە ئاشکرابۆئەوەدەمی بە خۆوە گرتووە، بۆ یەکەمجاریش بوو لە مێژوی جەنجالی کۆمەڵەدا، جورئەتی هەڵسەنگاندنێکی بوێرانە، لە دەمی ئەزمەی زروفێکی نالەباری ئەو رێکخستنەی لە لایەک کەوتبوە بەر کەلبەی ئەژدیهای بەعس، لە لایەکی دیکەوە سەرکردایەتییە ناسراوەکەیشی ئەو مەیدانەی بە جێ هێشتبوو، بنووسرێ.

هەر سەبارەت بە **شاسوار جەلالەوە** دەبێ بگەڕێمەوەساڵی ١٩٧٥، کورتەیەک لە ڕا و پراکتیکی ئەو دەمی بگێڕمەوە. ئەوەی لەو رۆژانەم وەبیر دێتەوە.. ئەو هەرگیز بەرانبەر رووداوەکان هەڵەشە و بە پەلەپروسکێ نەبوو، بەڵکو بە هێمنی، وردبینانە لێی دەڕوانین، بەڵام لە ئاست رادەربڕینی را و بۆچوونەکانی خۆیدا، تا بڵێی باوەڕ بە خۆ بوو، دلێر و بوێر بوو، بە ئاشکرا و بەبێ مانۆڕکردن و دڵەڕاوکێ، راشکاوانە و بە ئاشکرا قسەکانی خۆی دەکرد. ئەو هەمیشە دەیگوت. ئەگەر لە پێشەوەی خەڵک نەبین، دەبێ لەگەڵ خەڵک بین و لێیانەوە دانەبڕێین. ئەو رۆژە مقۆمقۆی باسوخواسی ئیتفاقیەی جەزایر بوو، پاش نیوەڕۆکەی بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ **هاوڕێیەکی** کارمەند لە ئەمانەتی دارایی، لە دۆلەکەی دەربەند (**خدر عبدالرحمن** کەرکووکی)و**محمدزاهیر** لەدوای نانخواردن و کردنی قسەکانی خۆمان، یەکسەر بەتەنیا رێگام بردەوە لای **شاسوارجەلال** لە ئەمانەتی عدلیە و ئەوقاف لە **بابەکراوە**، دیتم بەتەنیا لە ژوورەکەی خەریکی تەسفیەی کاروبارەکانییەتی. بە لای بەندەوە سەیر بوو، کە ئاوا خۆی ماندوو دەکات! چونکە کار لە کار ترازا بوو. بڕیاری ئاشبەتاڵ درابوو. من زۆر سەربەستانە ئەو پێشنیازەی برادەرانی سەرەوەی خۆم پێگەیاند. وا دەزانم هەنووکەیە. **شاسوار** سەری بڵندی هەڵبڕی و گوتی: مردوو ئەوە بەراستیتە! من ئەو چەردە پارەیەی لە لامە، تەسلیمی ئێوەی بکەم! دەزانم تۆ لە پاکی خۆت و خۆشەویستی کۆمەڵە، بەبێ ئەوەی مەبەستێکت هەبێت، ئەو پێشنیازەت بە من راگەیاند، بەڵام من هەرگیز کاری لەم جۆرە ناکەم، خۆم شەرمەزاری مێژوو ناکەم، لە ژیانمدا

چاوبەراوژێری کەسێک نیم، ئەوجا چجای ناپاکی بکەم، سبەینێ لەوسەرەوە بە دزم دەربهێنن. من ئەو دەم زۆرم پێ ناخۆش بوو، کە ئەوە هەڵوێستی **شاسوار** بوو ، هەموو ئەو پارەیەی کە بەملیۆن دینار زیاتر بوو بە ئیمزای **سالح یوسفی** تەسلیم بە شوێنی خۆی کردەوە، بە بێ ئەوەی دەستکاری یەک دینار بکات.[14] بەڵام بەئەزموون تێگەیشتم کە **ئارام** چ مرۆڤێکی گران و سەنگین، چەند بلیمەت بوو لە ناسینی بازاری سیاسەتچییەکان، ئەوەندەیش خاوەن دیدی پێشهات بوو. چونکە پاش دەیان ساڵ هاوڕێیەکی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە هەولێردا، چەردەیەک پارەی حکومەتی بەعسی هێنایە دەرەوە، بەبێ دەستکاری تەسلیمی ڕێکخستنی ناوشاری کرد و ئەوان تێکەولێکەیان پێ کرد، کەچی سەرباری ئەوەی ژن و کەسوکاری ( **حاجی ئەکرەم**) لەسەری لە زیندانی بەعسییەکان دارزان، هەتا پاش شەهیدبوونی ناوبراو، چەند کەسی دیکە خۆیانی پێ هەڵدەدەنەوە، بگرە هەتا بە دزیشیان ناوزەد کرد! ئەمە شەرعی وەفاداری سیاسەتی کوردانە. ئیتر چۆن سوژدە بۆ گیانی زیندووی **ئارام** نەبەم. لە بیرمە **شاسوار** هەموو جارێک دەیگوت. ڕەوشتبەرزی بۆ مرۆڤی شۆڕشگێر، جەوهەری بیروباوەڕی دروستە، بەڵام نابێ ئەوەمان لە بیر بچێت، کە ڕەوشت و پاکی و دڵسۆزیی، شتی پریمیتیڤی سەرەتایی ئینسانە، نابێ کەسمان خۆی پێوە با بدەین و وەک موزایەدە بە خەڵکی دیکەی بفرۆشینەوە.

بۆ جاری دووەم کە (**ئارام**)م لە ژیانی موختەفی ناو شاری سلێمانی دیتەوە، من لە ڕێگای **جەماله رەشەوە** ئەو سەردانەم کرد. یەکەم شتێک **ئارام** لەگەڵی باس کردم، سەبارەت بە ڕێکخستن و ئاستی چالاکییەکانمان بوو لە هەولێر.. دووبارە تەئکیدی لەسەر خۆپاراستن و نهێنی پۆلایین کردەووە. ئەوجا باسی ئەوەی لەگەڵ کردم کە سەردانی **هاوڕێیان** لە زیندانی (الفضیلیە) لەبەغداد بکەم، **ئارام** پەیامێکی بۆ **خاله شەهاب** و برادەران نووسیبوو، کە سەبارەت بە نووسین و بڵاوکردنەوەی ڕاپۆرتی شوبات بوو.[15] **هەروەها** چەندان نامەی پێچراوی دامێ بۆ هەندێ برادەر کە لە هەولێر دەژیان لە نموونەی **حەمید باتاسی، سەید مەجید**، لەگەڵ نامەیەکی دەستخەتی خۆی کە بۆ **خەسرەو تۆفیقی موقاول**

---

[14] وەک دواتر حەمە قەرەداغی بە ژیان زیندوو، ئەوکاتە ئەویش لە ناوچەکە حاکمی شۆڕش بوو دەیگێڕتەوە، لەو سەروبەندەدا لە شنۆ تووشی شاسوار دەبێت، کە ئەو دەمیش زۆر ڕەفیقی یەکتری بوون _ بۆ مێژووش حەمە قەرەداغی لە بەغدادیش گیرفانی لەگەڵ هاوڕێیەکانی هاوبەش بوو _ شاسوار کە ناوبراو دەبینێ، دیارە هیچ پارەیەکی ئەوتۆی لە گیرفان نەبووە، وەک عادەتی بە حەمە دەڵێ مردوو، چەند پارەت لە گیرفانە، حەمەیش بەبێ یەکودوو دەڵێ، سەدودە دینارم لە گیرفانە، شاسوار دەڵێ، کەواتە شەست دینارەکە بۆخۆت هەڵگرە و ئەوەی دیکە بدەرە من.

[15] لەبەر ئەوەی لە شوێنی دیکەی یادەوەرییەکاندا باسم کردووە، لێرەدا کورتەکەم دوبارە کردووتەوە.

**لەبەغداد** نووسرابوو. هەر دوو کارەکەم بە هاوکاریی **مەحەمەد زاهیر و فریاد محێدین،** کرد کە ئەو دەمە دوو هاوڕێی کۆمەڵە بوون و لەگەڵ ئەو خەتەی ئێمە لە بەغداد کاریان دەکرد.

بەداخەوە کە بۆ دواجار (**ئارام**)م لە ڕێگای کارئاسانیی **یونس، ڕەفیقەکەی جمالە ڕەش،** لە گوندێکی بناری ئەو شاخەی سەر گوندی تەنگیسەر بینی. لە ساڵی ٢٠٠٥ کە لەگەڵ **گۆران قەرەداخی ــ عبدالرحمن شێخ صدیق ــ** ی نەمر بەیەکەوە چووینە دیداری گۆڕی **ئارام** لە گوندی تەنگیسەر، وەک بیرمکەوتەوە، ئەوگوندە ناوی سەرزڵ بوو، کە ئەو دەم (**ئارام**)م لێ دیت.) لەو گوندە، ئەو پیتاکەی **خەسرەو تۆفیقی** ڕەحمەتی لەگەڵ هەندێ کۆمەکی دیکەم، تەسلیم بە **ئارام** کرد. گوتی مردوو گەورەترین گەنجینەت بۆ هێناوم و هەنووکە تەنیا ٢٥ دینارمان پێماوە، ئەو کۆمەکە زۆر گرفتمان بۆ چار دەکات. بەڵام دێتەوە بیرم، ئەوە دوا دەرفەتی دیداری من بوو لەگەڵ (**ئارام**)دا، زۆر بە چاکی هەستم بەوە کرد، کە **ئارام** زۆر کز و لاواز ببوو، دواتر کە بۆ مەودایەکی درەنگ، ئەو ساتانەم بیر دەکەوێتەوە، نازانم چۆن ڕێگام گرت و (**ئارام**)م بە جێهێشت و نەمدیتەوە! هەرچەندە من لەلای خۆمەوە پێشنیازی ئەوەم کرد، کە نامەوێ بۆ شار بگەڕێمەوە، دەمەوێ لە تەک ئەو ببم بە پێشمەرگە. ئارام خێسەیەکی تووڕەبوونی تێ گرتم و گوتی: مردوو بۆ وا دەزانی من دڵم بەم چەکدارییە خۆشە! ئەرکی ئێمە زۆر لە چەک لەشانکردن گەورەترە. بەتایبەت لە شارەکاندا، کە دەبێ هەموو تواناکانمان بۆ ڕێکخستن، هەر بەتەنیا ڕێکخستن، ڕێکخستنی چینایەتیی چینی کرێکار و خەڵکە ڕەشوڕوتەکان، ئەرکی سەرەکی خەڵکانی وەک تۆیە. ئێمە ناچارکراوین بۆ دیفاعکردن لە خۆمان، پەنا بۆ چەک هەڵگرتن ببەین. بۆیە دەبێ ئەو بیرە لە مێشکی خۆت دەربخەیت. وەک هەولێرییان دەڵێن، هەتا ئاوت لە دوو بێرێ بێت، دەبێ لە شار بە خەباتی ڕێکخراوەیی خەریک بیت. دواتر کە هەتا نزیکی سەر ڕێگای ئەو سەیارەی پێی هاتبووم، بەجووتە دەرۆیشتین. گوتی مردوو با شتێکت پێ بڵێم. برادەران **عەزیز مەحمود** و **جەمالەڕەش** پێشنیازی ئەوەیان بۆ کردووم، کە جەنابت لەو شوێنە بەتاڵەی[16] نوێنەری هەولێر لە کۆمیتەی هەرێمەکان دیاری بکەین، من ڕازی نەبوومە، گوتوومە لە عەباس گەڕێن، با لە شار کاری خۆی بکات، بە شێوەیەکی سروشتی و شایستەیی خۆی بۆ ئەرکی گەورەتر گەشە بکات. داخەکەم نەمانی **ئارام** وەک مامۆستایەک بۆ پێگەیاندنی کادرە گورجوگۆڵەکان، پەلەپڕوسکێکردنی خۆم، هەندێ دەست

---

[16] کە عبدالرزاق بوو، بەڵام لەپێش گیران و پاش بەربوونیشی لە زیندان ئامادە نەبوو، ئەو ئەرکە لە ئەستۆ بگرێت.

لەپشتدانی مەبەستاوی. خەونەکانی **ئارام** هەر وەک بە شەهیدبوونی خودی خۆی، بوونە تەمومژی هەڵچوون، تا ئێستایش لەسەر ئەرزی واقیع نەهاتنە دی. بەندە و دەیانی وەکو منیش بوونە بەردی بن گۆم.

دوا وشەکانی بەشی یەکەمی (لە هەواری یادەوەرییەکانمدا) سەبارەت بە **ئارام** . دەمینێتەوە سەر ئەوەی هەندێ لەو تێڕوانینە تایبەتییانەی خۆم بڵێم، کە بە نیازم لەگەڵ فرسەتی تەمەندا، لە بەشی دووەمی هەڵسەنگاندنی ئەزموونی کۆمەڵە بەگشتی و کەسایەتی **ئارام** و تراژیدیای شەهیدبوونی، بنووسم. لەگەڵ هەڵسەنگاندنی ئەزموونی ئاڵای شۆڕش و خوێندنەوەیەکی رەخنەگرانەی کتێبی (پەنجەکان یەکتری دەشکێنن)ی نەوشیروان مستەفا بڵاوبکەمەوە.

چەقی بیری **ئارام** لەو مەودا کورتەی (پاییزی ساڵی ١٩٧٥ _ سەرەتای ساڵی ١٩٧٨)ی بەردەست لە بەڕێوەبردنی کۆمەڵەدا، خۆی لەوە دەبینییەوە. گۆڕینی ستركتوری کۆمەڵە بەگشتی، لە هەمیزی کەسایەتییەکی رێکخراوەیی سەربەخۆی بێ ئەملاوئەولادا. چونکە خودی بیری **ئارام** بۆ خۆی لە هەموو باکگراوندێکی کۆنینە و کاریگەریی فلان و فیسار سەرکردەی خەباتی سیاسی پێشینە و وابەستەیی، کلکایەتی و سێبەربون، بیرکردنەوەی ناوی زل و دێی وێران، رزگاری ببوو. **ئارام** گەرەکی بوو لە هەمێزی کۆمەڵەدا، زەخیرەیەکی لەم جۆرە کادر و سەرکردە بخولقێنی کە بەرجەستەی داهێنان هەتا سەر رادیکالیکی شۆڕشگێڕبن. هەنگاوهەڵگرتنی بۆ دەرکردنی ئۆرگانی ناوەندی کۆمەڵە (ئاڵای شۆڕش) مژدانەی سەرەتایی ئەو مەبەستە بوو.

**ئارام** بە هێمنی، بەبێ هەڵچوون و هەر جۆرە توندڕەوییەک، پەنجەی لەسەر ئەوە دانابوو، کە کۆمەڵە دەبێ بە خۆیدا بچێتەوە، بەتایبەت لە پێشەوە لە رووی ئایدیۆلۆژی، نەکەوێتە شوێنکەوتووی تەیارە فیکرییە لادەر و توندڕەوەکانی ئەودەمی ناو پەرێزی مارکسیزم. بەردەوام تەرکیزی لەسەر دیراسەکردن و خوێندنەوەی وردی مێژووی ئەو فەلسەفەیە و توێژینەوەی ئابووری دەکردەوە. بەتایبەت ئاشنابوون بە مێژوو و ئابووریی وڵات، نەتەوەکەی خۆمانی زۆر لە لا مەبەست بوو. لەپاڵ ئەوەیشدا **ئارام** هەر ئەو دەمە، هەمیشە تەئکیدی لەسەر باوەڕبوونی تەواو بە دیموکراسییەت و ئازادی بیرکردنەوە، سەروەرییەکانی مافی مرۆڤ دەکردەوە. لەو رۆژە تەنگەتاوانەی **ئارام** و ئەو چەپکە هاوڕێیەی فریای رزگارکردنی کۆمەڵە کەوتن، بە سەرپەرشتی خودی **ئارام** مەبەستییان، هەڵسەنگاندنێکی ئانوساتی ئەو دەمەی کۆمەڵە بوو، لە بەردەم مەسەلە چارەنووسسازەکان، وەک هەمیشە بە چاولێکەری حیزب و لایەن و سەرکردایەتییە قەتماخەگرتووەکانی رابردوو و بەداوی وەنەکرێن، بە بیانوی بارودۆخی ناگونجاو بە

هەڵواسراوی نەمێننەوە. دیارە لووتکەی ئەو هەڵوەستەیەی **ئارام** و هاوبیرەکانی خۆی لە نووسین و بڵاوکردنەوەی ڕاپۆرتی شوبات دەبینتەوە، کە وەک لە بیرم بێت، ئەو دەمە زۆر بە ڕاشکاوی قامک خراوەتە سەر ڕابردوو، ئەرک و پەیامە هەنووکەیی و داهاتووی کۆمەڵە، وەک ڕێکخراوی سەربەخۆی چینی کرێکار و زەحمەتکێشانی خەڵکی کوردستان.

بەرنامەی **ئارام** ئەوە بوو کە کۆمەڵە لە نزیکترین فرسەتی رووخساو کۆنفرانسی ساغبونەوەی یەکجارەکی خۆی ببەستێ، بە بەشداری نوێنەری هەر جۆرە تێزێکی بیرکردنەوەی ناو ریزەکانی کۆمەڵە، بەبێ پەراوێزکردنی ئەم و ئەو کە ڕۆژێک لە ڕۆژان بۆ هەر مەبەستێک هەڵوێستیان لە کۆمەڵە وەرگرتوە. سەرمەشقی ئەو هەنگاوانانەیش هاوخەباتی و هاوکاری هاوڕێیانە بووە، بەتایبەت لە شاخ، لەگەڵ ئەو توخمە کوردانەی لەناو قیادەی مەرکزی حشع (وحدە القاعدە)، چەند گرووپێکی دیکەی مارکسی لەناو شاری سلێمانیدا..

**ئارام** شەهید بوو، لەگەڵ شەهیدبوونەکەی خەونە پیرۆزەکانی رەوینەوە، جەرگبڕترین گورزی کوشندە بەر بزاڤی شۆڕشگێڕی کورد و کۆمەڵە کەوت، خەڵکی کرێکار و زەحمەتکێشانی کورد لە دژوارترین زەمەندا، بە ئەمەکترین سەرکردەی هەڵکەوتووی ڕۆژە تەنگەکانیان لەکیس چوو. کۆمەڵە بێ ئەو سەرە بڵندە مایەوە، کە هەنگاو بە هەنگاو کەوی کرا و دواتر بەیەکجارەکی لەگۆڕ نرا.

من هەوڵ دەدەم، بۆ داهاتوو ئەو بیر و خەملاندنانەی خۆم سەبارەت بە هەڵوێستی دروستی **ئارام** لە هەڵوەستەکردن بۆ تێکەڵنەبوون بە دامەزراوە حازرەکییەکانی خەباتی چەکداری، لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٧ و مانەوەی لە ناوچەیەکی بەرتەسکی وەک قەرەداخ، بنووسم، کە ئەو خەڵکانەی بە بەشێکی ئەو حەقیقەتە ئاگادارن، بۆ هەر مەبەستێک بێت، خۆیانی لێ دەبوێرن.

## پرسیارەکانی بەندە و وەڵامەکانی تەها باراوی

تەهاباراوی هونەرمەندی ناسراوی سەرەتای سالانی حەفتاکان، لەپال هونەری نواندنەوە لەگەڵ تیپە شانۆییەکانی سلێمانی و مامۆستایی کردنی لە گوندەکانی دەوروبەری شاردا، ئەندام و چالاکوانێکی زەمانوزەمینی دەستپێکی کۆمەڵەی (مارکسی-لینینی بیروباوەڕی ماوتسی تۆنگ) ی کوردستان بووە، لە ساڵی ١٩٧٥ یشدا، چ لەناو شار و گوندەکانی دەوروبەری سلێمانیدا، دواتریش لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٦ دا لەگەڵ هەڵگیرساندنی خەباتی چەکداری شاخ، لە مەفرەزە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە، لە شانی **ئارام** و هاوڕێیەکانی بەشدارییەکی سەراتاییانەی لەوان رۆژاندا هەبووە، بگرە لە زۆر شەو و رۆژە سەختەکاندا، لە شار و شاخ هاوڕێی هاودەمی **ئارام** بووە. بە پێویستم زانی سەبارەت بە ئەوێ رۆژان بیدوێنم، ئەو پرسیارانەی ئاراستە بکەم. دیارە تەهای بە لوتف، خۆشنوکتە، پڕزانیاری لەوێ رۆژاندا، بەوپەڕی دڵفراوانی، دڵسۆزی و وەفاداری بۆ گیانی **ئارام** هاتە دەنگ، بە سوپاسەوە وەڵامی ئەم پرسیارانەی دایەوە.

1) دەنگۆیەک لێرە و لەوی بە شەرمەوە بۆ لەکەداردەرهێنانی **ئارام!** وەک بنیشتەخۆشە ئەدرێسی بە هەڵەی (بەیاننامەی شوبات) یان لەبری (راپۆرتی شوبات) کردووەتە پێشقاولی ئەو خواستەیان. دەمەوێ لەوبارەیەوە گوێ لەو زانیارییانەی ئێوە بگرم؟
2) لە گێڕانەوەی سەربردەکانی ئەوێ رۆژاندا ١٩٧٥ _ ١٩٧٦، سەبارەت بە چۆنیەتی راوەدوونانی **ئارام** لە لایەن دەزگا سیخوڕییەکانی بەعس، وەک برایم جەلال لە کتێبەکەی بەناوی چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵەدا نووسیویەتی: (شاسوار جەلال فەراشەکەی خۆیەوە زمانی لێدراوە) ل/٧٨ تۆ دەڵێی چی؟
3) ئەو دەنگانە ئەوەندەی بۆی کراوە و بێ موناسەبە، بلس لەوە دەکەن کە گوایە **ئارام** لە ساڵی ١٩٧٥ پێوەندییەکی بە کۆمەڵەوە نەبووە. ئێوە چی دەڵێن؟
4) یاخود ئەوە دەڵێن و دەڵێنەوە کە گوایە **ئارام** لە سنووری (٨-٩) گوندی ناوچەی قەرەداخ خۆی مەلاس داوە! زانیارییەکانی ئەوێ رۆژێی تۆ چیمان بۆ دەگێڕتەوە؟

5) برایم جەلال لە کتێبی (چەپکێک لە مێژووی کۆمەڵە) دا، باس لە چەندان دیداری خۆی لەگەڵ ئارام دەکات! لەو دیدارەی کە لە ڕێگای ئێوەوە بووە، ڕاستی و دروستی ئەو دیدارەمان بۆ بگێڕیتەوە؟

6) بەکورتی سەبارەت بە کاراکتێری کەسایەتی ئارام لەساڵی ١٩٧٥-١٩٧٦ دا، یادەوەرییەکانتان چیمان بۆ باس دەکات؟

تەها باراوی لە وەڵامدا گوتی :

"عەباس.. بەرلەوەی وەڵامی پرسیارەکانی تۆ بدەمەوە، پێم باش بوو هەندێ ڕوونکردنەوە بخەمە ڕوو... هەتاکو ئەم ساتەوەختەیش بڕیارم دابوو نە کەم و نەزۆر خۆم لە قەرەی گێڕانەوەی بەسەرهاتێک و ڕووداوێک نەدەم جا ئەگەر لە نزیک یان لە دوورەوە ئاگاداری بووبم، وە هیچ کات مەبەستم نەبووە ئەگەر بە باش، یان خراپ باسم کرابێ لە ڕووی سیاسییەوە بە جواب بێم. لەبەرئەوەی بۆ خۆم، خۆم بە کەسێکی چالاکوانی سیاسی نابینم و هاوکارییەکی زۆرم نییە لە خەباتی سیاسیدا. شارەزاییەکی ئەوتۆیشم لە سیاسەتدا پەیدا نەکردووە کە بتوانم هەڵسانگاندنی سیاسی بۆ ڕووداو و بەسەرهاتەکان بکەم. بە هیچ جۆرێک پێویستم بە پاکانە و لەسەرخۆکردنەوە نییە. چونکە ئەگەر هەر کارێکی سیاسی یان ڕێکخراوەیشم کردبێ بە هیچ جۆرێک لە هیچیان پەشیمان نیم و جێگای شانازیمە و ملیشم لە موو باریکترە، بەڵام لە ئاستی میللەتەکەمدا.

ئەگەر یەک چرکەساتیش نەک ناپاکی، گەر کەمتەرخەمیشم کردبێ ئامادەی هەموو لێپێچینەوەیەکم. لە سەرانسەری کاری سیاسیمدا تەنها لە بەرەی بێ دەسەڵاتداراندا خۆم دیتۆتەوە، هەرگیز لە بەرەی دەسەڵاتداراندا نەبووم، تەنانەت بیرم نایەت لە منالیشمدا کاتی قوتابی بووم، چاودێری پۆل بووبێتم. لە حاڵی حازردا بۆ ماوەیەکی دووروودرێژە هیچ پێوەندییەکی سیاسیم بە هیچ هێزێکی سیاسییەوە نییە، بەڵام خۆم بە دۆستی هەموو ئەوانە ئەزانم کە هەوڵی جدی بەردەوامییان هەیە بۆ خزمەتی خەڵکانی چەوساوە و بەش مەینەت، هەروەها ئەوانەی بەردێک ئەخەنە سەر بەردێک لە ڕێگای دروستکردنی کوردستانێکی ئازاد و سەرفراز و یەکسان. خۆشم بە قەرزارباری هەندێ هاوڕێی خۆشەویستم نەبێت، بە قەرزاری کەسی تر نازانم و لەم پاییزی تەمەنەشمدا بەتەمای هیچ دەستکەوتێک نیم و ناشبم، نزیکەی پانزە ساڵ خزمەتی مامۆستایی خۆم لە کوردستان هەیە تا ئێستا خانەنشینیم نەکردووە، چونکە لە هەندەران ژیان لەگەڵ ماڵ و منداڵەکانمدا بەسەر ئەبەم. هەروەکو ئەوەی نامەوێ بەجواب بێم لەسەر خۆم. بە ئەرکی خۆشم نازانم کە بەرگری لە هەندێ هاوڕێ و برادەری خۆشەویست بکەم کە ئێستا خۆیان لە ژیاندا

ماون، چونکه نه من کارم پارێزەرییە و نەکەسیش منی کردووە بە وەکیلی خۆی بۆئەوەی لەسەری هەڵبدەمێ. بەڵام ئەگەر هاورێیەکم شەهید بووبێ خۆی بە جەستە لە ژیاندا نەمابێ خۆم بە کەسێکی بێ موراڵ ئەبینم، ئەگەر ئاگاداربم ناهەقی لەگەڵ بکرێ و بە دەنگ نەیەم. شەهید **ئارام**- شاسوارجەلال وا بۆ ماوەی ٣٣ ساڵ ئەچێت کە شەهید بووە و تەنها بە جەستە لە ژیاندا نەماوە، بەڵام وەک روحیانەتێکی هەمیشە زیندوو لە هزر و بیر و هۆشی زۆربەی زۆری هاورێ و قوتابی و شوێنکەوتووەکانیدا ئەژی. بۆ تاکە ساتێکیش ناتوانرێ رەوشتی بەرزی ئەو مرۆڤە مەزنە پیرۆز رانەگیرێ، چ جای ئەوەی بە ناهەق پاش ئەو ماوە درێژەی دوای شەهیدبوونی بە نارەوا، ناهەقی بەرامبەر بکرێ و لەکەدار بکرێ. جا بۆیە بڕیارم داوە وەڵامی پرسیارەکانت بدەمەوە وەکو ئەوەی گوێم لێ بووە یان دیتومە ئەوەندەی بیر و هزرم بە هانامەوە بێت، ئیتر مەبەستم نییە کێم لێ زویر ئەبێ یان کێ پێی خۆشە."

**وەڵامی پرسیاری یەکەم..**

**یەکەم..** ئەو دەنگۆیەی ئەڵێ بەیاننامەی شوبات یان بڵاوکراوە کە ئەوە خۆی نە بەیاننامە و نە بڵاوکراوە بوو، بەڵکو خۆی راپۆرتێکی تێروتەسەل بوو بەناوی کۆمیتەی هەرێمەکانەوە دەرچوو، تەنها بۆ رێکخستنەکانی ناوخۆ بوو، ژمارەیەکی زۆر کەم لە کادرانی پێشکەوتووی ئەوکاتەی کۆمەڵە بینییانە، تەنها بە دەستخەت نووسرابوو، چەند دانەیەکی کەمی لێ کۆپی کرابووەوە. ژمارەیەکی زۆرکەمی رێکخستن چاویان پێ کەوت کە ئەوانیش یان کادرانی تاکوتەرا یان ئەندامە موختەفی و ئەوانەی خۆیان شاردبووەوە. راپۆرتەکەش بەناوی کۆمیتەی هەرێمەکانەوە نووسرابوو، هەڵسەنگاندنی ئەوێ رۆژێی باری کوردستان بەگشتی و باری رێکخستنی ئەو سەردەمەی کۆمەڵە و ئەرکەکانی بەتایبەتی تیا کرابوو، باسی شێوەی خەباتی ئەوساتە وەختە و هەڵسەنگاندنی ئەو هێز و پارت و رێکخراوانەی کە لەو سەدەمەدا کاریان ئەکرد و بۆچوونی کۆمیتەی هەرێمەکانی تیا دەربڕابوو. واتە مەبەستم ئەوەیە ئەو راپۆرتە بەیاننامە یان بڵاوکراوە نەبوو، پاش ئەو هەموو ساڵەی کاری رێکخراوەیی و کاری سیاسی، هەر کەسێک کە ئەو راپۆرتە ناوئەنێ بڵاوکراوە یان بەیاننامە! خۆئەگەر لە ناشارەزاییەوە بێت ئەوە خراپە، یان ئەگەر لە شارەزاییەوە بێت کە من زیاتر شکم بۆ ئەمەیان ئەچێت، ئەوە *نا ئەمینی* یە لە کاری نووسیندا.

**دووەم..** ئەوەش ئەنووسێ ئەو بڵاوکراوەیە (بەیاننامەیە) لە رۆژی هەشتی شوباتدا دەرچووە، من هەرچەند سەرم هێنا و سەرم برد، نەمتوانی لەم رقە ئەستوورە بگەم کە

وای لەو کەسە کردووە، بوختانێکی وا گەورە بکات بە شەهیدێکی وا خۆشەویست و هاورێکانی لە کۆمیتەی هەرێمەکان و خەباتی ئەوکاتەی برادەرانی ئەو سەردەمەی کۆمەڵە. بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی بەدەستەوە بێت!

**سێیەم..** گرنگی ئەو راپۆرتە لەوەدا بوو کە زۆر بە راستگۆیی و بێ ئەوەی درۆودەلەسە لەگەڵ خۆیدا بکات، هێزی خۆی بە هێزێکی گەورە و دوژمن بە کەم بگرێ. راستی تواناکانی ئەو سەردەمەی کۆمەڵەی بۆ کادرە پێشکەوتووەکانی رێکخستن بەیان کردبوو. هەروەها ئاماژەی بە قورسی قۆناغەکەدابوو، بەروونی و ئاشکرا لە پەرەگرافێکا ئاماژەی بەوە کردبوو کە ئەرکی رزگاری نیشتمانی کە ستراتیژی ئەو سەردەمی کۆمەڵە بوو، تەنها و تەنها بە کۆمەڵە خۆی ناکرێ. بۆیە پێویستی بە یەکریزی هەموو هێزەکانی سەر ساحەی کوردستانە، تەنانەت حشع و پارتە کارتۆنییەکانی دۆستی رژێمی ئەو سەردەمیشی لە یاد نەکردبوو کە هەوڵبدرێ لە تەکیاندا بۆ ئەوەی ریزەکانی رژێم بەجێ بهێڵن و بێنە ریزی بەرەی گەلەوە. واتە تا ئەو کاتە لەنێو خودی کۆمەڵەدا کە بڕوای تەواوی بە پارتی پێشڕەو هەبوو، بۆ یەکەم جار بوو بیرۆکەی دروستکردنی بەرەی نیشتمانی کە کۆمەڵەش بڕوای پێی هەبوو، هەوڵی دروستکردنی بدرێ. دەرئەنجامەکەشی دروستکردنی بەردی بناغەی یەکەم بەرەی کوردستانی لە شۆڕشی نوێدا لەنێوان کۆمەڵە و برادەرانی پاسۆکدا بوو. کە لەلایەن **ئارام** لە کۆمەڵە و **ئازاد مستەفا** لە پاسۆک، واتە لە ئاستی هەرەبەرزی هەردوو رێکخراوەکەدا مۆر کرا. بە هەمان رەنگ هەوڵ لەگەڵ (رێکخراوی رەنجبەران) و (گروپێکی بچوکی کۆمۆنیستەکان) درا.

**چوارەم..** خاڵێکی تری راپۆرتەکەی کۆمیتەی هەرێمەکان لە کاتێکدا نووسرابوو کە کۆمەڵە ناوی کۆمەڵەی مارکسی _ لینینی (بیروباوەڕی ماوتسیتۆنگ) کوردستان بوو، کە هەر لە دروستبوونییەوە ئاوەهای ناوبوو، تەنانەت لەنێو جەماوەردا، بە (تفەنگچییەکانی ماو) ناسرابووین، واتە کۆمەڵە لە بزووتنەوەی کۆمۆنیستی جیهانیدا پەیڕەوی رێبازی ماوی ئەکرد. لەو راپۆرتەدا هەوڵی ئەوە درابوو خۆ لەو خۆبەستنەوەیە بەتەنها بەو رێبازەوە قوتار بکرێ، هەوڵی ئەوە درابوو وەکو شۆڕشی ڤێتنام بەرابەرایەتی هۆشی مین، رەفتار لەگەڵ بزووتنەوەی کۆمۆنیستی جیهاندا بکرێ، واتە تەرەفگیری لایەک نەکرێ بۆ دژایەتی لایەکەی تر. ئەمەش لەوەوە سەرچاوەی گرتبوو، لەو رۆژگارەدا لەنێو کادرەکانی کۆمەڵەدا، کە بەردەست رژێم نەکەوتبوون لە رووی تیۆری شۆڕشگێرانەوە، بابەتی رۆشنفکرییەوە **ئارام** لە هەر هەمووومان شارەزا و بەتواناتر بوو، چونکە هەر لە سەرەتای حەفتاکانەوە لە رۆژنامەی هاوکاری ئەو سەردەمدا، ستونێکی ئەنووسی بەناوی خەباتی گەلانی ژێردەست. هەرجارەی لە بابەتێکیدا، لەسەر گەلێکی ستەمدیدەی ئەو سەردەمی

ئەنووسی. جگە لەوەی لە ساڵی ١٩٧٥دا لە لیژنەی رۆشنبیری کۆمەڵە بوو، شارەزاییەکی بێئەندازەی لە مێژووی گەلانی دنیا بەگشتی وگەلی کورد بەتایبەتی هەبوو. شارەزایەکی چاکی بیری مارکسی بوو، زۆریش سەرسام بوو بە شۆرشی ڤێتنام و سەرکردەکەی، مام هۆ.. واتە هۆشی مینە، کە لەو سەرووەختەدا بزووتنەوەی کورد توشی هەرەس و ئاشبەتاڵ ببوەوە، ئەوان لە ڤێتنام سەرکەوتن بەسەر گەورەترین هێزی ئەوسەردەمی جیهان (ئیمپریالیزمی ئەمریکی)، کە لەوە و پێشیش سەرکەوتبوون بەسەر داگیرکەری فەرەنساویدا.

**پێنجەم.** لەو راپۆرتەدا (کە کەسانێک هەن بە هەڵە و بەبێ هیچ بەڵگەیک باس لەوە دەکەن) گوایە قسەی بە برادەرانی سەرکردایەتی کۆن و وتبێ و باسی ئەوەی کردبێ کە بە معترف و رووخاو باسیان کرابێت! ئەمەیان دوورە لە راستییەوە، بەڵکو دەست نیشانی ئەوە کرابوو کە ئەو برادەرانەی سەرکردایەتی، رێکخستنەکانی کۆمەڵەیان بەجێهێشت و نیازیان وا بوو لە رێی ئیرانەوە بەرەو شام برۆن، بەڵام لە ئێران گیران و پاشانیش تەسلیم بە عیراق کرانەوە. ئەو برادەرانە بە دوو تاقم رووەو ئێران بەرێکەوتن کە هەردوو مەجموعەکە بریتی بوون لە حەوت ئەندامی سەرکردایەتی کۆن و ئەندامانی ئەستێرەی سووری ئەوسەردەمە (کۆمیتەی هەرێمەکان). ئەو زانیارییانەی کە ئەو رۆژە هەمبوون، کۆمیتەی هەرێمەکان بریتی بوو لە **خاڵە شەهاب، حەمەی سەعی مەلا عەباس، جەعفەر عەبدولواحید، فەرەیدوون عەبدولقادر، ئاوات عبدالغفور.** لەپاش ئاشبەتاڵ و دوای هەندێ کێشەی ناو ریزەکانی کۆمەڵە، کۆمیتەی هەرێمەکان بریاری خۆهەڵوەشاندنەوەی داو کۆمیتەیەکی سەرکردایەتی (وابزانم) کاتی پێکهێنرا بەناوی کۆمیتەی ئەستێرەی سوور بەسەرپەرشتی **جەعفەر عەبدولواحید** و ئەندامێتی **عومەر سەید عەلی، ئەنوەر زۆراب، عەلی بچکۆل، ئاسۆی شێخ نوری**([17]) بێجگە لە **خاڵە شەهاب و جەعفەر عەبدولواحید و ئەنوەر زۆراب** کە فەرمانی لەسێدارەدانیان بەسەردا سەپاندن، باقیاتی هاورێیانی تر هەموو ماون، خۆیان چاکتر حالی وەزعەکە ئەزانن، تا ئێستاش (ئەوەی من پێی بزانم) هیچ کامێکیان هیچ روونکردنەوەکیان لەوبارەیەوە نەداوە، کەسیشیان گلەییان لەو راپۆرتە نەکردووە کە هەمووشیان نەک هەر بە ئەندامی کۆمەڵە مانەوە، بەڵکو تا هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەش (هەندێکیان) ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە و پاشانیش یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوون.

---

[17] مامۆستا جەعفەر عەبدولواحید، ئەرسەلان بایزی بۆ بەرپرسیارێتی کۆمیتەی پارێزگای هەولێر دانابوو. کە دواتر ئەویش لە لایەن گیراوەکان ئیعترافی لەسەر کرا بوو، بەرگەر گرووپی دووەم بەرەو ئێران کەوت.

**وەڵامی پرسیاری دووەم..**

سەیر لەوەدایە ئێمەی کورد کە دەم ئەکەینەوە باسی ئەو مێژووە ئەکەین کە لەسەرمان نووسراون بە ناراست لەقەڵەمیان ئەدەین بە پاساوی ئەوەی کە نەیار و دوژمنەکانمان شێواندویانە و لە راستییەکان لایانداوە. هەر یەکێک خۆی خەباتگێڕێکی کورد و ئەندامێکی کۆمەڵە بووبێت لە رۆژە ناخۆشەکاندا، جا هەش بەسەر کۆمەڵە ئەگەر مەسئول و کادر و ئەندامەکانی مێژووەکەی بە جۆرێک بنووسنەوە! کە راستییەکان سەراونخوون بکاتەوە! ئەبێ مەمنوونی نەیار و دوژمنەکان بین کە تا ئێستا شرتوشۆیان لێ نەبڕیووە و سوکوچروک و ریسوایان نەکردووە! هەر بۆ نموونە من کاتێ باسی گرتنی هەندێ لە برادەران ئەکەم، زۆر بە گوترە و بێ هیچ بنەمایەک کاتەکان و شێوەی گرتنەکانیان باس ئەکەم. کە هەندێکیان دوورن لە راستییەوە. چونکە من خۆم لەوێ نەبوومە، ئەو برادەرانە زۆریان خۆیان لەژیاندا ماون، خۆم لە قەرەی نادەم. بەڵام بۆ وەڵامی پرسیارەکەی تۆ سەبارەت هەوڵی دەزگای ئەمنی رژێمی بەسەرچوو بۆ دەستبەسەرکردن و گرتنی **شاسوار جەلال**. ئەوە کاتی خۆی لە رۆژانی موختەفیدا، **شاسوار** بۆی گێڕاوینەتەوە، هەوڵی گرتنەکەی بەو شێوەیە بووە.. کاتی ئیعتراف لەسەر **شاسوار** کرابوو، لە دائیرەی ئەمنی سلێمانی ئەچن بۆ گرتنی، ئەودەمە لە دائیرەی رێگاوبانی سلێمانی فەرمانبەر ئەبێ، **شێخ سالاری** برای مدیری ئەبێ. کە مەفرەزەکەی ئەمن ئەچنە دائیرەکە و ژوورەکەی **شێخ سالار**ەوە و داوا ئەکەن کە **شاسوار**ــ یان بۆ بانگ بکات، گوایە لە دائیرەی ئەمن کاریان پێی هەیە. **شێخ سالاری** براشی(بەپێی ئەو وشە نهێنییەی نێوانییان کە پێشتر دایانناوە) بە فەڕاشەکەی دەڵێ، **شاسوار** بانگ بکا بۆ ژوورەکەی بەرێوەبەر. فەڕاشەکە بەو جۆرە بە **شاسواری** دەگەیەنێ و لە گرتن دەرباز ئەبێ. هەر لەختوخۆرایی ئەو فەڕاشە نەگبەتە بە پیاوخراپ (زمانلێدەر) ناوزەد دەکرێت!

**وەڵامی پرسیاری سێیەم..**

سەبارەت بەوەش کە گوایە، **شاسوار** و **سالارعەزیز** لەساڵی ١٩٧٥ دا، لە کۆمەڵەدا نەمابوون! ئەوەندەی من ئاگادار بم، ئەو زانیارییە هیچ بنەمایەکی نییە. چونکە :

- کاتێ ئەندامانی سەرکردایەتی کۆمەڵە هەموو گیران، ژمارەیەک لە برادەران بەتایبەتیش **شاسوار** و **سالارعەزیز** لەناو شاری سلێمانی و **مەلا بەختیار** و

شەهید **ئازاد هەرامی** لە کوردستان رۆڵی گرنگیان هەبوو لە گرتنەوەی بازنەکانی ڕێکخستن و گرێدانەوەی هێڵەکان بە یەکترییەوە. من کە لە شاری دیوانیە (خوارووی عیراق) مامۆستا بووم، بە نهێنی هاتمەوە بۆ سلێمانی، لە ڕێگەی هاوڕێی خۆشەویستم "**ئازاد جەلال رەفعەت**"ەوە، یەکەم کەس کە پێوەندیم پێوە کرد، **سالارعەزیز** بوو. پاش ئەویش واتە **سالار، شاسوارم** بینی.

- مادام پرسیارەکە پێوەندی بە ساڵی ١٩٧٥ ەوە هەیە، لە دەمی ئاشبەتاڵدا، واتە لە مانگی ئازاردا، زۆربەی برادەرانی کۆمەڵە بەمەبەستی تاووتوێکردنی موقاوەمەت یان نەکردن، لە دێی کێلوی سەر بە قەزای پێنجوێن، کۆبوونەوەیەکی چەند رۆژییان ئەنجام دا. **خاڵە شەهاب** کە لەوەوپێش لە ناوچەی چۆمان و ناوپردان و ئەوناوە بوو ، لەدوای ئەوەی بێ هیوا بوو بوو لەوەی کە سەرکردایەتی شۆڕش موقاوەمەت بکات، هاتبووە ناوچەی پێنجوین. هەر لەوسەروبەندەدا، برادەرانی وەک **شاسوار** و **دارۆی** برای **خاڵە شەهاب** لەو دەوروبەرە چاوەڕوانی بڕیاری سەرکردایەتی کۆمەڵە بوون. هەروەها **جەمالی عەلی باپیر** و هەندێ لە ئەندامانی تری کۆمەڵە لە ناوچەکانی نۆدێ/ی ئالان و ناوچەی دێروباری و مەرۆێ و پێنجوین و ماوەت و هەڵەبجە و تەوێلە و بیارە کە ئەودەم سەر بە ڕێکخستن بوون لە ئامادەباشی دابوون و چاوەڕوانی فەرمانی سەرکردایەتی بوون. ئەوانەی لەبیری من ماون و لەوان رۆژان بۆ کۆبوونەوە هاتبوونە دێی کێلو بریتی بوون لەم زاتانە.. **خاڵە شەهاب، حەمەی سەعی مەلا عەباس و فەرەیدوون عەبدولقادر و عومەری سەید عەلی و ئاوات عبدالغفور و وکمال عەلی و سەلام خەیات و نجم الدین (سالار) عزیز و مامۆستا عزیز و دلێرتاهیر و ئەنوەر شاکەلی و ئەرسەلان بایز (بە نوێنەرایەتی ئەو هاوڕێیانەی لە ماوەت کۆببوونەوە) و ئازادجەلال رفعت و ئیبراهیم ئەحمەد (ئیبراهیم سەرسپی) و سەلاحی حسینەفەندی و مامۆستا بهائدین و اکرم ئەحمەد سیف الله و گۆرانی حسینەفەندی و تایەری شێخ سدیق (شێخ فتاح) و عوسمان** (بەداخەوە ناوی باوکیم لەبیر نەماوە) و **تەها باراوی** و چەندان برادەری دیکە کە بەلێبووردنەوە ناوەکانیانم لەبیر نەماوە. ئەو دەمە **سالار عزیز** لە سکرتارییەتی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان، ئامێرێکی تایپی چاپکردنی لەگەڵ خۆی بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵە هێنابوو. کاتی خۆی ئەو تابیعەیە لەگەڵ چەند پارچە چەکێکدا کە بەسەرپەرشتی **عومەری سەید عەلی** لەگەڵ **سەلام خەیات** و **برایم سەرسپی** و **مامۆستا بهادین** و **تەها باراوی** لەرێی پێنجوینەوە گەیانرایەوە ناو شاری سلێمانی و چەکەکان لەلایەن **عومەری سەید عەلی**

شاردرانەوە و تابیعەکەش (ئەگەر بەهەڵەدا نەچووبم بە سەیارەکەی **شازاد سائیب** هێنرایەوە) لەلای **سەلامی خەیات** تەقەتکراو (شاردراو) هەر لەو مانگی سێیەی ساڵی ١٩٧٥ **خاڵە شەهاب** بەیاوەری **سالار عەزیز** و چەندان هاوڕێی تر، سەردانی لقی چواری پارتی و هێزەکانی خەبات و زمناکۆی کرد.

- بەنیسبەت **(ئارام)** یشەوە، ئەوە هەموو برادەران ئەزانن کە هەتا ئازاری ٩٧٥ **شاسوار جەلال** لە ئەمانەتی ئەوقاف و عدلیە کارمەند بوو. **عەباس** تۆ یەکێک لەو ئەندامانەی کۆمەڵە بووی و لە نزیکەوە پێوەندی رێکخراوەییت بە **شاسوارەوە** هەبووە و ئەو برادەرانەش ک هاتوچۆی ئەو ناوچەیەیان کردووە وەک **عومەری سەید عەلی** و **فەرەیدوون عەبدولقادر** بەوە دەزانن کە **شاسوار** بەدوای ئاشبەتاڵەوە لەلایەن سەرکردایەتی کۆمەڵەوە، نەوەک هەر چالاک و هاوکار بووە، بگرە لە لیژنەی رۆشنبیری کۆمەڵەشدا بووە، ئەو لیژنەیە لەپاڵ **شاسوار جەلال**، کەسانی وەک **حەمەدەمین پۆلا** و **فوئاد مەجید میسری** تێدابووە و وەک من بزانم لەلایەن **عومەری سەید عەلی** سەرپەرشتی کراون.
- ئەمینێتەوە سەر ئەوەی بڵێم، ئەگەر **شاسوار** و **سالار** لەنێو ریزەکانی رێکخستنیدا نەبونایە، چۆن ئەیانتوانی ئەو رۆڵە بگێرن کە ئەرکی گرتنەوە و سەرپەرشتیکردنی رێکخستنەکانی ئەو سەردەمەی کۆمەڵەیان هەبێ و بەردەوامی بدەن بە کار و چالاکییەکانی کۆمەڵە!

**وەلامی پرسیاری چوارەم..**

دەربارەی ئەوەش **ئارام** کە چۆتە شاخ، یەکسەر بۆ قەرەداغ چووە و تەنها لە ٧ _ ٨ دێی قەراغ دا گیری خواردوە!

- **ئارام** پاییزی ساڵی ١٩٧٦ هاتە دەرەوە، پێش چالاکی تەقەکردن لە پارێزگاری سلێمانی بوو. یەکەمجار هاتە دێی زەرون، ئەو رۆژە زۆربەی برادەرانی بزووتنەوە و کۆمەڵە لە زەرون بوون، **ئارام** ماوەیەک لە زەرون مایەوە و لە ماڵی **حاجی ئەحمەد** و برایەکی کە هاوڕێی کۆمەڵە و پێشمەرگەش بوو. ماوەیەک لە زەرون مایەوە و لەوێوە هەتا کانیتوو و مەرگە هەوارەکانی سیرەمێگ و ئەو ناوانە گەڕاو پاشانیش چووە دێی گەورەدێ و لە مقرەکەی **رەئیس عەبدوڵلا (خەباتی کەریمی حاجی مارف** کە ئێستا لە ولاتی نەمسا ئەژی) ماوەیەک مایەوە و پاشان لەگەڵ **ئازاد هەورامی** و **سالار عەزیز** و ژمارەیەکی زۆر لە هاوڕێیانی

کۆمەڵە کە لەو ناوچەیە بوون، جەولەیەکی درێژی کرد بۆ ناوچەی هەورامان و دەوروپشتی هەڵەبجە و پێنجوێن، ئەوەندەی من بەبیرم مابێت هەتاکو دێی سازان ڕۆشتبوون کە ماوەی زیاتر لە مانگێکیان پێچوو. دوایی لەو ناوچەیە مایەوە و هەتا بەهاری ساڵی ١٩٧٧ بەرەو قەرەداغ کەوتە ڕێ.

- **ئارام** ئەو کاتە کاراکتێری سەرەکی و بەعەمەلی سکرتێری کۆمەڵە و یەکێتی نیشتمانی ناوەوەی وڵات بوو. خۆ ئەو تەتەری شۆڕش نەبوو، هەر خەریکی جەولە و گەڕان بێت. کاری ئەو بەڕێوەبردن و سەرپەرشتیکردنی کۆمەڵە و کاری شۆڕش بوو. ئەگەر لە یەک ناوچەش بووبێت، کەی جێگای نەقد و عەتەبە!
- **ئارام** لەگەڵ **عەلی عەسکەری** و برادەرانی بزووتنەوە دانیشتنیان کردووە و گوایە ڕێکنەکەوتوون! ڕاستە لە نێوان **ئارام** و برادەرانی کۆمەڵە لەلایەک و **عەلی عەسکەری** و برادەرانی بزووتنەوە لە گەورەدێ و سەفرە (نەک لە قەرەداغ، چونکە عەلی عەسکەری لە شۆڕشی نوێدا نەچۆتە قەرەداغ) دانیشتن کرا و بگرە لە یەکەم دانیشتن ڕێککەوتن لەسەر پێکهێنانی دەستەی سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانی ناوەوەی وڵات کە بەم شێوە بوو.. **ئارام** وەک سکرتێر، **عەلی عەسکەری** وەک لێپرسراوی عەسکەری، **ڕسول مامند** وەک لێپرسراوی ڕۆشنبیری، **ئازاد هەورامی** وەک لێپرسراوی ڕێکخراوەیی. پاشان بڕیاردرا دوو هەرێم دروست بکرێ، هەرێمێک بۆ ناوچەکانی سلێمانی و ئەویتر بۆ ناوچەکانی هەولێر و بادینان.

هەر هەرێمێک ئامرهەرێم و یاریدەدەرێکی هەبێ و هەر لەو کۆبوونەوە بڕیار درا هەر یەک لە کۆمەڵە و بزووتنەوە ئامری هەرێمێکیان پێبدری بەمەرجێک لەو هەرێمەی کۆمەلە ئامری بێت، بزووتنەوە کەسێک بۆ یاریدەدەری دابنێ. هەروەها لەو هەرێمەی بزووتنەوەش، کەسێک لە کۆمەڵە بۆ پۆستی یاریدەدەر دەست نیشان بکرێ. ئەم دانیشتنە لە کۆتایی مانگی دوودا کراو لە ساڵی ١٩٧٧ دوای یەک دوو دانیشتن، بۆ ئەوەی کارەکان دەست نیشان بکرێ و ئەو ناوانەش تاوتوێ کران کە بۆ ئەو پۆستانە دیاریکرابوون.. لە سەرەتادا هەندێ کێشە دروست بوو، لەڕووی ئەوەی لە کۆمەڵەدا، چەند ناوێک هەبوو بۆ ئامر هەرێم، وەک **سالار، ملازم عومەر** و لە بزووتنەوەش **عەلی عەسکەری** و **دکتۆر خالد** . لەو کێشانەش کە هەبوون، **سالار** پێی باش بوو، خۆی ئامر هەرێمی سلێمانی بێت و نەچێتە ناوچەکانی هەولێر، لەبەر ئەوەی هەر خۆی لێپرسراوی ڕێکخستنی کۆمەڵە بوو لە سلێمانی و نەیئەویست لە ناوچەکانی سلێمانی دوور بکەوێتەوە. واتە پێی لەسەر ئەوە

دائەگرت هەم ئامرهەرێم بێت و ئامرهەرێمی سلێمانیش. **عەلی عەسکەریش** داوای ئەوەی ئەکرد یان خۆی یان **دکتۆر خالد** ئامرهەرێمی سلێمانی بن، واتە هەرێمی سلێمانی بۆ برادەرانی بزووتنەوە بێت. لە گەرمەی ئەو وتوویژەدابوو بە هەموو لایەک هەوڵی ئەوە ئەدرا ئەو کێشەیە چارەسەر بکرێ، نامەیەکی **مام جەلال** هات بۆ کۆمیتەی هەرێمەکانی کۆمەڵە، بەلام نامەکەیان بەهەڵە یان بەمەبەست لەرێی برادەرانی بزووتنەوە گەیشتە کۆمیتەی هەرێمەکانی کۆمەڵە و نامەکە کرابووەوە و لەلایەن برادەرانی بزووتنەوە خوێندرابووەوە، ئەوجا تەسلیم بە **ئارام** کرا. ئەوەی جێگای ئاماژەیە، لەو نامەیەدا بە روونی هاتبوو، وەک ئامۆژگاری **مام جەلال** بۆ کۆمەڵە کە تیا نووسرابوو، ئەبێ ئامن ئەگەرێمەوە ئەبێ تەبا بن، هەروەها ئاماژەی بەوەش دابوو، نووسیبووی کەمن (**مام جەلال**) **دکتۆر خالد** بەجێگری خۆم و سەرپەرشتیکەری ناوچەی بادینان داناوە و **عەلی عەسکەریش** بە سەرپەرشتیاری ناوچەی سۆران. پاش ئەوەی **عەلی عەسکەری** بەوەی زانی کە نامەکەی **مام جەلال** گەیشت و برادەران خوێندبوویانەوە، پێی لەسەر ئەوە دائەگرت و ووتی.. ئەگەر ئێوە **مام جەلال**/تان بە سکرتێری خۆتان قبولە ئەوا بەقسەی بکەن یان ئێوە بڵێن سکرتێری ئێمە نییە، ئەوا ئێمە بە سکرتێری خۆمان قبولە و بەقسەی ئەکەین. ئێتر وەکو کورد ئەڵێ.. وەی لە هینێ و وەی لەدۆشاوێ!

**وەڵامی پرسیار پێنجەم..**

من بەتەواوی نازانم، **برایم جەلال** چەند جار لەگەڵ **ئارام** و برادەرانی کۆمیتەی هەرێمەکان دانیشتوە! بەلام بۆ جارێکیان کە ئەوەی لە بیرم مابێت لە مانگی مارتی ١٩٧٦ بوو، لە ماڵی **دلێری سەید مەجید**، برایم بە وجودی بەندە و خاوەن ماڵ، (**ئارام**)ی بینیوە، ئەویش بەم شێوەی خوارەوە بوو.

"**ئارام** بۆ رۆژی پێشوو تر، **برایم خەلیل** _ ی سەرۆکی کۆمەڵەی رەنجبەران دیبوو، کە **برایم حسن** سکرتێری ئەو کۆمەڵەیە بوو و دوایی گیراو و چەندان کادرو ئەندامی دڵسۆز و تێکۆشەری کۆمەڵەکەی خۆیانی (کۆمەڵەی رەنجبەران) لەپێشەوە بەگرتن دا، لە نموونەی **عەبدوڵلا ی موزەمید** و **شێخ کمال شێخ مەحەمەد** کە لەسێدارە دران، هەروەها کۆمەڵێک تێکۆشەری دیکەی لە کۆمەڵەی مارکسی_ لینینی (بیروباوەڕی ماوتسی تۆنگ)ی کوردستان ئەو کاتە و برادەری پاسۆک و پارتی و هەتا خەڵکی دیکەشی دابەدەمەوە کە لەو کورە دڵسۆزانەی ئەو رۆژەی دابەدەستەوە و لە زیندانەکانی بەعس هەتاکو مانگی تەموزی ١٩٧٩

بەند کران. **برایم خەلیل** و هەندێ لە برادەرانی دیکەیان دەرباز بوون و بۆ پێشمەرگایەتی چوونە شاخ و بەداخەوە بە مەفرەزەیەک لە ناوچەی هەڵەبجە هەموویان شەهید بوون."

لە هەر دوو دانیشتنەکەی **ئارام** لەگەڵ هەر دوو برایم دا (**برایم خەلیل و برایم جەلال هەریەکەیان بەجیا**) لە تەکیان بووم، بەبێ ئەوەی من قسەیەک بکەم. ئەو دوو برایمە، رەخنەیان لە کۆمەڵە و کۆمیتەی هەرێمەکان لەسەر راپۆرتی شوبات هەبوو. هەرچی **برایم خەلیل** بوو ئەیووت، لەو راپۆرتە خاتری برادەرانی سەرکردایەتی کۆنی کۆمەڵە واتە **خاڵە شەهاب** و هاورێیەکانی گیراوە و وەکو پێویست رەخنەیان لێ نەگیراوە و شەرتی ئەو بۆئەوەی خۆیان (کۆمەڵەی رەنجبەران) حەل بکەن و بێنەوە ریزی کۆمەڵەی (م. ل)ی کوردستان ــ بیروباوەڕی ماو ــ ئەبێ لەپێشەوە کۆمیتەی هەرێمەکان رەخنەی توند ئاراستەی ئەو برادەرانەی سەرکردایەتی کۆنی کۆمەڵە بکرێ کە ئەو دەم لە زیندان بوون. **ئارام** و کۆمیتەی هەرێمەکان بەوداوایە رازی نەبوون و **ئارام** بە **برایم خەلیلی** راگەیاند.. کە هەرگیز بێوەفایی و فرسەتتەلەبی کاری ئەو و کۆمەڵە نییە.

لەپاش ئەو دانیشتنەی نێوان **ئارام** و **برایم خەلیل**،(کۆمەڵەی رەنجبەران) نووسراوێکیان دەرکرد کە دانەیەکیشیان بۆ ئێمەنارد و کۆمەڵەیان بەوە تاوانبار کرد کە گوایە رێگر بوون لە یەکگرتنەوەدا، تەنانەت لە پەرەگرافێکا وەها هاتبوو کە ئەڵێ..(کۆمەڵەی مارکسی لینینی ــ کوردستان ــ بیروباوەڕی ماوتسی تۆنگ) عەرەبانەشڕەکەی **خاڵە شەهاب** رائەکێشن.

بەڵام **برایم جەلال** کە یەکەم جار بوو **ئارام** ببینێ، بە پێچەوانەوە باسی ئەوەی دەکرد کە ناهەقی بەرامبەر برادەرانی سەرکردایەتی کراوە. لەو دانیشتنەی من ئامادە بووم، باسی ئەوەشی نە ئەکرد کە ئەو رێکخستنی لابووبێ یان بە (**ئارام**)ی ووتبێ کە ئەو (**برایم**) ئەوە قبول ناکات کە گوایە **ئارام** خەریکی ئەوە بێت کۆمەڵە دەستەمۆ بکات! لەو کاتەی **ئارام**، **برایم جەلالی** بینی، **ئارام** بە پراکتیک کارەکانی سکرتێری کۆمەڵەی ئەبرد بەڕێووە، بەبێ ئەوەی خۆی رازی بێت کە پێی بوترێ، سکرتێری رێکخستنی کۆمەڵە. ئەو **ئارام** هەر وەک ئەندامێکی کۆمیتەی هەرێمەکان کاری ئەکرد. هەروەها لەو دانیشتنەدا، بەوە ئەچوو **برایم جەلال** بەویستی خۆی لە رێکخستن دوور کەوتبێتەوە و **ئارام** بە شێوازە هێمنەکەی خۆی، پێشنیازی ئەوەشی بۆ کرد کە بگەڕێتەوە بۆ ریزەکانی رێکخستن. لەبارەی راپۆرتەکەشەوە، **ئارام** بە **برایم جەلالی** ووت.. کاکە تۆ ئەڵێی ناهەقی بەرامبەر بە برادەرانی سجن کراوە و **برایم خەلیلیش** ئەڵێ ئێوە خاترتان گرتوون. جا بریا هەردووکتان یەکدیتان ئەدی، خۆتان لەسەر خاڵێک رێکەوتنایە و پاشانیش ئێمەتان لێ ئاگادار بکردایەتەوە. ئەوە

تەنها ئەو جارە بوو کە من **برایم جەلالم** دی، پێش ئەوەی بچمە شاخ. سەیر لەوەدایە من هێشتا لە ژیاندا زیندووم، **برایم** ئەڵێ.. **تەها** لە جنوب **هاتەوە** و من ناردمە دەرەوە. کەچی من لەمانگی ١٠_ ی تشرینی یەکەمی ساڵی ٩٧٥ لە دیوانیەوە هاتمەوە بۆ سلێمانی و تا ڕۆژی ٢٨_ ٧_ ٩٧٦ لە سلێمانی موختەفی بووم و پێوەندیم بەریزەکانی کۆمەڵەوە هەبووە. ئاخر ڕۆژ واتە یەکەم ڕۆژی چوونە دەرەوەم لە ماڵی **کامیلی شەفیق** برای برادەران **فایەق و فازیلی شەفیق** بووم و **مەلا بەختیار** هات بەدواما کە هەر ئەو ڕۆژە لەگەڵ (**ئارام**)دا بووم و بە مەفرەزەیەک چووینە دەرەوە کە بریتی بوون لە.. **ملازم جوامێر** (کە دواتر لە بەغدا لە هەڵۆی سوور بوو، گیرا و شەهید کرا) **شێخ فەتاح واتە تایەری شێخ سدیق، حاجی چاوشین واتە حمە سدیق، غریب خولەی ئەمینی بوک، خلیفەی عەبدوڵلا مارف، لەتیف وەستا حسن، تەها باراوی** (وەک ڕابەری سیاسی) مەفرەزەکە. پاشان دوای دە ڕۆژێک لەسەر خواستی **ئارام** گەڕامەوە بۆ سلێمانی کە مەفرەزەیەکی تر ئامادە بوون بۆ هاتنەدەرەوە کە بریتی بوون لە **ستار سەعید خەلەف** (وەک ئامر مەفرەزە)، **نەبەز (خولەی جگەر)، کەریمی دادەمەنە (دکتۆر چالاک)، فایەق شەفیق، دەرسیم (غەفور سعید حسن)، احسان (ئەبو شەهاب)، ئەنوەر توفیق هەورامی**، ئەو کەسەی لە چالاکییەکەی پارێزگاری سلێمانی **هاوبەش** بوو. ئەو مەفرەزەیە بە سەیارەیەک لە سلێمانییەوە بەرێی عەربەتدا تا بەرزنجەی بردین.

**وەڵامی پرسیاری شەشەم..**

پاش ئەوەی برادەرانی سەرکردایەتی و ئەستێرەی سوور (کۆمیتەی **هەرێمەکان**)ی کۆن بەرەو شام (ڕوو لە ئێران) بەرێکەوتن، بە شێوەیەکی کاتی ڕێکخستنیان تەسلیم بە هاوڕێیەک کرد تاکو خۆیان ئەگەڕێنەوە. ئەو هاوڕێیەش (**عوسمان نانەوا**) هەر بەزوویی دەستگیر کرا. دوابەدوای ئەوە **ئارام** و هاوڕێیەکانی بەپەلە کۆمیتەی هەرێمەکانیان زیندووکردەوە کە بریتی بوون لە **ئارام، ئازاد هەورامی، سالار، مەلا بەختیار** کە هاتبوە سلێمانی (من ئەبێ بۆ حەق بڵێم، **ئارام** خاوەنی دەستپێشکەری و بیرکەرەوە و ئەندازیار و بەڕێوەبەری هەوڵەکانی گرتنەوە و خستنەوە سەرپێیانی کۆمەڵە بوو لەوان ڕۆژاندا، هاوڕێیان هاوکار و دەستباری **ئارام** بوون، بەڵام **سالار** لەپێشەوە و **مەلا بەختیار** دینەمۆی پێکەوەگرێدانی ڕێکخستنی ناو شارەکان بوو، بەو هۆیەی لە سەرەتادا بە ئازادی دەهات و دەچوو، ڕاپەڕاندنی زۆربەی ئەرکەکانی ڕێکخستنی ناوەوەی شارەکان لەسەر شانی ئەو بوو، هەروەها نابێ ڕۆڵی **سالار** و **ئازاد هەورامی**/یش لەبیر بکەم کە ئازایانە

شانیان دابووە راپەڕاندنی ئەرکی قورسی ئەودەم)، **ئازاد هەورامی، ئارام** و **سالار** لەناو شاری سلێمانی بە ئیختفا سەرپەرشتی کارەکانی رێکخستنیان دەکرد. چەند برادەرێک کە بە پەنجەی دەست دەژمێردران، کاری رۆژانەیان جێبەجێ دەکرد، زۆری کارەکانیش لە شاری سلێمانی بەرێوە ئەبرا. ئەو برادەرانەی کاری رۆژانەی رێکخستنیان ئەنجام ئەدا، زۆر بە چالاکی و ئەوەندەی بیرم مابێت، کەسانی وەک **مەلا بەختیار، شەماڵ (شێخ مەحەمەدی باخ)، سوارەی ئەحمەدی عارف، شێخ لەتیف شێخ عمر، دلێری سەید مەجید، ئازادی جەلال رفعت، ئاوات قارەمانی** کە ماڵەکەی مختەفیخانەی سەرەکی ئەو رۆژانە بوو، **ئازادی حەمەی مەلا، ئازادی سەگرمە، بەهرۆزی سالحی قەشانی، شوان (شاملی شێخ عەلی)، برایم سەرسپی، جماڵە رەش، دکتۆر بەختیار، خۆشناو ئەمین حاجی عزیز و عەزیز مەحمود** و هەندێ برادەری دیکە، بەداوای بووردنەوە ناوەکانیانم لەبیر نەماوە. هەر لەو دەمدا، هەندێ برادەری تر لەناو شاری سلێمانی خۆیان شاردبوەوە لە نموونەی، **چەماڵی عەلی باپیر، حەمەدەمین پۆلا، خەبات کەریم حاجی مارف، فوئادی مەجید میسری، حەمە سەعیدە قەڵەو** و چەندانی تر..

دوای گرتنەوەی رێکخستنەکانی کۆمەڵە، برادەران کەوتنە دروستکردنی رێکخراوی خوێندکاران و بەیاننامەیەکیان بڵاوکردەوە بەناوی خوێندکارانەوە کە رۆڵێکی گرنگی هەبوو لەو سەردەمەدا. کۆمیتەی هەرێمەکان لەگەڵ کادرە عەسکەرییەکانی ئەو سەردەمی کۆمەڵە کەوتنە دروستکردنی مەفرەزە سەرەتاییەکان کە هەر لە کۆتایی مانگی ٧ی ٩٧٦ ـەوە بەرەو دوا، چوونە شاخ بۆ دەستپێکردنی خەباتی چەکداری. بۆ ئەو مەبەستە کۆمیتەی هەرێمەکان پەیڕەوی ناوخۆی دەستەچەکدارەکانی نووسی کە لە پێنج خاڵ پێکهاتبوو. هەر مەفرەزەیەک نووسخەیەکی لەو پەیڕەوە پێبوو. ئەوەبوو کۆمیتەی هەرێمەکان بە هاوبەشی کادرە سەربازییەکانی نموونەی وەک، **ملازم عومەر، ملازم ستار سعید خلف، جوامێر سیامیر، چەماڵی عەلی باپیر، تالب روستەم، بەکری حاجی سەفەر، خولە کەشکۆل، سەلاح چاوشین** و هەندێ برادەری تر، مەفرەزە سەرەتاییەکانی سلێمانی و دەوروبەری پێکهێنرا..

پێم باشە لە کۆتاییدا، هەندێکی باری سەرنجی خۆم بخەمە روو لەگەڵ ئەوەشدا رێزم بۆ هەموو ئەوکەسانەی لە خەباتی سیاسی لە کوردستان هاوبەشییان کردووە، کەم یا زۆر ماندوو بوون و قوربانییان داوە، ئیتر بە هەر جۆرێک بووبێ، پێم وابێ ساڵانی زوو زۆربەی خەڵک ناچار کرابوون بە خەباتی سیاسی. چونکە مەرج نییە خەڵک بەئارەزوومەندی کاری سیاسی هەڵبژاردبێ. تکام وایە کەس بەمەبەستی خراپ لێم حاڵی نەبێ. سیاسەتیش هەروەکو هەموو پیشەیەکی تر کادر و شارەزای خۆی پێویستە، کەسێک

که پسپۆڕی ئەو بوارە نەبێ، مەحالە سەرکەوتن بەدەست بێنێ. من خۆم بە کەسێکی سەرکەوتوو لەوبوارەدا نابینم. وەکو لە پێشەکییەکەشدا باسم لێوە کردووە، بۆیە هەڵسانگاندنی سیاسی بۆ ئەو برادەرانەی ئەو سەردەم بۆ من کارێکی ستەمە. بەڵام حەزیش ئەکەم کە هەندێ ڕەوشتی جوانی **ئارام** هەبوو بەبیر بهێنمەوە، کە بەداخەوە زۆر هەوڵی ئەدا زۆربەیمان فێر بکات، کە وابزانم کەمیشی لێ فێر نەبووین! ئەم ڕایەم لە گۆترە نییە، بەڵکو سەرئەنجامی ئەو ماوەیە کە لە خزمەتیا بووم وەکو موختەفی لەم شوێنانەدا.. لەماڵی **ئاوات قارەمانی**، لە ماڵی **شێخ عوسمانی باراوی**، لە ماڵی **لەتیف شێخ عمر**، لە ماڵی **کامیلی شەفیق**، لە **ماڵی باپیرم**، لە ماڵی **دلێری سەید مەجید** و چەند شوێنێکیتر کە لەبیرم نەماون. ئەمە جگە لە ماوەیەک کە لە شاخ لە دێیەکانی زەروون، سەفرە، گەورەدێ، گەرەدێ و هەندێ ناوچەی تر لە تەکیا بووین.

1) بەش بە حاڵی خۆم لە کاری سیاسیدا کەسم نەدیبوو تا ئەو کاتە وەک **ئارام** بتوانێ گوێگرێکی باش بێ. بەپێچەوانەی ئەوەی **برایم جەلال** ئەڵێ، خۆی ئەسەپاند! نەخێر نەوەک هەر خۆی بەڵکو ڕای خۆیشی نەدەسەپاند. تەنانەت لە وتووێژدا قەت بۆ یەکجاریش نەم دیبوو دەنگ بەرز بکاتەوە. بەراستی هەندێ جار کە قسەی بۆ ئەکردین، چەند جارێک پێم دووبارە ئەکردەوە. ئەوەندە بە نەزاکەت و ڕێزەوە بۆ بەرامبەرەکەی قسەی ئەکرد، ئەو کەسە بە ئاسانی خۆشی دەویست.

2) هەموو کەس کەم یان زۆر خۆپەرستی تیایە، لە خواردنا بەشە باشەکەی بۆ خۆی ئەوێ، لە کاتی خەوا جێگای باشی ئەوێ. بەڵام ئەتوانم پرکێشی بکەم کە **هیچ** جۆرە خۆپەرستییەک لەو مرۆڤەدا **ئارام** بەدی نەئەکرا. کورد ئەڵێ.. سەفەر و موعامەلە سەنگی مەحەکە، من سەفەر و موعامەلەم لەتەکدا کردبوو، موعامەلەی کە سابەت نا، موعامەلەی ژیان. بەڵام من ناڵێم تاک بوو، بگرە تا ئەو ساتە وەختەش زۆر کەم لەو بابەتەی **ئارام** ئەبینم، چونکە هەر زۆر دەگمەن بوو. بەراستی مامۆستا **گۆرانی شاعیر** باشی پێکاوە کە ئەفەرموێ.. قەدری سەنعاتکار لەناو قەومی بەسیتا وەکو عەکسی قەمەر وایە لەنێو حەوزێکی لێخندا.

3) **ئارام** نەوەک هەر خاوەن قەڵەم بوو، بەڵکو خاوەنی قەڵەمێکی بەبڕشت بوو، زۆربەی زۆری نووسراوەکانی ئەو سەردەمی کۆمەڵە و شۆڕش ئەو ئەینووسین.

4) چەند ساڵێک بەر لە ئێستا، ڕادیۆیەک پرسیارێکی لێ کردم سەبارەت بە توانای سەرکردایەتی (**ئارام**)ەوە. من ئەوسا و ئێستاش ڕام وایە لەسەر **ئارام**، ئەگەر

سەرکردایەتی بریتی بێ لە تفەنگچێتی و سوارچاکی! ئەوە **ئارام** نە خاوەنی رەخت و ماین بووە، نە سوارچاکی شۆڕەسواربووە و نە بۆیەکجاریش فیشەکێکی تەقاندووە. تەنانەت ئەو ماوەیەی لە خزمەتیا بووین، بۆ یەکجاریش نەم دی نیشانەش بنێتەوە و فیشەکی بەخۆرایی پێوە بنێ. سەرەتا کە لە دەرەوە (شاخ) بوو، حازر نەبوو چەکی پێ بێ. تاکو رۆژێ **ملازم عومەر** پێی ووت، **ئارام** تکایە چەکێک هەڵگرە با پێت بێ. لە وەڵاما پێی ووت.. **عمر** چەکم بۆ چییە! قابیلە تەقەی پێ بکەم. **عمر** پێی ووت.. بۆ ئەمەیان ناڵێم، بەڵام ئێمە جەولە ئەکەین، بە دێهاتەکاندا ئەگەڕێن، هەموو کەس تۆ ناناسێ، دوور نییە هەبێ وا تێبگات، تۆ ئەمنی و پیاوی رژێمیت و بە دیل گیراوی، یاخود دەستبەسەر کراویت و هەر لە خۆیانەوە هەڵکوتنە سەرت و عەزیەتت بدەن.

5) **ئارام** ئەوەندە رێزی هاوڕێیەکانی و بەهاکانی مرۆڤایەتی ئەگرت کە وێنەی زۆر کەم بوو. بۆ نموونە هەموو لێپرسراوێکی ئەو کاتە ئەگەر مەفرەزەیەکی لەگەڵدا نەبوایە، ئەوە چەند حیمایەیەکی لەگەڵ دابوو. کەچی **ئارام** بەوە رازی نەبوو، تەنها فازیلی شەفیق وەک حیمایە لەتەکیابوو، بەڵام **ئارام** وەکو هاوڕێیەکی خۆشەویست موعامەلەی ئەکرد. عادەت وا بوو حیمایە پێش مەسئولەکەی لە خەو هەڵئەسا، بەڵام زۆربەی جار **ئارام** بە یەکدوو سەعات پێش **فازیل** لە خەو رادەبوو. بۆ راستی ئەم قسانەشم، **ئارام** کە شەهید دەکرێ، بەتاقی تەنیا ئەبێ، نەک هیچ مەفرەزەیەک، بگرە حیمایەکەی خۆیشی لەگەڵ نابێ.

6) هەندێ جار لەگەڵ هەندێ برادەرا پرسیاری ئەوە ئەکرێ و ئەوترێ، تۆ بڵێی **ئارام** شەهید نەبوایە و ئێستا لەژیاندا بمایە، ئەویش یەکێک نەئەبوو، وەکو ئەم لێپرسراوە گەندەڵانە! بە بڕوای من ئەگەر **ئارام** ئێستا لەژیاندا بمایە، نەک هەر نەئەبوو بە لێپرسراوێکی گەندەڵ، بەڵکو هەر نەش ئەبوو بە لێپرسراو. ئەشتوانم پرکێشی ئەوەش بکەم کە احتمالی ئەوەش هەبوو هەر وازیشی لە کاری پارتایەتی (حیزبایەتی) بهانیبایە و خەریکی نووسینی کاری فکری بوایە.

7) **ئیمامی عەلی** چەند خەریکی شیعەگەرایی بوو، چەند هەوڵی دروستکردنی شیعەگەرایی داوە، (**ئارام**)یش هەر ئەوەندە لە بزووتنەوەی گەلی کوردا، خەریکی دروستکردنی رێبازی (**ئارام**)ی بوو. **ئارام** تەنها و تەنها خەمی گەورەی، خزمەتی مرۆڤایەتی بووە و هەمیشە ئەو رستەیەی مارکسی دەگوتەوە، کە مرۆڤ

بەنرخترین سەرمایەیە و بەو رستەیەش مارکسیەتی راڤە ئەکرد و (**ئارام**)ی وەک شوێنکەوتوانی بیری مارکسی بەرهەم هێنا. **ئارام** عاشقێکی گەورەی بیری مرۆڤپەروەری بوو، پێی وا بوو مرۆڤ یان خەڵکی شۆڕشگێڕ و تێکۆشەر، ئەبێ پێشەکی روحیانەتی خۆیان پاک بکەنەوە و خۆیان بە بیری مرۆڤایەتی گۆش بکەن و خەڵکی پێ پەروەردە بکەن. پاشان خەڵکی شۆڕشگێڕ هەمیشە و لە هەموو بارودۆخێکدا، ئەبێ خۆیان بۆ خزمەتکردنی گەلەکەیان تەرخان بکەن. **ئارام** لە ژیانی خوێندنی زانکۆدا، لەبەشی ناوخۆیی قوتابیاندا، لەگەڵ دوو قوتابی خەڵکی وڵاتی ڤێتنام ئەبێتە ناسیاو و هاوڕێ. باسی ئەوەی بۆ ئەکردین کە چۆن ئەو دوو برادەرە کە ئەو هەتا ناوەکانی لە بیر مابوون و پێوەندی پێیانەوە مابوو، دەیگێڕایەوە..ئەو دوو قوتابییە جلوبەرگی هەموو قوتابییەکانی ئەو بەشی ناوخۆییەیان دەشوشت و لەئوتو ئەدا و نیوە قیمەتیان لە قوتابییەکان وەرئەگرت و پارەکەی کۆیان ئەکردەوە، بۆ خەڵکی وڵات و شۆڕشگێڕەکانی ڤێتنامییان ئەناردەوە. هەتا **ئارام** لەناو شۆڕش دەوری هەبووبێ، بڕوا ناکەم بە ئاگاداری ئەو هیچ ناهەقییەک بەرامبەر کەسێک کرابێ. بەڵام بەداخەوە **ئارام** ئەم گەلە ستەمدیدەیەی هەر زوو بەجێهێشت و پاش خۆیشی وەک **پشکۆ نەجمەدین** لە کتێبی ئەزموون و یاددا، نووسیویەتی.. روحیانەتەکەی بۆ ماوەیەک لە جەستەی **ئازاد هەورامی** بەرجەستە بوو. ئەتوانم بڵێم هەڵسەنگاندنی کەسایەتی **ئارام** بە کەسێکی نەشارەزای وەکو ئێمە بەتەنها ناکرێ. خۆزگە ئەو برادەرانەی ئەو وەختەی رێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شار و لە شاخ دا، بە دەستەجەمعی توێژینەوەیەکی چڕوپڕیان لەسەر کەسایەتی **ئارام** ئەنجام ئەدا و لە دوو توێی کتێبێکدا بڵاویان دەکردەوە. هەموو جارێ کە بیری (**ئارام**)م دەکەوێتەوە مێشک، ئەو دیالۆگەی شانۆگەری لانەوازانم بیر ئەکەوێتەوە کە وەستا سابیر لەبارەی کەسایەتی رەفیقەوە ئەڵێ.. جا کوڕی باش و چاک کوا لەنێو ئێمەدا جێگای ئەبێتەوە.

**تەها باراوی**

ستۆکهۆلم. سەرەتای مانگی یازدەی

ساڵی ٢٠١١ لەگەڕەکی خێرهۆلمێن

کتێبی دووەم

# ئەو ڕۆژ و شەوانەی لە بیرم ناچنەوە...

سەرجەلەی ژیانی منداڵی و قۆناغەکانی خوێندنم..

# ١

لەساڵی ١٩٥٧ دا، باوکم لەلای خۆیەوە بڕیاری ئەوەی داوە، گوند بە جێ بهێڵێت و ماڵمان هاتووەتە ناو شاری هەولێر. دیارە فشاری حەوسەلەچوونی، لە قورسایی ژیانی لادێ، ئەو هەنگاوەی بە باوکم هەڵگرتووە. دەنا ئەو دەم خاوەنی زۆرێک لە مێگەلە مەڕ، زەوی و زاری کشتوکاڵی بووە. کە لە رووی گوزەرانەوە لە ریزی جوتیارە زەنگینەکاندا ژمێردراوە. لێرەیشەوە بە هۆی نەخوێندەواری و نەشارەزایی لە ژیانی شار، چۆنیەتی سوودوەرگرتن و بەکارهێنانی ئەو سەرمایەی، کە لە ژیانی گوند بەدەستی هێنابوو. بە زەمەنێکی کورت، ساڵ لە دوای ساڵ باری گوزەرانی خێزانەکەمان روو لە هەژاری، توانەوەی ئەو دەستمایەی گوندی بوو. شێخ مەحەمەدی باوکم[18]، لەگەڵ ئەوەی پیاوێکی زەحمەتکێش و ماندوونەناس بوو، بۆ بەخێوکردنی سەربەرزانەی خێزانەکەمان، کە لە سێ کچ و سێ کوڕ پێکهاتبوون، لەگەڵ دایکم، لە ژیانی شاریش نەحەساوەتەوە، بەشەو و بە رۆژ کاری کردووە. باوک و دایکمان زۆر بەتەنگ ئەوەوە بوون، منداڵەکانیان بخوێنن و لە سێبەری خوێندەواری، تەواوکردنی خوێندن، دوارۆژێکی ئاسوودە بۆ خۆمان و خێزانەکەمان دابین بکەن، بەڵام دیارە چونەبەرخوێندن لەو خێزانە نەخوێندەوارەی ئەوێ رۆژیی ئێمەدا، هەر بۆکوڕەکان مەیسەربوە.

ساڵی ١٩٥٨ من دەستم بە خوێندن کردووە، یەکەمجار لە قوتابخانەی سەرەتایی بەناوی (المعری -سیروان) و دواتر لە پۆلی چوارەم گواستراومەتەوە قوتابخانەی (خولەکان)ی سەرەتایی، لەوێ قۆناغی سەرەتاییم تەواو کردووە. ئەو دەمە لەگەڵ هەڵگیرسانی خەباتی چەکداریی بەردەوامی کوردستان (شۆرشی ئەیلول) بە هۆی هەوادارییی شیلگیرانەی باوکم بۆ کوردایەتی و ئەندامبوونی لە پارتیدا، کە بەو نەخوێندەوارییەی خۆیەوە یەکەم رابەری من بووە بۆ ئەوەی بیر و هۆشم بە لای سیاسەتەوە رێچکە بگرێ، چونکە ئەو هەمیشە بەیاننامە و بڵاوکراوەکانی پارتی ئەودەمی بە من دەخوێندەوە و زۆر جارانیش ئەو شتە بڤانەی بە من بۆ هەواداران دابەش دەکرد.

ماڵەکەمان لەناو شاردا، شوێنی حەوانەوە و خۆحەشاردانی کادیرانی دەرەوە، بەتایبەت ئەوپێشمەرگە و کادیرانە بوو، بە نەخۆشی و هەندێ جار بە برینداری لە ماڵی ئێمە بە هەفتە و مانگ ماونەتەوە. ئێستاکەیش ناوەکانی وەک: (مەحمود سەلمان، عەلی

---

[18] کە چەندان ساڵ دواتر چوومە زانکۆ لە بەغداد ئەو "شێخ"ەم لەسەرناوی یەکەمی لابرد.

حەسەن، مەلا عەبدوڵلا باداوەیی، جەلال باداوەیی، عەزە گورگە، عوسمان حاجی سمایل، حسین شەمامەری....هتد)م لەبیر ماون، کە لە ناویاندا بە هۆی نەخۆشی و برینداربوونیانەوە، دەبوو شەوان من بە هۆی منداڵیم، کە جێی گومان نەبووم، بۆ لای (ئەحمەد تەبیبی) باوکی هونەرمەند فوئاد ئەحمەد و ئازاد و نەوزادیان ببەم، کە ئەوەی دواییان، هاوڕێی گیانی بە گیانی قوتابخانە و کوڵانم بوو. ئەو تەداوییان بکات، چارەسەری نەخۆشییەکانیان بکات و داودەرمانیان بۆ ئامادە بکات. لەو جۆرە ئاو و هەوایەدا، زۆرتر بیر و هەستم بە لای خەبات و کوردایەتی دادەمەزرا.

پاشان لە قوتابخانەی (خولەکان) یشدا بۆ مێژوو دەیگێڕمەوە، لە پۆلی پێنجەمی سەرەتایی بووم، مامۆستای هێژا و کوردپەروەر (بەگوگ) رۆڵی بنەڕەتی هەبوو لە نەشونماکردنی هەست و بیرم بە لای، خۆشەویستی کوردستان و نەتەوەکەم. ئەو وانەی زمانی کوردی پێ دەگوتینەوە، هەمیشە هۆنراوە نیشتمانییەکانی فێردەکردین، زۆربەی رۆژان، کە پێش چوونە پۆلەکان لە گردبونەووەی بەیانیاندا، هانی دەدام ئەو شیعرانەم بە دەنگی بەرز بۆ تێکڕای قوتابیان دەخوێندەوە. لەتەک مندا چەند قوتابییەکی دیکەش هەبوون، کە ئەوانەی لەبیرم ماون بریتیبوون لە برایان : محەمەد حوسێن، کە ئێستا ئەندازیارە و دەستخەتێکی خۆشی هەبوو کە ناوی کوردستان و کوردی بە درشتی لەسەر لاپەڕەی سپی بۆ زۆربەی قوتابییەکان دەنووسی، حوسێن عومەر کە هەنووکە پارێزەر و دادوەرە، لەگەڵ غازی کە خەڵکی گوندەکانی بناری سەفین و هەروەها عەبدوسەلام وابزانم ئەویش باوکی مەلا بوو، ئەو پێنجەمان بێجگە لە غازی، کە لە ژیاندا نەماوە، لە زیرەکترین قوتابییەکانی پۆلەکە بووین.

لێرەدا لە رێگەی هەر خودی (غازی)ەوە بۆ یەکەمجار ناوی (یەکێتیی قوتابیانی کوردستان) بووە وێردی سەر زمانمان، ناوە ناوە پێکەوە کۆ دەبووینەوە، بەیەکەوە وێنەی پێشمەرگە، ئەو بەیاننامانەمان تەماشا دەکرد و دەخوێندەوە، کە هەر غازی بۆمانی دەهێنا.

لەوێ رۆژاندا باوکم دوکاندار بوو، لە تەنکێشی دوکانەکانی پشت مزگەوتی بازاڕ، دوکانەکەمان بەتەک دوکانی مام حاجی حەمەئەمین جگارە فرۆشەوە بوو، لەگەڵ کوڕەکانی بەتایبەتی لەگەڵ مەجید، دۆستایەتیم بەهێز بوو، ئەو کاتانەی باوکی لەوێ نەدەبوو، چەند نووسەر و شاعیرێکی وەک (مەحموود زامدار، بورهان جاهید، عەبدوڵلا پەشێو، پیرباڵ مەحموود، مەجید هێرش...هتد) لێی گردەبوونەوە، باسی ئەدەبیات و شیعریان دەکرد، منیش لەو لاوە گوێم لێیان دەبوو، پێیانەوە شاگەشکە دەبووم. ئەو ناوانە لەگەڵ چەندان سەربازی نەناسراوی دیکە، لە سەرەتای شەستەکان لە شاری هەولێردا،

شاسواری بواری ئەدەبیات، رۆشنبیری کوردی بوون و رۆڵی جوامێرانەیان هەبوو بۆ بڵاوکردنەوەی کوردایەتی، هاندانی گەنجان بۆ رووکردنە ئەدەب و هونەر بە زمانی کوردی. چونکە هەتا ئەو رۆژەیش زۆرتر خەڵک بە زمانی عەرەبی قۆشمەی دەکرد.
لێرەدا دوو رووداوی قۆناغی خوێندنی سەرەتاییم لەبیر ناچنەوە:

• ئەوێ رۆژێ قوتابخانەی خولەکان لە سەررووی ئەو بەستە بوو، کە بە ناوەندی گەڕەکی سەعدووناوە و تەعجیل تێدەپەڕی. قوتابخانەکە سەربانێکی هەبوو، تازە قیر کرابوو. لەگەڵ گەرمبوونی ئاو و هەوا قیرەکە نەرم دەبۆوە، ئێمە ئەو پێنج قوتابییە دەم و سەعات بەیەکەوە لەو سەربانە پیاسەمان دەکرد، بەتایبەتی لە دەمی خولەکەکانی پشووی نێوان وانەکاندا. رۆژێکیان غازی چەند وێنەیەکی پێشمەرگەی لەگەڵ خۆی هێنابووە. قوتابخانە و ئێمەش لە یەکێک لە پشووەکاندا بەیەکەوە بە تامەزرۆیی کەوتینە سەیرکردنیان، بەبێ ئەوەی ئاگامان لەوە بێت یەکێک لەو قوتابیانەی دیکە، کە کوڕی هادی ئاغای پونگینە بوو، ناوەکەیم لەبیر نەماوە و لە پشتەوەمان دیقەتی دابووینێ. لە پڕ یەکێک لە وێنەکانی لە دەستمان رفاند و ئێمەش بە ناچاری شوێنی کەوتین، فرسەتمان نەدا لە دەستمان دەرچێ و لە پشتەوە گرتمان، بۆ سەربانەکە پەلکێشمانکرد. بە هەمووان لەبنەخۆمان نا، تاکو ئەم وێنەمان لێ وەرگرتەوە. بەڵام ئەم قوتابییە چەندان ئامۆزا و خزمی خۆی هەر لەوێ قوتابی بوون، کە چاویان بەم دیمەنە کەوت، ئەوانیش هاتن بۆ لەسەرکردنەوەی ئەو خزمەیان و یەکێکیشیان چووبوو خەبەری دابووە ماڵەوەیان، کە ئەو رۆژە چەکدار و جاشی حکومەت بوون. مۆڵگەیان هەبوو، ئێمە لەگەڵ ئەو قوتابیانە کەوتینە وێزەی یەکتری، هەردوو لا تەقسیریمان بە یەکتری نەکرد. زۆربەمان لەناو ئەو قیرە تواوە رەشهەڵگەڕابوون. لەگەرمەی لەیەکتریداندا بووین، کۆمەڵێک جاش بە چەکەوە دەرگای قوتابخانەیان لێ گرتین، کەوتنە هەڕەشکردن، بەڵام فەراشەکە، کە ئەو رۆژە ناسیمان مرۆڤێکی کوردپەروەر بوو، دەرگای لێ نەکردنەوە، چەند جاشێک هاتنە سەر دیواری قوتابخانەکە بۆ گەیشتنە سەربانەکە. لێرەدا مامۆستایانی هێژاو کوردپەروەر (بەگۆک و ناسیح و عومەر)، کە ناوی باوکیانم لەبیر نەماوە، هەڵوێستێکی جوامێرانەیان نواند، رێگەی ئەو جاشانەیان نەدا بگەنە سەربانەکە، تاکو پۆلیسی حکومەت گەیشتنە قوتابخانەکە. جاشەکان بە ناچاری قوتابخانەکەیان جێهێشت، ئەو مامۆستایانە و بەڕێوەبەری قوتابخانە، هەر دوو گرووپیان لە ژوورێک کۆ کردەوە، دوای هەندێ هەڕوگێف لە هەردوولامان، ئەو قوتابیانەی ماڵی هادی ئاغایان هاندا، بۆ ئەوەی جارێکی دیکە شەڕ بە ئێمە نەفرۆشن و بەڵێنیان لێ وەرگرتن، کە بەبێ شەڕ وازمان لێ بهێنن، هێشتا هەموو منداڵین، نابێ دژایەتی یەکتری بکەین. ئەوەبوو ماڵیان ئاوابێت ئەوانیش

لەسەر گفتی خۆیان بوون، چیتر کێشەمان لەنێوان دروست نەبووەوە، کەسیش لە گوڵ شیرینتری بە ئێمە نەگوت.

• لە ساڵی کۆتایی خوێندنی سەرەتاییدا بووم، بۆ رۆژی نەورۆز لەگەڵ ئەو قوتابییانەی لە پێشەوە باسم کردن، بە لێپسراوێتی غازی خۆشناو، خۆمان بۆ بەشداریکردن لە ئاهەنگی نەورۆز ساز دابوو، کە لەوان رۆژاندا، ئەو ئاهەنگە یاساغ بوو. لەبیرمە لە رۆژی نەورۆزدا، تاقیکردنەوەی وانەی ئینگلیزیمان هەبوو، زۆرمان تکا و نزا لە مامۆستاکە کرد، کە بەڵکو تاقیکردنەوەکە دوابخات، بەڵام رازی نەبوو، مامۆستاکە ئەودەم شیوعی بوو. هەرچەندە ئێمە لە وانەکەیشی زیرەکترین قوتابی پۆلەکە بووین، بەڵام هەر مەبەستی بوو ئێمە بۆ ئاهەنگەکە نەچین، کەچی ئێمە لەسەر بەڵێنی خۆمان، هەر پێنجمان بێڕەزامەندی هەتا کەس و کاریشمان بەشداری ئاهەنگی نەورۆزمان کرد و وەک کورس بەشداری هەندێک چالاکی ئاهەنگەکەشمان کرد.

لەبیرمە بۆ ئێوارە گەڕاینەوە، ئێمە لە پشتی پیکابێک بووین، هەرکە گەیشتینە سەر جادەی (قوشتەپە- هەولێر)، حەمەی سابیر ئاغا بە خۆی و کۆمەڵێک جاشی چەکدارەوە، سەر جادەکەیان گرتبوو. خەڵکێکی زۆری لەمبەر و ئەوبەری جادەکە راگرتبوو، کە لە ئاهەنگی نەورۆز گەڕابوونەوە. لەبیرمە هەر بەخۆی لە ئێمە هاتە پێشەوە، رووی پرسیاری لێمان کرد و گوتی: (ها منداڵ و تاڵینە ئەوە ئەنگۆ لەکێندەرێ دێنەوە؟) ئێمەیش زۆر سەربەستانە، بەوپەڕی بێ منەتییەوە وەڵاممان دایەوە گوتمان: (لە ئاهەنگی نەورۆز دێینەوە) یەکسەر بە ئێمە پێکەنی، فەرمانی بە جاشەکاندا، کە رێگای رۆیشتن بە ئێمە بدەن. لە بەردەمی هەموو خەڵکەکە نەڕاندی و گوتی: (مادەم راستگۆیانە وەڵامتان دامەوە، وەکو ئەو خەڵکەی دیکە هەریەکە، بە درۆیەک گەرەکێتی خۆی بپەڕێنێتەوە، ئێوە لە هەمووان کوردترن...سەد ئافەرین بۆتان. ئەوەبوو بەسەلامەتی گەڕاینەوە شار، بۆ بەیانی چووینە قوتابخانە و سەیرمان کرد مامۆستای ئینگلیزی ئێمەی (غایب) داوە، بۆ هەریەکەمان نمرەی سفری خستۆتەسەر کارتی مانگانە، بەڵام کە تاقیکردنەوەی بەکالۆریۆسی شەشی سەرەتاییمان دا بەتەنێ هەر ئەو پێنج قوتابییە لە دەوری یەکەم لە وانەی ئینگلیزی، سەرکەوتوو بوون، بە تایبەت محەمەد حوسێن و حوسێن عومەر لەو قوتابیانەی ناو شاری هەولێر لە ریزی پێشەوە بوون.

هەر لە ساڵی کۆتایی قۆناغی خوێندنی سەرەتایی بوو، بە هۆی چوونە گۆڕەپانی تۆپانێ (فوتبۆل) و سەیرکردنی گەمەکانی ئەو وەرزشە، لەگەڵ هاوکوفێکی تەمەنی خۆم بوومە برادەر کە تازە ماڵیان هاتبووە هەولێر و خەڵکی سلێمانی بوو و ناوی حەمەسەعید حەسەن بوو. دێتەوە بیرم جارێکیان تیپی تۆپێنی سلێمانی لەگەڵ هەولێر یارییان دەکرد،

ئەو رۆژگارە کە سلێمانی دابەزینە گۆڕەپانەکە، بە کوردی هوتافی خۆیاندا و بەجووتە لەگەڵ حەمەسەعید زۆر بەگەرمی کەوتینە چەپڵە لێدان بۆیان. کە خەریک بوو لەسەر ئەو چەپڵەلێدانە لەلایەن جەندرمەکانی حکومەت سەریەشەمان بۆ دروست ببێت. بەڵام بەزوویی بابی غارێمان پێوە ناو لە دەستییان دەرباز بووین. رۆژگار هاتوتێپەڕی، ئەو برادەرەم جارێکی وەک دۆست و هاوڕێ لە پێشمەرگایەتیی سالانی ١٩٨٠ _ ١٩٨٨ لە شاخ و هەواری ئێرەوئەوێ دیتەوە.

# ٢

تەمەن ڕێچکەی باڵاکردنی گرتبوو، تازە کەوتبوومە سەر پێیان و ساڵێکیان، کە باروبارگەی ماڵەوەمان لە هەواری رەشمالان، بەرەو گوندی ڕێچکەی گرتوە، منیان لەسەر باری یەکێک لە وڵاغە بەرزەکان سوارکردووە. لەو ناوەیش یەک زنجیرە دارتێل بە کەناری ڕێگاکەوە هەبووە، لەلای خۆمەوە هەرچەندە وڵاغەکان بەژێر رایەلی دارتێلەکان تێپەڕیون، تا دەنگم تێدابوە کەوتومەتە هاوارە هاوار، بۆ ئەوەی لەسەر وڵاغەکە دامبەزێنن، نەوەک ملم بە رایەڵی دارتێلەکانەوە بێت! بەڵام هەموو گەورەکان کە لەو کاروانە بوون، گاڵتەیان پێ کردووم. باوکم سەرباری بە تەنیابوونی، بەتایبەت بەدوای ماڵکردنی خۆی و جیابوونەوەی لەگەڵ ماڵی مامەکەم، لە گوندی خاوەن ماڵ و گوزەرانێکی خۆشبووە و خۆیشی مرۆڤێکی بە هیمەت و کارمەند، جوتیارێکی گورجوگۆل و مەڕدارێکی برنجی بووە، لە زۆر وەرز و چوونە بنەگەی کوێستان و شوێنی لەوەڕی رانە مەڕەکەی، چەندان وەرزێر و شوانی لە شان بووە. ماڵەکەمان بەردەوام قەلەباڵغ، بە میوان و قۆناغی ئەو خەڵکە لایدە بووە، کە ڕێگایان کەوتۆتە گوندەکە. بەتایبەت ئەوانەی لە ناوچەی خۆشناوەتییەوە، بەرهەمەکانی خۆیان لە ترێ و هەنار و هەلوژە و هەنجیر و بادام و سێوەلاسوورە و هەرمێ بۆ فرۆشتن هێناوەتە گوند. ماڵی باوکم شوێنی حەسانەوە و مانەوەیان بووە. ئەو رۆژانەیش کۆچ و کۆچباری مەڕلەوەڕاندنی باوکم چووەتە ناوچەکانی خۆشناوەتی، ئەم ناسیاوانە هەموو هاوکاری و کارئاسانیەکیان بۆ کردوون. بە جۆرێک زۆر بە گەرمی بوونەتە ناسیاوی یەکتری، لە خۆشی و ناخۆشیدا یەکتریان بەسەر کردۆتەوە. هەر بۆ نموونە ساڵی ١٩٧٤، کە بەشداری (شۆڕشی ئەیلوول) بووم، جارێکیان

لەگەڵ دەستەیەک پێشمەرگەی هەولێرەوە، لە ناوچەکانی چۆمانەوە، بۆ سەردان و دیدەنی کەسوکارمان بەرەو ناوچەکانی هەولێر گەڕاینەوە. لە ڕێگادا کە وەرزی هاوین بوو، سبەینەکی زوو گەیشتینە گوندی (سوسێ)ی پشتی چیای سەفین، بەردەم تیشەکانی (بەنەباوی)، تاکو بەرەو ناوچەکانی دەشتی هەولێر بپەڕینەوە. پێشمەرگەکان چەندانیان خزم و کەس و کاری خۆم بوون.دیتمان گوند چۆڵە و سەرەتا کەسمان لەناو گوند بەدی نەکرد، هەموومان لە ماندووبوونیان لە پەنا دیواری مزگەوت ڕاکشاین، کە لەترسی فڕۆکەی جەنگی ڕژێمی بەعس، بەدرێژایی شەوەکەی ڕۆیشتنمان کردبوو. پاش تاوێک سەرم هەڵبڕی، پیاوێکی کورتیلەی بەسالاچوو بەسەرمانەوە وەستاوە، یەکە یەکە لێمان دەڕوانی، منیش هەر لەخۆمەوە وتم: مام حاجی دەڵێی پشکێنەری ئاوا تەماشامان دەکەی! ئەویش یەکسەر لێم نزیک بوەوە و پرسی: ئەوە ئێوە لەکوێوە دێن، بەرەو کوێ دەچن؟. وتم : لەسەرەوە (ناوچەکانی سەرکردایەتی شۆڕش) بەرەو گوندەکانی دەشتی هەولێر دەچین. دیسانەوە پرسی بەرەو چ گوندێک؟ یەکێک لەو لامەوە، کە لە من هەراشتر بوو، تێڕاخوڕی و گوتی: چییە ئەو پرسیارانەمان لێ دەکەی، ئێمە لەبرسان قوڕەی زگمان دێت، نانێکمان بۆ پەیدا بکە! منیش لە تەکیەوە گوتم: ئەوە خەڵکی ئەو گوندە بۆ کوێ چوونە؟ حاجی گوتی: وەڵلا کەسی برای، هەندێ ناسیاوم لەو گوندانەی دەشتی هەولێر هەن، دەڵێی بۆنی ئەوانتان لێ دەکەم، خەڵکی ئەو گوندەیش هەموویان لەو سەر ئاو و کانییەی سەرەوە، کەپریان کردووە، چوونەتە ئەوێ. ئەوجا ڕاستەوخۆ ڕووی لە من کردوو گوتی: تۆ خەڵکی چ گوندەکی؟ منیش گوتم: من هەنووکە خەڵکی شارم، ماڵمان لە گوندی شێخانان بووە. بەبێ ڕاوەستان وتی کوڕە تۆ کوڕی شێمحەمەد و مرێمی نی؟ وتم: بەڵێ، یەکسەر باوشی لێ نام، زۆر بە گەرمی هەردوولا ڕووم ی ماچ کردم، فەرمووی لێ کردین بەدوای بکەوین، دەستی گرتبووم، هەموومانی بردە سەر جۆگەڵە ئاوێک، کە ساباتێکی گەورەی بەسەرەوە کرابوو. جارێ لەسەر ئاوەکە دەم و چاومان بەجوانی شوشت، دەمودەست خۆراکێکی بەیانیانیان لەبەر دەممان دانا، لەسەر نانەکە مام حاجی هەر تامەزرۆی پرسینی هەواڵی کەس و کارم بوو. گوتی: ئەوە بیست ساڵ زیاترە هیچ هەواڵێکی ماڵی ئێوە نازانم، چونکە پاش چوونە ماڵی خوداوە هێزی ئەوەم تێدا نەماوە، وەک جاران بە کەر و ولاغ بەروبوومەکانمان بۆ ئەو گوندانە بەرین، وەکو جارانیش ئەو کارە برەوی نەماوە، بە هۆی پەیدا بوونی ترومبێل و بردنی بەرووبۆمەکان بەرەو شار.

مام حاجی حوسێن زۆر بەخێرهاتنی کردین و هەر دەیگوت: دەبێ چەند ڕۆژ لێرە بحەسێنەوە، من زۆر قەرزاری ماڵی باوکی تۆم، چونکە بە مانگ ماڵی باوکی تۆ قۆناغی من بووە، سەربردەیەکی سەیریشم لە ماڵی باوکت بەسەر هاتووە. وتم مام حاجی دەکرێ

بۆمنی بگێڕییەوە! وتی بە مەرجێک بۆتی دەگێڕمەوە، دەبێ چەند ژەمێکی تریش لە ماڵەکەم بمێننەوە. بە هەر جۆرێک بێت بۆ ژەمی نیوەڕۆیش ئۆقرەمان گرت، بەڵام خواردنێکی ئەوەندە زۆر پڕگۆشتی مریشک و فروجی کوردەوارییان ئامادە کردبوو، کە برسێیەتی ڕۆژەکانی پێشوتریان لەبیر بردینەوە. لەونێوانەدا حاجی حوسێن سەربردەکەی بەم جۆرە گێڕایەوە.

ساڵێکیان کۆتایی وەرزی هاوین بوو، چەندان بارە هەنار و قەرتاڵە ترێ و هەنجیرم بە چەند ولاغێکەوە پێبوو، لەگەڵ گەیشتنە سەرجۆخێنانی پشتەوەی ماڵان، ژنەکان لەسەر تیلەی خانوەکەیان بانگیان کردم، مام حوسێن (بۆرە) بەرەڵلایە و لەوێ بوەستە، هەتا لە ژوورەوەی دەکەین. ئەوان لەو قسانەدا بوون، (بۆرە) لەسەر دیواری حەوشەوە بازی داو شاڵاوی بۆ من هێنا، چاوم لێ بوو ژنەکان بە دوایەوە بۆ لای من کەوتنە غاردان، (بۆرە ئەو سەگە دڕە بوو، ئەگەر باوکم لە ماڵ نەبوایە، دەبوایە بە ڕۆژ بە زنجیر ببەسترایەوە، دەنا پڕی دەدایە هەر یەکێکی لایدە، کە ڕێی دەکەوتە ماڵی باوکم، بەتایبەتی خەڵکی نەناسراو، باوکم بۆرەی هەروەک دەست و پێی خۆی تەماشا دەکرد، بە جۆرێک پەروەردەی کردبوو، هیچ دز و جەردەیەک بۆیان نەدەکرا لە ترسی بۆرە، تخوونی بنکە و ڕەشماڵ و ماڵی باوکم بکەون.

دەگێڕنەوە باوکم هەر ڕۆژێک مەڕێک، کاوڕێک، کوشتیەکیان هەبوویێت، بەشە گۆشتی بۆرە لە گۆشتی تەڕ و ناسک بە تەنیا دانراوە، باوکم بە خۆی لەبەردەمی داناوە، نەوەک وەکو سەگەکانی دیکە تەنیا ئێسک و پاشماوەی خۆراکیان خرابێتە بەردەم.) مام حوسێن لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو. من هەر ئەوەندەم زانی لە چاوتروکانێک بۆرە گەیشتە سەرم، بە قەلەمبازێکی خێرا بەرانگژم بوەوە، کە هەتا ئەوەم لەبیر نەمابوو، من خەنجەرم لەبەر پشتێنی بوو، هەر ئەوەندەم ئاگا لە خۆ بوو، لە خرتۆکێی وەردام، ئەگەر ژنەکان نەگەیشتبوونایە سەرمان، ئەوە بە دڵنیایی ونجڕونجڕی دەکردم، بە لێدان و چەغە چەغە، منیان بە زامداری لە بەر کەڵبەی دەرهێنا! کە لە باسک و ڕانم گازی لێ گرتبووم، خوێنیان لێ دەهات، ئەوەبوو ژنەکان منیان لەناو لێفەیەکەوە بۆ ماڵ بردەوە، نزیکەی مانگێک لەو ماڵە برینەکانیان هەموو ڕۆژێ بەقوڕە سووری بۆ شوشتووم، پاکیان کردۆتەوە، هەتاکو بەتەواوی ساڕێژبوونە و (دیارە بەهەندێ دەستووری کوردەواری چەوریان کردووە و مەرهەمیان لێ داوە) کەوتومەتەوە سەر پێیان، بۆرەشیان لەبەر ماڵان دورخستۆتەوە. پاش ساغبوونەوە، لە جیاتی بارەکانی ئەو مێوەیەی هێنابووم، شێمحەمەد چەندان بارە گەنم، دانەوێڵەی بۆ ئامادە کردبووم و بەڕێیان کردم. ئیتر ئێمە پاش نانخواردنی نیوەڕۆ، بە

سوپاسەوە ئەو هەوارەمان بەجێهێشت، بەسەر (بنەباوی) کەوتین و بە (باواجی) روو لە گوندەکانی بەستی شەرغە گلۆر بووینەوە.

# ٣

خێزانەکەمان بێجگە لە باوکم و دایکم، لە سێ کچ و سێ کوڕان پێکهاتبوو، دوو خوشک و دوو برای تریشمان، مەرگی دواکەوتوویی و نەزانی، پێویرانی نەخۆشییە کوشندەکان هەر زوو دروێنەی ژیانی کردوون. دایکم هەتا لە گوند و لە بەخێوکردنی مەڕومالات و بن رەشمالان ژیانی بەسەر بردوە و وەک مرۆڤێکی ژێر، چەوساندنەوەی پیاوسالاری کۆمەڵی دواکەوتووی کوردەواری، شتێکی دیکەی نەدیتووە و نەزانیوە. بەلام لەگەڵ رەوتی ئەو ژیانە پڕ کوڵەمەرگییە، بیر و زەین رووناک و ژنێکی بەحەوسەلە بوو، یادەوەرییەکانی هەموو هەر تاڵ و تفتی بوو. بە جۆرێک کە مێردی بە باوکم کردووە و ئامۆزای خۆی بووە، تەمەنی تەنیا چواردە سالان بووە. هاتۆتە ماڵی باپیرەم، واتە ماڵی مامی خۆی، وەک نۆکەر خراوەتە بەر کاری بەردەوامی شەو و رۆژان. بە جۆرێک لەگەڵ گزنگی بەرەبەیان لە خەوی شیرین بێدارکراوەتەوە، بۆ نانکردن و ئامادەکردنی خۆراکی بەیانیی بۆ هەموو خێزانەکە. پاشی ئەوە دەبوو جێوبالینگانی خەوتن هەڵگرێ، حەوشەو ناو ماڵ گسک بدات، ئاوی پێویستی ئەو رۆژە لە بیر هەڵهێنجێ. لە وەرزی هاوینانیش تێڵەکێشی بەر تەبارەی گەنم و جۆ، گیشەکردنی مەلۆکان و ئەوجا بارکردنی لە شەغرە و ناردنەوەی بۆ سەر جۆخین، نان و دۆ ئامادەکردن بۆ سێ ژەمەی سەپانەکان، کاری سەرباری رۆژانەی بەر قرچەی گەرما بووە. ئێوارەیش کە گەڕاوەتەوە بەبێ وەستان دەبوایە یەکسەر بچێتە بێرێ، مێگەلە مەڕ بدۆشێ، دەست و برد ژەمی ئێوارە ساز بکات، ئەوجا بوارێکی دەست بکەوێ بۆ لەباوەشگرتن و شیردانی کۆرپە ساوایەکەی. زستانیش لە پاڵ کارەکانی ناوماڵ، دەبوو خەریکی تەون و تەونکاری بێت. هەموو جارێک دایکم کە ئەو سەربردە پڕ کوێرەوەرییە بێ ماندووبونەی خۆی دەگێڕایەوە، فرمێسک بە لاچاوانیدا دەهاتە خوارەوە. لە دڵەوە بۆی دەسووتام و هەر لە تەمەنی هەرزەکاریمەوە زۆر جاران لە کاروباری ناوماڵ یارمەتیم دەدا. راستە باوکیشم لە پاڵ هەموو جۆرە زەحمەتکێشانێکی بۆ بەخێوکردن و گەورەبوونی ئێمە درێخی نەکردوە، بەلام تا بڵێی لەناو ماڵ و بەڕێوەبردنی خێزانەکەمان، زۆر توند و رەق و بێ حەوسەلە بوو. بە کورتی دایک و

باوکی من نەخوێندەوار بوون، زۆریان ڕەنجکێشاوە بۆ بەخێوکردنی سەرفرازانەی منداڵەکانیان، بەتایبەت لە ڕووی خۆشەویستی وڵات.

باوکم هەر لە پەنجاکانەوە هەوادارێکی بەردەوامی ڕێبازی کوردایەتی بووە، تا ناوەڕاستی شەستەکان لە ریزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان ئەندام بووە، بۆ خەباتکردن و شۆڕش قوربانی داوە، هەمیشە نەیارێکی سەرسەختی دووبەرەکی و ناتەبایی ریزەکانی نەتەوەکەی بوو.

گەورەبوونی من لە باوەشی خێزانەکەم، لە هەمێزی هەڵمژینی ئاووهەوای شاری هەولێردا، بە جۆرێک بنەگەی خۆی لە مێشک و دەروونم داناوە، کە هەنووکەیش ئەو شوێنە دلگیرانەی بە هەر شێوەیەک بێت، زۆربەیان کوێرکراونەتەوە، لە گەڵم دەژین و زیندوون. نموونەی ئاوی میری، غاباتی هەولێر، کە لە نێوان گەڕەکی وێستگەی شەمەندەفەر و گەڕەکی کوراندا بوون، لەگەڵ یانەی فەرمانبەرانی هەولێر، کە یەکێک لە شوێنە هەرە خۆشەکانی وەرزی هاوین بوو، سینەماکانی "حمرا، سەلاحەددین و سیروان"، هۆڵی گەل، باخچەکانی وێستگەی شەمەندەفەر، گۆڕەپانی تۆپێن و بن دیواری بالاخانەکەی ئەحمەد چەلەبی و خرکەبەردەکانی دەست هەیاس، بازاری گەرموگوڕی ناو قەیسەری ، چایخانەی وەسمانی بن قەلات، گازینۆکانی سەفین و ئێوارانی پشت قەلای شار، باغی شار، پیاسەی ئێوارانی کۆلانەکانی گەرەکی عینکاوەی دیانان، باخچە و دیمەنەکانی دارستانەکەی نێوان هەردوو گەڕەکی موحەتە و کوران.. پەنادیوارەکانی قەبرستانەکان و بن لەیلوکانی رۆژانی جەژنی موسلمانەکان.. هتد.

لەوێ رۆژاندا خەڵکی هەولێر، بەشێکی هێجگار زۆر یەکتریان دەناسی، ئێستاکەیش بە بیرمە، ئەو ئێوارانەی لە باغی شاری ناوجەرگەی شار، بە تایبەتی لە ئێوارانی وەرزی هاوینان کۆ دەبووینەوە، زۆرجار لەناو برادەران دەبووە قۆشمەی هەڵدانی ناو و ناسینی ئەو کەسانەی لە دەرگای باغەکە دەهاتنە ژوورەوە، مامۆستا موعتەسەم یەکێک بوو لە ناومان، کە زۆرترین خەڵکی دەناسی، هەروەها مستەفا پەژار، جەمیل ڕەنجبەر، سابیر چار چاو، زۆری دیکە.. دیارە مامۆستایەکانی کوردایەتی لەناو شاری هەولێردا، بۆ کۆمەڵێک ناو دەگەڕێتەوە، کە بەراستی سەربازی نەناسراو، وڵاتپارێزی و خۆشەویستی ناو خەڵک بوون. بە تایبەت لە نموونەی قادر رۆژباش، عەونی یوسف، مەئمون دەباغ، رەمزی وەلی، خاڵە نامیق، شەمسەدین موفتی، خاڵە سەید مەجید، ئەحمەد ڕەشوانی، عیزەدین فەیزی، عبدوڵلا پەشێو، مامۆستا بەگۆک، تایەرتۆفیق، حەیدەرە کەچەل، دایی شەوکەت، جەمیل ڕەنجبەر، قادر شۆڕش. دەیان سەربازی نەناسراوی دیکە، کە من لەو دەمە بە ناوەکانیان ناسیار نیم.

لە بارودۆخێکی زۆر خۆش و ناخۆشدا، قۆناغی ئامادەییم لە هەولێر تەواوکرد،[19] کە رۆژگاری دەرچوونی بەیاننامەی ١١ی ئازار بوو، کە تا رادەیەکی زۆر دەستپێکردنی قۆناغی نوێی ژیانم بوو، واتە هەنگاو هەڵگرتن بوو بەرەو چوونە بەر خوێندنی زانکۆ و گواستنەوە بۆ شاری بەغدادی پایتەخت، کە ئەو رۆژە وەک خەونێک بوو، لەوپەڕی هەژاری و دەستکورتی گوزەران، بەبێ هیچ پشت و پەنایەکو و رێنماییکەرێک، رێچکەم گرتبوو. هێشتا مرۆڤێکی هەرزەکاری سەرچڵ و کەم ئەزموون بووم.

لە پاش وەرگیران و دەستپێکردنی دەوامی کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغداد، لە بەشی کوردی، هەتا ساڵێکیش تەواو بوو لە بەشی ناوخۆی قوتابیان وەرنەگیرام. بەناچاری و بەگیرفانێکی بەتاڵ لە ماڵی کوڕە پورێکم، یادی بە خێر مەجید ئەبابەکر کە فڕنی "مەریس"ی هەبوو، دەژیام. کە جۆرە نانێکی بە روون و پەنیر بوو. لە ماڵی ئەوان ژوورێکی بە تاڵ و قەلەندەرانەم وەرگرتبوو، کە تەنیا یەک پارچە حەسیر، یەک بالیف و بەتانییەکم هەبوو بۆ خەوتن، هەروەها هەتا وەرگرتنم لە بەشی ناوخۆ دەبوو، شەوانە لە سەعات یەکی شەوەوە بچم لەلای ئەو کوڕە پورەم، یارمەتی بدەم. هەتا سەعات شەشی بەیانی ئەنگوتکی بۆ بکەم و بیکێشم. پاش سەعات حەفت و خۆگۆڕین لە گەرەکی "الفضل" بەرەو گەرەکی "ئەلوەزیریە" بەپێیان بۆ کۆلێج دەچووم. ئێواران کە دەهاتمەوە جلەکانم دەشووشتن، لەژێر بەتانییەکەم دەقم پێدەگرتن، بەیانیان بۆ کۆلێج لەبەرم دەکردن، بەڵام کە دواتر لە بەشی ناوخۆ وەرگیرام، مانگانەی بژێومان هەبوو، کە سەرەتا شەش دینار بوو.

بەو هۆیەوە تۆزێ پۆشتەتر بووم، بەیانیان لەگەڵ چەند قوتابییەکی هەژاری وەک خۆم دەچووینە گۆڕەپانی "مەیدان"، نیسکێنە و چەند سەموونێکمان بە ١٥ فلوس دەخوارد. نیوەڕۆیانیش هەر لەوێ "فۆگە"، کە هەندێ برنج و شلەی بەسەرەوە بوو بە ٤٠ فلوس نۆش دەکرد. ئەو ساڵەم بەو جۆرە بەرێکرد.

لە مانگی دوازدەی ساڵی ١٩٧٠ بوو لە لایەن نەمر "یاسین ئەنوەر" کەرکووکی بۆ چوونە ریزی بازنەی رۆشنبیریی کۆمەڵەی مارکسی لینینی-کوردستان (بیرباوەڕی ماوتسی تۆنگ) قسەم لەگەڵ کرا و هەروەها ئەرسەلان بایزیش بۆ هەمان مەبەست قسەی لەگەڵ کردم. ئەوەبوو بۆ یەکەمجار لە لایەن نەریمان مەحمود خانەقینی لە بەردەم گازینۆی "کندی" لە شەقامی "ئەلجمهوریە" لە ئەڵقەی رۆشنبیری کۆمەڵە رێکخرام و

---

[19] بە بوردنەوە لێرەدا بەخێرایی سەرجەلەیەکی ژیانی خوێندنم هاتوتە گۆڕێ، پێم خۆش نەبوو بیقرتێنم، دواتر بەتێری باسیان دەکەم.

کەوتمە جموجۆڵ. ئەودەمە ڕێنماییەکانی کۆمەڵە ئەوەبوو، هاوڕێیانی لە شار و ناوچە جۆربەجۆرەکان تێکەڵ بە یەکتری بکات، سیاسەتەکە ئەوەبوو خەڵکی یەک شار و ناوچەی دیاریکراو لەناو قوتابیانی زانکۆدا، بەدەگمەن لەیەک شانە کۆدەکرانەوە.

## ٤

هەر لە تەمەنی هەرزەکاری و هەستکردن بە بوونی خۆمەوە، چەندان شتی خۆش و زاخاودەری مێشک، وەک دیوارێکی لە رووخان نەهاتوو، هەتا هەنووکەیش بە بەردەممەوە قیت و کاریگەرن. من هەمیشە حەزم بە هەموو جۆرە گەمە و یارییەک بوو، بەڵام داخەکەم یەکەمجار لەناو منداڵان لە تۆپی پێ و تێنسی سەرمێز توانای بەرچاوم هەبوو، کەچی عەقلیەتی باوکم و کاڵفامی خۆم، بە ناچاری هەر لەپۆلی یەکی ناوەندییەوە دەستم لێ هەڵگرتوون. لە دوورەوە هەر بە تەماشاکردن و هەناسەهەڵکێشانەوە سەیرم کردوون، هەتا هەنووکەیش حەز بە تەماشاکردنیان، بەتایبەتی تۆپانێ دەکەم. دواتر پێش ئەوەی بە سیاسەت و حیزبایەتی ئاشنا بم، بەتێکەڵیم لەگەڵبرادەرە هاوتەمەنەکانی خۆم لە کوچە و کۆڵان، فێری وازیکردنی دۆمینە، تاوڵە و گەمەی کاغەزی کۆنکان بووم، کە زۆرتر بە شەوان و لە دووریی چاوی باوکمەوە دەمکردن. زۆر شەو هەبووە هەتا بەرەبەیان بەدەم ئەو جۆرە گەمەکردنە کاتکوژە بیمانایانەوە، لەگەڵئەو گرووپە مێردمنداڵانە شەونخونیمان کردووە. ئێستاکەیش ناوی هەندێکیانم لەبیر ماوە، کە بریتیبوون لە عورفان کورەچی، عەبدولخالق، شێرۆ ، یونس، رەسول و چەندانی دیکە. بۆ رۆژیش ئەگەر قوتابخانەم نەبوایە، بەتایبەتی دانی ئێواران بەدزی باوکم فڕکەی سینەمام دەکرد، تا چەند ساڵان فلیمی هەر سێ سینەماکەی هەولێرم قوتار نەدەکرد. لەو زەمان و زەمینەدا تێکەڵبوونم لەگەڵ کیژوکاڵان، زۆر کەم و بەدەگمەن بوو. حەزم بە شیعر و هەڵبەست خوێندنەوە بوو، کە ئەویش بە هۆی مامۆستا (بەگۆک)ی وڵاتپارێز خولیای ببووم. هەرچەندە لە دڵەوە بۆ خۆشەویستی دەسووتام، هەر لە کۆتایی ساڵی شەشی سەرەتاییەوە، لە ڕێگای وانە خوێندن و یاریکردنی جاروباری پەنادزەی شەوانەی کۆڵانەکەمان، بەتایبەتی لە وەرزی هاویناندا، بەبێ ئەوەی من خۆم جورئەت بکەم، کچێکی زۆر ناسک و نازدار لە لای خۆیەوە بۆ خۆی گری دابووم، ئەوان دوو خوشک بوون و من لەوانەی ژمێریاری یارمەتیم دەدان، بەڵام هەتا ئەو شەوەی بەبۆنەی

شەکراوخواردنەوەی نیشانکردنی بۆ یەکێکی دیکە، بەو هەستونەستە رووبەڕوو نەبوومەوە، کە لەرێگای دایکمەوە، پەیامێکی بۆ ناردبوم، بچمە ژوانی. کە ئەم کارە نەوەک هەر لە لای کەسوکارم کوفربوو، بگرە بۆخۆیشم ئەو زەمانە کە تازە لە رێگای پێوەندیکردن بە ریزەکانی یەکێتی قوتابیانی کوردستانەوە، تێکەڵی خەباتی کوردایەتی ببووم، کارێکی نەکردە بوو.

بە جۆرێک من و زۆرانی وەک من حیزبایەتی و خەباتکردنمان، ئەوەندە بە دڵسۆزی و دەروێشی گرتبوو، کە دوایی لەگەڵ هەڵکشانی تەمەن و دیتن، تێپەڕین و پەیداکردنی ئەزموون، من یەک بە خۆم زۆری پێ سەربەرزم، بەڵام لە حەقیقەتدا لە بواری تێکەڵبوون لەگەڵ رەگەزی مێینە، بمانەوێ و نەمانەوێ لە بنی بیرێ تەپەمان هاتووە. چونکە پاش ئەو کەڵەکەبوونەی ساڵانی تەمەنم، تازە لەوە گەیشتووم کە ئاسنی ساردم کوتاوەتەوە، ئەویش لە رێگای ئەو چەند سەرە واوەی لە وڵاتی بەهەشتی سوید فێری بووم و لێی تێگەیشتووم. بەڵی تازە دەزانم هەر کوڕ و پیاوێک لە تەمەنی هەرزەکاری و ژیانی خوێندنەوە، بە شێوەیەکی سروشتی و ئۆرگانیکی، لەگەڵ ئەو رەگەزەی دیکە تێکەڵ و هاموشۆی نەبێت، بەدڵنیاییەوە و بە شێوەیەک لە شێوەکان کەسایەتییەکەی لە رووی رووحی و دەروونی و کۆمەڵایەتییەوە نوقسان و وشک و بێتامە. وەک کورد دەڵێ، بە پیری دەچێتە بەرهەویری و چاوچنۆکانە بەدەم خۆ ناشیرینکردنەوە، هەتا ژێرپێخستنی ویژدان، پەڵوپۆ بۆ هەموو لایەک دەهاوێ. من دەگەڕێمەوە ئەوێ رۆژانی تەمەنی خۆم و گەرەکمە لە نموونەی خۆمەوە کۆمەڵگاکەم بخوێنمەوە.

ساڵی ١٩٦٧ بوو، هێشتا مووم لێ نەهاتبوو، خزمێکمان هەبوو "مەلاکە" کە یەکێک بوو لە کرێکارە کۆمۆنیستەکانی پەنجا و سەرەتای شەستەکانی هەولێر. بۆ یەکەمجار لە رێگای خۆشەویستی ئەوەوە، حەز و خۆشەویستیی فەلسەفەی مارکسیزمم لە دڵ و مێشک هەڵقولاوە. ئەو خزمەمان لەسەر بیروبارەکەی بەدوای کودەتا شوومەکەی ١٩٦٣ ی بەعسییەکان گیرابوو. برادەرەکانی ئیعترافیان لەسەری کردبوو. باوکم چەند جارێک لە زیندانی "نوگرە سەلمان" سەردانی کردبوو. هەر لەزیندانەوە دڵی لە حیزبەکەی شکابوو، بیروڕای لەق ببوو. لە یەکێک لە سەردانەکاندا، باوکمی کردبووە وەکیلی خۆی و رایسپاردبوو، کە کچەکانی بە مێرد بدات، هەرخۆیشی پێشنیازی بۆ باوکم کردبوو، یەکێک لە کچەکانی لە بەندە مارە بکەن. ئیتر کە باوکم هاتەوە و کەوتە جێبەجێکردنی ئەو کارە. شەوێکیان لەسەربان بووین، گوێم لێ بوو، بە دایکمی دەگوت، بەیانی فلانە مەلا دەهێنێتە ماڵەوە، بە مەبەستی مارەکردنی یەکێک لەو کێژانە لە بەندە، دایکیشم بە زمانی سوتاوی، گوتی ئەوجا کوڕەکەی ئێمە هێشتا مووی لێ نەهاتوە و کەی دەکاری ژن رایی بکات! ئیتر

باوکم زۆر بە ڕەقی وەڵامی دایەوە، خەریک بوو ناخۆشی دەکرد، منیش بۆ ئەوەی لە کۆڵ دایکمی بکەمەوە و لە لای خۆمەوە، هەڵم دایی و گوتم، ئەگەر سەریشم ببڕن، من ژن ناهێنم. ئەوەندە بەس بوو، باوکم بەو شەوە چی خراپ بوو بە من و دایکمی کرد. ڕاستە ئەودەمە پلانەکەی هەڵوەشایەوە و لە لای منەوە سەری نەگرت. کەچی بۆ دواتر هەر تۆڵەی لێ کردمەوە و دوای تەواوکردنی خوێندنی زانکۆ، بە پەندێکی دیکەی لەو جۆرەی بردم و پاش تەنیا یەک ساڵ لە یەکتری جیا بووینەوە.

هەر لەوێ ڕۆژانی تەمەنمدا، خاڵێکم هەبوو، کە بە ڕەچەڵەک ئامۆزای باوکیشم بوو، ناوی مەحمود بوو. مرۆڤێکی تا بڵێی سەرڕاست و بێفرۆفێڵ بوو، کە بۆ من نموونە و نیشانەی جوامێری بوو. بە درێژایی تەمەنی لە دوو شت نەفرەتی کردبوو. یەکێکیان بەدوای سەرنەگرتنی یەکەمجاری ژنهێنانی، کە هەرگیز جارێکی دیکە ژنی نەهێنایەوە. ئەوی دیکەیان بە سیاسەت و حیزبایەتیکردن نامۆ بوو، بەڵام دڵی بە وڵات و خەڵک زۆر خۆش بوو. لەبیرمە جارێکیان شێخێک لە ماڵی ئێمەوە، بە سەرزەنشتەوە پێی گوت: خولە ئەوە بۆ سمێڵت تاشیوە ؟ ئەویش یەکسەر نەیهێناونەیبرد، گەرماوگەرم گوتی: بۆ جەناب سمێڵ ترێ دەگرێ! پاش مەودایەکی تر دووبارە شێخ کەوتەوە تەشقەڵە پێکردنییەوە، هەمدیسان بە توانجەوە، پێی گوت: کوڕە مەحمود ئەتۆ کە ناوت مەحمودە، چما ناچیتە نوێژی بەکۆمەڵ (نوێژی مزگەفت) هەر بەتەنێ نوێژ دەکەی..؟ خاڵیشم لە جاری پێشووتر تەڕدەستانەتر وەڵامی دایەوە و گوتی: چما بەندە نوێژ بۆ خودای خۆم دەکەم یان بۆتۆ! من نوێژ بۆ خۆنیشاندان ناکەم! من هەرگیز بەدوای پیاوێکی وەکو تۆوە نوێژ ناکەم، تاکو خەڵک بمبینن، بەڵام لە بەرانبەر خودای خۆم سەرم بچێ نوێژم ناچێ. شێخ ماوەیەک دەمی بوو بە تەڵەی تەقیو، پاشان لەناکاو ڕووی دەمی لەباوکم کرد (ڕۆژی پێشووتر لە گوندی دوو کاوڕی دابەستییان بۆ هێنابووین، شێخی چەمبەری کە هاتبووە ژوورەوە، چاوی بە کاوڕەکان کەوتبوو) و گوتی: شێمحەمەد ئەو کاوڕە گۆشتنانەت لە کوێ بۆ هاتووە؟ باوکیشم بە سادەیی و جوامێری خۆی، گوتی یا شێخ ئەوە خزمانی گوند بۆ منداڵەکانیان ناردووە، لە خزمەت جەنابی شێخ دان! ئەوەندە بۆ شێخ بەس بوو. کە هەستان، گوتی: دە پەتێکم بۆ بهێنن تا هەردوو کاوڕەکە بۆمنداڵەکانم ببەمەوە. باوکم لە شەرمی ڕووی خۆی پەتێکی درێژی بۆ هێنا و شێخ خەریک بوو هەردوو کاوڕەکان بەدوای خۆیەوە جلیت بکات، من خۆم بۆ نەگیرا و دەنگم هەڵبڕی: جەناب هەر یەکێکیان ببە و ئەوی دیکە بۆ ئێمە بە جێ بهێڵە. ئەوە بوو زۆر بە مۆنی و جنگزییەوە تەماشای کردم، بە ناچاری هەر کاوڕێکی برد. ئەو ڕووداوە بۆ من بووە مایەی وەرچەرخانێکی

یەکجارەکی بۆ سەقامگیربوونی ئەو بیروباوەڕەی تازە خەریک بوو پێی ئاشنا دەبووم، بەتەواوی لە وەڵامەکانی خاڵم مەحمود و چاوچنۆکی گەیشتم.

# ٥

یەکێک لەو شتانەی هەر لە تەمەنی منداڵییەوە زۆرم حەز لێ دەکرد و پێی تامەزرۆ بووم، سەفەرکردن بوو. بەتایبەت گەڕان و سوڕان بە گوند، بە شار و شوێنەکانی وڵاتەکەم. دیارە لەناو خێزانێکی خاوەن مەڕ و ماڵات، چرۆکردنی ئەو هەست و نەستە هەر لە تەمەنی منداڵییەوە، بۆ من سەرەتایەکی زەمینەخۆشکەر بوو، گەڕان بەدوای لەوەڕ بۆ بەخێوکردنی مێگەلە مەڕ و بزن، لە ئاقاری گوندەکانی ئەم دیوی (زورگەزراو) ی نێوان دەشتی هەولێر و کەندیناوە، ئەوجا کۆچ و کۆچبار بۆ کوێستانی سالانە (وەرزی هاوین) و گەڕانەوە (وەرزی پاییز) بۆ گەرمیان، هەواری ئاسایی گوندی. بۆخۆی کەش و هەوایەکی پڕ خۆشیان لە مێشک و دەروونم بنەگە داناوە و گەلاڵەی کردووە، بۆ گەورەبوونی ئەو خورپە و خۆزگەیە، لەگەڵ سالانی بەسەرچوونی تەمەن بالای کردوە.

سەردانەکانی دایکیشم بۆلای خوشک و برایەکانی لە گوندەکانی ناوچە جیاجیاکانی دەشتی هەولێر، کەندیناوە و قەراج و هەرجارێکیش باوک و داپیرم بۆ سەردانی ناسیاو و خزمەکان لە شارەکانی پردێ، کەرکووک، دوبز، هەولێر چووبان، منیان لەگەڵ خۆدا دەبرد. دووبارە مایەی زیاتر گەشەکردنی حەزی سەفەرکردنی بەردەوامی لە لا بەخێو کردووم. لەپاش گواستنەوەی یەکجارەکیمان، بۆ شاری هەولێر و جێگیربوونی خێزانەکەمان، تا رادەیەکی زۆر بە هۆی هاتووچۆکردن بە تورمبێل بۆ سەردانی خزم و کەسەکان، بەردەوام پێیەکم لە گوند و پێیەکم لە شاربووە. هەر دایکم هەموو جارێک بۆمی دەگێڕاوە، لە دوا ساڵی تەمەنی ژیانی گوندیمان، باوکم زۆر مەبەستی بووە، من بخاتە بەر خوێندن، ئەو ساڵەیش خوێندنی قوتابخانە لە گوندی شێخانان نەبووە، بە ناچاری لەبەر خوێندنی مزگەوتی داناوم، لەوێ، مەلا برایم یادی بەخێر مەلای گوند بوو، زۆر ئاشنا و دۆستی باوکم بووە، کەچی من بۆ خوێندنی مزگەوت لاساریم کردووە. بە جۆرێک هەر جارێک مەلا برایم سیپارەیەکی (جزو عەمە)ی بۆ پەیدا کردووم، من بەبێ دەنگکردن ئەو سیپارەیەم لە کون و قوژبنان شاردووەتەوە، سەرم نەهێناوەتە بەرێ بۆ ئەو جۆرە خوێندنە، باوکم رۆژانە بەزۆر و هەڕەشەکردنەوە، رەوانەی حوجرەی کردووم، بەڵام من

گوێم پێ نەداوە. ناچار مەلا برایم ماڵی ئاوابێت، خۆی باوکمی رازی کردووە، کە وازم لێ بێنێ.

بۆ ساڵی دواتر کە ماڵمان هاتۆتە شار، دەستم بە خوێندنی سەرەتایی کردووە. زۆر چاکم لەبیرە تازە ماڵمان لە گەڕەکی جولەکەکان (تەعجیل) جێگیر ببوو، رۆژانە کە دەهاتمە دەرەوەی ماڵ، کڵاوێکی سەر بە گورینگەم بەسەرەوە بوو، تا رادەیەک بۆ بەرچاوی منداڵەکانی ئەو دەوروبەرە، دیمەنێکی سەیر و عەنتیکەی لێ کەوتووەتەوە ، رۆژ نەبوو گاڵتەم پێ نەکەن و بگرە چەندان منداڵ دوام نەکەون، بە مەبەستی فڕاندنی کڵاوەکەی سەرم. تاکو رۆژێکیان بەبیری ئەودەمی منداڵیم، شوژنێکی نووک تیژم لەگەڵ خۆم هەڵگرتووە، بۆئەوەی ئەگەر منداڵەکان فشارم بۆ بهێنن، فریای داکۆکیکردن لە خۆم بکەوم. دەبێ ئەوەیش بڵێم، ئەو دەمە کوڕە خزمێکی باوکم بەناوی قەهار سادق، کە هاوتەمەنی خۆم بوو، لەوێ بوایە و بەیەکەوە گەمانمان بکردبایە، منداڵەکان دەرەقەتمان نەدەهاتن، خۆیان لە قەرەمان نەدەدا.

ئەو رۆژە نازانم بۆ من بە تەنیا هاتبوومە دەرەوە، هێشتا هەر لە بەردەرگای ماڵەوە زۆر دوور نەکەوتبوومەوە، لەناکاو چەند منداڵێک لە پشتەوە، خۆیان لێ مەڵاس دابووم، وەک باشووکە یەکێکیان کڵاوەکەی سەرمی ڕفاند و بۆی دەرچوون. منیش بەبێ یەک و دووکردن دوایان کەوتم، شووژنەکەم لەناو ئەو کورتەکەی بەرم دەرهێنا و سەرم لەدوو نان، ها لێرە و ها لەوێ منداڵەکان چەند دانەیەکیان خۆیان لێم شاردەوە، بەڵام ئەوەی کڵاوەکەی منی بەدەستەوە بوو، لەگەڵ یەکێکی تریان خۆیان کوتایە کۆڵانەکەی خۆیان، کە کۆڵانێکی زۆر تەسکی گەڕەکی جوولەکەکان بوو، تاکو لە بەردەرگای ماڵەوەیان گرتم، هەڵم کوتایە سەری، کڵاوەکەمی لە پێشەوە فرێدایە ناو ئەو جۆگەلە چڵکاوەی بە بەردەمی ماڵەکان شۆڕ دەبووەوە، ئیتر من هەتا دەستم تێدابوو، بە چەپەرۆکان کەوتمە سەر و گوێلاکی، یەک شوژنم خێواندە لاق و لاتەریکی، منداڵی چەمبەری وەک برووسکە زریکاندی، دایک و خوشکی هاتنە دەرەوە، ئەوانیش پەلاماریان دام، منیش خەریکی ئەوە بووم، بەرەنگاری منداڵەکەی دووەم ببمەوە، ئەوان لەپشتەوە منیان گرت و گەرەکیان بوو بەرزەفتم بکەن، بەڵام زۆر بەچاپووکی سەرباری ئەوەی هەندێک چەپەرۆکم هەر بەرکەوت، لەبەر دەستیان دەرچووم، ئینجا ئەوان بە کۆمەڵ دوام کەوتن، تاکو خۆم کوتایە ماڵەوە و بۆیان نەگیرام. لەگەڵ دایکم و خوشکێکم، لە بەردەرگاوە کەوتنە هەڕەشە و سکاڵاکردن، کەچی دواتر لەگەڵ ئەو منداڵانە زۆربەیان بووینە هاوڕێ و برادەری گیانی بە گیانی و زۆربەی قۆناغەکانی خوێندنمان بەیەکەوە تەواوکرد.

دوایی ماڵمان گواستەوە گەڕەکی سەعدوناوە، پشت ئاشی عوسمانبابش و تا دەهات هەراشتر دەبووم. ماڵە دراوسێییەکمان هەبوو، وەکو خۆمان دەشتەکی بوون، تازە هاتبوونە شاری، دەستیان لە خێزانەکەی ئێمە کورتتر بوو. کوڕێکیان زۆر برادەری قوتابخانە و کۆلانێی من بوو، بەناوی فارس. ڕۆژێکیان سەیرم کرد، ئەوە ماڵیان بار دەکات، چوومە لایان و لە فارسم پرسی: بۆ کوێ دەڕۆن؟ گوتی: لەگەڵ باوکم بۆ سەپانیکردن، ماڵمان دەچێتە گوندێکی نزیک ئەو چیایە بەرزەی سەرەوە، دیارە مەبەستی چیای سەفین بوو، وەکو دوایی بۆم دەرکەوت گوندی (گراوی) بناری "سەری ڕەش" بوو. هەردووکمان زۆرمان پێ ناخۆش بوو، لە یەکدی جیا دەبینەوە. ئەوان ماڵەکەیان خستبووە دوای جێبە شرێکەوە، هەر فارس و خوشکێکی لە خۆی بچووکتریان هەبوو، پێش ئەوەی بەرێ بکەون، فارس پێشنیازی بۆ کردم، کە لەگەڵیان بچمە ئەو گوندە و لەو سەریش هەر لەگەڵ ئەو تورمبێلە بگەڕێمەوە شاری، منیش لە دڵەوە ئەو سەفەرەم زۆر پێ خۆش بوو، بەتایبەت بناری چیا و ئەو ناوچەیە. بەبێ ئەوەی مۆڵەت لە ماڵەوە وەرگرم، یەکسەر ڕەگەڵیان کەوتم، بۆ نیوەڕۆ بە تەقە تەق لە پشتەوەی جێبە شڕە لەگەڵ فارس بەرانبەر یەکتری هەڵتوتابووین و گەیشتینە گوند. ڕێگاکە تابڵێی ناخۆش و بەردەلان و زۆر زەحمەت بوو، لە چەند شوێنێک هەمووومان دەهاتینە خوارەوە، گەورەکان (دایک و باوک)ی فارس بە پاڵدان جێبەکەیان بەسەر گاشە بەردێک دەخست، بەڵام دیمەنی چیا و چۆڵ، ڕووباری بەستۆڕە، ئەو هەموو داروبارە بۆ بەرچاوی من یەک دنیای نوێی پڕ لە چەشەوەرگرتن و کەوتنە لەباڵدان و هەڵفڕین بوو. لەوەتەی هاتبوومە شاری، ئەوە یەکەم سەفەر بوو بۆ ئەو ناوچە شاخاوییەی بکەم، زۆر بە لامەوە دڵگیر و خۆشەویست بوو، کە دەتوانم بڵێم ئەو سەفەرە ڕێچکەی خۆشەویستی بەندەی بۆ سروشت، خاکی وڵاتەکەم گەرمتر بەرجەستە کرد، هەر لەوێ ڕۆژەوە هۆگری کردم. بەراستی ئەوڕۆژە بەو تەمەنی منداڵییەوە، زەوقێکی زۆرم وەرگرت. پاش گەیشتنە گوند و ماڵ دانان و بەجێهێشتنی ئەو برادەرەم بە فرمێسک هاتنەخوارەوە، لەگەڵ شۆفێرەکە سواری جێبە شڕەکە بووم، گەڕاینەوە شاری، ئێوارە کە باوکم بەو کارەی زانی، یەک چینە لێدانی خۆشم خوارد.

یەکێک لەو یادەوەرییانەی گەڕەکی سەعدوناوە، کە لەمێشکم ناسڕێتەوە دیمەنی ئەو بەستە بوو، کە هەموو گەڕەکی و تەعجیلی لە یەکدی جیا دەکردەوە. خەڵک بە هۆی چەند پردێکەوە، لەمبەر بۆ ئەوبەر دەپەڕینەوە، بەتایبەت لە وەرزی زستاندا، ڕۆژانی باران و بەهاران، کە بەفری شاخەکان دەتوایەوە، ئاو بە پانی و قوڵایی ئەو بەستە پڕاو پڕ هاژە هاژی بوو. لەگەڵ هەر ڕۆژێکی باران ئاوی بەستەکە لە بەرگی تاڵانچییەکان، ڕۆژانە دروێنەی تاڵانکردنی کەل و پەلی چەندان ماڵە هەژار و ڕەش و ڕوتەڵەی ئەم شارەی

دەکرد، کە لەبەر نەبوونیی و دەستکورتی، لە کەناری ئەمبەر و ئەوبەری، بەدرێژایی بەستەکە بۆخۆیان خانولۆچکەیەکی کاتیان دروستکردبوو، تاکو تێیدا بحەوێنەوە. ئەو دیمەنانە هەنووکەش بەمێشکمدا دەخولێنەوە، لەبەر چاوم گوزەر دەکەن، ئێستاکە دەپرسم ئەگەر ئەو بەستە بۆ هەندێک چاوچنۆکی، بیرکردنەوەی تەسکی بەرپرسەکانی شاری هەولێر، وا بەئاسانی و نابەرپرسیارانە پڕ نەکرایەتەوە، دەبووە مایەی کار ئاسنانییەکی زۆر بۆ دروستکردنی تەونی زێرابی سەرتاپای شاری هەولێر، لەو گیروگرفتە دەربازی دەبوو.

# ٦

ئەگەر منداڵان ئەمڕۆکە، لەناو باڵاخانەی ڕەنگاوڕەنگی چەندان نهۆمی پڕ کەرەستەی گەرمی و فێنکی، لە باوەش و ژێر سەرپەرشتی پزیشک و مامانی شارەزا لە دایک دەبن، ئەگەر منداڵان هەنووکە لە ژووری رازاوەی تایبەت بە خۆیان، پڕ لە کتێب و سیپارەی هەمەڕەنگ چاو دەکەنەوە و لەناو جلوبەرگی پۆشتەی گەرموگوڕی جوان و پاک و خاوێندا بەدەم ژیان پێدەکەنن و لە هەمێزی میهرەبانی و فرمێسکی خۆشەویستی کەسوکاریان لە قوشمەی گەورەبووندان، کانیاوی زانیاری، زانست و کەلتور و کەرەستەی نوێ بەسەریاندا باریوە، ئەوە لە ڕۆژانی لەدایکبوونی ئەوێ ڕۆژێی ئێمەدا، بەشێکی هێجگار زۆرمان لەبن ڕەشماڵی بەرباران و باووبژ و لە پەنا گیشە و لە بەربێرێی مەڕدۆشین لە دایک بوونە و بە تامی شیری مەمکی دایکە کلۆڵەکانیان برسێتییان ڕەواندووتەوە. ئەوێ ڕۆژێ منداڵان بە دنیای هەڵەت و پەڵەتان، گەرما و سەرمای بێپەروا شاگەشکە بوونە، لەناو قوڕوچڵپاو و باعەباعی مەڕ و بزنان، پرتەوبۆڵەی ماندوبوونی لەرادەبەدەری ڕۆژانەی دایکوباوکان و بینەوبەردەی زۆرداری و ستەمی چینایەتی بەردەستی دەرەبەگایەتی دواکەوتووی ناو کوێرەوەری و نەخوێندەواری و نەزانین چاویان کردووتەوە.

هەموو جارێک دایکم یادی بەخێر لە ڕۆژە ناخۆشەکانی ژیانماندا، بە تایبەت ئەو ڕۆژانەی لە نزیکەوە بە خەباتی ژێر زەمینیی من بۆ کۆمەڵە ئاشنا بوو، وەکو پشت و پەنایەک هاوکاری دەکردم بۆ بەردەوامی، کۆڵنەدان و بەرەو پێشەوە هەنگاونان. بۆی دەگێڕامەوە، من لەبن ڕەشماڵێک و لە بنگەی هەڵەت و پەڵەتەکانی گوندی (عەولافات)ی

ئاقاری سەرگوندی (سەربەشاخی) ئەودیوی زورگەزراوی دەشتی هەولێر، لە رۆژێکی بەباران و تەڕی بەهار چاوم بە دنیا کردۆتەوە، بەڵام هەرگیز ساڵ و رۆژەکەی بە تەواوی لە لا تۆمار نەبوو، بە گوێرەی دەفتەرنفووسی کۆنی ساڵی١٩٥٧ بێت، من لەدایکبووی ساڵی ١٩٥١ بوومە و دواتر بۆ چوونە قوتابخانە دوو ساڵان گەورە کراوم، هەنووکە بەندە لەدایکبووی ساڵی ١٩٤٩ م. ئەوێ رۆژان ماڵی باپیرم یەکێک لەو بنەماڵە پەڕاگەندە بووانەی گوندی شێواشۆکی وڵاتی کۆیە بوون، کە لەبەر رووبەروو بوونەوەی زوڵموزۆری حەمە ئاغای کۆیەدا، بە گوندەکانی دەشتی هەولێر و کەندیناوە و قەراج پەرت و بڵاوبێوونەوە، کە بۆ خۆی یەک چیرۆکی لەبیر چووی پڕ کوێرەوەری بووە.

ماڵی باوکم زیاتر خەریکی مەڕداری و جووتیاری بوون. لەم بوارەدا تا رادەیەک دەسترەنگین و زدنگین بوون، لە لایەن ئاغایەکانی دەشتی دزەیی ریزیان لێ گیراوە، بەتایبەتی (خدری پاشا)ی شێخانان، زەوی و شوێنی حەوانەوەی لە گوندی شێخانانی نزیک پردێ بۆ دابین کردوون. هەتا ساڵی ١٩٥٧ لەوێ نیشتەجێ بوونە، هەر دایکم بۆمی گێڕاوەتەوە. لەپاش وەرزی بەهاری ساڵی دووەمی تەمەنم، کە لە بنەگە گەڕاوینەتەوە گوندی، من تۆزێک لە کەوتنە سەر پێیان تەپۆبوومە و هەر بە گاگۆڵە کردن ژوور و دەرەوەم کردووە، بەڵام زۆر بزێو و عەجول بوومە، لە شوێنێک ئۆقرەم نەگرتووە، داپیرێکم (دایکی باوکم) هەمیشە بەدوامەوە بووە. چونکە دایکە کلۆڵەکەم بەردەوام سەرقاڵی کارکردن بووە و زۆر کەم بواری هەبووە بەدیار منەوە بێت.

رۆژێکیان داپیرم ئاگای لێم بڕاوە، قەمتەرە (دەرگای گەورەی حەوشە) کراوە بووە، فرسەتم هێناوە و بە قونەخشکە خۆم گەیاندۆتە دەرەوە، هەتا سەر لێواری دەرکی بیری ئاوێ گیرنەبوومە. ئەو بیرەی کە بەلانی کەم چل گەز قووڵ بووە، لەسەر دەمی بیرەکە سەرم بردۆتە پێشەوە، کەوتومەتە (سەرەدیقانێ) و لەناو بیرەکەش ئاوازی خۆم بە بازنەیی دەنگی داوەتەوە. ئەو رۆژە کۆچکم لەسەر و مل دابووە و داپیرەکەم کە منی لێ بزر بووە، بە پرتاو و تەنگاوی بۆ دەرەوە هاتووە، لە٠دوورەوە چاوی بە من کەوتووە، لەسەر دەمی بیرەکەم! بە هەزار و یەک دوعا و پاڕانەوە، کە خۆم بۆ ناو بیرەکە هەڵنەدەم، زۆر بە ئەسپایی لە پشتەوە کۆچکەکەی گرتووم، بۆ باوەشی خۆی بەرزی کردوومەتەوە، پڕ بەدەمی لە خۆشیان کەوتۆتە قیژاندن، هەموو ماڵەوەی سەرسام کردووە، بە قوڕگێکی پڕ لە گریان و قیژان، ئەو دیمەنەی بۆ دایک و باوکم گێڕاوەتەوە، بۆ یەکەم جار لە مەرگی حەقی دەربازی کردوم.

لەگەڵ ژیانی گوندی رۆژ بە رۆژ گەورە بووم. وەک بۆیان گێڕاومەتەوە لە تەمەنی پێنج ساڵیدا، ئەو داپیرەیەم کە زۆر هۆگری بووم، رۆژێک لەگەڵ چەند ژنێکی دیکەدا،

بەیەکەوە لە گوندی شێخانان بەرەو گوندی (سێ قوچان) بۆ بەشداریکردنی مەراسیمی کۆچی دوایی ناسیاوێک چوون. ئەو دەمەیش هاتووچۆ بە ئۆتۆمبێل زۆر کەم بووە، تەنیا خدری پاشا لەو گوندە ئۆتۆمبێلی هەبووە. لەنێوان گوندی (شێخانان) و (سێ قوچان) کە بەپێ سەعات و نیوێک دەبوو، لەو رۆژگاری یەک رووباری پڕاو پڕی ئاو هەبوو، خەڵکی پیادە و سواری ولاغی بەرزە، لە شوێنێکی دیاریکراو دەپەڕینەوە. من زۆر گریاوم، بەڵکو داپیرم منیش لەگەڵ خۆی بە سواری حەچۆ ببات، بەڵام نەیبردووم و منیش بە پەنادزە خۆم لە ماڵەوە دزیوەتەوە، هەنگاو بە هەنگاو دوایان کەوتووم، بەبێ ئەوەی ئەوان هەستم پێبکەن، زوو زوو خۆم بە زەوی داداوە تاکو نەمبینن. ئەوان لە رووبارەکە و لەو شوێنەی پێیان دەوت ئاوی ئێنجە پەڕیونەتەوە. کە هاتوومەتە سەر لێواری رووبارەکە، زۆر هاتووچووم، بەڵام لە خۆم رانەبینیوە، لەو ئاوە زۆرە بدەم، ناچار بە کەناری ئاوەکە هەڵکشاوم تاکو گەیشتومەتە شوێنێک، کە رووبارەکە زۆر باریک وتەسک بوەتەوە، ئاوێکی سەوز و گەش بە قوڵایی زەویدا رێی دەکرد، بە مەزەندەی خۆم دەتوانم بە بازدان بۆ ئەودیوی بپەڕمەوە، بەڵام شلپەم هاتووە، کەوتوومەتە ناو ئاوەکەوە. لە حەژمەت گیانی خۆم بەبێ ئەوەی مەلە بزانم لەناو قوڵایی ئاوەکەوە، دەستم بە هەموو لایەک داکوتاوە، لەو هەوڵدانە دەستم بە کۆلکە قامیشێکەوە گیربووە، کە ئەویش خەریکی لە خاک دەرچوون بووە، کە لە کەناری رووبارەکە مابووەوە. دواتر شوانێک، کە لەو ناوە خەریکی ئاودانی، رانە مەڕەکەی بووە، لە دوورەوە چاوی لەو هەوڵانەی من بووە، بە پەلە فریام کەوتووە، لەناو ئاوەکە دەریهێناوم، وەک چۆلەکەی باڵشکاو بە هەنسکدان دەستم لە ملی ئەو شوانە کردووە، کە لەمەرگ رزگاری کردووم، دیارە شوانەکە منی ناسیوەتەوە، لەگەڵ خۆیدا بەرەو گوندی بردوومەتەوە.

من ئەو یادەوەرییانەی دایکم بۆ ئەوە دەگێڕمەوە، کە ئەو رووداوە لەو تەمەنەوە لە دەروون و گیانی مندا، گرێیەکی درووست کردووە، لە ئەزموونی خەباتی شاخی چەندان ساڵە، هەتاکو هەنووکە تا رادەیەی زۆر لە ئاو دەترسم، گەلەک جاران بە چەند کاتژمێر و موجازەفەکردن لە شوێنی مەترسی، رێگای زۆرم بڕیوە، هەر بۆ ئەوەی لە ئاوێک نەدەم! هەتا هەنووکەیش فێری مەلەوانی نەبووم، شەوانەیش لە خەودا، کە خەون دەبینم، زۆرجار هەر خۆم لەسەر ئاودا دەبینم، هەموو گیانم ژێر ئارەقەی پڕ لە هەست و نەستی ترس لە ئاو کەوتووە.

# ٧

پاش تەواوکردنی قۆناغی سەرەتایی، لە قوتابخانەی "ناوەندیی 'کۆماری" بەرانبەر باڵەخانەی قەزای هەولێر، قۆناغی خوێندنی ناوەندیم دەست پێکرد. لە هاورێیەکانم جیا بوومەوە، ئەوان بێجگە لە (غازی) خۆشناو کە چیترمان نەدیتەوە و ئێستاکەیش نازانم چی بەسەر هات! ئەوانی دیکە چوونە قوتابخانەی "ناوەندی زازا". ئەو زەمانە لە ناوەندیدا خوێندن بە زمانی عارەبی بوو، لە قوتابخانەکەیشدا، پۆلی یەک، ٤ هۆبە بوو، لەگەڵ پۆلی دوو و سێ، کە هەریەکەیان ٢ هۆبە بوون. لەناو قوتابییەکاندا لەو 'رۆژەدا یەکێتیی قوتابیانی کوردستان چالاکییەکی بەرچاوی هەبوو، بەڵام چالاکی و هەبوونی یەکێتیی گشتیی قوتابیانی شیوعییەکانیش لە قوتابخانە بەهێز بوون، بەتایبەت وا رێککەوتبوو، ئەو رۆژە بەشێکی زۆر لە مامۆستاکان لایانگری شیوعییەکان بوون.

لەبیرمە لە وانەی وەرزش، ئێمەی ئەندامانی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان، شۆرت و فانیلەی زەردمان لەبەر دەکرد، ئەوانیش سوورمان بە کار دەهێنا. زۆرجاران مشتومڕ و ناخۆشی لەنێوانماندا پەیدا دەبوو، بەڵام بەهۆی هەبوونی مامۆستایانی وڵاتپارێزی وەک مەجید ئاسنگەر، باکوری و زوبێر بیلال، لە سزادان و سەریەشە رزگارمان دەبوو. لەپاڵ ئەوانیشەوە ناوی ئەو مامۆستایەنەم لەبیر ماوە؛ حوسێن رەشوانی، فاضل شەوکەت، ولییەفەندی، ناصر یوسف، عبدالرزاق/فیزیا، عبدالرزاق/رەسم، عبدالمجید/بەرێوەبەر بوو، صبحی فەلەستینی.

لە یەکەم ساڵی خوێندنی ناوەندیدا، پۆلەکەمان لە نزیکەی ٢٤ قوتابی پێکهاتبوو، لە نموونەی ئەکرەم مەنتک، رزگار گەنجۆ، خالید رەسول، وشیار فەتاح، جەلال، یونس عەلی جومعە، ئیبراهیم، فرید، رشاد، ئیسماعیل مستەفا، مەحەمەد زاهیر، صلاح پطرس و مەحەمەد عەبدوڵڵا ...، کە ناویانم بیرماوە. مامۆستا باکووری، کە چاودێری پۆلەکەی ئێمە بوو، هەمووومان بە هۆی زمانی عەرەبی ئاستی نمرەکانمان زۆر نزم بوو، رۆژێکیان لەدەمی پێدانەوەی کارتی نمرەکانی وەرزی یەکەمی خوێندنی ساڵدا، مامۆستا باکووری هاتە ژوورەوە، کەوتە خوێندنەوەی ناو بۆ پێدانەوەی کارتی نمرەکان. سەرەتا ئەوانەی خوێندەوە، کە لە هەموو وانەکان کەوتبوون، یەکێک لەوانە ئیبراهیم بوو، کە لەسەر دەفتەری تاقیکردنەوەکان نووسیبوی "ئیبراهیم لەک"

مامۆستا باکووریش، کە ناوەکەی خوێندەوە، لێی پرسی: ئیبراهیم تۆ لەکی نێرەی؟ یان لەکی مێیە؟ ئەویش زۆر بە تووڕەیی گوتی مامۆستا من لەکە نێرەم.
مامۆستا باکووری لەو تورەتر وەڵامی دایەوەو گوتی: دەک عەمرت نەمێنێ، نەخێر تۆ لەکە مێیەی، چونکە لە هەموو وانەکان کەوتووی، لە هیچ وانەیەک نمرەکانت نەگەیشتونەتە ۳۰ نمرە لە ۱۰۰ ی، هەستە کتێبەکانت بهێنەوە و بچۆرەوە گوندی، خەریکی جوتیاری بەو چیتر مەسرەفی خۆڕایی بە باوکت مەکە! ئەوەبوو برایم بەبێ دەنگی کتێبەکانی هێنایەوە بەردەم مامۆستا باکووری، چیترمان نەدیتەوە.
لەو قۆناغەدا لەگەڵ چەندان قوتابی بە هۆی چالاکی، بەشداریکردنی کۆبوونەوەکانی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان ئاشنا بووم، بووینە هاوڕێ گیانی بە گیانی رۆژانی داهاتوو لە نموونەی (جەمیل رەنجبەر، وشیار فەتاح، جەلال تاهیر، سابیر ساڵح، سەعدی خەلیل، مەهدی کاوانی، مەحەمەد زاهیر، حیسام و زۆراب بەرزنجی، یونس عەلی جمعە، حەمەدەمین حسین، جوهەر مستەفا، اسماعیل مستەفا، موحسین حەمەد ئەمین و....هتد)
لە ساڵی دووەمی ناوەندی بووم، لە پۆل دەرسی ئینگلیزیمان هەبوو، مامۆستا مەجید ئاسنگەر وانەی دەوتەوە، پەنجەرەی ژوورەکەمان بەسەر جادەکەوە بوو، سەیرمان کرد دەبابەیەکی زنجیردار بە جادەکەدا هات، لەبەردەمی قوتابخانەکەمان چەقی بەست، هەموومان زۆر ترساین، بەتایبەتی ئەوانەی لە ریزەکانی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان چالاکیمان هەبوو، تا رادەیەک بە هۆی سەرچڵییەکانمانەوە لەناو قوتابخانە ناسرابووین، بەبێ ئەوەی هیچ دڵەڕاوکێیەکمان بەرانبەر مامۆستا مەجید ئاسنگەر هەبێت، ئێمە چەند دانەیەکمان داوامان لێ کرد، کە بەڵکو رێگامان بدات بۆ خۆمان بچینە دەرەوە، بەڵام ئەو گوتی: مەترسن هیچ لەگۆڕێدا نییە! لەسەر خوێندنی وانەکەی خۆمان بەردەوام دەبین. تاکو لەناکاو زۆر بەتوندی لە دەرگای پۆلەکەیان دا، چەند سەربازێک و ئەفسەرێک بە هاوڕێیەتی بەڕێوەبەری قوتابخانە، کە ناوی عەبدولمەجید بوو، هاتنە ژوورەوە. دوای هەندێ چاوسوورکردنەوەی ئەفسەرەکە، مامۆستا مەجید ئاسنگەریان لەگەڵ خۆیان راپێچ کرد، بەڕێوەبەر لە پۆلەکەمان مایەوە، دەرگای داخست، رێگای جولەکردنی بە کەسمان نەدا، بەڵام لە پەنجەرەکانەوە دیتمان مامۆستا مەجیدیان سواری ئەو جێبە سەربازییە کرد، کە لەپێش دەبابەکە راوەستابوو، کە پێشتر بەدیمان نەکردبوو. یەکسەر کەوتنە لێخوڕین و لەبەرچاوان گوم بوون.

ئێمە قوتابییەکان تێکڕا خرۆشابووین، یەکسەر زۆربەمان ئەو ڕۆژە قوتابخانەی چۆڵ کرد، گەڕاینەوە ماڵەوە، بەبێ ئەوەی کەس ورتەی لەدەم بێتە دەرەوە. ئەوڕۆژە شار خرۆشابوو بوو، لە هەموو لایەکەوە بە جاش و سەرباز گەمارۆ درابوو، هێز و سیخوڕەکانی ڕژێم چەپ و ڕاست کەوتبوونە گرتن، ڕاونانی خەڵک، خەباتگێڕانی کوردایەتی. شار تەنیا بە ڕۆژ سیمای ئاوەدانی ژیانی تێدا بەدی دەکرا، دەنا بەشەو گیانی مردووی دەپۆشی، دەنگی دەستڕێژی ئێرە و ئەوێ، هاتووچۆی دەبابە، سەیارە سەربازییەکان دەهاتە گوێ. جاشەکان لە هەموو کوچە و کۆڵانێک مۆڵگای ئازاردانی خەڵکیان دانابوو، وەک مێردەزمە بەسەر جادەکانی شار دەخولانەوە. ئەوێ ڕۆژان ئەو چڵکاوخۆرانەی ڕژێم لەچاو زۆربەی خەڵکی کورد کەمینە بوون.

ئەو ڕۆژانە هەناسەی کۆڵنەدانی لاوان و چالاکی پێشمەرگەکانی شاخ ڕۆژ بەڕۆژ هێز و وزەی زیاتری دەدایە کۆمەلانی خەڵک، هیوا و خۆزگەکانی گەورە و گەورەتر دەکردن، بەڵێ سەرباری هەموو جۆرە توندوتیژییەکی ڕژێم، قوتابیان لەوان ڕۆژاندا، نموونەگەلێکی لەبننەهاتووی چالاکی و چاونەترسان بوون، هەموو هەفتەیەک کۆبوونەوەی شانەکان بەڕێوە دەچوو، ڕاپۆرتی هەفتانە بەرزدەکرانەوە، سەرشانە و لێژنەکانی سەرەوە برەویان بە گورج و گۆڵی خۆیان دەدا.

لەگەڵ ساڵی سێیەمی خوێندنی ناوەندیدا، بەدوای کەرتبوونی شۆڕشی چەکداری و پارتی دیموکراتی کوردستان، چالاکییەکانی یەکێتیی قوتابیانی کوردستانیش توشی شەپرە و پاشەگەردانی ببوو، ئێمە بەشێکی هەرە دیارمان کەوتینە بەرەی هێڵی (مەکتەبی سیاسی)، هەر بەناوی یەکێتیی قوتابیا‌ی کوردستان درێژەمان بە چالاکی و خەباتی خۆماندا، بەلام دیسانەوە وەک جاری جاران گەرم و گوڕ، بەهیمەت نەبووین. ئەمجارە کۆبوونەوە و چالاکییەکانمان لە پەنادزەیی و نهێنییەکی پۆلاینەوە ، کەوتە باری نیمچە ئاشکرایی و سێبەری دام و دەزگای ڕژێم.

# ٨

سالانی خوێندنی ناوەندی، بۆ بەندە هەر تەنیا خەریکبوون بە قوتابخانەوە نەبوو، بەڵکو بەدرێژایی ڕۆژانی ساڵ، بەدوای تەواوبوونی دەوامی خوێندن، دەبوو خێرا بگەمە دووکان و هاوکاری باوکە نەخوێندەوارەکەم بکەم، بەتایبەتی سەبارەت بە ڕاگرتن و نووسینی ناو دەفتەری قەرزوقۆڵەی دووکان. من هەر خۆم ئەو بەهرەیەم لە دایکم وەرگرتبوو، لە بواری ژمێریاری و بیرکاریدا، مێشک کراوە و زرنگ بووم، زۆربەی موشتەرییەکانی دووکان، خەڵکی ناسیاو و گوندەکانی دەشتی هەولێر بوون. بەتایبەتیش ئەوانەیان کە سەروسەکوتیان لەگەڵ کوردایەتی و پارتی ئەو ڕۆژەدا دەخورا. ئەوەی دێتەوە بیرم، لەوێ ڕۆژاندا، ئەو خەڵکەی جاش نەبوون و نۆکەر و چڵکاوخۆری میری نەبوون، کە ئەو دەمە جاشایەتی، نۆکەریی و جاسوسی شوورەیی بوو. بەڵام ئەنجامەکەی زۆر بە قازانج بۆیان گەڕایەوە، بگرە وەک مەسئولێکی بیستوچار عەیاری هەنووکەی یەکێک لە حیزبە دەسەڵاتدارەکانی کوردستانی خواروو بە خودی خۆمی گوتوە، کە ئەمە دەرەجەیەکە بۆپێدانی پلەوپایەی سێبەری دەسەڵاتی حیزبی کوردان، کە دیارە مامەحەمەیی و سکرتێربوونی عاتیفیشی هاتووەتە پاڵ بۆ لەوەڕان لەسەر حسێبی قوربانیی شۆڕشگێرە چاونەترسەکانی ڕۆژانی تەنگانە کە لەبیری کەسی خوداپێداوی دەسەڵات نەماون! ـ یان زەنگینێکی ترسنۆکی لێ دەرچێت، دەنا خەڵکی کورد هەمووی بە هەستونەستی دڵسۆزانە، بەقوربانی و خۆبەختکردن لە شانی خەبات و هەواداری ڕاپەڕینی چەکدارانەی ئەوان ڕۆژگار بوون. هەر کە ناوی پێشمەرگە دەهات، ئەو خەڵکە لەخۆشیان شاگەشکە دەبوون. بەکورتی لەوێ ڕۆژاندا، واتە سەرەتای شەستەکان، هەمیشە بەرەی خەڵک بەسەرەوەی لایەنگرانی ڕژێمەوە بوو.

هەر کە پشووی هاوینانیش دەهات، لەبری چوونە قوتابخانە، دەبوو بەو هەرزەکارییە، بۆ کرێکاری ڕوو لە مەیدانی کرێکاران بکەم. ئەودەم شوێنی ڕاوەستان و گردبوونەوەی عەمەلە، لەژێر قەڵاتی هەولێر، بەردەم چایخانەی هەنوکەی مەچکۆ بوو. ئێستاش ئەو یەکەم بەیانییەم لەبیرە، کە دایکە بەستەزمانەکەم بە ناچاری و بەرەبەیان، لە خەوی شیرینی بێدار کردمەوە. ئەوەندە سەرگران و قەڵس بووم، لەداخان ئەوخواردنەی بەیانی بۆی ئامادە کردبووم، نەمخوارد و بەگیرفانی بەتاڵ ڕووم لەو شوێنە کرد. ئەو یەکەم ڕۆژە بۆ یادەوەری من، یەکێک لە ڕۆژە ناخۆشەکانی ژیانم بووە! هەنووکەیش زۆر شەوان خەونی پێوە دەبینم، قازمە و کولینگم بەدەستەوەیە، لە بەرەبەیانێکی زوودا، عەردی ڕەقوتەق

هەڵدەکەنم، گەرەکمە شەنگوتاقەتی هەرزەکاری خۆم بۆ وەستا و باشوەستا دەربخەم، کە رۆژانە بۆ کارکردنم ببات. لە شەشی بەیانی هەتا نزیکی سەعات نۆی دانی سبەینە لەگەڵ (کانەبی) بە نۆبەت یەکێکمان ئەو بناغەمان هەڵدەکەنی، ئەوەی دیکەمان بە خاکەناسی گەورە گەورە، خۆڵە هەڵکەندراوەکەمان دەرەدا. بەڵام بەندەی کاڵفام، هەتا دەهات گەرموگوڕییەکەی کارکردنم لەکورتی دەدا، شەنگوتاقەتم بەرەو هەرەسهێنانی دەستوپلەکانم و لەرزین و خۆرانەگریی قاچەکانم بەرۆکی گرتبووم، ناو لەپی دەستەکانم، تادەهاتن پۆرکی گەورە و گەورەتریان لێ زیاد دەبوو، چۆک و ئەژنۆم بەرگەی بەپێوە ڕاگرتنی جەستەمیان کەمتر و کەمتر دەبوەوە. کانەبی هاوڕێم کە هەم ناسیاومان بوو و کوڕی یەک لە خزمە دوورەکانی گوندی سەربەشاخی کەندێناوە بوو، هەمیش زۆر لە من هەراشتر بوو، ئەزموونی ئەو جۆرە کارکردنەی هەبوو. سەرەتا گوێی بە زیادەڕۆیی خۆماندوکردنە گەرمەتەریقییەکەمی نەدا، بەڵام دوایی وا لە پەلوپۆ کەوتم، هەتا بەرەبەری نیوەڕۆیە، هەر بە خۆی هەردوو ئەرکی هەڵکەندن و دەردانی خۆڵەکەی گرتبوە ئەستۆ. منیش بە شەکەتی و خۆنەگرتن هەتا بەسەرپێوە نەوەستان، بە ناچاری لە پەنا نیوە سێبەری ماوەی دیواری خانووێک، بەوپەڕی دڵەکوتە و نارحەتی، زەقەزەق تەماشام دەکرد! لەبیرمە لەو دەمە وەختەکە وەک ئەوەی لە شوێنی خۆی وەستابێت، نەدەگەیشتینە دەمی ئیسراحەتی نانخواردنی نیوەڕۆ! لەپڕ باشوەستا لێمان پەیدا بوو، کەدیتی وا لە پەنا دیواری ڕاکشاوم، چاوی چوە پشتی سەری، لێم کەوتە هاوارەهاوار، بە هەموو دەنگی خۆی بەسەریدا قیژاندم: ئەوە بۆ دانیشتوی، هەی تەمبەڵی تەوەزەل..!! بە چەندان دەسکە پتکوپلاری دیکەی ناهەموار، کە یەکەمجارم بوو، بەوتەمەنە ئاوا سەرزەنشت بکرێم، زۆرم دڵ بە خۆ سوتا، یەکسەر بۆ ئەوەی چیتر گوێم لە پرتەوبۆڵەی ئەو قونکە پیاوە نەبێت، بە هەر شێوەیەک بێت، ڕاستبومەوە، ڕوو لە کانەبی گوتم: حەقی ئەو نیورۆژەی منیش بۆخۆت وەرگرە و ملی ڕێگای ماڵەوەم گرت.

زۆر بەزەحمەت گەیشتمەوە، چەندان جار ساتمەم دەکرد و بەلادا دەچووم، ئەگەر لەوتەمەنە هەرزەکارییەدا نەبومایە، ئەوە بەدڵنیایی خەڵک بەسەرخۆش تێم دەگەیشتن، لە هەموو لایەک بە هۆیها دوام دەکەوتن. ئێستایش دیمەنەکانی دەمی سەرخۆشی بورهان جاهیدی شاعیرم لە بەرچاوە، لەو دەمەی بەسەرخۆشی بەکۆڵانەکان بەرەو قەلاتی کێل دەبوەوە، چییان بەسەر دەهێنا! لە دەرگای ماڵەوە کە تووشی دایکە کلۆلەکەم بووم، هەر کە چاوی پێم کەوت، لەقیژەی دا و باوەشی پێداکردم و پرسی: ئەوە بۆ ڕەنگت هەڵبزرکاوە! هەر ئەوەندەم دەم هەڵپچڕی و بە پچڕ پچڕی گوتم، تەماشای دەستەکانم بکە

و لە ناوەندی حەوشەکە ڕاکشام. نزیکەی هەفتەیەک لە ماڵەوە کەوتم، تاکو بەیارمەتی دایکم و خوشکەکانم هاتمەوە سەرخۆم.

# ٩

تازە پۆلی سێیەمی ناوەندیم تەواو کردبوو، دەبوو ناسنامەی عیراقی دەربهێنم. ئەوە بوو لەگەڵ کوڕە خاڵێکم (عەبدوللا) کە ئەو دەمە لە نزیک شاری بەغداد سەرباز بوو. بەیانییەکی زوو لە خەو ڕابووم، ڕانکوچۆغەیەکی خورماییم هەبوو، بەدوای نانخواردنی بەیانی، خێرا لەبەرم کرد و لەگەڵ ئەو کوڕە خاڵەم، چووینە گەراجی بەغداد، ئەو دەمە گەراجی ترومبێلەکانی بەغداد لە بەرانبەر قاوەخانەی عەبۆ بوو کە ئێستا هەمووی کراوە بە نافورە و گوڵوگوڵزار. دڵم زۆر خۆش بوو، چونکە ئەوە یەکەمجارم بوو، سەردانی پایتەختی عیراق بکەم. بۆ دەوری کاتژمێر یەکی نیوەڕۆ بە نێرین گەیشتینە سەیتەرەی دێلتاوە، لەوێ لەناو تێکڕای نەفەرەکانی ناو ترومبێلەکە، هەر منیان هێنایە خوارەوە کە هەترەشم چووبوو،[20] کە تووشی ئەوجۆرە بەرخوردە بووم. هەنووکەش لەبیرم نەچووە، سەربازێکی ڕەقەڵەی ڕەشئەسمەری دەموچاو ترشاو، زۆر بەڕەقی باسکی گرتم، بەسەرمدا هاواری کرد! ئەگەر کوڕە خاڵە سەربازەکەم فریام نەکەوتایە، هەر نەمدەزانی مەبەستی چییە لەو ڕاپێچانەی من! کە دوایی تێگەیشتم دیارە زۆر ڕقی لە لەبەرکردنی جلوبەرگی کوردی بووەتەوە، بەسەر من هاواری دەکرد: (لابس گونیە و رایح بغداد) واتە گونیەی لەبەرکردووە و دەچێتە بەغداد.

بەدوای هێنومنهێنەکی باش کە خاڵۆزاکەم خەریک بوو، بەریاندام، بەڵام ناچاریان کردم چۆغەرەکەم و پشتێنەکەم لەبەر بکەمەوە، تەنیا ڕانکەکەم لەبەر بێت، کە گەیشتینە بەغداد ئەو خزمەم یەکسەر چوو، پانتۆلێکی لەنگەی بۆ کڕیم. بۆ شەوەکەی لە ئوتێلێکی ساحەی مەیدان جێگامان گرت، زۆرم برسی بوو، گوتم کاکە عەبدولا زۆرم برسییە. ئیتر

---

[20] پێشتریش وام بەسەر هاتبوو. لە کودەتا ڕەشەکەی ٦٣ی بەعسییەکان و پەیدابوونی حەرەس قەومی، لەسەر پرسینی ناوی ڕاکردوویەک، لەلایەن چەند حەرەس قەومییەکی تروکمانەوە، بەو منداڵییە لێدانی زۆرم خواردبوو، هەتا بەردەرگای مقەرەکەشیان بردم لە بەرانبەر ئەپارتمانی ئێستای جەلیل خەیات، هەر یەکێک لە حەرەس قەومییەکانی بەر دەرگاکە منی دەناسی، خەڵکی گەرەکی محەتە بوو، کوڕەکەی لەگەڵ من لە قوتابخانە بوو، ئیزنیان دام.

منی له ژوورەکه بەجێهێشت، خواردنی بۆ هێنام، بەڵام چ خواردنێک! تومەز کەبابی ساردەوەبوو بوو، هەر واقم ورما و گوتم، کوره کاکه عەبدوڵا ئەوه دەڵێی قەرسەقوله و نایخۆم. به ناچاری نانەکەم به وشکی خوارد. دیاربوو لەو هەموو دیمەنه قەرەبالغییەی بەغداد، به هۆی ماندوبوونی هەرتەک هەرتەکی ڕێگاوه، لەسەر جێگاکەی خۆمەوه، خەو بردمییەوه و بەیانی زوو له لایەن خالۆزاکەم بێدار کرامەوه، که دەبوو من بباته بەر دائیرەی دەرهێنانی ناسنامەی عیراقی و خۆی بۆ ئوردوگا سەربازییەکەی بگەڕێتەوه. که بەڵێنی پێ دام لەگەڵتەواوبوونی دەوامەکەی له ئوردوگا دەگەڕێتەوه، هەر لەبەردەم هەمان دائیره چاوەڕوانی دەکەم. ئەوەبوو ئەو شوێنه ئەو کاته له لای گەرەکی سەعدوون بوو. هێشتا سەعات حەوت نەببوو، ئێمه به ئامانەی ژماره چوار له مەیدانەوه گەیشتینه ئەوێ، کەچی بەم زوەیش خەڵک لەبەر دەرگاکه ریزی گرتبوو، کاکەم بابۆلەیەکی پڕ له نۆکی بۆ کڕیم، ئامۆژگاری کردم لەو ریزه بوەستم. بەکورتی فێری کردم چی بکەم و چی نەکەم. سەیرم کرد پیاوێک که جلی کوردی لەبەردابوو به هەولێری نەدەچوو. لێمان نزیک بووەوه و بەیەکەوه ریزمان گرت، که بەدوای رۆیشتنی خزمەکەم بۆ من فەرامۆشییەکی باش بوو، بەڵام نەخوێندەوار بوو و عارەبی نەدەزانی. ئەوەندەی بۆم کرا، فریای کارەکانی ئەویش دەکەوتم، بەشێکی زۆری مامەڵەکەی بۆ پێشەوه چوو. دەمەدەمی نیوەڕۆ بوو له پەنا کوشکێک لەگەڵ ئەو کابرایه لەفەمان دەخوارد، که کاکه عەبدوللا لێمان پەیدا بوو. کابرا زۆر نیگەران بوو، مامەڵەکەی گیری خواردبوو، به کاکەم گوت، بەڵکو یەکەم جار لەگەڵ ئەو بچی، ئەوی من بەرەو کۆتایی رۆیشتووه. کاکەم لەبەرئەوەی جلی سەربازی لەبەر بوو، بەئاسانی هاتوچووی ژوورەکانی دەکرد، کارئاسانییەکی زۆری بۆ کرد، دوایی هاته هیمدادی من و بەیەکەوه لەگەڵ تەواوبوونی دەوامی رەسمی دانی ئێواره من ناسنامەی عیراقی خۆم وەرگرتەوه، ئەوەی کابرای دیکەش مایەوه بەیانی، شەو لەگەڵ ئێمه هاتەوه هەمان هوتێل، بەیانی بەنده لەگەلی چوومەوه ئەو شوێنه، ئەوەی ئەویش تەواو بوو. که هەندی دنیایەک سوپاسی کردم و باوەڕ کەن، ئەوەندەی نزاو دوعای بۆ من و کاکەم کرد، که من دڵۆپ دڵۆپ ئارەقەی شەرمم ڕشت. لەبیرمه بۆ شەوێکی دیکه له بەغداد مامەوه، زۆر لاو شوێنی بەغداد گەڕام. بەتایبەت کەناری روباری دیجله زۆر به لامەوه دڵگیر بوو. هەروەها شاری یارییەکان، که سەرنجی داگیر کردبووم، که له لای گەرەکی قەنات بوو.

ئەو ساڵه قوتابییەکی زۆری دەرچووی ناوەندی له (الدار المعلمين) وەرگیران. هەرچەنده منیش هەوڵم دا وەربگیرێم، بەڵام نمرەکانی دەرچوونم بەرز نەبوون و واسیتەشم نەبوو و وەرنەگیرام. هەر لەو ساڵه له رێگای دۆستێکەوه ئامۆژگاری کرام که له سلێمانی ئامادەیی کشتوکاڵ کراوەتەوه، بۆ ئەوێش چوم. لەبیرم ناچێتەوه، هەرکه

چوومە سلێمانی، زۆر بەساردی وەڵامیان دامەوە، هەتا ئەوراقەکانیشیان لێ وەرنەگرتم، بەو بیانوەی مەوعیدی داواکردن تەواو بووە. ناچار بۆ رەواندنەوەی دڵتەنگیم، پیاسەیەکی بازاری ناو شاری سلێمانیم کرد. بۆژەمە نانخواردنی نیوەڕۆ، لامدایە لۆقلتەیەک لە لای سەراوە، دوای دانیشتنم، هەر گوێم لەوە بوو، کرێکاری ناو چێشتخانەکە، هاواری دەکرد، برنج و شلەیەک، شلەیەک بەتەنیا. منیش وامزانی، مەبەستی شلەساواری لای خۆمانە لە هەولێر. بە کابرام گوت: شلەساوارێکم دەوێ! یەکسەر دایە قاقای پێکەنین و هاواری کرد: بۆ بەیانی شلەساوار بە گۆشتی کەلەشێر لێنێن، ئەو موشتەرییە چەورەمان لە لادێوە بۆ هاتوە..! زۆر تووڕەبوم، بەلام نەفەرێک لەتەکمەوە فریام کەوت و گوتی: کاکە مەبەستی پلاوە، بۆ گاڵتەی پێ دەکەن. من برسیم بوو، وەختیش درەنگ و نەشارەزا بووم و بەناچاری بێدەنگ بووم، بەدوای نانخواردنەکەم بەتەنگاوی پارەی خۆراکەکەم دا و بۆی دەرچووم و بە هەناسەساردی بۆ هەولێر گەڕامەوە.

بۆ جاری دووەم، ساڵی ١٩٦٨ بوو، لەگەڵ چەندان برادەری وەک، سەلام گۆمەشینی، هوشیار فەتاح، هوشیار عزیز، سەردانی بەغدادم کردەوە، بە مەبەستی چوونە دەورەی موفەوەزی پۆلیسی. لە رێگای مەلا ناسیح سەردانی (مەکتەبی سیاسی)مان کرد، لە هوتێلی (حسیب) لە (حافظ قازی) و مامەلەیەکی زۆر ساردوسڕیان لەگەڵ کردین. بەڕێکەوت من لە بەردەمی هوتێلەکە چاوم بە پێشمەرگە و کادری ناوچەکانی شەمامک (حوسێن شەمامەر) کەوت، کە چەند جارێک بە نهێنی رێگای کەوتبووە ماڵی ئێمەوە، جوامێرانە بەدەنگمانەوە هات، هەر بە هۆی ئەوەوە زانیمان ناوی ئێمە لەناو لیستی ناوە پێشکەش کراوەکاندا نییە، ئەو ئێمەی بردە لای (کەمال محیدین)، کە ئەو دەمە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی بوو، ئەو پێشنیازی ئەوەی بۆ کردین ئەگەر بمانەوێ، ئەوە ناومان بۆ لیستی (نائب موفەوەز) دەنووسی. لێرەدا من کە خۆم دەرچووی سێی ناوەندی بووم، لە پۆلی چواری ئامادەییش دەرچووبووم، ئەو دەورەیەیش بۆ ئەوانە بوو کە لە پۆلی سێی ناوەندی دەرنەچووبوون. ئەوەبوو بە هەناسە ساردی گەرەکم بوو، یەکسەر بگەڕێمەوە هەولێر، کەچی هەر (حسین شەمامەری) پێشنیازی ئەوەی بۆ کردم کە ئەمشەو بمێنمەوە، بەیانی لەگەڵ (خاڵە سەید مەجید) بچمەوە، کە ئەو سەیارەی خۆی هەیە. بەلام برادەران دیاربوو دەمانەوە و ماڵی ئاوابێت، بۆ سبەینێ (خاڵە سەید مەجید) بە پیکابە موسەلەحەکەیەوە هاتە دوام، کە ئێمە لە هوتێل (نزار) لە گەڕەکی حەیدەرخانە بووین. ئیتر بەیەکەوە بەڕێکەوتین و بۆ نیوەڕۆیەکی زوو گەیشتینە کەرکوک، چووینە بارەگای لقی پارتی باڵی (م.س)، لەوێ نانمان خوارد و پاشان بەرەو هەولێر بەڕێکەوتین. لە رێگادا خەیاڵاتی زۆرمان کرد، لەوەی تووشی کەمین و گێچەڵی تەقەلێکردنی پێشمەرگەی پارتی (سەرکردایەتی بارزانی) ببین.

که بەردەوام لەو ڕێگایە چالاکیان هەبوو. بەلام ئەو ئێوارەیە، ئێمە بە سەلامەتی گەیشتینەوە هەولێر و لێرە بەدواوە لەسەر تەواوکردنی خوێندنی ئامادەیی بەردەوام بووم.

# ١٠

سالی (١٩٦٧_ ١٩٦٨) بوو، قۆناغی ئامادەییم دەستپێکرد، ئەو سالە یەکەم سال بوو، که خوێندنی ئامادەیی ببووە سێ سال، پێشتر هەر دوو سال بوو. ئەو دەمەیش لەناو شاری هەولێر تەنها یەک قوتابخانەی ئامادەیی هەبوو، بەناوی (ئامادەیی هەولێر). هەموو دەرچووەکانی قۆناغی ناوەندی لەوێ کۆدەبوونەوە، لە سالی یەکەم خوێندن گشتی بوو، سالی دووەم و سێیەم بەشی وێژەیی و زانستی لە یەکدی جیا دەبووەوە، قوتابیانی خەلکی هەژار و بەلەنگاز لە مالەوە بەپێ دەهاتینە قوتابخانە، که بیناکەی دروست بەرامبەر بە پەرلەمانی ئێستای کوردستان بوو. لەو ڕۆژە لە پێشەوە کتێبخانەی گشتی هەولێر و دواتر یانەی ئەفسەران بەرامبەری بوو. مامۆستایە هەرە دیارەکانمان لەو قۆناغە بریتی بوون لە: (فاروق خەلیفە، حەیدەر هەمزە، حەمید یەعقوب، تۆما، جەلال شەریف، سەدرەدین چەلەبی، مەلا عوسمان مەلا سالح، جەمال (مامۆستای ریاضیات)، یوحنا (مامۆستای زیندەوەری)، که هەموویان نموونەی مامۆستای کوردپەروەر و ولاتپارێز بوون. ئەودەمە نەجمەدین موفتی بەڕێوەبەر بوو. تا بلێی گوێڕایەلی فەرمانی مەعاریف و میری بوو، هەرگیز لەبیرم ناچێت، بە فرمانی موتەسرفی هەولێر، لەبەرکردنی جلی کوردی لە قوتابخانە یاساغ کرابوو، هەموو قوتابییەکان بە ناچاری ملکەچی ئەو بڕیارە بوون. لە سەرەتادا هەر هەموویان پانتۆلیان لەبەر کرد، تەنیا بەندە و ئەکرەم مەنتک نەبێ، که مامۆستا نەجمەدین موفتی هەرچەندی هێنا و بردی و هەتا هەڕەشەی لە قوتابخانە دەرکردنی لێ کردین، بەلام ئێمە ملمان نەدا. بۆ مێژوویش دەلێم: مامۆستایان حەیدەر هەمزە، جەلال شەریف، مەلا عوسمان، فاروق خەلیفە که یاریدەدەری بەڕێوەبەر بوو، پشتگیری ئێمەیان کرد لەسەر لەبەرکردنی جلی کوردی، فەسل نەکراین و ئەو بڕیارەمان شکاند.

بەرە بەرە قوتابیانی وەک هۆشیار فەتاح و هۆشیار عەزیز و چەندانی دیکە چاویان لێمان کرد، که بەیەکەوە لە لێژنەی یەکێتیی قوتابیانی کوردستانی سەر بەبالی (م.س) بووین. بێجگە لە ئەکرەم مەنتک، که سەر بە یەکێتیی قوتابیانی کوردستانی پارتی و سەرکردایەتی بارزانی بوو. ئەو قوتابیانەی لەبیرم ماون، تاریق مەحەمەد سەعید، ریاز

خدر وادی، حوسێن عومەر، مەحەمەد حوسێن، هوشیار فەتاح، عەباس عەبدوڵلا یوسف، بەختیار حەیدەر، ئەکرەم مەنتک، ئەکرەم ئەحمەد سۆربەشی، جەلال تاهیر، حەمەدەمین حوسێن، نەوزاد رەفعەت، عزەدین رەزا، حەیدەر کەریم، سەباح عەبدوڵلا سالح، مەحەمەد زاهیر، ئازاد تۆفیق، ئەمجەد ئەرشەد.. هتد.

لەو تەمەنەدا ئێمەی ئەندامانی ی. ق. ک زۆر سەرچڵ و سەرەڕۆ بووین، بە پشتیوانی چەکدارانی باڵی مەکتەبی سیاسی لەناو شاری هەولێردا، هەندێجاران زێدەڕۆییمان دەکرد. زۆرجار منداڵکارانە دەمانچەمان دەبردە قوتابخانە. هەر بۆ نموونە: بەدوای کودەتای بەعسییەکان لە شاری هەولێر، مامۆستایەکی هونەر بەناوی حەمید مەرمەڕچی، کە مەسیحی بوو، هاتبووە قوتابخانەکە، خەریکی گەرا دانانی ڕێکخستنی بەعسییان بوو، بەناوی یەکێتیی نیشتیمانی قوتابیانی بەعسییەکان. ئێمەیش بەناوی یەکێتی قوتابیانی کوردستان (باڵی م.س) زۆر بە توندی و رەقی بەرەنگارییان بووینەوە، بەتایبەت حەمید مەرمەڕچی، کە بواری چالاکی خۆی بۆ ئەوە تەرخان کردبوو، کە دنەی ئەو قوتابیانە بدات، کە تا رادەیەک لەگەڵ هەست و نەستی کوردایەتی نەدەهاتنەوە، بەتایبەت لە کوڕی ئەفسەرەکان، هەندێ لە زەنگینەکان، کارمەندانی هێلی شەمەندەفەری هەولێر، تا رادەیەک چەند شانەیەکی لێ دروست کردبوون، ئێمە لە ڕێگای یەکێک لەو کەسانەی، کە خەڵکی گەڕەکی ئازادی بوو و زۆر دۆستی من بوو، کە باوکی ئیمام تابوور بوو، بە هەموو ناوەکانمان زانیبوو، لە ڕۆژ و شوێنی خۆیدا ناوەکانی ئەو قوتابیانە بڵاو دەکەمەوە، کە یەکەم شانەی ڕێکخستنی بەعسی بوونیان لە هەولێر چاند.

ئەوەبوو بەندە و هۆشیار فەتاح یادی بەخێر لە ژیاندا نەماوە، لەگەڵ جەوهەر مستەفا، کە ئەوکاتە قوتابیی ناوەندی بوو، تەکلیف کراین، وەک لێژنەی کوتەک، کە لەناو قوتابخانەکە لەگەڵ حەمید مەرمەڕچی قسە بکەین. ڕۆژێکیان هەنووکەیش وا دەزانم دوێنێیە، چووینە سەر ژووری (مەرسەم و مەسرەح)، کە کردبوویە مۆڵگای خۆیی و هەوادارەکانی لە قوتابیان. سەیرمان کرد، دەرگای لە ژوورەوە کلیل داوە، بە هەر شێوەیەک بوو دەرگاکەمان کردەوە، چوار قوتابی لەوانەی ببوونە بەعسی، کە هیچ پێوەندییەکیان بە هونەر و شانۆوە نەبوو، لە دەورەی مێزەکەی بە حەپەساوی و چاو شۆڕی، سەیرمان دەکەن. من هاتمە قسەکردن و بە شێوەیەکی رەق بە قوتابییەکانم گوت: بڕۆنە دەرەوە ئێمە قسەمان لەگەڵ حەمید مەرمەڕچی هەیە، تا رادەیەک چی خراپ بوو پێمان کرد، دەستی بە گریان کرد، لەوێ وازمان لێ هێنا، بەلام قونکە دەمانچەی لە بەرپشتێنی من و جەوهەر کرمانجدا بینی. ئیتر ئێمە هاتینە دەرەوە، ئەویش دواتر چوو بۆ لای م نەجمەدین موفتی و شکایەتی لێمان کرد. تەنیا ناوی منی دەزانی و گوتبووی

دەمانچەی پێ بووە. بۆ رۆژی دواتر هاتمە قوتابخانە، بینم قوتابخانە ئاسایی نەبوو، هەر لەگەڵ زەنگلێدان، فەراشی بەڕێوەبەر بەدوامدا هات، مۆڵەتی لە مامۆستا حەمید یەعقوب وەرگرت، کە وانەی ئینگلیزی پێمان دەگوت، لەگەڵ دەرچوونم لە پۆل گوتی: نەکەی بترسێی ئەتۆ کوردی!!

منی هەرزەکار بەبێ ئەوەی دەمانچەکەی، کە لەناو پشتێن شاردبوومەوە، بیدەمە یەکێکی دیکە لە هاوڕێیەکانم، زۆر سەربەستانە چوومە ژووری بەڕێوەبەر، کە لەگەڵ دیتنی و نەدیتنی من، یەکسەر بە تەنگاوی پەلاماری دام، تاکو دەمانچەکەی بەرپشتێنم دەربێنی، لەو هێنان و بردنەدا، مامۆستا فاروق خەلیفە هاتە ژوورەوە، چەند جارێک پێی گوتم: (هەی ئەوەندە تەنکە بخۆی) بەرزفتی کردم، دەمانچەکەی لێ وەرگرتم و منی دەرکردە دەرەوە. خۆی پاش ماوەیەک دەمانچەکەی لەناو دەفتەرێک دانا بوو، هاتە دەرەوە و منی بردە ژوورەکەی خۆی، کە لە تەنیشت ژووری بەڕێوەبەر بوو، زۆر سەرزەنشتی کردم، کە چۆن قوتابی دەمانچە دەهێنێتە قوتابخانە و بە شێوازە گاڵتەجاڕییەکەی خۆی، جوێن بارانی کردم. دواتر پێی گوتم: بڕۆوە پۆلەکەت. لەپاش تەواوبوونی دەوامی قوتابخانە خۆت دوابخە، دەیدەمەوە خۆت، بەڵام جارێکی تر ئەو ناماقولییەی نەکەیت!

منیش بە تەواوی رەنگم هەڵبزرکابوو، هەموو گیانم کەوتبووە ژێر ئارەقە، هەستم بە شەرمەزارییەکی زۆر دەکرد، چونکە دەترسام لە قوتابخانە دەربکرێم، بەڵام دوای دانانی لیژنەیەکی بەدواداچوون و لێپرسینەوە، دیارە لە پێشەوە م. فاروق بە هاوکاری مامۆستایان جەلال شەریف و حەیدەر هەمزە و حەمید یەعقوب، کە ئەو دووەی دوایی هەواداری باڵی (م.س) بوون، م. نەجمەدین/یان رازی کردبوو، کە باس لە دەمانچەکەی من نەکا، هەرکە بانگ کرام بۆ پرسیار و وەڵام، شێلگیرانە "حەمید مەرمەڕچی"م لە پێبوونی دەمانچە بەدرۆ خستەوە، بگرە تا رادەیەکی زۆر تاوانبارم کرد، کە ئەو بواری مامۆستایەتی خۆی بۆ لەخشتەبردنی قوتابیان و دروستکردنی رێکخستنی حزبی تەرخان کردووە، لە کۆتاییدا منیان بۆ دوو هەفتە لە قوتابخانە دەرکرد، چەند پلەیەکیشیان لە سلوک دابەزاندم، دواتر مامۆستای نەمر فاروق خەلیفە ئەو بڕیارەیشی لە دۆسیەی قوتابخانە دەرهێنا و لەبەر چاوم دڕاندی.

# ١١

پۆلی چوارەمی گشتیم لە ئامادەیی هەولێر تەواو کرد. بەڵام چ تەواوکردنێک، تازە خەریک بوو لەگەڵ ڕۆشنایی ژیان ئاشنا دەبووم، هەر کتێب و سیپارەیەکی کوردیم بەرچاو بکەوتایە، بە هەزار و یەک هەوڵی خراپ و باش، پارەم پەیدا دەکرد و دەمکڕی. لەو ڕۆژانەدا باری گوزەرانی ژیانمان زۆر خراپ ببوو، دووکانەکەی باوکم بە هۆی دەستبڵاوی من و کۆمەکی باوکم بە ماڵە کادر و پێشمەرگەی پەڕپووت، ببووە وێرانە. بۆیە بەناچاری باوکم شەوانیش کاری دەکرد. بۆ ماوەی چەندان ساڵ وەک حەسحەسی شەوان دەست بەکار بوو، منیش لەگەڵ خوێندنی ڕۆژێدا، کاری ڕێکخراوەیی و قوتابیانم دەکرد. شەوان لە سەعات یەکی شەوەوە، دەچووم لە فڕنی سەموونی ناسیاوێک لەلای مەرقەدی (شێخەڵڵا) هەتا شەشی بەیانی کارم دەکرد. زۆرجاران لە ڕۆژانی هەینی و وچانەکاندا لەسەر جادە سەموونم دەفرۆشت. زۆر پێی قەڵس دەبووم و زۆرجاران سەبەتە سەموونم لەسەر جادە بە جێ دەهێشت و دەبوایە دایکە کڵۆڵەکەم لەگەڵ خوشکەکانم بچن سەرپەرشتی بکەن. لەوێ ڕۆژگاردا بەبێ ئەوەی من و باوکم بە یەکتری بزانین، هەر یەکەمان لەگەڵ لایەنێکی پارتی بووین.

سەرەتا باوکم لە ژێرەوە لەگەڵ ڕێکخستنەکانی پارتی و سەرکردایەتی بارزانی کاری دەکرد و زۆرجاران پرێسکە و ئەدەبیاتی قاچاغی بە من دابەش دەکرد، تاکو جارێکیان لێی کەوتمە گومان. نامەیەکی پێچراوم کردەوە و بە مەسەلەکەم زانی. لە ماڵەوە بووە دەمەدەم و هەرامان و زۆرم لێدان خوارد، بەڵام لەو سەروبەندەدا، دیاربوو لە ڕێگای چەند ناحەزێکەوە، ڕۆژێکیان من دووکانم کردەوە، نامەیەکی هەڕەشاوییان فڕێدابووە دوکانەکەمان، بەو بیانوەی من کوڕە گەورەی (شێخ محەمەد) جەلالیم و دەبێ واز بهێنم، دەنا دەکوژرێم! ئیدی باوکم، کە بەونامەی زانی، زۆری پێ تێکچوو، یەکسەر لە ڕێگای ڕێکخستنەکانی خۆیەوە، چووە بیستانە و بە یەکجاری وازی لە پارتی و حزبایەتی هێنا. جارێکی دیکە ناوی ڕێکخستنی پارتی بەسەر زمانیدا نەهات و تەرەبوو، چیتریش شەڕی لەگەڵ من نەدەکرد و زۆرتر دەستم واڵابوو، کە درێژە بە خەباتی سیاسیی ڕێکخراوەیی خۆم بدەم.

لەوێ ڕۆژاندا بە هۆی چالاکی و زیادکردنی ئەندام و هەوادار لە ریزی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان بە تایبەتی و ڕێکخستنەکانی حزبیش بە گشتی، تاڕادەیەکی دیار بەرەو پێشەوە چوو بووم. لەناو قوتابیان وەک ئەندامی لێژنەی شار دەست بە کار بووم،

بەرپرسی ئامادەیی هەولێر و دواتر ئامادەیی ئازادی و ناوەندیی برایەتی بووم. لەو برادەرانەی لەبیرم ماون بۆ لیژنەکانی ئامادەیی هەولێر بریتیبوون لە: هۆشیار فەتاح، جەلال تاهیر، سدقی ئامێدی و مەهدی کاوانی، ئەو دەم قوتابیانی ئامادەیی هەولێر وەک توێژێکی گەنجانی شار، هەوێنی خەباتی کوردایەتی بوون. سەرباری هەندێک بینەوبەردەی نادروستی حزبایەتی، کە تازەبەتازە خەریکی فەریکەکردنی سەرەتاکانی پاشاگەردانی و یەکتر نەخوێندنەوە و دیاردە دزێوەکانی نێو کۆمەڵی کوردی بوو. قوتابییەکان بە گشتی لە پێوەندییەکی قوتابیانەی دروست دەژیان، یەکێتیی قوتابیانی کوردستان بە هەردوو باڵە ئاشکرا و (پارتی باڵی م.س) نهێنییەکەیەوە (باڵی پارتی و بارزانی) شانبەشانی یەکێتیی گشتیی قوتابیانی سەر بە (حزبی شیوعی) و چەند قوتابییەکی تاکوتەرای سەر بە بەعسییەکان لە ئامادەیی هەولێر وجودیان هەبوو. یەکێتیی قوتابیانی کوردستان لە هەولێر لقی هەبوو، کە جەمیل رەنجبەر بەرپرسیاری بوو، ئەوەی لەبیرم مابێت ئەندامانی لقی قوتابیان بریتی بوون لە سەعدوڵلا پەرۆش و هیوا سەرهەنگ و نوێنەری قەزاو ناحیەکان، هەروەها کۆمیتەی لیژنەی شاری هەولێر بێجگە لە: سەعدوڵلا پەرۆش، هیوا سەرهەنگ، هۆشیار عەزیز، بەندە و هۆشیار فەتاح و جەوهەر مستەفا کرمانج و موحسین حەمەدەمین مورتکەیی، پێکهاتبوو، کە دیسانەوە جەمیل رەنجبەر بەرپرسی کۆمیتەکە بوو، دیارە ئەو رێکخراوەی ئێمە لە سێبەری ئاشکرای پێشمەرگەکانی باڵی (م.س) لە هەولێر و هەبوونی بارەگای ئاشکرا، باردۆخی کارکردنمان باشتر بۆ رەخسا بوو. لە خەباتی ژێر زەمینییەوە کەوتبووینە خەباتی ئاشکرای بەرچاوی خەڵک. لەبیرمە یەکێک لەو کارە باشانەی ئەوێ رۆژێ، بە پشتیوانی رێکخستنەکانی پارتی، بەتایبەتی هەندێ پێشمەرگەی وەک مەحەمەد عەجەم، عەزە گورگە، عومەرسۆفی، قادربادادوەیی و بەهرام باشتەپەیی[21] ئەنجامماندا. هەڵمەتی بە کوردی کردنی ئەو تابلۆ و ناونیشانانە بوو، کە دوکاندار و کۆگا و کۆمپانیاکان بە عەرەبی هەڵیانواسیبوو، بە ماوەی مانگێک لە سەرتاسەری ناو شاری هەولێردا. بۆ یەکەمجار لە مێژووی ئەم شارە، زۆربەی هەرە زۆری ئەو ناونیشانانە بە زمانی کوردی بەسەر شوێنەکان هەڵواسران.

من کە بوومە پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، دەبوو بەشی وێژەیی، یان زانستی هەڵبژێرم. بەبێ ئەوەی بەماڵەوەشمان بڵێم، هەر بە نیازی ئەوەی، کە ئامادەیی تەواو بکەم و بچم لە کۆلیژی یاسا و ماف بخوێنم، بەشی وێژەییم هەڵبژارد. دەربارەی ئەوەی لە

---

[21] بێجگە لە شەهید مەحەمەد عەجەم، ئەوانەی دیکە قوربانی شەڕی قێزەونی کوردکوژی ناوخۆن لەوێ رۆژگاردا

تاقیکردنەوەکانی ساڵی چواری گشتی نمرەکانم لە وانە زانستییەکان باشتر بوو لە نمرەی وانە وێژەییەکان، کە دواجار ئەو لیژنەیەی مامۆستایان لە ژووری مامۆستای هێژا فاروق خەلیفە دیدەنیان لەگەڵ کردم، زۆریان هەوڵ لەگەڵ دام، کە پەشیمان ببمەوە، بچمە بەشی زانستی، کەچی هەر ئەوەی خۆم هەڵبژارد.

لەساڵی شەشەمی ئامادەیی بووم، مەسەلەی هەڵبژاردنی ناوخۆمان لە یەکێتیی قوتابیانی کوردستان هاتە گۆڕێ. نوێنەرانی سکرتاریەتی قوتابیان بۆ سەرپەرشتیکردنی کۆنفرانسی ناوخۆیی هەولێر هاتبوون، کە بریتی بوون لە: فازل مەلا مەحمود، فازل تەیب، و شاسوار جەلال. کۆنفرانسەکە لە هۆڵی گەڵ بەسترا، ئەو دەمە نێوان بەندەو جەمیل رەنجبەر تا رادەیەک سارد بوو، بە هۆی ئەوەی جەمیل رەنجبەر بە فرمانی لقی پارتی و بەبێ رەزامەندی کۆمیتەی شاری هەولێر، هۆشیار عەزیز و هیوا سەرهەنگی کردبووە ئەندامی لقی هەولێر. من و موحسین حەمەدەمین بە پلەی یەکەم رەخنەی توندمان گرت، بە ناڕەوامان لە قەڵەم دا. جەمیل رەنجبەر و سەعدوللا پەرۆش، بە دڵەوە ئەو سەرنجانەی ئێمەیان پێ دروست بوو. بەڵام بەبێ ئەوەی راشکاوانە ئەوە بە ئێمە بڵێن، کە لە شوێنێکی حزبی ئەو بڕیارە دراوە. بەتایبەت جەمیل لەگەڵ من کەوتبووە ناتەبایی، چونکە من ئامادە نەبووم بەشداری کۆبوونەوەکانی کۆمیتەی شار بکەم. ئەوەبوو لە رۆژی هەڵبژاردنەکە هەموومان لەگەڵ ئەندامە هەڵبژاردراوەکانی کۆنفراس ئامادە بووین. جەمیل بەپێی رێنمایی لقی پارتی لە هەولێر، گەرەکی بوو بۆ دیاریکردنی نوێنەرەکانی قوتابییەکانی هەولێر بۆ کۆنگرەی یەکێتیی نیشتیمانی قوتابیانی عێراق، ئێمە پەراوێز بکات و هەروا بۆخۆی، بەپێی ویستی مەسئولەکانی لقی پارتی، لیستێکی ئامادەکراوی پێشینەی پێشنیازکرد، کە بەبێ هەڵبژاردن لە کۆنفرانس دەنگی لەسەر بدرێ، کە ناوی بەندە و موحسین حەمەدەمینی تێدا نەبوو. ئێمە ئەوەندەمان بەلاوە گرنگ نەبوو، بەڵام لێرەدا شاسوار جەلال و فازل مەلا مەحمود بەریان لە هەنگاوەکە گرت. لەو دوو رۆژەی کۆنفرانسەکەدا، خوێندنەوەی راپۆرتی نوێنەران و دەرکەوتنی چالاکییەکانی ئێمە، تا رادەیەک باش شارەزابوون. لە پێشەوە ئەو پێشنیازەی جەمیل رەنجبەر و پێشنیازی ئەوەی ئایا لەناو نوێنەران بە هەڵبژاردن نوێنەر دیاری بکرێت، خرایە دەنگدان، پاش هەندێ ناڕەزایی لەلایەن جەمیل و چەند کەسێکی دیکەوە، دەنگدان بە ئاشکرا کرا و ئەوان دۆڕاندیان و بێجگە لە جەمیل و هیوا سەرهەنگ و هۆشیار عەزیز، دەنگێکی دیکەیان نەهێنا. زۆربەی زۆری نوێنەران دەنگیان بەو پێشنیازە دا، کە بە هەڵبژاردن نوێنەرەکان دیاری بکرێن. بۆ یەکەمجاربوو لە هەولێر چەند قوتابییەکی کچ، کە ناوی ئەوانەی بیرم ماوە، خوناو تەها و کچە برایەکی تەها فەقێ یوسف بوون، لەپاڵ بەندە و موحسین حەمەدەمین و هۆشیار فەتاح، وەک پێنج

نوێنەری ناو شاری هەولێر. ئیتر ئەو هەڵوێستەی شاسوار جەلال بووە مایەی ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٩ـەوە، پێوەندییەکی هاوڕێیانەمان لە نێوان هەڵبقوڵێ و ڕۆژبەدوا زۆرتر و گەرمتر بەرەو پێشەوە چوو.

# ١٢

لەگەڵ لێدانەوە و بەبیرخۆهێنانەوەی سەرجەلەی فیلمی بەسەرهاتی ژیان و یادەوەرییەکانم، بیر لەوێ ڕۆژگار دەکەمەوە و دەزانم بە هۆی سادە و ساکاری گوزەران و بە ژمارە کەمی خەڵک، بەبەراورد لەگەڵ ئیستادا، ئینسانەکان گەورە و بچووک، ژن و پیاو بەرچاوڕوون و بە چاوڕوو و بێفرۆفێڵ تر بوون. ئێمە، کوڕگەل لە قوتابخانە و کوچە و کۆلانان، هەمیشە دۆست و هاوڕێی گیانی بەگیانی یەکتری بووین. ڕاستە کاروکاسبی زۆر کەم و دیاریکراو بوو و هەژاری و نەبوونی باڵی بەسەر زۆربەی دانیشتوانی شاردا کێشابوو، بەلام لەگەڵ ئەوەیشدا پێوەندیی خەڵک بەیەکترییەوە، لە بەرچاوتێری و چاوبەیەکتری هەڵهاتن و یارمەتی یەکترییەوە دەچۆڕایەوە. هەتا ئەودەمە لەناو ڕیزەکانی ڕێکخستنی حیزبیدا بە شێوەیەکی فەرمی و بەرچاو پرینسیپ و گوێگرتن لە خەڵک و بەدواداچوونی خواستەکانیان هەبوو. بە جۆرێک هەستکردن بە خۆشەویستیی وڵات و کورد بەشێوەیەکی خۆڕسک لەناو کۆمەلانی هەرەمەکی خەڵک هەستی پێ دەکرا، کە لەگەڵ ئارەزووی هێزە نەیارەکان بە خەڵکی کورد یەکنەدەهاتەوە.

لەبیرمە لەوێ ڕۆژاندا کە من لە قۆناغی ناوەندی خوێندن بووم، چەتە و نۆکەرە خائینەکانی سەر بە ڕژێم، بە چاوپەنای چەندان دەستە و تاقمی دزی و جەردەیی، ناوشاری هەولێریان کردبووە مەیدانی جلیتجلیتانێی گزی و فزی و ڕووتکردنەوەی خەڵکی ئاسایی. شەوانە وەک مێردەزمەی تاریکایی، هەر شەوەی بەتایبەت لە گەرەکەکانی دەوروبەری شاردا، دەیانکوتایە سەر ماڵی هاوڵاتییەک و قوڕبەسەریان دەکرد. هەرچییەکیان لەدەست بهاتە درێخییان پێ نەدەکرد. بە شێوەیەک ژیانیان لەو خەڵکە تالوقێزەون کردبوو. کەس هەتا بەیانی بەتەمای ژیانی خۆی نەبوو. ئێمەی مێردمنداڵ هەر دەبوو گوێ بۆ بەسەرهاتی شەوی پێشوو بگرین؛ فلانە ماڵ براوە و فیسکە کوژراوە. دیارە ئەو مەرگەساتە لە ڕێگای دەسیسەی دوژمنانی کورد و بۆرەپیاوە خۆفرۆشە خۆماڵییە جەردەکانەوە، جێبەجێ دەبوو. خەڵکیان بە چاک و خراپەوە خەریکی یەکتری

کردبوو. تاکو کەس نەپرژێتە سەر هەستونەستی هاولاتیبوون، ولاتپارێزی و خۆشەویستی یەکتری. لەپاڵ ئەوانەیشدا، هێزەکانی حکومەت لەوان ڕۆژاندا هەرچییەکیان لەدەست بهاتایە بۆ چەوساندنەوەی کۆمەلانی خەلکی ستەمدیدە نەدەگەڕانەوە.

لەبیرمە بەمەبەستی هەمەچەشنە و ئازاردانی خەلک لە گوند و ناو شاردا، هەر گوندییەک لە هەر لایەک هاتوچۆی شاری بکردایە، بە چەندان جۆر سووکایەتییان پێ دەکردن. هەر بۆ نموونە بە رووی بێزارکردن و وەڕسکردنی خەلکی ئەو گوندانەی بناری چیای سەفین و دەوروبەر، کە رۆژانە بەکەر و ولاخ میوە و سەوزەیان بۆ شار دەهێنا، بەوپەڕی بێئابڕووییەوە کەر و ولاخەکانیان لێزیندانی دەکردن و خاوەنەکانیشیان ناچار دەکرد رۆژانە ئالیک بۆ ئەو ولاخە گیراوانە بەرن. بە جۆرێک بەردەم قشلەی هەولێر وەک تەویلەی کەر و هێسترە گیراوەکانی لێ هاتبوو. هەر گوندیی بوو جورکێکی ئالیکی بەدەستەوە بوو و بەدوای ولاخەکەی خۆیدا دەگەڕا.

# ١٣

قۆناغی خوێندنی ئامادەیی بۆ من چەشنێک لە تێکەلەی کارکردنی شەوانە لە فرنی سەموون و دوای دەوامی قوتابخانەیش چوونە دووکانە شڕۆلەکەی باوکم بوو. ئەوجا سەرقالبوونم بە کاروباری ڕێکخراوەیی قوتابیان لە ئامادەیی هەولێر، ناوەندی برایەتی و ئامادەیی ئازادی کە تازە کرابووەوە، لە پالیشیانەوە لە کارکردنی ڕێکخراوەیی حیزبی (پارتی) دریغیم نەدەکرد. بە جۆرێک چەندان کەڕەت لە پۆلی خوێندن لە ماندوویتییان سەرم دەخستە سەر رحلەکەم، یەکسەر خەوم لێ دەکەوت و مامۆستا بەخەبەری دەهێنام.

دیارە هەر من بەتەنیا ئاوا هیلاک و بێحەوسەلە نەبووم، قوتابی دیکەی وەک خۆم هەژار و عەمەلمەندەتر هەبوون. لە پۆلی پێنجەمی وێژەیی بووم، مامۆستای بەشەخسیەت و بەساموهەیبەت، جەلال شەریف، یادی بەخێر، ئەو رۆژە لە وانەی مێژوودا، تاقیکردنەوەی مانگانەی کردین. لەبیرمە دەبوو وەلامی پرسیارەکان لە دەفتەر بنووسینەوە. قوتابییەکی تەنیشتم دیاربوو لە چەند پارچە کاغەزێکی درێژوکانی قۆپیەی نووسیبووەوە، دروست یەکێک لەو پارچە کاغەزانە وەلامی ئەو دوو پرسیارە بوو کە مامۆستا هێنابوویەوە، کە من هیچ یەکێک لە پرسیارەکانم نەدەزانی. بەدوای تەواوبوونی ئەو

قوتابییە، منیش ئەو پارچە کاغەزەم لێ وەرگرت و وەڵامەکانم لەسەر نووسییەوە، بەڵام ڕاست پارچە کاغەزە قۆپییەکەم لەناو دەفتەرەکە تەسلیم بە مامۆستا کرد..!

پاش دوو ڕۆژان مامۆستا جەلال شەریف بانگی هۆدەی بەڕێوەبەری ئامادەیی کردم، بەدوای چوونە ژوورەوە و ڕۆژباشکردنم، وەک ئەوەی بەڕێوەبەر لێم بەبیانوبێت، بەیەک دەسرازە لۆمەکردنی وەک.. ئەدی ئۆغلم مەسئولی حیزب و قوتابیانە، وەک بەرزەکی بانان لەبری عیلم و مەعریفە فێری قۆپییە بووە، بەبێ ئەوەی شەرم لە خۆی بکات! چەند گەورەیە..! لێرەدا مامۆستا جەلال شەریف هاتە قسەکردن و گوتی، مامۆستا لێگەری با لەپێش چاوی تۆ دەستخەتی تاقی بکەینەوە، چونکە ئەوەی من سەرنجمداوە، نووسینی قۆپییەکە و نووسینی وەڵامی پرسیارەکان لەناو دەفتەرەکە، دوو دەستخەتی جیاوازن و ئەگەر ئەوە قۆپییەچی بوایە وا کاغەزی قۆپییەکەی لەناو دەفتەری تاقیکردنەوە بە جێ نەدەهێشت! دووبارە دەستخەتەکەمیان بەراوردکردەوە و نووسینەکان لە یەکتری نەدەچوون. چەندیان کرد نەمدرکاند قۆپییەکەم لەکێ وەرگرتوە. دیسانەوە مامۆستا جەلال شەریف لە بەردەمی بەڕێوەبەر کەوتەوە فریام و گوتی. ئەوە قوتابییەکی قۆپییەچی نییە و مادام وانەی خۆمە، من دەیبورم و پێی گوتم، دووبەیانی جارێکی دیکە ئەو تاقیکردنەوەت بۆ دوبارە دەکەمەوە. ئەوەبوو فێرکردن و هاوکاری مامۆستا جەلال شەریف لە ژیانی داهاتوومدا سەرمەشقێکی نوێی بەگوێمدا چرپاند و زۆر سودم لێ وەرگرت.

لەو تەمەنەدا تابلێی سەرچڵ و گەرمەتەریق بووم، بۆ نموونە ڕۆژێکیان لە پۆل و لەوانەی مامۆستای هێژا (فاروق ب. خلیفە) دا، قوتابییەک بەناوی نیازی بۆ ئەو ڕۆژە لەلای من کوفری کرد و بەزمانی تورکمانی لەگەڵ مامۆستا قسانی کرد، هەر لەوگوڕەی لێی هەستامەوە و هەتا زللەبوو، لەبناگوێم قایم کرد. مامۆستا و قوتابییەکە واقیان وڕماو دەمیان بوو بە تەڵەی نەتەقیو. بەڵام لەگەڵ تێپەڕینی زەمەن و سەرەتای ساڵانی خوێندنی زانکۆ لە بەغداد (سڵاو لەگیانی نیازی) لەداوای لێبووردنی خۆم و لێبووردەیی ئەو، زۆر لە نزیکەوە ببووینە دوو برادەری گیانی بەگیانی و لە ڕۆژانی پێشمەرگایەتی من لەساڵی ١٩٨٠ دا کە دەرمانخانەی پزیشکی هەبوو، چەندان جار بە چەردە داوودەرمان لەو شاخە بەسەری دەکردمەوە. هەروەها هەر لەو تەمەندا، زیاتر لە گوێڕایەڵی و پرسکردن بە دایکوباوکم سەرەڕۆتر ببووم و یەکەم سەفەرم بەتەنیا بۆ شاری کەرکووک بوو، بە هۆی سەیرکردنی یاری تۆپانێی نێوان هەڵبژاردەی هەولێر _ کەرکووک، کە بۆ شەویش لە هوتێل مامەوە لە نزیک ئەو پردەی سەرچەمی خاسە کە ئەودەم بە ناوەڕاستی کەرکووکدا شۆڕدەبوەوە.

# ١٤

پاییزی ساڵی١٩٧٠ بوو، كه له كۆلیجی ئادابی زانكۆی بەغداد/ بەشی كوردی وەرگیرام و بەرەو بەغداد بەرێكەوتم. دیارە ئەودەم چوونی گەنجێكی رووتەڵە و هەژاری وەک بەندە بۆ پایتەختی عیراقی، وەرچەرخانێكی نوێ بوو. چوومە ناو ژیانی پڕ زاقوزریقی زانكۆ. هەر لێرەوەیش بۆ یەكەم كەرەت بوو، له پۆلی خوێندن لەگەڵ كۆمەڵێک خوێندكار به كچ و كوڕەوە بە تێكەڵاوی كۆببینەوە. ئەو ساڵە، ساڵی جەژنی سەركەوتنی كورد بوو، كوردبوون له لایەن بەشێكی زۆری خەڵكی بەغداد مایەی ریزگرتن، دەربرینی هەست و نەستی خۆشەویستی بوو.

بەكورتی كەوتبوومە بەر نۆرمێكی نوێی گوزەرانی ناو كەشوهەوایەكی دیكەوە، كه دەبوو بە تەنیا لە شاری بەغداد بە خۆم رابگەم، بەتایبەت له رووی گوزەرانی ژیان و شوێنی حەوانەوەم، بۆ بەندەیەكی رۆڵەی خێزانێكی هەژاری دەستكورت و كەمدەرامەت، كارێكی ئاسان نەبوو. راستە ماڵەوەمان پاڵپشتێكی گەورەبوون بۆ دەستگرتنم لەخوێندنی زانكۆ. لووتكەی ئەو پشتیوانی و هاندانەم، خۆی لەوەدا دیتەوە، كە بۆ خاتری مەیسەربوون، كارئاسانی بۆ من كە بتوانم بچمە بەغداد، خێزانەكەمان بەناچاری لەدوای نزیكەی چواردە ساڵان گەڕانەوە ناو ژیانی گوندی. له كەناری ماڵە مامەكەم له گوندی شێخانانی نزیک شارۆچكەی پردێ، دایكم و خوشک و براكانم لە خانووێكی بچكۆڵە حەوانەوە، خانووەكەی شارمان بە كرێ دا، كەموزۆر بەشێكی بژێوی ژیانی خوێندنی منی پێ دابین ببوو، كە هەموو كرێی خانووەكەمان، ئەو كاتە شەش دینار بوو، باوكیشم له مەلەوانگەی ئیدارە محەلی هەولێر، ببووە باخچەچی و هەر لەوێش، لە پاش رۆژانی ئاسایی كاركردن لە ژوورێكی گچكەلانە دەخەوت.

ئەوان رۆژان بۆ من سەرەتای كاروانی ژیانێكی هێجگار پڕ خۆشی و ناخۆشی بوون، لەلایەک بە ژیانی زانكۆ و بەغدادی پایتەخت ئاشنا و تێكەڵ ببووم و هاتبوومە ناو خەڵكانێكی جیاوەزەوە، لەلایەكی دیكەوە بە پێچەوانەی رۆڵەی خێزانی خوداپێداو و زەنگین، دەبوو بە كولەمەرگی بژیم، بەو ژیانە رابگەم. بەتایبەت ئەو پارەیەی له ماڵەوە بۆم دابین ببوو، تێری ئەوەی نەدەكرد لەگەڵچەند قوتابییەک ژوورێک بەكرێ بگرم، بەڵكو ئەو دەمە كوڕە پورێكم له بەغداد لەگەرەكی الفضل دەژیا، خاوەن ماڵ و منداڵ بوو، فڕنی (مەریس) ی هەبوو، كە چەشنە نانێكی بە پەنیرو روون بوو. لەگەڵ ئەو رێكەوتم بۆ

شەوانە لەدوای سەعات یەک و دووی شەوەوە، بچم کاری لەگەڵ بکەم و لە لای خۆیان لە جیاتی کارکردنەکەم، ھۆدەیەکی لاچەپیان دابومێ بۆ حەوانەوە و خەوتن.

یادی بەخێر مەجیدی کوڕە پلکم زۆر بەکەڵکم ھات، ژوورێکی چۆڵوھۆڵیان لە قەبەر کردم، شەوانە و بەدرێژایی ھەموو ھەفتەیەک، بێجگە لە شەوانی ڕۆژی ھەینی، لە شیرین خەو بەخەبەری دەھێنام، دەچووم لە فڕنییەکە کارم لەگەڵ دەکرد، بەتایبەت ئەنگوتککێشان کاری سەرەکی من بوو. لە بیرمە ئەو دەمە لە ژوورەکەم یەک پارچە حەسیرم ھەبوو، لەسەری پاڵدەکەوتم و لەگەڵ لباد و جاجم و بالیفێک، کە لە ماڵەوە لەگەڵ خۆم بردبووم. ھەتاکو نیوەی ساڵ بەو کولەمەرگییە ژیام، کە تەنیا یەک پانتۆڵ و یەک دوو کراسی نیوقۆلم ھەبوو، ئێواران بەر لە خەوتن لەناو ئاوی سارد دەمشوشتن، لەژێر حەسیرەکە دەقم پێدەگرتن و بەیانییەکەی کە لەکار تەواو دەبووم، بۆ چوونە کۆلێج لەبەرم دەکردن، ئەودەم ھێشتا جلی یەککرتوی زانکۆ دانەھاتبوو. ھەروەھا یەک جووتە پێڵاوی شڕەم ھەبوو. بۆ کارکردنی شەوانە ھەر شەلواری کوردیم لەبەر دەکرد. بە جۆرێک ھەتا گەیشتمە نیوەی ساڵ، لە بەشی ناوخۆ وەرگیرام، باری ئەو ژیانە پڕ زەحمەتییەم سووکتر بوو.

لێرەدا نابێ ئەوە لە بیر بکەم، کە قادر مەولوود قوتابی ھەمان بەشی کوردی بوو، دوو پۆل لەسەرەوەی من بوو، خەڵکی ھەمان گەڕەکی سەعدوناوە بوو لە ھەولێر، لە سکرتارییەتی یەکێتی قوتابیانی کوردستان کارمەندی ژمێریاری بوو بە ئێواران، ھەستی بە دەسکورتی و ھەژاری من کردبوو، بۆ ئەو چەند مانگەی ساڵی یەکەم جوامێرانە لە شانی چەندان قوتابی دیکە، مانگانە یارمەتییەکی سێ دیناری بۆ دابین کردبووم، لەلای خۆیەوە وەک ئەندامی یەکێتی قوتابیانی خۆیان ناونووسی کردبووم، چەند برادەرێکی ئەڵقە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە (کۆمەڵەی مارکسی - لینینی کوردستان) پێی ئاگادار بوون کە ماوەیەکی کورت بوو، لەلایەن نەریمان محمود خانەقینی ڕێکخرابووم، دواتر لەلایەن شاسوار جەلالەوە، کۆبوونەوەم لەگەڵ دەکرا و ھەر لە ڕێگای ئەو ھاوڕێیەشەوە ھەوڵی زۆرم بۆ درا، کە کارێکم بۆ ببنرێتەوە، بەلام مەیسەر نەبوو.

لەبیرم ناچێتەوە، ھەموو سەرەمانگان شاسوار لەگەڵ برای ھێژا عەزیز مەحمود بۆ خۆشترین لۆقلتنەی بەغداد لەگەڕەکی (ابونواس و المسبح) دەعوەتی دەکردین کە ھەندێ جاران یاسین ئەنوەر کەرکووکیشی تێدەکەوت. ھەر لە ڕێگای برایان عەزیز مەحمود و یاسین ئەنوەر کەرکووکی و ئەرسەلان بایزەوە بە ناسیاری حەمەقەرەداخی و نەجمەدین عەزیز ناسیار بووم. لە ڕێگای ئەوانەوە فێری خواردنەوە بووم، بەلام ھەندێجاران حەمە قەرەداخی پارەی خواردنەوە و نانخواردنی ئێوارەکانی وێر دەکرد، چونکە بە ھۆی

مامێکییەوە لە هەمووان خۆشگوزەرانتر بوو. ئەودەمە زۆریش  چاوتێر بوو. لە پاڵ ئەم هاوڕێیانەی خەباتی سیاسی و هاوبیریدا، بەندە لە کولییەیش، کۆمەڵێ برادەر و دۆستی خۆشەویستم هەبوو، کە لە پێشیانەوە، سەباح عەبدولا کۆیی، شێرکۆ فەتحولا، رزگار عبدولرەزاق، وریا خدر، بەهزاد ئیسماعیل. هاشم حوسین، نەوزاد رەفعەت، محەمەد غەریب، عومەر رواندزی، عرفان کەرکووکی و زۆری تر، کە ناوەکانیانم لەبیر نەماوە. دواتر هەندێک لەو برادەرانە لە ئەڵقە رۆشنبیرییەکانی کۆمەڵە رێکخران.

# ١٥

لە ساڵی دووەمی خوێندن لە کۆلیجی ئاداب/ بەشی کوردیی زانکۆی بەغداد، لەگەڵ هاوڕێی هاوشاریم سەباح عەبدولا بەیەکەوە ژوورێکی بەشی ناوخۆمان لە گەڕەکی وەزیریە بەرکەوت. هۆدەکەمان لەگەڵ دوو قوتابی موسلاوی، کە هەردووکیان برا بوون، لەناو یەکتری بوون. لە کەشوهەوای سیاسەت دووربوون، بەلام ژوورەکەی ئێمە لە بنەبانی بوو، هەر دەبوو ئێمە بەسەر ئەوانەوە هاتوچۆ بکەین. هەرچەندە هەردووکیان مرۆڤی بەحەوسەڵە و ڕووخۆش بوون. بەلام هەرکاتێک دەیانزانی ئێمە لەدوای گەڕانەوەمان بۆ بەغداد، لە ماڵەوە کولیچە و مێوژ و شەوچەرەمان هەیە، هەتا ئەوەی ئێمە بنی دەهێنرا،  تا درەنگانی شەو دەبوونە هاوبەشمان و لەگەڵ تەواوبوونی شتەکانمان، بەدەگمەن سەریان بە ژوورەکەمان دادەگرت! زۆر جاران هەستمان دەکرد لەژێر بەتانییەکانیان شتە تایبەتییەکانی خۆیان دەخۆن، بەشی ئێمەیان نەدەدا. زەمان هات و رۆیی و لەساڵی ١٩٨٨ کە بەندە بەناچاری ئاوارەی وڵاتی تورکیا ببووم، هەردوو برام لەو ئوتێلەی شاری قۆنیا دیتەوە، زۆریان پێ خۆش بوو، لەگەڵ ئێمە، من و هاوڕێیەکم بەناوی محەمەد سابیر، لە ژوورێک دابمەزرێین، بە هەمان ربەی بەشی ناوخۆی گۆرین لەسەر گیرفانی ئێمە بلەوەڕێن. پێم گوتن، ئەو بوارە بەلام ئەو هەوار نییە!

بەراستی ئەو ساڵەی بەشی ناوخۆی وەزیرییە، یەکێک لەساڵە هەرە خۆشەکانی ژیانی خوێندنم بوو لە بەغداد. لە لایەک ئەو خانووەی بەشی ناوخۆ کەوتبووە یەکێک لەگەڕەکە هەرە خۆشەکانی ئەوسای بەغداد و ئەو قوتابییە کوردانەی لەو خانووە کۆببوونەوە، لە چەندان کۆلێجی جیاجیاوە هاتبوون و پێوەندیی برادەرایەتی گەرموگوڕمان لە نێوان دروست ببوو. لە وانە ئیحسان ولاشی، کە قوتابی کۆلیجی یاسا بوو، مەدحەت کەرکوکی

لەبەشی جوگرافیا، لەتیف مەحەمەد و عەلی کە ئەوانیش خەڵکی کەرکووک بوون لە بەشی زمانی ئینگلیزی بوون، لەگەڵ عزەدین رەزا و حەیدەر کەریم[22] و چەندانی دیکە کە ناوەکانیانم لەبیر نەماوە.

دوای چەند مانگێک لەتەک ئەو خانووەوە، خانووێکی دیکەشیان کردە بەشی ناوخۆ، چەندان قوتابی دیکەی کوردی وەک وریا خدر، بەهزاد، عرفان مەردان کەرکوکی، محەمەد غەریب جێگەیان گرت. لەوێ قوتابییە عەرەبەکان زۆربەیان بەعسی بوون و جاروبار ئەوانیش دەهاتنە بەشەکەی ئێمە، بۆ خۆگیفکردنەوە. جارێکیان یەکێکیان بەناوی سلیمان عەنتەر، کە دەتگوت دارتێلە، خۆی بە مەسئول دەزانی، زۆری بۆ قوتابی لەتیف محەمەد هێنابوو، کە لەگەڵ سەباح لە یەک پۆل بوون لە بەشی زمانی ئینگلیزی. لەتیف پێش ماوەک لەگەڵ بەندە تێکچووبوو. دیتم بەگریان هاتە ژوورەکەمان و بۆ سەباحی دەگێڕایەوە کە عەنتەر شەڕی پێ فرۆشتووە و دەستی بەروومەتی داهێناوە. ئەوەبوو لەگەڵ سەباح دڵمان دایەوە و من زۆر بەگەرمی لە باوەشم گرت، گوتم تا سبەی ئێوارە لەسەرم بوەستە، بزانە چی بەسەر دەهێنین.

شەوەکەی "لەتیف"مان لە ژوورەکەی خۆمان گلدایەوە، بەیانی لەگەڵ ئەو هاوڕێیانە لەو بارەیەوە قسەمان کرد، کە هەموویان ئەندامی یەکێتی قوتابیانی کوردستان بوون، هەواداری ئەڵقە رۆشنبیرییە سەرەتاییەکانی کۆمەڵەیش بوون، بەبێ ئەوەی بوار بدەین ئەو غەدرە بە ئاسانی تێبپەڕێت، لەناو خۆمان تەگبیرمان کرد و ئەو شەوەیش لە زانکۆی المستنصریە ئاهەنگێکی گەورە هەبوو. لەپاش کاتژمێر دوازدەی شەو من و لەتیف لەبەشی ناوخۆ چاوەڕوانی برایان شێرکۆ فەتحوڵلا، رزگار عەبدلرەزاق، وریا خدر، بەهزاد ئیسماعیل، محەمەدغریب و عرفان مردان/مان دەکرد. ئەوانیش لە ئاهەنگەکە خۆیان مەست کردبوو و لە کاتی خۆی گەیشتنە لامان. وەک بریار بوو هەموویان بەیەکەوە چوونە سەربانی سەرەوەی خانووەکە، من و لەتیفیش بەیەکەوە چووینە ئەو ژوورەی عەنتەرە فەندی لێبوو، دیار بوو بەو شەوە لەناو بەشی ناوخۆ عارەقی دەخواردەوە، کە بۆ قوتابیان یاساغ بوو. بە هەر شێوەیەک بوو لە پێشەوە لەتیف بانگی دەرەوەی کرد، بەناوی ئەوەی کاری تایبەتی پێی هەیە، ئەویش ئەوەندە لە خۆی بایی بوو، دەستی لەتیفی گرتبوو و هاتە دەرەوە، منیش بەدوایانەوە بووم، بەبێ ئەوەی هەست بەبوونی من بکات، وەک چۆن پلانمان دانابوو، هەتا سەربان لەگەڵ لەتیف سەرکەوت. هەرکە چاوی بەو برادەرانە کەوت،

---

[22] حەیدەر پێشمەرگەی حیزبی شیوعی بوو، ساڵی ١٩٨١ لە ناوچەی بەستی شەرغەی رۆژئاوای کۆیە شەهید بوو.

ملهورانه دەنگی هەڵبڕی و گوتی: "شنو کاکەوات عندهم دبکە کردیە!" هێشتا نەگەیشتبووە ناوەراستی برادەران، یادی بەخێر مەحەمەد غەریب، کە هەروەک سلێمان عنتر کەتە و بالا بەرز بوو، هەتا شەقەزلەگرتی سرەواندییە لاڕوومەتی و شریقەی هات، دەتوانم بڵێم هەر وەک چێڵ بۆڕاندی، کەوتە جوێندان بەکورد و سەرکردەکانی، ئیتر هەموومان ئەوەمان بەس بوو، هەر یەکەمان یەک یەک کەوتینە کوتانی، بە جۆرێک ئەو دیزداشەی لەبەری بوو، بە شاپان، ونجرونجڕ ببوو. ئەو زەلامە زلە بەدوای ئەو هەموو لووتبەرزییەی، کەوتە پاڕانەوە و هۆڕهۆڕ دەگریا! تاکو چاودێری بەشی ناوخۆ و چەند قوتابییەک فریای کەوتن، لەبەر دەستمانیان دەرهێنا، لە بەرچاوی چاودێرەکە گوتمان. جارێکی تر لەو شوێنە عارەق بخۆیتەوە و شەڕ بە هەر کوردێک بفرۆشی، لەوە خراپترت لێ دەکەین. دیاربوو چاودێرەکەیش ئەو تەمبێ کردنەی زۆر پێ خۆش بوو. چونکە ئەویش لەپێش ئێمە پێی گوت، من چەندان جار ئاگادارم کردوویتەوە کە نابێ لە ژووری بەشی ناوخۆ مەشروب بخۆیتەوە! دەک نۆشی گیانت بێ و من بەیانی راپۆرتی خۆمت لەسەر دەنووسم، کە بە شایەدی ئەو قوتابییانە مەشروبت خواردووەتەوە، چیتر لێرە نابیت . لە راستیدا ئەو چاودێرە خۆی لە بیانوو بوو و زۆر رقی لە بەعسییەکان بوو و لەگەڵ قوتابییە کوردەکان زۆر میهرەبان بوو. ئیتر بۆ بەیانی سلیمان عنترمان لە بەشەکەمان نەدیتەوە، هەر کاتێکیش لە کۆلێج چاوی بە هەر یەکێکمان دەکەوت، وەک ئەوەی نەبای دیتبێ و نەباران، سلاوێکی گەرمی لێمان دەکرد.

# ١٦

هەر لە ساڵی دووەمی خوێندنی زانکۆدا، بەشێکی هاوڕێیانی کۆمەڵە، بە شێوەیەکی نیوەناچل، خاووخلیچ خوومان دابووە خوێندنەوە، بەدواداچوونی بیروباوەڕی ماوتسی تۆنگ، کە ئەودەمی زۆر بلاوی بیری شۆڕشگێڕی رۆژگار بوو. بالوێزخانەکانی ولاتانی چین و کوریا و ئەلبانیا زۆر بەهەرمێن بوون، بۆ هاتووچۆی قوتابیانی هەڵگری ئەو بیروباوەڕە. بەتایبەت بۆ ئێمەی قوتابیانی بەلەنگاز و دەستکورت لە رووی گوزەرانەوە.

چونە ئەوسەفارەتانە وەک رێچکەی مێرولان بوو. هەفتە نەبوو سەر بەیەکێک لەو سەفارەتانەدا نەکەین، لەو کتێب و نامیلکانەی لە ژووری پێشوازی دایاننابوو، سەرو چەپکێکی لەگەڵ خۆمان نەهێنینەوە، چونکە هەموویان بەخۆرایی پێشکەش دەکردین، وامان

لێ هاتبوو لەگەڵ کارمەندەکانیان ببووینە ئاشنا، هەندێ جار لەگەڵمان دادەنیشتن، بەڵام هاتووچوونەکەمان زۆر بە پەنادزە بوو، بەتایبەت بۆ سەفارەتی وڵاتی چین، کە ئەو دەم هەم نزیکی کۆشکی کۆماری بوو، هەمیش لە ژێر چاودێری پیاوەکانی رژێم بوو. کەچی ئێمەی قوتابی گوێمان بە هیچ نەدەدا، چوونە ئەو سەفارەتانەمان کردبووە رێچکەیەکی نەپسایەوە. دیارە خوێندنەوەی نووسینەکانی ماوتسی تۆنگ بە زمانی عارەبی لەچاو خوێندنەوەی سەرچاوەکانی مارکسیزم زۆر ئاسان و سادەتر بوو، چونکە هەم خودی ناوەرۆکی نووسینەکانی ماوتسی تۆنگ لەگەڵ کەشوهەوای کۆمەڵی جووتیاری کورد نزیک و گونجاو بوو، هەمیش وەرگێرانەکان زۆر ورد و سادەتر بوون.

لەگەڵ تەواوبوونی ئەو ساڵەی خوێندن، لە رێگای برای خۆشەویستم، سەباح عەبدوڵا، کە باوکی لە هەولێر کرێکاری رێگاوبان بوو، ئاگاداری ئەوە بووم کە لە هەولێر دەستکراوە بە لێدانی دوو رێگای نێوان هەولێر و مەخموور، هەولێر و کۆیە. ئەوەبوو هەر لەگەڵ سەباح بەیەکەوە چووینە وەزارەتی رێگاوبان، کە ئەو کاتە یادی بەخێر نوری شاویس وەزیری بوو. بەراستی یەکێک بوو لەو وەزیرە کوردانەی ناو حکومەتی عیراق، کە کاری زۆر گەورەی بۆ کوردستان کرد، لەگەڵ کۆمەڵانی خەڵک سادە و بە لوتف بوو، لە خۆی نەگۆڕابوو. بەبێ هیچ واسیتەیەک لە رێگای سکرتێرەکەیەوە، بە گەرمی پێشوازی لێمان کرد، هەتا چای و قاوەی بۆ بانگکردین. زانی ئێمە دوو قوتابی زانکۆین و دوو کوڕە هەژارین، دەمانەوێ پشووی هاوینە بۆ خۆمان کار بکەین. دوای بەخێرهێنانی گەرممان، یەکسەر بەدەستخەتی خۆی نووسراوێکی بۆ کردین، دایە دەست سکرتێرەکەی فەرمانی وەزاری لە لای خۆیەوە بۆ دەرکردین، کە بۆ ماوەی پشووی هاوین، هەردووکمانی بە ناونیشانی چاودێر لە بەڕێوەبەرایەتی رێگاوبانی هەولێر دامەزراند. پێی گوتین ئەو زۆر سەرفرازە بەوەی کە کارئاسانییەکی بۆمان کردووە. تاکو لە پشووی هاوینە دەستبەتاڵ دانەنیشین، ئەو کارە بۆ خۆمان بکەین، لە بواری کارکردنی رۆژانە، زۆرتر لە ژیان بگەین، خۆمان پێبگەیەنین لە پێناوی چاکتر خزمەتکردنی وڵات و نەتەوەکەمان. ئێمەش بە سوپاس و رێزەوە ماڵئاواییمان لێ کرد، بەوپەڕی دڵخۆشی گەڕاینەوە هەولێر. لەدوای یەک دوو رۆژ هەر لەگەڵ سەباح بە یەکەوە چووینە بەڕێوەبەرایەتی رێگاوبانی هەولێر، کە ئەوکات لە نێوان ناوەندی زازا و منارەی چۆلی بوو. لە پێشەوە ئەوەی سەباح/یان بەبێ هیچ بەربەستێک جێبەجێ کرد و فرمانی دەست بەکاربونیان دایەوە دەست. بەڵام ئەوەی من دەنگی نەبوو، ناچار بە خۆم یەک پێ چوومە ژووری بەڕێوەبەر و سەربارى ناڕازیبوونی فەراشی بەردەرگا، کە ئەوکاتە جەلال مەدحت خۆشناو بەڕێوەبەر بوو. دوای سڵاوکردن، مەسەلەکەی خۆم بۆ باس کرد، کە من قوتابی بەشی زمان و ئەدەبی کوردیم لە زانکۆی

بەغداد، لەگەڵ فلان کەس ئەمری وەزاریمان هێناوەتەوە بۆ کارکردن لە پشووی هاوینە، نازانم بۆ فرمانی دەستبەکاربوونی ئەوەی سەباح دەرچووە، ئەوەی من دەنگی نییە! لەگەڵ ئەوەی ئەمرە وەزارییەکەی هەردووکمان بەیەکەوە بووە. هەر ئەو رۆژەیش خەڵکێکی زۆر لە لایەن لیژنەیەکی حیزبی دیدەنی دەکران بۆ دەمەزراندن. جەلال خۆشناو سەرێکی هەڵبڕی و بە پێکەنینەوە گوتی، دەستی نووسینی چیت هەیە. منیش وەڵامم دایەوە و قسەکانی منی بەدڵ بوو. گوتی دانیشە. من دانیشتم و خۆی هەستا و دیاربوو چووە ئەو ژوورەی لیژنەکەی دامەزراندنی لێ دانیشتبوو، لەگەڵ یەکێک قسەی دەکرد، کە ناوەکەی منی ناسیبوو، بە جەلال خۆشناوی دەگوت، ئەوە کاتی خۆی جەلالی بووە و یەکێکی دیکە لە شوێنەکەی دادەمەزرێنین. گوێم لێ بوو، جەلال خۆشناو هەرچەندە ئەندازیار بوو، بەڵام شیعریشی دەنووسی، وەک پارێزەری من، بەو زاتە عەقڵ قوندەیەی گوت، کاکی خۆم من بەرێوەبەری ئەو دائیرەم و ناتوانم فرمانی وەزیرەکەم جێبەجێ نەکەم، کە ئەندام مەکتەبی سیاسی حیزبەکەی تۆیە، ئەو کارە لە دەسەڵاتی تۆدا نییە و نووسراوەکەی منی وەرگرتەوە، هاتەوە ژوورەکەی خۆی، کە هەر یەک دەرگایان لەنێوان بوو. ئەوجا رووی لە من کرد و گوتی، هەنووکە دەوام خەریکی تەواوبوونە، سبەینێ زوو وەرەوە لای خۆم، فرمانەکەت دەدەمە دەست، هەر بەخۆشم رەوانەی سەرکارت دەکەم لە رێگای کۆیە. بەڵام دەبێ بۆ گۆڤاری هەولێر هاوکاریمان بکەی. تومەز خۆی لە دەستەی نووسەران بوو. من گفتم پێدا و یەکەمجار پارچە پەخشانێکم لەسەر نەورۆز بۆ نووسین، لەو رێگایەشەوە بە خزمەت چیرۆکنووسی نەمر محەمەد مەولود مەم گەیشتم و دۆستایەتیمان پەیدا کرد.

یەکێتیی قوتابیانی کوردستان وەک رێکخراوێکی گورجوگۆڵی سەرەتای حەفتاکان، بۆ خۆی مێژوویێکی پڕ لە سەروەری لە دەواری خەباتی نەتەوەکەمان گرتووە، کە ئەو رۆژانە بەبیر خۆم دەهێنمەوە و دەکەومە تەتەڵەکردنی رووداوەکان، قوتابیانی ئەوێ رۆژان، گەنج و لاوی رۆژگارەکە بوون، خاوەن خەون و خۆزگەی خۆش بوون، بەڵام ئەو رۆژە دوور لە هەر جۆرە ئازادی بیرورا، هەر جۆرە کەشوهەوایەکی ناوکەندوی دیموکراتی ئێستاکە، بزێوترین و بگرە شۆڕشگێرترین توێژی ئەوان رۆژان بوون. رۆژانێک دەسەڵاتی بەعس دروێنەی گیانی خۆڕاگری و ئازادی کوردی دەکرد. بەشێکی زۆری قوتابیان ئەوی رۆژێ بە روتوڕەجاڵی بەرگی بەریان و بە گیرفانی بەتاڵ و خۆراکی هەرزانی زانکۆ و سەرجادەکان، وەک هێزێکی لەبننەهاتووی کۆڕی خەبات، لەپاڵ خوێندن و کۆششکردن بۆ بەدەستهێنانی زانست و مەعریفە و بڕوانامە، چاونەترسانە و بەبێ گوێدانە یاریکردن بە مەرگ و چارەنووسی خۆیان، رووبەرووی بەعس دەبوونەوە.

بەڵێ یەکیتیی قوتابیانی کوردستان لەوان رۆژاندا، بۆ چاکتر تەیاربوون و قۆشمەکردنی مەیدانی، بەرەو کۆنفرانسی حەوتەمی خۆی لە شاری سلێمانی هەنگاوی ناو و قوتابییە نوێنەرەکانی ئەو کۆنفرانسە، کە هەموویان بەوپەڕی ئازادی و گیانی دیموکراتی لە کۆبوونەوە و کۆنفرانسە ناوخۆییەکان هەڵبژێردرابوون، پۆل پۆل بەرەو سلێمانی بەڕێکەوتن. ئێمەیش لە نوێنەرانی بەغداد هەموو بەیەکەوە بە دوو کۆستەری گەورە لە بەرەبەیانێکی زوو بەڕێکەوتین. لەبیرمە دەمەدەمی پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ بوو گەیشتینە ناو دەروازەی کەرکووکی برینداری بەردەستی بەعس، بەبێ گوێدانە هەر مەترسییەک، هەموو قوتابییەکان بە یەک دەنگی یەکگرتوو، کە هەموو پەنجەرەی کۆستەرەکانمان خستبووە سەرپشت، بە دەنگێکی دلێرانە سروودی ئەی رەقیب و کوردستانیبوونی کەرکووکی خۆشەویستمان دەگوتەوە، کە بەیەکجار خەڵکی کوردی ستەمدیدەی سەرجادەکانی هێنابووە خرۆشان.

بۆ ئێوارە گەیشتینە شاری سلێمانی و هەرچەندە جێگاوڕێگامان بۆ دیاری کرابوو. بەلام لە پڕ عەزیز مەحمودمان لێ پەیدا بوو، کە بەزۆر بەندە و یاسین ئەنوەر و ئەرسەلان بایزی بردەوە ماڵە قەڵەندەرخانەکەی خۆی و دایکە کڵۆڵەکەی. ئەو دایکە قارەمانەی، کە دواتر لە ساڵی ١٩٧٦/١٩٧٥ ببووە گەنجینەی پاراستنی نهێنییەکانی (ئارام)ی نەمر. بۆ هەموومان دایکێکی لاچەکبەسەر و بەوەفا بوو، یەک بە یەکمانی لە باوەش دەگرت، هەمووانی خۆش دەویست.

کۆنگرەی قوتابیان چەند رۆژێکی تژی لە گفتوگۆی بە سوود و هەندێ دەمەتەقێی توندوتیژی بەخۆوە بینی، بەلام لە تێکڕای بینەوبەردەکانی خەڵکانی بە حەوسەڵەی وەک عادل موراد، حەمە قەراخی، ئازاد خەفاف، چیا عەباس، یاسین ئەنوەر و سالار عەزیز و گەلێکی دیکە، سیمبۆلی هێمنکەرەوە و سەرپەرشتیکاری پراکتیکی بوون لەپێناوی گەیشتنە ئەنجامی سەرکەوتوو. کە لەگەڵ هەڵبژاردنی ستافی نوێی سەرکردایەتی قوتابیان، کۆنگرە بە چەپلەڕێزان کۆتایی بە کارەکانی خۆی هێنا و لاپەڕەیەکی نوێی لە مێژوودا تۆمارکرد.

# ١٧

لە ساڵی ١٩٧١ دا، هەرچەند بەعس بۆ مەبەستی تایبەتی عەقڵی نەخۆشی خۆیان، سوودی زۆریان لێ وەرگرت. بە هەنگاوێک نەوتی عیراق خۆماڵی کرا. بۆ رۆژی دوایی

سەرجەم توێژەکانی کۆمەڵانی خەڵک، بەتایبەت لە بەغدادی پایتەختدا ڕژانە سەر شەقامەکان و ئاهەنگ و شایی و لۆغان، هەموو کونج و کەلەبەرێکی گرتەوە. لە بەغداد ڕێپێوانێکی جەماوەریی گەورە ڕێکخرا، کە لە گۆرەپانی (المیدان) دەستی پێکرد و لە گۆڕەپانی (التحریر) کۆتایی دەهات. خەڵکەکە بەدەوری ئەو شوێنە کۆ ببوونەوە. لەبیرمە ئێمەی قوتابیانی کورد لە زانکۆی بەغداد و المستنصریە، لەژێر دروشمە نووسراوەکانی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان بەریز لەو ڕێپێوانەدا ڕێمان دەکرد. دروشمە نووسراوەکان زۆرتر هەر پیرۆزبایی ئەو هەنگاوە و بەشان و شەوکەت هەڵدانی برایەتی کورد و عارەبانەوە بوو!!

لەناو ئەو حەشامەتەدا چەند قوتابییەکی گورجوگۆڵی وەک یاسین ئەنوەر کەرکوکی، عەزیز مەحمود و عومەری ڕەواندزی، کەوتنە دەستپێشکەرییەکی بوێرانەی داهێنانی پەچەکردارێکی هوتافە بێتامەکانی ئەو ڕۆژەی قوتابییە بەعسی و عارەبەکان، کە لەلایەن خۆیانەوە وەک گەڕەلاوژێ، کەوتبوونە گوتنەوەی دروشمی شۆڤێنییانەی خۆیان (نفط العرب للعرب) و شتی دیکەیش. ئەوە بوو یەکەمجار یاسین و عەزیز لە پێش هەموو کەسێکەوە چوونە سەرشانی چەند قوتابییەکی دیکە، بەم دروشمە دەنگیان هەڵبڕی.. (تمر العرب للعرب، نفط العراق للعراق).

ئێمەی قوتابیانی کورد، هەرچەند لەچاو ئەو خەڵکەی دیکە، بە ژمارە لەگەڵ زۆرینەی عارەبەکان بەراورد نەدەکراین، سەرەتا هەر بە خۆمان و بۆ خۆمان، ئەو درۆشمەی خۆمان دەگوتەوە، هەتا هەندێ قوتابی ترسنۆک زوو هەستیان بە مەترسی ئەو هوتافە کرد و بلەز ڕیزەکانی ئێمەیان چۆڵ کرد، بەڵام بەدەم ڕۆیشتن و گوتنەوەی ئەو هوتافە، تا دەهات دەوروبەرمان قەرەباڵغ تر دەبوو. دیارە هەندێک لەو خەڵکانەی لە ئێمە گرد ببوونەوە، هاوسۆزی ڕووی دروستی هوتافەکە بوون و لەگەڵ ئێمەدا دەیانگوتەوە. هەندێکی دیکەیش لە بۆرە پیاوەکانی ڕژێم بوون و بۆ کۆنترۆڵکردنمان لە کات و شوێنی پێویست، بەدەورمانەوە بوون. تاکو نزیک گۆرەپانی (السنک)، ڕیزەکەی ئێمەی قوتابیانی کورد ئەوەندە گەورە ببوو، خۆشمان واقمان وڕمابوو، ئەو هەموو خەڵکە لە ئێمە کۆببووتەوە! بەڵام لەو شوێنەدا، هەستمان کرد لە هەموو لایەکەوە سەرباز و سیخوری چەکدار بەدەوروبەرمانەوە زۆر بوونە، ئێمەی قوتابیان سەیرمان کرد، هەر ئەو چەند هاوڕێیە ماوین کە ئەوەندەمان هاوار کردبوو، دەنگمان نووسابوو و خۆمان بەتەنیا دیتەوە. لەو ئانوساتەدا، پیاوەکانی ڕژێم چیتر حەوسەڵەی بیستنی ئەو هوتافەیان نەمابوو، بەتایبەت زۆری نەمابوو، ئەو ڕیزە بگاتە بەردەم مێزگردی، وتاردانی سەرۆک کۆمار. لە چاوتروکانێکدا، پیاوەکانی ڕژێم لە هەموو لایەکەوە شاڵاویان بۆ ئەو ڕیزە هێنا، کە ئەو

هوتافەی دەچڕی. بەدار و خوترمە کەوتنە ویژەی بەشداربووەکانەوە، کە لەناویدا ئەو قوتابییە کوردە تاک و تەرایانە مابووینەوە، بە پەنادزە خۆمان لە پەلاماردان دەرباز کرد. کە یاسین لەپشتەوە قۆڵی منی گرت و لە ریزەکە دەریهێنام، بەرنەکەوتم و لەگرتن و سەروپۆتەلاک کوتان رزگاری کردم.

# ١٨

لەگەڵ دەستپێکردنەوەی ساڵی دووەمی خوێندنم لە بەغداد، وازم لە ئیشکردن و گەڕان بەدوای کار پەیداکردن هێنا. بەو یارمەتییەی بژێوی بەشی ناوخۆی قوتابیان لە زانکۆ قەناعەتم کرد، کە سەرەتا شەش دینار بوو، دوایی بووە حەفت دینار. هەر لەو ساڵە دا بوو بە یارمەتی شاسوار جەلال، کە ئەو دەمە لە رۆژنامەی هەفتانەی هاوکاری رۆژنامەنووسێکی دیاربوو، ناوناوە نووسینێکم ﭻ وەک پەخشان، یان وەرگێڕان لە عەرەبییەوە بۆ کوردی بڵاو دەکردەوە و موکافەئەیەکم بەردەکەوت. مرۆڤی سەربڵند عەزیز مەحمود لەوان رۆژاندا، کە زۆر ئێواران لەگەڵ برادەرەکانی دیکە، بەیەکەوەمان بەسەر دەبرد، هەمیشە قەلۆش و گیرفان بەتاڵ بوو، چونکە هەر پارەوپولێکی بهاتایە دەست، بەزۆری لە دۆست و برادەرانی سەرف دەکرد، گیرفانی خۆی لەگەڵ هاوڕێیەکانی جیا نەدەکردەوە و کە سەری مانگ دابهاتایە، خۆی بێ پارەبوایە و دەهات.. دەیگوت.. مردوو ئەمشەو لای تۆم. تۆ دەبوایە بۆ ئەو شەوە لە خزمەتیدا بیت. بەتایبەت لەو بارەوە شاسوار و حەمە قەراخی هەمیشە گیرفانیان لەگەڵ ئەو هاوبەش بوو. لە بیرمە زۆر سەرەمانگان، کە شاسوار موچەکەی وەردەگرت، دەهات بەندە[23]، عەزیز مەحمود و یاسین ئەنوەری کەرکووکی لە خۆشترین لۆقلتەی ئەو دەمی بەغداد، لەگەرەکی (المسبح) داوەت دەکرد و دەیگوت با ئێوەی رووتەڵەیش ژەمە خواردنێکی بە لەزەت لەو جۆرە لۆقلتە نوێیانە بخۆن.

بەراستی من لە ژیانی خۆمدا، دەیان هاوڕێی دڵسۆز و بە وەفام هەبووە و هەیەتم، بەڵام نموونەی شاسوار، عەزیز مەحمود و یاسین ئەنور هەمیشە لە خەیاڵ و بەرچاومن، لەو ماوە کورتەی هاوڕێیەتیماندا، زۆر رەوشتی جوانمەردی و لاوچاکییان لێ فێر بووم.

---

[23] ئەو کات، ساڵێک زیتر بوو شاسوار بەرپرسی رێکخراوەیی من بوو، لە کۆمەڵە.

هەرگیز لەبیریان ناکەم و هەنووکەیش دوا دیداری (ئارام)م بەر لە شەهیدبوونی لە مێشکمدا تۆمارە، کە دەبێ لە خەباتکردنی ژێرزەمینی کۆڵنەدەم و پشووم درێژ بێت.

دوا دیدەنی مامۆستا عەزیز مەحمودم لە بەرچاو ناسڕێتەوە، کە ڕۆژی دواتر لە زیندانی موسل لە سێدارە دەدرا. منیش وەک هاوڕێیەک لەگەڵ کەسوکارەکەی بۆ دوادیدار چووبوومە خزمەتی. دیتم یەک لووتکەی لە رووخان نەهاتووە، وشەکانی سەرزاری بە پێکەنین، بڕوابوون بەخۆی و خەباتی رەوای نەتەوەکەی دەردەبڕی. هەرگیز ئەو دیمەنەی ئەوێ ڕۆژێم لەبیر ناچێتەوە، کە هەموو ئەو خواردنەی لە شارەوە بۆ دیداری دوا سات هاتبوو و هەمووی لەسەر سفرەیەک دانرابوو و منیش دیارییەکەی خۆم هەر بەدەستەوە گرتبوو، دەمویست لە بەردەمی خۆی دایبنێم. لە پڕ مامۆستا عەزیز جوامێرانە دەنگی هەڵبڕی، بە جەندرمە پاسەوانەکانی گوت، ئەگەر ئەو پێشمەرگە گیراوەی قیادەموقەتە، کە وابزانم ناوی (سەیدۆ) بوو و بۆ بەیانی هەردووکیان بەیەکەوە لە سێدارە دەدران، گوتی: ئەگەر ئەویش نەهێنن لەگەڵ ئێمە نان بخوات، ئەوە منیش نان ناخۆم. ئەوەبوو مەسئولی زیندانەکە هات، بۆ روونەدانی گرفت، بە ناچاری ملی بۆ ئەو داخوازییەی عەزیز دا، سەیدۆیان بە کەلەبچەیی هێنایە دەرەوە، ئەو زنجیرەی دەست و پێیان کردەوە، کە رۆژی پێشتر دوای ئەوەی پەلاماری پاسەوانەکانی دابوو، پێیان بەستبووەوە. ئەوجا منیش ئەو پرێسکەی خۆمم برد لە بەردەمی عزیزم کردەوە، کە چاوی بە عەمبەکە کەوت، یەکسەر هەستایە سەرپێیان و باوەشی پێداکردمەوە و گوتی، مادام بۆ دواجار عەمبەم خوارد، مەرگم بەراگێڕتان دەکەم، تێگەیشتم مەبەستی لە هاوڕێیانی کۆمەڵەیە.

هەروەها دوا دیداری من لەگەڵ جوانەمەرگ یاسین ئەنوەر کەرکووکی، بۆ ڕۆژانی کۆتایی ساڵی دووەمی خوێندنی من، ساڵکۆتایی خوێندنی کلاسەکەی ئەوان بوو. ئەو دەمە یاسینی ئەمر بەرپرسی لقی بەغدادی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان بوو. لەدەمی ماڵئاواییدا، رووی لەمن کرد و گوتی لەو هەفتەیەی دواتر دێمە هەولێر و بۆ خوازبێنی دەزگیرانەکەی لە هەولێر...! داخی گرانم تومەز ئەوە ماڵئاوایی یەکجارەکی بوو، دروست پاش ئەو هەفتەیە هەواڵی دڵتەزێنی یاسین/مان پێگەیشت، کە لە رووداوێکی هاتوچۆی نێوان بەغداد و کوت جوانەمەرگ بووە. ئەوە بوو بە یەکەوە لەگەڵ ئەرسەلان بایز بەشداری رۆژانی ماتەمینەکەیمان لە کەرکووک لە سەرخوانی ماڵی د. ئەنیس سابیر کرد. بەراستی کۆمەڵە و خەڵکی کورد ڕۆڵەیەکی بە هیمەت و گورجوگۆڵی وەک یاسین ئەنوەرمان لەدەست چوو، کە بە دڵنیاییەوە جێگای ئومێدی خەڵکی رەشورووت و مایەی پشت پێبەستنی هاوڕێ و هاوبیرەکانی بۆ رۆژانی تەنگانە بوو.

# ١٩

لەدوای بەیاننامەی ئازاری ١٩٧٠ ـەوە، یەکێک لە کارە جوان و دەستپێشکەرییەکانی "ی. ق. ک"، هەنگاوی کردنەوەی زنجیرەیەک ئۆردوگای (کەمپینگی) هاوینەی قوتابیان بوو، لەچەند شوێنێکی وەک ناوچەکانی گەرمیان، خانەقین، دەوروبەری کەرکوک و ناوچەکانی دیکەی کوردستانی باشوور. دەتوانم بڵێم یەکێک لەو سەروەرییانەیە، کە بۆ تێکڕای یەکێتیی قوتابیانی کوردستان لەوان ڕۆژاندا، لە مێژووی نەتەوەکەمان جێگای شانازییە.[24]
ساڵی دووەمی خوێندنمان لە بەغداد بەسەر برد و بەندە بۆ هاوینە لەپاڵ دەیان قوتابی لە نموونەی شەماڵ حەوێزی، ئازاد هەورامی نەمر، سالار عەزیز، حەمە قەراخی، ئازاد سۆلاڤ و زۆری دیکە، کە ناوەکانیانم لەبیر نەماوە، بۆ ئۆردوگای هەشەزینی نزیک بە سەنگاوی کەناری گەرمیان بەشدار بووم.

لەبیرمە بەرەبەیانێکی زوو، لە هەولێر لەگەڵ کاروانی قوتابیانی لقی هەولێر بەرێکەوتین، کە هەتا کەرکووک سەعدی پیرە بەرپرسی کاروانەکە بوو. یەکەمجار لە کەرکوک لە لقی قوتابیانی کوردستان بۆ چەند کاتژمێریک لاماندا، بۆ ئێوارەیەکی درەنگی ئەو ڕۆژە، گەیشتینە گوندی هەشەزین. برادەرانی مەسئولی ئۆردوگا و بەشێکی زۆری بەشداربووەکان گەیشتبوون. پاش یەکترناسین و کۆبوونەوەیەکی کورت، کە حەمە قەراخی وەک بەرپرسی سەرەکی ئۆردوگاکە، سەرپەرشتی کرد و ڕێنماییە سەرەتاییەکانی بۆ باسکردین. بۆ شەوەکەی دوای ئەوەی پێخەفی نووستنمان وەرگرت، جێگامان لە سەربانی ئەو قوتابخانەیە خۆش کرد، لەپاش نانخواردنێکی بەکۆمەڵ، لە سەربانەکە پاڵکەوتین. کە دەبوو بەیانی لەپێش گزنگی خۆرەتاو ڕابین، لە گۆڕەپانی قوتابخانەکە گردبینەوە، بۆ خوێندنی سروودی بەیانی، گوتەی ڕۆژ و دابەشکردنمان بەسەر مەفرەزەی دە پازدە لە قوتابییەکان.

بۆ بەیانییەکەی لەدوای ئەو کارانەوە، هەریەکەمان سەرو نانی گەرمی بەیانیمان وەرگرت، لەگەڵ پێخۆرێکی ئاسایی و کوپێک چای. ئەوجا بە ڕابەری یەکێکی شارەزا، هەر گروپەو ملی ڕێچکەی ئەو گوندانەی گرت، کە دەبوو بەسەریان بکەینەوە. یەکێک لە شتە

---

[24] هیوادارم ئەو هەنگاوە بە شێوەیەکی مۆدێرن بۆ قوتابییە گەنجەکانمان گیانی بەبەردا بکرێتەوە، وەک ئەزموونی نەتەوەکانی نموونەی جولەکە، فەلەستینی و ئەریتیرییەکان بکرێتە تراديشونێکی ساڵانە و گەنجانی نیشتەجێی دەرەوەی کوردستانیش بەخۆوە بگرێ.

خۆشەکانی ئەو چالاکییە، ئەوە بوو کە بەیانییان بەدوای یەکترییەوە ڕیچکەمان دەبەست، بەدەم سروودگوتنەوە ڕێگامان دەبڕی، بۆ گەڕانەوەیش هەر بەهەمان ڕێوڕەسم بوو.

لەوەیش خۆشتر ئەوە بوو، هەمومان بە یەک گیانی کوردانەی کەم وێنەی ئەو ڕۆژگارە، کە دەگەیشتینە هەر گوندێک، بەتایبەت وەرزی دروێنە و خەرمانکوتان بوو، کە لەو ناوچەیە جۆخین بەناوهێنان بە جەنجەڕ و گێرەی وڵاخان بوو. دەقمان بەوە گرتبوو، کامە وەرزێر و خێزان هەژار و ڕووتەڵە و بێکەس بوونایە، یەکەمجار زبارەمان بۆ ئەو دەکرد و زۆرجاران، بە یەک ڕۆژ کاری چەند هەفتەیەکمان لە کۆڵ دەکردەوە و نیوەڕۆیەکەیش بە نان و دۆیەک، یان نان و سەلکە پیوازێک شوکرانەمان دەکرد. لە گەرمەی کارکردنی بەردەوامی بەر هەتاودا، درێغی ئەوەشمان نەدەکرد، کە لەگەڵ ئەو جوتیار و کەسەکانی خێزانەکە، بکەوینە باسوخواسی ژیان و گوزەران و باسکردنی خەباتی ڕەوای نەتەوەکەمان. کە دەتوانم بڵێم بای دەیان کۆلکەکادری نەخوێندەوار سوودمان بەو خێزانە دەگەیاند.

لە ڕووی بەرچاوڕۆشنی و ڕوونکردنەوەی مەسەلە گرنگەکانی ڕۆژگار. بە جۆرێک لەگەڵ خەڵک تێکەڵ ببووین، کە هەم ئێمە خۆمان بە کەسوکاری ئەوان دەزانی و هەم ئەوانیش ئێمەیان بە کوڕ و برای خۆیان دەخوێندەوە. لە گەرمەی ڕۆژانی ئۆردوگادا، کە شەوانە تادرەنگانێ بە سیمیناری ڕۆشنبیری هەمەجۆر و چالاکیی هونەری و بەزمورەزمی هەڵپەرکێ و گۆرانی گوتنەوە و ڕۆژی هەینیشمان بە پشوو و خۆ شوشتن و جلوبەرگ خاوێنکردنەوە بەسەردەبرد. داخەکەم لە دووەم هەینی کە زۆربەمان چووبووینە سەر ئاوی ڕووباری باسەڕە، کە نزیک بە گوندی هەشەزین بوو، پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ کاروباری خۆمان جێبەجێکرد و بۆ ئۆردوگا گەڕاینەوە. ئێوارەکەی کە وەک ڕۆژانی ئاسایی مەستاری ناوەکان کرا، یەکێکمان بەناوی حەمەدەمین دیار نەبوو، کە هەر لە گروپەکەی ئێمە بوو، لە کاتی خۆشوشتنیش زۆر لە من نزیک بوو، بەڵام دوایی نەمدیتەوە، تومەز بۆ مەلەکردن دوورکەوتبووەوە و کەوتبووە قووڵایی ڕووبارەکەوە، کە ئاوەکەی زۆر تیژڕۆ بوو، خنکاوە. بۆ شەوەکەی تەرمەکەی لە بنی گومێکی قووڵ دۆزرایەوە و کۆستێکی ناخۆش بوو. بەدوای چەند ڕۆژێکی دیکە منیش تووشی مەلاریا بووم و زۆر بە خراپی دەڕشامەوە و بەپەلە بۆشاری کەرکوک/یان بردم. دوای پشکنینی پزیشک و دەرمان وەرگرتن، پزیشکەکە ئامۆژگاری کردم، کە دەبێ لە ماڵ بحەسێمەوە و زۆر هاتوچۆی بەرهەتاو نەکەم و تێکەڵی ناو خەڵک نەبم. ئەوە بوو بە ناچاری گەڕامەوە هەولێر، دوای دوو هەفتە چاک بوومەوە و سەیرم کرد، ئۆردوگایش لە تەواوبووندایە.

لە سالی دووەمی کۆلێجدا، واتە ١٩٧١ بوو، ئێمەی ئەندامی پارتی بالی م. س لە کۆبوونەوەیەکی فراوان، لە بارەگای لقی پێنجی پارتی لە گەڕەکی ئەبو نەواس، بەیەکجارەکی تێکەل بە ڕێکخستنەکانی پارتی لە بەغداد بووینەوە. ئەو سەرشانەی بەندە و یادی بەخێر کامل کەریمی کەرکووکی، کە بۆمان دانرابوو، ناوی کەمال عەبدولا بوو و خەلکی شاری دهۆک بوو. مرۆڤێکی هێجگار ڕەوشت بەرز و کوڕە هەژارێکی وەک خۆمان بوو. هەر لە یەکەم کۆبوونەوە، خۆی بە شەرمەزار زانی، کە ئەو کراوەتە بەرپرسی ئێمە، لە کاتێکدا چەند مانگێک بوو، هاتبووە ریزی ڕێکخستنەکانی پارتییەوە، ئێمەیش لەو کۆنتر و بەئاگاتر بووین لەکاروباری ڕێکخستن. دلمان دایەوە و بەروحی ریازیمان وەرگرتبوو. هەتا کامل لەگەل ئێمە بوو، کە دواتر لە کۆلیجی پۆلیسی وەرگیرا و بەشی کوردی بەجێهێشت، کەمال هەموو هەفتەیەک دەهات و دەیگوت، چکامل چکەریم چکەی چکۆبوونەوەک بچکەین ؟ ئیتر کامل لەو ترسە چوو بۆ کۆلیجی ئەفسەری پۆلیس، لە گۆڕینی ناوەکەی ڕزگاری بوو. بەدوای ئەوە بەندە بۆ لای هەڤالێکی دیکە بەناوی فەتحولا کەریم گواسترامەوە و هەتاوەکو سەرەتای سالی چوارەم، بەلام نێوانم لەگەل کەمال و تێکڕای برادەرە یادینییەکان هەر خۆش بوو.

هەرگیز لەبیرم ناچێتەوە، یادی بەخێر مەلا عەلائەدین سجادی، کە وانەی مێژووی ئەدەبی کوردی پێ دەگوتینەوە، تازە کتێبەکەی (مێژووی ئەدەبی کوردی) سەرلەنوێ چاپ کردبووەوە، کەمالیش کە زۆر بەلەنگاز بوو. خۆم کە ئەو کتێبانەم بە قوتابییەکان فرۆشتەوە، کە دەبوو هەمو قوتابییەک بە ناچاری بیکڕێت. من لە لای خۆمەوە پارەم لە کەمال وەرنەگرت، کە ئەو دەمە ٧٥٠ فلوس بوو. چونکە کەمال گوتی ئەز ئەو کتێبەم گەرەک نییە، لە کتێبخانە قەرزی دەکەم بۆ خوێندنەوەی. زۆر چاکم لەبیرە هەموو جارێک، کە مامۆستاکان، کتێبەکانی خۆیان بە ئێمە دەفرۆشتەوە، بەتایبەت دکتۆر ئیحسان فوئاد یادی بەخێر لەگەل دکتۆر مارف خەزنەدار، دکتۆر عیزەددین مستەفا، هەمیشە پارەیان لەو قوتابییانە وەرنەدەگرت، کە هەژار بوون. کەچی ئەو ڕۆژە کە پارەی بیست و چوار کتێبم دایەوە دەست سجادی و پێم گوت، دانەیەکیشمان داوەتە قوتابییەکی هەژار، پارەمان لێ وەرنەگرتووە، پەنچەی نارازیبوونی هێنا و برد و گوتی: نابێ دەبێ پارەکەی ئەویش بژمێرن. منیش نەمهێنا و نەمبرد لەگەل پێدانی ئەو٧٥٠ فلوسە لە گیرفانی خۆم و گوتم: مامۆستا ئەگەر ئەو ٢٥ کتێبەت لە بازاری هەر کوێیەک بفرۆشتایە، دوو ٧٥٠ فلوسی زیاتریان لێ دەگێڕایتەوە. کەچی دەستی درێژکرد و ئەو ٧٥٠ فلوسەیشی خستە گیرفانی کەوا و سەلتەکەیەوە. بەلام کەمال لە شوێنی خۆیەوە زۆر سەرگران بوو و بە زۆر کتێبەکەی وەرگرت. ئەو علائدین سجادییەی لەگەل دەستپێکردنەوەی شەڕی وێرانکارانەی

رژێمی بەعس لە دژی کورد لە ساڵی ١٩٧٤دا، هاوکاری دامودەزگا کارتۆنییەکەی رژێمی کرد و پۆستی ئەمینعامی ئەمانەتی عدل و ئەوقافی قبووڵ کرد.!

# ٢٠

ئەو رۆژانەی ژیانی بەغداد، لە نێوان ١٩٧٠ ـ ١٩٧٥ ، خۆشترین زەمەنی ژیان بوو. لەو پایتەختە سەربەگۆبەندەی عیراق، کە لە هەموو مێژوویدا، بە دەگمەن چەند ساڵێکی پڕ لە ئاسوودەیی و هێمنی بەخۆوە دیتوە و هەمیشە شاری قەسابخانەی کوشتاری مرۆڤ، زوڵم وزۆرداریی خەلافەتی ئەمەوی و عەباسی و عوسمانلییەکانی دەسەڵاتداری ژێرناوی ئایینی ئیسلام و شەریعەتەکەی بووە. ئەوجا پایتەختی کودەتا خوێناوییە یەک بەدوای یەکەکانی دەسەڵاتدارە عەرەبە سونە مەزهەبەکان بووە. ئیتر ئەوچەند ساڵە بەغداد کەوتبووە هەناسەدانێکی ئاسایی، لە هەموو لایەکەوە خەڵک رووی لێدەکرد، بەتایبەت خەڵکێکی زۆری کورد نیشتەجێی ئەو شارە بوون. لەناویاندا فەیلییەکان بە ژمارە زۆری ئەو کەماتییەی کورد بوون لە بەغداد و دەوروبەرەکەی، کە جێگە و پێگەی دیاری خۆیان هەبوو. بەڵام دێوەزمەی دەسەڵاتی بەعسییەکان، کە بە نەفەسێکی تۆڵەسەندنەوە دەژیا، لە سەرەتادا زیرەکانە بەدەم گاگۆڵەکردنەوە، خەریکی تەونی چنینی پلان و دەسیسە ژەهراوییەکانییان بوون. تاکو زۆر بە ئاسپایی لە رۆژانی دواتر، دەستیان خستە بینەقاقای ئەو هەناسەوەرگرتنە ئاساییە و زۆری نەبرد عیراقی دەستکردیان کردە ئەو دۆزەخەی کە هەتا هەنووکەیش، کەس ناتوانی لەسەر تەواوبوونی ئەو مەرگەساتە، مەزەندەیەک بدات!

بەڵێ لەوێ رۆژاندا، کۆمەڵەی مارکسی لینینی ـ کوردستانی عیراق لە بەغدادی پایتەخت سەری دەرهێنابوو. بە سوودوەرگرتن لە کەشوهەوای سەرەتای حەفتاکان، بەغدادی کردبووە هەواری هەنگاونان بەرەو شارەکانی کوردستانی باشوور. بە جۆرێک هەڵسوڕاوە سەرەکی و گورجوگۆڵەکانی کۆمەڵە، چ وەک ئەندامانی سەرکردایەتی، چ وەک کادر و ئەندامەکانی خوارەوە، بەشێکی زۆریان لە بەغداد نیشتەجێ و کارمەندی دەوڵەت، یان قوتابی زانکۆکان بوون. کە ئەو رۆژانە بە بیر خۆم دەهێنمەوە، زەخیرەی پێکهاتی ئەوێ رۆژانی کۆمەڵە، بە شێوەیەکی سەرەکی لەو خوێندکار و گەنجانەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە لە بنەڕەتەوە هەمان زەخیرەی حیزبە هەڵوەشاوەکەی باڵی مەکتەبی سیاسی بوون. ئەگەرچی لە کۆبونەوەکان هەمیشە ئەوە دووپات دەکرایەوە، کە دەبێ نهێنییەکانی

ناو شانه و ئەڵقە رۆشنبیرییەکان، بە گیان و دڵ بپارێزرێن و دەبوو کەمترین ژمارە یەکتری بناسن، بەڵام لەبەر ئەوەی جۆری پێکهاتەی ئەو ئەڵقە و شانەکان و شیرازەکانی بەرێوەبردنی کۆمەڵە، هەر لە سەرەتاوە هەمان فۆرمی رێکخراوەیی حیزبی رابردوو بوو، ئارام لەگەڵ گرتنە ئەستۆی رێکخستنە لەیەکترازاوەکانی ساڵی ١٩٧٥ی کۆمەڵەی بێسەر بەجێهێڵراو، بە داهێنانی سترکتوری رێکخستنی هێشویی، ئەو شێوازە کلاسیکییەی گۆڕی. بەو رەنگە زۆربەی هەرەزۆرمان یەکترمان دەناسی و لەگەڵ ئەوەیشدا ژمارەی بەشداربووەکانی ئەڵقە و شانەکان، هەتا ساڵی ١٩٧٤ لە هەر شارێکدا، لە هەموو حاڵەتێکدا لە پەنجەکانی دوو دەست تێنەپەڕیوون. ئەوەیش بە هۆی ئەوەی کە هەر لە سەرچاوەی رێکخستنە حیزبییەکەی رابردووەوە، زۆربەمان یەکترمان دەناسی و بگرە برادەری هاودەمی یەکتری بووین، لە خوێندن و پێکەوەژیان، پێکەوە هەستان و دانیشتن، بەیەکەوە سەفەرکردن، هەتا پێکەوە خواردنەوە و بەشداریکردنی ئاهەنگەکان. لەپاڵ ئەوانەیشەوە، کە من بە کەتەگۆریای ئەوێ رۆژێی چالاکییەکانم دادەچمەوە، بەردەوام بەشداربووەکانی ئەو ئەڵقانە لێرە و لەوێ ئاڵوگۆڕییان پێ کراوە. لە بیرمە هەر خۆم یازدە جاران، لەو ئەڵقەوە بۆ ئەڵقەیەکی دیکە، لەو شانەوە بۆ ئەو شانە، گواستراوەمەتەوە. لەو شتە باشانەی بە ئامۆژگاری شاسوار جەلال فێری ببووم، ئەوە بوو، کە هەرگیز لە لای ئەو ئەڵقە و شانە نوێیانەدا ناوی تەواوی خۆم نەدەدرکاند و ئەمەیش زۆر بەکەڵکم هات. چونکە برادەران لەناو رێکخستنەکانی بەغداد لە پاییزی ساڵی ١٩٧٥ گیران و لە کاتی ئیعترافاتە زۆروزەبەندەکانیاندا، چوار کەسیان ئیعترافی لەسەر بەندە کردبوو. بەڵام کەسیان ناوی تەواوی منی نەدەزانی و هەر یەکەیان ناوێکی گوتبوو. ئەو زانیارییانەم لەو برادەرانە زیندانییانە پێ گوترا، کە بەندە لەسەر تەکلیفی ئارام، چووبوومە سەردانیان لە زیندانی الفضلیەی بەغداد، کە لەناویاندا ئەرسەلان باییز و عومەری سەید عەلی بوون. بەڵام ئەودەمە لەناو هاورێیانی کۆمەڵە، جۆرە خۆشەویستییەک، رێزلەیەکگرتن و هاوسۆزی و وەفادارییەک هەبوو، کە پێشتر لە ریزی هیچ حیزب و لایەنێک بەرخوردی نەدیتراوە.

# ٢١

ماوەیەک بوو دامودەزگاکانی رژێمی بەعس لە بەغداد و دەوروبەری، بە شێوەیەکی فاشستانە کەوتبوونە ئازاردانی کوردەفەیلییەکان. ئەوەی لەدەستیان هات بۆ دەربەدەرکردنیان لەناو ماڵوحاڵی خۆیان دریخییان پێ نەکردن. بە جۆرێک دۆزەخیان بۆ دروست کردبوون. رۆژانە دەیان بنەماڵە، کۆمەڵ بە کۆمەڵ لە ناوچەکانی نیشتەجێبوونیان دەردەکران. بەوپەڕی سووکایەتی پێکردن بۆ ئەودیوی سنوورەکان فڕێیان دەدان. دیارە بەعس بەو ملهوڕییەی خۆی بە بیانوی قەلاچۆکردنی نەتەوەی کورد، بەگوێرەی ئەجندای رەگەزپەرستانەیان گەرەکیان بوو، دەنگی خەڵکی کورد کپ بکەن، ئیتر لەو بازنە دوورەدەست و لاوازەی نەتەوەی کورد هەنگاویان هەڵگرتبوو. رۆژ لەدوای رۆژ سیماکانی سیاسەتی دوژمنکارانەیان بۆ بەربەرەکانی کورد، چاکتر و روونتر دەردەکەوت. هەر لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٤ ـەوە، نیشانەکانی دەستپێکردنەوەی دێوەزمەی شەڕی بەعس لەگەڵ سەرجەمی خەڵکی کورد دەرکەوتبوون.

لێرەدا رێکخستنە سەرەتایی و بچکۆلانەکەی کۆمەڵە کەوتبووە سەر دووڕیانی بڕیاری ئەوەی بە چ لایەک دەشکێتەوە. وەک چەردەیەک جاشی خۆفرۆش، لە شانی کۆمەڵێک دووکانی حیزبی کارتۆنیی خائین، یان لەپاڵ هەڵەداوانبوونی حشع، بەرەی رژێمی بەعس دەگرێ، یان ئەو رێگا دروستەی ناو خەڵک و ریزەکانی موقاوەمەتی نەتەوەکەی خۆی هەڵدەبژێرێ. بێگومان لەورۆژەدا، کۆمەڵە سەرباری نەناسراوی و کاری رێکخراوەیی خەباتی ژێرزەمینی، دروستترین رێگای ناوباوەشی ریزەکانی خەباتی نەتەوەکەی خۆی گرت، بە شێوەیەکی پراکتیکی یەک دەسرازە هەڵبژاردەی لە ئەندامی سەرکردایەتی، کادر و هاوڕێیە تێکۆشەرەکانی خۆی، خستە ریزی خەباتی چەکداری چواردەساڵەی جوانەمەرگ، کە ئەندامانی کۆمەڵە لە ریزی قوتابیان و لاوان و لەناو هێزی پێشمەرگە بە شێوەیەکی سەرەکی و لە دامودەزگا ئیداری و ئیعلامی.. هتد خەباتی شێلگیرانەی خۆیان درێژە پێدابوو.

لەو پێناوەدا ژمارەیەک لەو تێکۆشەرانە لە مەیدانی نەبەردیدا، شەهید و بریندار بوون. لەو سەروبەندەدا، من کە لە ئازاری ١٩٧٤ دا، لە پۆلی چوارەم بووم، بڕیار بوو دوا ساڵی خوێندنەکەم تەواو بکەم، ئەوجا وەک هاوڕێیەکی کۆمەڵە روو لە شاخ بکەم. بەڵام دیاربوو لەلایەن هەندێ پیاوخراپەوە بۆ دامودەزگا ئەمنییەکانی رژێم، راپۆرتم لێ درابوو. رۆژێکیان ماڵی ئاوابێت، لەلایەن دڵشاد گەنجۆ ی قوتابی کۆلێجی پەروەردەوە ئاگادار

کرامەوە، کە مەفرەزەیەکی ئەمن بەدوامدا دەگەڕێن، کە ئەودەم هەردووکمان لە یەک بەشی ناوخۆی قوتابیان لە تەنیشت کۆلێجی ئاداب دەخەوتین. ئەوەبوو یەکسەر خۆم شاردەوە و بەشی ناوخۆم بەجێهێشت و بۆ دەوامی کۆلێجەکەی خۆم نەچووم. ئەو چەند شانەیەی ڕێکخستنی کۆمەڵە و ئەڵقە ڕۆشنبیرییانەی لەلام بوون، تەسلیم بە سەلام بەرزۆم کردن. کە لەو هاوڕێیانە پێکهاتبوون؛ هیوا ڕەئوف، عوسمان فەتاح لە کۆلێجی ئەندازیاری، ئازاد عزیز، سادق فەیلی لە کۆلیجی کشتوکالی، کاکە عەبە لە کۆلیجی ئابووری لەگەڵ فازل ئەرکەوازی لە بەشی کوردی کۆلێجی ئاداب، کەمال معروف و حسێن، کە ناوی باوکیم لەبیر نەماوە، هەر لە کۆلێجی ئاداب، لەگەڵ چەند کەسێکی دیکەی کچ و کوڕ، لێرە و لەوێی کۆلێجەکانی زانکۆی بەغداد.

پاش تەنیا ڕۆژێک دەستوبرد گەڕامەوە هەولێر و هەر بەترومبێل خۆم گەیاندە ناوچەی چۆمان. ڕۆژێکی سەیروسەمەرە بوو، هەزاران خورتی وەک من بە تاو و دڵسۆزییەکی پڕ لە خۆشەویستنی وڵات و نەتەوەکەی ڕووی لەو شاخانە کردبوو، کە بنکە و بنەگەی شۆڕش و سەرکردایەتی ئەو ڕۆژە بوو. لەیەک قەرەباڵغی بێسەروبەر، مرۆڤی تێدا گوم دەبوو و کەس بەکەس نەبوو. ئێمە هەموو ئارەزووەکمان، تفەنگ لەشانکردن و چوونە بەرەی موقاوەمەتی چەکدارانە بوو. بەڵام بەشێکی ئەوانەی خوێندکاری کۆلێج، لەلایەن سکرتارییەتی قوتابیانەوە، پسولەی بوونە مامۆستای قوتابخانەمان پێ درا ورەوانەی ئەمانەتی پەروەردە کراین. لە ڕۆژێکی باراناوی ئازاری ١٩٧٤ سەردانی ئەمانەتی گشتی پەروەردە و خوێندنمان کرد. لەبیرمە چەند کەسێک وەک لیژنەی دامەزراندنی ئەو ئەمانەتە، لە پەنا تارمەی خانووێکی قوڕ لە بەری ناوپردان، لەسەر تەشکەبەرەیەک دانیشتبوون و ناونووسیان دەکردین. پاش هەندێ پرسیار و وەڵام، زۆر بە نادڵی هەریەک و پازدە دینارێکیان بۆ سەرفکردین، هەر چەند کەسێکیان بۆ قوتابخانەیەکی ناوەندی ناوچەکانی کوردستانی ئازادکراویان نارد.

بەندە بەگەر ئەو لیستەیە کەوتبووم، کە بۆ ناوەندی هیران و نازەنین فەرمانمان دەرچوبوو. دەبوو بەزوترین کات ئەو ناوە بەجێبهێلین، چوونکە لە هیچ شوێنێک جێگای حەوانەوە بەرنەدەکەوت، بارانیش لەوێ ڕۆژاندا سەربار بوو. ناچار ئەو کۆمەڵە مامۆستایە، هەموومان ریزمان بەدوای چەند مامۆستایەکی شارەزا گرت، بەپێیان ڕێگای قەدپاڵی ئەوشاخانەمان گرت. شەوێکی درەنگ گەیشتینە ڕەواندوز، لە بەرباران دوو ڕۆژان بەتوبزی خۆمان لەوێ نیشتەجێ کرد و بۆ ڕۆژی سێیەم خۆمان گەیاندە گوندی فەقێیان و شەوەکەی بەسەر ماڵە جوتیارەکان دابەش کراین. بەمجۆرە قۆناغ بە قوناغ بە دە ڕۆژان گەیشتینە ناحیەی هیران.

# ٢٢

ساڵی ١٩٧٤ بوو. ئێمە کۆمەڵێک مامۆستای سەرەتایی، ناوەندی و ئامادەیی لە شارۆچکەی "هیران"ی خۆشناوەتی کۆ ببووینەوە. هەمووومان لە باڵاخانەی قوتابخانەی "ناوەندیی هیران" دەخەوتین. حەمەدئەمین حوسێن کە مامۆستای سەرەتایی بوو، لەگەڵ محەمەد زاهیر محەمەد عەلی و بەندە کە هێشتا قۆناغی کۆلیژمان تەواو نەکردبوو، بەڵام کرابووینە مامۆستای ناوەندی و ئامادەیی. هەرسێکمان لە شانەیەکی بازنەی رۆشنبیریی کۆمەڵە هاورێی یەکتری بووین. ئەو دەم رێکخستنەکانی کۆمەڵە زۆر نهێنی بوو، ئەندامەکانی زۆرتر لەناو قوتابیانی زانکۆ دەنگ و رەنگیان هەبوو، بەتایبەت لە زانکۆی بەغداد و سلێمانی.

لە شارۆچکەی هیران، بارەگای لقی دووی پارتی، هێزەکانی پێشمەرگەی دەورووبەر، لقی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان، یەکێتی لاوان، دادگا و بەڕێوەبەرایەتی پۆلیس و چەندان دامودەزگای تر هەبوون. ئەو مامۆستایانەی لەبیرم ماون، شێخ محەمەد ئەمین، مامۆستای سەرەتایی و مەسئولی لاوانیش بوو، سەیفئەدین کۆیی، نەریمان، مەحەمەد حەسەن، حەسەن فەرەج، جەمیل عیسا، بەندە و مەحەمەد زاهیر، عەبدوڵڵا هێرانی کە مامۆستای سەرەتایی بوو، شەفیق کۆیی و چەندانی دیکەیش، کە ناوەکانیانم لەبیر نەماون، لەگەڵ مامۆستا برایم کە هەم موفتیش بوو، هەمیش نوێنەری بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی هەولێر بوو لە هیران. ئەو رۆژە کۆتایی مانگی ئازار بوو، قەرەباڵغییەکی هێجگار زۆر لەو شارۆچکەیە کۆ ببوەوە. قەدپاڵ و پەنا بەرد، بنەشاخ و دۆڵ نەمابوو، کەپر و هەواری نیشتەجێبوونی تێدا خۆش نەکرابێت، بە جۆرێک لە هەموو لایەکەوە خەڵک جمەی دەهات. ساڵەکەیش زۆر بەباران بوو، ئەو خانووبەرەی هەبوون، بەشی ئەو حەشاماتە زۆرەی نەدەکرد، بەجۆرێک مزگەوت و تەکیەی شێخ مەلاسانی لە هەموو شوێنەکانی دیکە، پڕ خەڵک تر بوو، کە زۆر بە دڵفراوانی و جوامێرانە پێشوازی خەڵکیان دەکرد. لێرە و لەوێیش مێوانخانەی شۆڕش هەبوون، بەڵام هەربەشی خەڵکەکەی نەدەکرد. بۆیە لەو رۆژە سارد و بەبارانەدا، خەڵکی دانیشتووی شارۆچکەکە نموونەی مرۆڤی بەربێن فراوان و خانەدانی بوون، ماڵ نەبوو چەندان نەفەر چ خێزاندار، چ سەڵت بە بەردەوامی میوانی نەبێت. لەسەر و گوێلاکی ئەو خەڵکە هەژار و کەم دەرامەتە بوون، راستە شۆڕش موچەیەکی دەدا، بەڵام ئەوە دەرەقەتی پێداویستیەکان نەدەهات. داخوازییە زۆر و زەبەنەکانی تێر نەدەکرد. قوتابخانەی سەرەتایی دانێک دەوامیان دەکرد کە کچ و کوڕ تێکەڵاو بوون، ژمارەی

کچەکان زۆر کەمتر بوو لە ژماری کوڕەکان، ئەو دەمە دەبوو مامۆستاکانی ئامادەیی و ناوەندییەکە لە بینایەکە بچنە دەرەوە، هەروەها بۆ دەوامەکەی ناوەندی و ئامادەییش بە پێچەوانەوە، دەبوو ئەوانەی سەرەتایی بچنە دەرەوە، لەشوێنێک خۆیان خەریکی کات بەسەربردن بکەن.

دیارە ئەم نەبوونی ژمارەی تەواو و پێویستی بینایەی قوتابخانە، وەک تێکڕای چیرۆکەکانی دیکەی کوردەواریی، هەر لە کۆنەوە لە کۆمەڵی کوردی مارە کراوە، بە جۆرێک لەوپەری پێشکەوتن و گۆڕانی ڕۆژگار، کەچی ئێستاکەیش لە شارێکی وەک هەولێر سەدان بینایەی مزگەوتی زیاد هەیە، کەچی هەر لە وشارەدا سەدان، بگرە زیاتریش بینایەی قوتابخانەی خوێندن بۆ زارۆک کەمە و نییە بانێکە و سەد هەوا!

لەو سەربردەیەدا، ئێمە ئەو سێ هاوڕێیەی کۆمەڵە، بۆ ڕەواندنەوەی گومان لەسەرمان و سەرپەرشتیکردنی شانەیەکی ڕێکخستن، "حەمەدەمین حوسێن"مان نارده گوندی نازەنین، کە کەوتبووە تەنکیشی سەرووی هیران، لە بناری زنجیرە شاخی ئاوەگرد. شانەکەش دوو مامۆستا بوون؛ برایم و عبدالرزاق لەگەڵ خوێندکارێک ئیسماعیل حەمە سوور پاش مانگێک [25]چووە گوندی نازەنین و کارەکانی خۆی رادەپەراند. من و مەحەمەد زاهیر لە هیران مابووینەوە. بە هەردووکمان پێوەندیی هاوڕێیانەی خۆشمان لەگەڵ مامۆستایان جەمیل عیسی، مەحەمەد حەسەن و حەسەن فەرەج لە لایەک و لەگەڵ مامۆستا عەبدوڵڵا هیرانی و چەند خوێندکارێکی قۆناغی ئامادەیی کە خەڵکی هیران و دەوروبەر بوون، لە لایەکی تر دروست کردبوو. لە مانگی چواریش پاش کارەساتی بۆردومانی قەڵادزێ، دەیان قوتابی دیکەی ئامادەیی و ناوەندی بۆ هیران هاتن. قوتابخانەکە قەرەباڵغ بوو، چالاکی ئێمەیش بەگوڕتر بوو، لەو ماوەیەدا من بۆ هەندێ کاری ڕێکخراوەیی کۆمەڵە، لەگەڵ کاوەی ئەندازیار کە بە سەردان هاتبووە لای برادەرە کۆییەکان، سەفەرێکی خێرای ناوچەکانی چۆمان و گەڵالەم کرد. پاشان لەو سەرەوە بە هاوڕێیەتی، شێرکۆ فەتحوڵڵا و رزگار و ئەرسەلان بایز بە قەڵادزێ و رانیەدا گەڕاینەوە.

بە چەند ڕۆژێک پێش بۆردومانەکە، لەگەڵ هەندێ هاوڕێیان کۆ ببووینەوە و بەرنامەی کارکردنمان لە ناوچەکە ئاڵوگۆڕ کردبوو، بەتایبەت لەوێ ڕۆژندا، ئەرسەلان بایز وەک نوێنەری کۆمەڵە هاتبووە ناوچەکە و لەگەڵ خۆیدا هەندێ پەرتووک و بڵاوکراوەیەکی دەستنووسی هێنابوو. کە گەڕاینەوە خۆشناوەتی، هەتا دەوروبەری هیزۆپ بەیەکەوە

---

[25] مامۆستا حەمەدەمینی نەمر کە لە ناوەراستی نۆوەدەکان لە باوەشی نەبوونی و هەژارییەکی هێجگار کوشندەدا کۆچی دوایی کرد.

بووین، بۆ شەوەکەی لە هیزۆپ لە ماڵی دۆستێکی من بووین، کە لەبن گەوەرە بەردێک ماڵی دانابوو. لەوێ من بەرەو هیران و نازەنین گەڕامەوە و "ئەرسەلان"یش ئاودیوی دۆڵی سماقوڵی بوو بۆ سەردانی هاوڕێیانی دەوروبەری کۆیە. کە گەیشتمەوە هیران، مامۆستایەکان هەواری خۆیان گواستبووەوە دەرەوەی قوتابخانەکەی هیران، سەرەتا لەپشتی قەبرستانەکەی سەرگردی پشتی تەکیە و دواتر هاتین لەسەر ڕێگای نازەنین کەپرمان کرد، بەشەو لەوێ دەخەوتین و بەڕۆژ دەگەڕاینەوە، بە تایبەت لەو ماوەیەدا پەلاماری فرۆکە جەنگییەکان، ناوچەکەی هەراسان کردبوو. شەو لەبەر چراو فانۆس دەرسمان دەگوتەوە. هەروەها شەڕی پێشمەرگە و هێزەکانی حکومەتیش لەچیای سەفین، روو لە گەرمی بوون و رۆژ لەدوای رۆژ هێزی پێشمەرگە لە پاشەکشە و بەجێهێشتنی چیای سەفین بوو.

دووەم ڕۆژی گەیشتنم بوو، کاردۆ گەلاڵی رەحمەتیم دیت، کە بەرپرسی لقی یەکێتیی قوتابیانی هەولێر بوو، زۆر بە فرمان قسەی لەگەڵ کردم، ئاگاداری کردمەوە کەمن و مەحەمەد زاهیر خەریکی بڵاوکردنەوەی نامیلکەکانی بیری ماوتسی تۆنگ/ین و دەبێ لێکۆڵینەوەمان لەگەڵ بکرێ. منیش ئەوەندە گوێم پێ نەدا، چونکە پێشتریش لەگەڵ شێخ مەحەمەد بالیسانی، کە هەر مامۆستای سەرەتایی و بەرپرسی یەکێتی لاوانی لقی هەولێر بوو، تووشی هەندێ قڕە ببوم لەسەر ئەوەی یەک لەو نامیلکانەی لەلای مامۆستا عەبدوڵڵا هیرانی دیتبوو، ئەویش گوتبووی کتێبی چاکە و لە عەباس/م وەرگرتوە. بۆ رۆژی دواتر سەیفئەدین کە بەڕێوەبەری ئامادەیی و ناوەندی بوو لەگەڵ مامۆستا برایم/ی نوێنەری پەروەردەی هەولێر، من و محەمەد زاهیریان بانگی ئیدارە کرد و لەسەریان فەرزکردین کە نابێ بەندە وانەکانی کوردی و مێژوو بڵێمەوە، کە لە هەموو پۆلەکان دەمگوتنەوە. هەروەها مەحەمەد نابێ ئابووری لە قۆناغی ئامادەیی بڵێتەوە، وانەی ئایینی و عەرەبی و جوگرافیا و ئینگلیزییان بۆمان دانا، کە من وانەی ئایین و جوگرافیام بەرکەوت و مەحەمەدیش عەرەبی و ئینگلیزی پێ درا.

لێرەدا ئێمە لە خۆمان گەیشتین، زیاتر چالاکییەکانی خۆمان چڕتر کردەوە، پێوەندییەکانی خۆمان بە عەبدوڵڵا هیرانی پساند، بۆ خۆ گورگە نەکردن، لەگەڵ مەحەمەدیش ئەوەندە هاموشۆی یەکترمان نەدەکرد. بۆ پێشگرتن لە هەر چاودێریکردن، هەموو نامیلکەکان و بڵاوکراوەکەمان ناردە گوندی نازەنین و لەوێ شاردرانەوە. رۆژێک لەگەڵ مامۆستا حەسەن فەرج و مەحەمەد حسن لە کۆبونەوەی ژووری مامۆستایان ڕاپۆرتێکمان بۆ لقی ٢ و هێزی پێشمەرگە، بە تایبەت بۆ عەلی شەعبان/ی رەحمەتی نووسی. زۆربەی مامۆستاکان ئیمزامان کرد کە ئێمە ئامادەین دەست بدەینە چەک و بچینە

چیای سەفین بۆ بەرگریکردن. ئەوەبوو هەر ئەو سێیەمان سەردانی بارەگای هێزمان کرد و یاداشتەکەمان دایە دەستیان و بەگەرمی سوپاسیان کردین و گوتیان دوایی خۆمان وەڵامتان دەدەینەوە. لەو ماوەیەدا من لە پۆل و بەر لە دەستپێکردنی وانەکە، سەیرم کرد یەکێک لە قوتابییەکان بەدەمانچەوە هاتبووە پۆل و لەپێشەوە قاچی خستبوە سەرقاچی. دیاربوو کوڕی یەکێک لەو مەسئولانەی لقی پارتی بوو، شەرمی لە کەس نەدەکرد. من یەکسەر لەپۆل دەرمکردە دەرەوە.

پاش چەند ڕۆژێک ئەندامێکی لقی دوو، عەبدولواحید خۆشناو بە خۆی هاتە قوتابخانە و پاش کۆبوونەوەی لەتەک بەڕێوەبەر و نوێنەری پەروەردە، منیان بانگی ئیدارە کرد. عەبدولواحید خۆشناو بە زمانێکی هەڕاشاوی رووی لە من کرد، دوای هەندێ قسەفڕێدان، گوتی: دوای دوو ڕۆژی تر خۆت لەگەڵ ئەو مامۆستایەی دیکە دێنە لق و لێکۆڵینەوەتان لەگەڵ دەکەین!!! .

هەرگیز لەبیرم ناچێت، دوای ڕۆیشتنی ناوبراو، مامۆستایان حەسەن فەرج و مەحەمەد حسن و شەفیق هەڵوێستی جوامێرانەی خۆیان دەربڕی. مامۆستا برایم/ی نوێنەری پەروەردەیان ناچار کرد، کە نابێ عەباس بەتەنیا بچێ و ئێمەیش هەموومان لەگەڵ ئەو بۆ لێکۆڵینەوەکە دەچین، دەنا ئێمە چیتر دەرس ناڵێینەوە و هەر ئەمڕۆ خواحافیزیت لێ دەکەین بەرەو ناوچەکانی سەرکردایەتی شۆرش بەڕێدەکەوین.

ئەوەبوو بۆکاتی دیاریکراو، لە لایەن لقەوە ڕێگای ئەو چەند مامۆستایە درا کە لەگەڵ من بێنە دانیشتنی لێکۆڵینەوەکە. تەبیعی کاردۆ، یادی بە خێر، چاوورووی نەبوو بێت، تەنیا شێخ مەحەمەد وەک شاهید لەسەر من هاتبوو. دوای دانیشتن و قسەکردنی شێخ مەحەمەد،کە گوایە لەوەتەی من هاتوومەتە هیران هەر خەریکی بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی ماوتسی تۆنگ بوومە و هەوڵم داوە قوتابیانی ئامادەیی بەشداری لە چالاکی یەکێتیی لاوان نەکەن. ئیتر هەر ئەو باسی یەکێتیی لاوانی کرد، ئێمە هەر سێکمان؛ مەحەمەد حسن و حسن فرج و بەندە، شتەکانمان بە لایەکی دی قۆستەوە و هەموو پۆخڵەواتەکانیمان خستە روو، کە هەتا باسی دەست پاک نەبوونی لە سەرفکردنی بودجەی لقی هەولێرمان بە بەڵگە هێنایەوە. چونکە بە هەڵبژاردن هەردوو مامۆستایان مەحەمەد حەسەن و حەسەن فەرج ئەندامی لق بوون، بەڵام نەیاندەزانی پارەکان لەچی سەرف کراوە و بۆ کوێ چووە. شێخ مەحەمەد دەمی بوو بە تەڵەی تەقیو و گوتی: ئەوە من بۆ لێکۆڵینەوە لەگەڵ عەباس داوا کراوم، یان خۆم لێکۆڵینەوەم لەگەڵ دەکرێ! لێرەدا عەلی شەعبان هاتە ژوورەوە کە دانیشت و بۆیان باس کرد مەسەلەکە چییە، یەکسەر جوامێرانە گوتی: من زۆر سوپاسی ئەو مامۆستایانە دەکەم کە ئامادەیی خۆیان دەربڕیوە بۆ بوونە

پێشمەرگە و چوونە چیای سەفین. ناوی هەموومانی خوێندەوە، کە ناوی بەندە لەپێشی پێشەوە بوو.

هەروەها درێژەی بەقسەکانی داو گوتی: ئەوەی شتی قۆری لەسەر ئەو مامۆستایە گوتووە، بۆ خۆی شەکری شکاندووە، برۆن دەرسی خۆتان بڵێنەوە، ئێمە هەر مەمنوونتان دەبین، کە ئێوە هاتن لەژێر بوردومانی فرۆکە دا دەرس بە منداڵەکانمان دەڵێنەوە، هەتا منیش لەو ناوچەیە و لە ژیاندا بم، کەس ناتوانی تەماشاتان بکات. ئێمە ئەوانەی لەگەڵمان دانیشتبوون بۆ لێکۆڵینەوە، بەتایبەت واحید خۆشناو و شیخ مەحەمەد، ورتەیان لە دەم نەهاتە دەرەوە.

ئێمەیش بە سەربەرزی هەستاینە سەرپێیان و گەڕاینەوە قوتابخانە. بەڵام پاش هەفتەیەک تاقیکردنەوەی سەری ساڵمان لەبەر چڕی بۆردومانی فرۆکەکانی رژێم، بەزوویی بە قوتابییەکان تەواو کرد. هەموومان پەرتەمان لێ کرد و مامۆستایەکان زۆربەیان چوونە ناوچەکانی سەرکردایەتی شۆرش و رەوانەی ئێران کران، تاکو لە ئۆردوگاکان دەرس بڵێنەوە. بەندەیش مەودایەک لەسەر ئامۆژگاری نوێنەری کۆمەڵە، ئەرسەلان بایز لە ناوچەکە مامەوە و چووم لە گوندی نازەنین لەگەڵ مامۆستایەکانی ئەوێ دەژیام.

زۆرجاران لەگەڵ مامۆستا حەمەدەمین سەردانی دۆڵی سماقولی و گوندی سناوە و جەلی/مان دەکرد. دوا سەفەرمان لە ناوچەکەدا، کە دەمە دەمی هاوین بوو، سەرمان لە هاورێیەکمان بەناوی م. برایم فەقێ عەولا دا، کە لە گوندی کونەفلوسە بوو. هەر ئەو شەوە هەستمان کرد هەر پێشمەرگەیە پۆل پۆل بەرەو دۆڵی چیوە و بالیسان دەپەڕنەوە. بۆ بەیانی فەڕاشی گوندەکە هاتە لامان و گوتی، هێزی دەشتی هەولێر ناوچەکانی خوارەوەیان چۆڵ کردووە. ئێمە بە پەلە خۆمان کۆ کردەوە و لەگەڵ م. برایم بریاری ئەوەمان دا بگەڕێینەوە بۆ گوندی نازەنین و لەوێ مشورێک لە خۆمان بخۆین. لە رێگای گەڕانەوەدا لەناو چەمەکەی بەر گوندی نازەنین سەیرم کرد، کۆمەڵێک پێشمەرگە بە کەنار ئێمەوە رێدەکەن و یەکێکیان جانتاکەی منی بەکۆڵەوەیە، کە کۆمەڵێک شتی وردەواڵە و شەهادە و دەفتەری خدمەتی تێدا بوو، یەکسەر گوتم: کاکی برا ئەو جانتایەی من بۆ لە لای تۆیە؟! پێشمەرگەکە زۆر بەتورەیی لە منی ڕاخوری و گوتی، بێدەنگ بە، دەنا لێرە بە گولەیەک ساردت دەکەمەوە. تفەنگەکەی لە شانی هێنایە خوارەوە و ئێمەیش بە هەر سێکمان یەک دەمانچەمان پێ بوو، کە لە لای مامۆستا برایم بوو. منیش بە هەرزەکاری خۆم، هاوارم بەسەردا کردەوە و گوتم: لەبری بردنی جانتاکەم دەشمکوژی..! لێرەدا یەکێکیان کە فەرماندەیان بوو، گوتی: برا بە چی دەزانی ئەو جانتایە هی تۆیە؟ گوتم: برا

ئەگەر دەفتەر خدمەی منی تێدا نەبوو، ئەوجا بمکوژە..! ئەوەبوو مەسئولەکە جانتاکەی لە شانی چەکدارەکە کردەوە، کە مەیدانی لە من دەخواست و تەماشای کرد و گوتی: بەڕاستی خۆ ئەوە دەفتەر خدمە و شەهادە و کۆمەڵێ وردەواڵەی ئەو مامۆستایەی تێدایە..! ئیتر کۆمەڵێ جوێنی ناشیرینی پێدا و پێی گوت: من گوتم هەڕوو جانتای ژووری ئەو مامۆستایانەیش بهێنە..! من بەبێ کوشتن جانتاکەم وەرگرتەوە، ئەوانیش بە ملشۆڕی ڕێگای خۆیان گرت.

کە گەیشتینەوە نازەنین، سەیرمان کرد ژوورەکەی مامۆستایان، دەرگاکەی لە ڕێسمەوە دەرهێنراوە و کەلوپەلەکانیان هەموو تێکوپێک داوە. بەدوای شتی گرانبەها گەڕابوون و تەنیا جانتا بەرچاوەکەی منیان بە شتێکی گرانبەها زانیبوو و بێ ئەوەی سەیری ناوەڕۆکەکەی بکەن و بزانن چی تێدایە، بردبوویان. کەچی ئەویشمان لێسەندنەوە. خەڵکی گوندەکەیش پەشۆکا بوون زەندەقی ئێمەیشیان برد و دەیانگوت، دەبێ ئەو گوندە چۆڵ بکەن! ناچار هەر سێکمان خۆمان پێچایەوە، سەرەتای مانگی شەش بوو، دۆڵی نازەنین/مان بە جێ هێشت و بۆ شەو بەپشتی گوندی "کۆلکەڕەش"دا بەسەر "چیای هەورێ"دا کەوتین. شەوەکەی، تاشە بەردێکی گەورەمان دیتەوە، کە تا ڕادەیەک بەرز بوو، چووین لەسەری بخەوین، حەمەدەمین و برایم کردیانە دەمە دەم کە کامەیان لە ترسی مار لە ناوەندێ هەرسێکمان بخەوێ، لەو بینەوبەردەی ئەوان، ناوەندەکە بەر من کەوت و ئەوانیش هەر یەکەیان کەوتە پەرگەیەکەوە. بەیانی بەرەو ناوچەکانی سەرکردایەتی ڕێگامان گرت.

# ٢٣

دوای ئەوەی من بۆ ماوەیەک لە برادەرە مامۆستاکانم دواکەوتم، بۆ کاروباری ڕێکخراوەیی کۆمەڵە لە ناوچەکانی خۆشناوەتی مابوومەوە، کە گەیشتمەوە ناوچەکانی سەرکردایەتی و سەردانی پەروەردەی هەولێرم کرد، بۆ سۆراغی مامۆستاکانی هاوڕێ و چارەنووسی خۆم. هەموو مامۆستاکانی ئامادەیی هیران بۆ ئۆردوگای زێوە لە کوردستانی ڕۆژهەڵات ڕەوان کرابوون. منیش لەسەر ئارەزوی خۆمەوە، لە ڕێگای هاوڕێیانی کۆمەڵەوە، بە تایبەتی لەگەڵ شاسوار جەلال چووینە سەردانی دکتۆر کەمال مەزهەر، کە ئەو کات یاریدەدەری دارا تۆفیق بوو لە ئەمانەتی ڕۆشنبیری و لاوان، کە لە بەغدادیش

ساڵێک مامۆستای مێژوو بوو لە بەشی کوردی، ئاشنایەتیمان هەبوو. نیازی خۆم بۆ باس کرد کە بگوازرێمەوە ئەمانەتەکەی ئەوان و دوای چەند رۆژێک فەرمانی گواستنەوەم دەرچوو. لە ئێزگەی دەنگی کوردستان، لە بەشە کوردییەکەی سۆرانی کاری محریرم پێ درا. سەرەتا لەبن خیوەتەکانی ناوچەی ئازادیی نزیک بە حاجی ئۆمەران و دواتر لە کۆشکی سەلام لە چۆمان لە ژوورێک لەگەڵ برایان مەحەمەد زادە و ئەنوەر مەحمود جێگیر بووم.

چەند مانگێک بوو پەلاماری فرۆکە جەنگییەکانی رژێم ناوچەکەیان هەراسان کردبوو. زۆربەی کارمەندەکانی ئێزگەی دەنگی کوردستان بە تایبەت نووسەر و موحریرەکان، هەتا مەسئولەکانیش، بە هەزار و یەک بیانوو لە ترسی بۆردومانی فرۆکە، ئەو ناوەیان چۆڵ کردبوو و ئێمە چەند کەسێک مابووینەوە. ئەوەبوو من و ئەنوەر شاکەلی کە ژوورەکانمان لەتەک یەک بوو، هەردووکیشمان کۆمەڵە بووین، بگرە ئەنوەر بەرپرسی رێکخستنی من و چەند هاورێیەک بوو. هەردووکمان بەیەکەوە راسپێردراین بۆ کۆکردنەوەی ئەدەبیاتی پێشمەرگە و سەردانی ناوچەکانی سلێمانی و کەرکووک بکەین. لە سەرەتا هەریەکەمان لە رێگایەکەوە بە بازگەی شیوەرەشی پشت حاجی ئۆمەران بە پسولەی بارەگەی بارزانی ئاودیوی ئێران بووین. پاشان لە رۆژێکی دیاریکراودا لە شاری مهاباد یەکترمان گرتەوە و بە ماشێن گەیشتینە تەوێڵە و لەوێ لەنێوان خۆماندا، چۆنیەتی سەردانی هێزەکانمان دابەش کرد. ئەنوەر بەرەو ناوچەکانی گەرمیان و قەرەداغ و کەرکوک بەرێکەوت. هێزەکانی ناوچەکانی سلێمانیش بۆ من مایەوە. یەکێک لە سەردانەکانم بۆ هێزی رزگاری بوو لە سەرگەڵوو بەرگەڵوو. من دوو پێشمەرگەم لە تەک بوو کە لە هێزی خەبات بۆیان دانابووم. ئەو رۆژە بە تراکتۆر لەناوچەی سەرسیرەوە، کە دەکەوێتە پشتی چوارتاوە هاتینە گوندی مالومە و رۆژەکەی فرۆکە جەنگییەکانی رژێمی عیراق، ناوچەکەیان بە خەستی بۆردوومان کردبوو. ئێمە ئێوارەکەی لە هەڵەدنەوە بەرێکەوتین، گوایە بە چەند سەعاتێک دەگەینە گوندی سەرگەڵو، کە بارەگای هێزی رزگاری و ناوچەی هێز لەوێ بوو کە حەمەی حەمە باقی بەرپرسی بوو و پێشتر لەبواری ئەدەبیاتی کوردی چەند جارێک یەکترمان دیتبوو. بەتایبەت ئەوکاتەی ئەو لە دەورەی کادیران بوو لە ناوچەکانی سەرکردایەتی شۆرشدا، کە بەهۆی چەند برادەرێکەوە سەردانم دەکردن، یان ئەو دەهاتە کۆشکی سەلام لە چۆمان.

ئەو شەوە زۆر سارد بوو، بەفرێکی زۆری لێ هاتبوو، دونیایش ساماڵ بوو، هەمووی ببوو بە سەهۆڵبەندان، هەر چۆنێک رێمان دەکرد، خلیسمان دەبرد و شلپ بەردەبووینەوە، بەجۆرێک هەموو لاق و لاتەرێکمان داماڵابوو، زۆر بە زەحمەت بۆ

نیوەشەو گەیشتینە ناو گوند، بەڵام چ ناو گوند! لە هیچماڵێک و خانوویێک نوزەی ئاگر، یان چرایەک بەدی نەدەکرا..!

بە هەر شێوەیەک بوو، مزگەوتەکەی گوندمان دیتەوە. مزگەوت نە دەرگای پێوە مابوو، نە هیچ رایەخێکی لێ بوو. تەنیا دوو پارچە حەسیری وشکوبرینگی تۆزاوی لە دەوروبەری زۆپایەکی هێجگار زەلام هەبوو. دوو پێشمەرگەکە یەکێکیان کوڕی لادێ بوو، ئەوەکەی دیکە پۆلیس بوو، لە خۆم دەستوپێ سپیتر بوو. پێشمەرگە لادێییەکە زۆر گەڕا، تاکو چرایەکی فتیل سوتاوی دۆزییەوە و چەند پێمان دەکرد، پلپ دەکوژایەوە. توومەز هیچ نەوتی تێدا نەبوو. لەسەرمان هەرسێکمان هەڵدەلەرزین، بەناو ژووری مزگەوت هەروەلەمان دەکرد، بەڵام ورشەورشی بایەکە بە دەرگا گەورەکە دەهاتە ژوورەوە و بە یەکجاری کاسی کردبووین. من ئاگام لە خۆ بوو کە هەموو هەناوم هەڵدەلەرزی و قرچەقرچی ددانەکانم بۆ نەدەوەستا! یەکەمجارم بوو لە ژیان ئەو جۆرە سەرمایە ببینم، کە تەنیا دەستە جلێکی کوردیم لەبەر بوو، بەبێ ئەوەی پاڵتۆم هەبێ! رۆژانی دواتر سەرمام زۆر دیوە، مەگەر تەنیا سەرماکەی زێوەی مەرگەوەری کوردستانی رۆژهەڵاتی لێ دەرچێت، کە ڕەنگبێ لەوەی سیبیریا بکات، سەرمای ئەو شەوەی بەرگەلوم بیر ناچێتەوە.

ئەو پێشمەرگە پۆلیسە وەک پەروایەک، یەکێک لە حەسیرە تۆزاوییەکانی لە خۆی پێچا و پشتی دایە دیوارەکەوە و لێی راکشا. ئەوەی لادێییەکەیش هەر دەسوڕا و دەگەڕا، بەڵکو باوەشێ داری دەستکەوێ و زۆپاکە داگیرسێنێ و لەوسەرمایە دەرباز ببین..! بەڵام چەند هات و چوو، هیچی بەرچنگ نەکەوت، منیش هەستام پارچە حەسیرەکەی دیکەم لە خۆم لوول دا. هەستم کرد وەک بن میچی مزگەوت رووخابێت، ئاوا تۆز و خۆڵ بەسەرمدا باری، کەچی ئەمەیش دادی نەدام و هەستام کەوتمەوە پیاسەکردن هەتا سەعات دووی شەو. لەپڕ پیاوێک پەیدا بوو، لایتێکی بەدەستەوە بوو، تومەز لەتەک مزگەوت فڕنی نانکردن هەبوو کە سەرنجمان نەدابوو، کابرای نانەوا دەرگای فڕنەکەی کردەوە و چەند پرسیار و قسەمان لەگەڵ کرد، دەتگوت دەمی قفل دراوە، هیچ وەڵامی نەدایەوە. دیسان هاتینەوە ژووری مزگەوتەکە، من ئۆقرەم لەبەر بڕا و ژانە زگێکی سەیرم لەسەرمان گرت، دڵۆپ دڵۆپ فرمێسکی چاوەکانم دەهاتنە خوارەوە، هەستم بە گەرماییان دەکرد، کە بە لا رووومەتەکانم بەدەم ڕێچکە بەستنەوە، یەکسەر دەیبەست..! سەرما زۆری بۆ هێنابووم، پێشمەرگە لادێییەکە دڵی پێم سووتا، هات داینیشاندم، پشتی خۆی لە پشتم گیر کرد، لە هەناسەی گەرمی ئەو، هەندێک هۆشم هاتەوە بەر. دیسان دەنگی هەنگاو هەڵگرتن و دانان هاتە گوێمان، هەردووکمان یەک پێ تاومان دایە دەرگا، بەڵام ئەو لەبەندە چاپوکتر بوو، کە پێشتر لە رۆیشتنی ڕێگادا بە زەحمەت باری دەبردم! سەیرمان کرد پیاوێکی دیکە دەرگای

فڕنەکە دەکاتەوە. ئەوجارەیان پیاوەکە وەڵامی داینەوە و گوتی، گوند بەدەگمەن خەڵکی تێدا ماوە و هەموویان لە ترسی فڕۆکە بۆ بەرگەڵو باریان کردووە، تەنیا بارەگای ناوچەی هێز خەڵکی تێدا ماوە، بەڵام لێرە دوورە و لەو سەری گوندییە، لە پەنا کۆمەڵە گاشە بەردێکە، بەو شەوە بە ئێوە نادۆزرێتەوە! گوتمان ئەدی چی بکەین، خەریکە رەق دەبینەوە! گوتی برۆن لەو خوارەوە پیرەمێردێک هەیە، بارە دارێکی لێ بکڕن کە بە ٧٥٠ فلوسی دەفرۆشێ، ڕێگاکەی نیشانماندا.

دینار و نیوێکم دایە پێشمەرگەکە و بە چاوتروکانێک خۆی بزر کرد. منیش بە هەناسەساردی گەڕامەوە ژووری مزگەوتەکە، کابرای پۆلیس پرخەیەکی خۆشی دەهات، خۆزگەم بە گیانی خواست، نازانم چۆن لەو جێیە رەق نەبووەوە! لەو بیرانەدا بووم، پێشمەرگەکە یەک کۆڵەداری بەسەر شانەوە بوو و هاتە ژوورەوە. سەیرم کرد ئاگر بە چی بکەینەوە؟ چوومەوە بەر دەرکی فڕنەکە، دوای هەندێ تەقە تەق، کابرای دووەم دەرگاکەی کردەوە، فڕنەکەیان هەڵکردبوو، گەرەکم بوو خۆم باوێمە ئەو دیوو لەخۆشی ئاگرەکە قسەم بۆ نەکرا، بەڵام کابرا بەرزەفتی کردم و گوتی، هەرچییەک بێت، ناتوانم ڕێگات بدەم بێیتە ژوورەوە، چونکە بە فەرمانی فەرماندەی هێز کەس نایەتە ژوورەوە، تەنیا من و ئەو پیاوە کەڕە نەبێت کە هەویرەکە دەشێلێ، خێرا گوتم: بۆ ئاگر هاتووم، تاکو دارەکانی پێ ئاگر بدەین لەناو زۆپای مزگەوتەکە! هەندێ داری سوتاو و پەنگەری بۆ لەسەر خاکەناسێک دانام و دایە دەستم، بردم و سەرەتا ژوورەکەمان بە دووکەڵ قانگ درا، توومەز دارەکان تەڕ بوون، هەتا ئاگریان گرت، سەعات بووە چواری بەیانی، خەریک بوو دونیا برە برە ڕۆشن دەبووەوە و ئاگرەکەیشمان گرتی، بەڵام چ دەورێکی هەبوو لەو ژوورە لەندەهۆرە کە لە هەموو لایەکەوە دەلاقەی گەورەی تێدابوو.

هەر سێکمان ئەوەندە بەدەوری زۆپاکەوە نزیک بووین، قەستمان دەکرد بچینە ناوییەوە، جلەکانم لە چەند شوێنێکەوە سووتان، تاکو تۆزێک گەرم بوینەوە. لەو دەمەدا خەڵک پەیدا دەبوون، داوای نانیان دەکرد، دیار بوو هەر یەکەی چەند نانی دیاریکراوی خۆی هەبوو، بە جۆرێکی هێجگار زەحمەت، کابرای نانەوا سەرو نانی گەرمی داینێ کە هەر ئەوەتە کەلینێکی زگمانی گرت...! سەعات دەوری شەشی بەیانی بوو بەدوای سۆراغی بارەگاکەی "حەمەی حەمە باقی"دا چووین، پێشمەرگەکان هەستیان دەکرد، باری تەندروستیم روو لە خراپییە، منیان گەیاندە ئەوێ، هەر ئەوەتا قسەم بۆ دەکرا، خودا هەڵناگرێ پاسەوانی بارەگاکە گوتی، کاکە حەمە لێرە نییە، بەڵام مادام ڕەفیقی ئەوێ، بەخێر بێی سەرچاو. هەرسێکمانی وەرگرتەوە، ئێمەی بردە ژوورێکی گەرم و پۆشتە کە ژووری خۆی بوو، زۆپاکە زۆر بە خۆشی دەسووتا، ژوورەکەی لە جیهانێکی دیکەی

سەرما بوو. من هەر ئەوەتە دانیشتم و دانەنیشتم، لە بەرانبەر زۆپاکە راکشام و هۆشم لای خۆم نەما! کاتێک چاوم کردەوە هەر بەتەنیا لە ژوورەکە بووم، بەتانییەکم پێدادرابوو، بەڵام هەموو جەستەم لەناو ئازار هاواری دەکرد، لەگەڵ ئەوەیشدا، باش گەرم داهاتبووم، سەرلەنوێ ژانە زگەکەم هێرشی بۆ هێنابوومەوە و بە ناڵەناڵ دەرگاکەم کردەوە و سەیرم کرد، کەس بەدەنگمەوە نایەت، بە قوونەخشکە لە دەرگاکە چوومە ئەودیو، ناو هەیوانەکەوە، هەر کەس نەبوو، زاتیشم نەدەکرد، دەرگای دەرەوە بکەمەوە، بۆیە ئەوەندەی تاقەتم هەبوو، هاوارم کرد...! بەبێ ئەوەی کەس فریام بکەوی...!

لەوێ لە هەیوانەکە لە هۆش خۆم چووبووم...!! نازانم چەندی بردبوو! کاتێک چاوم کردەوە، دونیا تاریک ببوو، چرایەک لە ژوورەکە دەسووتا و زۆپاکەیش هەر نرکەی دەهات. لە جووڵە جووڵی من برادەرەکەی بەیانی هاتە ژوورەوە، پرسی، برسیت نییە؟ هەست بە چی دەکەی؟ ئەوە بۆ هاتبوویە ئەو هەیوانە ساردە! خۆ ئەگەر زوو نەهاتمایەوە، لەوێ رەق دەبوویەوە! تومەز دوای خەولێکەوتنی سەرلەبەیانی من، ئەو برادەرە بە پێشمەرگەکانی گوتوە با بەندە لە لای ئەوان بێت و پێشمەرگەکانی بردبوو بۆ بارەگای هێز لە بەرگەڵو. کە چوون و هاتنەوەکەی ماوەیەکی بردبوو و منیش لە حەژمەت ئازاری گیانم هەستابوومەوە، بەبێ ئەوەی بە هیچ شتێک ئاگاداربم! ئەو برادەرە نان و ماستی بۆ هێنام، زۆری لێ کردم کە تۆزێک بخۆم، بەدوای پزیشکی ناردووە، هابزانە دەرکەوتن. لەبیرم نەماوە چیم خوارد یان نا! پاش ماوەیەک پزیشکەکە هات کە کوڕێکی سەرقژن و ئیسک سووک بوو، زۆری پشکنیم و هەموو جلەکانی لەبەر کردمەوە، دەستە جلێکی پاکیان لەبەر کردم، دەرزییەکی لێ دام کە نازانم چی بوو، هەندێ حەب و گولاجیشی بۆ دانام کە هەتا چەند رۆژێک بیانخۆم، دەبێ بحەسێمەوە و سەرما بردومی! لەو گفتوگۆیە بووین حەمە باقی و مەفرەزەکەی هاتنەوە، کە منی بەو حاڵەوە دیت، زۆر دڵنەوایی کردم و منی بردە ژوورە تایبەتییەکەی خۆیەوە، پاش ئاگر کردنەوە و گەرمبوونەوەی ژوورەکە، شەویش ناوناوە دەهاتە سەرسەرم و لە ئەحواڵی دەپرسیم.

بەیانی رۆژی دواتر سەیرم کرد لاقەکانم جولەیان تێکەوتووە و دەمگوت، هەنووکە چاوم دەردەپەڕی!! لەو رۆژەوە چاوم کز بوو. پاش هەندێ چاکبوونەوە، کەوتنەوە سەر پێیان، پێشمەرگەکان لەگەڵ پزیشکەکە هەموو رۆژی سەریان لێ نەدەبڕیم، تاکو حەفتەیەک وام دەزانی هاتوومەتەوە سەرخۆ، داوام لە کاکە حەمە کرد، بەڵکو پێکەوە بچینە سەردانی فەرماندەی هێز کە ئەو رۆژە سیروان نەورۆلی بوو. بەیەکەوە چووینە بەرگەڵوو و ناوبراو پێشوازییەکی گەرمی لێ کردین، رێ و شوێنمان دانا کە سەردانی ناوچەکانی خوارەوە، پیرەمەگرون و دۆڵی چەمی ڕێزان بکەم. هەرکە لەو ناوچانە گەڕامەوە،

سەرماکە پەیدا ببووەوە، بە هەر شێوەیەک بوو خۆم گەیاندە پێنجوین و لەوێ لە ماڵی خاڵۆیەکی عەزیز مەحمود، نزیکەی چل ڕۆژان کەوتم، هەموو دەیانگوت دەمرم! بەڵام بەهۆی هاوکاری و یارمەتی خاڵۆی مامۆستا عەزیز و سەرپەرشتی پزیشکەکانی ئەوێ، کە بەداخەوە ناویانم لەبیر نەماوە، سەرلەنوێ بوژامەوە. گەڕامەوە ناوچەی چۆمان، ئەو دەمە دەنگۆی نسکۆی شۆڕش هەموو کونج و کەلەبەرێکی گرتبووەوە!.

# ٢٤

ڕۆژ کۆتایی مانگی شەشی ساڵی ١٩٧٥ بوو، کۆمەڵێ برادەر لە گازینۆی شەوانی هەولێر کۆ ببووینەوە و زۆربەمان ئەوانە بووین کە بەشداری شۆڕشمان کردبوو. لەناویاندا چەند دانەیەکمان ئەندامی کۆمەڵە بوون، وەک حەمەدەمین حوسێن، جەلال تاهیر و دڵشاد عەبدوڵلا، کە پێوەندی ڕێکخراوەیی هەموویان، بەمنەوە بوو و منیش هێشتا پەیوەست بووم بە شیرازەی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە بەغداد، کە تازە خوێندنی ساڵی کۆتایی کۆلێژم تەواو کردبوو. ئەو برادەرانەی دیکەیش بریتی بوون لە موحسین کەریم کە دۆستی گیانی بەگیانی هەموومان بوو و دواتریش هەر بووە کۆمەڵە، هوشیار فەتاح لە بازنە ڕۆشنبیرییەکان بوو لەگەڵ (پ.س.س) (ک.ج.م)، کە زۆربەی کاتمان بە تاوڵەکردن بەسەر دەبرد، یان لەناو خۆمان قسەوباسی هەرەسی شۆڕش و چارەنووسی خۆمان دوای تەسلیمبوونەوە بوو، کە هێشتا کەس نەگەڕابوەوە سەر ئیش و کاری خۆی.

جاروبار ئەرسەلان بایزیش دەهاتە لامان، بەڵام زۆرتر لەگەڵ دڵشاد عەبدوڵلا بوو. ڕۆژگارەکە تا بڵێی ناخۆش بوو و هەموو خەڵک کاس و بێ نموود بوو. لەو دەمەدا تەنیا ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە، کە لە شاخ گەڕابوونەوە، هێشتا تارادەیەک شیرازەی ڕێکخراوەیی خۆی لەدەست نەدابوو و زۆر بە نهێنی کارەکانی خۆی رادەپەڕاند. کۆمەڵێ برادەری تری گەڕاوەیشی وەک، کاردۆ گەلالی، جەمیل ڕەنجبەر و جاروبار مامۆستا سەعد، دەهاتنە هەمان شوێن. جارێک لەو جارانە، من هەر ئەو ڕۆژە لە بەغداد گەڕابوومەوە، بڵاوکراوەیەکی کۆمەڵەم پێبوو، بۆ ئێوارەکەی هاتمە ئەو گازینۆیە و لەگەڵ حەمەدەمین و جەلال یەکترمان دیت، قسەوباسەکانی خۆمان کرد و بڵاوکراوەکەم دایە م. حەمەدەمین کە لەگەڵ جەلال، دوایی بە نۆبەت بیخوێننەوە و ناوەڕۆکەکەی بۆ دۆست و بازنە ڕۆشنبیرییەکان باس بکەن. پاش مەودایەک ئەو ناوانەی لە پێشەوە باسم کردن، یەکە یەکە

پەیدابوون و لە دەورووبەرمان دانیشتن. بەبێ ئەوەی من پێی بزانم، کە لەگەڵ موحسین کەریم خەریکی تاوڵەکردن بووم، رۆژی پێشووتر (پ.س) و (م.ج) لەگەڵ حەمەدەمین تووشی شەڕە قسە هاتبوون و نەگەیشتبوونە یەکتری. وا پێ دەچوو ئەو ڕۆژە بۆ تۆڵەسەندنەوە، ئیهانە کردن و زیاتر تەنگاوکردنی حەمەدئەمین، کەوتنە پتک و پلار هاوێشتن. "پ.س" جوێنی پیس پیسی بە حەمەدئەمین دەدا و (م.ج)یش ئاگرەکەی خۆش دەکرد. من خۆم بۆ نەگیراو بە (پ.س) و (م.ج)م گوت، چییە دەڵێی بۆشەڕ هاتوون..!

لێرەدا (پ.س) زۆر بە دەنگێکی بەرز گوتی: ئەگەر هەر جۆرە پێوەندییەکی ڕێکخراوەیی نهێنیشتان هەبێ، ئێمە مەبەستمان تۆیشە، (م.ج) کە گوایە لە بازنە رۆشنبیرییەکانی لای جەمیل رەنجبەر بوو، کەچی نەیهێناو نەیبرد، گوتی، ئەدی عەباس مەسئولی هەمووانە، ئەوانە بەتەمابوون جێگای شۆرش بگرنەوە، چووبوونە ناوچەی ماوەت بۆ درێژەپێدانی شۆڕش، بەڵام دوایی هەر وەکو ئێمە تەسلیم بوونەوە. م حەمەد ئەمین/یش، گوتی: (م.ج) ئەو بوختانانە مەکەن، زۆرْ شورەییە بۆ تۆ شتی ناراست بۆ خەڵک هەڵبەستی! کەچی (پ.س) سەرلەنوێ کەوتەوە قسە گوتن بە حەمەدئەمین و ناچار منیش هەستام و داوام لە حەمەدئەمین و جەلال کرد، با بڕۆین، بۆ ئەوەی شتەکان نەگاتە لەیەکتردان. بەڵام (پ.س) لە جێی خۆی هەستایەوە و بە هەڕەشەوە رووی لە حەمەدئەمین کرد، دەزانم ئێوە چی دەکەن، خۆتان و ڕێکخراوەکەتان دەناسم. ئیتر حەمەدئەمین خۆی بۆ نەگیراو زلەیەکی راوەشاند بۆ (پ.س)، من نەمهێشت بەرێ بکەوێ. محسن کریم و هۆشیاریش کەوتنە نێوان و سەرزەنشتی هەردووکیان کردن، کە ئێمە رۆیشتین.. (م.ج) لەناو ئەو هەموو خەڵکەکە هاواری کرد: بە نیازی هیچ گەلەکۆمەیەک مەبن..! دەنا لە دائیرەی ئەمن چوغلتان دەکەین..! بەڵام ماڵیان ئاوابێت، دیار بوو هەر هەڕەشە و گوڕەشە بوو، بۆ ماوەی زیاتر لە هەشت ساڵان پێوەندیمان نەبوو.

هەر لە مانگی نۆی ساڵی ١٩٧٥ لە (مجلس الخدمه) لەگەڵ چوار دەرچووی "کۆلیجی ئادابی زانکۆی بەغداد/ بەشی کوردی" ناومان وەک مامۆستای ئامادەیی لە شارۆچکەکانی خوارووی عیراق دەرچوو بوو. ناوی من لە شارۆچکەی (علی الغربیه) بوو، کە چوومە ئەوێ بۆ دەست بە کارکردن، داوای تەزکیەی حیزبی بەعسیان لێ کردم و ناچار گەڕامەوە و بەدوابیدا نەچووم. هاتم بەیارمەتیی سابیر سلێمان کە ئەودەم سەرۆکی نەقابەی زراعییان بوو لە کۆمپانیای دواجنی شمالی، لە هەولێر.

لە ١٠/٢٥ - ١٩٧٥ بێ تەزکیەی حیزبیی وەک م. ملاحض دامەزرام. ئەرسەلان ئەو دەمە یەکێک بوو لە بەرپرسەکانی ڕێکخستنی ناو شار بەدوای جەعفەر عەبدولواحید و بە فەردی یەکترمان دەدیت. زۆری لەگەڵ هەوڵدام کە بەشداری کۆمیتەی ناو هەولێر بکەم.

من ماوەیەک بوو زۆر گەرم نەبووم، لە بەغداوە راپۆرتێکم بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵە نووسیبوو، لە رێگای ئەنوەر شاکەلی و حاکم برایم. رەخنەی خۆم هەبوو و چاوەڕوانی وەلام بووم. بەلام وەلام نەدرامەوە، گوتم جارێ با هەر بە فەردی بمێنمەوە و رێکخستنەکانی لای خۆمم پاراست و ئەوان زۆربەیان گیران و هەندێکیشیان دەرچوون و ئەو خەتەی ئێمە بەسەلامەتی مایەوە و دواتر رێکخستنی لەسەر بنیاد نرایەوە.

رۆژێکیان هەر یەک دوو مانگ بوو دامەزرابووم، تازە ئۆرزدی لە هەولێر کرابووەوە، قادر مەولوود، کە ئەویش لە دواجن فەرمانبەر بوو، لە دائیرە پێی گوتم، دوێنێ لە ئۆرزدی عەزیز محمودی دیوە و رایسپاردووە کە ئەمڕۆ پاش نیوەڕۆ یەکتر ببینن لە بەر دەرگای ئۆرزدی. کە بۆ وەعدەکە چووم، لەگەڵ جەمال رەش پیاسەیان دەکرد. بە دیداری یەکتری شاد بووینەوە و پێکەوە چووینە ماڵی ئێمە. ئەوان قەمەرەیەکی مارسیدس/یان پێ بوو. لە رێگادا هەواڵی تەسلیمکردنەوەی خاڵە شەهاب و هاوەڵەکانی لەلایەن ئێرانەوە بە عیراق پێ راگەیاندم، کە هەواڵێکی هێجگار ناخۆش بوو. ئەوان لەگەڵ خۆیان یەکەم بەیاننامەی دامەزراندنی (ی.ن.ک)یان هێنابوو، کە یەک لاپەڕە بوو. منیش دوای رۆیشتنی ئەوان و خوێندنەوەی بەیاننامەکە، لە گیرفانی پانتۆڵەکەم دانا، بەو نیازەی لە لای برادەرێک چەند دانەیەکی لە بەر بگرینەوە (بنووسینەوە)، چونکە نەمان دەوێرا لە هیچ شوێنێک کۆپی بکەین. ئەوە بوو بەبێ ئەوەی لە بیرم مابێت، بەیانی چوومە دائیرە و هەمان پانتۆڵم لەبەر بوو. پاش تەواو بوونی دەوام، نەگەڕامەوە ماڵ و بۆ سەعات ٣ ی عەسر چوومە بانقی رافدین، بەرانبەر یانەی کۆنی فەرمانبەرانی، کە رۆژی پێشووتر سلفەیەکی قەرزم کردبوو و دەبوو ئەمڕۆ بچم و وەریبگرم. منیش زۆر ئاسایی چوومە ژوورەوە، تەنیا یەک کەس بە جلی مەدەنی وەک من راوەستابوو، ئەویش دیار بوو مامەڵەی سلفەی هەبوو. من چەند راوەستام، کەس نەیگووت، ماڵت لەکوێ..! ناچار بە ئەسپایی بە یەکێک لە فەرمانبەرەکانم گوت، کە من هاتووم بۆ وەرگرتنی سلفەکەم، ئەویش بە دەست هێمای بۆ لای کوڕێک کرد کە بەدەم جگەرە کێشانەوە لەگەڵ ژنێکی فەرمانبەر قسەی دەکرد، پاش مەودایەک کاغەزێکی بۆ لای ئەو کابرایە هێنا کەوەک من لەوێ بوو، کابرا ئیمزای کرد و کاغەزەکەی بردەوە. من پێم گوت. برا ئەدی ئەو سولفەی من؟ یەکسەر وەک فیشەکە شێتە بەسەرمدا قیژاندی، جارێ راوەستە..! منیش خۆم بۆ نەگیراو گوتم، ئەوە بۆ دەڵێی شورتەی لەسەرم هاوار دەکەی..؟ لێرەدا ئەو کابرایەی تەکم وەک ئەوەی نەقیزەیان لێوە هەژاندبێ، لێم هاتە پێش و هەر ئەوها هەردووشانی گرتم.. گوتی هەی سەگی سەگباب لۆ شورتە خۆت و باوکت ناهێنی..! منیش ئەوەندەی هێزم تێدا هەبوو دەستەکانیم لەسەر شانی خۆم راتەکاند، هەتا زلە بگری لە بناگوێم قایم کرد. کابرا یەکسەر دەمانچەی لە بەر پشتێن، لەبن

چاکەتەکەی دەرهێنا و بە جوێن ڕووی لە من کرد و گوتی، یاڵڵا پێشم کەوە بۆ دائیرەی ئەمن..! من یەکسەر تەزوویەک لە تۆقی سەرمەوە هەڵیکرد.. هەموو جەستەمی ڕاهەژاند، مەسەلەی ئەو بەیاننامەم بیرکەوتەوە، کە هەتا ئەو دەمە گەرەکم بوو پردەمە دەستی و دەمانچەکەی لێ بستێنم. فەرمانبەرەکانیش هەموو بە حەپەساوی سەیری ئەو مانۆڕەیان دەکرد. قسەیەک لە من و یەک لەو، هەر لێم دەهاتە پێش، بەڵام من تازە دەستێکم کەوتوتە پێش و یەک لە پاش، هەر چییەکم بکردایە هەر بە زیان بۆ خۆم دەگەڕایەوە! لەو بێنەوبەردەی دێم و نایەم بووم، عەریف بەهرام، کە بەرپرسی پۆلیسەکانی بانق بوو، وەک فریشتە، هاتە ژوورەوە و چاوی بە من کەوت، کە دەیزانی من کوڕی کێم و پێشتر لایەنگری باڵی مەکتەبی سیاسی بووم. کە دیمەنی کابرای دیت دەمانچەی بەدەستەوەیەوە و خەریکە منی پێش خۆی دەدا، منیش هەمووگیانم بن ئارەقەی ترس و لەرز کەوتبوو، یەکسەر هاتە نێوانمان و دیار بوو ئەو کابرای پۆلیسی دەناسی کە شورتەی ئەمنی هەولێرە، گوتی بزانم مەسەلە چییە، ڕاوەستن شتەکە گەورە مەکەن، کابرا هەر ڕانەدەوەستا، منیش بڕە بڕە گەیشتبوومە لای دەرگاکە، بارام باوەشی بە ئەمنەکەدا کرد و دەمانچەکەی لە دەست وەرگرت، منیش بای غارێم پێوەنا و یەکسەر بەو کۆڵانەی لای حەسارەکان سەرکەوتم، جارێ زوو بەیاننامەکەم ونجڕ ونجڕ کرد و فڕێم دا و لەو سەری گەڕەکی جولەکان دەرچووم.

پاش چەند ڕۆژێکی دیکە بە لای سولفەکەمدا چوومەوە، باش بوو ئەو فەرمانبەرەی گۆڕین لەوێ نەبوو و کارەکەم بە زوویی جێ بەجێ بوو، چونکە نەیانزانیبوو من ناوم چییە و کامە مامەلە هی منە و عریف بارام/یش گوتبووی بابە من نەمویستوە لەناو بانق شەڕە دەمانچە بێت، چوزانم ئەوەکێ بووە!

بەدوای چەند ڕۆژێک، هەمان بەیاننامەم لە شەهید کاردۆ گەلالی وەرگرت، کە تازە پێوەندیمان پێکەوە پەیدا کردبوو، ئەو وەک بزووتنەوە و من وەک کۆمەڵە. ئەوجارەیان لە دوای لەسەر نووسینەوە و دابەش کردنی بەناو ڕێکخستندا، بە تەقەتی لە ماڵەوەم هەڵگرت.

# ٢٥

لە دووەم دیدەنیم لەگەڵ ئارام لەسەرەتای ساڵی ١٩٧٦دا، نامەیەکی پێچراوی دامێ کە بیگەیەنمە دەست حەمید باتاسی لە هەولێر، کە لەو دەمەدا لەگەڵ نورەدین کەرکوکی، لە

لۆقڵتەیەکی بچکۆلانە، لەپشت یانەی فەرمانبەرانی هەولێر و بەرانبەر بە بانکی رافیدین کرێکاری دەکرد. منیش کە گەڕامەوە هەولێر، پێوەندیم بە مامۆستا "یوسف دەرگەلەیی"یەوە کرد، لە من بەتەمەن تر و بەگونجاوترم زانی، کە بەیەکەوە بچینە لایان. چونکە ئەو هەم هەردووکیانی دەناسی و هەمیش لە من بە تەمەنتر بوو، گوتم نەوەک گومانم لێ بکەن و نامەکە وەرنەگرن!

لەبیرمە، دەوری سەعات یەکی نیوەڕۆ بوو و مامۆستا یوسف لە قوتابخانە هاتبووەوە، لەو نزیکان یەکترمان گرت و هاتینە بەرانبەر بانک. یەکێک لە فەرمانبەرەکانی ئەوکاتی بانکەکە هاتە دەرەوە، کە ناوی (ش.ا) بوو و هەر لەوبەری جادەکەوە چاوی بە مامۆستا یوسف کەوت وا لەگەڵ من بەرەو لۆقڵتەکە دەچین، وەک فیشەکە شێتە هاواری کرد: - یوسف، یوسف، ئەوە چییە واز لەو منداڵ و تارانە ناهێنی! بۆ بۆ خۆت خەریکی ماڵ و منداڵەکانی خۆت نابی! قەدری عافیەتت هێشتا وەرنەگرتوە! مامۆستا یوسف هەر حەپەسا و بە منی گوت، تەماشای ئەو پیاوە نامەردە بکە، چۆن پێمان دەوەڕی، ماوەی چەند مانگێکە نەمدیتوە، هەر بۆیەش حەزناکەم سەر و فەساڵی ببینم! بەحەق مامۆستا یوسف هەر بەسەر خۆیشی نەهێنا.

ئەوەبوو نامەکەمان دایە حەمید باتاسی، زۆری پێ خۆشحاڵ بوو کە چەند ڕۆژێک دواتر حەمید باتاسی گوم بوو، تومەز پێوەندی بە شاخ کردبوو. داخەکەم لە پەڕینەوەی سەر جادەی چۆمان- پردی زەرد کەوتبوونە بۆسەیەکی هێزەکانی رژێم و شەهید بوو. پاش یەک دوو هەفتەیش نورەدین یش لۆقڵتەکەی هەڵگرت و نازانم بە کوێ گەیشت!

گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتەم بۆ ئەوە گێڕایەوە، کە هاوڕێی دلێر، یوسف دەرگەلەیی دوای چەند ساڵی خەباتی ژێر زەمینی لەناو شاری هەولێردا، یەکێک لەو هاوڕێیانەی دەست و قامی لە خەباتی ناوشاردا دیاربوو، ڕۆڵێکی بەرچاوی هەبوو لە گەشەکردن و پێگەیاندنی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بەناو کۆمەڵانی خەڵکی شاری هەولێر، ناوچەکانی رەواندوز و دەوروبەری. مامۆستا یوسف دەرگەلەیی لەم پێناوەدا گیانی خۆی بە وڵات و نەتەوەکەی بەخشی، کەچی ئەو زاتەی لە رۆژە تەنگانەکانی ساڵی ١٩٧٦دا پتک و پلاری لێ دەدا، بەرهەمەکەی دەخوات و شاپ شاپانێ بە بەروبوومەکەی دەکات و خێزانی شەهید "یوسف"یش لەناو ئازار و نەخۆشی دەتلێتەوە و تەپ و تۆزی لەبیر کردنەوەی بەسەردا دەنیشێتەوە!

مامۆستا یوسف دەرگەلەیی نموونەی مرۆڤی دڵپاک و رەوشت بەرز بوو. دڵی زۆر بە خەباتی ڕێکخراوەیی کۆمەڵە خۆشبوو، بەبێ ئەوەی گوێ بدات بە پلەی خوێندەواری و ئاستی گوزەرانی ژیان بدات، لەگەڵ هاوڕێیە هەژار و کرێکارەکان تێکەڵ ببوو، پێش گیران

و شەهیدبوونی لەژێر ئەشکەنجەی دامودەزگای رژێمی گوڕبەگوڕدا، بەندە بە نهێنی دەژیام و جێگایەکی دیاریکراوم نەبوو. رۆژێکیان بە رێکەوت لە شەقامی کوران، لە تەکم رایگرت، بەزۆر سواری سەیارەکەی کردم و بۆ ماڵەوەی خۆیانی بردم، چەند رۆژێک بە نهێنی لە ماڵەکەیان مامەوە و زۆر قسەوباسمان پێکەوە کرد. چەند شەوێکیش حەیدەر چوکل، کە ئەودەمی بەرپرسی رێکخراوی ناو شاری کۆمەڵە بوو، بەشداری کردین، منیش"ئاڵای شۆڕش" بووم. بەڵام وەفاداری و باوەڕبەخۆبوون و یەکتر خۆشویستن ئەو سنوورانەی نەهێشتبوو. راستە هەردووکیان شەهیدبوون، کەچی دیسانەوە یەک گیانی کۆڵنەدان و رووبەڕووبوونەوەی ناخۆشییەکانیان فێری من کرد، کە هەتا لە ژیان ماوم، یادیان بەرز رادەگرم.

# ٢٦

سەرەتای ساڵی ١٩٧٦ بوو، شارێکی گەورەی وەک هەولێر دەتگووت، دۆ و خۆڵی بەسەردا کراوە. دام و دەزگا سەرکوتکەرەکانی رژێم، لە هەموو لایەکەوە خەریکی کۆنترۆڵکردنی ناوچە شاخاوییەکانی کوردستان بوون. گردۆلکە و لوتکە شاخ نەمابوو، بەتایبەت دەوروبەری رێگا، جادەکانی هاتووچۆ و شار و شارۆچکەکان هەموویان کردبوە تەپۆڵکە و رەبایە و بازگەی سەربازی. بەدەیان و سەدان ئۆردوگای سەربازی لە پانتایی خاکی کوردستان رایەڵ کرابوو. لە لایەکی دیکەوە شیرازەی رێکخستنەکانی خودی حیزبی بەعسیان گەیاندبووە ناو هەموو قوتابخانە، گوند و ئۆردوگا زۆرەملییەکان و بگرە تێکڕای شارەکانیان تەنیبووەوە.

لێرەدا جێگای خۆیەتی، ئاماژە بەوە بکەم، تاکە رێکخستنێک کە نوزەی تێدا مابوو، بۆ بەرگریی شاڵاوی بە بەعس بوون، کۆمەڵە بوو. هەرچەندە بەدوای هەرەسی شۆرشی چەکداری ئەیلول، سەرکردایەتی کۆمەڵە بەر لە رۆیشتنەکەیان بەرەو ئێران، لە لایەن خۆیانەوە بەیاننامەیەکی کز و ئاست لاوازیان بڵاو کردەوە. کە هاورێیانی، کۆمەڵە بۆئەوەی ئاشکرا نەبن و نەگیرێن، با بەرانبەر بە فشاری حیزبی بەعس لە فەرمانگە و دەزگاکانی مەدەنی نەرمی بنوێنن، کە ئەوەش زۆرتر لەژێر کاریگەری ئەو تەوەرە ئاشتی و ریفۆرمخوازەی هەندێ لە سەرانی شۆرشی ئەیلول بوو، کە گەڕابونەوە سێبەری رژێمی عیراق و خەریکی مانۆڕکردن بوون لەگەڵ رژێمی بەعس، بەو نیازەی حکومەتی بەعس

ئاوڕیان لێ بداتەوە و وەک نوێنەری کورد مامەڵەیان لەگەڵ بکات! هەر ئەوانەیش بوون، بزووتنەوەی سۆسیالیستی کوردستانیان دامەزراند، بەڵام بەعس ئەوەندە لووت بەرز و مەغرور بوو ئاوڕی لە کەس نەدایەوە. سەرکردایەتی ئەوده‌می کۆمەڵەیش، زۆرتر لەژێر کاریگەریی تیورە سێ جیهانییەکەی ماوتسیتۆنگ بوو، کە ناکۆکییەکی ناوخۆ لاوەکییە و تەنیا ناکۆکی سەرەکیمان لەگەڵ ئیمپریالیزمە.

ئەوەی من پێی بزانم، لە هەموو لایەکەوە بە کۆی دەنگ، بەوپەڕی نارەزایی ناوەرۆکی ئەو بەیاننامەی سەرکردایەتی کۆمەڵەیان رەتکردبووەوە. کۆمەڵە دوای گیرانی سەرکردایەتیەکەی لە لایەن رژێمەوە، بە دەستپێشکەریی ئارام و دەیان لە هاوڕێ چاونەترس و گیانفیدایەکانی ئەوێ رۆژێ، سەرلەنوێ کەوتەوە خۆ ئامادەکردن و بگرە سازدان و ناردنەدەرەوەی مەفرەزە سەرەتاییەکانی جاڕدانی سەرلەنوێی خەباتی چەکداری، کە لە سەرەتاوە زۆرتر بە مەبەستی خۆ ئامادەکردن و زەمینە خۆشکردن بوو بۆ دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری، بەتایبەت پێش کۆتایی ساڵی ١٩٧٥ دەیان هاوڕێی کۆمەڵە هەبوون کە لە گیران و ڕاوەدوونانی دەزگاکانی رژێم دەرباز ببوون، و بە نهێنی لە شار و ناوچەکان خۆیان حەشاردابوو.

لەوێ رۆژگاردا، بارودۆخی خەباتی سیاسی هێجگار دژوار و پڕ مەترسی بوو. بەزۆریش لەبەر ئەوەی خەڵک بەگشتی، توێژ و توخمە خوێندەوارەکان بەتایبەتی، بە یەکجار چۆکیان دادابووەوە و مەعنویاتی ئەو خەڵکە لەسەر چۆکان دەخشا. بە دەگمەن نووسەر و هونەرمەند و خەڵکی خوێندەوار و رۆشنبیر مابوون ئاڵای سپییان بۆ بەعس هەڵنەکردبێ. ئەوانەیش کە بەراستی مرۆڤی خاوەن هەڵوێست و خۆراگر بوون، متمانە و باوەڕیان زۆر لاواز ببوو، بەتایبەت هێشتا ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی عێراقی لە سێبەری سەرکردایەتییەکەی خۆیاندا بە هەموو جۆرە ملکەچی و سەودایەک لەگەڵ رژێم بەردەوام بوون.

بەجۆرێک لەو زەمان و زەمینەدا، خوێندەوارەکانی کۆمەڵی کوردی بەگشتی، نووسەر و هونەرمەندەکان بەتایبەتی، بۆ هەندێ دەستکەوتی ماددی و پاراستنی ژیانی خۆیان، لە پێشەوەی هەموو چین و توێژەکانی دیکەی کۆمەڵ بوون، بۆ پێشوازیکردن و دەستەشایی گرتنی هەڵپەرکێی بەزموڕەزمی هەڵپەرستانە، خۆشکردنی دڵی رژێم و بەشداریکردن لە هەرای دەستەمۆکردنی رۆڵەکانی نەتەوەکەمان بۆ بوون بە بەعسی، جیش شەعبی و هەتا سیخوری کردنیش. دیارە تاک و تەرا بەشداری هەرجۆرە چالاکی و خۆ تێوەردانێکی دام و دەزگای رژێمیان نەدەکرد و خۆیان دوورە پەرێز گرتبوو.

لەو ئاووهەوایە تەم و مژاوییە خنکێنەرەی خەباتکردن و بەرخۆدان، هاوڕێ جەربەزەکانی کۆمەڵە لە شاری هەولێر و دەوروبەریدا، بە پێچەوانەی هەر جۆرە بیروڕایەکانی هاوکاریکردن لەگەڵ ڕژێمدا، گیانی خۆیان خستبوە سەر دەستان و فیداکاریان نواند و سەرەتایەکی نوێی تێکۆشانیان خولقاند. چەندان ڕۆڵەی کۆمەڵە هەتا لە زیندانیەکاندا، بەوپەڕی قارەمانی و نەبەردییەوە ڕووبەرووی ئەشکەنجە و ئازاردانی دڕندانە ببوونەوە و بە بڕوایەکی پۆلاییەوە نهێنییەکانی کۆمەڵەیان لە یەکجارەکی دارمان پاراست، لەناویاندا یەکەم نموونەی قوربانیدانی کرێکاری شۆرشگێر عوسمانە گچکەڵ هەبوو، کە بە گیانبەختکردنی خۆی ئەو ڕێبازە شۆڕشگێرییەی زیندوو ڕاگرت.

ئەو ڕۆژە، واتە سەرەتای ساڵی ١٩٧٦ بوو، دەیان هاوڕێی کۆمەڵە لە هەولێر گیرابوون، شیرازەکانی ڕێکخستنی پەرش و بڵاو ببوەوە. هێڵەکانی ڕێکخستن و کۆمیتەی هەولێر لەیەک ترازا بوون و چەند هاوڕێیەک دابڕابوون. لێرەدا جێگای خۆیەتی وەک مێژوو شایەتی بە ڕۆڵی جوامێرانە و شۆڕشگێڕانەی نەمر سەعدی خەلیل بە نازناوی (سیروان) بدەم، کە بەدوای ئەو کارەساتەی ڕێکخستنەکانی هەولێر تووشی هاتبوون، ئەو کەڵە پیاوە لەگەڵ نەمر و کادیری ماندونەناسی پێشمەرگایەتی، شەهید مەلا غەفور لەناو شاری هەولێر لە لایەن خۆیانەوە، لەپاڵ هێڵە شاراوەکانی دیکە، کە بەیەکترییان نەدەزانی، ئەوان خەریکی سەرلەنوێ بووژانەوەی ڕێکخستن بوون. بە هەستێکی پیرۆز و دڵسۆزییەکی ڕچەشکێن درێژەیان بە خەبات دا. یەکەم بناغەی سەرلەنوێی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەیان لە هەولێر خستە دەمی گاگۆڵە کردنەوە. ئێستاکەیش بە بیرمە ڕۆژانە بۆ یاری شەترنج، دوای دەوامی دائیرە، دەچوومە چاپخانەکەی عەبۆ، لە نزیک قەڵای هەولێر. هەموو جارێ سەعدی خەلیل بەتەنیا، یان لەگەڵ مەلا عەزیز دەهاتن و پێکەوە هەندێ قسەمان دەکرد، بەڵام قسەکانمان زۆرتر قسەی گشتی بوون. من و سەعدی لە ڕۆژانی ساڵی ١٩٦٩ ـەوە یەکترمان دەناسی، کە ئەو دەم، من لە قوتابیانی سەر بە باڵی (م.س) و سەعدی/ش لە قوتابیانی سەر بە باڵی بارزانی بوو. بەڵام هەمیشە نێوانمان خۆش بوو، ئەو بەو ڕاستیەی دەزانی کە ئێمە لە خەبات و چالاکی ئەوانمان چاو دەپۆشی، هەرگیز ئامادە نەبووین بۆ دەزگاکانی ڕژێم دەستنیشان و ئاشکرایان بکەین، سەرباری ئەوەی باڵەکەی ئێمە لەگەڵ حکومەت بوو. ئیتر ئەو ڕیز و خۆشەویستییە لە نێوانمان جۆرە وەفا و ڕاستگۆییەکی هاوڕێیانەی لە نێوانمان دروست کردبوو. تاکو ڕۆژێکیان سەعدی نامەیەکی سالار عەزیز، کە پێشمەرگە بوو لە شاخ و لە سەرکردایەتی کۆمیتەی هەرێمەکان بوو، بۆ هێنام و سالار لە سەرەتای ساڵانی ١٩٧١ – ١٩٧٢ لێپرسراوی

شانەکەی ئێمە بوو لە زانکۆی بەغداد، بەبێ ئەوەی بەوە بزانێ، کە من و هەندێ هاوڕێ لە هەولێر خەریکی ڕێکخستنی خۆمانین و ڕاستەوخۆ پێوەندیمان بە "ئارام"ـەوە هەیە.

منیش بەبێ ئەوەی لە سەرەتا بچمە ژێرییەوە، نکۆڵیم کرد و پێم گوت، من ڕیزم بۆ سالار هەیە، بەڵام بەڕاستی نامەوێ بەشداریتان بکەم، چونکە گومانم هەیە لەناوتان خەڵکی گومانلێکراو هەبێ...! سەعدی خەلیل زۆر ڕاشکاوانە قسەی لەگەڵ کردم و ئەگەر من پەیمان بدەم بۆ هاوکاریکردنی، ئامادەیە هەموو شیرازەی ئەو ڕێکخستنانەم لەگەڵ باس بکات کە خۆی و مەلا عەزیز گرتویانەتەوە. بەدوای چەند مانگێک ڕۆژێک سەعدی خەلیل منی بردەوە ماڵی خۆیان لە گەڕەکی سێتاقان، کە تازە خانوویکیان بۆ خۆیان تەواو کردبوو و کوردەخانی هاوسەری لەماڵ نەبوو. سەعدی تێکڕای ناوی هاوڕێیانی خستە بەردەمم، کە زۆربەیان لە دائیرەکانی کشتوکاڵ فەرمانبەر بوون، لەگەڵ چەند مامۆستایەکی سەرەتایی،کە بەداخەوە ناوی هەموویانم لەبیر نەماوە، بەڵام هەرە دیارەکانیان، ئەمانە بوون: بەهرۆز قەشقە، حاجی ئەکرەم، فوئاد قەشقە، دلێر مەلا شینە، سەفینی مەلاقەرە، مەلا عەزیز، مەحەمەد جواد، خدر، بێستون، سەردار،.... هتد

سەعدی هەموو شتەکانی خۆی لە لای من درکاند، بەبێ ئەوەی داوای هیچ لە من بکات، چونکە بڕوایەکی لەبننەهاتووی بەمن هەبوو. چەند جارێکیش بەیەکەوە سەردانی مام "مەلا شینە و غەوسە"مان کرد، کە ئەویش چەند هەوادار و دۆستێکی هەبوو، کە دواتر بۆ ناو ڕێکخستنەکانی هێڵی یەکێتی نیشتمانی کوردستان سوودیان لێ وەرگیرا.

لەو ڕۆژگارەدا، یەکێک لە خۆزگە و هەوڵدانە بەردەوامەکانی هاوڕێیانی تازەدەرچووی شاخ، ئەوە بوو، کە هەمیشە و هەموو جارێ سوور بوون لەسەر ئەوەی هەندێ لە هاوڕێیانی شار بۆ شاخ بنێرین بۆ پێشمەرگایەتی لە ناوچەکانی هەولێر. کە بەندە زۆر دژی ئەوکارە بووم، چونکە هێشتا کۆمەڵە لە هەولێر خۆی نەگرتبووەوە.

لە سەرەتای مانگی ٦ بوو، بەمەبەستی تەنیا هاوکاری کردن و ڕێکخستنی کارەکان بۆ دروستکردنی کۆمیتەیەکی دیاریکراو لەپێناوی سەرپەرشتی کردنی ڕێکخستنەکانی لای ئەو دوو هاوڕێیە، کە ئەگەر هەڵە نەبم، مەلا بەختیار هاتبووە .شار و ئەوانی دیتبوو، پێی گوتبوون، با پشت بە (من) ببەستن و ڕێکخستنەکانی خۆیان تەسلیم بە من بکەن، بەبێ ئەوەی هەوڵ بدات خۆم ببینێ، دوایی بۆم دەرکەوت، چرپەیەکی لە ئارام بیستبوو سەبارەت بە بەندە.

ڕۆژێکی هاوین بوو لەگەڵ هەردووکیان سەعدی خەلیل و مەلا عزیز دانیشتم و لەوانم بیست کە ئەوان زۆرتر لە ڕێگای ئەوبرادەرانەی لە تەنزیماتی کۆنی کۆمەڵە ئیعترافییان لەسەر کراوە، بەڵام بەردەست ڕژێم نەکەوتون و لە دەرەوە پێشمەرگەن، وەک عەلی

سالح، شاخەوان، ڕێباز، مەحەمەد عەجەم و هەمزە عوسمان. چەندانی دیکە. بەداخەوە لەناو ئەو هێڵەدا چەند گومانلێکراوێک هەبوون کە دواییەکەی بوونە مایەی سەرتێداچوونی بەخۆرایی مەحەمەد عەجەم لە گۆڕستانی باداوان و هەمزە عوسمان لە ئاقاری گوندی قۆریتان، کە ئەو گومانلێکراوانە خۆیان لە پێشتر تەسلیم بە ڕژێم ببونەوە و تەپکەیان بۆ ئەوان دانایەوە و شەهید بوون.

هەردووکیان دوو ڕۆڵەی پڕ لە ئازایەتی و کوڕی ڕۆژی تەنگانە بوون. زۆر بەزوویی شەهید بوون و بۆشاییەکی گەورەیان بە جێ هێشت. تەنیا عەلی سالح و چەند هاوڕێیەک مابوونەوە، کە بە ژمارە پەرتەوازە و کەم چالاکی بوون، لەپاڵ ڕێباز، شاخەوان، سامی، سەردار، نەریمان. ئەوانە لەناو هێزە زۆر و زەبەندەکانی پێشمەرگەی بزووتنەوە لە ناوچەکانی هەولێردا وجودیان زۆر لاواز و کزبوو. پێوەندی ئەو هێڵەی شار بە ناوەندیی کۆمەڵەوە لە ڕێگای ئەو برادەرانەوە بوو. یەکەم شتێک بۆ پاراستنی ڕێکخستن و خۆیان من لەسەرم فەرز کردن، ئەوە بوو، کە هەموو جۆرە پێوەندییەکیان بەو برادەرانەی دەرەوە بیڕن.

لەو ڕۆژگارەدا، ئەو هێڵە ڕێکخستنەی ڕاستەوخۆ ئێمە لەناو شاری هەولێر کارمان تێدا دەکرد، لەگەڵ نەمران کەریم ڕەسول و یوسف دەرگەلەیی، سدیق ڕەنجبەر و م. حەمەدئەمین بوو. نەمر شەهید زریان (جەمال) لە دەوروبەری سۆران و چۆمان و ڕەواندوز، مەهدی کاوانی لە ناوچەکانی خۆشناوەتی (هیران و شەقلاوە و کاوانیان) خەریکی دامەزراندنی ڕێکخستنێکی پۆلایین بووین، بەهاوکاری و ئامادەیی گیانفیداکارانەی ئەو هاوڕێیانە، بەراستی سەرەتای ئەو ڕێکخستنە دامەزرا، چونکە هەر یەک لەو هاوڕێیانە چەندان شانە و بازنەی ڕۆشنبیری پێکەوە نابوو، کە ئەو کات دەبوو هەموو هاوڕێیەکی کۆمەڵە بەو بازنە ڕۆشنبیرییانە تێپەڕێت ئەوجا دەبووە هاوڕێی کۆمەڵە.

پاش حوکمدانی هاوڕێیانی کۆمەڵە لە زیندانەکانی ڕژێم لە بەغدا و کەرکووک و گواستنەوەیان بۆ زیندانی (ئەبو غرێب) لە بەغداد هەر بە خۆم چوومەوە سەردانیان، کە هێشتا تێکۆشەران (خاڵە شەهاب و م. جەعفەر و زۆراب) لە سێدارە نەدرابوون و زۆربەمان چاوەڕوانی ئەوە بوو، کە فەرمانەکە جێ بەجێ ناکرێت، بەڵام دوایی بەزوویی لە سێدارە دران.

لە سەردانێکی زیندانی ئەبو غرێبدا، ئەرسەلان بایز ناوی سەید برایم غەفوری پێدام لەگەڵ ناوە نهێنییەکەی، کە ماوەیەک بوو لە ڕێکخستنەکان دابڕابوو. دوای گەڕانەوەم ڕۆژێکیان هاوڕێیانی سلێمانی لە ڕێگای یونس، کە سەرپەرشتی گەراجەکەی شەهید جەماله ڕەشی دەکرد، جوابیان بۆ ناردم و چوومە سلێمانی. لە ناو شار چاوم بە ئارام

کەوتەوە و رەزامەندی خۆیان نیشان دا کە ئێمە لەگەڵ هاوڕێیانی سەعدی خەلیل بەیەکەوە کۆمیتەیەک دروست بکەین. لەوێ من بە باشم زانی کە سەعدی خەلیل لێپرسراوی یەکەم بێت و گفتم بە (ئارام) دا هەموو کارئاسانی و هەموو هاوکارییەکی بکەم، بەبێ ئەوەی ڕێکخستنەکانی خۆمانی لە لا ئاشکرا بکەم. ئارام چەند نامەیەکی دامێ کە دووانیان بۆ دوو دەوڵەمەندی کورد بوون لە بەغداد، "خەسرۆ تۆفیق" و ئەوی دیکەیانم لەبیر نەماوە و لەگەڵ نامەیەکی دیکە بۆ تێکۆشەری ماندونەناس سەید مەجید، کە وابزانم لە لای "مام جەلال"ەوە هاتبوو.

هاتمەوە هەولێر و ماڵەکەی سەید مەجیدم دۆزییەوە و نامەکەم داێ، ئێستاکەیش بە خۆی روداوی چونە ماڵیان و دەرچوونەکەم بە سەرسورمانەوە دەگێڕێتەوە. هەر لە ڕێگای ئەویشەوە توانیم سەید برایم بدۆزمەوە، کە ئەو دەم لە گوندی "عارەب کەند"ی شەمامک مامۆستا بوو.

# ٢٧

لەگەڵ برایم سەید غەفور بەدوای یەکتر دیتن و ناسین، بەماوەیەکی کورت، نێوانمان زۆر گەرموگوڕ بوو. ئەو وەک هەر مرۆڤێکی تامەزرۆ بە خەبات و قوربانیدان، زۆر بە گوڕ و تاو بوو، بە هەستێکی جوامێرانە و چاونەترسانە ئامادەیی خۆی بۆ سەرلەنوێ گرێدانەوەی شیرازەکانی ڕێکخستن دەربڕی. بەپەرۆشەوە لە هەوڵدان بۆ سەرلەنوێ دارشتنەوە و پتەوکردنەوەی ریزەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵە لەناو شاری هەولێر و دەوروبەر و ناوچەی بادینان، مەخموور و کەندیناوە و شەمامک کەوتە چالاکی، چونکە لای ئەویش هێڵێکی ڕێکخستنی کۆمەڵە هەبوو پێوەندی هاوڕێیانەی خۆیان نەپچراندبوو. لەناویاندا چەندان ئینسانی سەربەرزی لە نموونەی شەهید کاوە، بکر، سیفئەدین و حوسێن، شەهید ئەیوب عارەبکەندی، مەجید کاکۆ و چەندانی تر هەبوون.

برایم غەفور کوڕی رۆژی لێقەومان بوو، بە هیمەت و نهێنیپارێز بوو، ڕۆڵێکی دیاری هەبوو لە گەشەکردن و نەشونماکردنی ریزەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانی کوردستان لەو ناوچەیەدا. زۆر کاری ڕێکخستنی لە ئەستۆ گرتبوو، هەتا لە بواری پێوەندیکردن و هاوکاریی ڕێکخستنی بۆ هێزی پێشمەرگەی یەکێتی لە ناوچەکەدا، چەندان جار گیانی خۆی خستۆتە مەترسییەوە و کارەکانی بە سەرکەوتویی ئەنجام داوە.

سەرەتای ساڵی ١٩٧٧ بوو، ئێمە لەلای خۆمانەوە بە ئاگاداری ئارام کۆمیتەیەکی پتەو و تۆکمەمان لەناو شاری هەولێردا، لە ، برایم، سدیق رەنجبەر و بەندە پێکهێنابوو، کارەکان بەوپەڕی گیانی هاوڕێیانەی پڕ لە لەخۆبوردەیی، قوربانیدان ئەنجام دەدران. من لەلای خۆمەوە سەرپەرشتی چەند لێژنەیەکی سێ کەسیم دەکرد و درێژەمان بە خەبات دەدا. لە نموونەی ، کەریم رەسول، سابر رەسول، دکتۆر مەجید عەولا کە بەرپرسی رێکخستنەکانی کۆمەڵە بوو، لە "زانکۆی موصل" و هەروەها چەند هاوڕێیەکی کرێکار لە نموونەی عومەری چاپخانە، رۆستەمی بیرهەڵکەن، حامید فەرحان/ی کرێکاری شارەوانی. پاشان هەر بەتەنیا چەند هاوڕێیەکی دیکەم دەبینی لە نموونەی یوسف دەرگەلەیی، کە هێڵێکی رێکخستنی گورجوگۆڵی هەبوو و هەمیشە پیتاک و ئابوونەوەیان لە هەموو هێڵەکانی تر زیاتر بوو، زریان جەمال بۆ بەڕێوەبردنی رێکخستنەکانی سۆران، چۆمان، رواندز و دەوروبەرەکانیان، فریاد محێدین لە بەغدا، کە سەرپەرشتی هێڵێکی دەکرد لەناو شاری بەغداد و زانکۆی بەغدا. ئەوانەی دیکەش هەریەکەیان لەلای خۆیانەوە سەرپەرشتی چەندان خەتوختوتی رێکخستنەکانیان دەکرد.

ماوەیەک بوو، بە هۆی سەرقاڵیی من بە کاروباری فەرمانبەرییەکەم و سەفەرکردنم بۆشاری بەسرا، لە سەعدی خەلیل دابڕابووم، چونکە سەفەرەکەم بۆ شاری بەسرا دوو مانگی پێچوو. لەبیرمە ئەو رۆژەی گەیشتمەوە ماڵ، دایکم یادی بەخێر هەر لە بەر دەرگا پێی گوتم، کوڕم ئەو کوڕە باریکەڵە، چەند جارێک هاتووە و سۆراغی پرسیوی، رایسپاردووم، پێت بڵێم، زۆر بەپەلە و بە زوترین کات پێوەندی پێوە بکەی. ئەوەبوو پاش دانانی کەلوپەلەکانم، لەگەڵ رۆستەم کە بۆ پاش کاری دائیرە، تاکسیەکی کرییبوو و زۆربەی کارەکانی "کۆمەڵە" مان لەناو شار و دەوروبەردا، پێڕادەپەڕاند. بەیەکەوە چووینە نزیک ماڵەکەی سەعدی خەلیل، هێشتا دونیا رووناک بوو لە دەرگای ماڵەوەیانم دا، هاوسەرەکەی دەرگای لێ کردمەوە، یەکسەر گوتی: تۆ "عەباس"ی! گوتم: بەڵێ. گوتی زوو لێرە برۆ، خۆم هەواڵی دەدەمی کە پێوەندیت پێوە بکات. دیار بوو دائیرەی "ئەمن"ی هەولێر هاتبوونە سەر ماڵەکەی و بە رێکەوت لە ماڵ نەبووە و بەئاسانی رزگاری ببوو.

هەر بۆ شەوەکەی سەعدی خەلیل کە دیار بوو لە ماڵی مەلا عەزیز بوو، خۆی گەیاندە من. هەموو رێکخستنەکانی لای خۆی تەسلیم بە من کرد و نهێنییەکانی هەمووانی بە جێ هێشت. هەر لەوێ رۆژێوە، مەلا غەفوری بە من ناساند و لەسەر ئەوە رێککەوتین کە ناوبراو بکرێتە ئەندامی کۆمیتەی ناو شار لەگەڵ هاوڕێیانی دیکە. ئەوە دواجار بوو لەگەڵ سەعدی خەلیل یەکتر ببینینەوە. زستانی ساڵی ١٩٧٨ بوو، بۆ پێشمەرگایەتی چووە شاخ و

دوایی لە هاوینی ساڵی ١٩٧٩ لە بناری کۆسرەت لە شەڕێکدا بەرانبەر هێزەکانی رژێم شەهید بوو و نەمدیتەوە.

سەعدی خەلیل، کە لێپرسراوی هێڵێکی پاشماوەی رێکخستنەکانی کۆمەڵەی ناو شاری هەولێر بوو، بەدوای گیران و هەڵوەشانەوەی رێکخستنەکانی کۆمەڵە لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٦ دا. بەڕاستی هاوڕێیەکی جەربەزە، چوست و زۆر وریا بوو، هەموو گیانی وڵاتپارێزی و قوربانیدان بوو. لەناو باوەشی خێزانێکی جوتیاری هەژاری گوندی قەشقە و خوێندنی لە شاری کەرکوک و هەولێر، نموونەی کادیر و هەڵسوڕاوێکی بەتوانا و لێهاتوو بوو، لە کاری رێکخراوەیی ژێرزەمینیدا. زیرەک و بە حەوسەلە بوو، هەمیشە دەم بە پێکەنین و قسەخۆش بوو، بەداخەوە تەمەنی پێشمەرگایەتی لە خەباتی چەکداری نوێدا زۆر کورت بوو. بەڵام دەیان رۆڵە و کادیری بۆ خەبات و پێشمەرگاریەتی لە ناوچەکە و ناوشاری هەولێر پێ گەیاندبوو.

وەک لە بەشەکانی پێشەوەدا باسی ئەوەم گێڕاوەتەوە کە لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٦دا ئارام نامەیەکی بۆ دەوڵەمەندێکی کوردی بەغداد (خەسرەو تۆفیق) نووسیبوو، کە ناسیاوی خۆی بوو. وەرزی بەهار بوو، لە رێگای کاری دائیرەوە چوومە بەغداد، کە زۆربەی هەفتەکان بۆ ئیش و کاری لیژنەی کڕینی دەواجنی هەولێر، بۆ بەغداد دەچووم. لەپێشەوە چوومە کۆڕی زانیاری کورد، چاوم بە فریاد محێدین کەوت و بەیەکەوە ئۆفیسەکەی "خەسرەو تۆفیق"مان دەستنیشان کرد، کە لە گۆڕەپانی (التحریر) بوو. کەچوینە ئەوشوێنە فریاد لە خوارەوە لەسەر جادەکە وەستاو و من بەسەرکەوتم. ئەو دەمە بەندە لەڕولاواز، باریکەڵە و چاویلکە لەچاو بووم، قژم پاک تاشیبوو. لە ژوورێک سکرتێری ناوبراو زۆری لەگەڵ هەوڵدام، چ کارێکم هەیە بەوی بڵێم و ئەو دەیگەیێنێتە ژوورەوە، بەڵام خۆم لەسەر ئەوە سوور بووم کە من لە سلێمانی هاتووم و کاری تایبەتیم بە خەسرەو هەیە. ئەوەبوو سەرەتا خۆی چووە ژوورەوە و کە هاتە دەرەوە بواری منی دا، خۆم بەتەنیا چوومە ژوورەوە و پاش سڵاوکردن، گوتی: بڵێ کوڕم چ کارت هەیە کەوا لە سلێمانی هاتووی! کە قسەکانی خۆم کرد، گوتی: تۆ کوا خەڵکی سلێمانی! بە قسەکردنەکەت لە خەڵکی شار ناکەیت! گوتم قوربان، من ئەو نامەیەم بۆ هێناوی، حەز دەکەم لە بەرچاوی خۆم بیخوێنییەوە، هەر هەنووکەیش وەڵامەکەم بدەیتەوە. چوونکە زۆر دەترسام، نەوەکو سکرتێرەکەی بانگ بکات و ئەویش بەو نهێنییە بزانێ و بەیەکەوە پەلبەستم بکەن!

هەر کە نامەکەی خوێندەوە، رەنگی دەم و چاوی بە تەواوی گۆڕا، کە خۆی کەتەیەکی دەم و چاو گوشتن و سوورە بوو و یەکجاری سوور بووەوە، بەشپرزەیی گوتی: کوڕم تۆ بەدوای مەرگی خۆتدا دەگەڕێی! کێ تۆی هێناوەتە ئێرە و چۆن منتان دۆزیوەتەوە؟! منیش

پێوەندی خۆم لەگەڵ ئارام پێ گوت و بە کورتی وەڵامی دامەوە کە ئارام داوای هەندێ پێتاکی لێ کردووە و گوتی بەیانی وەرەوە بۆتی دەخەمە زەرفێکەوە و لە لای سکرتێرەکەمی دادەنێم. منیش بەدڵخۆشییەوە ماڵئاواییم لێ کرد، ئەو هەر لە شوێنەکەی خۆی نەدەجولا و دەرگام کردەوە و دەرچووم.

کە هاتمە دەرەوە، فریاد لەوبەری جادەکە چاوەڕوانی دەکردم، بەیەکەوە پیاسەیەکی "ئەبو نواس"مان کرد و دواتر ئەو گەڕایەوە شوێنی خۆی و منیش چوومەوە هوتێلەکەم. فریاد زۆری لەگەڵ گوتم، کە ئەوانە دەوڵەمەندن و تەنیا گوێ بە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان دەدەن، واچاکە وازی لێ بهێنم و بەدوایدا نەچمەوە، چونکە دوور نییە ئەو تەلەفۆن و پێوەندی بە دەزگاکانی حکومەتەوە هەبێت و تەپکەیەکم بۆ دانەنێتەوە! بەڵام گوێم بەو ترس و لەرزە نەدا، جێبەجێکردنی خواستەکەی "ئارام"م لە لا گەورەتر بوو.

بەیانی لە کاتی دیاریکراو چوومەوە ئەو شوێنە، بەبێ ئەوەی فریاد لەگەڵ خۆم بەرم. کە سەرکەوتم و سەیرێکی سەر پەیژەکان و ئەو بەر و ئەو بەری دەوروبەرمم کرد، هەستم بە هیچ شتێکی نائاسایی نەکرد. زۆر بە هێمنی و لەسەرەخۆ چوومە ژووری سکرتێرەکەی، هەرکە چاوی بە من کەوت، هەر ئەوەندە گوتی ناوت چییە! یەکسەر زەرفەکەی دایە دەستم، منیش بەخێرایی هاتمە خوارەوە، لە بەر دەرگای ئاپارتمانەکە تەماشام کرد، خەسرەو تۆفیق لەوبەری جادەکەوە، خۆی بەشتێک خەریک کردبوو، چاوەڕوانی دەرچوونی من بوو، منیش بەبێ ئەوەی ئاوڕی لێ بدەمەوە ڕێگای خۆم گرت، چوومەوە لای فریاد و جێبەجێبوونی کارەکەم پێگوت و کە زۆر دڵخۆش بوو.

فریاد محێدین کە خەڵکی کۆیە بوو و لە بنەماڵەیەکی تێکۆشەر و کاروانی شۆڕش بوو. مرۆڤێکی قسەخۆش و کەم دوو بوو، بڕوای تەواوی بە دروستبوون و هاتنەمەیدانی ڕێکخستنی نوێی چینە زەحمەتکێشەکان هەبوو، لە بواری خەباتی ژێرزەمینی و نهێنیدا، نموونەی پشت پێ بەستن و پیاوی هەڵسوڕان بوو، بەداخەوە لەدوای نەوەدەکانی چەرخی رابردوو، لە وڵاتی ئەڵمانیا پەنابەر بوو و لەوێ بە نەخۆشییەکی کت و پڕ لە نەخۆشخانە کۆچی دوایی کرد، چەندجارێک بە تەلەفۆنی نێوان ئەڵمانیاو سوید یەکترمان بەسەرکردەوە، زۆر بە هێمنی بێ نازانە ماڵئاوایی لە ژیان و نەتەوەکەی کرد.

# ٢٨

کاروبارەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵە سەرلەنوێ لە هەولێر کەوتبووەوە سەر پێیان. زۆربەی هاوڕێیە کۆنەکان دۆزرانەوە و بەگەڕ کەوتنەوە. ئێمە ماوەیەک بوو خەتێکی ڕێکخستنمان لە بەغداد هەبوو، تێکۆشەری کۆچکردوو فریاد محیدین ئەو دەمە لە کۆری زانیاری کورد، کارمەندبوو، سەرپەرشتیی ئەو هێڵەی دەکرد، لەگەڵ خەتێکی دیکەی تەنزیمی لە خوارووی بەغداد، کە عارف روشدی سەرپەرشتی دەکرد.

ماوەیەک بوو دایکم هەموو جارێ پێی دەگوتم، کە بەڵکو جارێک لەگەڵ خۆم بۆ بەغدادی ببەم، بە مەبەستی سەردانی مەزاری شێخ عەبدولقادری گەیلانی. ئێمەیش تازە هەندێ بڵاوکراوەی نوێمان بۆ هاتبوو. دەبوو بەشی ئەوانەی بەغداد و خوارووی لێ بدەین. پێشتر کوڕی ڕۆژانی تەنگانە، برایم غەفور خۆی ئەو کارەی مەیسەر دەکرد. بەڵام ئەوجارەی بە هەندێ سەرقاڵییەوە کارەکە کەوتەوە سەر بەندە. من بۆ ئەو سەفەرە بە سدیق رەنجبەرم گوتبوو، چونکە دەبوو یەکێک پێی بزانی کە من بۆ کوێ دەچم. بەڵام نەیاندەزانی من دایکم لەگەڵ خۆم دەبەم. ئەوەبوو شەو کە گەڕامەوە ماڵەوە، بە دایکمم گوتم: دایکە خۆت ئامادەبکە، بەیانی دەتبەم بۆ بەغداد، بۆ زیارەتی شێخ عەبدولقادر گەیلانی، بەڵام بەو مەرجەی ئەو بڵاوکراوانەم بۆ بخەیتە بن بنکەوێی بەرتەوە. ئەویش هەر بۆ دڵڕاگرتنی من، هەمیش بۆ جێبەجێبوونی زیارەتەکەی گوتی: باشە. شەوەکەی شتەکانمان خستە ناو ئەو کورتەکەی بۆئەوسەفەرە لەبەری دەکرد. سبەینەکەی زوو چووینە لای ئەو ماشێنانەی (منشاە نقل)ی نەفەرات بۆ بەغداد، کە تازە لە هەولێر کرابۆوە، ئەوکات لەو کۆڵانەی نێوان یانەی فەرمانبەران و دائیرەی کارەبا بوو.

ئێمە شوێنی خۆمان گرت، من و دایکم لەتەک یەکدی دانیشتین، ژنێکی دیکە بەتەنیا بوو، هات لە سەر کورسیی پشت دایکم دانیشت. ماشێن بەڕێکەوت و لە چایخانەکەی (العظیم) ئیسراحەتمان کرد و هەر کە کەوتینەوە ڕێ، سەیارەیەکی پۆلیس هاتە بەردەمی مونشئەکەی ئێمە و سەیارەی بەدوای خۆیدا پەلکێش کرد! من لە لای خۆمەوە دڵم قر قرا، ئەوە چییە! دەبێ چی چاوەڕوانمان بکات! باشە دەبێ ئەو برادەرە کە دەزانی من سەفەری بەغداد دەکەم، زمانی لێ دابم! سەدویەک مەزەندەی هەمە جۆرم کرد، دڵم لەسەر سەدی لێی دەدا، دەمگوت ئێستا نا ئێستا لەناو دەفەی سینگم دەردەپەڕێ! کە ماشینەکە گەیشتە بەر مخفەری پۆلیس، ئێمەیان جاڕدا کە هەموو دابەزینە خوارەوە. من هەر لە خۆمەوە بە دایکم و ژنەکەی پشتەوەم گوت، ئێوە دامەبەزن! کابرای پۆلیس هیچ قسەی نەکرد. کە

پیاوەکان هاتینە خوارەوە، بە هەموومانیان گوت، دەستتان بەرزبکەنەوە، روو لە پاسەکە بکەن. دوو پۆلیس یەک بەیەکمان لە بنی پێمانەوە تا تەوقەسەرمانیان پشکنی. بەڵام من ئۆقرەم نەدەگرت و چەند جارێک بەبێ ئەوەی ئاگام لە خۆبێت، دەستەکانم دەهێنایە خوارەوە، هاواریان لێ دەکردم، کە دەستم بەرز بکەمەوە. کەوتبوومە ناو شەپۆلی هزرەکانی خۆمەوە، ئاخەر ئەگەر دایکم بەو بارە ئەدەبیاتەوە بگیرێ، چ تاوانێکی هەیە! بۆ ئەم بەزمەم پێ کردا کێ لە منی وەردەگری کە من ناچارم کردووە کە ئەو شتانەم بۆ هەڵگرێ! نۆرەی پشکنین گەیشتە من و دوای تەواو بوون، خۆم بۆنەگیراو لە پۆلیسەکەم پرسی مەسەلە چییە؟! پۆلیسەکە پیاوێکی بە تەمەن بوو، دەتگوت لەو شپرزەییەی من گەیشتووە کە زۆر بێحەوسەلە ببوم. دەمی هەڵپچڕی و گوتی: ئەو ماشینەی پێش ماشینەکەی ئێوە کە لەهەولێر هاتووە لە گەراجی (نهضە)دا نارنجۆکێکی تێدا تەقیوەتەوە!

وەک ئەوەی مژدەیەکی هێجگار خۆشیان پێ دابم، پشوویەکم هاتەوە بەر و پاش تەواوکردنی پشکنینی هەمووومان، یەکە یەکە گەڕاینەوە شوێنەکانی خۆمان. سەیرم کرد دایکم وەک ئەوەی نەبای دیبێ و نەباران، زۆر ئاسایی بۆ خۆی بۆرژاوە، ئاگای لە دنیا نەماوە! سەیارەکە بەڕێکەوتەوە و گەیشتینە بەغداد. یەکسەر چووینە "هوتێل عەبدوڵلا" لە شەقامی جمهوری و دوای شاردنەوەی ئەدەبیاتەکان لەبن قەرەوێڵە، خواردنم بۆ دایکم بانگ کرد و خۆم بۆ لای فریاد چووم و بەشە ئەدەبیاتی ئەوانم لەگەڵ خۆ برد. بۆ ئێوارە لەگەڵ فریاد دایکممان برد بۆ زیارەت. شەوەکەی هەتا درەنگ، لە "شەقامی سەعدون" و دەوروبەری بەدەم پیاسەکردنەوە کاتمان بەسەربرد.

بەیانییەکەی رۆژی دواتر، دوبارە بەتەنیا دایکم بردەوە بۆ زیارەتی مەرقەد و پاشان هاتینە بازاری شوریجە و لەوێ گەڕاین. عەسرەکەی دایکم لە هوتێل بەتەنیا جێ هێلا و ئەدەبیاتەکەم کردە ناو زەمبیلێکی پڕ میوە و چوومە بەری "علاوی" و لەوێ سواری ماشێن بووم بۆ شوێنی مەبەست و ئێوارە درەنگانێ گەیشتمە ئەوێ. شار خەریک بوو چۆڵ دەبوو و پرسیاری ئەو گەڕەکم کرد، گوتیان سەیارەی "عبریە" لە فلانە شوێن بۆ ئەو گەڕەکە دەچێ. نیو سەعاتێک گەڕام، تاکو ئەو شوێنەم دۆزییەوە، ئێمە پێمان باش نەبوو بەتاکسی بچینە گەڕەکەکە چونکە هەم بۆ پاراستنیماڵەکە، هەم بۆ سەلامەتی خۆمان. کەچی تاکسییەک وەک مێش بەدوام کەوتبوو، لە ناوەندی جادە و سەر شۆستەکان پێشی لێ دەگرتم و دەیگوت بۆ هەر کوێیەک بچم، ئەو بە نیوەقیمەت دەمبات! تاکو گەیشتمە شوێنی رۆیشتنی سەیارەی "عبریە"یش هەر بەدوامەوە بوو.

چەند جارێک خەریک بوو زەمبیلەکە فڕێ بدەمە پەنایەکەوە و بۆ گەراجی بەغداد بگەڕێمەوە. بەڵام دوایی ئۆقرەم گرت و چووم سواری یەکێک لەو سەیارانە بووم کە بۆ

گەرەکی مەبەست دەچوو. کابرای شوفێری تەکسی هەر بەدیارمەوە بوو، دڵم چەندان خەیاڵپلاوی بۆ دەهۆنیمەوە!! چەند نەفەرێک پەیدا بوون و بەرێکەوتین و بینیم، کابرای تاکسی هەر دەستم بۆ هەڵدەشەقێنی، بەڵام چیتر دوامان نەکەوت. نزیکەی یەک دوو سەعاتێک لە لای عارف مامەوە، شتەکانم پێگەیاند و دوای پرسین و وەڵام و پێداچونەوەی کاروبارەکانی رێکخستنی شانەکەیان، من ماڵئاوایم لێ کرد و بەرەو بەغداد گەرامەوە، بەڵام ئەمجارە خەیاڵ ئاسوودە، چونکە شتێکی بڤەم پێنەبوو. سەعات یەکی شەو گەیشتمەوە لای دایکم کە بە دڵەراوکێ چاوەروانی گەرانەوەم بوو. باوەشی پێدا کردم و زۆر سەرزەنشتی کردم کە وا درەنگ گەراومەتەوە. بەڵام دیاربوو تێگەیشتبوو من بۆ شوێنێکی دەرەوەی بەغداد چوو بووم.

# ٢٩

لە هاوینی ساڵی ١٩٧٨ دا، ساڵێک بوو کۆمیتەی شەهید برایم عەزۆ لە هەولێر بۆ سەرپەرشتیکردنی رێکخستنەکانی کۆمەڵە لەناو پارێزگای هەولێر کەوتبووە سەر پێیان. ئەندامە هەرە دیارەکانی ئەو کۆمیتەیە بریتی بوون لە؛ برایم غەفور، مەلا غەفور، سدیق ساڵح رەنجبەر، مەحەمەد حسن مەنگوری و بەندەیش بەرپرسی کۆمیتەکە بووم، کە ماوەیەک بوو مەحەمەد جەواد لە کۆمیتەکە لادرابوو. ماوەی شەش مانگێک دەبوو لەگەڵ "کۆمیتەی هەڵمەت"ی ناو شاری سلێمانی لە رێگای مەلا بەختیارەوە لە سەردانێکیدا بۆ سلێمانی، یەکترمان دیتبوو. ناوەکان هەموو نهێنی بوون، ئەوەی لە بیرم مابێت، زۆرتر سەلیم بوو کە لەو رۆژانە جەمال تایەر لە لایەن دەزگاکانی رژێم گیرابوو. جارێکیان سلیم کە ناوی خۆی دلێر ئەحمەد بوو، هاتە هەولێر و چەند دانە بڵاوکراوەیەکی هێنابوو، پێی راگەیاندین کە بریارە کۆمیتەی سەرکردایەتی ناوخۆ دابمەزرێ و دەبێ لە فلانە رۆژ سەردانی سلێمانی بکەم. لەگەڵ یەکەم کۆبوونەوەی ئەو کۆمیتەیە، حەمە چاوشین بوو بە مەسئولی سەرکردایەتی ناوخۆی رێکخستنەکانی ناوشار. هەر لەو کۆبوونەوە ئاگادار کرامەوە کۆمەڵێ ئەدەبیات، دەمانچەیەکی بێدەنگ و دە نارنجۆکی دەستی بۆ رێکخستنەکانی هەولێر لە لایەن ناوەندی "کۆمەڵ"ەوە رەوان کراوە و دەبێ هەر بەخۆمان مشوری گواستنەوەیان بخۆین.

ئەوە بوو گەڕامەوە هەولێر. ئەو سەردەم، زۆربەی سەفەرەکانم بۆ دەرەوەی هەولێر، بە جۆرێک ڕێکم دەخستن کە بەئیش و کاری دائیرە دەردەچووم، بەتایبەت ئەو چوار ساڵەی لە دواجنی هەولێر سەرۆکی لیژنەی کڕین بووم. زۆر سوودم لێ وەرگرتبوو بۆ هاتوچۆیەکانم و ڕاپەڕاندنی کاروبارەکانی ڕێکخستن. تاکو گومان لەسەر خۆم دروست نەکەم، بە دەگمەن مۆڵەتم وەردەگرت و تەنیا بۆ کڕینی کەلوپەل، زۆربەی شارەکان دەگەڕام و زۆربەی کاتیش سەیارەی دائیرەم بە کار دەهێنا، بەتایبەت ئەوانەی کوردستان و بەغداد و موسل.

بۆ هێنانی ئەو شتانەی سلێمانی، لەگەڵ "م. برایم" قسەم کرد کە چۆن ئەو کەلوپەلانە بگوازینەوە. برایم برادەرێکی ڕێکخستنەکانی لای خۆی بۆ دەستنیشان کردم، کە قەمەرەیەکی تاکسی لادەی هەبوو، ناوی مەجید کاکۆی گوندی عارەبکەندی بوو. ئێستایش لەبیرم ماوە لە لای گۆڕەپانی کۆتری سەلام بە ڕێگەی "م. برایم"ەوە یەکترمان ناسی و هەر ئەو ڕۆژە بەرەو سلێمانی بەڕێکەوتین. شەوەکەی خۆم لە ماڵی سلیم بووم، "مەجید"یشمان لە هوتێل دانا. بەیانی سەیارەکەمان بردە حەوشەکەی ماڵی هاوڕێیەک، لەوێ بەشی زۆری بڵاوکراوەکانمان لە سندووقی دواوەی قەمارەکە، لەبن تەختەیەکی پان سەفت کرد و هەندێ ئاسنی گرانمان لەسەر دانا و بەشێکی دیکەیشمان پێچایەوە و لەناو مەکینەکەی سەیارەکە بەتوندی بەستمانەوە. دەمانچە بێ دەنگەکەمان خستە بن ئەو کورسییەی پێشەوە، کەخۆم لەسەری دانیشتم، نارنجۆکەکانیشمان لەبن کوشینی پشتەوە جێگیر کرد. بۆ نیوەڕۆ، سەعات ١٢ بوو، بە قرچەی گەرما بەڕێکەوتین. حەمە چاوشین بە قەمەرە "نصر"ەکەی هەتا لای سەرچنار پێشکەوت، لە دووڕیانەکەوە دەستی لێ هەڵشەقاندین و ڕێگای خۆمان بەرەو کەرکوک گرت. چونکە لەوڕێگایەوە کەمتر بازگە هەبوو. لە بازگەی کەندەکەوە بەبێ ڕاوەستان لێمان خوڕی. زۆر خێرا دەڕۆیشتین، لە بازیانیش دەرچووین و بە تەکیەدا تێپەڕین، بەبێ ئەوەی پێی بزانین لەناو گردۆڵکەکانی نێوان تەکیە و "چەمچەماڵ"دا، کەمینی پۆلیسی گومرگ هەیە. ئێمە خەیاڵمان ئاسوودە بوو، مەجید بە خێرایی ١٢٠ لێیدەخوڕی. لەپڕ لە پەنا گردێکەوە "مسلحە"یەکی پۆلیس بۆمان دەرچوو، بەتوتەتوت دوامانکەوت. سەیارەکەی پۆلیس زۆر لێمان نزیک نەدەبووەوە، بەڵام دیار بوو ڕەشاشێکی گەورەی بەسەرەوە بوو، پۆلیسێک بەسەریەوە نیشتبوو. گوتم: مەجید ئەوانە بەدوای ئێمەوەن. مەجید لەسەرەتا دەنگی هەڵبڕی و گوتی: ئەوجا چی بکەم! لەو دەمەیش ڕێچکەیەکی خۆڵ لە قیرتاوەکە جیا دەبووەوە، گوتی ئەو ڕێچکەیە بگرم! گوتم: بابە ئەوە زیاتر خۆمان گورگە دەکەین، واباشە لە شوێنی خۆمان بوەستین، بەڵکو

خواوکردانه، به سەلامەتی دەرچین! مەجید هەر ئەوەندە لەگەڵ من بوو سەیارەکەی هێواش کردەوە، لە کەنار جادەکە ئیستۆپێکی قایمی گرت!

سەیارەی پۆلیسەکانیش لە دوورمانەوە وەستان، بۆ بەختی ئێمە دووکەس لەپێشەوە هاتنە خوارەوە، یەکێکیان تفەنگەکەی بەدەستەوە گرت و بۆلای ئێمە هات، ئەوەی دیکەشیان لە دوورەوە وەستا و سێرەی لێمان گرت. ئەوەی سەرماشێنەکەش سەربار. ئەو پۆلیسەی بۆ لای ئێمە دەهات، لە دوورەوە بە زمانی عارەبی دەیگوت، وا دیارە قاچاخێکی زۆرتان پێیە کە وا بەو خێراییە لێدەخورن! من دابەزیم و لە زمانە عەرەبییەکە زانیم ئەو پۆلیسە کە زیاتر لێمان هاتە پێش وەک خۆمان کوردە. کە نزیکمان بووەوە، گوتم هیچمان پێ نییە و بەڵکو بۆ ئەوە بلەزین، تاکو زوو بگەینەوە ماڵ. هەر کە گەیشتە لای قەمەرەکە، جارێک بەدەورمان سوڕایەوە، تفەنگەکەی لە شان کرد و گوتی دەرگای صندوقی دواوە بکەوە. مەجید لە شوێنی خۆی دەستی لەسەر سووکان رەق ببوو، جوڵەی نەدەکرد، هەردووکمان رەنگمان تێدا نەمابوو، بەڵام من ناچار بووم، پەلەقاژەی خۆم بکەم. بە هەر شێوەیەک سویچەکەم لە مەجید وەرگرت، دەرگای سندووقەکەم هەڵدایەوە، تەماشای کرد بەڕاستی هیچی تێدانییە جگە لەوەی هەندێ پارچە ئاسن لەسەر پارچە تەختەدارێکی پان بە پانایی سندوقەکە دانراوە، یەکسەر دەستی برد و پارچە ئاسنەکانی لابرد، تەختە دارەکەی بەرزکردەوە، تەماشای کرد هەمووی بڵاوکراوەی ئۆرگانی کۆمەڵە بوو، بەسەفتە دانرابوو، دیسان هەر بەزمانی عارەبی گوتی، ئەوە چییە..؟ گوتم؛ ئەمە نامیلکە و کتێبی منداڵانە. گوتی ئەگەر وایە بۆ شاردوتانەوە! قسەی ترم بۆ نەکرا، هات دەرگای پشتەوە بکاتەوە، یەکسەر بە کوردی پێم گوت، برام تۆش دیارە کوردی، ئەمە بڵاوکراوەی پێشمەرگەیە و چیتر بەدوایدا مەگەڕێ، لە هەموو شوێنەکانی سەیارەکەمان شاردوتەوە، هەر ئەو نامیلکانەمان پێیە!! کەوام گوت، پۆلیسەکە خەندەیەکی بۆ کردم، بە کوردی گوتی، مادام ئێوە ئەو پیاوە بەجەرگەن، زووکەن سندووقەکە دادەنەوە و بۆی دەرچن. من زۆر سوپاسم کرد و مەجیدیش هاتەوە هۆش خۆی، هەناسەی شەهادە و ئیمانی هەڵکێشا، سویچەکەم دایەوە دەستی، پۆلیسەکە گەڕایەوە و منیش سوار بووم، بەهەمان چەشن لە بازگەی کۆنترۆلی چوونە ناو کەرکوک و ئەوانەی پێشووتریش، لە بەر گەرما کەس رای نەگرتین، کە بەدەگمەن ترومبێل بەسەرجادەوە بوو. کەهاتینە ناو شار، یەکسەر چووینە ماڵی ئەحمەد کرێکار و هەموو شتەکانمان دەرهێنا و لە ماڵی ئەوان تەقەتمان کرد. لەگەڵ مەجید بە دەستبەتاڵی گەڕاینەوە هەولێر، بەگومانی ئەوەی نەوەک ئەو پۆلیسە ژمارەی قەمارەکەی نووسیبی، بۆ بازگەکانی ناردبی، بە خەیاڵئاسوودەیی هاتینەوە.

دوایی هەر لە ڕێگای ڕێکخستنەکانی ناو شاری کەرکووک، کە ناوی کۆمیتەی "ئاگر" بوو، تاقیبی ئەو پۆلیسەمان کرد و دۆزیمانەوە، ناوی مستەفا بوو، هەندێ پارەمان وەک دیاری بۆ نارد، کەچی ئەویش جوامێرانە، پارەکەی وەرنەگرتبوو، بەڵکو گوتبوی: "من ئەو کارەم بۆ گیانی برایەکەی خۆم کرد، کە لە ساڵانی شەستەکاندا لە پێشمەرگایەتی شەهید بووە، ئەگەر بۆ پارەم بکردایە و ئەوانم تەسلیم بکردایە، بەلانی کەم چەند ئەستێرەیەکم وەردەگرت و خەلاتی گەورە دەکرام." دواتر هەر بۆتاقیکردنەوە و لەیەکتر دڵنیابوون، کۆسرەت، کە تازە "ڕێبازی"ی کوڕی لە دایک ببوو، لەگەڵ ئەمیرەخانی ژنی، کۆرپەکەیان کردە مەلۆتکە و بە پیکابێکی دەبل قەمەرە هەرسێکمان چوینە کەرکووک، زۆربەی شتەکانم خستە دەوروبەری ئەو سەبەتەیەی "ڕێباز"ی کۆرپەی لەناو دانرابوو. ڕێباز، بەو کۆرپەییە، یەکەم موغامەرەی سەرچڵانەمان پێ کرد و بەسەلامەتی گەڕاینەوە هەولێر.

# ٣٠

چەند ساڵێک بوو، ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە، بەتایبەت لەناو شارەکاندا، بە هەوڵی **ئارام** و هاوڕێیەکانی بووژابوونەوە و کەوتبوونەوە گاگۆڵەکردنەوە. لە ساڵی ١٩٧٨ ەوە، سەرکردایەتی ناوخۆی کۆمەڵە بۆ سەرپەرشتیکردنی ڕێکخستنەکانی ناوەوە دامەزرابوو.

لەو زەمان و زەمینەدا، لە پارێزگای هەولێریش ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە، بەدوای شالاوی ئاشکرابوون، ڕاوەدوونان و گرتنی بەکۆمەڵی بەشێکی بەرچاوی کادرە ناسراوەکانی ناو شاری هەولێر لە ساڵی ١٩٧٥ – ١٩٧٦ دا. **ئارام** ڕاستەوخۆ پێوەندی بەحاجی مەمۆوە کردوە و لەبەر ڕێنمایی، ئامۆژگاری و ڕاسپاردەکانی ئەودا، ئەوهێڵە شاراو و پەراوێزەی کۆمەڵە، بەهاوکاری و دۆزینەوەی پاشماوەی ڕێکخستنە هەڵوەشاوەکەی گۆڕین، هەنگاو بە هەنگاو و بە هەناسەیەکی درێژی هێمنانە، سەرلەنوێ دەسرازەکانی ڕێکخستن لە بنجوبنەوانەوە چێنراوەتەوە.

ئەو هاوڕێیە تاکوتەرایانەی ئەودەم، لاوچاکی و بوێری و زاتی بەشداریکردن، بەرێوەبردن و گەشەپێدەری ئەو دەستپێشکەرییە بوون، ئەو دەم چاونەترسانە یەک ئەرکی قورس و پڕ مەترسیی بەرپرسیارێتییان لە ئەستۆ گرتبوو. لەو زنجیرە یادەوەرییەوە، هەوڵەدەم ڕووناکی بخەمە سەر ئەو ڕۆژانی تەنگانە و خەڵکە تێکۆشەرە بەدەگمەنەکان بەسەربکەمەوە، تاکو لە سێبەری دەسەلاتی قەدەر، خەڵکی کۆنە بەعسی و فایلدار،

سەربازی راکردوی قادسیەی جەلاد، ماستاوچیی فرسەتتەلەب و گەندەڵی سەر سفرەی گەندەخۆری هیچ لەبارانەبووی ئەوان رۆژان، لەپاڵ قورخکردنی دەسکەوتی مشەی دەسەلات، دەستکاری ئەو سەروەرییانەیش نەکەن و پرکێشی خۆهەڵکێشانی فشەکردن نەبن. بەڵام جارێ لێمگەڕێن، هەندێک لەو فیلمانەتان بۆ لێبدەمەوە، کە ئەو رۆژە سەخت و شەوە تەنگەچاوانەتان بۆ وێنادەکات، کە هەتا ئەودەمەی بەیەکجارەکی لە ژیان چاولەیەک دەنێم، بەردەوام لە بەرچاوانم دێن و دەچن. لە گێڕانەوە و سەرلەنوێ لێدانەوەیاندا، هەنووکەیش موچرک بە گیانمدا دەزریکێنێ. زۆر جاران لە بەرانبەر قوربانی گیانی ئەو هاوڕێیانەی بە پێشکەشکردنی گیانی خۆیان لەوان رۆژاندا، مومی روناککردنەوەی تاریکستانی ئەو کاروانە سەربەگۆبەندەیان پێکرد. ئەو هاوڕێیانەی موو بە موو لە راپەڕاندنی ئەو ئەرکە قورسانە، هاوڕێ و هاوکار، تەواوکەر و رێپیشاندەری یەکتریمان دەکرد. ئەمرۆکەیش بەندە لە شوێنی هاوڵاتیبوونی خۆمەوە، سوژدە بۆ ئایەتەکانی کۆڵنەدان و سووربوونیان لە سەر رووبەڕووبوونەوەی زۆرداری و فاشیزم دەبەم. ئەو تاکوتەرایانەیش بە سەقەتی و پەقەتی وەک بەندە بەکەلاکەوتوویی ماون، هیوای سەرفرازی و بەردەوامی سەربڵندییان بۆ بە ئومێد دەخوازم.

حەمە چاوشین، یادی بەخێر کە لەم ساڵانەی دوایی، بە نەخۆشی کۆچی دوایی کرد، یەکەم لێپسراوی سەرکردایەتی ناوخۆی کۆمەڵە بوو. لە کۆتایی ساڵی ۱۹۷۹ لە ناو شاری سلێمانی تووشی راوەدونانی دەزگا ئەمنییەکانی رژێم ببوەوە، چاپوکانە خۆی لە تەپکە و گرتن دەربازکردبوو، بە ناچاری چووە شاخ و لەوێیشەوە یەکسەر بۆ ئەورووپا. ئیتر دەبوو یەکێک لەو برادەرانەی ئەو سەرکردایەتییەی رێکخستنەکانی ناوخۆ (سلێمانی، هەولێر و بادینان، کەرکووک، هێڵەکانی بەغداد و خانەقین.. هتد) بۆ تاووتوێکردنی کاروبارەکانی رێکخراوەیی کۆمەڵە لەنێوان ناوەندی شاخ و ناوخۆی شارەکاندا و دانانی یەکێک وەک لێپسراوی ناوخۆ، سەردانی ناوەندی کۆمەڵە بکات، کە ئەودەمە لە "خری ناوزەنگ"ی نێوان سنووری دەستکردی کوردستانی رۆژهەلات و باشووردا بوو. بارودۆخی بەندە لە هەمووان ئاساییتر بوو، بۆ ئەو سەفەرە. ماوەک بوو خۆیشم، ئارەزووی دیداری ئەو برادەرانەی ناوەندی کۆمەڵەم دەکرد، تاکو لە نزیکەوە بەوە ئاشنابم، ئاخۆ بەدوای مەرگی ئارام، بۆشایی شوێنەکەی پڕ بۆتەوە! بەدوای کۆبوونەوەکی سەرکردایەتیی ناوخۆ، بێ لێپسراوی یەکەم و پچڕان و نەمانی هێڵی پێوەندیی باوەڕپێکراوی نێوان ناوەندی (شاخ) و ناوخۆ، بەدوای دەرچونی لێپسراوی یەکەم بۆ دەرەوە، لەوسێ ئەندامەی شارەکان (دلێر، ئەحمەد کرێکار، حاجی مەمۆ) بڕیارمان دا کەبەندە ئەو سەفەرەبکات، بەڵام دەبێ هەر خۆم، ئەو رێگا و چۆنیەتی گەیشتنە شوێنی مەبەست مەیسەر بکەم. سەرەتا گەرەکم بوو،

لە ڕێگای قەندیل و گوندەکانی قرناقا و "پشتئاشان"دا بڕۆم، بەڵام لە لایەن "کۆسرەت ڕسول"ەوە ڕێگایەکی ئاسانترمان دۆزییەوە، ئەویش لەڕێگای "عومەر نۆغەرانی"یەوە، کە لە سەنگەسەری لای قەڵادزێ دۆستێکی بەناوی حەمەسوور هەبوو، ئەو ڕێگای سەفەرەکەمان بۆ نزیک و مەوداکورتر دەکات. دەبێ ئەوە دووپات بکەمەوە، لەو ڕۆژانەدا ڕێکخستنەکانی ناو شارەکان هەر چەند لەچاو پێداویستی و حەقانییەتی خەبات بە ژمارە کەم و سنووردار بوو، بەڵام خەڵکی جەربەزە، چاونەترس و بێ دڵەڕاوکێی لە خۆ گرتبوو، چونکە ئەو دەمە هیچ جۆرە دەسکەوت، باقوبریقێکی دەسەڵات و مشەخۆری لەئارادا نەبوو، بەڵکو بەراتی تێکۆشانی ئەو ڕۆژانە لەپاڵ شەونخوونی بەجێگەیاندنی ئەرکە دژوارەکانی ڕێکخستن، کۆبوونەوەی بەرسێبەری سەرچڵێکردن و چالاکی نواندنی هەمەجۆرەی پڕ مەترسی، تەنیا ترسی ڕاوەدونان و چاودێری دامودەزگای ڕژێم، پیاوە خۆفرۆش و چڵکاوخۆرەکان، ئەوجا چاوەڕوانی گرتن و ئەشکەنجەدان و گیانفیداکاری و مەرگ، پێشوازی خەباتگێڕانی دەکرد.

بەڵێ ئەو گیانە تژی لە بوێری و جورئەتی شۆڕشگێڕانە، مایەی بەردەوامی جێبەجێکردنی ئەو ئەرکە قورسانە بوو. بەوپەڕی شانازییەوە بەندە کە بۆ ٤-٥ ساڵان بە دەستگری چەپکێک لەو هاوڕێیانەی ئەوێ ڕۆژی دەستبارم بوون، توانیمان ژێرخانێکی پتەوی ڕێکخستنێکی نهێنی لە هەولێر، بادینان و هەتا ناو بەغداد و "زانکۆی موسڵ"یش، دابمەزرێنین. بۆ بەڵگەیش، ڕێکخستنەکانی هەولێر لەوێ زەمان و زەمیندا، هەتا پێش دەرچوونی بەندە بۆ شاخ، بێجگە لە مەغدیدی خەیات، کە پۆستەبەری نێوان هەولێر و ناوەندی کۆمەڵە بوو. لە ڕێگای قەسروماکۆسان، بەدەم گیرانەکەی لەلایەن دەزگای ئەمنی هەولێرەوە، ئیعترافی لەسەر بەندە، بەناوی "هەوراز"[26] و مەلاغەفور، کە ئەندامی کۆمیتەی شەهید برایم عەزۆ بوو و حسن ئەنوەر (مامۆستا کاوە)، کردبوو، یادیان بەخێر، هەردوکیان شەهید بوونە.

لەو سەروبەندە لەگەڵ ئەوەی مەفرەزەی ئەمن بەشەو چووبووە سەر ماڵەکانیان، بەڵام هەردووکیان قارەمانانە خۆیان دەرباز کردبوو و یەکسەر چوونە شاخ. هەروەها سدیق ڕەنجبەر بە هاوڕێتی سەردار کە بە مەبەستی چوونە شاخ و بوونە پێشمەرگە، لە ڕێگای "هیران - نازەنین" بە دەستکێشی گومانلێکراوێکەوە (مەحەمەد جەواد) گیران، کە پێشتر لە ڕیزەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵە دوورخرابووەوە. بەڵام ئەو دوو تێکۆشەرەیش، سدیق و سەردار لەگەڵ ئەوەی خەڵکانی سەرەوە و خوارەوەی ڕێکخستنەکانیان دەناسی،

---

[26] کەدواتر ناوی نهێنیی خۆم بۆ حاجی مەمۆ گۆڕی.

بە خۆڕاگری و کۆڵنەدانی ژێر ئەشکەنجەی ئیستخباراتی عەسکەری هەولێر، تێکڕای شیرازەکانی ڕێکخستنیان پاراست و بگرە سدیق ڕەنجبەر بەوپەڕی جوانمەردی لە زیندانی ئیستخبارات رایکرد و سەربڵندانە خۆی گەیاندە شاخ. دەنا کەسی دیکەمان نەگیراون و ڕێکخستنەکان، لەسەر ڕاسپاردە و ڕێنماییەکانی ڕۆژانی کۆتایی ٧٥ و سەرەتای ٧٦ ی ئارام زۆر بە پشوودرێژی و هێمنانە، سەرباری هەرجۆرە فشار و پاڵەپەستۆی توندوتیژی دامودەزگا سەرکوتکەرەکانی ڕژێم، بە هەناسەیەکی ماندونەناسانە پەلوپۆی خۆی بەناو خەڵکدا بڵاوکردووتەوە، هەر لە چالاکی ڕێکخراوەیی-بڵاوکردنەوە مەنشورات و بەیاننامە، هەڵواسینی لە بەردەم شوێنە گشتییەکان و بەردەرگای ماڵان و هەتا درۆشم نووسینی سەردیوارەکان کاری ڕۆژانە بووە.

# ٣١

دوو ڕۆژ پێش جەژنی نەورۆزی ساڵی ١٩٨٠، لە هەولێرەوە لەگەڵ عومەر نۆغەرانی، بە سواری پیکابێکی پڕ لە فەردە ئارد، کە عومەر بە خۆی پیکابەی لێدەخوری، بەرەو سەنگەسەر بەڕێکەوتین. دەمەو عەسرێکی درەنگ گەیشتینە بەردەم ماڵ و هەواری حەمەسوور. ناوبراو خۆی لە ماڵ بوو و میوانداریيەکی گەرموگوڕیان کردین. ئەو مرۆڤە ناوەکەی، لەگەڵ بەژن و باڵا زرافەکەی و ڕوخسار گەش و دەم بەپێکەنینەکەیەوە، یەک دەهاتەوە و بەدەم و لوتفێکی هێجگار دۆستانە کەوتە دواندنمان. بەوردی دیقەتی دابووە بەندە کە سەروسوکتم لە ئاردفرۆش و کاسبکار نەدەچوو! دەتگوت دڵی خەبەری پێداوە، لە خۆیەوە درکی بە مەبەستی سەردانەکەمان کردبوو. دەوروبەری سەنگەسەر بەفر دایپۆشیبوو، بە هۆی سایەقەبوونی ئاسمانەوە، سەرماوسۆڵەیەکی وشک و توش، بەرگی دەشتودەریان بە شەختە و سەهۆڵبەندان داگرتبوو. مرۆڤ تفی هەڵبدایە، یەکسەر دەیبەست و دەبوو بەزوقم. حەمە سوور وەک ئینسانێکی چاوتێر و ویژدان زیندوو، هەر دەیگوت بەخێر بێن سەرچاوان. بەڵام بۆ سەفەرەکەتان ڕۆژێکی هێجگار تووش و دژوارتان هەڵبژاردوە! وەک ئەوەی لەلای خۆیەوە، پێمان بڵێ، باسی مەبەستەکەتان مەکەن! ئەوجا سەفەرکردن بۆ ئەو شاخانە لە دەموساتێکی لەم جۆرە، ئەگەر نەکەوییە ناو تەپکەی جاش و عەسکەران، ئەوە بە مسۆگەر ڕەقبوونەوەی پێشەرۆکی مەرگێکی ناجۆرت چارەنووسە! باوەڕیش ناکەم کەس هەبێت، بە ئاسانی بەگەرت بکەوێ! چونکە کەس لە

ژیانی خۆی بێزار نییە! بەڵام بەندە بڕیاری خۆم دابوو، بە هەموو کاڵفامی خۆم، وام دەزانی هەموو شتێک بە جێبەجێکردنی ئەو بەڵێنەم بەستراوەتەوە! هەر دەبوو ئەو سەفەرە بکەم، ئەگەر سەریشمی تێدا دابنێم! دەمی ئێوارە، سفرەی نانخواردنیان ڕاخست، خواردنێکی گەرموگوڕیان لەپێشمان دانا، بەدوای ئەو ژەمەخواردنە، بۆ سەرئاو چوومە دەرەوە، بەڵام چ دەرەوەیەک ! لە ناوەوەی خۆمەوە، هەستم بەو ساردییە جەستە تەزێنە کرد، کە لە هەموو لایەکەوە ختوکەیان دەدام. بەخێرایی پێویستی خۆم تەواوکرد، بلەز خۆم کوتایە ژوورەوە، لێو و لاڕوومەتەکانم لەسەرمان سوور هەڵگەڕابون، بناگێچکەکانم ببوونە ڕێچکەی خلیسکانی کلکی چاویلکەی چاوەکانم. بەدەم ئەو دیمەنەوە عومەرۆک و حەمەسوور، بە جووتە لە پەرۆشی خۆیانەوە، کەوتنە هەوڵدان بۆ پەشیوانکردنەوەم لە سەفەرەکەمدا! هەتا حەمە سووری مرۆڤدۆستی ڕاستەقینە، لە قووڵایی دڵسۆزی ناو دڵ و دەروونی خۆیەوە، پێی گوتم: باوکم ئەگەر بۆ منی دەکەی ! ئەو سەفەرە مەکە، چونکە تێیدا دەچی و گەڕانەوەت بۆ نییە، دڵم بەگەنجێتیت دەسووتێ! بەتایبەت ڕووباری ئەو قەدپاڵانەی بناری قەندیل دەمی هەستانییەتی، کە داروبەردان لە ڕەگوڕیشەوە هەڵدەتەکێنی!

کەچی ئەو ڕۆژە، وەک ئەوەی حەمەسووری میهرەبان، گوێزانم بۆ بژمێری، تەقەی سەرم دەهات. زۆر بە پێداگرتنەوە رووم لێ کرد: کاکی خۆم، من بڕیاری خۆمم داوە و ئەو سەفەرە دەکەم، ئەگەر بەرێزتان یەکێکم بە ولاغە بەرزەیەکەوە بۆ پەیدا بکەن، مەمنوونتان دەبم، دەنا خەمی منتان نەبێ، پێویست بەم هەموو ترس و دڵەڕاوکێیە ناکات!

سەعات حەوتی ئێوارە تێپەڕی نەکردبوو، حەمەسوور لەگەڵ کابرایەکی ولاغدار بە جووتە لێمان بەژوورکەوتنەوە. پاش دەمەتەقێیەکی باش، ئەو برادەرەمان بە ٦٠ دیناری ئەو دەم، قەناعەت پێ کرد. ئەوەبوو بەندە وەک ئەوەی باڵم لێڕسکابێت، دەستوبرد ئەو دەستە کورتەکوشەلوارەی لەگەڵ خۆمم هێنابوو، لەبەرمکردن و چاکەت و پانترۆنەکەم بە عومەری ناردەوە هەولێر. لە چاوتروکانێکدا، بەوجەمادانییەی پێم بوو، دەمامکی خۆمم دا و ئەو پرێسکە یاساغانەی هێنابووم بۆ ناوەندی کۆمەڵە، لەناو گیرفانی ناوەوەی کورتەکەکەی بەرم جێم کردنەوە، ماڵئاواییم لە عومەر و حەمەسوور و ماڵەوەیان کرد، کە هەموویان بە کزوکڵۆلییەوە لە بەندەیان دەڕوانی و لەقوڵایی دڵ و دەروونییانەوە، هیوای سەلامەتی چوون و گەڕانەوەیان بۆ خواستم.

ئەوجا وەک تایتەورداس بە گورجی کەوتمە دوای برادەری ولاغدار، کە دەبوو هەتا سەر چەمەکەی ئەوبەری بەستەکەی پشتی سەنگەسەر بەپێ ڕێبکەم. هەنووکە، کە ئەو یادەوەرییانە دەگێڕمەوە، پاش ٣٢ ساڵان، دیمەن و رووخساری بەزەیی ئاسای

حەمەسوورم دێتەوە بەرچاوان، کە بێجگە لە هەواڵی مەرگی ئەو مرۆڤە، شتێکی دیکەی لێنازانم. سوژدە بۆگیان و هەستە مرۆڤ پەروەری و پەرۆشییەکەی دەبەم.

وەسمانی رێبەرم، جڵەوی و لاغەکەی بەدوای خۆیەوە جلیت کردبوو، منیش هەنگاو بە هەنگاو شوێن پێیانم لەناو قەتماخەی قوڕی تێکەڵ بە بەستەڵەکی بەفر هەڵدەگرت. ئەو وەسمانەی ئەو شەوە بۆ من، نموونەی لاوچاکی و بەتەنگەوە هاتن بوو، کە لە بڕینی ئەو رێگاوبانەدا بۆم دەرکەوت، هەر یەکێکی دیکە بوایە، من گورگانخواردوو ببوم. هەتا لە جادەی نێوان ژاراوە و سەنگەسەر پەڕینەوە، وەسمانی پەپوولە دەمنادەم، ئاوڕی لێم دەدایەوە و بە چرپە دڵنەوایی دەکردم و گوڕوتێنی وەبەر دەنام. دیارە ئەو دەم گوێچکەکانم قولاغ و ساغبوون و گرفتی بیستنم نەبوو. بەڵام لەبەر تەوژمی سەرماکە و ترسی پەڕینەوەی رێگاکە، لەناو دڵ و دەروونی خۆم، کەوتبوومە پرتەوبۆڵە و بەدەم هەناسەهەڵکێشانەوە، دوای وەسمان و ولاغەکە کەوتبوم. نزیک لێواری جادەکە ببوینەوە، چەند لایتێکی زەق و تیژ بەدوای یەکەوە، وەک ئەوەی پرکێشی پەلاماردانە سەرنێچیر بکەن، بەتاو روو بە رووی ئێمە، جادەکەیان رووناک دەکردەوە. وەسمان بە چرپە تێیگەیاندم، بەزوویی خۆم لەو کۆندرەی بەردەمی جادەکە مەلاس بدەم و خۆیشی لە بەرانبەرم لەودیوی دیکەی جادە، لەگەڵ هێسترەکە، بە جۆرێک گرمۆڵە ببونە باریەکتری، هەر لە تۆپەڵە کەستەکێکی رووت دەچوون. بەڵام من لەگەڵ هەنگاوی دووەمم بۆ ناو قورتەکە، پێیەکم هەرزەلی و پشتاوپشت، بۆ ناو قوڕولیتاوی ناو کەدرکە زرپەم هات، وەک تەڕاش قرقەپ کەوتم. گوێم لە چرپەی وەسمان بوو گوتی: لەو شوێنە نەجوڵێم، سەیارە سەربازییەکان وەک گورگی برسی بەدوای یەکترییەوە، ترس و سامناکیی زۆرتریان لە جادەکەوە، بەو دەوروبەرە دەبەخشی. بەبێ ستۆپکردنەوە ملی رێگایان گرتبوو، زۆر لەسەرخۆ بە بەردەمی ئەو بەر و ئەمبەری جادەکە تێوەڕین. بەبێ ئەوەی دڵم لە شوێنی قایمی خۆی دەرپەڕێ! وەسمان دەستوبرد گەیشتە سەرم و بە دوای دڵنیابوون لە ساغ و سەلامەتیم، لەناو لیتاوەکە راستی کردمەوە و گوتی: مەترسە ئەوە یەکەم مەترسیی پەڕینەوەی جادەکەمان گوزەراند.

ئەودەمەی گەیشتینە دەم کەندەلانێکی تاریک و تونی کەناری رووبارەکەوە، لە نزیکەوە بە دەنگی خوڕەی بەتاوی شەپۆلی ئاوەکە ئاشنابووم و تێکڕای جیهانی هۆش و بیری داگیر کردم. بێگومان ئەگەر ئەو تاوە زەندەقچوونم بەدەستەخۆ بوایە، ئەوە هەترەشم لێباری بوو! بەدوای رۆیشتنێکی کەموزۆر، مەلی هەڵفڕیوی چاوەکانی من لەبن چاویلکەکەمەوە، لە شەقەی باڵی وڕوکاسبوونمی دەدا، وەسمان گەڕایەوە سەرم، دەستێکی گرتم و رێشمەی هێسترەکەی لە چنگم نا: توندی بگرە! دەستەکەی دیکەیشی خستە ژێر

پێیەکمەوە، ئەوەندەی هێزی تێدا بوو، سووکە بارێک، بۆ سەرپشتی وڵاغەکە باری کردم. خۆی بەپێش کەوت و منیش بە سواری هێسترەکەوە لەدوای بووم. ڕێشمەی وڵاغەکەم شل کردبوو و بە چاکی ڕێچکە و شوێنپێی وەسمانی گرتبوو. بەڕاستی لەو جۆرە شەوەزەنگە ترسناکە حەپەسابووم. بە دەنگێکی نووساو بانگی وەسمانم کرد. کاکە وەسمان هەندێک لەسەرەخۆ بڕۆ، با لە من دیاربیت! ئەو مرۆڤە بەحەوسەڵەیە، بەدەم وەرگرتنی ڕێشمەی وڵاغەکە لێم، بە هێمنی وەڵامی دامەوە: مەترسە لە دەستێکی ئەمین دای، هەر بەزیندوویتی بمێنمەوە، بە سەلامەتی دەتگەیێنمە شوێنی مەبەست. ئیتر بەدەم چەمەکە شۆڕبووینەوە، گوێم لێ بوو وەسمان دەیگوت: لەو چەمە دەربازبین، کە زۆر شەوان جاش و جەیش تەپکەی لێدادەنێنەوە. بەڵام ئەو شەوە سەرماکە بواری ئەوەی نەدابوون. بەدوای چەمەکەوە مەترسییەکی ئەوتۆمان لەپێش نامێنێ. هەڵدەکشاین و دیسانەوە خوڕەی ئاوی بەلێشاوی چەمە پان وپۆڕەکە سەرنجی ڕاکێشامەوە، چاکتر بە هەردوو چاوانم ڕوانیمە شەپۆلی تیژڕۆی پانتایی ئاوەکەوە. وەک ئەژدیهایەک لە قووڵایی ناخی خۆیەوە هاڕەهاڕی بوو. بەدوای ڕێکردنی مەودایەک، دیتم چاوە شینەکانی وەسمان، لە زوقمی سەرما، وەک دوو چرای گەش دەبریسکانەوە. لەپێشەوە هەتا سەرچۆکان شەلوارەکەی هەڵکرد، ڕێشمەکەی دایەدەستەکەی دیکەمەوە و ئەوجا ئامۆژگاری کردم، کە خۆم توند بە سەر پشتی وڵاغەکەوە بگرم و دەستێکم لەپێشەوەی کورتانەکە گیر بکەم، لاقەکانم بەبن زگی وڵاغەکەوە بنووسێنم، ئەوجا هێسترەکەی بە تەنکایی ئاوی چەمەکە ڕێنمایی کرد.

لەو شەوە زەنگەدا، دیاربوو وڵاغەکە دڕی بەتاریکی دەدا، منیش لە بەرتەوژمی هەڵمەتی، ئەو کزەبایە ساردوسڕە بەفراوییەی ئاوەکە، خۆم گرمۆڵە کردبوو. دروست لە تۆپەڵە قوڕێکی قوڕگی بێجولەی ترس دەچووم. دڵنیام هێسترەکەیش وەک وەسمان لە ترپەترپی دڵەی ناوجۆڵانەی هەناوی من، هەستیار بوو. بە جۆرێک کە ڕێشمەکەم توندتر دەگرت، لەگەڵ دەنگی وەسمان ئاوڕی دەدایەوە، کە ڕێشمەکەی شل بگرم! وەسمان ئەو بڕەی تەنکاو بوو، لە پێشمانەوە ئاوەکەی بڕی، بەڵام دیاربوو بە هۆی ساردی و تیژڕەوی ڕەوتی ئاوەکە، زۆرتری بڕ نەکرد. هات خۆی هەڵدایە سەرپشتی هێسترەکەوە، لەپشتەوەی من، ڕێشمەی وڵاغەکەی لێ وەرگرتم و وەک ئینسانێکی بە ئەزموون، کەوتە تاودانی هێسترەکە. وڵاغی بەستەزمان کە دوو زرتە زەلام باری بوو، هەتا سەرەوەی زگی کەوتبوە ناو ئەو ئاوە تەزیوەوە. تەکان لەدوو تەکان قووڵایی ئاوەکەی دەبڕی. بە مەزندەی خۆم، گەیشتبووینە ناوەڕاستی ئاوی چەمەکەوە، کە بە لێشاو بەرەوخوار قۆشمەی بوو. چونکە تا دەهات ئەو ئاوە ساردە زۆرتر بۆ سەر پشتی هێسترەکە هێرشی

دەهێنا. نەوەک لاق و لاتەریکمی تەزاندبوو و موچرکی تەزین هەموو جەستەمی تەنیبوو. نێرڤ و دەمارەکانم دادەدادیان بوو. کەچی لەناکاو ولاغەکە ساتمەیەکی قایمی کرد و پاشی بەدەم ئاوەکەوە رۆیشت و نوشتایەوە! لەو چرکە بەسامەدا، وەسمان هاواری لێ کردم: نەکەی دەستەکانت لە کورتانەکە بەربدەی! کە هەر تاوێک پێشتر رێنمایی کردبووم، بە هەردوو دەستان پێشەوەی کورتانەکە بگرم، دەنا کارمان لە کار ترازاوە! ئەوەندەم پێ کرا بڵێم: کورە خۆ هەڵدانی چی! من لەسەر پشتی ولاغەکەوە هەترەشم چووە. چما دەکارم دەستەکانم بەربدەم، هەردووکیان بەدەم گرتنی کورتانەکەوە، وەک قفڵ بەکلیلدراوی سرهەڵهاتوون! نازانم ئەو هێسترە بە چ هێزێکی ئەفسوناوی، وەک ئەوەی لە شپرزەبوون و پەلەقاژەکردنی مەرگی ئێمە تێگەیشتبێت! شەنگوتاقەتی دایە خۆی. کە من لە لای خۆمەوە لەناو لێتاوی سەهۆڵبەندانی ئاوەکە نقووم ببوم، هەموو جیهانم ببوە ئاوی تەزیو، هێستر، وەسمان، سێبەر و هەناسەدانی خێرای خۆم. هەر کە تەکانی دایە خۆی، پاشی خۆی لەو ئانوساتە مەرگە ساتەدا، راست کردەوە و بەسەر پشتییەوە کەوتینەوە سەرپانتایی ئاوەکە. کە هەتا بەرسینگمان لێمشتی ئاو ببوو. ئیتر بڕە بڕە مەرگی چەتون، سەروپۆتەلاکی بەردابن، بە هیمەتی ئەو هێسترە و وەسمانی پشودرێژ لە تەنکایی دیوی ئەوبەری ئاوی چەمەکە نزیک دەبوینەوە.

دیسان، وەسمانی جەربەزە وەک ئەوەی نەبای دیبێ و نەباران، جڵەوی هێسترەکەی دایەوە من و خۆی هەڵدایە ناو تەنکایی ئاوەکەوە، بەڵام دەستەکانم لەبەر سەرماکە بە جۆرێک تەزیبۆون، بەسەر گرتنی کورتانەکەوە گۆج ببوون. قاچوقولەکانم وەک ناو سەهۆڵبەندان بەسترابوون و جولەیان نەمابوو. وەسمان بە واقوڕماوی دڵی دامەوە و گوتی: خەمی مەخۆ، هەنووکە دەگەینە وشکایی و سڕبوونی دەست و لاقەکانت دەکرێنەوە. ئەوجا هەر خۆی لەناو ئاوەکەوە، جڵەوی هێسترەکەی راکێشا. هەر ئەوەندە لەناو ئاوەکە دەرچووین، من هەر بەسەر پشتی ولاغەکەوە چەقیبووم. وەسمان پێی گوتم: جارێ هەتا بەردەمی ئەو گردۆلکانەی بەردەممان، دامەبەزە. هەستم بە کزەبایەکی تەزیوی وشکوبرینگ کرد، کە سەروچاویان سواغ دەدام و جلوبەرگە تەڕەکانی بەرمیان هەڵدەمژی. لەو چاوتروکانەدا هەستم بە رەقبوونەوەیان کرد، کە کزەبایەکە مارنجی لەسەر دەکردن. بۆ ئەوەی دەنگم لەناو ئەو سەرمایە توشە بێتە دەرەوە، ئەوەندەی دەنگم تێدابوو، قیژاندم: کورە وەسمان دەست و قاچوقولم لە جووڵە کەوتوون! لەو دەمەدا لەگەڵ بیستنەوەی دەنگی خۆم، کە دڵنیابوونێکی خۆش بوو، گوێبیستی رەوە دەنگێک بووم، بە هۆی تەوژمی رەشەبایەکەوە هات، کە هەر لە لوورە لووری گورگان دەچوو. ترسی تەپکە و کەمینی چەتەولەکانی رژێم، هەموو شتێکیان لەبیر بردمەوە. بەڵام ئەمجارەیش وەسمان زوو

فریام کەوت و گوتی: ئەوە دەنگە دەنگی قاچاخچییانە لەو بەرزاییانەوە دادەبەزن. ئەمشەو، بێجگە لە سەرماوسۆڵە، هیچ مەترسییەکی دیکەمان لە ڕێگادا نەماوە. ئەوە مژدەیەکی خۆش بوو، ئاگام لە دەست و قاچوقولم نەما، هەناسەی ئومێدم زیندوو بووەوە و بەرچاوەکانم ڕۆشن بوونەوە. لەگەڵ بۆڵێڵی دەربەدەربوونی تاریکایی شەوەزەنگەکە، بەرگی سپی شان و شەوکەتی شاخ و بنارەکانم بە چاکی دەبینی. گوتم تازە نامرم. ئەوجارەیش بە یارمەتی هێستر و وەسمان دەرەقەتی مەرگی چەرمەسەری هاتم!

ئێمە لە دونیای کێلبوونەوەی خۆماندا بووین. منی تۆپەڵەبووی سەرپشتی ئەو هێسترە بەهەڵمەتە و وەسمانی پیادە، بەدەم بڕینی هەورازی بناری گردۆلکەکانی بەردەممان، لەسەر پشتی وڵاغەکە عەجمانم نەبوو. تادەهات هەموو بەدەنم ڕەق دەبوو، پشتم کۆمابووەوە و خۆم بۆ ڕاست نەدەکرایەوە. هاوارم لە وەسمان کردەوە، ئەو مرۆڤە میهرەبانە، بەبێ ئەوەی ماندووبوونی بەر ئەو سەرمایە بزانێ، وەک بازێک پرکێشی گرتنی نێچیرەکەی بکات، گەڕایەوە سەرم و لەسەر پشتی هێسترەکەوە، باوەشی پێدا کردم و لە پێشەوە پەنجەکانی هەردوو دەستمی لەگرتنی کورتانەکە کردەوە و پشتمی ڕاستکردەوە، پاشان بە باوەش هێنامیە خوارەوە، بەڵام چەندی کردم لاقەکانم عەردیان نەدەگرت و دەچەمانەوە. وەسمان بە دەستە زبرەکانی لە ئەژنۆمەوە هەتا سەرگۆزینگم بۆی شێلام، هەستم دەکرد گەرماییان تێدا پەیدا دەبوو. ناچار بەدەم گاگۆڵەکردنەوە، چەنگەپڕەی هەوڵی ڕۆیشتنم دەدا. لەوەدەمەدا بوو کاروانی قاچاخچییەکان بەسەرماندا وەربوون، یەک دوو زەلام کە سەیریان کردم، دیاربوو بەزەییان بە من هاتەوە، هاتن دەستیان گرتم و ڕاستیان دەکردمەوە، هەتاکو قاچەکانم نەختە نەختە، جولەیان تێکەوتەوە. ئەوانیش بە هەردووکیان، تێروپڕیان بۆ شێلام و وردە وردە بەخۆکەتمەوە.

کاروانچییەکان ڕێگای خۆیان بەرەو خوار گرت. یەکێکیان دارەکەی دەستی خۆی دایە دەستم، بۆئەوەی پێی بڕۆم، کە سوودی زۆری هەبوو. ئەوجا بە ئێمەیان گوت: پاش نیو سەعاتی دیکە دەگەنە کاولەکانی گوندی "سونێ" و لەوێ، لە چەندان کەلاوەدا، ئاگری گەورەمان کردووتەوە، لەوێ دەحەسێنەوە و بە چاکی خۆتان وشک دەکەنەوە.

شەوەکە لە کۆتایی بوو، ئێمە بە هۆی بەئەسپایی ڕۆیشتنەکەی منەوە، درەنگ گەیشتینە ناو کەلاوەکانی "سونێ". دەمودەست بەدەوری ئاگری یەکێک لە ئاگردانە گەشەکان جێمان گرت. وەسمان زوو یەک باوەشە داری بڕاوی نوێی تێخست. ڕاستە من جارێکی دیکەش، لە ساڵی ١٩٧٤ دا، لە شەوێکی سەرمای تووشی بێپەروای سەرگەڵو، ئازاری زۆرم چەشتبوو و سەرما چاوترساوی کردبوم، بەڵام لەو سەرمایە نفوراتەی ئەو شەوەی لە ئاودانە، تا بڵێی ناجۆر و ئەژرەنگ بوو، کە لە بەردەمی ئەو ئاگرە خۆشە خۆم

دیتەوە، دوای مەودایەکی کەم بوژامەوە و جلوبەرگەکانی خۆمان وشک کردەوە. یەکسەر بەبێ شەرمکردن لە هەموو ئەو دەردەی دیتبووم، خەوم لێکەوت. کەچی وەسمان دەستوبرد، وەک وەفادارییەک، لەپێشەوە، هێسترەکەی بەسەر پاشماوەی ئالیکی ولاغی قاچاخچییەکان بەستەوە، ئەوجا بۆ خۆی هاتە بەر ئاگردانەکە.

ڕۆژ لە تاقی عاسمانێ بوو، کە وەسمان بێداری کردمەوە. لەخۆشییان، بەبێ ئەوەی ئەو چەرمەسەرییەی شەوم لەبیر مابێت، وەک تای تەورداسێ بەدوای وەسمان کەوتم. هەرچەندی کرد، بۆ لەمەودوا هەر بە پێ ڕۆیشتم. لەناکاو لە پەنایەکی قوتەی مامەندە دەسوڕاینەوە، گوندی شێنێ لێمان بەدیار کەوت. لە دوورەوە لە سەربانی هەموو ماڵەکانەوە، دووکەڵی لولەی زۆپاکان، بەری ئاسمانی گرتبوو. وەسمان وەک چۆن لە لایەن حەمەسووری سەنگەسەر راسپێردرابوو، دەست بەدەست منی تەسلیمی ئەو کەرتەی هێزی پارێزگاری سەرکردایەتی یەکێتیی کرد، کە بنکەیان لەناو گوندەکە بوو. هەر یەکسەر بەبێ وەستان، ماڵئاوایی لێم کرد و بە هەمان ڕێگا گەڕایەوە.

# ٣٢

لە بەهاری ١٩٨٠دا بە ئەرکی ڕێکخستنەکانی ناوخۆی کۆمەڵە، چوومە سەردانی ناوەندیی کۆمەڵە لە "خڕی ناوزەنگ"ی نێوان سنووری دوو پارچەی کوردستان. سەفەرەکە بۆ خۆی موجازەفەیەکی پڕ مەترسی بوو، بەڵام گیانی فیداکاری ئەوێ ڕۆژێی خەباتی سەختی هاوڕێ گیان لەسەر دەستەکانی کۆمەڵە، لە شار و شاخدا، ئەو ئەرکەی زۆر ئاسایی کردبوو. پێتان سەیر نەبێت، لەوێ ڕۆژگار زۆر کەس هەبوون، نەوەک هەر خۆیان لە قەرەی ڕێکخستن و هاوکاریکردنی تێکۆشەرە چاونەترسەکانی شار نەدەدا، بگرە لێرە و لەوێ کە توشمان دەبوون، دەکەوتنە پتک و پلار هلوێشتن. زۆریشیان خۆیان لێمان دەشاردەوە، نەوەک ببینە مایەی پێزانینی سیخور و بۆرە پیاوەکانی حیزب و دەسەڵاتی بەعسییەکان. کەچی ئێستاکێ ئەو کەسانە وەک بەرزەکی بانان، لەسەر ڕەوسەی سەروەرییەکانی خەباتی ڕۆڵە بەجەرگەکانی ئەوڕۆژێ، دەلەوەڕێن. خۆیان بادەدەن و چاوچنۆکانە گەرەکیانە و هەوڵ بۆ ئەوە دەدەن، هەموو دەستکەوتێک بۆ گیرفانی تایبەتی خۆیان قۆرخ بکەن!

بەرەبەری ئێوارە بوو، دوای حەسانەوە و خەوتنێکی چاک و ژەمە خواردنێکی پێشمەرگانە، لەپێشەوە لەگەڵ "نەوشیروان" بەدوور و درێژی کەوتینە باسوخواسی ڕێکخستنەکانی ناو شار، شیرازەی ڕێکخراوەیی کۆمەڵە و چۆنیەتی پێکهاتنی کۆمیتەی سەرکردایەی ناوخۆ، کە لەسەر بڕیاری ناوەندیی کۆمەڵە، ئەم ئەندامانە بوون، جەمال تاهیر کە تازە لە زیندان بەربوو، وەک بەرپرسی کۆمیتەکە و هاوڕێیان، بەندە لە هەولێر، سەلیم لە سلێمانی و ئەحمەد کرێکار لە کەرکوک.

نەوشیروان کەوتە خوێندنەوەی ئەو نامە و پۆستەی ڕێکخستنەکانی ناوخۆ کە من گەیاندبووم. "مەلا بەختیار" کە پێشتر چەند جارێک بە نهێنی هاتبووە سلێمانی، یەکترمان دیتبوو. لە ژوورەکەی "نەوشیروان" هاتە سەردانم و پێکەوە لەگەڵ ئەویش هەمان باسەکانی پێشووتر، دووبارە بوونەوە. ئەویش ڕا و سەرنجەکانی خۆی، کە ڕادەیەکی زۆر شارەزایی لەسەر ڕێکخستنەکانی سلێمانی و هەولێر هەبوو، قسەمان کرد. دیارە کاتی خۆی "**ئارام**"ی نەمر، باسی منی بۆ کردبوو، کە لە هەولێر ئەرکی دامەزراندنەوە و گرتنەوەی ڕێکخستنەکانی هەولێرم بە جیا خراوەتە سەرشان.

دواتر لەگەڵ "نەوشیروان" باسی کاروباری ڕێکخستن، چۆنیەتی پێوەندییەکانمان بە ناوەندی کۆمەڵە و جۆری هاوکاریکردنمان لەگەڵ هێزی پێشمەرگە کرد. ئەوەبوو هەر ئەوان لەلایەن خۆیانەوە هاتن و ڕۆیشتنی تەتەریان لەنێوان شار و شاخ گرتە ئەستۆ. زۆربەی پێوەندییەکانمان بۆ ناوچەکانی سلێمانی و هەولێر پێکتر بەستەوە، شوێن و خەڵکی باوەڕپێکراو بە ئاگاداریی شار و شاخ دانران. دەوری سەعات یەکی شەو لەگەڵ "نەوشیروان" چووینە سەردانی "مام جەلال"، لە شوێن و ژووری نووستنەکەی خۆیدا، کە هەر چواردەوری دیوارەکان بە کتێب و بڵاوکراوەی هەمەجۆر هەڵچنرابوون. تاڕادەیەکی زۆر سەرنجی ڕاکێشام و زۆر دڵم پێی خۆش بوو. مام جەلال زۆر بەگەرمی پێشوازی لێ کردین، لەگەڵ بەندە کەوتە گفتوگۆ و هەزارویەک پرسیاری لێ کردم. ناوناوەیش قسەکانی پێ دەبڕیم و دەیگوت: لێگەڕێ با من ئەوەت تێ بگەیەنم، یان بۆتی ڕوون بکەمەوە، کە لەسەر چۆنیەتی پێکەوەگرێدانی بازنەکانی خەباتی شاخ و شار ڕێنمایی و زانیاریی بەسوودی بۆمان باس کرد. هەتاکو هاتمە سەر ئەوەی، کە هەردوو لامان چ ڕێکخستنەکانی ناو شار و چ ئەوانەی شاخ، هەوڵی توندوتۆڵکردن و بەهێزکردنی ڕێکخستنەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بدەین و ڕێکخستنی فراوانی یەکێتی بە پراکتیک بکەینە پەرژینی دەوروبەری ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە. "مام جەلال" لەلایەن خۆیەوە چەند هەڤاڵێکی هەولێر و دەوروبەری، ڕووبەڕووی ئێمە کردەوە، نامەی تایبەتیشی بۆ نووسین کە لەگەڵ ئێمە هاوکاری بکەن، لە هەموو شتەکان ڕا و بۆچوونەکان تەواوکەری

یەکتری بوون، تەنیا بۆ مەسەلەی تەتەر، کە سکرتێری گشتی پێشنیازی شوێن و یەکێکی کرد، کە بۆ هێنان و بردنی پۆستە ئێمە سوودی لێ وەرگرین. ئەوەبوو نە ئێمە قبووڵمان کرد و "نەوشیروان"یش پشتگیری بەندەی کرد، کە ئێمەی کۆمەڵە بەسوپاسەوە ڕێگا و شوێن و خەڵکی دیاریکراوی خۆمان هەیە.

بەرەبەیان بوو لەلایەن "مام جەلال"ەوە بەڕێ کراین و گەڕاینەوە شوێنەکەی "نەوشیروان" کە ڕێگاکە سەرەوەهەوراز و هەمووشی بەستبووی. چەند جارێک بەربوومەوە و خلیسکم برد. "نەوشیروان" بە گاڵتەوە پێی گوتم: ئەوە تامی هەورازە، باش بوو ئەو ناوەت لە یەخە بووەوە، چونکە هەموومان زۆرمان ڕق لە هەورازە. بە هەر شێوەیەک بوو، گەیشتینەوە شوێنەکەمان. ڕۆژی دواتر کە من خەبەرم بووەوە، سەیرم کرد سەعات ١١ی پێش نیوەڕۆ بوو، دیسان دونیا ساماڵ بوو، "نەوشیروان" لەسەر جێگاکەی خۆی خەریکی نووسین و بڵاوکردنەوەی پۆستەکانی ئێمە بوو، ئەوەی پێویست بوو بەدەم بۆ منی دەگوت، بڕیار و ڕاسپاردەکانی بە نووسین بۆ ناوخۆ نووسی. دەبێ ئەوەیش بڵێم، لەپێش دیدارەکەی منەوە "حەمە چاوشین" ماوەیەک لەلای "نەوشیروان" مابووەوە و لە نزیکەوە زۆر ئاسانکاری بۆ سەفەر و ئاسینی من خۆش کردبوو، لە زۆر ڕووەوە لاوچاکی و هاوڕێیەکی زۆری بەرانبەر بەندە نواندبوو. هەتا پێشنیازی ئەوەی کردبوو کە من بکرێمە لێپرسراوی سەرکردایەتی ناوخۆ، بەڵام جارێ لە پێشەوە من خۆم ڕازی نەبووم، "جەمال تایەر"م پێ گونجاوتر بوو، کە تەنیا دووجار لە شار یەکترمان دیتبوو، بەڵام دواتر بۆ من ڕوون بووەوە، کە سەرباری ئەو پێناسە بە نرخەی "حەمە چاوشین" سەبارەت بە من، هەندێ هاوڕێی ناوەندی، لە پێوەندی گیانی بەگیانی من لەگەڵ **"ئارام"**ی نەمردا مورتاح نەبوون. هەر لەو ساوە من لەسەر هێڵی بیرکردنەوەکانی **"ئارام"** ناونووس کرابووم، کە هەنوکەیش زۆری پێ سەر بەرزم. گیانی ئەو هاوڕێیە نەمرە نەبوایە، بەندە جارێکی دیکە نەدەکەوتمەوە کاری ڕێکخراوەیی، کە هۆیەکەیش بۆ ڕۆژانی ساڵی ١٩٧٥ و دەرکردنی بەیاننامەیەکی ئاست نزم و هەڵسوکەوتی بەشێکی هاوڕێیانی کۆمەڵە لەوێ ڕۆژگاردا دەگەڕایەوە. کە هەوڵەدەم لە بازنەکانی لەمەودوا باسیان لێوەبکەم.

دیسانەوە "حەمە چاوشین" کە لەلای "نەوشیروان" بووە، پێسنیازی ئەوەی بۆ کردبوو، کە بەندە و ئەو، لە ڕێگای خوازبێنی خوشکێکی ئەو بۆ من، ببینە خزمی یەکتری. "نەوشیروان" زۆر جوامێرانە ئەوەی لەگەڵ باس کردم، منیش هەرچەندە لە دڵەوە پێم خۆش بوو، پێم گوت: بەرای من مەسەلەکە یەک لایەنی نابێت، من پێشووتر ژنم هێناوە، لە یەکتری جیابووینەوە، کوڕێکیشم هەیە، ئەگەر تۆ ڕات لەسەر بێت دەتوانی نامە بۆ ماڵەوە

و خوشکەکەت بنووسی، ئەگەر بەدڵیان بوو، زۆر چاکە و ئەگەرنا، هەر یەکەمان لە ماڵی خۆی. ئیتر نە ئەوان لە منیان پرسییەوە و نەمنیش بەدوایدا چووم.

پاش نیوەڕۆ، دوای نانخواردن سەروگوێلاکی خۆم پێچابووەوە و لەگەڵ "نەوشیروان" لە سەربانی ژوورەکەی ئەو، لە بەرخۆرەتاو پیاسەمان دەکرد، پێشنیازی ئەوەم بۆ کرد، کە حەز دەکەم چەند هاوڕێیەکی گیانی بەگیانی خۆم، کە ئێستا لێرە، لە سەرکردایەتی کادیرن، چاوم پێیان بکەوێ، ئەگەر ئەو پێی خراپ نەبێت. ئەویش لە وەڵامدا گوتی: نا من بۆ پێم خراپە، بەڵام ئەوە بەندە بە خۆت و ئەگەر بتەوێ دەبێ هەر ئەوڕۆ، یەک یەک چاوت پێیان بکەوێ، چونکە دەبێ بەیانی، کە ڕۆژی نەورۆزە تۆ بگەڕێیتەوە و خەڵکمان بۆ ئامادە کردووی. گوتم: زۆر باشە لەپێشەوە داوای دیدەنی "ئەرسەلان بایز"م کرد. پاش مەودایەک خۆی هاتە ئەوێ. ماوەی سەعاتێک پێکەوە دانیشتین و بە دیداری یەکتری شادبووینەوە. پاش ئەوەی نەمران، "مامۆستا کاوە و مەلا غەفور"یشم دیت. شەو درەنگانێ دووبارە "مەلا بەختیار" هاتەوە ئەوێ و هەندێکی تر پێکەوە دانیشتین.

بۆ بەیانی زوو لە خەو ڕابووم، دوای نان و چا خواردن، ژوورەکەی "نەوشیروان"م بە جێ هێشت، کە بەڕاستی فرمێسک بە چاوانمدا هاتە خوارەوە. هەر لە خۆمەوە پێم ناخۆش بوو، ئەوان لەو ژیانە ناخۆشە جێ دەهێڵم و خۆم بۆ شار دەگەڕێمەوە. "نەوشیروان" زۆر بەگەرمی بۆ سووربوون لەسەر خەباتی شار و پاراستنی ڕێکخستنەکان و گەشەکردنی ریزەکانمان. هانی دام و پێی گوتم: ئەگەر مەرگ ڕێگا بدات چ لە شاخ و چ لە شار یەکتری دەگرینەوە.

ئەوەبوو بە هێز و ورزەیەکی لە جاران پتەوتر، لەگەڵ بەڕێزان "بەکر پیرۆت"ی فەرماندەی خەباتی پێشمەرگەیی و "عەزیز"ی خوارزایدا، بەرەو خوارەوە بەڕێکەوتین. بۆ پاش نیوەڕۆ لە ئاقاری گوندی "سونێ" پەڕینەوە. کامە ڕێگای لاچەپ و دوورەچاو بوو، بەویدا دەڕۆیشتین. ئەوان یەکێکیان لە پێشەوە و من لە ناوەند، ئەوی دیکەشیان لەدواوە ڕێگامان دەبڕی. بەرەبەری ئێوارە، نمەنم باران دەستی پێ کرد. لە ڕێگای خۆمان لە دوو سێ شوێن کوارگی (قارچک) بەهارانەمان دەردەهێنا، لەسەر ئاگر سورمان دەکردەوە و دەمان خوارد، کە بۆیەکەمجار بوو خواردنی لەم جۆرە بخۆم. دونیا بە باشی تاریک ببوو، گەیشتبووینە دەوروبەری گوندی "ژاراوە" کە ماڵی باوکی "عەزیز"ی پێشمەرگە، لەوێ

بوو.[27] ' هێشتا زۆرمان مابوو بگەینە ناو ماڵەکان، هەرسێکمان لەنزیک یەکتری دەڕۆیشتین. ئەوان تفەنگەکانیان لە گۆلمی دەستیان بوو، منیش لەنێوانیانەوە. لەناکاو دەنگیان داین: کێن زەلام! بەکر پیرۆت خێرا خۆی گەیاندە من و بۆ سەرزەوی پاڵی پێوە نام و خۆمان بەناو قوڕ و چڵپاوەکە دادا. هەمان دەنگ زیاتر لێمان نزیک بووەوە و بانگی کردین: ئەگەر پێشمەرگەن، هەستن بە ئەسپایی بڕۆن و خۆتان تەرە مەکەن! دیار بوو "عەزیز"، خاوەن دەنگەکەی ناسی و بانگی کرد: فلان ئەوە من و بەکری خاڵم و برادەرێکین، هەر بۆ کارێکی بەپەلە دەچینە ناو گوند و دەردەچین! خاوەن دەنگەکە دیار بوو یەکێک لە جاشە چەکدارەکانی ناوچەکە و بۆ تەپکە لەو ناوە دانیشتبوون. ئیتر بەخێرایی هەستاینەوە، بە هەنگاوی بلەز خۆمان گەیاندە ناو گوندی و دەوری سەعات ١٠ی شەو بوو لە ماڵی "عەزیز" خۆمان گرتەوە. هەموو گیانمان قوڕ و چڵپاو بوو، ناچار ماڵەکە ژوورەکەی لێی دانیشتبوون، بۆیان چۆڵ کردین، جلەکانمان لەبەر کردەوە و سەر و شەلواری ماڵەکەمان لەبەر کرد و سەروگوێلاکی خۆمان پاک کردەوە. دوایی "بەکر پیرۆت" دەستەجلێکی ماڵی خوشکەکەی هەبوو، لەبەری کرد، سەرلەنوێ خۆی بەستەوە و بە خوشکەکەی گوت: ئەو برادەرە ئەمانەتی ئێوەیە و لە ڕێگا توشی فلانە جاش بووینە، دەزانی ئێمە هاتووینەتە ماڵی ئێوە، ئەوە خۆم دەڕۆم و پاش حەسانەوەیان با "عەزیز" و ئەو برادەرەیش لێرە نەمێنن، ببەنە ماڵی (....)، سبەینێ یەکسەر کارئاسانی بۆ بکات کە دەچێتەوە شار.

پاش ڕۆیشتنی "بەکر پیرۆت" من تۆزێک شڵەژام و ترس کەوتە دڵمەوە. پریسکە و نووسراوەکان، کە هەموویان لەناو نایلۆن پێچرابوونەوە، لە نیفۆی شەلوارە قوراوییەکەم بوون. هەموویانم دەرهێنا و ژنی ماڵەکە یەکسەر جلەکانی، کە بە قوڕ ببون، لەگەڵ جەمەدانییەکەی کە لە سەرم پێچابوو، هەمووی لێ وەرگرتم و بردی بۆ شووشتن. من و عەزیز لە بەرزۆپاکە خۆمان گەرم دەکردەوە، کە لەدەرگای دەرەوە درا. عەزیز تفەنگەکەی دەست دایە و سواری کرد، بە منیشی گوت، شتەکانی پێم بوون، هەمووی بخەمە بن ئەو دارانەوە کە بۆ سووتاندن دانرابوون و بەتانییەک بەسەر خۆمدا ڕاکێشم و خۆم خەوتوو نیشان بدەم.

---

[27] "بکر پیرۆت"ی قارەمان ئێستاکەش دەژی و ڕۆڵەیەکی هێجگار وەفادار و دڵسۆز و پڕ گیانی قوربانی بوو، لەگەڵ هەوراز و نشێوەکانی خەباتی پێشمەرگایەتی هەژاوە، هەنوکە لە ڕانیە نیشتەجێیە و مووچەکی خانەنشینی پێشمەرگەی دێرینی هەیە.

تومەز، هەر خودی "بەکر پیرۆت"، چووبووە ماڵێکی دیکە و یەکێکی باوەڕپێکراوی بەدوای مندا ناردبوو، کە بۆ دڵنیایی لەو ماڵە بگوازمەوە و بۆ ماڵی ئەوەی دیکە. کە پیاوەکە و عەزیز هاتنە ژوورەوە، تێگەیشتم شتێکی ئەوتۆ لەگۆڕێدا نییە. یەکسەر کەلوپەلەکانم لەژێر دارەکان دەرهێنا و خستمنە ژێر ئەو دۆشەکەی لەسەری دانیشتبووم. زۆری نەبرد ماڵەکە زۆر بەدەست و برد، چێشتی برنج و شلە و گۆشتێکی زۆری مریشکیان لەپێشمان دانا. دیار بوو لەو هۆدەی تەکمانەوە، جلەکانیان بۆ وشک دەکردمەوە. هەر کە لە خواردنەکەمان بووینەوە و دەستمان شووشت، جلەکانم کزر ببونەوە و بەخێرایی لەبەرم کردن و بەگەر کابرای دیکە کەوتم. ئەو شەوە نازانم چۆن نووستم، چونکە دەتوانم بڵێم زۆربەی کات بەخەبەر بووم. بەیانی بەر لە هەموویانەوە رابووم، ئاوم لەناو کتلی کرد و خستمە سەر پەنگرەکانی بەردەم زۆپاکەوە، کە هێشتا دارەکان بەتەواوی نەسووتابوون. ژنی ماڵەکە لە هاتنوچوونی من بۆ دەرەوە و ژوورەوە بەئاگا هات و سەرزەنشتی کردم، کە بۆ وا لەخۆمەوە ئاوم خستۆتە سەر ئاگر و دەمەوێ چای لێ بنێم!

دوای نانخواردنی بەیانی، لەگەڵ پیاوی خاوەن ماڵ چووینە سەر جادەکە، کە ترومبێل بۆ سلێمانی دەچوون، لەوێ منی بەڕێ کرد و لەگەڵ چەندان نەفەری دیکە، سواری لاندرۆڤەرەک بووم و بەرەو سلێمانی بەڕێکەوتین. هەتا هاتینە بازگەکەی تاسلوجە لە هیچ بازگەیەک کەس نەیگوت ماڵت لەکوێیە. لەو بازگەیە ئێمەیان راگرت، سەربازێکی دووخەت پێناسی لێمان داوا کرد. پێناسی هەموو نەفەرەکانی دایەوە، تەنیا ئەوەی من نەبێت، داوای "دەفتەر خدمە"ی لێ کردم، کە من پێم نەبوو. یەکسەر منی هێنایە خوارەوە، لەوێ تەماشام کرد پێڵاوەکانم زۆر سەیر قوڕاوی بوون، کە دەتگووت لە قوڕشێلان هاتوومەتەوە. کابرای سەرباز تەماشایەکی کردم کە جلی کوردیم لەبەرەو پێڵاوەکانم بەو جۆرە قوڕاوین، بەشوفێری ترومبیلەکەی گوت: ئێوە برۆن. منی گلدایەوە و گوتی: دەبێ لەگەڵ ئەفسەر قسە بکەم. منی لە قولغێکی پاسەوانی بەجێهێشت، بەراستی دڵم لەسەر سەد لێی دەدا، چونکە دەمزانی هەر بمگرن! راستەوخۆ دەمپشکنن و هەموو پۆستەکانم پێ دەگیرێ!

لەمەودوا هەموو بیر و هزری خۆم کۆ کردەوە. ئەگەر رادەکەم دەرچوونم مەحاڵە و بەیەکجاری خۆم گورگە دەکەم. لەو خەیاڵانەدا بووم، لەپڕ بیرم کەوتەوە، من نامەیەکی "دار الرقابە والنشر"ی بەغدادم پێیە، کە دامنابوو بچمە "قەڵادزێ"یش بۆلای "کتێبخانەی عەلی" بۆ سۆراغی ساغبوونەوەی نامیلکەی "قەندیلۆکە"، کە ماوەیەک بوو بە چاپ گەیشتبوو، کە لەلایەن بەندە و "تاریق جامباز"ەوە، کرابووە کوردی و نووسەری گەورە و نەمری فەلەستینی "غسان کنفانی" نووسیبووی. ئەوەبوو ئەو نووسراوە بۆ من بووە

گوریسی نەجات، دیم لە دوورەوە ئەفسەرێکی یەک ئەستێرە بەرەو قولغەکە دێت، یەکسەر رووی لە من کرد و گوتی تۆ بۆ "دەفتەر خدمە"ت پێ نییە؟ گوتم: قوربان من فەرمانبەرم و ناسنامەی دائیرەم پێیە. گوتی ئەدی بۆ پێڵاوەکانت وا قوڕاوین و لەکوێوە دێیتەوە، کە جەنابت فەرانبەری لەدواجنی هەولێر! ئەوەبوو من نووسراوەکەی بەغدادم دەرهێنا و پێم گوت: چووبووم بۆ قەڵادزێ لای کتێبخانەی کتێبفرۆشی کە بەدوای ساغکردنەوەی ئەو نامیلکەیەم چووبووم. سەربازەکەیش لێمان نزیک بووەوە، زۆر بە مۆنی سەیری منی دەکرد، بە تێڕوانینەکانی هەموو گیانی دەپشکنیم، بەراستی زەندەقم چوو بوو. هەر دەست بداتە بەر پشتێنەکەم، هەموو شتەکانم لێ ئاشکرا دەبێت! ئەفسەرەکە کە چاوی بە نووسراوەکە کەوت و لێمی وەرگرت، ناوەکەمی لەگەڵ ناسنامەکەم بەراورد کرد، خەندەیەکی بۆ کردم و پشووم هاتەوە بەرێ، گوتی: جەنابت دیارە نووسەرێکی پەڕپوتی، ئەو جلە ئوتونەکراو و پێڵاوە قوڕاوییەت لەبەردایە.!!! زۆر بە گەرمی دۆقەیەکی لەگەڵ کردم و داوای بوردنی لێم خواست و گوتی: دەبوایە ئەو نووسراوەت زوو پیشانی ئەو سەربازەی کۆنترۆڵ بدایە، من خۆم خەڵکی بەغدادم وماڵم هەر لە نزیکی بەڕێوەبەرایەتی رقابەی چاپەمەنییەکانە لە شۆریجە و زۆر خۆشحاڵم کە لەناو کوردیش ئەدەبیاتی عەرەبی بە زمانی کوردی هەیە.

منیش خواخوام بوو هەر زوو رزگارم بێت، گوتم: ئەوجا من چۆن بگەمەوە شار؟ یەکسەر بانگی سەربازەکەی کرد و گوتی: هەر سەیارەیەک هات، ئەو بەڕێزە لە پێشەوە سواربکە و بڵێ هەتا شاری بەرن و پارەشی لێ وەرنەگرن. من لەخەنیخۆشیان هەموو گیانم ببوو بە سوپاس بۆ ئەو ئەفسەرە، بەڵام جورئەتم نەکرد، ناو و ئەدرێسی لێ داوا بکەم. بەزوویی لێی دوور کەوتمەوە و یەکسەر سەیارەک پەیدا بوو. سەربازەکە منی سوارکرد و بۆی دەرچووم. بەڵام هەموو گیانم بەو سەرمایە بن ئارەقە کەوتبوو. هەر لە "کەندەکەوە" دابەزیم و یەک پێ چوومە، ماڵی دایکی "نەوشیروان"، کە لە خانووەکانی دەواجنی سلێمانی بوون. یادی بەخێر دایکی "نەوشیروان" هەر خۆی لە ماڵ بوو و زۆر بەخێرهاتنی کردم. گوتم پورێ، ئەو نامانە بۆ خۆتانە و توخوا ئەوانەش با لێرەبن هەتا دوای نیوەڕۆ بەدوایان دێمەوە.

ئەوەبوو پاش نیوەڕۆ لەگەڵ "جەمال تایەر" بەجووتە شتەکانمان وەرگرتەوە، شەو لە ماڵی مامۆستا "جەمال تایەر" مامەوە و بەیانییەکەی سەرێکم لە "ئەحمەد کرێکار" لە کەرکوک داو هەموو باس و خواسەکانی سەفەرەکەم بۆ هەردووکیان گێڕاوە و هەمان رۆژ گەڕامەوە هەولێر.

# ٣٣

ئەگەرچی بەهاری ساڵی ١٩٧٤، قوتابی دوا پۆلی کۆلیجی ئاداب بووم و وەک هەرزەکارێک بە ئەزموونێکی تاڵ و تفتی پێشمەرگایەتی و چوونە ریزی خەباتی چەکداری تێپەڕی بووم، کەچی هەڵگیرساندنەوەی خەباتی پێشمەرگانەی شاخەکانی کوردستان لەساڵی ١٩٧٦دا، سەرلەنوێ تامەزرۆی پێشمەرگایەتی کەلکەڵەی مێشک و دەروونی داگیر کردبووم. ئەو چەند جارانەی ئارام/م بینی، ئەوەم لێ دووپات دەکردەوە، کە دەمەوێ شانبەشانی ئەو هاوڕێیە قارەمانانە لە شار دەربچم و چەکی پێشمەرگایەتی لە شان بکەم. بە تایبەت ساڵانی ١٩٧٦ – ١٩٨١ ناوچەکانی هەولێر لە دوای ناوچەکانی بادینان، ئەڵقەی لاوازی هێزی پێشمەرگەی کۆمەڵە و یەکێتیی نیشتمانی کوردستان بوون. بەڵام ئارام قەناعەتی پێ دەکردم، کە واز لەو جۆرە بیرکردنەوە بهێنم، چونکە کاری رێکخراوەیی ناو شارەکان و خەڵک، زۆر گرنگ و پێویست ترە.

داخەکەم ئارام شەهید بوو. شەهیدبوون و ریبازەکەی زۆرتر بۆ بەندەیەکی وەک منی دەست و پێ سپیی ناو ژیانی سیاسەتی تێکەڵوپێکەڵی کوردان، یەک کوانووی لەبننەهاتووی درێژەپێدانی خەباتی دژوار و گوێنەدانە هەر جۆرە کۆسپ و تەگەرەیەکی مەرگەسات بوو. هەنوکەیش ئەو رۆژانەم دێتەوە بیر و بەردەوام دێنەوە خەونم. بە هەر جۆرێک سەربەرزانە لە ئەزموونی خەباتی ژێرزەمینی و بەبێ چاوترووکاندن هەتا ساڵی ١٩٨٠ لە شار بووم و سەرەتای هاوین بوو لە لای خۆمەوە گەیشتبوومە چەقی بڕیاری چوونە شاخ. ئەو رۆژە لەناو شارەکانی کوردستان سەرکردایەتی ناوخۆی کۆمەڵە، ببوە خاوەن دەسرازەیەکی پێکەوە لکاوی رێکخراو و کۆمیتەی جۆراوجۆر لە شارەکاندا. لەناو شاری هەولێریش بە دەستپێشخەری و چاونەترسی چەندان هاوڕێی ماندوونەناس و نەترس، تا رادەیەکی باش شیرازەکانی رێکخستنی ژێرزەمینی گەشەی کردبوو و بە جۆرێک چالاکییەکانی سەر دیوار نووسین، بڵاوکردنەوەی بەیاننامە و هێنانی پێشمەرگە بۆ ناو شار و دەستوەشاندن لە نۆکەر و پیاوەکانی رژێم، بارودۆخێکی شۆڕشگێڕانەی ساز دابوو. پاشان درکم بەوە کردبوو کە لەلایەن دامودەزگاکانی رژێمەوە کەوتوومەتە ژێر چاودێرییەکی وردەوە و لە چەند لایەکەوە، وەک دەزگای، "ئەمنی بلدە" و "ئەمنی هەولێر" بۆ لێکۆڵینەوە و بەدواداچوون بانگ کرابووم. هەتا جارێکیان لەلایەن جەوهەر کرمانجەوە پەیامی تەبلیغکردنم پێ گوترا، کە دەبێ لە رێگای واحید خۆشناوی ئەوکاتەی بەڕێوەبەری چاپخانەی شارەوانی هەولێرەوە، سەردانی دەزگای ئەمن بکەم.

لە پەراوێزی ئەو واقیعە پڕ ناخۆشە چاوەڕوانکراوەدا، هەر چۆنێک بوو کۆمیتەی سەرکردایەتی ناوخۆم قەناعەت پێ کرد، کە دەمەوێ بۆ شاخ دەرچم، تێکۆشەرانی خەباتی ژێرزەمینی، "سەلیم"، واتە دلێری ئەحمەد شوکری و ئەحمەد کرێکاری کەرکووکی لە ژیان ماون و مامۆستا جەمال تاهیر لێپرسراوی سەرکردایەتی ناوخۆ بوو، نارازی بوو، بەڵام دوای سووربوونەکەی خۆم و روونکردنەوەی بارودۆخەکە، بەتایبەت ئێمە لەگەڵ کۆمەڵێک هاورێ کە تازە خەریکی پێکەوە دروستکردنی مەفرەزەیەکی پێشمەرگەی ناوشار بووین، بە سەرپەرشتی برای چاونەترس "کەریم رەسول" و بەشداری "تەها فەقێ یوسف و سابیر رەسوڵ"، بۆ دەستوەشاندن لە کەسانی رژێم لەناو شاردا و کەوتبووینە بیری ئەوەی کە لەگەڵ دەرچوون، کارێکی شۆڕشگێڕانە ئەنجام بدەین. ئەوەبوو لەرێگای "حاجی ئەکرەم"ەوە، کە ئامۆزام بوو، کارمەندێکی شارەزا و بەتوانای کۆمەڵەی هەرەوەزییەکانی جووتیاران بوو لە دەشتی هەولێر، ئاگادار کرامەوە کە باشترین کار، دەستبەسەرداگرتن و فراندنی چەردەیەک پارەی هاتوو بوو بۆ ئەو کۆمەڵە هەرەوەزییانەی کە لەلایەن ئەندامێکی کۆمەڵە بەناوی بەهائەدین نوری بەرێوە دەبرا. هەتا ئەو رۆژەیش بەهائەدین کە بەرێوەبەری کۆمەڵە هەرەوەزییەکانی هەولێر بوو، راستەوخۆ پێوەندی رێکخراوەیی بەخۆمەوە هەبوو و ئەو مەسەلەیەم لەگەڵ باس کرد، ئازایانە گفتی هەموو هاوکاریکردنێکی دا بۆ ئاسانکاری و جێبەجێ بوون. خۆیشی هێشتا دەژی و هەنووکە نیشتەجێی سلێمانییە.

ئەوە بوو لەگەڵ حاجی ئەکرەم و کەریم رەسول و سابیر رەسول، پلانی چۆنیەتی جێبەجێکردنەکەمان دارشت و بە چاکمان زانی، بەندە بچێتە دەرەوە (شاخ) و لەگەڵ دەستەیەک پێشمەرگەی هەڵبژاردە بێینە دەوروبەری پردی (حاجی وسو)ی کۆتایی بەستی شەرغە لە رۆژهەڵاتی هەولێر و لەوێ پێشوازی لە فراندنی ئەو پارەیە بکەین و بە سەلامەتی دەستی بەسەردا بگرین. ئەوە بوو لە دواجاری بەشداریکردنم لە کۆبوونەوەی سەرکردایەتی ناوخۆی کۆمەڵەدا، پێشنیازی پاڵاوتنی کۆسرەت رەسول/م بۆ جێگاکەی خۆم کرد.

جەمال تایەر پێوەندی بە سەرکردایەتی کۆمەڵەوە کرد و ناوەندی کۆمەڵە رەزامەندی خۆیان بۆ دانانی کۆسرەت بۆ بەرپرسی هەولێر و ئەندامی سەرکردایەتی ناوخۆ دەربڕی. لە سەردانێکی جەمال تاهیردا، بەندە و کۆسرەت کە پێشتر خۆمان بۆ ئامادە کردبوو، دەور و تەسلیممان کرد و تێکرای کاروبارەکانی رێکخستنی شار رووبەرووی کۆسرەت کرایەوە و ئەویش هەروەک رابردووو، شانی دایە بەر ئەو مەسئولیەتە قورسەوە.

بەدوای چونەدەرەوەی بەندە و هاتنە دەورووبەری پردی "حاجی وسو" بە هاورێتی مەفرەزەیەکی پێشمەرگەی جەربەزەی هەرێمی هەشتی هەولێری یەکێتی، لە کات و دەمی دیاریکراودا، کەچی ئەو کارە بە هۆی نووسینی کورتە نامەیەک بەرەنگی سوور و دانانی لەسەر مێزی بەرێوەبەری گشتی کۆمەڵەی هەرەوەزی جوتیارانی هەولێر، بەهائەدین نوری، کە ئەو رۆژە فەرمانی سەرفکردنی ئەو چەردە پارەیە ئیمزا نەکات! مەگەر چەند کەسێکی وەک کۆسرەت و سەفین مەلاقەرە کە بەنهێنی ئەو کارەیان دەزانی، سەربردەی ئەو تەلەسمەیان لە لا بێت.

<u>سەرنج :</u>
تەواوکردنی درێژەی ئەو یادەوەرییانە بۆ زنجیرەی دووەم دەمێنێتەوە.

## ساڵی ١٩٨٠ و ڕۆژانی پێشمەرگایەتی لە شاخ

# ١

سەرەتای هاوینی ساڵی١٩٨٠ بوو، بە هاوکاریی "حەیدەر سوێری"، کە هەنووکەیش لەژیاندا ماوە، بڕیاری چوونەشاخم جێبەجێ کرد. ئەو وەک هاوڕێیەکی بە وەفا و سەربڵند، بە پیکابێکی پڕ بوز (سەهۆل) و شووتی، خۆمان گەیاندە گوندی "نازەنین"ی خۆشناوەتی. بۆ ماوەی چەند ڕۆژێک لەنێوان ماڵی "خاڵە کاکەی نازەنینی"، ماڵی "وەستا عەلی"، یادیان بەخێر، کۆچی دواییان کردووە. هەردووکیان دوو جوتیاری کوردپەروەری گوندەکە بوون و لە ئەندامە سەرەتاییەکانی ئەوێ ڕۆژانی ساڵی ١٩٧٦ی کۆمەڵە بوون. ماڵەکانییان، خاووخێزانیان و کەسوکاریان، وەک دوو وەکری نهێنیی باوەڕپێکراو لە نێوان ڕێکخستنەکانی شار و ڕێکخستنەکانی کۆمەڵەی ناو پێشمەرگە و شاخدا، خزمەتێکی زۆریان بە کۆمەڵە و یەکێتی و هێزی پێشمەرگە کردووە.[28]

---

[28] داخەکەم لە دوادیدەنیم لەگەڵ "خاڵە کاکە و وەستا عەلی"دا، کە لە ساڵی ١٩٩٢ بەسەردان لەوڵاتی سوید گەڕابوومەوە، هەردووکیانم زۆر ناگزور دیتەوە. خاڵە کاکە هەردوو چاوی کوێر ببوو. لەبیرمە بەهاوڕێیەتی "حاجی ئەحمەد نازەنینی"، یادی بەخێر ئەویش لەو ساڵانەی دوایی بە نەخۆشی کۆچی دوایی کردووە، کە تابلێی مرۆڤێکی چاوتێڕو دلسۆزی وڵات، خەمخۆری نەتەوەکەی بوو. ئەوەندەی پێڕاگەیشتم لە خزمەتکردنی درێخیم نەکرد.
یەکەمجار چووینە سەردانی خاڵە کاکە، کە لەناو کۆنە باخچەکەی خۆیانەوە، کەپرێکیان بۆ کردبوو. هەر لە دوورەوە کە گوێی لە دەنگمان بوو، هاواری کرد و گوتی: حاجی ئەحمەد ماڵت ئاوا، کە ئەو دۆستە خۆشەویستە، پڕ لە پیاوەتی و وەفادارەی من، "حاجی مەمۆ"ت هێناوە، کە دەزانم لە سویدەوە بۆ سەردانم هاتووە. هەتا هەنووکەیش لە یارمەتی خۆی و "دکتۆر مەجید"ی سەربڵند، درێخییان نەکردووە، کەچی ئەوانەی ئەمڕۆ لە سێبەری ماندووبوون و قوربانی ئێمەدا، لە ڕۆژە خۆشەکانی ئێستاکێ بوونەتە مەسئول، لەپاڵمانەوە، بێزییان نایەت سەردانم بکەن. ڕۆژە تەنگەکانی رابردوویان لەبیر نەماوە!
ئەوزاتانە، لەوان ڕۆژە ناخۆشەکاندا، بە چەندان هاوڕێیان بۆ کۆمەڵە لە ناوچەکە ڕێکخستووە، هەوار و ماڵەکانییان لە شەو و تاریکە شەوان بنەگەی حەسانەوە و پاڵدانەوەی ئەو بەناو "مارکسست ـ لینینیسستانە" بوون. بەڵام لە ڕۆژی کۆچی دوایی "خاڵە کاکە"دا، یەکێک لەو زاتە مەسئولانەم ئاگادارکردەوە،

چاوەڕوانی ئەو هێزەی پێشمەرگە بووم، کە لە ناوچەکە دەسوڕانەوە. ئەوەبوو شەوێکیان "شێخ عەلی" ناسراو بە "خولە کەشکۆڵ"، کە ئەو دەمە ئەندامی سەرکردایەتی کۆمەڵە و ئامرهەرێمی هەشتی هەولێری یەکێتی بوو، لە ماڵی "خاڵە کاکە" یەکترمان دیت. ئەو ڕۆژە کە هێشتا شەڕی عیراق و ئێران دەستی پێ نەکردبوو، پێشمەرگە هەر بەتاریکی و لە شەواندا، دەکاری بچێتە ناو گوند و لەگەڵ خەڵک تێکەڵ بێت و دەبوو بۆ پێش گزنگی خورەتاو گوند بەجێبهێڵێ و خواردنی دوو ژەمە لەگەڵ خۆی هەتا ئێوارە هەڵگری. شەوەکەی هەرچۆنێک بوو، "مامۆستا کاوە" کە ڕابەری سیاسیی هەرێم بوو، تفەنگێکی ژەنگاوی چینییان لەگەڵ چوار مەخزەنە فیشەک بۆ مەیسەرکردم و لە خۆم بار کرد. بەڵام تابڵێی شڕ و شپرێو بووم، چونکە هەر شتێکم لە هاوڕێیەک وەرگرتبوو.

بەنیازی ئەوە بووم کە بەدوای چەند ڕۆژێکی دیکەوە، دەست بەسەر چەردەیەک پارەی زۆردا دەگرین و خۆمان پۆشتە دەکەین. ئەوەندەیش تامەزرۆی پێشمەرگایەتی بووم، گوێم بە هیچ شتێکی نارێک، ناجۆر و دژوار نەدەدا. دوای باسکردن و مشورخواردنی بەپەلەی جێبەجێکردنی ئەو کارەی لەپێشەوە باسم کردووە، هەر شەوەکەی لە ئاقاری گوندی "سناوە"، لەگەڵ مەفرەزەیەک پێشمەرگە بە لێپرسیاری "عەلی سالح"، لەو هێزەی هەرێم جیا بووینەوە و بەرەو بەستی شەرغە، لە کەناری گردۆلکەکانی دێدەوان بەرێکەوتین. بۆ ڕۆژی دواتر شەوەکەی خۆمان گەیاندە گوندی "کرۆژ"ی باوەشی چیای باواجی. ڕۆیشتنی پێشمەرگەکان زۆر هێمن و ڕێکوپێک بوو، هەرچەندە ژمارەمان لە دوازدە پێشمەرگە تێپەڕی نەدەکرد، بەڵام هەمیشە دوو دوو بەرێدەکەوتین و مەودای دە مەترێک نێوانمان هەبوو و لەگەڵ تاریکبوون ئەو مەودایە نەدەما و هەموو وەک مێگەلە مەڕێکی غەوارە سەرمان بەدوو یەکترییەوە دەنا. لە هەموو ئانوساتێکدا نهێنیمان هەبوو، بۆ کاتی لێقەومان و کەوتنە بوسەوە، لەیەکدابڕان و یەکتر بزرکردن لە ڕۆیشتنی شەواندا، چونە ناو گوند و دابەشبوون بەسەر ماڵان و گەڕانەوە بۆ شوێنی دیاریکراو. هەموو ئەوانە بۆ بەندە لەو کەشوهەوایەی پێشمەرگایەتی، شتێکی پڕ زەحمەت بوو. ئەگەر دڵسۆزی و بەتەنگەوەهاتنی ئەو هاوڕێیە پێشمەرگانە نەبوایە، لە کەندولەندان بەجێ دەمام و هەڵتە دەبوم. سەرەتا زوو ماندوو دەبووم و پەنجەی پێیەکانم هەموویان بلۆقیان کردبوو. کە پێم بەر بەرد و ڕێڕەوی ڕەقەکار دەکەوتن، گیانم زریکەی دەکرد. بەڵام چونکە ڕێگایەک بە ئارەزووی خۆم گرتبووم، شەرمم دەکرد دەنگی نوزە و ئاخوئۆفان هەڵببڕم و

---

بەڵکو بەیەکەوە بەشداری پرسەکەی بکەین لە گوندی نازەنین، نەیهێناونەیبرد و گوتی: تۆیش سەیری! هیچ نەگۆڕاوی! من لەکوێ دەرفەتی چوونە گوندی نازەنینم هەیە!

هەرخۆم دەخواردەوە. هەنوکەش کە ئەو سەرەتایەم بیردەکەوێتەوە، هەموو گیانم دەقرقزێ و موچڕکانم پێدادێت! وەی لەوە..!

لە کاناری "باوەجی"یەوە گەیشتینە گوندی "گومەتار".کە ماڵە جوتیارەکان زانییان، ئێمە مەفرەزەیەکی پێشمەرگەی یەکێتین، زۆر بە نادڵی و نانێکی ساردوسڕیان لەبەرمان دانا. کەچی ئێمە وەک ئەوەی کەوتبینە سەر قاورمە، لەبرسان ئەو نانەمان زۆر بە چێژەوە نۆش کرد! کاتژمێر یازدەی شەو بوو، لەپاش دڵنیابوون لە نەبوونی کەمینی جاش و پیاوەکانی رژێم، لە جادەی کۆیە _ هەولێر بەسەلامەتی پەڕینەوە. سەعات دووی شەو گەیشتینە گوندی "گومەشین". هەرئەوەندەمان دەرفەت بۆ دانرا، کە بە هەر شێوەیەک بێت، ئەو خەڵکە لە شیرین خەوێ بێدار بکەینەوە و پێخۆری بەیانی و نیوەڕۆ وەرگرین. ئەوەش بۆ من مردنێک بوو بۆ خۆی! ئەوە بوو هەتا دەمەدەمی گزنگی خۆرهەڵاتن، لە هەڵەتوپەلەتەکانی نێوان گوندی "گومەشین" و گوندی "بایزاغا"، هەر یەکەمان بەدوای حەرەس دانانەوە، سەرخەوێکمان شکاند. بۆ بەختی من، ئەو عەردەی لێی پالکەوتبووم، تومەز شانە مێروستان بوو، پاش تاوێک هەموو گیانم بە مێروولە راگێڕدرا و ناچار لەبری خەوتن، کەوتمە پاسکردنی تێکڕای بەدەنم لە مێرولان. بەدوای نانخواردنی بەیانی لەو پێخۆرەی بە هەر یەکێکمان بوو، ملی رێچکەیەکمان گرت کە زیاتر بۆ کەندولەندانی بردین و مەودایەکی باش، دوو دوو بەدوای یەکەوە ئەو ئاقارەمان بڕی.

لە شوێنێک چەندان بن گەوەڕ و کەپکە کەندەلانمان دیتەوە، بۆ ئەوەی خۆمان لە ئاوەدانی و تیشکی گەرمای خۆر بشارینەوە، هەر چەند دانەیەک خۆمان کوتایە یەکێک لەو بن سێبەرانەوە. پاسەوانیش چوو لە یەکێک لە شوێنە بڵندەکان، بە چاوەکانی سێرەی لە دوورایی دەوروبەر گرت. دیسانەوە بۆ ژەمی نیوەڕۆیەکەی، سەرباری ئەوەی تیشکی خۆر، گەیشتبووە سەرتۆقەرەی سەرمان، بەسەرمانەوە گەمەی جەستەبرژاندنی لەگەڵ دەکردین، کەچی ئێمە لەو پێخۆرەی مابوومان، لە بەرخۆرەتاوەکە، ئەو عەردەی بەردەمی خۆمان، بەنوکە قەمەی تفەنگەکان خۆش کرد و وەک سفرە، هەریەکەمان پاشماوەی خۆراکی خۆمان لەسەر دانا. بەبێ هەر جۆرە فەرموو کردنێک، هەریەکەمان لە ئاست خۆیەوە، کەوتە پاروکردن. دیارە نانی زۆربەمان، هەر نانەوشکە و هەندێک لاچکە توور و چەند دانەیەک تەرەپیازیشی لەگەڵ بوو. بەو ئاوە گەرمەی لە مەتارەکانمان مابوو، ئەو ژەمەشمان بەسەربرد. بەڵام بەراستی تام و چێژی خۆی هەبوو. پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ، "عەلی سالح" لەگەڵ "هاوڕێ کاوە مەخموری" و بەندە، کۆبووینەوە، بەیەکەوە تەگبیرمان کرد و ئەو شەوەمان بردە ماڵی "کێخوا هەمزە" کە بەتەنیا وەک بنەماڵەیەکی مەڕدار لەو ناوە دەژیان. هەروەها دەمی خۆنزیکبونەوەمان بۆ سبەینێ لە پردی حاجی وسوی سەر

کۆتایی بەستی شەرغە، کە شوێن و مەوعیدی یەکگرتنەوەمان بوو، لەگەڵ هاوڕێیانی شار، تاووتوێ کرد.

ئێوارەکەی گەیشتینە ماڵی "کێخوا هەمزە" لەو گوندە. دیار بوو پێشمەرگەی یەکێتییان خۆش دەویست و بە گەرموگوڕی وەریانگرتینەوە، لە دیوەخانەکەیان جێگای هەموومانیان کردەوە. ژەمەخواردنێکی پڕگۆشتی مەڕ و قەلیان بۆ ئامادە کردین، کە بێجگە لە بەندە، لە مێژبوو پێشمەرگەکان ژەمەخۆراکی وا پڕ گۆشتیان نەخواردبوو. هەموو پێی شاگەشکە بوون. ئەوەندەی بۆمان خورا، درێخیمان نەکرد و "مام هەمزە" هەر دەیگوت، ئەوە چییە بۆ زوو دەست هەڵدەگرن. بۆ شەوەکەیشی هەر لەو دیوەخانە جێوبالینگانییان بۆ داناین و ماڵەکە بۆخۆیان گەرەکیان بوو پاسەوانیشمان بۆ بگرن، بەلام خۆمان ڕێگامان نەدان. "هاوڕێ کاوە" لیستی پاسەوانەکان و نهێنی شەوی دابەش کرد، کە هەریەکەی سەعاتێکی بەرکەوتبوو، بێجگە لە بەندە کە بۆ ئەو شەوە دانەنرابووم. بەیانی لەگەڵ گزنگی خۆرەتاودا، بەدوای خواردنی نانێکی گەرموگوڕی ئەو بەیانییە زووە، بۆ هەریەکەمان، دوو ژەمە خۆراکی پڕ هێلکە و تەماتە و بیبەری شین و تەڕەپیوازییان پێچابووەوە و هەر بە تراکتۆری خۆیشیان، هەتا ئاقاری "پردی حاجی وسو"یان بردین، کە بە یەک دنیا سوپاسگوزارییەوە بەجێمانهێشتن.

# ٢

برادەرانی ئەو مەفرەزەیەی باسیم گێڕاوەتەوە، هەر هەموویان لەو سەفەرەوە بوونە هاوڕێ و هاودەمی گیانی بەگیانیم و زۆربەشیان لە درێژەدانی کاروانی ئەو خەباتە جەنجاڵ و سەربەگۆبەندە، شەهید بوون. بەسەرکردنەوە و یادکردنەوەیانم بە پێویست و ئەرکی سەرشانی خۆم دەزانم.

"عەلی سالح": یەکێک لەو کرێکارە شۆڕشگێرانە بوو، بەدوای گرتن و ڕاوەدونانی هاوڕێیانی کۆمەڵە لەناو شاری هەولێردا، بەرچنگی دەزگا ئەمنییەکانی ڕژێم نەکەوتبوو. دلێرانە وەک پێشمەرگەیەکی مەفرەزە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە لە ناوچەکانی هەولێر، شانی دابووە بەر خەباتی چەکداری. خاوەن پشوویەکی درێژ و بە حەوسەڵە و ماندوونەناس بوو. بە هەناسەیەکی پڕ لە ئومێد دەژیا و کۆڵدانی نەدەزانی. هێمن و بڕوای بە فەلسەفەی خەباتی چینایەتیی چەوساوەکانی نەتەوە ستەمدیدەکەی هەبوو. هەتاکو دەمی

خۆشەهیدکردنەکەی لە شەڕێکی دەستەویەخەدا لەگەڵ هێزەکانی رژێمی بەعس، تاکو بەبرینداری نەکەوێتە دەست دوژمن. ئەو بەردەوام لەسەر خەباتی بێوچانی پێشمەرگایەتیی تژی لە گێرەوکێشەی بێشومار، بەرگەی هەموو تاڵوتفتی و ناهەمواریییەکانی گرتبوو. لەگەڵ خەڵک سادە و ساکار بوو و دۆست و خۆشەویستی زەحمەتکێشان بوو. بەدڵ شەهید "ئارام"ی خۆش دەویست و لە تەمەنی پێشمەرگایەتی، بەهاوڕێتی کۆمەڵێک پێشمەرگەی کۆمەڵە لە ناوچەکانی هەولێرەوە خۆیان گەیاندبووە ناوچەی قەراخ و سەردانی "ئارام"یان کردبوو.

"کاوە مەخموری": ناوی عەبدولکەریم بوو. یەکێک لەو دەستە پێشمەرگە سەرەتاییانەی ناوچەکانی هەولێر بوو، کە دەست و قامی جوامێری بە باڵای خۆڕاگری، سەروەرییەکانی خەباتی چەکداریی نوێ و دانانی بەردی بناغەی گەشەکردنی هێزی پێشمەرگە و موقاوەمەت لە ناوچەکانی هەولێر، دەشەکێتەوە. "کاوە مەخموری" لە رووداوێکی ناخۆشدا و بە دەستکێشی عەقڵی ژەنگاوی کوردی، لە لایەن بۆرەپیاوێکەوە بەنامەردی لە گوندی بالیسانی بنکەی مەڵبەندی یەکێتی نیشتمانی تیرۆرکرا! کاوە نموونەی مرۆڤێک بوو کە لە هەرەتی تەمەنی هەرزەکاری، چەکی موقاوەمەتی لە دژی رژێمی بەعسییەکان لەشان کردبوو و هەر بە گەنجێتیش هاتبووە ریزەکانی کۆمەڵە. شێلگیرانە لە خۆپێگەیاندن سووربوو، وەک ئینسانێکی سەربڵند و بەوەفا، کەوتبووە ناو کورەی خەباتێکی بێوچان و سەخت و دژوار. بە حەق بەرگەی هەموو ناخۆشییە یەک بەدوای یەکەکانی گرتبوو. ئەو رۆژەم لەبیرە کە ئێوارەیەکی دەمەو عەسرێکی درەنگ، کزەبایەکی بەفراوی هەڵیکردبوو، من لەو هۆدەیەی گوندی نازەنین، خەریکی ئامادەکردنی ژەمەخواردنی ئێوارە بووم، کاوە بەهاوڕێتی "سەید جەوهەر" لێم بەژوور کەوتن، بەدوای دانیشتن، حەسانەوە و نانخواردنی ئێوارە، بەجووتە لەسەربانە بچکۆلانەکەمان و بەدەم پیاسەکردنەوە، کاوە بە زمانێکی پڕ لە گەردنئازاییکردن، ئەوەندە سادە و دڵسۆزانە قسەی کرد، بە هەموو گیان و جەستەم لەگەڵی هەژام. دەتگوت بە تێکڕای هەست و نەستی بەرەوپیری مەرگی خۆی هەنگاو دەنێ. ئای ژیانی ئەو پێشمەرگایەتییە، چەندان کارەساتی تراژیدیاوی لە هەمێزگرتبوو، بەتایبەت بۆ ئەوانەی بە ویژدانێکی زیندوو و بیرێکی گەش، ئەو رێگایەیان هەڵبژاردبوو. دەیان رۆڵەی جەربەزەی وەک کاوە، عەلی سالح، ئەحمەد قەمبەری و قاسم کرێکار... هتد بوونە سووتەمەنی و گەندەخۆران لەسەر خەرمانی قوربانیدانییان دەگەوزن..!

"ئەحمەد قەمبەری": ئەو چرکە ساتە بێزەوەرەی، هەواڵی جەرگبڕی شەهیدبوونیمان بەرگوێ کەوت، وەک برووسکە ئاسای لەباربردنی پەڵە هەورێکی ئاوس، عەشقێکی پڕاوپڕ

لە پاکی و بێگەردی، تارمایی مرۆڤدۆستیی ئینسانێکی گەورەی، لە بەرچاومان هەڵوشی! هەر ئەو رۆژە لەگەڵ شەماڵ و هاورێیەکانی دیکە، لە گوندی وەرتێ، سەرگەرمی بەچاپگەیاندنی دوالاپەرەکانی دوا ژمارەی گۆڤاری پێشمەرگە بوین. بۆ شەوەکەی شەماڵ، کە بەشێکی ئەزموونی پێشمەرگایەتی لەشانی ئەحمەد قەمبەری بەسەر بردبوو، بە شیعرێک منیش بە پارچە پەخشانێک، وەک جووتە کۆترێکی باڵکراو، لە هەمێزی لاپەرەکانی کۆتایی ئەو گۆڤارە، بوینە میوانی گیانی نەمری ئەو مرۆڤە گەورەیەی لەکیسمان چوو. لە ژیانم ژمارەگەلێک هاورێ و دۆستی گیانی بەگیانی، دەستە برای ئەو کاروانەم بوون. بەشێکی هێجگار زۆریان لە نموونەی ئەحمەد قەمبەری لەناو کەرەسیسەی خەباتی چەکداری، ئاشنا و هاورێیەتیمان کەوتبووە گاگۆلەکردنەوە. داخەکەم زوو بەندەیان بۆ تلانەوەی بەردەم ئەو چیراوکە نەپساوەی نەگبەتییەکان بەجێهێشت..! لە سەیرکردنی بەژن و باڵای ئەحمەد قەمبەری، لە تۆپەڵێک بەرخۆدان و لە نەسرەوتنی بەرچۆراوکەی زەحمەتییەکان دەچوو. راستە کورە جوتیارێکی زەحمەتکێشی گوندی قەمبەری وێرانە، گوزەرانی کولەمەرگی ئەوێ رۆژێ بوو. هەمیشە رووگەش، دەموچاو میهرەبان، سادە و بەرچاوگەش، هێمن و بەپرسیار بوو، بەڵام هەمیشە بەدوای بیرکردنەوە قسانی دەکرد. لە ئازایەتی کەموێنە بوو. لەگەڵ ئەوەش بەدیداری "ئارام"ی سیمبۆلی زەحمەتکێشان نەگەیشتبوو، کەچی باسکردنی بیرە گەشەکەی، کار و رەفتارە شۆرشگێرەکانی "ئارام"، وێردی سەرزمان و خولیای بیرکردنەوەی بوو. بەڵێ ئەحمەد قەمبەری پێشمەرگەیەکی پارتیزانی پڕبەپێستی پێناسەکانی "ئارام" بوو. هەرگیز لە سێبەری تفەنگەکەی ئازاری بەو خەڵکە نەگەیاندووە، کە خەباتی بۆ دەکردن. ئەو نازی بەسەر کەسەوە نەدەکرد و خەباتکردنی بە ئەرکێکی سەربڵندانەی خۆی دەزانی، بۆیە هەردەم لەگەڵ ئەو سەرەتایانە شارەزا و بەحەوسەڵە بوو. ئەحمەد قەمبەری دوژمنی باوککوژەی شەڕی دۆڕاووبێهودەی کوردکوژیی ناوخۆ بوو، کەچی لەو جۆرە شەڕە نگریسە، جوانەمەرگ بوو. ئەستێرەیەکی دیکەی ئومێدی زەحمەتکێشانی قەمبەر و سەرتاپای کوردستان کوژایەوە.

"سەید جەهەر": کورێکی چەند هێمن بوو، ئەوەندەیش قۆشمە و دەم بەپێکەنین بوو. وەڕسبون، تورەیی و قەڵسبوون بە روخسارییەوە ئاشنا نەبوون. راستە خوێندەوارییەکی سەرەتایی هەبوو، کەچی تا بڵێی وریا، زیرەک و گورجوگۆڵ بوو. رۆژ بەرۆژ لەگەڵ هەڵکشانی تەمەنی پڕ وەیشومەی پێشمەرگایەتی ئەوێ رۆژێ، وەک کادرێکی سەربازی جەسوور باڵای دەکرد. بەڵام شەهیدبوون بینەقاقای ئەویشی گرت و وەک رۆڵەیەکی جوانەمەرگ بەزوویی ماڵاوایی کرد.

"برایم سماقە": بەژیان ماوە و وەک مرۆڤێکی بێمنەت و سەربڵند، نانی بەروبوومی زەحمەتکێشیی خۆی و ژن و منداڵە بێنازەکانی دەخوات. لە گوندی سماقەی رۆژئاوای کۆیە بە مەڕداری و بزنەوانی ژیان دەگوزەرێنی. ئەو رۆژانەی کۆمەڵە و هێزی پێشمەرگەی یەکێتی لە ناوچەکانی هەولێر، باری کەسر و بازنەی لاوازیبوون، ئەو برایم سماقەیە، لەشانی هاوڕێیانی کۆمەڵە و لەژێر کاریگەریی بنەماڵەی شەهید عەلی مەولوود داربەسەری، [29] وازی لەشوانیکردن دەهێنا و چەکی پێشمەرگایەتی لەشان دەکرد. لە هەمێزی خەباتی چەکداریدا، بەدڵ و بەگیان تێکەڵ بە کۆمەڵە ببوو. ئایەتەکانی خۆراگری، دروشم و سەردێرەکانی خەباتی چینایەتی ئەزبەر دەکرد و لەگەڵیان دەهەژا. وێنەیەکی زیندووی وەفاداری و ریزو سەروەری ئەودەمی ئەو رێکخستنە بوو.

"مەلا عزیز": (غەفور بەردەسپی)، رۆڵەی خێزانێکی زەحمەتکێشی گوندی "بەردەسپی"ی بەستی شەرغەی رۆژئاوای وڵاتی کۆیە بوو. لەناو ئێشوئازاری هەژاریی و نەخوێندەوارییی، لەگەڵ تامی ژیانی نەداری فرچکی گرتبوو. نموونەی ئازایەتی و چاونەترسی، کوڕی تەنگانە و جوامێریی دەمی لێقەومان و تەنگەتاوی بوو. هەرگیز بە خەیاڵیدا نەدەهات، لە بەرانبەر ئۆردویەک لەشکری دوژمن و نەیار، چۆکدابدات. خاوەن هەست و نەستێکی ناسکی خۆڕسک بوو. دوژمنی ئاغای زۆردار، چەوساندنەوەی مرۆڤ، ملکەچی و ماستاوکردن و مەدەلایی ناسیار نەبوو. داخەکەم بەکوێرایی بازرگانەکانی شەڕی بێهودەی کوردکوژیی ناوخۆ، ئەویش بووە قوربانی و سووتەمەنی ئەو جەنگە و گیانی پاکی بەخشی.

"قاسم کرێکار": کوڕی مەلامەحەمەدی نێرەگێنی بوو. ئەندامی کۆمەڵە بوو لە ناو شاری هەولێر. لە ساڵی ١٩٧٦ بەر شاڵاوی گرتن کەوتبوو، بەدوای چەند ساڵی زیندانەوە، لە ساڵی ١٩٧٩ بە لێبوردنی گشتی بەربوو و یەکسەر چەکی پێشمەرگایەتی لە شان کردبوو. هەر لەو یەکەم هەفتەیەی دەستپێکردنی ژیانی پێشمەرگایەتیم، لە هاوینی ساڵی١٩٨٠ بووینە دوو هاوڕێی گیانی بەگیانی یەکدی. هەتا لە رووی فیکری و تاووتوێکردنی ئەومەسەلە ئایدیۆلۆژییانەی ئەوێ رۆژێ، لە رۆژمێری خەباتی کۆمەڵە برەوی هەبوو، لەزۆربەی سەرەداوەکان یەکترمان دەگرتەوە.

---

[29] عەلی مەولوودەی وەک ئینسانێکی کۆمۆنیستی شۆڕشگێری سەردەمی خۆی، لەو رۆژانەی حیزبەکەی _ حشع _ بەرەی بەعسی گرت، لەدەمی هەڵگیرساندنەوەی شەڕی بەعس لە دژی بزاڤی نیشتمانی کوردستانی باشوور، ئەو مرۆڤە نەمرە لەو ئەندامە کوردە تاکوتەرایەنەی شیوعییەکان بوو، ریزی دەیان ساڵەی حیزبی بەجێهێشت و سەنگەری نەتەوە ستەمدیدەکەی خۆی گرت. داخەکەم لە پەلامارێکی بۆردومانی فرۆکە جەنگییەکانی رژێمی بەعس، لە ناوچەی ناوپردان شەهید بوو.

بنەماڵەی مەلا مەحەمەد نێرەگینی (یادی بەخێر کەبەدەستی جاشێکەوە لەناوشاری هەولێر تیرۆرکرا) لەناو گوندەکانی بەستی شەرغە ی رۆژهەڵاتی هەڵەتەکانی دیدەوان، یەکێک لەو خەڵکە تاکوتەرایانە بونە، لەگەڵ کۆمەڵە و پێشمەرگە و مەفرەزە سەرەتاییەکانی "ی. ن .ک" دانویان کوڵاوە. ئەوەندەی بەندە پێی ئاگادار بم، لە ساڵی ۱۹۷۷ ماڵ و هەوارەکەیان لە گوندی و سەر شیناییەکەیان لە دەمی بەستی شەرغە، وەکرێکی نهێنی رێکخستنەکانی کۆمەڵە بووە. من بۆ خۆم لە رێگای راسپاردەی "ئارام"ی نەمرەوە، کەلوپەلی پێویستم بۆ ئەو پێشمەرگانەی کۆمەڵە بردووەتە ئەو ماڵە. هەتا دەمی ئەنفالەکان، هەمیشە پۆستەبەری نێوان شار و پێشمەرگە بوونە. لەو کاروانەدا قوربانی کەموێنەیان داوە. بێجگە لە شەهیدبوونی قاسم کرێکار و سلێمانی برای کە هەردووکیان لە گەرمەی شەڕی پێشمەرگایەتی لە دژی هێزەکانی رژێم شەهید بوونە، سێ برای دیکەیان بە ناوی "عەبدوڵڵا، دارا و دەروێش" ئەنفال کران، واتە شەش شەهیدی یەک خێزان! کەچی یەکێک لەو برایانەی ئەو شەهیدانە کە هەتا دانیشتووی گوند بوو، لەوێ رۆژانی تەنگانەی پێشمەرگایەتی، لە گیرفانی خۆی و لەسەر بژێوی ماڵ و منداڵەکانی، بەردەوام ناندەر و خەمخۆری بەجێگەیاندنی کاروبارەکانی ئەو پێشمەرگانە بووە، هەنووکە کە باری تەندروستی روو لە خراپییە، ناوناوە بە پارە عەملیاتێکی جەستەیی ئەنجام دەدا. قاسم کرێکار، وەک کرێکارێکی تامەزرۆی هوشیاریی چینایەتی، لە خەباتی چەکداری شاخدا، هەمیشە بەدەم فێربوون و چاکتر قاڵبوونەوەی فیکری، مرۆڤێکی سەرڕاست و سادە و خاکی بوو، بێ نازوفیز، هاوکاریی هەموو زەحمەتکێشێکی ئەو گوندانەی دەکرد، کە رێگای دەکەوتە لایان و بەردەوام بەتەنگ داواکارییەکانییانەوە دەچوو. لە هەر گوندێک کەسێکی بەلەنگاز، پیر و پەکەوتە، ژن و منداڵی سەقەت هەبوایە، دۆستی قاسم بوون و لە هاوکاریکردنیان دریخی نەدەکرد.
برادەران سەفینی مەلاقەرە، دلێری کانیلەلەیی و فارووق عەلی مولوود کە بەژیان ماون، لەو مەفرەزەیە بەشدار بوون..

# ۳

ئێمە لە چێشتەنگاوەوە، کە گەیشتینە ئاقاری شوێنی مەبەست، هەر چەند دانەیەکمان لە پەنا کەندەلانێکەوە، خۆمان مەلاس دا و پاسەوانیش لە شوێنێکی بڵند، بەسەر ناوچەکەی

دەڕوانی. بە هەر شێوەیەک بوو، وەختمان گەیاندە بەرەبەری پاشنیوەڕۆیەکی درەنگ، نائومیدی باڵی بەسەر بەندە داگرتبوو. عەلی ساڵح وەک ئەوەی دڵی خەبەری دابێت، لەودەمەی دۆشداماوی بیرکردنەوەکانمدا، سەرتاپای بیر و هەستمی هەڵەداوان کردبوو. لەگەڵ "هاوڕێ کاوە" لێم نزیک بوونەوە و پێیان گوتم: لەوە زیاتر مانەوەمان سوودێکی نییە. باشتر وایە ئەو ناوە بەجێبهێڵین. ئیتر هەموومان خەریکی خۆکۆکردنەوە بووین، لەپڕ دیتمان سوارماتۆڕێک بەتەنیا گەیشتە سەر پردەکەی حاجی وسو و لەوێ وەستا، وەک کە نیشانەمان دانابوو. نەفەرە سوار ماتۆڕەکە هاتە خوارەوە، سەیری دەوروبەری دەکرد. منیش بە دووربین، سێرەم لێ گرت و ئەو سوارماتۆڕەم ناسییەوە، کە سابر رەسوڵ بوو. لەگەڵ قاسم کرێکار بە پەنادزە خۆمان گەیاندە نزیکی، ئەویش کە ئێمەی ناسییەوە، لێمان هاتە پێشەوە و بەجووتە کەوتینە قسەکردن و هەواڵی جێبەجێنەبوونی کارەکەی بۆ باس کردم. سابر لە لای خۆیەوە هەستی بە نیگەرانی من کرد، دڵی دامەوە و دڵنیای کردم، کە ئەو کارە هەر دەکرێ. ئەوەیشی پێ ڕاگەیاندم، کە حاجی ئەکرم و کەریم رەسوڵ دەیانەوێ بمبینن. منیش گفتی دیتنیانم لە ئاقاری گوندی "داربەسەری گچکە" پێ دان. لەدوای سێ ڕۆژی دیکە. ئەوجا بە هەناسەساردی لەگەڵ سابر ماڵئاواییمان لەیەکتر کرد. ئەویش بەڵێنی خۆی دووپات کردەوە، کە لەو یەک دوو ڕۆژەدا، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی دیکە پێوەندی بە هێزی پێشمەرگەوە دەکەن و بەیەکجاری دێتە شاخ.

ئێستاش لەبیرمە، دەتگوت لەو شوێنە چۆکم شکاوە، بەزۆر هەنگاوم هەڵدەگرت، قاسم کرێکار بن باڵی گرتبووم و بەزۆر لەگەڵ خۆیدا دەیبردم. ئەوە یەکەم جارم بوو ئەوەندە شۆک ببم و وەک گۆج دەڕۆیشتم. کە گەیشتینەوە پێشمەرگەکانی دیکە، عەلی ساڵح و کاوە مەخموری بە هەواڵەکە نیگەران بوون، بەڵام تازە چیمان پێ دەکرێ. بە ناچاری ملی ڕێگامان بەرەو ئاقاری گوندی بانیماران گرت. ئەوەبوو پیکابێک لە شار دەگەڕایەوە، لە دوورەوە درکی بە ئێمە کرد و ڕێگاو ڕێگا بۆ پاشەوە گەڕایەوە. ئێمە بەخێرایی ئەو ئاقارەمان بەجێهێشت، لە ترسی چوغڵکردنمان و پەیدابوونی مەفرەزەی جاش و هێزی دوژمن. بۆ شەوەکەی دوایی سۆراغ وەرگرتن بەئەسپایی، لە پەنایەکەوە، چووینە ناو گوندی و بەسەر چەند ماڵێک دابەش بووین. پاش حەسانەوە، نانخواردن و وەرگرتنی خۆراک بۆ ڕۆژی دوایی، گوندەکەمان بەجێهێشت و لە پەنایەکی دووری گوندی، عەلی ساڵح و ئەو پێشمەرگانەی مەبەستی بوون، لێمان جیا بوونەوە و لەگەڵ کاوە شوێن و کاتی یەکترگرتنەوەیان دانا و هەر گرووپە و بە لایەکدا ڕێمان گرت.

ئەو ڕۆژ و شەوانە لەو ئاقارە دەخولاینەوە، تاکو بۆ کاتی بەڵێنەکەمان، خۆمان گەیاندە ناو بیستانەکەی کەناری گوندی "داربەسەری گچکە"، دەمە دەمی نیوەڕۆ حاجی

ئەکرەم و کەریم رەسول لە شاری هەولێرەوە بە سواری ماتۆرێک پەیدابوون. لەگەڵ خۆیان هەندێ خواردن و کراس و پێڵاو و چەندان رۆژنامە و کتێب و نامیلکەی چاپکراوی نوێیان هێنابوو. پێشمەرگەکان خەریکی ئەو شتانە بوون و منیش لەگەڵ ئەو دوو هاورێیە دانیشتم و سەربردەی جێبەجێنەبوونی کارەکەیان وەک خۆی گێرایەوە. حاجی ئەکرەم کە دەرچووی ئامادەیی کشتوکاڵی بوو، لەگەڵ رۆژانی پێشمەرگایەتیی خەباتی چەکداریی ئەیلول، لە ساڵی ١٩٧٤ـەوە هاتبووە ریزەکانی کۆمەڵەوە. چالاکییەکی بەربڵاوی لەناو جووتیاران و کۆمەڵانی خەڵک هەبوو. خاوەنی یەک سەلیقە و سوخەتی شۆڕشگێڕانە بوو، کە بەزویی دەبووە دۆست، تا بڵێی رووخۆش و ئیسک سووک بوو. کە بۆ جاری دووەم کارەکەی جێبەجێ کرد و برە پارەکەی هێنایە دەرەوە، تەسلیمی لێپرسراوی رێکخراوی ئەودەمی هەولێر، "کۆسرەت"ی کرد. خۆی لە نزیک و دوورەوە دەستکاری ئەو پارەی نەکردبوو و بەو هۆیەوە هەموو کەسوکاری گیران، بە تایبەت هاوسەرە بەجەرگەکەی بۆ چەند ساڵێک لە زیندانی فاشییەکان بوو. کەچی هەنووکەیش کەسانی بێچاوورِوو هەن، ناوناوە و لێرەولەوێ، خۆیان بە فس فس پاڵەوانی ئەو پارەدەرهێنانە دەخوێننەوە، بەبێ ئەوەی شەرم لە قوربانی حاجی ئەکرەم و هاوسەرەکەی بکەن!

حاجی ئەکرەم لەگەڵ هاتنەدەرەوە و بوونی بە پێشمەرگە، زوو جێگای خۆی کردووەوە، بووە کادرێکی بەرچاوی گۆڕەپانی خەباتی پێشمەرگایەتی و لەگەڵ دروستبوونی کەرتی شەقڵاوەی رێکخستنەکانی کۆمەڵە، کە ئەو رۆژە هەموو ناوچەکانی دەرەوەی شاری دەگرتەوە، بە ئەندامی کەرت دیاری کراو و رۆڵی جوامێرانەی هەبوو لە گەشەکردن و پەرەسەندنی رێکخستنی کۆمەڵە و چالاکییە جەماوەرییەکانی یەکێتی لە تێکرای ناوچەکاندا. لە بەرەبەیانی ١٩٨٣/١١/٢٣دا، ئەویش یەکێک بوو لەو کۆمەڵە هاورێیەی لە کارەساتەکەی گوندی "قورەبەرازە"ی بتوێن، شەهید بوو.

هێژا "کەریم رەسول"یش، کە ئینسانێکی تا بڵێی هێمن و لەسەرەخۆ، رەوشت و ئاکار بەرز، خۆڕاگر و پشوو درێژ و حەوسەڵەیەکی ماندووپرووکێنی هەبوو، بە درێژایی ئەو رۆژە دژوارانەی ١٩٧٥ – ١٩٨٠ کە هاتبووە ریزی کۆمەڵەوە، هاورێیەکی چالاکی ناو شار و ئەندامی رێکخراو و بەرپرسی مەفرەزەی چەکداری ناو شار بوو. هەرگیز رۆژێک نەمدیت تەنگەتاو و ورە نزم بێت. باوەرێکی لەبنەهاتووی بە دوارۆژ و سەرکەوتن هەبوو. ئەو کە ماوەیەکی زۆر پێوەندیی رێکخراوەیی لەگەڵ بەندە هەبوو، پشت و پەنایەکی قایمی رێکخستن و من بوو. لە کارکردن و قوربانیدان سڵی نەدەکردەوە. داخەکەم لەو رۆژەی کە لەو شوێنەی لە پێشەوە باسم کردووە، یەکترمان دیت و هەندێ نهێنی کارەکانی ناو شاری بۆ گێرامەوە. من وەک هاورێیەک لێی پاڕامەوە کە واز لەو کارە

بهێنێ، بە تایبەت کە ناوی چەند گومانلێکراوێکی هێنا، کە بڕیار بوو بەیەکەوە کاری شۆڕشگێڕانە لەناو شاری هەولێر ئەنجام بدەن، نە بە قسەی من و نە بەقسەی کەسی تری کرد، کە واز لەو،کەسانە بهێنێ. ئەوەبوو زۆر بە ئاسانی کەوتە داوی دوژمن و بە چەک و پلان و کۆمەڵێک نهێنییەوە گیرا. بەڵام گیان و جەستەی خۆی کردە قەڵغانی پاراستنی نهێنییەکان، بەمەرگی سەربەرزی، دەرسدانەوەی قوربانیدان، وەڵامی ئەشکەنجەی دڕندانەی دەزگای موخابەراتی دایەوە. وەک من پێی بزانم لەژێر باری ئازاردانی نامرۆڤانە گیانی بەخشی بە کۆمەڵە و یەکێتی.

کە دەسرازی ڕۆژمێری پێشمەرگایەتیی ئەو ڕۆژانەی سەرەتای هاوینی ساڵی ١٩٨٠ دەخوێنمەوە و تاڵ و تفتییە لە ڕادە بەدەرەکانی ئەو ڕۆژانە بەسەر دەکەمەوە، هەناسەیەکی پڕ زوخاوی کاروانی هەوراز و نشێوی سەر بەگوێبەند هەڵدەکێشم و دەگەڕێمەوە ئاووهەوای ئەوێ ڕۆژان و سەیرم بەخۆم و بە هاوڕێیەکانم دێتەوە، کە چ مرۆڤێکی نائاسایی بووین. چۆن و بە چ دەردەسەرییەک بەرگەی ئەوێ ڕۆژانمان گرتووە و شانمان داوەتە چ شاخێکی تووش و بێ پەروا!

بەڵێ کە دێمەوە سەر خەرمانی خەباتی چەکداریی ئەو ڕۆژانە و لەگەڵ فیلمی ژیاندا تاوتوێیان دەکەم، ئەو مەفرەزە بچوکانەی ئەوێ ڕۆژێ، لە هێزێکی وەک یەکێتیی نیشتمانی کوردستان، کە ناوکی هێزی سەربازی و سیاسی یەکێتی بوون لە ناوچەیەکی هێجگار بەرفراواندا، لە ڕووی ژمارەوە زۆر کەمبوون و وجوود و ناسینیان و کاریگەرییان بەسەر ڕەوتی ڕووداوەکان لە ئاقاری باسکردن و خۆپێوەبادان نەبوو. کاری سەرەکیی پێشمەرگەکان بریتی بوو لەوەی ڕۆژانە خەریکی خۆحەشاردان و خۆشاردنەوە بوو لە ئاوەدانی. جێگای پێشمەرگە کەند و لەند و بن گەوەرە بەست و بنارە شاخ و هەڵەتوپەڵەتە ڕەق و وشکەکان بوو، کە هەتا بەدەگمەن شوان و گاوان بۆ لەوەڕاندنی مەڕ و ماڵات ڕێیان دەکەوتێ. دەبوو شەوانە سوود لە تاریکایی شەو وەربگیرێ، تاکو پێشمەرگە بچێتە ئاوەدانی. ئاوەدانی لە لایەک بۆ تێرکردنی زگ و خۆراکستاندن بۆ ڕۆژی دوایی لە خەڵکێک، کە خەبات بۆ ئازادی و ڕزگارکردنیان دەکەین و لە لایەکی دیکەوە توخمە بە توانا و چالاکەکانی ناو ئەو هێزە بەبێ ماندووبوون و بێ گوێدانە حەسانەوە، بەو شەوە دەکەوتنە کۆبوونەوەکردن بە خەڵک و بانگەشەکردن بۆ خەباتی چەکداری و ڕێبازی حیزب و شۆڕشی نوێ. ئەو ڕۆژەیش وەنەبێت خەڵک بە ئارەزوی خۆی، تامەزرۆبوونی بۆ دیتنی پێشمەرگە و خۆشەویستی و ئاگاداربوون لە دەنگوباسەکان، خوازیاری ئارەزوومەندانەی ئامادەبوونی ئەو کۆبوونەوانە بێت، بەڵکو بە چاوی خۆم دەمدیت ئەو خەڵکە ناچار دەکران بۆ ئەو جۆرە کۆبونەوانە بێن. زۆرجاران جوتیار و

دانیشتوانی گوندەکان لەسەر ئامادەنەبوون بۆ کۆبوونەوەیەکی پێشمەرگە، سووکایەتییان پێ کراوە، بگرە لە گوندەکە دەرپەڕێنراون، من زۆر رووداوی لەو جۆرەم لە هەگبەدا هەیە، بەڵام ئێرە شوێنی نییە.

لەو رۆژانەدا، هێزی پێشمەرگەی یەکێتی لە ناوچەکە لاواز بوو و پێویستی بە هەبوونی دەیان مەفرەزەی گورجوگۆڵ و گورزوەشێن هەبوو. دەبوو رێکخستنەکانی کۆمەڵە لە جاران و خەڵکانی تر زۆرتر بەدەست و بردبن، هەر ئەو هەستە بەرز و پڕ لە مەسئولیەتە بوو، ئەو چەپکە هاورێییەی کۆمەڵە بە حەق یەکەم هەوێن و راوکەی هەڵسانیان لە گەڵاڵەکردنی دەیان خونچەی نوێی لێ کەوتەوە.

پاش مانەوەی چەندان رۆژی خۆشاردنەوەی ناو هەڵەتوپەڵەتەکان و شەوانی ئاوەدانی لە گوندی "داربەسەری گەورە، داربەسەری گچکە، سماقە و گۆمەشین"، لەگەڵ عەلی ساڵح و پێشمەرگەکان یەکترمان گرتەوە. هەر ئەو رۆژە سەرباری هەر جۆرە مەترسییەک، خۆمان گەیاندە دەوروبەری گوندی "گۆپتەپە"ی نزیک جادەی هەولێر- کۆیە. بۆ شەوەکەی لە جادەکە پەڕینەوە و بەسەر چیای باواجی کەوتین. نانی بەیانیمان بردە ئەو چەند ماڵەی لە گوندی کرۆژ کە خەریکی خەڵوزکردن بوون. ئەو کارە چەپەڵەی کە لە سێبەری حیزبە چەکدارەکان، ناکۆکی نێوانیان برەوی پێ درابوو، بەجۆرێک خەڵوزکردن وەک پەتا کەوتبووە گیانی قەڵاچۆکردنی داروباری ناوچەکە. ئەنفالکردنی دارستانی چڕ و سوودبەخشی چیا و شاخ و دۆڵەکان، هەتاکو دوکەڵی چاڵەڕەژوو لەسەر لوتکەکانەوە بەری ئاسمانی بێگەردی لەکەدار و رەشتاڵ کردبوو.

لێرەدا بەشێک لە مەسئول و هێزی چەکداری "حسک" لە ناوچەکە، لە پەراوێزی دەستکەوتی تایبەتی خۆیان و بەربەرەکانێکردنی گەشەکردنی "یەکێتی" بە رۆژی ئاشکرا خۆیان کردبووە خەمخۆری برەودانی بە ئاشکرای خەڵوزکردن. دیارە ئەو دەمەیش بە هۆی راکردنی خەڵکانێکی زۆر لە خەفەتی سەربازی بۆ رژێم، بە تایبەت بەدوای هەڵگیرسانی شەڕی کاولکاری عێراق- ئێران، سەدان کەسی بێکار و دەستبەتاڵ، لەو گوندە دوورەدەستانە لە سێبەری هێزی پێشمەرگە بەبێ مەبەست و لەپشتی مەبەستی دڵ و دەروونی دوژمنەوە. خەریکی ئەوکارە چەپەڵە بوون. پانتایی شاخ و لووتکەکانیان لە دار و دەوەن رووت کردەوە، کە یەک زیانی ئەوەندە گەورە و گرانی بە چاوانەوە بوو، بەدەیان ساڵی دیکەش ئەو دیمەنە دارستاناوییەی شاخەکانی کوردستان ناژێتەوە. سامانێکی ئابووریی گەورەی لەکیسی نەتەوە دا و وڵات کرایە خاکێکی رووت و قووت، کە مایەی ئاوەدانی و ژیان و نیشتەجێبوونی گوندنشینەکانیشی کەم کردۆتەوە.

# ٤

زیاتر له ده ڕۆژ و شەوان بوو، سەرباری ڕۆیشتن و خەوتنی کەندولەندان، خۆمان نەشوشتبوو. هەموومان دڕوون و بێزەوەر بووبووین. ڕۆژەکەی لەو دۆڵ و چەمەی سەر ڕێگامان، بەدوای دانانی پاسەوان، بە ئاوی جۆگەلەی دەم گومان، کەوتینە خۆشوشتن و پاککردنەوەی جلوبەرگی قرێژاوی بەرمان، کە هەموو لەبەر ئارەقەی بەردەوام ڕەقببوونەوە. لەبیرمە لەناو گومە ئاوەکەوە، بەتەک ئەحمەد قەمبەری و لەولاترەوە "برایم سماقە"وە بووم، دیاربوو هەردووکیان سابوونیان پێ نەبوو، هەر ئاویان بەخۆدا دەکرد و گوێم لە برایم بوو بە ئەحمەدی دەگوت: کاکە کورتەک و شەلوارە قرێژاوییەکانم بەبێ سابوون پاک نابنەوە، نازانم کێ سابوونی زیادەی پێیە؟ منیش یەکسەر دەنگم هەڵبڕی و سابوونەکەی خۆم بۆ هەڵدان. بەڵام سابوون لە گولمی برایمی دەرپەڕی و بە بەردێکی دەم ئاوەکە کەوتەوە و بووە چەند پارچە. لێرەدا ئەحمەد قەمبەری تا دەنگی تێدا بوو گوتی: سابوونەکە پەتارپەتار بوو، ئەوە من لەو بەراییە پارچەکانی هەڵدەگرمەوە. وشەی پەتارپەتار کە زۆر بە ئاواز و یەکەمجار بوو گوێبیستی ببم و دوایی چەند جارێکی دیکەش بە ئەحمەد قەمبەریم دوبارە کردەوە و لەناو تاخچەیەکی قۆدیلەی مێشکم جێگای خۆی گرت.

# ٥

تا ماوەیەکی زۆر لە بنج و بنەوانی ئەوە نەگەیشتم، کە هاوڕێیانی کۆمەڵە سەرباری ئەو خەباتە سەختە، لەگەڵ یەکتریش ناتەبان. لێرەدا جێگای خۆیەتی چیرۆکی بە پێشمەرگەبوونم، لەو بازنەیەدا بەو ئاقارەدا بەرم کە بۆ یەکەمجار لەگەڵ ڕۆژانی سەرەتای پێشمەرگایەتی هەستم بە بارودۆخێکی هێجگار سەیرکرد. یەک دوو ڕۆژ بوو بە ئاشکرا پێشمەرگە بووم و چەکم لە شان بوو، بەبێ ئەوەی یەکێک سەرەداوێکم بۆ باس بکات، تا ڕادەیەکی باش، درکم بە پرتە و بۆڵەی تاک و تەرای پێشمەرگەکان و سەرنج و ڕەخنەی توندی ئێرە و ئەوێی کادیرەکان کرد، بەتایبەت باسکردنی سەرەتاکانی ناکۆکی نێوان ئەندامانی ناوەندیی کۆمەڵە، گەیشتبووە نێو یەکە یەکەی ڕێکخستنەکان لە ناوچەکانی سەرکردایەتی و خوارەوە.

رۆژانێک تازە بەتازە دەستەیەک هاوڕێی کۆمەڵە لە دەورەی کادیرانی بنکەکانی سەرکردایەتی گەڕابوونەوە، زۆربەیان زۆر بە شپرێوی بینەوبەردەی نێوان مەسئولەکانی سەرکردایەتیان دەگێڕایەوە، کە بەلای بەندەوە هەڵکردنی کزە بایەکی هێجگار تووش و مەرگەسات بوو. بەڕاستی زۆری بۆ نیگەران بووم. بە ڕێکەوت لەو ڕۆژانەدا جەمیل ڕەنجبەر، کە لە لایەن ناوەندیی کۆمەڵەوە بەدوای ئەرسەلان کرابووە بەرپرسی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لەناو ریزەکانی هێزی پێشمەرگەدا. جەمیل ڕەنجبەر، چ وەک شاعیرێکی شۆڕشگێڕ و خاوەن ڕۆشنبیرییەکی فراوان و چ وەک هاوڕێیەکی دێرزەمانی خەباتی قوتابیان هەر لە قۆناغی خوێندنی ناوەندییەوە هاوڕێ و ناسیاو و نزیکی یەکتری بووین. جەمیل خۆی ڕۆڵەی بنەماڵەیەکی پڕ خەباتی کوردایەتی و قوربانی گەورە بوو. هەمیشە لەناو هاوڕێ و دەوروبەری خۆیدا جێگای ڕێز و خۆشەویستی بوو. لەگەڵ سەرەتاکانی لەدایکبوونی کۆمەڵەدا لەپاڵ مامۆستا جەعفەر عەبدولواحیدی شەهید، ڕۆڵێکی دیار و بەرچاوی هەبووە لە گەشەکردن و کەوتنە سەرپێیانی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لەناو شاری هەولێردا، بەلام بە هۆی کاری مامۆستایی لە ناوچەکانی سەر سنوور و برادۆستدا، بۆی نەلواوە لەناو ریزەکانی ڕێکخستن ڕۆڵی بەرپرسیارێتیی سەرەکی لەناو شار ببینێ. بەلام لەگەڵ ئەوەیشدا لە شالاوی گرتنە بەربلاوەکەی هاوڕێیانی کۆمەڵە لەناو شاری هەولێردا، دووجار گیراوە و پاشان بە چەندان ساڵ حوکم دراوە. لەگەڵ بەربوونی لە زینداندا، یەکسەر پێوەندی بە ڕێکخستنی کۆمەڵە کردۆتەوە و چەکی پێشمەرگایەتی لە شان کردووە. وەک هاوڕێ و خەڵکی ناوچەکان دەگێڕنەوە، کادر و هاوڕێیەکی خاکی و پراکتیکی بووە، بەدەنگ خواست و جێبەجێکردنی هەرەوەزی و هاوکاریی جوتیارانەوە هاتووە و لە نزیکەوە بەشداری ژیانی کردوون.

ئێمە تەنیا مانگێک لە سەرکردایەتی نزیکی یەکتر بووین، ئەوەبوو بەر لە کۆنفرانسی یەکی کۆمەڵە لەگەڵ کاروانێک پێشمەرگە و مەسئولەکانی کۆمەڵە بۆ کاروباری شۆڕش، وەک ئەندامی لقی هەولێری یەکێتیی نیشتمانی چووە خوارەوە و لە بناری قەندیل و گوندەکانی "مامەزەردکە و جەلکان" کەوتنە بەر پەلاماری کۆپتەرە سەرەبازییەکانی ڕژێم و لەگەڵ چەند پێشمەرگەی دیکەدا شەهید بوو.

لەو سەروبەندەدا هەروا بە ڕاگوزاری و بە هاوڕێتی و لەسەر خواستی خۆی، شێخ عەلی لە ئاقاری نێوان گوندی "نازەنین و جەلی" دا کۆبوونەوەیەکمان بە شانەی سەرەکیی کۆمەڵە کرد، کە بریتی بوون لە شەهیدان جەمیل ڕەنجبەر، مەلا غەفور، شێخ سلێمان، ساڵح سولاوکی، هۆشیار کەریم، هەژار بانیمارانی و شۆڕش حاجی، کە لەبەری چیای کۆسرەت بوون، کە هەردووکیان بەژیان ماون، بە ئامادەبوونی "مامۆستا کاوە"ی نەمر.

لەو کۆبوونەوە تووشی حەپەسان بووم، کە وا هاوڕێیانی کۆمەڵە بەو ڕەنگە لەگەڵ یەکتری دژوارن، بە تایبەت زۆربەیان لەگەڵ مامۆستا کاوە دڕدۆنگ و ناڕێک بوون. ئێمە بە هاوکاری "شێخ عەلی"ی ئامر هەرێم، زۆرمان قسە بۆ کردن و بۆ ئەوە هانماندان، کە دەبێ گیانی هاوڕێتی و خۆشەویستی بپارێزن. لە کۆبوونەوەکە مەلاغەفور و مامۆستا کاوەمان ئاشت کردنەوە، کە نێوانیان خۆش نەبوو.

مەلا غەفور کادرێکی تێکۆشەری ریزەکانی ڕێکخستنی ناو شار بوو، کە ڕاستەوخۆ بەرپرسی ئەو هێڵە بوو، کە مامۆستا کاوە لەناو شار سەرپەرشتی دەکرد. لەدوای ساڵی ١٩٧٥ لە ڕێگای شەهید سەعدی خەلیل (سیروان) هاتبووە ریزی کۆمەڵەوە. لە یەکەم کۆمیتەی بەڕێوەبردنی ڕێکخستنەکانی هەولێر، ئەندامی کۆمیتەی شەهید ئیبراهیم عەزۆ بوو. پیاوێکی هێجگار دڵسۆز و خاوەن قسە و گفتاری خۆی بوو. لەناو ریزەکانی ڕێکخستن زۆر بەگەرمی خەریکی خۆگۆشکردن بوو بە ڕۆشنبیری و تێگەیشتنی سەرەتاکانی فەلسەفەی مارکسیزم. لە ناوچەکانی خۆشناوەتی زۆر شارەزا بوو، حەوسەڵەیەکی لەبننەهاتووی ڕۆیشتن و جەولەکردنی هەبوو. خەڵکێکی زۆری گوندەکانی خۆشناوەتی دەناسی و پێوەندییەکی دۆستانەی و بەهێزی بەو خەڵکەوە هەبوو. بە هۆی کارامەیی و بەردەوامبوونی لە خەباتکردن لە کۆنفرانسە ناوخۆییەکانی ساڵی ١٩٨٣دا لە ناوچەی خۆشناوەتی، بە دەنگی یەکەم بۆ بەرپرسیارێتی کەرتی ڕێکخستنی شەقڵاوە و ئەندامی کۆنفرانسی سێ هەڵبژێردرابوو. بەڵام لە ڕوداوی دڵتەزێنی کەنار گوندی "قورە بەرازە"ی بتوێن و لە تەقینەوەی ئەو ماشێنەی تێیدا بوون، لەگەڵ یەک چەپکە هاوڕێی دلێر و هەڵکەوتووی ناوچەکانی هەولێر شەهیدبوو.

بەراستی ئەوە یەکەم دەردەدڵی من بوو کە تا ماوەیەکی زۆر لە بنج و بنەوانی حاڵی نەبووم! کە بۆ دەبێ هاوڕێ پێشمەرگەکانی کۆمەڵە لە پەراوێزی ئەو خەباتە سەختەدا، لەناو یەکتری ناتەبابن! بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانە و سەرباری ئەو جۆرە دەردە دڵیانەی هەموو یەکێکیان، تێکڕای پێشمەرگەکان یەک ئاسمانی دڵسۆزی و شۆڕشگێڕی کەموێنەی گەرم و گوڕی مەیدانی خەبات، کەپرەی بەسەردا کردبوون و هەریەکەیان بۆ خۆی یەک جیهانی پڕ لە گوڕج و گۆڵی و شێلگیرانەی ساز دابوو.

# ٦

ئێوارەکەی بەدرەنگییەوە لە گوندی "سماقولی گەری" لەگەڵ پێشمەرگەکانی هەرێمی هەشتی هەولێر یەکترمان گرتەوە. شێخ عەلی (خولە کەشکوڵ) کە لە دوورەوە چاوی بە ئێمە کەوت، بە پێکەنینەوە گوتی: هاورێیان باش بوو هەر خۆتان بە سەلامەتی گەڕانەوە..! دواتر لەگەڵ دابەشبوون، ئەوەشی بە بەندە ڕاگەیاند کە ئەوان خەبەریان هەیە، مەفرەزەیەکی پێشمەرگەکانی هەرێمی پارێزگاری سەرکردایەتی لە بناری شاخی کۆسرەتن، ئەگەر ئەمشەوە بەدەستوبرد لە جادەکەی نێوان چنارۆک و بناری کۆسرەت بپەڕنەوە، ئەوا لەو گوندانەی بنارەکە دەیاندۆزنەوە. ئەوانیش پۆستەی خۆیان لەگەڵ دیلێک و مەفرەزەیەکی شارەزا، بە بەشداری پێشمەرگەیەکی بریندار "مەحەمەد ژوژکە" و پێشمەرگەیکی نەخۆش "هیوای مەلا شینە" ئامادەکردوە، تاکو رادەستی ئەو مەفرەزەتان دەکەن و لەوێشەوە بەیەکەوە بەرەوسەرکردایەتی بەرێدەکەون. بەدوای نانخواردن و وەرگرتنی ژەمەخۆراکێک بۆ سبەینێ، لەناو کێلە بەردەکانی ئەو گۆڕستانەی ئەوبەری گوندەکە گردبووینەوە و من ماڵئاواییم لە یەکەیەکەی پێشمەرگە و هاورێیان کرد و هیوای سەرکەوتن و دیدارمان لەگەڵ یەکتری خواست. داخەکەم لەگەڵ مامۆستا کاوە چیتر یەکترمان نەدیتەوە کە لەشەڕێکی پەلاماری چاشەکانی رژێم لە بناری سەفین لە گوندی "قەلاسنجی سەروو" لەگەڵ پێشمەرگەیەک بەناوی ئەنوەر شەهید ببوو. ئیتر یەکسەر بەدوای یەکترییەوە رێچکەمان بەست. بەر لە نیوەشەو، کە مانگ ئاسمانی ناوچەکەی رووناک کردبووەوە، گەیشتینە پەنا ئەو گردۆلکانەی دەم جادەکەوە. لەسەر زۆربەی گردۆلکەکان تەپکە و رەبییەی عەسکەریی سوپای عیراق مۆڵگەیان گرتبوو. هەموو مەفرەزەکە دەوری دەکەس دەبووین، من و هیوا لەگەڵ دیلەکە بێچەک بووین. لە پەنا گردێک بە پەنادزە گردبووینەوە و شوێنی پەڕینەوەی سەرجادەکە دیاری کرا، نهێنی شەو و تاوی پەڕینەوە بە هەمووان گوترا و هەموومان بەسەر سێ بەش دابەش بووین و خۆمان گەیاندە ناو ئەو بەستەی دەمی جادەکە. بەندە و هیوا و مەحەمەد ژوژکەیی لەگەڵ عەزیز مەلەکی و برایەکەی کە ئەرکی ئاگادلربوون لە دیلەکەیان پێ سپێردرابوو، کەوتینە ئەو رەتلەی دووەم بۆ پەڕینەوە.

ئەو شەوە لە ژیانی پێشمەرگایەتیمدا، یەک لە شەوە پڕزەحمەت و دەردەسەرییەکانم بوو. چونکە لەپێشەوە تەسلیمی مەفرەزەیەکی شپرێوی نارێکوپێک کرابووم و لەدەمی جادە پەڕینەوەکە بۆم دەرکەوت، هەر لە مەسئولی عەسکەری مەفرەزەکەوە، تا زۆربەی

پێشمەرگەکان فریان بەسەر هەستونەستی ئەوەک هەر کۆمەڵە و یەکێتییەوە، بگرە هەتا پێشمەرگایەتیشەوە نەبوو. چونکە هەر لەگەڵ پەڕینەوەی ڕەتلەکەی ئێمە، کە دیلەکەشمان[30] لەگەڵ بوو، لەناکاو بوە فیتوهۆڕ و هاتوهاوار، لەنێوان چەند دانەیەک لەوانەی بەدوای ئێمەوە دەپەڕینەوە لەگەڵ ئەوانەی لەپێش ئێمە پەڕیبوونەوە. ئیتر هەر ئەوەندە بوو لە هەموو لایەک وەک بڕێشکە، گوللە بە سەر و دەوروبەرماندا باری، بە جۆرێک دیتم دیلەکە ئەوبارودۆخەی قۆستەوە و لە بەرچاوی ئێمەوە بای غاربێ پێوە نا، وەک کۆدی بەرەڵلاکردن لەنێوان دەسترێژی تەقەکانی ناو ڕەبیەکان و هەرێ و هۆیهای هەندێک لە بەشداربووەکانی مەفرەزەکەوە، ئەو دیلە لە بەرچاوان بزر بوو، کە بەندە بۆ یەک دوو پێچی ناو ئەو بەستەی کەناری ئەو بەری جادەکەوە بەبێ چەک لەگەڵ هیوا دوای کەوتین. بەڵام باش بوو هیوا هۆشیاری کردمەوە، کە وا چاکە ئێمە دوای نەکەوین و فریای دەربازکردنی خۆمان بکەوین و کەس نەبووە برای کەس. ئەو سەرباری نەخۆشییەکەی، لەو دەوروبەرە لە بەندە شارەزاتر و لە ژیانی پێشمەرگایەتی وریا و بەئەزموونتر بوو. ئێستایش ئەو دەسرازە دەسترێژانەم لە بەرچاوە کە وەک بڕێشکە بە کۆ بەرجادەکە دەکەوتن و هەڵدەبەزینەوە، دەتگوت بەزموڕەزمی دەستباری مانگەشەوەکە لە تەنگەتاوکردنی ئێمە دەگێڕن، ڕەواندنەوەی تاریکایی شەو و بەباداکردنی ترسولەرزی ئێمە دەبەخشنەوە. ئەوەندەی هێزم تێدا بوو کەوتمە ڕاکردن، بەڵام کە ئاوڕمدایەوە و هیوام بیرکەوتەوە، کە نەیدەتوانی غار بدات. ناچار گەڕامەوە سەری و دەستم گرت و بەیەکەوە وەک دوو لێقەوماوی بەجێماو بەو کەندەوە بەرەو گردۆڵکەکانی ئەودیوی جادەکە ڕێمان کرد. کە هیوا ناوناوە ڕێنمایی دەکردم بە کوێدا بڕۆم. مەدایەکی باش ڕۆیشتین، دەسترێژی گوللەکانیش هێور ببوونەوە و ملی ئەو هەورازەمان گرتبوو، کە وەک زینۆی قەدپاڵان ئاودیوی ئەودیوی لای بەرانبەر گوندی "داری قەمتەران"ی دەکردین. بە هانکە هانک لەگەڵ هیوا وەک دوو مەڕی گێژوویژ سەرمان لەدوو یەکتری نابوو. لە دوورەوە هەستم بە هەبوونی تارماییەک کرد و هیوا زوو ناسییەوە و گوتی: مەترسە ئەوە دەشەلی و مەحەمەد ژۆژکەی میهرەبان. مەحەمەدیش کە چاوی هەڵبڕی و ئێمەی بەدی کرد، بۆمان شاگەشکە بوو و لە دوورەوە گوتی: وامزانی هەردووکتان پێکراون و زۆر لە خەمتاندا بووم، شوکر بە سەلامەتی دەربازبوونە. ئەوانە کەی پێشمەرگەن. خەریک بوو هەموومان گورگانخواردوو بکەن! تۆزێکی دیکە ڕۆیشتین، کە ئیتر بەرەو نشێو بوو. پێشمەرگەکان

---

[30] دیلەکە کوڕێکی ئەنوەر بەگی بالیسانی بوو، کە پاڵێوراوی ئەنجومەنە کارتۆنییەکەی تەشریعی سەر بە بەعس بوو لەساڵی ١٩٨٠

بەتوپەڵ راوەستابوون. مەسئول عەسکەرییەکە لە دوورەوە کە هەرسێکمانی بەدیکرد، زۆر سەربەستانە رووی قسەی لێ کردین و گوتی: ئەمن وامزانی دیلەکە لەگەڵ ئێوە بەجێماوە، چما لەگەڵ ئێوەیش نییە..!! ئێمەیش کە دوو بێچەک و پێشمەرگەیەکی بریندارى شەل هیچ وەلامێکمان نەدایەوە، بەڵکو لە ناوخۆیان کردیانە دەمەدەم. باش بوو عەزیز مەلەکی، کە پێش چەند هەفتەیەک لەناو قیادە مووەقەتەی پارتییەوە، پێوەندی بە هەرێمی هەشتی یەکێتییەوە کردبوو، بە مەبەستی سەردانی ماڵومنداڵی لە ئێران بۆ سەرکردایەتی دەهات، دەنگی هەڵبڕی و گوتی: کاکی خۆم تازە کار لە کار ترازاوە، نە دەمی گەڕانەوە ئەوبەری ماوە و نەمانەوە لێرەیش دادمان دەدات. وا چاکە لەو چەند ماڵەی دەم ئەو چەمە سەر و ژەمە نان وەرگرین و پێش تاریکورووونیان بگەینە بناری ئەو شاخە لە چیای کۆسرەت. ئەو رێگایەی لەناو شەڕەدووکەڵی ترسولەرزی کەوتنە داوی تەپکەی هێزەکانی دوژمن و پێکانی گوللەی غەوارە بڕیبوومان، هەمووی بەردەلان و سەر دەوەنە تیشە شاخ بوو، ئەوەندەیش لوس و تیژ بوون، من زیاتر لە چەندان جاران بەربوومەوە و جارێکیان هەتا چاویلکەکەم لێ پەڕی و دوای مەودایەک دەستگێرانی من و هیوا[31] دۆزیمانەوە.

یەک بە خۆم سەرباری هەر بیرکردنەوەیەکی نابەلەد، لە نزیکەوە هەستم بە ئازارێکی ورەپڕوکێنی ژێرپێیەکانم دەکرد. بەڵام چی بکەم، دەبوو هەر بڕۆم و خۆمی پێوە مەعتەل نەکەم و لە کاروانەکە بە جێ نەمێنم. ئەوە بوو لێرەوە مەحەمەد ژوژکەیی پێش کەوت و هەمووومان وەک کاریلە کورپە بەدوایەوە. لەو قولایی شەوە خۆمان کردە ناو ئەو کەپرانەوە، کە جوتیاران بۆ بەناوکردنی بەروبوومەکانیان لەو سەرچەمە تێیدا دەژیان. هەر چۆنێک بوو ئەو خەڵکەمان لە شیرین خەو کرد و وێڕای سەر و ژەم نان وەرگرتن، لەو ماڵەی من و هیوا و مەحەمەد ژوژکە رووومان تێ کردبوون، پێلاوێکی نیوداشیشیان بۆ من پەیدا کرد. کە ئەو کلاشەی پێم کەڵکی پێرۆیشتنی نەمابوو. لێرەدا دووبارە گوێم لە دەنگەدەنگی نێوان ئەو پێشمەرگانە بوو، کە لەخۆڕایی شەڕیان بەیەکتری دەفرۆشت. گوێم لێبوو، عەزیز مەلەکی پێی دەگوتن. من و برایەکەم لەگەڵ ئەو دوو برا بێچەکە و ئەو پێشمەرگە بریندارە، کە مەبەستی لە بەندە، هیوا و مەحەمەد ژوژکە بوو، ناگەڕێینەوە و ئەوەی لەگەڵ ئێمەیش نایەت، با مشووری خۆی بخوات. لێرەوە دڵەڕاوکێیەکی دیکەشم بۆ زیاد بوو. ترسی ئەوەم لێ نیشت، کە یەکێک لەو چەکدارە بە پرتەوبۆلانە، بەنهێنیی بەندەی

---

[31] ئازادی مەلا شینە لەسەر ئەوەی توشی نەخۆشی سیل هاتبوو، ئەودەمە لوتت بگرتایە، گیانی دەردەچوو، کەچی خۆشەویستی ژیان وکۆمەڵە وپێشمەرگایەتی ئومێدی چاکبونەوە گەیاندییە سەرکردایەتی وسەردانی پزیشکی شۆڕش و ناردنە ئێران بەتەواوی ساغبوەوە و رۆژانی دواتر پێشمەرگەیەکی بوێروەدەستوەشێنی لێدەرچوو بوو، تاکو بەر لەئەنفالەکان لەگەڵ برایە قارەمانەکەی دلێر کەوتنە دەست دوژمن و شەهیدکران

زانیبێت و فرسەت لە بێچەکیم بهێنی، پەلبەستم بکات و وەک نێچیر رادەستی دوژمنم بکات. بەڵام دڵنیام هەڵوێستی عەزیز مەلەکی و بەئاگایی مەحەمەد ژوژکەیی ببوە بەربەست. ناچار هەموو ملی رێگامان گرت و هێشتا سەرەتای زەردەی خۆرهەڵاتن بوو، خۆمان گەیاندە بناری شاخەکەوە.

# ٧

جارێ زوو هەموو پێشمەرگەکان بەبێ حەرەسیات دانان، هەر کەسە لە شوێنی خۆیەوە کەوتە زەوی خۆشکردن و لێی کەوتنە خەوێ. نازانم چۆن دوای ئەو هەموو راکردن و ماندووبوونە، وا زوو خەویان لێ کەوت! کەچی بەندە لەبەر ئازاری پێیەکانم عەجمانم لەبەر برابوو، نەوەک هەر خەوم لێ نەدەکەوت، بەڵکو ئۆقرەم نەدەگرت دابنیشم، یان پاڵبدەمەوە. لەپێش خۆمەوە هەر ئاخ و ئۆفم بوو، برادەرانیش بە جۆرێک هەر یەکە لە شوێنی خۆی کەوتبوونە خەوێ، دەتگوت لەناو جێگا و پێخەفێکی پاک و خاوێنی نەرمونۆڵ لێی پاڵکەوتوون!

دیارە مرۆڤ کە ماندوو بوو، لە ترسان شەکەت بوو و پاشان کەوتە دۆخێکی دەربازبوونەوە، خەوی خۆش دەبێ. لەو دەمەدا بە ناچاری بە سەرلەبەری فیلمی ژیانی پڕ وەیشومەی رابردوووی خۆمدا، چوومەوە و بە خۆم دڵی خۆمم بەوە دایەوە، کە خراپتر لە پاشترە و هەموو کاتێکیش هەر ناخۆشی نابێت، خۆشی لەپاشترە! بەکورتی هورێنەم دەکرد، هرێم لە برێ دەرنەدەکرد. پاش چێشتەنگاوێکی درەنگ سەیرم کرد "محەمەد ژووژکە"یش لەبەر ئازاری برینەکەی، هەر ناڵە ناڵییەتی. سەرباری دەردی خۆم، دڵم پێی سووتا، کە خورتێکی تازە باڵای کردبوو، تا بڵێی زراڤ و ناسک و نازدار بوو، هەر دەتگوت باڵای دارمێوە بۆ بەرزبوونەوەی زیاتر هەنگاوی گرتووە. تازە ریشی هاتبوو و سمێڵی هەر ئەوەتە رەش کردبوو، دڵت نەدەهات بە بەژن و باڵایدا هەڵبڵێی. بۆ من ببووە مایەی دڵ پێخۆشبوون و جێگای ئومێد و پشت پێبەستن. کوڕێکی هێجگار دڵفراوان و دەم بە پێکەنین بوو. کە چوومە سەری یەکسەر چاوی کردەوە و دەستی بۆ تفەنگەکەی بن سەری برد، بەڵام کە منی ناسییەوە، شەرم گرتی و یەکسەر هەستایەوە سەر پێیان و کەوتە خۆداوەشاندن، لە تۆز و خۆڵی ئەو زەوییەی لەسەری درێژ ببوو. بە شەلەشەل هەندێ هات و چوو، ئەو گەنجە جوانە لە شەڕێکی کوردۆلۆژی لە بەرگی دووکانی حیزبی

چەکداری ئەو شاخانە، لە قاچەوە بریندار کرابوو. برینەکەی بەم شەلەشەلەی خستبوو. پێشمەرگە یەکە یەکە زۆرتر بە هۆی هەتاوی خۆرەکەو و گەرمابوونیانەوە لە خەو رابوون. ئەوجا دەست کرا بە خواردنی ئەو نانە وشک و رەقەی پێمان بوو، کە هەندێک لە پێشمەرگەکان دڵیان بەوە خۆش بوو، لەناو نانەکەیاندا پێخۆرێک دانرابوو. منیش پرێسکەکەی خۆم کردەوە، هەر چەندە دڵم بە جارێک گیرابوو، لە حەژمەتان و لەبەر ئازاری پێ و قاچەکانم حەوسەڵەی خواردنم نەمابوو. کە سەیرم کرد لەناو نانەکەی مندا پیاز و توور و تەماتەیەک دانراوە، چووم بێجگە لە نانەکان، هەموویانم لە بەردەمی هیوای مەلاشینە دانا، کە زۆری دڵ پێ خۆش بوو، چونکە ئەو هەر نانی رووتی پێبوو.

پاش نانخواردنی بەیانی ئەو چێشتانگاوە و سک تێربوونی زۆربەمان، محەمەد ژووژکە گوتی: وا چاکە بەئەسپایی جێگۆڕکێ بکەین، نەوەک پیاوخراپێک ئێمەی دیتبێت و لەپڕ گەمارۆمان بدەن، کە زۆربەمان نەشارەزا و چەند دانەیەکیشمان بێ چەکین. پێشمەرگەکان هەموو رایەکەیان پێ پەسەند بوو. دوو دوو رێچکەمان بە بوونی مەودای نێوان یەکتر بەست و بنارە و بنار، هەتا ئاقاری گوندی ژووژکە نەوەستاین. محەمەد ژووژکە شارەزایی تەواوی هەبوو. ئێمەی بردە بنارێکی سەخت و بەر سێبەر و پێی گوتین: بۆ خۆمان لێرە ئۆقرە بگرین، هەتاکو خۆی لەگەڵ پێشمەرگەیەک دەچێتە گوند و خۆراکی نیوەڕۆمان بۆ دێنێ و لە باس و هەواڵی ناوچەکەیش دەپرسێ، بەتایبەت سۆراغی ئەو مەفرەزەیەی سەرکردایەتیش دەکات، کە ئێمە بۆ سەفەری سەرکردایەتی بە دوای ئەوانەوە وێڵ بووین.

دوابەدوای رۆیشتن و بزربوونی محەمەد ژووژکە و پێشمەرگەکە، هەستم کرد چاوم دەچێتە خەوەوە. جێگاکەی لێی دانیشتبووم، پڕ بوو لە وردە بەرد. هەندێکم بە دەستی گێسک داو ملم شۆڕکردەوە. هەر ئەوەتە چاوم گەرم بوو بوو، تەوژمی ئازارەکانی ژێر پێم زریکەی داد و بێدادی لێوە هێنام. خەوەکەم لێ زڕا، چاوەکانم سوور هەڵگەڕابوون و لەو ئاوێنە بچوکەی لە گیرفانم بوو، سەیری خۆم کرد. بینیم چاوەکانم لە گۆمی خوێناوی دەچوون. ریشم هاتبوو و یەکەم جارم بوو خۆم ئاوا دزێو و ئەژرەنگ ببینم. دەم و چاوم چڵکن ببوو و هەموو جەستەم کوترا بوو. کە بێگومان هەموو سەرچاوەی لە ئازارەکانی پێیەکانم وەرگرتبوو. زۆر خۆم هێنا و برد، بەڵام بێسوود بوو. وەخت زۆر بە درەنگی بەسەردەچوو، دەتگووت رۆژەکە بەشی شەوەکەشی قووت داوە، ئەوجا بە من چی! بۆ شەوەکەی دەتوانم بخەوم! دەبێ بەناچاری هەر بەسەر ئەو پێیانەوە بڕۆم! لەو کەین و بەینەدا بووم، نازانم چەندی پێچوو بوو، لەپڕ محەمەد و هاوڕێیەکەی لەگەڵ ژنێک

دەرکەوتن، کە دیاربوو دایکی محەمەد ژووژکە بوو. نیوەڕۆیەکی درەنگ کەوتینە سەر ئەو خواردنە زۆرەی ئەو دایکە بۆ کوڕ و هاوڕێیەکانی هێنابووی.

ئەو دایکانەی کوڕە جگەرگۆشەکانیان پێشمەرگە بوون، بۆ خۆیشیان پێشمەرگەیەکی شاراوە و ئاشکرا بوون، ئەگەرچی مامەڵەیان لەگەڵ چەک و شەڕ و جەولەی ئەمسەر و ئەوسەری وڵات نەبوو، بەڵام لە هەر کات و شوێنێک رۆڵەکانیان هەواڵیان بەدوایاندا بناردایە، یەکسەر سەرباری هەر جۆرە مەترسییەک، رێگای گەیشتنە لای رۆڵەکانیان دەگرت، هەمیشە لەگەڵ خۆیشیان چ خواردن و خۆراکێکی خۆشە، ئامادەیان دەکرد و دەیانهێنا. ئەو دایکانە، زۆربەیان تەتەری هێنان و بردنی نامە بوون و هەندێ جاران پۆستی گرنگی نێوان شاخ و شاریش بوون. بە جۆرێک، بۆ خاتر و خۆشەویستی کوڕ و وڵات و ناوی پێشمەرگە، چەکی سووکیان دەگواستەوە بۆ شار و بە پێچەوانەیشەوە و لە هیچ جۆرە قوربانییەک لەو رێگایەدا نەدەسڵەمینەوە.

دوای سوپاس و ماڵئاواییکردن لە دایکی ئەو هاوڕێیە، دەمی ئێوارە بەرەو گوندی "کەلکانی شێخ حەمەساڵح"، بەدوای یەکترییەوە رێچکەمان بەست، کە سۆراغی ئەو مەفرەزەیەی یەکێتی، لەوێ سەری دەرهێنابوو. پاش چەند سەعات رۆیشتن گەیشتینە گوندەکە، لە ماڵی "شێخ حەمە ساڵح"مان پرسی، یەکسەر بەرەو دیوەخان و هەوارە خۆشەکەی رێمان گرت، کە جێگایەکی فێنک و دیوەخانێکی پۆشتە و پەرداخی هەبوو. زۆر بەگەرمی پێشوازی لێمان کرد و رێگای نەدا بێجگە لە حەرەسی سەر جێگایەکی بەرز، هیچ پێشمەرگەیەک بەسەر ماڵە جووتیارەکان دابەش ببێت. دوای هەندێ حەسانەوە و پرسیار و وەڵامی نێوانمان، لەوە ئاگادار بووینەوە، کە مەفرەزەی ناوبراو لەو ناوەن، بەڵام جارێ هەموویان کۆ نەبوونەتەوە و چاوەڕوانی گەڕانەوەی تێکڕای هەڤاڵانن. من هێشتا لەبەر ئازاری پەنجە و ژێر پێیەکانم و شەکەتبوونم، خۆم بۆ نەدەگیرا بە چوارمەشقی دابنیشم. بە ئیزن وەرگرتنەوە، قاچەکانم درێژ کردن و جەنابی شێخ لێم هاتە پێش و زۆر میهرەبانانە سەیری بنی پێی کردم و یەکسەر گوتی: کوڕی چاک ئەوە کوتراون، دەبێ بە گوێزان شەقار شەقاری بکەین، تاکو خێزاوەکەی لێ دەربهێت. گوتم: قوربان خۆ من بەناو ئاودا نەڕۆیشتووم! گوتی: براگیان ئەوە بەسەر بەردی رەق و تەقی زۆردا رێت کردووە و کوتراوە. گوتم: زۆر سوپاست دەکەم ئەگەر لەو هەموو ئازارە رزگارم بکەی! زۆر بەئەسپایی دوو گوێزانی هێنا، هەر بە دەستی خۆی لە پێشەوە پێیەکانی بۆ پاک شووشتم، دوای وشک کردنەوەیان کەوتە شەقار شەقارکردنی پێستە رەقبووەکە، دیاربوو زۆر دڵی پێم سووتا، هەر ئۆفەئۆفی بوو و بۆ حاڵی من نیگەران بوو. بەراستی دەتگوت دەرزی بەنجیان لێ داوم، یەکسەر لەگەڵ دەرچوونی خێزاوی پێیەکانم، هەناسەیەکی حەسانەوەم

هەڵکێشا و هێمن بوومەوە، هەستم کرد تروسکایی گەشتر لە جاران کەوتنە نێو چاوانمەوە. ئەگەر پێیەکانم زامدار نەبوونایە، یەکسەر پرکێشی ئەو دەستە میهرەبانانەم دەدا و ماچم دەکردن، کە وا منیان لەو هەموو ئازارە رزگار کرد. پاشان بە هەندێ سپرتۆ بۆی سارێژ کردم و لە شوێنی خۆم چاوەکانم چوونە خەوێ.

نازانم کاتژمێر چەندی بەیانی بوو، کە بێدار بوومەوە، هەر خۆم بە تەنیا لە جێ و بالینگانەکە بووم و تەماشایەکی ژێر پێیەکانی خۆم کردن. تەنیا داڕوشانی پەنجە گەورەکانم نەبێ، بنی پێیەکانم بەلایان لێ نەمابوو. خەوێکی قووڵم لێ کەوتبوو، ئەوان وەک رۆڵەیەکی خۆیان مامەڵەیان لەگەڵ کردبووم، لە ماڵەکەیان گلیان دابوومەوە و زۆریان خزمەت کردم. داخەکەم ئەو کەڵە پیاوە کوردپەروەرە، لەلایەن دەستەیەک جاش، لەگەڵ دوو کچی گەنجی خۆی تیرۆر کران.

پاشان هەستامە سەر پێیان و بە ئەسپایی کەوتمە هەنگاونان و رۆیشتن. جەنابی شێخ خۆی لێم پەیدا بوو، دوای بەیانی باشکرن، ئامۆژگاری کردم، کە جارێ ئەوەندە لەسەریان نەڕۆم باشترە. ئەوەبوو لە شوێنەکەی خۆم دانیشتمەوە، هەستم کرد زۆرم برسییە و هێندەی نەبرد لەسەر سنییەک خۆراکی سبەینێیان بۆ هێنام و برسێتی خۆم رەواندەوە. دوایی مامە شێخ پێی راگەیاندم بۆ سەلامەتی گوندەکە، پێشمەرگە چوونەتە دەرەوەی گوندی و بۆ عەسر دەگەڕێنەوە، بە تایبەتی مشووری ئەوەشی خواردبوو، کە یەک دوو بەلەمی ماتۆڕدار پەیدا بکات، بە مەبەستی پەڕینەوە بۆ بەری ئاسۆس و گوندی شۆڕیجە، چونکە هەواڵی گەیشتنی ئەو مەفرەزەیەی سەرکردایەتیشی درابووێ.

پاش عەسرێکی درەنگ، هەردوو مەفرەزەکەی ئێمە و سەرکردایەتی پەیدا بوون. بە هەردوو لامان دەوری ٢٥ پێشمەرگە بووین. هێشتا نەحەسابوونەوە، کە لەناکاو ئاگادار کراینەوە، هەر چوار دەوری گوندمان لێ گیراوە! لە سەرەتادا وامان زانی ئەوە هێزی رژێم و جاشەکانی ناوچەکەن، سووسەی پێشمەرگەیان لەو گوندە کردووە و هێرشیان هێناوە. بەلام لە دەنگە دەنگی هاواری ئەو چەکدارانەی بانی پشتی گوندەکەوە، تێگەیشتین پێشمەرگەی "حسک"ن، پێ بەپێ دوای ئەو چەند پێشمەرگەیە کەوتوون، کە لەولاتی کۆیەوە بۆ ئێرە هاتوون و داوای تەسلیمبوونمان لێ دەکەن. دیاربوو ئەوانیش بەوە ئاگادار نەبوون، کە ژمارەی ئێمەیش بەقەدەر خۆیان دەبێت. ئێمە پێشتر هەر لە دایکی حەمە ژووژکە بیستبوومان، کە مەفرەزەیەکی "حسک" بە سەرپەرشتی سەرباز لەو ناوەن و سۆراغی پێشمەرگەی یەکێتیان کردووە. ئەو رۆژە سەرباز زۆر نەیاری یەکێتی بوو، دوایی خۆشی بووە یەکێتی و لەگەڵ شێخ شەماڵ بەدەستی پێشمەرگەکانی "حسک" تیرۆر کران. دەبێ ئەوەیش بڵێم، ئەو پێشمەرگانەی هەرێمی هەشت، کە لەگەڵ ئێمە

هاتبوون بۆ رادەستکردنمان بەو مەفرەزەیەی سەرکردایەتی، لەگەڵ دیتنی ئەو مەفرەزەیە، دەتگووت کێچیان کەوتۆتە کەوڵی و زۆر بە پەلەپروسکێ گەرەکیان بوو بەجێمان بێڵن و بۆ خۆیان بەرەو دواوە بگەڕێنەوە. بەڵام پەیدابوونی پێشمەرگەی "حسک" بە هەڕەشە و گەف کردنیان بۆ چەککردنی ئێمە، پەلەکردنەکەی هەڵوەشاندنەوە، ئێمە بە ناچاری هەموو پێشمەرگەکانی یەکێتی بۆ چەند قوڵێک لەناو گوند و دەوروبەری گۆڕستانی گوندی دابەش بووین، کە من لەو دەمەدا هیچ ئازارێکم نەمابوو. مەفرەزەکەی سەرکردایەتی دوو تفەنگی برنەوی زیادەیان پێ بوو، من و هیوای نەساغ دەستمان دایە یەکو تفەنگ و رەختێک فیشەکمان لە خۆ بەست. ئەوە بوو من لەگەڵ عەزیز مەلەکی و برایەکەی، محەمەد ژووژکە کەوتینە ناو کێلەبەردە زلەکانی گۆڕستانی بنار گوندەکەوە. لێرەدا من خۆم بۆ نەگیراو لە وەڵامی بانگکردنی هێزەکەی "حسک" بۆ خۆ تەسلیمکردنمان، دەنگم هەڵبڕی و گەرەکم بوو هێمنیان بکەمەوە، کە ئەگەر بکرێ لەگەڵ یەکتری دابنیشین و بە زمانێکی دۆستانە لەسەر هەر کێشەیەک کە هەیە قسە بکەین، ئەگەر هەردوو لا خۆمان بە پێشمەرگەی کوردستان دەزانین. من هێشتا هەر بە پێوە بووم و قسەکانم تەواو دەکرد، لەپڕ عەزیز مەلەکی، ماڵی ئاوابێت، دەستێکی گەیاندە شانم و دەستوبرد، بەرەو دواوەی پەلکێش کردم و یەک دەستڕێژە گولە بەسەرماندا باری. زۆربەی فیشەکەکان بەر ئەو کێلە بڵندە کەوتن کە من لە تەکییەوە راوەستابووم. بێگومان ئەگەر عەزیز نەبووایە، کە دیاربوو ئەو لە پەناوە بە دووربین سەرنجی دابوو، کە سێرەیان لە من گرتووە، ئەوە وەک بێژینگ دەبێژرام. ئیتر تەقە لە هەردوو لاوە دەستی پێکرد. من تا ماوەیەکی زۆر حەپەسابووم و لە جێگای خۆم نەجووڵامەوە. دوای هاتنەوە سەر خۆم منیش لە پەنایەک سەیری سەنگەرەکانی بەرانبەر خۆمانم دەکرد، کە لەگەڵ هەر جوڵەیەکی ئێمە، یەکسەر دەستڕێژیان لێ دەکردین. من هیچم لێ دیار نەبوو، تاکو تەقەی پێوە بنێم، بۆیە تاکە یەک فیشەکم نەچووواند، تفەنگەکەم هەر بە ساردی مابووەوە، ئەوانەی دیکە بۆ بەرگری لە خۆمان و رێگانەدان لە هاتنەپێشەوەی ئەوان، هەتا بەرە بەری تاریکبوون، سەرگەرمی تەقەکردن بوون. بەڵام وەک ئەوانەی بەرانبەرمان نا، بەڵکو تەقەکانی هەڤاڵانی ئێمە، تاقولۆق بوون و تەنیا بۆ رێگەنەدانی هاتنە پێشەوەیان بوو. نازانم چەند پێشمەرگە بوون و کەسیانی بەرکەوتبوو یان نا، بەڵام ئێمە لە قوڵێکی دیکەی کەنار گوندییەوە بریندارێکمان هەبوو، کە برینەکەی سووک بوو، فیشەکێک بەر شلکەی دەستی کەوتبوو، ئەویش هەر جەنابی شێخ حەمەساڵح بۆی تیمار کرد. لەگەڵ تاریکبوون، تەقەکان نەمان و دیار بوو هێزەکەی "حسک" لەوە گەیشتبوون، کە ژمارەی پێشمەرگەکانی ئێمە لە بیست پێشمەرگە زیاترە. ئیتر بەرەو دواوە کشابوونەوە و لەگەڵ تاریکبوونی شەو، ئێمە خۆمان پێچایەوە و

یادی بەخێر، شێخ حەمەساڵح لە جوامێریی خۆی، بۆ بەڕێکردنمان هەتا دەم ئاوەکە لەگەڵمان هات. هێشتا لە گوندی کەلکان بووین، مەفرەزەکەی هەرێمی هەشتیش ئامادەیی خۆیان وەرگرت، کە تاریکایی شەو بقۆزنەوە تاکو بەڕێگای خۆیان بەرەو خۆشناوەتی بگەڕێنەوە. پاش ماڵئاواییکردن و ماچوموچ و پێدانی هەندێ لەو فیشەکە زیادەیەی لە لای مەفرەزەکەی سەرکردایەتی بوو، ئەوان ڕێگای خۆیان گرت و لە چاوتروکانێک لە بەرچاو گوم بوون. ئەوەی ئێمە مابووینەوە، کە من و هاوڕێیان هیوا و محەمەد ژووژکە و عەزیز و برایەکەی بووین و ئەوەی سەرکردایەتیش نزیکەی ٩ پێشمەرگە بوون، کە هەڤاڵ کاکەخان بەرپرسیان بوو.

کاکەخان، پێشمەرگەیەکی تا بڵێی گورجوگۆڵ و ڕوو خۆش بوو. لە دەمی ئەو شەڕەوە، کە لە ختوخۆڕایی دەرگەیان پێگرتبووین، وەک کورد دەڵێ "لە ماڵی خۆمان شەڕیان پێ فرۆشتین"، بۆم دەرکەوت، کە پیاوێکی جەربەزە و بە هیمەتە، بەردەوام سەرپەرشتی هەموو قۆڵەکانی دەکرد و هان و هیمەتی دەخستە بەر پێشمەرگەکان، ناو ناوەیش پلار و قسەی دەگرتە سەرباز، کە دیاربوو یەکتریان دەناسی و پێی دەگوت، دیارە ئەوە دەکات بۆ ڕازیکردنی دڵی ڕژێم و بەنیازە تەسلیم ببێتەوە، زۆر بە هەڵەدا چووە، ئەگەر هەر وا بە ئاسانی ئێمە چەک بکات، مەگەر بەسەر تەرمەکانمان بۆ ناو ڕژێم باز بدات، چونکە هەر کاکەخان دەیگوت: سەرباز بە بازدان ناسراوە.

هەروەها لەگەڵ بەڕێکردن و لە دەمی شەڕەکەیشدا، شێخ حەمەساڵحی گیان زیندوو پشت و پەناو هاوکاری زۆری کردین، من پێشتر ناویم بیستبوو، کە گوایە ئازاری جووتیار و ڕەنجبەرەکان دەدات، بەڵام لەو ڕۆژ و شەوەی دیتمان و خزمەتی زۆری، بە تایبەتی منی کرد، بەبێ ئەوەی یەکتری بناسین، لە دڵەوە خۆشم ویست و جێگای خۆی لە بیرەوەرییەکانم قایم کرد. خۆزگە هەموو خوداپێداو و دەست ڕۆیشتووەکان لە کاتی تەنگانە و لیقەومان، ئاوا بەتەنگ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی خۆیان دەهاتن و دەبوونە پشت و پەنایان. سڵاو لە گیانی خۆی و هەردوو کچە خۆشی لە خۆ نەدیوەکەی.

# ٨

شەوی ناو ئاوی دوکان و لەناو بەلەمێکی شەق و پەق، لە سەرەتای مانگی هەشتی ساڵی ١٩٨٠دا، بۆ من یەک جیهانی تاقینەکراوەی نوێ بوو. ڕاستە ساڵی ١٩٧٤ دوو جاران

به بەلەم لە بەری خەلەکانەوە، بە ئاوی دوکان پەڕیومەتەوە لای گوندی دوبە، بەلام هەردوو جاران بە رۆژی رووناک و دوور لە مەترسی بوو. ئەو شەوە زۆر جیاواز لە شەوانی دیکە دەهاتە بەرچاوم. ئەگەرچی هێشتا هاوین تەواو نەببوو، بەلام ساردییەکی سەیر ناو هەناوی داگیر کردبووم، خولقی هەتا قسەکردنم نەبوو و کزومات لە پەنایەک سەیری ئامادەکردنی ئەو دوو بەلەمەم دەکرد کە تا ماوەیەکی چاک هاتبوونە پێشەوە. سەرەتا هەندێ پێشمەرگەی چاپوک لەگەڵ عەزیز مەلەکی لەو بەلەمەی پێشەوە جێگایان گرت. یەکێک لە پێشمەرگە هەرە چاپووکەکانی شەڕەکەی ئێوارەیش، کە ناوی "یەکێتی" بوو، کوڕێکی گەنج و خوێن شیرین بوو، تازە مووی لێهاتبوو، خووی دابووە بایەخدان بە من، ئەوجا نازانم دڵی پێم دەسووتا یان لەبەر ئەوەی من کۆمەڵە بووم. دواتر بۆم دەرکەوت ئەویش هەستونەستی لەگەڵ کۆمەڵەیە و نایەوێ لە لای ئەو مەفرەزەیەی خۆیان بیدرکێنی، چونکە ئەوان بە حوکمی ئەوەی زۆربەیان کۆیی بوون، هێلی گشتی و بزووتنەوە بوون.

ئەو رۆژگارە هێشتا کۆمەڵەبوون لەو ناوچانەدا بۆ پێشمەرگە تاک و تەرایەکانی ناوچەکانی هەولێر تا رادەیەک بڤە بوو، چونکە هێزەکانی "حسک" بالادەست بوون و کۆمەڵەیان بە نەیاری سەرەکی خۆیان دەزانی. ئەو رۆژە، لەو ناوچانەی هەولێر بێجگە لەو کەرتەی دەشتی هەولێر، مەفرەزەیەکی بچووکی خۆشناوەتی و کەرتێکی دۆڵی خانەقا کەسی دیکە لەناو هێزی پێشمەرگەی کوردستان بە ئاشکرا کۆمەڵەبوونی خۆیان جاڕ نەدابوو، چوونکە دەبووە مایەی دەردەسەری بۆیان. هەر بۆیەش لێرە بەدواوە چوومە بن کەوڵی "یەکێتی" و قەناعەتم پێ کرد، کە ببێتە کۆمەڵە و، هەر کە گەیشتینە سەرکردایەتی، دوای چەند رۆژێک هاتە بارەگای ناوەندیی کۆمەڵە و بووە هاوڕێیەکی دڵسۆزی کۆمەڵە و پێشمەرگەیەکی چاونەترسی یەکێتی. داخەکەم لە نەبەردییەکی دەستەویەخەی ناو شاری کۆیە لەگەڵ "ئەحمەد برنۆ"دا، گیانی پاکیان بە کوردستان بەخشی.

لەو شەوەدا "یەکێتی" خۆی لەوان جیا کردەوە، هاتە تەکم و کەوتە دواندنم، کە بۆچی ئاوا دۆش داماوم، دەم و چاوی خۆم تێکناوە! بەراستی ئەو نزیکبوونەوەیە و گیانی بە تەنگەوە هاتنەوەی ئەو، تا رادەیەکی زۆر لە روحەوەی بوژاندمییەوە، زۆری پێ دڵخۆش بووم و پێکەوە کەوتینە قسەکردن. هەتاکو بەلەمی یەکەم بە سەلامەتی لە پێش ئێمە بەرێکەوت، ئێمە وردە وردە ئەوانەی مابووینەوە، چوینە ناو بەلەمەکەی دیکەوە، کە پێشمەرگە بریندارەکەیش لەگەڵمان بوو، بەلام دڵم هەر بە گەرمی لە کوتەکوتی خۆی نەکەوتبوو، جاروبار بۆ دڵنیایی دەستەکانم بۆ ناو ئاوەکە شۆڕ دەکردەوە، دەموچاوی

خۆم تەڕ دەکرد تاکو خەو نەمباتەوە، چونکە ئەوانی دیکە بێجگە لە من و یەکێتی و لێخورەکە، هەموویان یەکسەر خەوتن.

شەوەکی ئەنگوستەچاوی ناو دەریا لە جیهانی ناو لانکی ئەو منداڵە ساوایەی دەکرد، کە هیچ جۆرە فرسەتێکی دیکەی نەبوو لە دەمی برسی بوون و ئازار، تەنیا بۆ خۆی بگری. بابایەکی زەلامی وەک من بۆ دەبێ بگریم، سەرباری ئەوەی مەلە نازانم، ماندو و شەکەت بووم، سەری هار و مارانم لێ وێک هاتبووەوە، بەڵام هەبوونی "یەکێتی"ی مرۆڤ و هەستیار لە تەکمەوە، ئارادەیەک دڵنەوایی بۆ گێڕابوومەوە. بەوپەڕی وریایی چاوم بڕیبووە پانتایی ئاوی پەنگ خواردووی دەریاچەکە، شەپۆلەکانی ئەو بەلەمەی پێشمان بە تیژی دەیبڕین، کە بە هۆی تروسکایی ئەو لایتەی پێشەوەی، کە جاروبار پێی دەکرد، وەک نیشانەیەک بۆ ڕەواندنەوەی گومان کە خەریکی ڕاوە ماسین. دەسرازەیەک تروسکایی بەسەر شەپۆلەکانەوە بۆ ڕووبەری پان و پۆڕی سەر ئاوەکەی پەخش دەکرد، لەگەڵ هاتووچۆکردنی شەپۆلەکان وەک ملوانکەیەکی مرواریی سپی لە ملی بووکی دەریا بکەن، بۆ خۆیان کەوتبوونە سەماکردنەوە. کەچی دڵی من نەدەحەسایەوە و هەر تەپە تەپی بوو، بە جۆرێک کپی و سامناکی ڕووی ئاوەکە، ئەوەندەی دیکە سەرسامی کردبووم. ئێمە هەر بەتیژی بۆ پێشەوە دەچووین، لە ناکاو ماتۆڕی بەلەمەکەی ئێمە کوژایەوە، کە هەتا ئەو دەمە لایتەکەی پێنەکرابوو و هەر بە دوو شوونی ئەوەی پێشەوەدا ملی دەنا. پێشمەرگەکان لە خەوێکی قوڕسدا بوون. لێخوڕەکە بە یارمەتی "یەکێتی"، چەند جارێک کندڕی لە ماتۆڕەکە ڕاکێشا، ماتۆڕەکە هەر ئەوەتە نوزەیەکی نووساوی لێ دەهات و پێ نەبوو! زۆریان هەوڵدا، ماتۆڕی چەمبەری بە یەکجاری نوزەی لەبەر بڕا. کابرای بەلەمەوان بە ناچاری چەند لایتێکی تیژی بۆ بەلەمەکەی پێشەوە هەڵکرد و کوژاندەوە، وەک نیشانە کە ئێمە لەناو ئاوەکە گیرمان خواردووە. نزیکەی ١٥ خولەکی برد، هەتا بەلەمی پێشەوە گەڕایەوە لای ئێمە. ئەوانیش هەوڵی زۆریان دا، بەڵام سوودی نەبوو، کەس لە پێشمەرگە خەوتووەکان خەبەری نەبووەوە، پاش تەگبیر و ڕا گۆڕینەوە، وا بە چاک زانرا ئەو بەلەمەی پێشەوە بەتیژی پێشمەرگەکانی خۆی بگەیەنێتە کەناری دەریاچەکەوە، لە پەنا گوندی "شۆڕیجە" دایان بەزێنی و لەوێ چاوەڕوانی ئێمە بکەن و بەلەمەکە بە بەتاڵی بە دوای ئێمەدا بگەڕێتەوە. بەلەمەکە ڕۆیشت و کات زۆر لەسەرخۆ دەڕۆیشت. لەپڕ هەستمان کرد ئاو دێتە ناو بەلەمەکەوە، تومەز لە ژێرەوە کون بوو. ڕاوەستان و لەڕینەوەی سەر ئاوەکەیش، وای کردبوو ئاو ڕێگای خۆی بۆ ناو بەلەمەکە بدۆزێتەوە، کە لە هەمووان زیاتر من هەترەشم چوو بوو. هەموو پێشمەرگەکانمان بێدار کردەوە و بە جامیلکان کەوتینە ئاوبەتاڵکردن. لەو سەروبەندەدا، دڵمان چەند توند بوو! کابرای بەلەمەوان

ئەوەندەی دیکە سەرودڵی دەگرتین، ناو ناوە دەیگوت، فلانە ساڵ لەو ناوە بەلەمی بەردەشانییەکان نقووم بووە و ئەوەندە کەسە خنکاون، پاش چەندان رۆژ تەرمەکانیان دۆزراوەتەوە. بەراستی مرۆڤ هەندێ جاران پلاری قیرسیایە، بەرگەی هەموو ناخۆشییەک دەگرێ، هەموومان لەگەڵ ئاوفرێدان بە جۆرێک پاڵمان بەیەکەوە دابوو، کە دەتگووت دیوارە و وەک خشت بەتەک یەکەوە چووینەتە بار یەکترییەوە. نازانم ئەوکاتە چۆن بەسەرچوو، من لە پێشی پێشەوە دەستم لە خۆ شووشتبوو، ئەوانەی مەلەشیان دەزانی، ورەیان بەردابوو، کە چۆن بەو شەوە تاریکە لە ناوەڕاستی پانتایی ئەو دەریایە قووڵە بۆ ئەوبەر مەلە بکەن! تاکو لە دوورەوە وەک هەڵهاتنی ئاسۆ بەلەمەکەی یەکەم لایتی بۆمان لێدا و پەیدا بووەوە. یەکسەر پشوومان هاتەوەبەرێ و ئومێدی رزگاربوونمان ژیایەوە. بەخێرایی گواستمانەوە و تیژ بەڕێکەوتین. هەر کە گەیشتینە لای پێشمەرگەکانی دیکە، خەریک بوو پێشەنگی گزنگی رۆژ ئاشبەتاڵی بە تاریکی شەو دەکرد. کاکە خان زۆر دەستوبرد بریندارەکەی لە کۆڵ کرد، کە خوێنی زۆری لێ رۆیشتبوو و تاقەتی رۆیشتنی نەمابوو. وەک شارەزایەک پێشمان کەوت و لەگەڵ تاریک و روونی بەیانی ئێمەی گەیاندە بەر ماڵی موختاری گوندی، کە هێشتا لەسەربان دەخەوتن و چەند ژنێک لە حەوشەکەوە خەریکی نانکردن بوون. کابرای موختاریان لە خەو راپەراند، بە حەپەساوی هاتە ناومان و هەر بە چەپەرۆک لە سەروسکوتی خۆی دەدا، کە بەم بەرەبەیانە کەی کاتی هاتنی پێشمەرگەیە. هەردەیگوت و نەیدەبڕییەوە. دەبێ پێش سەعات ٨ ی بەیانی لە گوند دەرچن. گوایە هێزی حکومەت لەو کاتژمێرە بەدواوە دەگاتە گوندی بە مەبەستی ئەنجامدانی دەنگدان بۆ ئەنجوومەنی کارتۆنی حوکمی زاتی. بە هۆی دەنگە دەنگ و قەرەباڵغی ئێمە چەند هاوولاتییەکی دیکە لە دەوروبەرمان پەیدابوون.

موختار بە ناچاری سەروناتی گەرمی بۆ کردینە بالولە و هەندێ خورمای تێ کرد و گەرەکی بوو هەروا بەڕێمان بکات. کاکەخان لێی هاتە وەڵام و پێیگوت: دەبێ خۆت هەتا نزیکی گوندی شارستێنی بناری ئاسۆس بەپێشمان بکەوی، گوێدرێژێکیشمان بۆ پەیدا بکەی تاکو ئەو برادەرەی سوار بکەین، موختار بە ناچاری چوو گوێدرێژە زلەکەی خۆیانی هێنا و کورتانی کرد، گوتی فەرموون با بەڕێ بکەوین. لێرەدا من بیرێکی سەیرم بۆ هات، چونکە وەک ئەوان باسیان دەکرد هەموو گرد و بەرزاییەکان رەبیەی رژێمی بەسەرەوە بوو، بەم رۆژە رووناکە بەدیمان دەکەن، دەرچوونمان بە سەلامەتی مەحاڵە! بۆیە کوڕێکی مێردمنداڵ لە تەکمەوە وەستابوو، لێم پرسی بوو کە کێیە و گوتی کوڕی موختارم، من دەنگم هەڵبڕی و گوتم: دەبێ ئەو کوڕەی موختاریش لەگەڵمان بێت، لە دواوە لەنێوان پێشمەرگەکان بڕوات. کابرای موختار زوو لە مەبەستمان گەیشت، چەندی دایکی کوڕە داد

و فیغانی کرد، کە وازی لێ بهێنین، کوڕەیش پێشمەرگەی خۆش دەویست و حەزی دەکرد ئێمە بە سەلامەتی دەرباز ببین، خۆی لە دەستی دایکی ڕاپسکاند و بەگەرمان کەوت. بەڵام کاکەخان لە پێشەوە ئاگاداری کردینەوە، کە چەکەکانمان بەپەنادزە لە بەرانبەر ڕەبییەکان بە شاراوەیی و شۆڕکردنەوە بە لاشانمان هەڵگرین، تاکو هەست نەکەن ئێمە چەکدارین، موختاریش بەڵێنی ئەوەی داینێ ئەگەر دەنگیان داین، دەڵێم ئەوە زەلامی گوندین، بۆ سەر قەبرانی گوندی شارستێن دەچین، یەکێکمان لێ مردووە.

# ٩

بەو جۆرە، موختار ڕیشمەی کەرەکەی گرت و پێشمان کەوت، کاکەخان و پێشمەرگە چاپووکەکان بەدواوەی ڕیزیان بەست، "من و یەکێتی و عەزیز مەلەکی"ش لەگەڵ برایەکەی، کوڕی موختارمان لە نێوخۆمان دانابوو، لە دوای دواوە ڕێمان گرتبوو.

ئەوەبوو موختار ڕێچکەیەکی ناو کەند و لەندی ئەوتۆی گرتبوو، هەرگیز بە ئێمە نەدەدۆزرایەوە، تەنیا لە چەند شوێنێکی ناچار کەوتینە بەرامبەر ئەو بەرزاییانەی دەبابەی هێزەکانی ڕژێمی بەسەرەوە بوو، تاکو لە جادەکە پەڕینەوە. کە لە ئاسۆسەوە دەهاتە خوارەوە و بەو دەشتەدا دەچووە بناری مەرگەوە. بەڵام نە ئەوان خۆیان لە ئێمە گەیاند، نە ئێمەیش خۆمان گورگە کرد و تفەنگەکانمان بە لوولە شۆڕکراوەیی لە شان کردبوو و بە سەلامەتی گەیشتینە شوێنی دوورە دەستی ڕژێم. موختار و کوڕەکەیمان بە سوپاس و ڕێزەوە بەڕێ کرد، بەتایبەت کوڕێژگەکەی یەکەیەکەمانی ماچ کرد. هەریەکەمان ڕێی خۆمان گرتە بەر، بۆ چێشتانگاوێکی درەنگ گەیشتینە گوندی شارستێن، خەڵکەکە هەموو بەهەڵەداوان لێمان کۆ بوونەوە. چییان هەبوو لە خۆراک بۆیان ئامادە کردین و ئاگاداریان کردینەوە، کە تا زووە دەبێت گوند بەجێبهێڵن، نەوەک هێزی دوژمن، بەتایبەتی کۆپتەری مەرگچین پەلامارمان بدەن و جارێکی تریش گوندەکە کاول بکەنەوە. ئێمە وڵاخێکمان لێیان بەکرێ گرت، لەگەڵ خاوەنەکەی بریندارەکەمان سواری پشتی وڵاخەکە کرد، بەرەو گوند و کەلاوە ڕووخاوەکانی "کانی بی" ڕێچکەمان بەست. خەڵکەکە ناحەق نەبوون، چونکە بەو ڕۆژی ڕووناکە و بە بەرچاوی ئەو ڕەبیانەوە، ئەو کۆمەڵە پێشمەرگەیە تێیپەڕن و بچنە ناو گوندی بۆ خۆی ڕووداوێکی چاوەڕوان نەکراو بوو و مایەی لێکەوتنەوەی ڕووداوی دڵ تەزێنی ناخۆشی لێ دەکرا. بەبێ ئەوەی پێی بزانن ئێمە چۆن وا درەنگکەوتووین و

چیمان بەسەر هاتووە! ئێمە لە ترسی گیانی خۆمان تاکو نەبینە پارووێکی ئاسانی دروێنەی پەلاماری کتوپڕی کۆپتەرەکانی ڕژێم، کە لەو نزیکانە مۆڵگایان هەبوو، هەمیشە بۆ ڕاونانی پێشمەرگە ئامادەبوون، بە هەنگاوی خێرا، کە هەر ئەوەبوو غارمان نەدەدا، بە چەند سەعاتێک خۆمان گەیاندە ئاقاری گوندەکە. لە پەنا چەند دار گوێز و کانییەک مۆڵگامان دانا و پاش دانانی حەرەسیات، من بەزگی برسی بۆ خۆم خەوتم، کە زۆربەی پێشمەرگەکانی تریش هەر وایان کرد، لەگەڵ گەرمبوونی ڕۆژ چاوم کردەوە، پێشمەرگەکان دوو دوو خەریکی نان خواردنی نیوەڕۆ بوون و بە ماوەیەکی کورت سکی خۆمان تێر کرد. هەموومان هەستاینەوە سەرپێیان و ملی ڕێچکەی بەرەو هەورازمان گرت، تاکو بۆ ئێوارە گەیشتینە ناوقەدی "ئاسۆس". لەوێ کۆمەڵێک خێزان بۆ خۆیان کەپریان دروست کردبوو. لەبیرم نەماوە لەوێ خەریکی چی بوون. بۆ شەوەکەی لای ئەوان دابەش بووین، من و هێژا هیوا مەلاشینە بەر ماڵێک کەوتین کە هەر ژن و کچێکی مێرد منداڵە لە ماڵ بوون.

بەیانییەکەی ئەو جامیلکە ماستەی هەیان بوو، لە بەردەمی ئێمەیان دانا. کە سەیرم کرد هیوا وەک ئەوەی فرسەتی بۆ هەڵکەوتبێ، بەپارووی زۆر گەورە خەریک بوو هەموو ماستەکە لف بکات، دەستم گرت و پێم وت، با نەختێک بۆ کچ و ژنەکە بمێنێتەوە، ئەوانیش بەتایبەتی کچەکە سەیری پارووی دەستی ئەو هاوڕێیەیان دەکرد. "هیوا"یش دەستی کێشایەوە، بەڵام زۆر لە من تووڕەبوو و کە دەرچووین زۆر ڕەخنەی لێ گرتم، کە نەمهێشتووە هەموو ماستەکە بخوات! من لەبەر نەخۆشییەکەی لێی بێدەنگ بووم و ورتەم لە دەم نەهاتە دەرەوە. بەخێرایی لەسەر ئەو تاتە بەردە گەورانە کۆ بووینەوە، کە شەوەکەی لەسەریان خەوتبووین. هێشتا نیوەڕۆ نەببوو، ئێمە گەیشتینە سەر تۆقەڵەی ئاسۆس، کە یەک کزەبا و نەسیمی ئەوەندە فێنکی دەهات، مرۆڤ حەزی دەکرد سەرخەوێکی لەبەریدا بشکێنێ، پێشمەرگەکان ملی ئەو ڕێچکەیان گرتبوو، کە بەرەو خواری خوارەوە شۆڕ دەبووەوە، منیش بە ناخێری گیانم گەرەکم بوو لەپێش ئەوانەوە بدەم و بگەمە خوارەوە. دەمزانی سەرچاوەی کانی و ئاوێکی زۆر خۆشی لێیە، کە پێشتر لە بەهاری ساڵی ١٩٧٥ بەو شوێنەدا تێپەڕ ببووم. ماوەیەک بە قەدبڕی ڕۆیشتم، پێشمەرگەگان بە پێچاوپێچی شۆڕدەبوونەوە و ئامۆژگاریان کردم، کە وریای خۆم بم نەوەکو تووشی هەڵدێر بم! بەڵام گوێم پێ نەدان و لە هەندێک شوێن بە قونەخشکە دەهاتمە خوارەوە، تاکو لە شوێنێک خلیسکم برد و پشتاوپشت سەرەوخوار خۆم بۆ نەگیراوە، تەقەتەقی سەرم کە بەو وردە بەرد و دار و شاخەکان دەکەوت، بە هۆش خۆی هێنامەوە. ئەگەر دەستوەکەری نەکەم و فریای خۆم نەکەوم! کارم تەواوە. لەو تاوەدا گەیشتبوومە سەر هەڵدێرێکی هەزاربەهەزارەوە هەر دوو دەستی خۆم دەکوتاو دەستێکم

له لقەدارێکی بە رەگ و ڕیشەی قایم گیر بوو، هەتا هێزم تێدا بوو، تاقەتم دایە خۆم و دەستەکەی دیکەیشم لێ گیر کرد. چەند پێشمەرگەیەک کە لەو پێچەی پشتمەوە نزیک بوون، چاویان لێم بوو. پیاوانە فریام کەوتن، بە هەر جۆرێک بوو پشتێنەکەی خۆیان لێک گرێدا و لەسەرەوە بۆیان شۆڕکردمەوە، هەتا ئێرە نەدەوێرام تەماشای خوارەوە بکەم، بەڵام کە ئومێدم پەیدا کرد، بە تێرایی سەیری دەورووبەری خۆمم کرد. بە شێوەیەک باوەشم لەو لقەدارە گرتبوو، دەتوت دەیان ساڵە هاوڕێی یەکترین، ئەویش بە نەرمونیانی باوەشی بۆ کردبوومەوە. بە لقوپۆپەکانی باوەشێنی کزەبایەکی ماندووبوونی بۆ دەکردم، کە چاوم بڕییەوە ئەو هەڵدێرەی خوار قاچە شلبووەکانم، چ هەڵدێرێکی سەر بەگۆبەند بوو، تا چاو بڕ بکات بەرە و خواری خوارەوە قوڵ دەبووەوە، هەموو شاخ و کەندەڵان بەدوای ڕێچکەیان بەستبوو، سەرم هەڵبڕی و پشووێکم هەڵکێشا کە دەتگوت چەندین ساڵ لەناو چاڵدام و تروسکاییەکم لێ دەرکەوتووە، کە سەری پشتێنی هاوڕێیان گەیشتبووە لام، بە دەستێک پشتێنەکەم لە ناوقەدی خۆم توند گرێدا و ئەوجا بە هەردوو دەستان خۆم پێوە هەڵواسی و ئەوان بەسەر ئەو بەرد و وردە دارانە هەڵیان کێشام و هیچ درکم پێ نەکرد هەتاکو گەیاندمیانە لای خۆیان و دەستیان گرتم. ئەو پشتێنە چیتە لە شوێنێکەوە بپچڕێ! باش بوو گەیاندمیانە سەرەوە، ئەوجا خەریک بوو دەبورامەوە، چاوەکانم ڕێشکەوپێشکەیان دەکرد، کە پێشمەرگەکان بە چاکی دیقەتیان دام، جلەکانی بەرم، بەتایبەتی لەلای پشتەوەم هەموو ونجن بە ونجن ببوو. پیستەی پشتم بە شێوەیەک داماڵابوو، گەیشتبووە پشتملمەوە و لە زۆر شوێن خوێن فچقەی کردبوو. نازانم چەند لەو پێشمەرگانە ناوە ناوە لە کۆڵیان دەکردم، هەتا گەیاندمیانە سەر ئاوەکە و هەندێک ئاویان بە دەم و چاومدا کرد، بە تەواوی لە هۆش خۆم چووم. دەڵێم مرۆڤ سەیرە، ڕەنگبێ باوەڕ نەکەن، لەم شوێنە کۆمەڵێک پێشمەرگەی ناوچەکانی سلێمانی، کە لەناویان "شێخ مەنسوری حەفید" هەبوو، بە ڕێکەوت لەوێ بوون، گۆلکێکیان لە جەلەبچییەکان وەرگرتبوو و بۆ خۆیان کوشتبوویانەوە. من بە بۆنی چزە چزی گۆشت برژاندن هاتمەوە هۆش خۆم و چاوم کردەوە، یەکەم کەس بەسەرمەوە وەستابوو، هاوڕێکانی کۆمەڵە بوون، "هیوا و محەمەد ژوژکەیی و یەکێتی" یەکسەر ڕاستیان کردمەوە و کەوتنە دڵدانەوەم، کاکەخان و عەزیز مەلەکی و ئەوانی دیکەیش پیرۆزبایی سەلامەتیان لێ دەکردم. هەڤاڵانی شێخی گەورەیش، یەک بن باڵ گۆشتی برژاو و جگەریان بۆ هێنام و وەکو ئادەمیزادی حەوت ڕوح، زیندووبومەوە و کەوتمە جگەر و گۆشتخواردن. نازانم کامیان بوو بە دۆنگی گۆشتەکە پشت و دەندەکانیان بە جوانی بۆ چەور کردم. یەکێکیان کراسێکی زیادی پێ بوو و هەتا ئەویشیان لەبەر کردم، کە جلەکەی خۆم کەڵکی لەبەر کردنی نەمابوو.

لێرەدا تامەزرۆیی خواردنی هیوا و ماستەکەم بیر کەوتەوە، بەخەندەوە ڕووم لێ کرد و وتم: هاوڕێ گیان ئەوە ڕۆژی خواردنی گۆشتە و خۆت بە چاکی تێرکە، فەرموو لەبری منیش هەندێک بخۆ، کە خۆم تەنیا چەند پشکە جگەرێکی برژاوم بۆ خورا، هیوا پێکەنی و وتی: هاوڕێ ئێمە لەبەر خەمی تۆ هیچمان پێ نەخورا، مادەم ئێستا شوکر تۆ تەندروستیت باشە، ئیتر منیش دەکەومە سەر گۆشتخواردن، کەچی سەیرم کرد ئەوەندەی بۆ نەخورا، دیاربوو زیاتر تامەزرۆی ماستخواردن بوو.

دوای ئەو هەموو ساڵانە، هەنووکە بیری ئەو ڕۆژی دەکەمەوە. پێشمەرگەکانی کوردستان هەر ململانێیان لەگەڵ مەرگی ڕووبەڕووبونەوەی دوژمن نەبوو، بگرە لەبەرامبەر سەخت و دژوارییەکانی سروشتی کوردستانیش کۆڵیان نەداوە، بەڵام ئەو دەمە بەندەیەکی وەکو من لە هەرەتی تەمەنی بە شەنگ و ورە بووم، دەرەقەتی ئەو بەسەرهاتانە دەهاتم و بەرگەم دەگرت.

پاشان بە هاوکاری و یارمەتی تێکڕایی پێشمەرگەکان، گەیشتینە بنکەکانی سەرکردایەتی یەکێتی و کۆمەڵە لە توژەڵە و خڕی ناوزەنگ. بەڵام وەزعی قاچوقوڵم زۆر خراپ بوون، لە ناوەندیی کۆمەڵەیش ئەوەیان پێ ئاسایی نەبوو، کە لە دانیشتنەوە پێم درێژ بکەم! زۆر جاران سەرزەنشتیان دەکردم، کە هاوڕێی کۆمەڵە دەبێت بەرگەی هەموو ناخۆشییەکان بگرێ، ماڵی ئاوابێت دکتۆر شالاو کە پزیشکێکی تەواو بوو، فریام کەوت و ڕۆژانە برینەکانی پشتم و پێیەکانمی بۆ تیمار دەکردم، لەگەڵ پەخشانخانی ژنی ئەرسەلان بایز زۆریان خزمەت کردم، هەروەها مەلا بەختیار ڕۆژانە سەری لێ نەدەبڕیم، بۆماوەی مانگێک هەموو ساڕێژ بوونەوە و بەئاسانی کەوتمەوە سەر پێیان و چیتر بەدانیشتنەوە پێم درێژ نەکرد.

# ١٠

ساڵی ١٩٨٣، وەرز کۆتایی پاییز و ڕوو لە زستان بوو. لەگەڵ مەهدی کاوانی، کە هاوڕێی دەیان ساڵەی ژیانی خەباتی شاخ و تێکۆشانی ژێرزەمینیی شار بوو، چ لە ڕۆژانی خوێندنی زانکۆی بەغداد، چ لە شاری هەولێردا. لە گوندی نازەنین خۆم کەنارگیر کردبوو

و سەرمان بەیەکەوە نابوو،[32] بۆ خۆمان ژوورێکمان لە کەناری گوندی سەر ڕێگای بەرەو "سناوە و جەلی" لە خزمێکی حاجی ئەحمەد وەرگرتبوو.

دایکم یادی بە خێر، لە شارەوە هەموو پێخەف و خۆراکێکی پێویستی بۆ دابین دەکردم. دوو هەفتە، یان مانگێ جارێک دەهاتە سەردانمان. چیمان گەرەک بووایە، بە هەر شێوەیەک دەیگەیاندە دەستمان. من خۆم هەتا بەهاری ساڵی ١٩٨٣، ئەندام مەڵبەندی سێی یەکێتی بووم لە گوندی وەرتێ. دوای هاتنەخوارەوەی "مام جەلال" و دروستبوونی کۆمەڵێک پرتە و بۆڵە، لەسەر من، کە گوایە خەریکی ڕێکخستنی ژێربەژێرەکیم، بەرازیبوونی "مام جەلال" دانیشتم، دڵنیایش بووم، کە یەکێتی گفتوگۆ لەگەڵ ڕژێم دەکات. بە هەموو شێوەیەک کەناگیر بوونم پێ باشتر بوو، بەتایبەت من بە ڕۆژی ئاشکرا لەگەڵ شەڕی ناوخۆ نەبووم و ئامادە نەبووم بەردێک لەسەر بەردێکی دیکە دابنێم لەو بوارە بێهودەیەدا.

چەند مانگێک بوو، زۆر بە ئاسوودەیی دەژیام. ڕۆژانە خەریکی خوێندنەوە، دارشکاندن و خۆراک ئامادەکردن بووم، بۆ خۆمان کە "مەهدی"یش هاوکارم بوو. شوێنەکەمان تا ڕادەیەکی زۆر ببوە جێی مقۆمقۆی هەندێ خەڵکی ئاست نزم و نەخۆش. دیار بوو ڕاپۆرتی زۆریان لەسەرم نووسیبوو. بەلام نیازپاکی و دڵسۆزی، ڕاستگۆیی و هەڵوێستی خۆم و هاوکاریی دەیان هاوڕێی بە وەفا و دلێر، پەرژینی پاراستنمان بوون. چونکە لە هەر لایەکەوە هێزەکانی پێشمەرگە ڕوویان لەو گوندە دەکرد، کەم و زۆر بەتایبەت ئەوانەی یەکێتی، سەردانی ئێمەیان دەکرد. زۆرجاران بۆ شەویش لە لامان دەمانەوە. هەتا پێشمەرگە و کادرەکانی سۆسیالیست و شیوعیش لە نموونەی "حەسەن کاکە و قادر مستەفا" زۆر دەهاتنە لامان. ئێمەیش لەو گوندەدا، بێجگە لە هاوکاریکردنی

---

[32] بە ڕاستی بە نیازی چوونە دەرەوەی وڵات بووم. بەلام کە هاتمەوە گوندی نازەنین، سەیرم کرد ئەو کەلوپەلانەی، کە لە ماڵی "خاڵە کاکە"ی نەمر لەناو باخچان لەگەڵ دەیان دەستنووس و بڵاوکراوەی شۆرش حەشارم دابوون، کە پاسپۆرت و بڕوانامەی دەرچوونی کۆلیژیشی تێدا بوو، هیچی نەمابوون. دیاربوو لە لایەن چەند کاسەلیسێکەوە دەستکاری کرابوون و دەستم نەکەوتنەوە. ئەوەیش بۆ خۆی شەقەزلەیەکی دیکە بوو لە ڕوومەتی خەباتکردنم درا. داخەکەم هەمدیسانەوە، پێم شەرم بوو برادەرەکانم بە جێ بهێڵم، یان بیر لە خۆتەسلیم کردنەوە بکەمەوە. ناچار لەگەڵ ئەو برادەرە بە هاوکاریی ماڵی دۆستی هەرە بەڕێز "حاجی ئەحمەد"ی کۆچکردوو، ماڵی "خاڵە کاکە" و ماڵی "وەستا عەلی"ی نەمر، کە هەر سێکیان سێ هاوڕێ و دۆست، برا و ڕۆڵەی کاتی تەنگانەی ڕۆژانی سەختی خەباتی کۆمەڵە و یەکێتی بوون، کە لەگەڵ بەندە هێجگار نێوانیان خۆش بوو و ماڵەکانیان هەمیشە قۆناغی حەسانەوە و هاوکاریی ئێمە بوون، هەروەها لەگەڵ ماڵی "مام جەلال نازەنینی" و ماڵی "اسماعیل حەمەسوور" و ماڵی "مام حەمەدی فەراش"، دۆستەکانی دیکە لەو گوندە گیرساینەوە.

خەڵکەکە لە ئیش و کاری وەک خانووکردن، ڕەز بەناوهێنان و ئاوڕاکێشان، سەرمان پێوە نەبوو بۆ یارمەتیدان و کارکردن. لەگەڵ مامۆستای قوتابخانە چوار پۆلییەکەی گوندیش زۆر هاوکار بووین. هەردووکمان هەتا وانەمان بە قوتابییەکان دەگوتەوە، بە تایبەتی ئەوانەی پۆلی شەشی سەرەتایی بوون، زۆر ڕۆژ ژوورەکەمان چەندان قوتابی لێ کۆدەبووەوە بۆ دەرس خوێندن و ڕاڤەکردنی بابەتە قورسەکان، بە جۆرێک پێوەندیمان لەگەڵ خەڵکی گوندی ئەوەندە گەرموگوڕ بوو، هەر وەک یەکێک لە خۆیان، سەیری ئێمەیان دەکرد. لە زۆر کار و ناکۆکییەکانی نێوان جوتیارەکان، دەوری دۆستایەتی و لە یەکتر نزیککردنەوەیانمان دەدیت.

ئێمە بەوە ئاگادار بووین، کە زۆربەی سەرکردایەتیی یەکێتی، کۆمەڵە و شۆڕشگێڕان، لە دۆڵی بالیسان و دەوروبەری گوندی "خەتێ"ن. من تەنیا جارێک چوومە دۆڵی سماقولی، لە گوندی "سماقولی سەروچاوە" سەرم لە چەند دۆستێکی گوندەکە دا. لەوانە "کوێخا عەزیز و کوێخا عەبدە" کە نێوانیان خۆش نەبوو. هەروەها دۆستی بە وەفا و خۆشەویست "مام جەلال"ی ڕاوچی، کە بە یەک لاق دەتگوت پەلیکە بە ڕێگادا دەڕۆیشت. دەنا هەمیشە لە گوند و لە ماڵەکەی خۆم بووم. جارێک دایکم لە سەردانی ئێمەدا لەو گوندە، بۆی باس کردم کە ڕەفیقی خۆشەویستم "مەحەمەد عبدالخالق" کە مامۆستای ئامادەیی زمانی ئینگلیزی بوو لە هەولێر، دەیەوێ سەردانم بکات. منیش ڕۆژێکم بۆ دانا و "حەمە" هاتە سەردانمان. من بۆ ڕۆژی دیاریکراو چوومە سەر جادەی گوندی "کاموسەک" و لەوێ بەدیداری یەکتر شاد بووینەوە. نیوەڕۆکەی لە ماڵی "مستەفا"ی کاموسەکی نانمان بەیەکەوە خوارد، "حەمە" باسی ئەوەی بۆ گێڕامەوە کە لەو ڕۆژانە "دلشاد مەریوانی" لە هەولێر میوانی بووە. حەمە بۆ خۆی بەژیانی ئیلتزامی تەنزیمی بە کەسەوە نەبوو، بەڵام هەمیشە خۆی بە هەواداری "حشع" دەزانی. ئەو لەگەڵ "دلشاد" کەوتووەتە موناقەشە و لەو بینە و بەردەیە، ناوی منی هێناوە کە "حاجی مەمۆ" یەکێکە لە کادرەکانی کۆمەڵە و لە دژی شەڕی ناوخۆیە. ئەوەتە لە گوندی "نازەنین" دانیشتوە و بە نیازە لەو ڕۆژانە سەردانم بکات. بەڵام "دلشاد"ی چەمبەری لە لای خۆیەوە فرسەتی هێناوە، کە چووەتە لای "نەوشیروان" بەبێ هیچ بەڵگەیەک، کەوتۆتە داپلۆسینی سەر و پۆتەلاکێ من، بگرە وەک خەت مایلی "حشع" بۆی تێکۆشیوم و گوتوویەتی، "حاجی مەمۆ" پێوەندی بە "لیژنەی محلی حشع" لە هەولێرەوە هەیە!

پاش هەفتەیەک لەو سەردانەی ئەو برادەرەم، ڕۆژێک "نەوشیروان" پەیامێکی کورتی بۆ ناردم. داوای کردبوو کە بچم لە گوندی "خەتێ" سەردانی بکەم. منیش بەبێ ئەوەی شتێک بە خۆم بزانم، یان بای تۆزقاڵێک گومان لە خۆم بکەم، یەکسەر ڕێگام گرت، چونکە

سەرباری هەموو شتێک من تا ئەو ساتە، "نەوشیروان"م لە دڵەوە ریز دەگرت. کە چوومە ئەوێ، لە قوتابخانەکەی گوندی "خەتێ" جێگەیان گرتبوو، پاش نیوەڕۆ بوو، بردمیانە ئەو ژوورە کە "نەوشیروان"ی لێ بوو. باش بوو "حمە توفیق"یش ئەو دەمە لەوێ بوو، کە لە ساڵی ١٩٨١ەوە لە ڕێگای پێشمەرگایەتی شاخ ناسیبووم. وەک پیاوێکی زۆر ڕاستگۆ و سەرڕاستم دەناسی، نێوانمان خۆش بوو. پاش هەندێ قسە و باسی گشتی، "نەوشیروان" بە زمانێکی پڕ لە هەڕەشە کەوتە عەلەیی من و کۆمەڵێک هاوڕێی ناو ریزەکانی پێشمەرگە، بە تایبەتی لە سنووری هەولێر، داپلۆسی. ئەوجا هاتە سەر ئەوەی بۆ من بەتەنیا لەو گوندە دانیشتووم، دەبێ کارێک بکەم. پاشان بەکورتی گوتی: تۆ وەک گوێی لەڕێ ئێمەت لێهاتوە، ئەگەر دەتکوژین، دەڵێن کادری خۆیان کوشت! ئەگەر نا ئەوە تۆ بە هێواشی ئێمە دەکوژی! منیش بە ئوسولێکی نەرم و لەسەرخۆ وەڵامم دایەوە، ئاخیرەکەی گوتم: من هەرگیز لە مردن نەترساوم، بەڵام قەت خەون بەوە نابینم بە دەستی هاوڕێیەکانی خۆم بکوژرێم. نەوشیروان، دیسانەوە بەتوندی گوتی: دەتکوژین و دەڵێین "حسک و حشع و پارتی" کوشتیان! گوتم ئەوە هەموو کەس دەزانی ئەوانە من ناکوژن، فلانە شەو "سەید کاکە" بەخۆی و هێزەکەی هاتۆتە ئەو گوندە، گەرەکی بووە، بێتە سەرمان، بەڵام هەر هەڤالانی خۆی بەریان لێ گرتووە، خۆشی دوایی سڵاوی بۆ ناردوم کە لەوان دڵنیابم و کەس ناتوانی دەستم بۆ ببات.

لێرەدا نەوشیروان، خەندە کەوتە سەر لێوی، بە شێوەیەکی دۆستانە ڕووی تێکردم، تا ڕادەیەک کەوتە باسکردنی من بە چاکە، تێکۆشەری ڕۆژانی تەنگانە، ڕۆشنبیرێکی باشی هەولێر، هەتا گوتی: تۆ ئەگەر ئسلوبی خۆت بگۆڕی و واز لە مەلا بەختیار و سالار بهێنی، ئێمە لە هەولێر لە هەموو بوارەکاندا لە تۆمان لێوەشاوەتر نییە، دەتکەینە مەسئولی یەکەمی ناوچەکە. گوتم: کاک نەوشیروان، بەڕاستی من ماندوو بوومە، دەمەوێ بۆ خۆم بحەسێمەوە، ئەو ئوسلوبەیش فرچکم پێوە گرتوە و هەرگیز ناتوانم دەستبەرداری ببم. ئەوجا هاتە سەر ئەوەی گوتی: تۆ ڕاپۆرتت لەسەر هاتووە و خەڵک هەیە ئامادەیە ڕووبەڕووت بێتەوە کە تۆ خەت مایلی "حشع"یت و کار بۆ ئەوان دەکەی!

بەڕاستی زۆری پێ تێکچووم، تەزوویەک لە بنی پێمەوە دەستی پێکرد، لە تۆقی سەرم گیری خوارد. بە تەنگەتاوی بیری خۆم کوشی و یەکسەر گێڕانەوەکەی "مەحەمەد عبدالخالق"م بیر کەوتەوە و بە پێکەنینەوە ڕووم لە نەوشیروان کرد و گوتم: کاک نەوشیروان ئەگەر ئەو ڕاپۆرتنووس و کەسە ئامادەیە ڕووبەڕووم بێتەوە لەوەی کە من لەگەڵ "حشع" کار دەکەم و نهێنییەکانی یەکێتیان پێ دەدەم، ئەو کەسە ئەگەر "دڵشاد مەریوانی" نەبێ، هەر کەسێکی دیکەبێت، ڕاست دەکات! ئەوە پیاو نەبم لە بەردەمی ئێوە

بەو دەمانچەیەی پشتێنم خۆم نەکوژم! کە ئەمەم گوت، بەراستی "حەمە تۆفیق"یش بە رووم پێکەنی، نەوشیروان مەودایەک هیچ قسەی نەکرد. پێی گوتم کە بچمە سەردانی "فەرەیدوون" و ئەوان کارێکیان بۆ داناوم و ئەو قسەم لەگەڵ دەکات.

پاش دیدەنی "فەرەیدوون"، یەکسەر بۆ بەیانی گەڕامەوە گوندی نازەنین، نامەیەکی بە پەلەم بۆ "مەحەمەد عبدالخالق" نووسی. بۆم نووسیبوو، چی تر دۆستایەتی ئەو پیاوە نەکات و بڕوای خۆی پێ نەسپێرێ. بۆ مێژوو دەڵێم، کە "حەمە" ئەوەی خوێندبووەوە، خێرا وەڵامی دامەوە و گووتی، ئەو ئامادەیە سەردانی نەوشیروان بکات، راستی و ناراستی شتەکانی بۆ روون بکاتەوە. بەڵام دیار بوو "نەوشیروان"یش لەو فیشاڵانەی ئەو برادەرە گەیشتبوو.

# ١١

ساڵی ١٩٧٠ تا سەرەتای ١٩٧٤ لە بەغدادی ئەوێ رۆژاندا، توێژی قوتابیانی کورد، گورجوگۆڵترین خەڵکی کورد بوون. لەناو جەرگەی پایتەختی عیراقی بەردەستی رژێمی بەعس، وەک چقڵی چاوی بەعس هەڵسوکەوتیان دەکرد. ئەو بەعسەی رۆژ لەدوای رۆژ بەخت و باڵای دەسەڵاتیان بڵند و ملۆزمتر دەبوو. رژێم چ ناراستەوخۆ لە رێگای یەکێتیی قوتابیانی نیشتمانی خۆیانەوە، چ راستەوخۆ لە سێبەری دامودەزگا سەرکوتکەرەکانیدا، هەزارویەک حیساباتیان بۆ یەکێتیی قوتابیانی کوردستان دەکرد، کە ئەو رۆژە زۆربەی هەرە زۆری قوتابییە کوردەکانی بەغداد، موسڵ، بەسرا و سلێمانی لەژێر ئاڵای رێکخراوەکەیان رووبەڕووی سیاسەتە رەگەزپەرستییەکانی دەسەڵاتی بەعس ببونەوە و خاوەن هەڵوێستی چاونەترسانەی خۆیان بوون و بە توێژی دژ بە دڕندایەتی ئەو دەسەڵاتە دەخوێندرانەوە. دیارە ئەو رۆژانە لەناو ریزەکانی یەکێتیی قوتابیانی کوردستاندا، بەتایبەتی کادر و ئەندامە هەڵسوڕاوەکانی پێشەوەی ریزەکانی دا، دەیان و سەدان خورتی کوردپەروەری خاوەن بیر و باوەڕی کوردایەتی و پێشکەوتنخوازی بەرمەیدان بوون. هیچ هەڕەشە و گوڕەشەیەکی دەزگا تۆقینەرەکانی رژێم نەیدەترساندن، بگرە لەسەر خەبات و داکۆکیکردن لە خواستە رەواکانی نەتەوەکەمان شێلگیرتر دەبوون.

بێگومان هەبوونی خەڵکانی شۆڕشگێری وەک "محەمەد قەرەداخی، عەزیز مەحمود، نەجمەدین عەزیز، چیا عەباس، ئەرسەلان بایز، یاسین ئەنوەر، سەلام عەبدولرەحمان،

سەلام بەرزو و سعدون فەیلی" و دەیان و دەیانی دیکە، کە ناوەکانیانم لەبیر نەماوە، نموونەگەلێکی ئەو قوتابییە جەربەزە و بوێرانە بوون، کە دەنگ و رەنگی کوردبوونیان لە بەغدادی پایتەخت دەزرگاندەوە. لەبیرمە ئەو رۆژانە لەناو ریزەکانی تێکرای نەتەوەکەمان لە کوردستانی خوارووردا، تا رادەیەک یەکریزییەکی بەرچاو هەبوو، بەتایبەت لەناو ریزەکانی قوتابیاندا، لە مەیدانی خەباتی سیاسی، حیزبایەتی، هەتا پیشەییدا، یەکگرتوویی و خۆشەویستی و یەکترخوێندنەوە، زمانحال بوو. راستە ئێمەی هاوڕێیانی کۆمەڵە، رێکخستنی رێکخراوەیی سیاسیی خۆمان زۆر بە نهێنی هەبوو، کە خاوەن دیسپلینێکی پۆلایینی زۆر شاراوە بوو. مەیدانی چالاکیمان ئەو رۆژە، زۆرتر لەناو قوتابییان بوو، لە سازدان و دروستکردنی بازنە رۆشنبیرییە سەرەتاییەکان، بەڵام بۆ مێژوو دەیڵێم هەموو فەرمان و ئامۆژگارییەکانی بەرێوەبەرەکانی کۆمەڵە، خۆی لە پاراستن و بەهێزکردنی یەکریزی و تۆکمەیی خەباتی یەکێتیی قوتابیانی کوردستان و لە پشتیوانیکردنی سەرکردایەتیی شۆڕشی کوردستان و بەشداریکردن لە خەباتی رەوای نەتەوەکەمان دەدیتەوە.

لە پاییزی ساڵی ١٩٧١دا، یەکێتیی قوتابیانی کوردستان خۆی ئامادە دەکرد بۆ بەستنی کۆنفرانسی خۆی لە شاری سلێمانیدا. ئەوەبوو لەناو قوتابیانی کورد لە کۆلێجەکان و ئامادەییەکانی تێکڕای کوردستان و عیراق، دەیان کۆنفرانس و کۆبونەوەی ناوخۆیی بەسترا بۆ دیاریکردنی نوێنەرەکانی کۆنفرانسی سەرتاسەری ناوبراو. هەتا ئەو دەمە ئێمەی ئەندام و هەوادارانی کۆمەڵە قورساییەکی ئەوتۆمان لەناو کاراکتێری هەڵسوڕاوی بەرێوەبەری قوتابیان نەبوو. ئەوەی من لەبیرم بێت، لەو کۆبوونەوە ناوخۆییانەی قوتابیاندا، بەتایبەت لەناو قوتابی زانکۆکاندا، زۆر ئەندامی کۆمەڵە بۆ نوێنەرایەتی کۆنفرانس و هەتا مەسئولیەتی ناوچە و لق و کۆمیتەکان بەزۆربەی دەنگ هەڵبژێدران. هەر بۆ نموونە عەباس مەحەمەد، ئەرسەلان بابیز، یاسین ئەنوەر و حوسین خانەقینی لە بەشی کوردیی کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی بەغداد دەنگی هەرە زۆری قوتابیانمان هێنابوو.

# ١٢

هەر وەک لە ئەڵقەکانی پێشووتر و لێرەولەوێ، سەبارەت بە دەروێشی کاڵفامانە و پێوەندیی ڕێکخراوەیی خۆم بە "کۆمەڵەی مارکسیزمی لینینیزمی کوردستانی عیراق، بیروباوەڕی ماوتسی تۆنگ" ی قسەم کردووە. لێرەدا فراوانتر لەو بارەوە دەدوێم. ئەوەندەی لەبیرمە یەکەمجار لە پاییزی ١٩٧٠دا، لەگەڵ ئەرسەلان بایز و کامل کەریم لە ئەڵقەیەکی ڕۆشنبیریی سەرەتایی پێوەندیمان هەبوو. پاشان بەندە بۆ لای نەریمان مەحموود گواسترامەوە. لە مانگی دوازدەی ١٩٧٠دا، یەکسەر بۆ چوونە ریزی کۆمەڵە موفاتەحەی کردم. بۆ ماوەیەکی کورت لەگەڵ ئەو مامەوە، منیش لە لای خۆمەوە لەگەڵ چەند برادەرێکی هاوبیر لە بەغداد و هەولێر، چەند ئەڵقەیەکی ڕۆشنبیریمان دروست کرد، لە نموونەی جەلال تاهیر و حەمەد ئەمین حوسین، کە ئەو دەم خوێندکاری پەیمانگای مامۆستاتایان بوون، لەگەڵ هوشیار فەتاح لە هەولێر، هەروەها دواتر لە بەغداد لە نموونەی خالد مەولوود، ناسراو بە خالد جوتیار، کە لەو نزیکانە کۆچی دوایی کرد و نەجمەدین عەزیز هەولێری و کەمال ئەمین سەمین. پاش مەودایەکی دیکە پێوەندیی ڕێکخراوەیی بەندە کەوتە لای "شاسوار جەلال"ەوە، کە ئەوێ ڕۆژان ژوورێکی لەناو ماڵی خێزانێکی مەسیحی، لە گەرەکی "المسبح" بە کرێ گرتبوو.

کۆبونەوەکانمان دوو هەفتە جارێک بوو، بەڵام پێوەندی تاکی بوو. ئەو جارانەی لەگەڵ شاسوار، یان خۆم بەتەنیا کە دەچوومە ئەو ماڵە بە مەبەستی پێکەوە دانیشتن و تاووتوێکردنی چالاکیی ڕێکخراوەیی و دیراسەکردنی مەسەلە تیورییەکان. هەستم دەکرد ئەو ماڵە زۆر ڕیزی شاسوار دەگرن و هەر وەک ئەندامێکی ئەو خێزانە سەیری دەکەن، بەڵام "شاسوار"یش لە لای خۆیەوە، هێندە مرۆڤێکی هێمن، زمانشیرین و دەم بەخەندە و ڕوح سووک بوو، ئەوەندەیش بەرچاو ڕوون، بە سەلیقە و خاوەن مەعریفەیەکی زەنگین بوو. هەرگیز تەنگەتاوی و تووڕەبوونی بێ تەبریرم بە ڕووی ئەو مرۆڤە نەبینی. لە لایەکی دیکەوە خواردنەوە و رابواردنی زاتیم لەو کەڵە پیاوە نەدیت. کاتی خۆی بەم شتانە نەدەچواند، لەگەڵ هەر یەکێک دابنیشتایە، بە ئوسلوبە قەناعەتپێکەرەکەی سەرنجی ڕادەکێشا. بە دەست خۆت نەبوو، لە دڵەوە خۆشت دەویست. بەدوای ساڵی ١٩٧١ یشەوە، لە چەند لایەکەوە بەندە پێوەندیی ڕێکخراوەییم بەو هاوڕێیانە دەکرد، کە سەرەتا هەر بە تاکی بوو، کەمال خورشید و فازیل ئەرکەوازی و عەبدولحوسێن لەبەشی کوردیی کۆلێجی ئەدەبیات، ئازاد عەزیز و دڵشاد عەبدوڵا لە کۆلیجی کشتوکاڵ لە ئەبوغرێب، ئازاد

نەجمەدین و ئەحمەد سابیر لە کۆلیجی پزیشکی. سەلام بەرزۆ و سادق لەناو قوتابییە فەیلییەکان، هیوا رەووف و عوسمان فەتاح لە کۆلیجی ئەندازیاری.

ساڵی ۱۹۷۲ بوو شاڵاوی راوەدوونانی کوردە فەیلییەکانی بەغداد و دەوروبەری دەستی پێ کرد. دامودەزگاکانی رژێم زۆر دڕندانە بە بیانوی نابەجێی شۆڤینییانە کەوتنە تەسفیرکردنیان بۆ ئێران. لێرەدا یەکێتیی قوتابیانی کوردستان، چ بە بەیاننامە، چ بە پرۆتستۆکردنی ئاشکرا وەک بەدەنگەوە هاتنی فەیلییە لێقەوماوەکان، رۆڵی بەرچاوی هەبوو لە پشتگیریکردنی براکانی خۆیان، لە قاودانی ئەو سیاسەتە چەپەڵە.

مانگرتنی قوتابیانی کورد لە زۆربەی کۆلێجەکانی زانکۆی بەغداد بۆ نارەزایی دەربڕین، ئەو رۆژە دەنگی دایەوە، دەزگا ئەمنییەکانی رژێمی تووشی شۆک کردبوو. لەبیرمە لەو قوتابییانەی لەنێوان قوتابیانی کۆلێجەکان بۆ رێکخستن و دانانەوەی یەک کاتی مانگرتن و خۆپیشاندان لە ناو کۆلێجەکاندا، عەزیز مەحمود و یاسین ئەنور و چەندانی دیکە رۆڵی سەرەکییان هەبوو. رۆژی مانگرتنەکەمان، ئێمەی قوتابیانی کوردی کۆلیجی ئاداب لەو حەوشەیەی بەشی کوردی کۆ ببووینەوە و خەریکی گوتارخوێندنەوە و حەماسەت خوڵقاندن بووین. ئاگادار کراینەوە، کە عەزیز مەحموود لە ئۆفیسی بەردەرگای کۆلیجی ئاداب، لە لایەن چەند قوتابییەکی بەعسییەوە، رێی پێگیراوە و بردوویانەتە ئەو ژوورەوە، کە لە بەردەرگای سەر جادەکە بوو. ئەوە بوو نزیکەی پازدە قوتابی "شێرکۆ فەتحوڵلا، وریا خدر، بەهزاد ئیسماعیل، مەحەمەد غەریب، عومەر رواندزی، رزگار عەبدولرەزاق، عرفان، مەردان، عەباس، کمال... هتد" بەبێ گوێدانە هەر جۆرە مەترسییەک، پەلاماری ئەو ئۆفیسەمان داو بەزۆر دەرگاکەمان پێ کردنەوە، کە لەو ناوە زۆریان بۆ ئەو هاورێیە هێنابوو، تاکو بیپشکنن، بەڵام ئێمە پێڕاگەیشتین و لە بەردەستیان دەرمانهێنا و لەو ناوە دەربازمان کرد، لە چوونەدەرەوەدا عەزیز مەحمود یەک چەپکە بەیاننامەی یەکێتیی قوتابیانی کوردستانی دایە دەستم، کە لە دژی راگواستنی فەیلییەکان ئەو رۆژە چاپ کرابوو، هەروەها سەری نایە بناگوێم و گوتی: من دەمانچەیشم پێیە. هەر چۆنێک بوو بە پەلە پرۆسکێ دەربازمان کرد و گوم بوو، سەیرمان کرد هەر چوار دەوری کۆلێجی ئاداب بە ئەمن و پیاوی موخابەرات تەنراوە و پەلاماری ئەو ئۆفیسە دەدەن کە عەزیز مەحمودیان تێدا گیر کردبوو. بەڵام دەستبەتاڵ مانەوە، عەزیزمان رزگار کردبوو. لەو هێن و منهێنەدا، قوتابیانی کورد بە تاکتیکی یاسین ئەنور زۆربەیان بەرەو کۆلێژی یاسا و کارگێڕی و ئابووری بەرێکەوتن، بۆ بەهاناوەچوونی قوتابیانی کورد لەوێ. کە ژمارەیان لەچاو عارەبەکان زۆر لە خوار بوو. من و چەند قوتابییەکی لە نموونەی رەشاد سەبری، ئازاد میران، کەمال عەبدولا دهۆکیی و خەجیجە و فەتحولا کەریم و چەندانی

دیکە، لەو دۆخە ناهەموارەدا، لاسارانە ئەو چەند دانە بەیاننامەیەی بەدەستمان کەوتبوو، دەستوبرد هەموویمان لەسەر دیواری بەشەکانی کۆلێج هەڵواسی و لە دەرگای پشتەوەی کۆلێجی پەروەردە بەرەو وەزیرییە بۆی دەرچووین، هەریەکە بە لایەکەوە رۆیشتین، نەوەک پیاوەکانی رژێم دوامان کەوتبن.

**کتێبی سێیەم**

# ویژدانی زیندوو، بیری گەشە..

**هەڵدانەوەیەکی ڕەخنەگرانەی باسوخواسەکانی ئەو کتێبەیە، کە ئەوشیروان مستەفا لەژێر ناوی (لە کەناری دانوبەوە بۆ خڕی ناوزەنگ) نووسیویەتی.**

**چەند وشەیەک..**

خوێندنەوە و هەڵسەنگاندنی ئەو کتێبەی سەرەوە، بۆ چەندان ساڵ بەر لە هەنووکە دەگەڕێتەوە. دیارە گەرەکم نەبووە لەو بارودۆخانەی رابردوو، ئەم نووسینە رەخنەئامێزەی بەندە، بۆ هەر بە خراپ سوودلێوەرگرتنێک شۆڕبێتەوە و بە کار بهێنرێ. یان لەخۆڕایی بە تۆمەتی دەستلەپشتدانی ئەم و ئەو، بۆ مەبەستی شەخسی و تایبەت ناوزەد بکرێت. نووسینەکەم تەنیا زادەی عەقڵپێداشکان، پەرۆشی دەرخستنی ئەو ئەزموونەی لە نزیکەی چل ساڵان تێیدا هەڕەتی تەمەنم بەڕێکردووە، بە شێوەیەک ژیانی تەمەنی پڕ کوێرەوەریم بۆی تەرخان کردبوو. من ریز و پێزانینم بۆ خەبات و ماندووبونی نەوشیروان مستەفا هەبووە و هەیە. سەرنج و بیروڕایەکانم سەبارەت بە گێڕانەوەکانی ناو کتێبەکەی، بای سەرەمووێک لەو هەست و نەستەمیان کەم نەکردووتەوە. هەر خۆشم لە وشە بە وشەی نووسینەکەی خۆم بەرپرسیارم. تاکە شتێک دەبێ، بۆ هەموو لایەک دانی پێدا بنێم، ئەوەیە کە لێرەوە سڵاو بۆ گیانی "ئارام"ی نەمر پێشکەش بکەم، کە لەپاڵ سەرەتاتکێکردنی تەمەنی گەنجێتیم لەگەڵ فەلسەفەی مارکسیزم _ لینینیزم، تەنیا خۆم بەقەرزاری زیندووێتی بیر و کردارە کەموێنەکانی ئەو مرۆڤە گەورەیە دەزانم، چونکە ئەگەر ئەو نەبوایە جارێکی دیکە توشی حیزبایەتی نەدەبوومەوە و زۆرم سوود لە بیروڕایەکانی وەرگرتووە. لە سەرچاوەی کانیاوی خۆشەویستی ئەو و دەیان هاوڕێی شەهید و زیندووی سەربڵند ئەم هەنگاوەم هەڵگرتووە. هیوادارم توانیبێتم لە بواری خزمەتکردن بە دەواری هەژارانەی بزاڤی شۆڕشگێڕی کورد، ترووسکاییم دابێتە کەلەنێکی سەر بە جەنجاڵی ئەو کاروانە.

**کورد لە ئەورووپا و سەفەری ئەمسا**

دیاردەی هەبوون و جێگیربوونی کوردان لە **ئەورووپادا**، لەو رۆژانەی **نەوشیروان** باسیان دەکات، بەتایبەت بەگوێرەی کوردی **کوردستانی** باشوورەوە، ئەوەندە مێژوویەکی کۆنینەی نییە، کە تووشی بیرکردنەوەی دۆشدامانمان بکات. چونکە تاکە رێگای دەرچوونی تاکوتەرای خەڵکی کورد لە **بەغدادی** عیراقەوە، زۆرتر بە هۆی زەماڵەی خوێندنەوە، یان بازرگانیکردن و گەشتوگوزارەوە بوو، یان ناردنی خەڵک بە وەفدی ڕەسمی بووە، کە جارجارەیش تاکو تەرای کوردی باوەڕپێکراوی دامودەزگای حکومەتی و حیزبی و بەعسی تێکەوتوە. ئەو رۆژانە هیچ هاولاتییەکی عیراق نەوەک هەر کورد، بگرە هەتا هەر عیراقییەکی دیکەش، بەبێ رەزامەندی دەزگاکانی ڕژێم مافی سەفەرکردنی نەبووە! چ جای کادرێکی سیاسی ناسراوی کورد! کەچی دەرچوونی **نەوشیروان** لەو عیراقە و لەناکاو

سەردەرهێنانی لە ڤییەننای پایتەختی وڵاتی نەمسا نیمچە تەلەسمێکە بۆخۆی! کە بەدوای دەیان ساڵی بەسەرچوودا، دەبوو روونتر و ڕاشکاوانە بەخۆیدا ڕابفەرموێ، چۆنیەتی سەفەرکردنەکەی بگێڕتەوە.

ئەو دەم زەمان و زەمینی سەرەتای حەفتاکان، بەیاننامەی ئازار لەگۆڕێ دابوو، ئاشتی و هێمنی لە کوردستانی باشوور و عیراق بەرقەرار بوو. نووسەر بە تەمومژ دەربازبونەکەی خۆی لە عێراق دەگێڕتەوە، باشتر بوو بەرچاوی خوێنەر لێڵ نەکات، هەتا لە چۆنیەتی وەرگرتنی مافی نیشتەجێبوونی لەو وڵاتە و چۆنییەتی وەرگیرانی لە خوێندنی زانکۆی ڤییەننادا، بەجۆرێک بازنەی ناسیاوی خۆی لەگەڵ کوردە جیگیربووەکانی ئەوێ، تێکەڵ بە یەکتری دەکات، کە مرۆڤ سەر لەوە دەر ناکات، بە چ ڕێگایەک مافی پەنابەری سیاسی وەرگرتوە!

**(د. موراد چاکەی تایبەتی بەسەر منەوە هەبو. کاتی خوی لەبەغدا گیرم خواردبو نەمئەتوانی دەربچم چونکە چەندین مەنعی سەفەری گون وتازەم لەسەر بو. د.موراد، بەهوی زەبیحییەوە، یارمەتی دلم لە بەغدا دەرباز بوم.)ل/١٢**

نەوشیروان قەزاواتێکمان بۆ ڕایەڵ دەکات، کەس بە بنج و بنەوانەکەی ناسیار نییە. خۆیشی نەهاتوە پاش ئەو هەمو ساڵە بەتەواوی ئەو سەربردەیە بگێڕتەوە، تاکو خوێنەر ناچار نەکات بەدوای مەزەندەدا بگەڕێ. دەبوو هۆی ئەو "چەندین مەنع"ەی لەسەری کۆ بونەوە، سەرچاوەکەی و بۆچییەکان تۆمار بکات! کەس نازانێ بۆ خۆی لێ نەبان کردووە! هەروەها کەسیش نازانێ ئەو د. مورادە فریشتەئاسایە کێیە! کە ئەو جوامێرییەی بەرانبەر نواندوە، زانیارییەک بۆ خوێنەر ناخوێنێتەوە کە وا بە سووک و ئاسانی لە فڕۆکەخانەی بەغداد سواری فڕۆکەی کردوە!

**قوتکردنی سەرەتاکانی ئەزموونی سیاسی..**

لە دەستپێکی ئەو کتێبەدا، نەوشیروان بەم جۆرە چوونە ئەورووپایەی بەشێکی زۆری ژیانی سیاسی خۆی، قوت کردووە و کتوپڕ خوێنەر دەباتە سەر باسکردنی باقوبریقی ژیانی نەمسا و رابردوو لەبیر خۆی و خوێنەر دەباتەوە. کە مرۆڤ بەدوای ئەوەدا پەلکێش دەکات، نووسەر نایەوێ بەسەرهاتەکانی خۆی لە بەرجەستەترین مەودای سەرەتاکانی گەنجێتی وکامڵبوون، ڕەوتی بیرکردنەوە و ئەزموونی سیاسی و چالاکییەکانی بەبیر خوێنەر بهێنێتەوە و لەو بارەوە شتێک بە خەڵک بڵێ! بە دڵنیایەوە نەوشیروان زەخیرەیەکی هێجگار زۆر و هەمەلایەنی لە هەگبەدا هەیە. چونکە هەم بۆ خۆی لە زەمەنێکی پڕ جەنجاڵی، تارادەیەک سەرەتایی قۆناغێکی خەباتی کوردایەتی

کەوتوتە سەرپێیان و کادرێکی ریزەکانی پێشەوەی ئەو کاروانە بووە و هەمیش لەگەڵ ڕەوتی تێکۆشانی سیاسیدا، رۆژنامەنووسێکی دیاری مەیدان بووە. بۆیە فەرامۆشکردنەکەی، هەم بۆخودی خۆی و هەمیش بۆ ساغبوونەوەی مێژووی خەباتی سیاسی و هەتا چەکداری نەتەوەکەمان بە زیان گەڕاوەتەوە. بێدەنگەبوونی سەبارەت بە بارودۆخی کەرتبوونی "پدک" و خەباتە چەکدارییەکەی لە ساڵی ١٩٦٤ – ١٠٦٦دا، بۆ لەنگبوونی تای تەرازوی تێکرای ناوەڕۆکی ئەو کتێبەیە، تەنیا نیشانەی ئەوەی لەگەڵ خۆدا هەڵگرتووە کە پشتکردنە مێژوویەکی پڕ خامۆشیی و ڕچەدانی نەگبەتییەکانە، نایەوێ کەموزۆر خۆی لە قەرە بدات.

**"زەبیحی"ی گومناو و بەسەرهاتی..!**

سەبارەت بە ناوهێنانی "**زەبیحی"ی** گومناوەوە، نەوشیروان بەو ڕەنگەی خوارەوە کەوتوتە وەسفکردنی:

**(هەرچەندە ئەمەن وبیروبۆچونمان لە زۆر لایەنەوە جیاوازبو بەلام رەحمانی زەبیحی دوستێکی خوشەویست و دلسوزم بو.)ل/١٢**

راستە نەوشیروان و زەبیحی لە رووی فیکر و سیاسیشەوە هاوڕا نەبوونە و زۆریش لە یەیەکتری جیاواز بوون. بەڵام دیارە گومناوبوونی **زەبیحی**، هەتا نەمانی یەکجارەکی و شوێن و چۆنیەتی بزربوونەکەی زەبیحی بۆخۆی، یەکێکە لەو تەلەسمانەی بازنەکانی خەباتی کوردان. ئەو یەکێک بووە لەو سەربازە گومبووانەی، خاوەنی کاروانێکی پڕ ماندووبوون، کەڵەکەبوونی ئەزموونێکی زەنگین بوو.

ناوی **زەبیحی** لەگەڵ لەدایکبوونی **کۆمەڵەی** (ژ.ک) لە **کوردستانی ڕۆژهەڵات** و بەشداریکردنی لە دامەزراندنی **پارتی دیموکراتی کورد** و **کۆماری مهاباد**، دوایی کۆڵنەدان و پەڕینەوەی بۆ **کوردستانی باشوور** و تێکەڵبوونی بە **پارتی "باڵی جەلالی"** و بەشداری لە خەباتی ئەو پارچەیەی **کوردستاندا**، کەوتوتە سەر زاران. بەبێ ئەوەی کەس لە نزیکەوە بە نهێنییەکانی ژیانی ئاشنا بێت! کەسیش لە ڕووداوی نهێنی لە ناوچوونەکەی زەحمەتی ئەوەی نەکێشاوە کە ئاشکرا بکرێت، چۆن ئەو گەنجینە پڕ زانیاری و ئەزموونە بەخۆڕایی گومناو بوو.

**نەوشیروان** کەموزۆر ئاوڕ لەو چارەنووسەی ناداتەوە کە مایەی دڵسۆزی و خۆشەویستی نێوانیان تێر بکات. لێرەدا جێگای خۆیەتی ئاوڕێک بە لای ئەو سوخەتەی بەشێکی زۆر لە سەرانی قوتابخانەی سیاسیی کوردی بدەینەوە.. هەر ئەوەندە بەسە فیکر وسەنگەرجیاوازییان لەگەڵ نزیکترین هاوڕێی خۆیان بۆ پەیدا ببێت، ئیتر ئەو کەسە

ئەوەک هەر ناوی لە قاموسی خەبات و ماندووبوون دەسڕێتەوە، بای تۆزقاڵێک ویژدانیان بۆ قوربانیدان و فیداکاریی ئەو کەسە لە ڕۆژە سەخت و دژوارەکان ناجوڵێ. بەندە نموونەیەک لە بەرخوردی ئەویٚ ڕۆژانی خودی **نەوشیروان** دەهێنمەوە:

ڕۆژانی سەخت و تەنگەبەری خەباتی شار و شاخ لە سالانی ١٩٧٦ – ١٩٨١دا ، بەندە ئەوەک هەر هاوڕێیەکی ڕۆژانی تەنگانە بووم، بگرە لەویٚ ڕۆژاندا بە شان و باڵمیاندا هەڵدەگوت، خۆی بە بەندەی دەگوت: "ئەگەر ڕۆژێک من سەربەست بکەن لە هەڵبژاردنی ڕەفیقەکانمدا، هەرگیز کەس لە خەڵکی وەکو ئێوەی سەرڕاست، دڵسۆزتر بە ڕەفیقی خۆم نازانم." بەلام بەپراکتیک هەر ئەوەندەی نەبرد، بەندە لە ئاقاری بالاخانەی بیروکرداری دەسەلاتدارانی کۆمەڵە لە ساڵی ١٩٨٣ بەدواوە و لە "ی.ن.ک" کەوتمە هەڵوەستەکردن! بە بێ ئەوەی ڕۆژێک لە ڕۆژان بە لای سەنگەری دووژمنانی نەتەوەکەم کەوتبم، یان بە هەر باج و قوربانییەک و هەر جۆرە فشارێک لەگەڵ دەزگا سیخوڕییەکانی ڕژێمە داگیرکەرەکان شەنەبای سەودا، یان جاشایەتیم کردبێت! بەڵکو تاکە هەڵویستی من، هەر تەنیا بوونە ئالای شۆڕش بووە، ئەوەک هەر ناوم لە ناو کولەکەی تەڕیش نەما، بگرە لە لایەن "**خۆیان**"ەوە فەرمانی گرتنم بە زیندوویێتی و مردوویی بۆ دەرکرا. کە چەندان ڕۆڵەی شەهید و بەژیان زیندوو تاودراون بۆ تیرۆرکردنم، بەلام هەندێک لەو ڕۆڵە جوامێرانە ویژدانی خۆیان ئازارنەداوە و ئامادەی ئەو کارە نەبوون، خۆیشم ئەوەندەیتر وریا و ئاگادار بووم، بۆ ئەوەی نەکەومە تەپکەی بەردەستیانەوە. ئیتر بۆ دەبێ **زەبیحی** گومناو نەبێت..!

**(لە دوا ساڵەکانی تەمەنی دا هەڵەیەکی سیاسی گەورەی کرد، چوە ناو یەکی لە حیزبە کارتونییەکانەوە، لە کاتیک دا نە ئەو پیویستی بەمە هەبو، وە نە لەو ریگایەشەوە ئەیتوانی خزمەتیکی کورد بکا...)ل/١٤**

وەک **کورد** دەڵێت، مشتێک نموونەی خەرواریکە. لە چاو پەنای خوێندنەوەی سەرەتاییانەی ئەو نووسینەوە، جۆرە شێواز و میتۆدێک ڕێنمایی کراوە، لە زۆربەی خاڵە تەماوی و نادیارەکاندا، نووسەر هیچ کاتێک خوێنەر ناگەیەنێتە کەناری ساغبوونەوە، بەڵکو زۆرتر بە تیلکوەردان لەو باسخواسانەدا کە ڕوونکردنەوە، یان بە لانی کەم ڕای خۆی گەرەکە. چەقی دڵسۆزییەکەی بۆ **زەبیحی** گومناودا لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، کە تەنیا **زەبیحی** شارەزای ئەدەب و زمان بێت! **نەوشیروان** خۆی لە ئاست کاری سیاسی و کاری مامانییە چەند سەرییەکەی **زەبیحی** نەبان کردووە! کێ دەڵێ بۆ قازانجی **کوردی** نەکردووە! و کارەکانی لەو مەیدانانەدا زۆر لە کارەکانی زمان و ئەدەب بارگرانتر و مایەی هەڵوەستە لەسەرکردن بوونە، دواتر بەم وشانە پاساوی بۆ هێناوەتەوە.

**(مەلا مستەفای بارزانی رقی لی ی بو، چونکە ئەو وەکو هەژار، خۆی بەلای ئەودا نەخست بو. سەرانی دیموکرات ، بەتایبەتی د.قاسملو، حەزیان لەچارەی نەئەکرد، چونکە کاری لەگەڵ ئەوان نەکردبو، زەبیحی باوەری وا بو هەر کوردی کەوتە هەر پارچەیەکەوە پیویستە خزمەت بەو پارچەیە بکا. حیزبی بەعس قینیان لی ی بو. چونکە بەدوستی مامجەلال و ئیبراهیم ئەحمەدیان دا ئەنا..)ل ۱٤/۱۳**

بە گوێرەی ئەو وشانەوە، ناتەبایی تێکۆشەرێکی گومناوی وەک زەبیحی لەگەڵ ئەو هەموو حیزب و هێز و دەسەڵاتەدا، هەر وا ئاگری بێ دوکەڵ نەبووە و لە خۆڕایی بۆی هەڵنەبەستراوە. بەڵام نووسەر بەلای بنجوبنەوانی ئەو قسەوقسەڵۆکانەوە نەچووە. هەر بۆیە ئەو گۆمەزەیە و دەیان گرێکوێرەی دیکەی کاروانی خەباتی کوردان، ئەوە هەڵدەگرێ کە خەڵکانی دڵسۆز بە کورد و وڵاتەکەیان، ئاوڕی لێ بدەنەوە و خاڵە شارەوەکان ئاشکرا بکەن، تاکو خەڵکی کورد بە کاروکردەوەی نادیاری سەرانی قوتابخانەی سیاسی ئاشنا بین و زۆر لەو هەموو تەنگەژە خامۆشە زەبەندانەی کاروانی سیاسی کوردان بکرێنەوە و بۆ خاتری خاتران هەر وا بە سوک و سەلامەتی تێنەپەڕن و بەرماڵی لەبیربردنەوەیان بەسەردا نەدرێ.

**ئەورووپا و بەخێوکردنی وڵاخ بە نوقل..**

چەندان سەرکردە و کادرانی مەیدانی خەباتی چەکداریی کۆتایی حەفتاکان و سەرەتای هەشتاکانی کوردستانی باشوور، هەتاکو خۆیان لە ئەورووپا بوون و لەوێیان دەگوزەراند، ئا بەم جۆرە وشانەی خوارەوە یەکلایەنە وەسفی ئەورووپایان کردووە. نەوشیروان لەسەر زاری نەمساوییەک ئەم وشانە بە شێوەیەکی شاگەشکەکارانە دەگێڕتەوە کە مرۆڤ لە بەرانبەر ئەو تۆمارکردنەی دوور لە هەر ڕوونکردنەوەیەک تووشی هەڵوەستەکردن دەکات.

**(من وڵاخەکانم بە نوقل وپسکیت بەخیو ئەکەم، جەنابیشت لی یان ئەدەی، لیرە لە وڵاخ نادەن بەرەشمەکەی ئیشارەتی ئەدەنی.)ل۷/ــ۱۰**

بەلانی کەم دەبوو بە خوێنەر بڵێ لەو وڵاتەدا ئاژەڵیش خاوەنی نوقل و پسکێتی تایبەت بە خۆیانن، کە بۆ دۆزی پێشکەوتنی ژیان لە ئەورووپا، گیانی بەزەیی مرۆڤانەی خەڵکەکەی دەگەڕێتەوە و هێشتا کۆمەڵی کوردی لێی بەدوورە. ئەوجا وەسفکردنە جوانەکانی بۆ سروشتی دلگیری وڵاتی نەمسا، چەشنێکە لە لاواندنەوە و خۆشەویستی خۆی بۆ ئەو وڵاتە، کە جێگای دڵخۆشییە. بەڵام هەرکە خۆیان هاتوونەتە شاخ، لە سێبەری تفەنگدا دەسەڵاتیان پەیدا کردووە، سەبارەت بە دیاردەی چوونی ئەندام و کادرەکان بۆ ئەورووپا و

بەجێهێشتنی سەنگەری شاخ بە هەر بیانوییەک بێت، ئەو هەڵویستەیان سەراوژوور بووەتەوە. ئەو ئەوروپا بەهەشت ئاسایەیان بە مەڵبەندی ڕاکردووان و هەرچی و پەرچییان خوێندوتەوە! بەتایبەت لەو ڕۆژانەی خەڵک زۆر بێزاربوون لە شەڕی بێهودەی نێوان هێزە چەکدارەکانی شاخ، بە تاک و بە کۆ لە جیاتی پێشمەرگایەتی و شەڕی بێهودەی کوردکوژی، ڕوویان لە دەرەوەی وڵات دەکرد.

**جۆری پێوەندیی نەوشیروان بە کۆمەڵەوە**

**(لەو کاتەوە کە چوبوم بو ڤیەننا هەولم ئەدا خوم لە روداوە سیاسییەکانی کوردستانی عیراق دور رابگرم. بەشداری هەندی لە کوبونەوەکانی خوێندکاران ئەبوم بەلام کەم تیکەلاوی چالاکی پارتایەتی ئەبوم.) ل/١٤**

وەک لەم وشانەدا دەردەکەوێ، **نەوشیروان** کەموزۆر ناوی **کۆمەڵە** و هەر جۆرە پێوەندییەکی خۆی لە دوورەوەیش تۆمار ناکات. ڕاستگۆیانە دوورەپەرێزیی خۆی دەگێڕێتەوە. کەچی کە دێتەوە شاخ، بە هەر جۆرێک بێت لەناو یەکێتی دەبێتە نوێنەری کۆمەڵە! بگرە هەر بەدوای شەهیدبوونی "**ئارام**"ەوە، یەکسەر دەبێتە کەراکتێری سەرەکی **کۆمەڵە!** هەنگاو بە هەنگاو لە سێبەری خوێندنەوەی زیرەکانەی پاڵ "**مام جەلال**"دا، بە سکرتێربوونی یەکجارەکی **کۆمەڵە** بۆ خۆی دەجلیتێنێ! ڕاستە **نەوشیروان** قوربانییەکی گەورەی داوە، لەوەی لە بارودۆخێکی هێجگار نالەباری خەباتی چەکداریدا، دەستبەرداری ژیانی خۆشی **ئەوروپا** و خوێندنی ئەکادیمی خۆی بووە و **هاتوتەوە** شاخ، کە ئەو لەخۆبوردەییە دەگمەن بووە. بەڵام مەگەر ئەو ئەزموونە هەر بە بزاڤێکی خەڵکی وەک **کورد** نۆش کرابێت، کە باوەڕ ناکەم لە دونیای تێکۆشانی ڕەوای ئازادیخوازان نموونەی هەبێت. بە جۆرێک ئەمە یەکێکە لە سەرچاوەکانی گەشەکردنی نائاسایی و ناسروشتیی ئەو **کۆمەڵەیە** و دوایی لە وەرچەرخانێکی پەلەپروسکێدا، بە ڕەزامەندی هەمان سکرتێر، **کۆمەڵە** لە شەوورۆژێکدا هەڵدەوەشێنرێتەوە و ئارەزومەندانە سەروەرییەکانی خەباتی بە چاک و خراپییەوە لە سەبەتەکەی "**ی. ن. ک**" دەکرێ!

**سەفارەتی عیراق و یەکتر خوێندنەوە..**

**(ئەوسا لە نێوان کورد و حکومەتی بەعس دا هێشتا ئاشتی بو. نیوانی ئیمەش لەگەل سەفارەت ئاسایی بو. بو ئاهەنگەڕەسمییەکانیان بانگیان ئەکردین. بەریکوپیکی روژنامەکانی بەغداد: الثورة. و الجمهورية یان بو ئەناردم.)ل/١٤**

له خوێندنەوەی ئەم وشانەی سەرەوەدا، دیارە **سەفارەتی عیراقی** بە هاتن و جێگیربوونەکەی **نەوشیروان** ئاگادارە بووە، هەتا ئەدرێسی پۆستەکەیان زانیوە. وەک خۆی نووسیویەتی "ڕۆژنامەکانی.... بۆ ئەناردم." کە لە هەمان پەرەگرافدا بە کۆ (**ئیمەش**) قسە دەکات، کەچی دواتر بە تاک (بۆ ئەناردم) قسە دەکات. لێرەدا، ئەوەی ساغ کردوتەوە کە **سەفارەت** بە بوونی ئەو لە **نەمسا** ئاشنا بووە. ئاساییە سەفارەت ئاگاداری بوونی نەوشیروان بووبێت، چونکە ئەو کەسێکی سادە و هاکەزایی نەبووە، بەڵام دەبوو خۆی بە ئاشکرا و بەبێ تەمومژ ئەو ڕاستییە بنووسێ. لە سەبەتەی ئەزموونی سەفارەتەکانی عیراقی ژێررکێفی ڕژێمی بەعسی بەسەرچوودا، یەکێک لە کارەکانیان چاودێریی بووە و ئەو سەفارەتانە لە هەر وڵاتێک بووبن، سۆراخی پەنابەرانی عیراقییان کردووە و بە هەبوونیان زانیوە و ئاگادار بوونە کێن و چ کارەن. ئەوەندەی بۆیان مەیسەر بووبێت فشاریان بۆ ئەو پەنابەرانە هێناوە کە پێوەندییان بەو سەفارەتانەوە نەپچڕن. کەچی نەوشیروان سەبارەت بە وەرگرتنی مافی پەنابەری سیاسی لە نەمسا و پێوەندیی هەبوونی لەگەڵ سەفارەتی عیراق ڕوونکردنەوەیەکی بەرچاوی پێویست و ڕۆشنی نەداوە.

**کوردستانی بون و نەبونی سکرتێری کۆمەڵە..**

لە زەمانوزەمینی ساڵانێکی ئەزموونی **کۆمەڵەی ڕەنجدەرانی کوردستاندا**، بەتایبەت لە سەردەستی ڕێبەرایەتی **نەوشیروان** و هەوادارانیدا، وروژاندنی زاراوەی **کوردستانیبوون** بۆ خۆیان و **عیراقچیبوون** بۆ نەیارەکانیان لە کۆمەڵەدا، مەودایەکی زۆر نان و پیوازی ڕۆژانی شاخی پێ دەخورا و وەک عوملەیەکی قورس گرەوی پێشڕەواتی دەسەڵاتداربوونی لەناو **کۆمەڵە** و **یەکێتی** پێ قورخ دەکرا. بەجۆرێک ئەو سەرەتایە تەماوییە، لەپاڵ چەندان زەمینەی دیکەی وەک شەڕی خۆکوژیی براکان و خەریکردنی هاوڕێیەکانی **کۆمەڵە** لە پانتایی خەباتکردنیاندا، بەو شەڕە لابەلا ناپێویستانەوە. ئەمە خۆی لە خۆیدا چاکترین میکانیزمی بنکۆڵکردنی ئەجندای سیاسی و ڕووخاندنی ئەو ستروکتورە شۆڕشگێرییە نوێیە بوو، کە "**ئارام**" لە هەوڵی دارشتنی سەرەتاکانیدا بوو؛ هەر لەو چاوپەنایەیشەوە هەنگاوەکانی پەچەکاری مەنهەجی ئەجندای لەباربردنی ڕێکخستنێکی بە بیروباوەڕ، ڕێچکەی بەستوە. کە "**ئارام**" لەگەڵ ئەو خەباتە چەکدارییە ناچارییەی تووشی بیوو، پشوودرێژانە خەریکی خوڵقاندنی گیانی بەدیموکراتیی یەکترقبووڵکردن و لەگەڵ یەکتر گفتوگۆکردن بوو، لەپێناوی ساغکردنەوەی کۆڵەکە جەوهەرییەکانی بەرنامەی خەباتکردنی نزیک و دووری **کۆمەڵە**. کەچی لە سێبەری مامەڵەکردن لەنێوان **کوردستانیبوون** لە ڕووخساردا و **عیراقیبوون** لە پراکتیکدا، بەردەوام ئەو کادر و

ئەندامانەی **کۆمەڵە**، کە هەر وا لە خۆڕایی بە **عیراقچی** ناوزەد دەکران[33] بەبێ ئەوەی هەر جۆرە بەرژەوەندییەکی **کۆمەڵە** لە بەرچاو بگیرێ. لێرە و لەوێ ئەو جۆرە کادرانە پەراوێز و ترۆ دەکران. کەچی **نەوشیروان** دوابەدوای نەمانی **کۆمەڵە**، پاش چەندان ساڵ لە نووسینەوەی یاداشتەکانیدا زۆر ڕاستگۆیانە، بەوپەڕی بێمنەتییەوە پەردەی لەسەر چۆنییەتی ئەو **کوردستانیبوونە** هەڵداوەتەوە و دەڵێ:

**(ئەمجورە نەخشەیە گەلانی دراوسی ئەترسینی و، دژی کورد ئەیان وروژینی، چونکە هەندی شوین خراوەتە ناو سنوری جوگرافی کوردستانەوە، ئیستا بە ئەرزی کورد دائانرین ، رەنگە هەبی بلی.. کورد هیشتا دەولەتی نیە چاوی بریوەتە ئەرزی گەلانی تر. ئەی ئەگەر دەولەت و لەشکری هەبی چی بکا؟)ل/١٥**

من بۆ ئەمڕۆکە، سەبارەت بە ساغبوونەوەکانی ڕۆژگار لە بەڕاست و نا دروستی بۆچوونەکانی ئەوێ ڕۆژێ قسەیەکم نییە، چونکە ئەوەتە بەشێکی سەرەداوە نادیارەکان دەرکەتوون. بەڵام دەبێ لە ئاست ئەو پەیڤانەی سەرەوە قسەی خۆم بکەم، چونکە من و دەیانی وەک من لەو کەش و هەوا لێڵەدا، باجی زۆرمان پێدراوە. بێگومان ئەو وشانەی سەرەوەی ناوبراو، نموونەگەلێکی سەرمەشقی ئەو مامەڵەیەیە، کە ساڵانێکی زۆر دەسکەلای بەردەستی دەسەڵاتدارەکانی **کۆمەڵە** بووە و گەمەی خۆیان پێ کردووە و لە مەیدانی هەڵسوکەتە تەمومژاوییەکانی سیاسەتکاری، لەسەر ئێسکوپروسکی دەیان ڕۆڵەی فیداکاردا، وردیان کردووتەوە. لێرەدا سکرتێری **کۆمەڵە** ڕاشکاوانە بە هەموو لایەک دەڵێ کە لە بنەڕەتەوە، چەند باوەڕی بە سەرەتا فیکرییەکانی "**کۆمەڵەی م. ل**" هەبووە، هەر ئەوەندەیش لەگەڵ **کوردستانیبوون** هەژاوە! ئەوەتە بە ڕووی تەنیا نەخشەیەکی پێشنیازکراوی کوردستان، کە چەند خوێندکارێکی **کوردی** خوێنگەرمی دانیشتوی **ئەوروپا کردبوویان**، خۆی بۆ ناگیرێ و بیر و بۆچوونە ڕاستەقینەکانی خۆی دەردەخات، بگرە بۆ پاساوهێنانەوەکانیشی لەگەڵ خودی خۆی یەک نایەتەوە، بە جۆرێک وەک سوخەتێکی ئاسایی سەرانی حیزبی کوردی کە بە درێژایی مێژوو، بونەتە ئاوقاتی داگیرکاران، هەتا ئەوەندە بە تامەزرۆیی بە "گەلانی دراوسی" ناویان دەبات، کە مرۆڤ بۆی هەیە لە بەرانبەر ڕاستی و ناڕاستیی ئەو هەموو غەدرەی لە **کوردیان** کردووە، بکەوێتە هەڵوەستە و گومانەوە! گەلۆ ئەتۆ بڵێی مێژووی ئەو گەلە دراوسێیانەی **کورد** ئەوەندە هەژار و کەم

---

[33] کە خۆشیان لەمبارەوە کەمسوچ نەبوون، بەبێ هیچ باکگروندیکی بابەتی، بۆ دەست و پیسپیەتی خۆیان و کەمتواناییان لە بەرپەرچدانەوەی ئەو تۆمەتە، بەتۆبزی خۆیان خستوتە ژێر بارییەوە کە خۆیشم یەکێک بوم..!

وێنەی حەپەلوشکردنی خاکی **کوردستان** بێ! لە بەرانبەر خەڵکێکی ستەمدیدەی وەک **کورد** فریشتە و پەرێزپاک بێ! کە نووسەر لە خەمی ئەوەدابێت کە لە لایەن ئەو جۆرە نەخشەیەی **کوردستان**، خاک و ئەرز و ئاوی ئەوان قوت بدرێ! **نەوشیروان** لە درێژەی گێڕانەوەکەیدا، پاساوەکانی بەوە پشتڕاست دەکاتەوە، کە ئەم جۆرە نەخشەیەی **کوردستان** دەبێتە مایەی وروژاندنی "گەلانی دراوسێ". وەک ئەوەی ئەو "گەلانە" هەتا ئێستا کڕوکاس کەوتبوون و کەمیان بە **کورد** کردبێ! لە هەمێزی ئەو پاساوانەی نووسەردا، ئەوە خۆی حەشار داوە کە دیارە بڵاوبوونەوەی ئەم جۆرە نەخشە جوگرافییە هەتا لەسەر کاغەزیش بۆ پەزەکانی ناو پەرێزی پەرشوبڵاوی سەرانی سیاسەتمەداری کوردی زیانی هەیە، لە فەرهەنگی سیاسیی ئەواندا بڤەیە! برایەتی یەکلایەنە و کاڵفامانەی **کورد** لەگەڵ **عارەب** و **تورک** و **فارس** دەڕوشێنێ..! لە بەرانبەر مێژووی پڕ سەروەری میللەتی **ئیسلام** لە ڕوودا دەمێنێین..!

دواتر لە درێژەی ئەو سەربردەیەدا، **نەوشیروان** بیروبۆچوونەکانی خۆی بەوە بەراورد دەکاتەوە، کە گوایە گرنگی دەریا و نەبوونی سنووری **کوردستان** بەسەر دەریاوە، کاریگەرییەکی خراپی کردوتە سەر دۆزی **کورد**، وەک ئەنتی کوردستانییەک هەموو هەوڵی خۆی بۆ ئەوە داوە کە ئەو خوێندکارە واز لەو خەیاڵە بهێنێ و گاڵتە ئامێزانە بە ناچاری دەست لەو باسە هەڵدەگرێ.

**سەفەری وڵاتانی ئەوروپا..**

**(من نەمئەتوانی بە ئازادی هاتوچوی عیراق بکەم. پشودانەکان سەفەری وڵاتانم ئەکرد./.../**
**زستانی ٧٣/١٩٧٢ سەفەرێکی درێژم کرد بۆ سویسرا، ئیتالیا، فەرەنسا، ئیسپانیا.**
**لەو ماوەیەدا سەردانی ئەلمانیای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، یوگسلافیا، بولگارستان..م کرد./.../**
**جاریکیتر سەفەریکی دریژی چیکوسلوفاکیا و رومانیام کرد..)ل/١٧**

**نەوشیروان** دەروازەی باسکردنی سەفەری گەشتوگوزاری بۆ وڵاتانی **ئەوروپا**، بە بیانوی نەتوانینی بە ئازادی سەفەرکردنی بۆ **عیراق**، دەست پێکردوە. کە مرۆڤ خوێندکاربێت، بواری کات و ئیمکاناتی دارایی بۆ سازبێت، گەڕان بە وڵاتانی **ئەوروپادا**، کە هەتا ئەمڕۆکەش لانکی پێشکەوتن، شارستانیەتی مۆدێرنە، کارێکی پڕ بە سوود و باشە، بەڵام نووسەر هەروەک چۆن سەبارەت بە سەفەرنەکردنی بۆ **عیراق**، هۆیەکی قەناعەتپێکەر بەدەستەوە نادات و دەربارەی سەرچاوەی خەرجیی ئەو کاروانە گەشتوگوزارە، هیچ بە خوێنەر ناڵێت، چونکە ئێستاکەیش سەفەری ئەو وڵاتانە گیرفانێکی گەرموگوڕی دەوێ. بەتایبەت بۆ خوێندکارێک! گریمان ئەوە کەسێکی وەک نەوشیروان برادەر و ناسیاوی لەو

وڵاتە ئەورووپییانە هەبووە و دەشێت لای ئەوان مابێتەوە و زۆر خەرجییان لە کۆڵ کردبێتەوە.. ئەدی بۆ ناوی یەکێکیان نابات..!

**رووخانی سیستەمی بلۆکی ئەورووپای رۆژهەڵات**

**نەوشیروان**، بە دەستخۆشییەوە وەک هەر سیاسەتمەدارێکی **کورد**، سەبارەت بە هەرەسهێنانی کۆمیدیانەی سیستەمی حکومڕانی وڵاتانی بلۆکی **ئەورووپای شەرقی**، بە ڕاگوزارانە و تا ڕادەیەک گاڵتەئامێزانە کەوتوتە هەڵدانەوەی لاپەڕە پڕ ناهەموارەکانی ئەو سیستەمە حکومڕانییە. ڕاستە بەسەرکردنەوەی ئەو ئەزموونە هەڵوەشاوەیە، خۆی لە خۆیدا نیشانەگەلێکی زۆری لەپاڵ خۆیدا هەڵگرتووە. کە زەقترینیان وەک ڕووداوەکان ساغیان کردوتەوە، کەلتوری پاشەگەردانیی ڕۆژهەڵاتی لە دەسەڵاتدا و بۆگەنکردنی دامودەزگاکانی دەوڵەتی، کردوتە مێژوویێکی ناشیرین و پڕ گرێکوێرەی ئەوتۆ کە مرۆڤایەتی لە ئاستیدا هەتا ئێستا دەستەوەستانە. **نەوشیروان** بە پێی ئەو شارەزایی و ئەزموونەی خۆیەوە دەیتوانی لە باوەشی ئەو جۆرە باسکردنە، بە توێژینەوەیەکی گشتلایەنی تێکڕای جەمسەرەکانی ئەو ئەزموونە شکستخواردوە دەربخات، بە تایبەت ئەو پەتای گەندەڵییەی تێکڕای ئۆرگانەکانی **حیزبی** و **حکومی** گرتبوەوە و بە سەرجەم شادەمارەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ژیاری ئابووری کۆمەڵگادا هاتبوە خوارەوە. تاکو لە سەرەتای دەستپێکردنی ئەزموونی حکومڕانی **کوردی** لە **کوردستانی باشووردا**، وەک سەرمەشقێکی بەرچاو دەرسی لێ وەربگیرایە، نەوەک بەو شێوەیەی هەینێ و ئێستا، وەک مۆدیلێکی کەرەسیساوی ئەوێ،کۆپی بکرێ و جلوبەرگی کوردەواری لەبەردابێت.

**نەیاری نەیارم، دەبی بەدۆستم**

لەگەڵ سەرهاڵدانی گەمەی سیاسەت، بە جلکی **کوردی**، لەژێر کاردانەوەی دەستکورتانەی ئەو سیاسەتەی **ئینگلیزەکان** "فرق تسد"، بەڵام لە بوار و هەوارێکی پێچەوانەوە، بەشێکی زۆر لە سەرانی حیزبی **کوردی** بۆ مسۆگەرکردنی بازاڕی گەرموگوڕی سەرکردەیی تاک و تەنیای خۆیانەوە، پرینسیپی سەرەوەیان کردوتە سەرمەشقی جەوالی دڕاوی کۆنەڕقی ناو هەناوی بزاڤی کورداتییەوە. سەرەدیقانێی یەکتر و ڕاونانیان پێ پیادە کردوە. ئەوەتە **نەوشیروان** دروست لە لاپەڕە ١٩ ەوە و لە تاوتوێکردنی ڕووداوەکاندا، ڕاستەوخۆ بەری لە ئەسلی مەقسەدی خۆی گرتووە، بێ پەروا لە فەنتازیای هۆنینەوەی بیر و بۆچوونەکانییەوە، کەوتوتە هەوڵدانی گۆلکردن لە سەرکردایەتیی **مەلامستەفای بارزانی**. ئەگەر ئەوە تەنیا لە بیر و هۆشی نووسەر جێگای

نەبوبێتەوە، دەنا هەموو ئەو خەڵکانەی بەژیان ماون، ئەو ڕۆژانەی سەرەتای حەفتاکانیان لەبیر نەچوەتەوە، کە زۆرینەی خەڵکی **کورد**، بەدەنگ و ڕەنگی جیاوازییانەوە، هەتا بە ڕەوتە هەڵوەشاوەکەی "م.س" یشەوە، ئەگەر بە رووکەشیش بێت، بە بیانووی بەرژەوەندی کوردایەتی، لەگەڵ سەرکردایەتی **مستەفا بارزانی** یەکهاتونەتەوە. واتە زۆرینەی خەڵک بە پراکتیک کەوتبوە ئەو بەرەیەوە. **حشع** و حیزبە کارتۆنییەکان بە پێشڕەوایەتی حیزبی **بەعس** لە بەرەی دووژمنی کورد بوون. کەچی **نەوشیروان** وەک ئەوەی لە دیدی چاودێرێکی غەیرەکوردی دوور لە واقیع، وێنەی ڕەوتی ڕووداوەکانی ئەویَ ڕۆژان دەگری، بەڵام هەر بۆ پەرێزشپڕێوی **کورد**، لە دوورەوە بەم جۆرە وێنەگرتنەکانی عەرز دەکات:

**(حیزبی شیوعی عیراق چوبونە ناو جەبهەکەی حکومەتەوە. هەروەها بەشداری وەزارەت بون. نیوانیان لەگەل پارتی تیکچوبو. روژنامەکانی/ الطریق الشعب/ ی حیزبی شیوعی و/ التاخی/ پارتی پەلاماری یەکتریان ئەدا..پارتی لەو شوینانەی دەستی ئەرویشت تەنگی پی هەلچنی بون. ئەندام و لایەنگرەکانیان ئەگرتن و ئازاریان ئەدان. عیسی سواری بارزانی،سەرلەشکری هێزەکانی پارتی لەبادینان، 12 کادری شیوعی کە لە سوریاوە ئەگەرانەوە، بەکومەل کوشت. وەکو دوایی بارزانی لە نامەیەکی دا بو کارتەر دانی پی دانابو، تەنگ هەلچنین بە کومونیستەکان بەزوری بو رازی کردنی ئەمریکا و هاوپەیمانەکانی بوە.)ل/١٩**

سیاسەتی حیزبی **کوردی** لەوان ڕۆژانیشەوە، هەمیشە دەقی بەوەوە گرتوە کە زۆرتر "برۆ بدە بەرێ" زمانیحال بووە. سەرانی بەرێوەبردنی ئەو سیاسەتە، بە رووی ئەجندا دەمدەمییە نەیارەکانی **"حشع"** بەرانبەر بە بزاڤی ڕەوای خەڵکێکی چەوساوە، وەڵامێکی جیاواز و لۆجیکییان نەبووە، کە مایەی لەقاودانی سیاسەتی چەتونی ئەوان بێت. بەڵام خوێندنەوەی وشەکانی **نەوشیروان**، فەنتازیای "دیزە بەدەرخۆنەکردن"ی نەیارییەکەی خۆیەتی بەرانبەر بە **"حشع"**، بۆ خاتری لەکەدارکردنی یەکلایەنەی سیاسەتەکانی سەرکردایەتی **بارزانی** بەرانبەر بەو حیزبەوە. بە بێ ئەوەی مەسەلەی سەرچیخچوونەکانی سەرانی **"حشع"** بەرانبەر بە دۆزی **کورد** لە عیراقدا روون بکاتەوە، کە هەمیشە لە داکشان و ڕاکشان بووە. هەرگیز خاوەن بەلانسیکی بابەتی و لۆجیکێکی بەرچاوی سەردەمییانە نەبووە. کە ئەو حیزبەی بەناچاری بەرەو ئاقاری کەوتنە داوی ئەو حیزبی بەعسەوەی بردووە، لە مێژوویەکی نزیکی بەسەرچوودا، گەورەترین کارەساتی بەسەر هێنابوون. کەچی نووسەر زۆر بلەز، بەبێ هیچ بەدواداچوونێک بۆ ئەوەی خۆی مەبەستییەتی، یەکدەسرازە گومان و دڵەڕاوکێی کردوتە ناوەخنی ڕستەکان. خوێنەر بەوە ئاشنا ناکات،

هەتا لەبۆچی ڕۆژنامەکانی **پارتی** و **حشع** کەوتونەتە گیانی یەکترییەوە! بۆ و کەی هێزەکانی **پارتی** ئاوا نارەوا، شیوعییەکانیان ئازار داوە و قەتلوعامیان کردوون؟

بێگومان هەڵوەستەکردن لە ڕووی ئەو خاڵانەدا و پێداچونەوەی ئەو نووسینە، ئەوە دەهێنێ مرۆڤ زیاتر پێوەی خەریک بێت. هێنانەگۆڕێی ناکۆکیەکانی نێوان **حشع** و **پارتی**، هەروا بۆ یەک ڕۆژگاری دیاریکراو ، هیچ بوارێک تێر ناکات بە مەبەستی دەرس لێ وەرگرتن و دووبارە نەبوونەوە، لە کاروانی خەباتی کورداندا، کە هەمیشە بە بەرگ و ڕەنگی تازە چەندبارە بوەتەوە.

هەڵدانەوەی لاپەڕەکان، بەتایبەت بۆ یەکێکی وەک **نەوشیروان**، کە هەم مەدایەکی زۆر بەرپرسیارێتی لەناو دەسەڵاتی **کوردی** لە شاخ و شاردا هەبووە و هەم شارەزای ڕۆژگاری سەردەم و گۆڕانکارییەکانی جیهانە. مرۆڤێکی بە سەلیقەیە لە بواری ڕۆشنبیری و نووسین و خاوەن ئەزموونی ناخۆش و تاڵە لەگەڵ ڕووداوەکان. نەدەبوو وا بە ڕاگوزارانە بۆ مەبەستی نەیاری کۆنینە، بروسکە ئاسا ناویان بهێنێ و دوایی بۆ بەداوێوەکردن بەجێیان بهێڵێ! چونکە هەر خۆ لە قەرەدانی لەو باسوخواسە جەنجاڵەدا، چەشنێکە لە کەشوهەوای جورئەتی تاوتویکردنی بابەتەکە. ئەوە یەکێکە لەو مەسەلانەی خوازیاری بەسەرکردنەوەکی گشت لایەنانەی نوێی بەرڕەوتی ڕوداوەکانە، تاکو بەخێرایی نەخرێنە ژێرەوەی گوفەکدانی کوێرەوەرییە بێشومارەکانی خەڵکی کورد.

داردەی کوشتنی شیوعییەکان لە **کوردستانی باشووردا**، رابردوویەکی ناخۆشی پڕ ترادیژیاوی هەیە. هەر بۆ سەرەتای حەفتاکان ناگەڕێتەوە، بەڵکو مێژووەکەی بۆ ڕۆژانی بەرپابوونی ئەو بۆربۆرینە سیاسییە بێهودەیەی نێوان سەرانی **پارتی** و حشع دەگەڕێتەوە، کە لە یەکەم ڕۆژی دروستبوونی پارتییەوە سەری هەڵداوە و لەگەڵ هەڵگیرسانی خەباتی چەکداری کوردانیشەوە، کەوتوتە بارودۆخێکی ناهەموارتر و کارەساتی ناخۆشتری لێ کەوتوتەوە. بێگومان دەسیسە و دانەخۆرەکردنی تۆخمەکانی ئەو زەڵکاوە، لەلایەن دامودەزگا سیخورییەکانی ڕژێمە داگیرکارەکانی **کوردستان** ڕۆڵی زەقیان هەبووە. هەروەها بەدوای نەمانی سەرکردەیەکی وەک "**فەهد**"، سیاسەتی تەمومژاوی **حشع** بەرانبەر بە خەڵکی **کورد**. لەلایەک، بە مەبەستی لەقالبدانی خواستە نەتەوەییەکان، کردنی بە هاوڵاتییەکی **عیراقی** ئاسایی تابع و تا ڕادەیەکیش لەکەدارکردن و لەباربردنی ناسنامەی بزاڤی خەڵکی **کورد** و هەڵبەستنی دەیان تۆمەتی نابەجێ و زیندەبەچاڵکردنی بیرۆکەی کوردستانیبوون بوو، لەلایەکی تر، کلکایەتیکردنی بێ ئەملاوئەولای بەرژەوەندیی سیاسەتی هێزی دەرەکی بوو لەژێر چەتری خەیاڵاوی پێوەندی ئومەمی، کە هەمیشە نەوەک هەر سەروەرییەکانی خەڵکێکی ستەمدیدەی وەک **کورد** بەتەنیا، بەڵکو تێکۆشان و

قوربانییە بێشومارەکانی خودی "**حشع**" و تێکڕای چینی کرێکاری عیراقی بۆ کراوەتە بەراگێڕ و پێخۆری یارمەتیدەر بۆ ئەوەی زەمینە بۆ حیزبێکی خوێنڕێژی وەک حیزبی **بەعس** خۆش بێت، تاکو جڵەوی دەسەڵات بگرێتەوە دەست و کاردانەوەی هەڵچوون، وەڵامدانەوەی نامەسئولانەی سەرانی پارتی، جێگای بە هەر جۆرە بەخۆداچونەوەیەک، دیالۆگێکی لەیەکگەیشتن و یەکترقبوڵکردن گرتوتەوە. یەک دەسرازە گرێکوێرەی پڕ لە قوربانیی بێهودە، چواندنی بەخۆڕایی هەل و فرسەتی مێژوویی سوودمەند بە هەموو لایەک بەڕێکردوە، بەبێ ئەوەی سوود و دەرسی لێ وەربگیرێ.

لێرەدا بۆ بەرچاوڕوونی، ئاشنابوون بە بارودۆخی ڕۆژانی سەرەتای ساڵی ١٩٧٤ بە پێویستی دەزانم لە گەرمەی باسوخواسە سەرنجڕاکێشەرەکانی "**نەوشیروان**"ەوە، تۆمارێکی دیدی خۆمتان بۆ بگێڕمەوە کە لەوان ڕۆژدا بە پراکتیک خۆم لەناو جەرگەی ڕووداوەکان و لە دەفەری بەسەرهاتەکان وەک هاوڕێیەکی **کۆمەڵە**، پێشمەرگەیەکی ڕاگەیاندنی **شورشی ئەیلول** تەواجودم هەبوو.

سەرەتای بەهار و کۆتایی وەرزی زستانی **ساڵی ١٩٧٤**، وەرزێکی تابلێی بە باران و تەڕ بوو. دنیای سەوزایی و ژیانی ئومێدبەخش، دیمەنە دڵڕفێنەکانی سروشتی سەرتاپای وڵات، هیوا و ئاواتێکی پڕ بەروبۆمیان بەدەمەوە بوو. بەڵام سووربوونی دێوەجانەی شەڕاوی **بەعس** و پاشگەزبوونەوەیان لەو بەڵێنانەی بە سەرکردایەتیی ئەوێ ڕۆژێی **کورد** و شۆڕشیان دابوو و باش هەڵنەسەنگاندنی گەمەی سیاسەتی نێودەڵەتیی نێوان جەمسەرە نەیارەکان لە لایەن سەرانی کوردەوە، تەنیا مایەی هەڵگیرسانەوەی شەڕی کاولکاری کوردستانی لێ کەوتەوە. شەڕێک بوو لە نێوان ڕژێمێکی ڕەگەزپەرستی هەتا سەر ئێسقان دوژمن بە **کورد** و **کوردستان**. زۆرینەی خەڵکی **کورد** بە سەرکردایەتی **بارزانی**، شەڕ و بەیەکدادان سەرتاسەری **کوردستانی باشووری** تەنیبوەوە، تەڕو وشکی وڵاتی سووتاند، کە تێیدا هەموو ئاواتەکانی خەڵکی کوردی کردە خەون. ڕژێمی **بەعس** بەپێی ئەو ئەزموونەی پەیدایان کردبوو، لەسەر ئاستی دەرەوەدا بە پشتیوانی یەکێک لە زلهێزە هەرە گەورەکانی ئەو ڕۆژە؛ **سۆڤییەت** و بلۆکەکەی، سەرجەمی عەرەبەکان و **جیهانی ئیسلامی** ڕەسمی و نا ڕەسمی، هەر لە یەکەم ڕۆژەوە دەیانزانی ئاقاری ڕووداوەکان بەرەو کوێ دەچن، هەموو جۆرە ئامادە باشییەکیان بۆ هەر کتوپڕییەک هەبوو. حیزبی **بەعس** لەپاڵ ئەوەیشەوە لە بواری ناوەخۆدا و بە هەبوونی سوپایەکی تۆکمەی پڕ چەکی مودێرن و هاوپەیمانێتی "**حشع**" و یەک دەسرازە جاشی خۆماڵیی **کورد**، شەڕی بەرەیی بەسەر کورددا سەپاند. لەگەڵ دەستپێکردنی وەرزی بەهاردا دەیان بەرەی شەڕی کردەوە و بە هێرشێکی ئاسمانیی سەرتاسەری و شاڵاوێکی زەمینی، شەڕی لە هەموو بەرەکان

هەڵگیرساند. کەچی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد لە جیاتی ئەوەی لە پێشەوە خۆی بۆ هەموو هەڵگرتەکانی شەڕهەڵگیرسانەوە ئامادە بکات و وا بە ئاسانی نەچێتە ژێر بارگرانیی دەرچوونی بەکۆمەڵی خەڵکێکی زۆری شارەکان، ڕێگا بە کۆبەنەوەی بەرفراوانی ئەو خەڵکە نەدات لە دەور و بەرەکانی شەڕدا، پلانی سەرتاسەری موقاوەمەتکردنی پەلاماری ڕژێم دابڕێژێ و قورسایی شەڕی پارتیزانی بخاتە دەوروبەری شارە گەورەکانەوە، زۆر لاسارانە ملی دایە شەڕی بەرەیی لە ناوچە و بنکەکانی سەرکردایەتی شۆڕش کە بۆ جولانەوەی نەتەوەیەکی بێ پشت و پەنا، زۆرتر لە ئینتیحار دەچوو. چونکە سەرکردایەتی شۆڕش لەبری پشتبەستن بەو هەموو هێزە بەشەرییەی بەردەستی بۆ گواستنەوەی شەڕ و یاریکردن بە تاکتیکەکانی جەنگ، لە ڕێگای مەسئولە بەرزەکانەوە کەوتە بڵاوکردنەوەی تەسریحاتی ئاگراوی بێ بنجوبنەوان! بگرە تێکڕای قورسایی خۆیان یەکلایەنە بە گەمەیەکی نادیاری نێوان زلهێزەکانی دونیا و گەمەی سەوداکارانەی هێزی ڕژێمە داگیرکارەکانی کوردستانەوە تێکەڵ کرد. ڕاستە هێزەکانی ڕژێمی شای ئێران لە پشتەوەی بەرەکانی شەڕەوە، بە هەندێ ئیمکاناتی چەکی قورسی دژە ئاسمانی و جبەخانەی تۆپی دوورهاوێژی مەیدانەکانی سەر سنوورەکانەوە بوون، بەتایبەت لە دەوروبەری بنکەکانی سەرکردایەتی لە چۆمان و حاجی ئۆمەران و گەلالە، بەلام لە زۆربەی هەرەزۆری بەرەکانی شەڕدا، هێزی پێشمەرگەی کوردستان، دلێرانە ڕووبەڕووی بالادەستیی هێزەکانی ڕژێم ببونەوە و نەبەردییان دەخوڵقاند. بە جۆرێک لە درێژایی یەک ساڵی شەڕدا، ڕژێمی بەعس سەرباری ئەو هەموو بالادەستییەیش لە تەرازووی هێزدا، کەچی نەیتوانی موقاوەمەت خەفە بکات و دەنگی بەرانگژبوونەوە بخنکێنێ. بۆیە، وەک پێشەی گۆڕینەی سەوداکارییان، ناچار پەنایان بۆ گەمەیەکی پڕ شەرمەزاری ئامێزی سیناریۆیەکی ئامادەکراوی بەردەستی سەودای سیاسی زلهێزەکان برد و بە شێوەیەکی کاتی هەرەسیان بە خەباتی چواردەساڵەی کورد هێنا. لەو ڕۆژەدا حیزبی بەعس ئەگەر بەشێوەیەکی وەختیش بێت، بە ئامانجەکانی گەیشت. کە دیارە بواری تەفروتوناکردنی موقاوەمەتی کوردی بۆ ڕەخسا. لێرەدا نابێ ئەوەش فەرامۆش بکەین، کە سەرکردایەتی شۆڕش لە دەموساتی ئەو کارەساتەدا، بەپێی تێڕوانینی تایبەتی خۆیانەوە، بێگوێدانە دەنگی موقاوەمەتی خەڵک، جاڕی ئاشبەتاڵیان دا، بەو پاساوەی کە گوایە بە هۆی پاڵەپەستۆ و فشاری دەوڵەتی، بۆ ماوەیەکی کاتی دەست لە شۆڕش هەڵدەگرن و بۆ دەرفەت و زەمانێکی گونجاو، خۆ ئامادە دەکەن.

بەڵێ زانیارییەکانی نەوشیروان، لەو بوارەدا و سەبارەت بە تاوتوێکردنی سەرەداوی ڕووداوەکانی ئەوێ ڕۆژێ، بە ئاشکرا ڕووکەشی پێوەدیارە. کەش و هەوایەکی پڕ

تەمومژی کردوتە ڕەشماڵی مەبەستەکانی. چونکە هەم خۆی لە گۆڕەپانی ڕووداوەکان دوور بووە و هەم وەک خۆی گوتەنی "لە حیزبایەتی لاتەریک بووە" نیشانەکانیش بۆ ئەو پچڕ پچڕییەی هۆنینەوەی ڕەوتی ڕووداوەکان دەگەڕێتەوە، کە کەموزۆر خۆی بە هێنانەگۆڕێی شتێکی کۆنکریت، خەریک نەکردووە، بە تایبەتی لە بواری تێکۆشان و موقاوەمەتی ڕەوای کۆمەلانی خەڵک. مەنهەجی نووسینی سیاسیی نوێ، سەرجەم کونج و کەلەبەرەکانی کۆن و نوێ، لەبەر خاتری خاتران لەیەک دانابڕدرێ، بگرە وەک یەکەیەکی تەواوکەری یەکتری دەکرێنە هەوێنی داهاتوێکی خاوەن ئەزمونێکی دیراسەکراوی سودبەخش. شالاوی شیوعی کوژی یەکلایەنە وەک دیاردەیەکی نوێ تەنیا لەسەردەستی سەرکردایەتی بارزانی و شۆڕش لەوێ ڕۆژێدا ناوهێنراوە کە بە عەمەلی کەوتبوونە دووڕیانی بەلایەکداکەوتن لەبەردەم هەڕەشەکانی بەعس و حیزبی شیوعی کە بە ڕۆژی ڕوناک بەرەی ئەو ڕژێمەی هەڵبژاردبوو، شان بە شانی هێزی چەکداری ڕژێم لە دژی شۆڕشی کورد چەکی لە شان بوو. بۆیە هەرگیز ئۆباڵەکەی بە تەنیا بۆ سەرکردایەتی بارزانی ناگەڕێتەوە.

ئەگەر بارزانی ئەوێ ڕۆژان، شیوعییەکانی بە خاتری ئەمریکا تێرۆر کردبێ، کە زۆر گران بەسەر خۆیان و کورد کەوتووە و دوایی خۆشیان لێی پەشیمان بوونەتەوە. بەڵام پاش زیاتر لە دەیان ساڵی دیکە، هەمان ئەو حیزبی شیوعییە بەرەی بەعس و ڕژێم بە جێ دەهێڵێ و لە شاخەکانی کوردستانەوە، شانبەشانی هێزی پێشمەرگەی حیزبەکانی دیکەی شاخ، سەنگەری موقاوەمەت دەگرێ و قوربانی دەدا. کەچی هەمدیسانەوە لە سەرەتای ئایاری ١٩٨٣دا، کارەساتیان بەسەر هێنراوە. بەڵام ئەمجارەیان بۆخاتری ڕازیکردنی کێ..؟

هەر ئەمجۆرە شێوازەی شەنوکەوکردنی تەماوی ڕووداوەکان، خوێنەر دەخاتە بەردەم پرسیارکردنەوە؛ ئایا بەسەرکردنەوەی ڕەوتی ڕووداوەکانی مێژوو، بەتایبەت بۆ خەڵکێکی چەوساوەی وەک کورد، زۆرتر خوازیاری ئەوە نییە کە هەوڵدانەکان بۆ ساغکردنەوەی مێژوی کەلەکەبووی ئازارەکانمان، دەبێ لە هەمێزی ویژدانێکی زیندووی هەڵقولاوی خواستە نەتەوەییەکانمان، دڵسۆزییەکی بێ پەروای قوربانی بێشوماری خەڵکەوە لەنگەر بگری....؟ ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە خەڵکانی خاوەن ئەزموون، لە هەر جۆرە بەسەرکردنەوەیەکی لەم جۆرە، چیتر پەردە بەسەر گرێکوێرەکانی رابردوومان‌دا نەدەن و نووسین و یاداشتەکان تێکەڵ بە گەمەی سیاسی نەکەن..؟

**پێوەندییە دەرەکییەکانی حیزبی کوردی..**

**نەوشیروان** لە درێژەی باسوخواسەکانیدا نووسیویەتی:

> **(لەو ماوەیەدا پێوەندی سەرکردایەتی بارزانی لەگەڵ ئێران و ئەمریکا و ئیسرائیل و، پێوەندی سەرکردایەتی بەعس لەگەڵ سۆڤیەت بە هێز بو بو.)ل/١٩**

وەک ئەوەی **نەوشیروان** گەرەکی بێت، پێوەندی نێوان عیراق و سۆڤیەتی کۆن و گەشەکردنی ئەو پێوەندییە دەوڵەتییە، بکاتە پارسەنگی پێوەندی نارەسمیی ژێرەکی سەرکرادیەتی بارزانی بە ئێران و ئەمریکا و ئیسرائیلەوە! ئەگەر **بارزانی** پێوەندییەکانی ئەوەندە بەو وڵاتانەوە بەرەو پێش نەبردایە![34] ئەوە پێوەندییەکانی **بەعس** لەگەڵ سۆڤیەت بەهێز نەدەبوو! هەروەک **نەوشیروان** مەبەستیەتی، دەبێ خەڵکی **کورد** هێشتا بەو راستییە نەزانن کە پێوەندی نێوان دەوڵەتان بۆ چەندان پرۆتۆکۆڵ و پەیماننامەی ئیمزاکراوی دەوڵەتی دیاریکراو نەگەڕێتەوە! کە هەرگیز لەگەڵ ئەو پێوەندییەی لە پەنا دیواران لەلایەن سەرکردایەتی جولانەوەیەک بە دەزگا سیخورییەکانی دەوڵەتێکەوە بارتەقا نابێتەوە، کە ناوبراو خۆی لێ بێدەنگ کردووە.

> **(رژیمی بەعس گرنگی مەسەلەی کوردو گەورەیی مەترسی ئەم جولانەوەیەی بو سەرخاکی عیراق و پاشەروژی ئەزانی و ئەیزانی چ قورساییەکی عەسکەری، ئابوری، سیاسی لەسەر دروست کردوە)ل/١٩**

لێرەیشدا جەوهەری ئەو میتۆدەمان بۆ دەردەکەوێ کە نووسەر لە هەر کوێیەک کەوتبێتە ناو باسوخواسی هەڵگیرسانەوەی شەڕی **بەعس** لەگەڵ کورددا، یەکلایەنە هەوڵی داوە هەر روو بکاتە بەڵگە و قسە و قسەلۆکەکانی **بەعس** بۆ سووچدارکردنی **بارزانی!** وەک ئەوەی ئەو شۆڕش و بەرخۆدانە بەسەرکردایەتی **بارزانی،** لە هەر سیمایەکی عادیلانە داکەلابێت، لە هەموو هیوا و خۆزگەیەکی **کورد** داماڵرابێت! دیسانەوە نووسینی بابەتییانە، ئەو نووسینەیە کە باوەشی بە هەموو جەمسەرە پێوەندیدارەکانەوە کردبێتەوە. ئەگەر نەوشیروان کوردیش نەبوایە، دەبوو بیانوو و پاساوەکانی سەرکردایەتی کوردیش لەو زەماندا بەسەر بکاتەوە و تەنیا لەسەر زمانی بەعس پاشۆل لە رووداوەکان نەگرێ.

ساغبوونەوەی رەوتی رووداوەکانی بەسەرچوو، ئەمڕۆکە بەرانبەر بە دەرکەوتە بەرچاوەکان ملکەچن و لە لای مرۆڤی ویژدان زیندوو، لاساری لەگەڵناکرێ. هەتا ئەگەر

---

[34] کە لە راستیدا پێوەندیی ئاشکرای لەم جۆرە لە نێوان ئەمریکا و ئیسرائیل بە کورد و "بارزانی"ەوە نەبوە. ئەوەی هەشبوە زۆرتر شتێکی پەراوێزی، بە پەنادزەکیی کز و نزم بوە، هەتا ئێستاش دیکومێنتێکی خاوەن سەرچاوەی رەسمی لە هەر ئاست و لایەکەوە بێت، بەرچاو نەکەوتوە.

بەسەر بیروبۆچوونی خۆی و هاوبیرەکانیشی دابشکێتەوە. مێژوو دەریخست مەسەلەی کورد لە رەوتی رابردوویدا، هەرگیز مەترسی نەبووە بۆ سەر خاکی عیراق، بەڵکو هەمیشە بەعس و هاوکوفەکانی مەترسی و هەڕەشەی هەرە گەورە بوونە بۆ سەر کورد و ناسنامەی نەتەوەیی. چونکە لە هیچ زەمان و بوارێکی شۆڕشی ئەیلولدا، بانگاشەی جیابوونەوەی **کورد** لە عیراق و دروستکردنی دەوڵەتی سەربەخۆ بەسەر زمانی هیچ یەکێک لە سەرانی حیزبی کوردی لەوێ رۆژاندا، گوزەری نەکردووە و بگرە تێکڕای ئەو هێزە سیاسیانەی **کورد** زیاتر **عیراقی** بوونە. بەردەوام کوردستانی باشووریان بە بەشێک لە "شیمالی عیراق" زانیوە. هەر بۆ بەڵگەش بارزانی لە دەمی هەڵگیرسانی شەڕی نێوان **عارەبان** و **ئیسرائیل**، لەساڵی ١٩٦٧دا، بۆ نیازپاکیی **کورد** وەک **عیراقییەک**، یەکلایەنە جاڕی شەڕراگرتنی دا، بۆ ئەوەی وەک عیراقییەک پشتگیری لە عارەبان بکرێ لە دژی ئیسرائیلدا. لە راستیدا شۆڕشی کورد و جووڵانەوە ئازادیخوازەکەی بە تەنیا لەسەر دەسەڵات و بەرژەوەندی تاکڕەوی دیکتاتۆرییانەی بەعس مەترسی هەبوو، نەوەک لەسەر خاکی عیراقدا!

بێگومان ئەو باسکردنەی قسە و قسەلۆکەکانی **بەعس**، لە شانی مەبەستی تایبەتی خۆیەوە، نیشانەیەکی دیکەی خواست و خۆزگەی ناو دڵ و دەروونی سەرانی حیزبی کوردیی لە خەمی عیراقیبوون، کە ناتوانن خۆیانی لێ دەرباز بکەن. پاشتر و هەر لەو لاپەرەیەدا، **نەوشیروان** خاڵێکی زۆر بەرچاوی لە خامۆشییەکانی سیاسەتی سەرکردایەتی بارزانی لە شۆڕشی ئەیلولدا دەستنیشان کردووە، کە ئەویش بریتییە لەوەی: سەرانی ئەو دەم یەکلایەنە بوونەتە کارتی گەمەی نێوان دوو رژێمی داگیرکاری **کوردستان** (ئێران و عیراق) و ئەو رژێمانەش وەک داشی دامە بۆ بەرژەوەندییەکانی خۆیان یارییان بە کارتی **کورد** کردووە. بەڵام لێرەوەش ئۆباڵەکەی بەتەنیا بۆ ئەو سەرکردایەتییە ناگەڕێتەوە. من دڵنیام سەرکردایەتی بارزانی لەودەمدا، لەو بەشداریکردنە ئاگادار بووە، بەو ئاواتەی لەو گەمەیەدا بەبێ ئەوەی لە بەرچاوی بگرن کە هەمیشە لایەنی پەراوێز و بێهێز لەو جۆرە گەمەیە دۆڕاوی سەرەکین، دەسکەگوڵێ سەرکەوتن بۆخۆیان بەدەست بهێنن! بەڵام کە لەو سەرەوە بە دۆڕاوی دەرهاتوون، وەنەبێت هەر بۆ لاوازی یەکلایەنەی ئەوان گەڕابێتەوە، بگرە هەم بۆ چۆنیەتی دەستپێکردنی سەرەتاکانی گەمەکە و قورسایی **کورد**، هەم بۆ باوەڕنەبوون بە کوردستانیبوونێکی سەربەخۆ، فاکتەری دیکەی ناوەکی و دەرەکی بەند بووە. بەڵام ئەو ئەزموونە تاڵە هەر بەتەنیا وەک یەکێک لە خامۆشییەکانی شۆڕشی ئەیلول، سەرکردایەتی **بارزانی**، لەوێ دەمدا کۆتایی پێ نەهاتووە و دەرسی لێ

وەرنەگیراوە، بەڵکو دواتر وەک بنیشتەخۆشەی ژێر ددانی سەرکردەی حیزبەکانی کورد، بەبێ گوێدانە قوربانییەکانی خەڵک لە تێکڕای کوردستان دووپات کراوەتەوە.

**هەڵدانەوەی قەتماخەی برینەکان...**

**نەوشیروان** کە مرۆڤێکی سیاسەتمەداری خاوەن رابردوویەکی درێژخایەنی پڕ لە خەباتی شاخ، حیزبایەتی، رۆژنامەگەری و دونیادیتەی زمانزانە، لەو زنجیرە نووسینەی یاداشتەکانیدا، بوارێکی گونجاوی پڕبەپێستی لە بەردەستدا بوو، ئەگەر بەگیانێکی پشودرێژانەتری نوێ، بەری لە رەوسەی تژی لە زیوان بگرتایە و رچەشکێن و بەرچاوڕوونانە تاوتوێی مەسەلەکانی بکردایە و شێوازێکی نوێی دوور لە کۆنە رق و حەزی شەخسی دادەهێنا. بەمەیش کەشوهەوای دڵخۆشکەری بە بەرۆکی کوردایەتی شاباش دەکرد و سەرمەشقێکی تازەی بۆ سارێژبوونی برینەکانی کورد دەکردە سەرمایەی کتێبەکانی. نەوەک هەر وا لە پێشەوە، یەکلایەنە تای تەرازوی لایەنی کوردی لەبەرانبەر دوژمنان لەنگ بکات، چونکە خواستە هەنووکەییەکانی نەتەوەکەمان لە هەموو رۆژێک زیاتر، ئەمرۆکە پێویستی بە هەڵهاتنی ئاسۆیەکی نوێی تۆژینەوەی بەردەستی خەڵکە دەستسووتاو و بەئەزموونەکانە. بۆ ئەوەی خاڵە پڕ تەمومژاوییەکانی دیرۆکی ناکۆکی و ناتەبایی نەپساوەی نێو ماڵی کورد بە کەناری ساغبوونەوە، بە ئەنجام بگات. هەر وەک "**ئارام**"ی نەمر هەموو جارێک دووپاتی دەکردەوە، ماڵی بارزانی و هیچ لایەنێکی ناکۆکی نێو ماڵی کوردی، بە تاوانبارکردنی یەکلایەنە و یەکتر سڕینەوەی سەرکاغەز، کۆتاییان نایەت.

(حیزبی بەعس لە ئیمزاکردنی بەیانی ئازاری ۱۹۷۰ لەگەڵ بارزانی ئومیدی وا بو کە کارتی کوردی لەدەس شا دەربهێنی و، بەقازانجی خوی بەکاری بهێنی. بەلام هەولدانی شا لەگەل بارزانی بو ئەوەی پەشیمانی بکاتەوە لە ریکەوتن لەگەل بەعس و، پیلانگیری بەعس دژی بارزانی و، بزوتنەوەی کورد، هەروەها بی بروایی بارزانی بە بەعس و نەویستنی ریکەوتن لەگەل بەعس، ئەو ئومیدەی بەعسی نەهینایەدی و کارتی کوردی بە موافەقەتی سەرکردایەتی بزوتنەوەی کورد لەدەست شادا مایەوە.)ل/۱۹

بێگومان هەر مرۆڤێکی کوردپەروەری بەژیان زیندووی ئەوێ رۆژێ، بەو راستییە حاشاهەڵنەگرە ناسیارە، کە حیزبی بەعس، هەر لە بنج و بنەوانەوە بای کلۆجێک باوەڕی بە چارەسەرکردنی کێشەی کورد لە عیراقدا نەبووە، کە لە بەرژەوەندی کورد بێت. هەر لە هاتنە سەرلەنوێی سەر دەسەلاتیشەوە، بە هەمان هەناسەی یەکەم ئەزموونیانەوە، بە ئاگر و ئاسن کەوتوونەتە وێزەی کورد و هەڵتەکاندنی گیانی موقاوەمەتی. بەلام سەرباری

ئەوەی کە رەوتی "م.س" جیا بووەوە و بە چەک و پێشمەرگەکانیانەوە لە شانی هێزەکانی رژێمەوە بوون و بە قازانجی پلانی بەعس، لە شالاوی تەفروتوناکردنی سەرکردایەتی بارزانی، نەوەک هەر شکستی هێنا و بەس، بەڵکو چەقی دەسەلاتی بەعسیش کەوتە ژێر مەترسی لەناوچوون و هەڵوەشانەوە. بەعس بەو ئەزموونەی لە پاشۆڵیاندا بوو، زیرەکانە کەوتنە مانۆڕێکی مەکرۆیانە، بۆ رزگارکردنی خۆیان لە کەوتن و لەدەستنەدانی دەسەلاتی خوێناوییان. ئەوە بوو بەناچاری و دوور لە هەر جۆرە نیازێکی راستگۆیانە، بە تاکتیکێکی جەهەنەمی بەیانی ١١ی ئازاریان لەگەڵ سەرکردایەتی بارزانی جاڕدا. کە زۆرتر بە مەبەستی درێژەپێدانی ئەو شەڕە ناوخۆییەی کورد بوو، کە لە شاخەکانەوە بۆ هەموو قوژبنێکی کوردستان پەنگیداتەوە. کەچی نەوشیروان وەک ئەوەی بەعس نەناسێ، هەر لە دوورەوە وەک چاودێرێک دەڕوانێتە رووداوەکان، "بەعس"یش لە شانێ بارزانی، کورد دەخاتە سەری دووەمی کارەساتەکان و دەستەواژەی (بێ بڕوایی بارزانی بە بەعس و نەویستنی ریکەوتن لەگەڵ بەعس) دەکاتە پارسەنگی بیانووەکانی رژێم!

بە دڵنیاییەوە، بەسەرکردنەوەی حەقیقەتی فاکتەرەکانی ئەو رۆژە، هەر لە دەرچواندنی بەیانی ئازار و هەڵوێستی جوامێرانەی **مستەفا بارزانی** و **مام جەلال** بۆ بەرگرتن لە تەشەنەکردنی ئەو شەڕە ناوخۆییەی، کە هەتا رۆژانی پێش جاڕدانی بەیانەکە گەرم بووە. یەکەم وەلامدانەوەی کوردانەی دژ بە ئاواتە چەپەڵەکانی بەعس بوو، کە هەرگیز لە هەگبەی حەز و خۆزگەکانیانەوە نەبوو. لەپاڵ چەندان فاکتای دیکەوە، دەبنە پشت و پەنای راستیی تۆمارکردنی بە ئەمانەتی مێژوویی. ئەگەر نەوشیروان لە گێڕانەوەی رابردوو، مەبەستی ئەوە بوو بێت کە راستگۆیانە بە هەمان نۆرمی بیرکردنەوەی ئەوێ رۆژێ، بەسەرهاتەکان شەنوکەو بکات، دەبوو لە ئەنجامگیری ئەو مێژووە، وەک لە مەیدانی عەمەلیدا دەرکەوتوون، دەستپێشکەری خۆی تۆمار بکردایە. هەر بۆ نموونەیش، پشتکردنە باسکردنی سیاسەتی پاکتاوکردن و کۆمەڵکوژیی رژێمی بەعس، غەدرکردنێکی گەورەیە لە مێژووی خەڵکی کورد و گومان پەیدابوونە لە بەردەوامبوونی خەباتی کوردایەتی و رەوایەتی ئەو تێکۆشانە! چونکە ئەوە هەر بارزانی و عەشیرەتەکەی نەبوون، بەتەنیا تووشی هەڕەشەی لەناوچوونی بەردەستی بەعس ببوونەوە، بەڵکو تێکڕای سەروەرییەکانی کورد کەتبوونە بەرشالاوی قڕکردن و پلانی رەشکردنەوە. هێنانەوەی پەیڤەکانی دیکتاتۆرێکی وەک سەددام بە (صدقت)، قڕقەپ کردن لە بەرانبەر گوتەکانی سەرانی کورد، مایەی گومانە بە تەوێڵی پێرمی سەرکردە جۆربەجۆرەکانی کوردەوە.

(ئیران دەسکەلای گوشاری کوردی – عیراقی بە دەستەوە بو. کە نەک هەر گوشاریکی توند بو لە سەر ژیانی ئابوری، سیاسی، کومەلایەتی.. بەلکو هەرەشەیەکی راستەقینە بو لە دەسەلاتی بەعس و یەکیتی ئەرزی عیراق و ئاسایشی نەتەوەی عەرەب.)ل/٢٣

لەبەر رۆشنایی ئەم وشانەوە، نەوشیروان راشکاوانە پەردەی لەسەر باوەڕی تەواوی خۆی هەڵداوەتەوە، ئەگەر بە هەر جۆرە کاردانەوەیەکیش بێت، پێمان دەڵێ، عیراقیبوونەکەی چەند مەلیکانەیە، تا ئەوپەڕی پەرۆشی، نەوەک هەر بۆ یەکێتیی خاکی عیراقی بەردەستی بەعس، بگرە بەلای ئەوەوە عیراق بەشێکە لە خاکی عارەب و نیگەرانی هەر هەڕەشەکردنێکیشە بۆسەر (ئاسایشی نەتەوەی عەرەب)!

لەبەر رۆشنایی ئەو جۆرە تێڕوانینەوە، کە مایەی پرسیاردانانە لەسەر جۆری رەوایی دۆزی کورد لە چوارچێوەی عیراقێکی دەستکرددا! بێ هەر جۆرە گرونديكی مێژوویی، دەگەینە سەرەداوی ئەوەی بڵێین، ئەگەر سەرانی حیزبی **کورد** ئەوەندە بە مەزەندەکانی "**بەعسی**"یان موعجیب بوون، بۆ هەر لە سەرەتاوە بە چاولێکەری حیزبی شیوعی و چەپەتوندڕەوەکان، خۆیان لە حیزبێکی "پان عیراقی" خۆیان دانەدەمەزراند! تاکو بە پاراستنی سەروەرییە خوێناوییەکانی عیراق، ئالای شەکاوەی ئومەی عارەبی بەسەر هەموو لایەک بشەکایەوە..! هۆنینەوەی ئەو ریسەی نەوشیروان خۆی پێوە خەریک کردووە، بۆ کاردانەوە و کەوتنەژێر کاریگەری ئەو تەونە دەگەڕێتەوە، کە لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتی عیراقی و هزری عیراقیبوون و برایەتی بەزۆری یەکلایەنەی **کورد** بە **عارەب**! خەمی بنەڕەتی ئەو قوتابخانەیە بووە و بەردەوام خەڵکی **کوردی** پێ سەرخۆش کراوە. بەلام بە پراکتیک خەون و خەمێکی سەقەت و بێهودە بووە، کە سەراوژوور پێچەوانەی هزری هەر جۆرە کوردستانیبوونێکی لەبار بردوە. لە خوێندنەوەی مێژووی نزیکی کاروانی خەباتی کورداندا، ئاوڕدانەوە بەلای خاڵە گەش و خاڵە خامۆشەکان بەیەکەوە جەوهەری تێڕوانینی بابەتییانە پێک دەهێنن لە پێناوی شرۆڤەکردنی ئەنجامەکان، لەپێناوی زامنکردنی وەرچەرخانێکی نوێی بەر ڕەوسەی ئەزموونەکان و هەڵهاتنی ئاسۆیەکی گەش لە بەردەم نەوەکانی داهاتوو. راستە مەلا مستەفای بارزانی وەک سەرکردەیەکی بێهاوتا لە زەمان و زەمینی خۆیدا، دەرکەوتێکی مێژوویی بووە، کە لەپاڵ سەروەریی و لایەنە گەشەکانی تەمەنی خەباتکردنیدا، ئەو ئەزموونە، لایەنی تاریکیشی هەبووە و بێ خەوش و لە خامۆشی بەدەر نەبووە. بەلام لەبیرچوونی ئەوەی بارزانی بە چاک و خراپەکانییەوە، بۆ مەودایەکی درێژخایەن، خاوەن مێژوویەکی نەپساوەی پڕ لە ئەزموون بووە، بەردەوام کاریگەری و کاردانەوەی بەسەر هەست و نەستی کۆمەڵانی خەڵکی کوردەوە هەبووە. بە جۆرێک رەگ و ڕیشەی خۆی داکوتا بوو، کە هەتا ئێستاش

پارتی و نەوەکانی سوودی لێ وەردەگرن. بۆیە بەتەنیا ڕەتکردنەوەی ئەو مێژووە و یەکسەرە قەرزاربارکردنی، غەدرکردنە لە کاروانی قوربانییەکان و بەلاوەنانی دەرسوەرگرتنە لە تاڵ و شیرینی ئەو ئەزموونەوە.

**دیاردەی ئاشبەتاڵ، لە مێژووی کۆن و نوێدا..**

دیاردەی ئاشبەتاڵ لە مێژوی کۆن و نوێی خەباتی نەتەوەی **کورد** بەگشتی و بزاڤی حیزبایەتی بە تایبەتی، سەرەتایەکەی، تەنیا بۆ هەرەسهێنانی شۆڕشی ئەیلول و سەرکردایەتی **بارزانی** ناگەڕێتەوە، بەڵکو ئەو دیاردەیە هەمیشە لە ئەنجامی فشاری هێز و دەسیسەوە کراوەتە گەروی هەر جۆرە هەوڵدان و خەباتێکی نزیکبووەوە لە سەرکەوتنی **کوردان**. کە لێرە و لەوێ خەباتی کورد دەقی پێوە گرتووە و لە سەرتاپای **کوردستان** دووپات بووەتەوە، چ بەتۆبزی، چ بە خوایشی **کورد** خۆیەوە. زنجیرەیەک ئاشبەتاڵ ئەنجامی ئەو ئەزموونانە بووە. بەڵام لەدەمی ئەو هەرەسهێنانە مەرگەساتەی شۆڕشی چوارده ساڵەی ئەیلولدا، تەوژمی بانگاشە و بیروبۆچونەکان لەبەرانبەردا، زۆرتر زەقو بەرچاو بووە. بە جۆرێک وەک ئەوەی زاراوەی ئاشبەتاڵ بۆ یەکەمجار خوڵقابێت و کرابێتە بەر جەستەی ئەو هەرەسهێنانەوە.

ئاشبەتاڵ بەتەنیا لەگەڵ کۆتایی پێهێنانی شۆڕشی ئەیلول نەڕسکاوە، بگرە بۆ ئەزموونی فەشەل و خامۆشییە زۆروزەبەندەکانی سەرانی حیزبی سیاسیی کورد لە پێشەوە .و هەرەسی بەرخۆدانی خەڵکی کورد بەگشتی دەقی گرتوە. لێرەوەیش دەبوو نەوشیروان ڕچەشکێن و ڕاشکاوانە چۆنیەتی ئەزموونی ئاشبەتاڵی لە دیرۆکی بزاڤی تێکڕای کورد پشتگوێ نەخستایە و دەستپێشکەرانە ئەسپی مەبەستەکانی خۆی لە باسکردن و پێداچونەوەیەکی ڕەخنەگرانەی ئاشبەتاڵی ١٩٧٥دا، تاو بدایە. تاکو پەیڤەکان لە قاوغی مەبەستی شاراوە دەربچوونایە و گومانەکانی بڕەوەندایەوە. لە پێناوی زەمینەخۆشکردن بۆ خوڵقاندنی کەشوهەوای دیالۆگێکی تێروتەسەل لە تاووتوێکردنی بەشێکی برینەکانی جەستەی کورد و ئامانجی گەشەسەندنی سروشتی بزاڤی کوردایەتی. کەچی شێوازی لەبیرچواندنی خامۆشییەکان و شاباشکردنیان، بوەتە مەبەستی کاڵکردنەوەی ئەو بزاڤە.

هەر لە ڕوانگەی ئەو نووسینانەی "نەوشیروان"ەوە، سەبارەت بە شۆڕشی ئەیلول و سەرکردایەتییەکەیەوە، نووسەر بای سەرەداوێک ئاوڕ بە لای دۆزی کۆمەڵانی خەڵک و ڕۆڵیان لە چاک و خراپی ئەنجامەکان ناداتەوە. چونکە هەر ئەنجامگیرییەک لە دیاردەی

کەسایەتی سەرکردایەتی مستەفا بارزانی، بەبێ ناسین و قووڵبوونەوە لە بارودۆخی کۆمەڵی کوردی لەوێ رۆژگاردا، شتێکی نوقسان و یەکلایەنەی رووت و قوت دەردەچی.

**لووتبەرزیی سەرانی کورد بەرانبەر خەڵکی کورد ...**

**(مەلا مستافا لە ئاستی هاوولاتی کوردا، خوی چەند بە زل ئەزانی و دلرەق و بی بەزەیی و زوردار بو، کەچی لە ئاستی بیگانەدا، خوی چەند بە بچوک و خزمەتکار و ملکەچ دا ئەنا.)ل/٣٩**

نەوشیروان بە جورئەتانە، بەڵام لە بەرگی تەنیا "بارزانی"دا، باس لەسوخەتێکی بەرچاوی بەشێکی زۆری سەرانی کورد دەکات. ئەو سوخەتەی هەر لە کۆنەوە بەشێکی زۆری سەرانی حیزبی کورد فرچکیان پێوە گرتووە، رەگ و ریشەی دیرۆکیی خۆی بەناو هەناوی سیاسەتمەدارە دەسەڵاتدارەکانییەوە داکوتاوە. من یەک بە خۆم بە وردی بەوە ناسیارنیم کە مستەفا بارزانی تا چەند لەگەڵ ئەو وەسفەی سەرەوە یەک هاتوتەوە. بەڵام کە بەندە ئاوڕ لەساڵی ١٩٧٤ی پێشمەرگەبوونی خۆم دەدەمەوە، ئەو رۆژانەم بیردەکەوێتەوە کە بە رێکەوت دووجاران لەسەر جادەی ناو شارۆچکەی چۆماندا، دیومە بارزانی مستەفا بە سواری تاکە یەک جێبی لاندرۆڤەر، بە بەردەمی هاتوچۆکەرانی سەر جادەکە بە رۆژی رووناک تێپەڕیوە، بەبێ ئەوەی چ لە پێشەوە و چ لە پاشەوە، هیچ جۆرە حیمایەیەکی چەکداری بە دەوروبەرەوە بێت، یاخود دەسرازەیەکی سەیارەی پڕ پێشمەرگەی لە بێش و دواوە ریز بوبێت، یاخود پێشمەرگەی چەکدار لەوبەر و ئەمبەری رێگای تێپەڕینی دەست بەتفەنگەوە وەستابن! کە وابزانم هیچ سەرکردەیەکی کورد ئەوەندەی مستەفا بارزانی مەترسی پەلاماردانی دوژمنانی کوردی بەسەرەوە نەبووە. دەبوو وەک ئەو دیاردە ناشیرینەی هەنووکە، لەناو یەک لەشکری چەکداری ئەم بەر و ئەوبەری جادەکان خۆی گەمارۆ بدات، تاکو بەزلزانینی خۆی بۆ خەڵکەکە دەربخات!؟ لەپاڵ ئەوەدا، وەک رووداوەکانیش دەیگێڕنەوە، مستەفا بارزانی لە بەرخوردێکی ئەوێ رۆژیی خۆیدا بەرانبەر دیکتاتۆرێکی وەک سەددام، نموونەیەکی تاک وتەرای ئەو سەرکردانەی حیزبی کوردییە کە لە مێژوی نوێی نەتەوەکەمان بەپڕشنگداری تۆمارکراوە.

لە زەمان و زەمینی ئیمزاکردنی رێکەوتننامەی ئازاردا، سەددام حوسێن بە پێی خۆی چوەتە دیداری "بارزانی"یەوە. دیارە بارزانی مستەفا بە کاتی گەیشتنی سەددام ئاگادار بووە، بەڵام چونکە لە ئاست دووژمنێکی وەک سەددام خۆی لە کێو بە بڵندتر زانیوە، لە پێش دەمی گەیشتنی ناوبراودا، خۆی بە چونە کوێستانەکانی دەوروبەر خەریک کردووە، بۆ پاش گەیشتنی سەددام گەڕاوەتەوە. ناچار سەددام خۆی بۆ پێشوازیکردنی بارزانی هاتووتە دەرەوە.

کەچی سەرانی بەرەی کوردستان لە کەشوهەوای راپەڕینی کۆمەلانی خەلکی کوردستاندا، کە چوونە بەر عەرشی "سەددام"ی بگروبکوژی کورد، هەیانبوو بە تامەزرۆیی ئەو تاوەی دیداریان لەگەڵ سەددام بە ئاسودەترین تاوی ژیانی خۆیان دەربڕی. گریمان ئەو شتانەی نەوشیروان لەسەر زاری د. محمود عوسمان دەیگێڕتەوە، کە بارزانی لەدەمی باسوخواسەکانی رێکەوتننامەکەی جەزاییردا، لە دیداری لەگەڵ "شای ئیران"دا، لاواز و دەست لەسەرچۆکان بووە!

رومەتی خەوشیکی ئانوساتێکی هێجگار نالەباربوە، دەبوایە بارزانی بە شێوەیەکی دیکە بجولایەوە!

بەلام هەر سەبارەت بەو سەربردانەوە ،جێگای خۆیەتی خوێنەر ئاوڕ بەلای ئەو نووسینەی پشکۆ نەجمەدین بداتەوە، کە لەسەر کۆمەلە و ئەو کتێبەی "نەوشیروان" نووسیوە. ئەویش بەرخوردی بارزانی لەو دیدارەی لەگەڵ "شای ئیران"دا دەگێڕتەوە. لێرەدا بەپێویستی دەزانم سەربردەیەکی مەیدانیی جوتیارێکی کوردستانتان بۆ بگێڕمەوە.

**"مام رەحمان"**، یادی بەخێر، خۆی خەلکی گوندێکی **کەندێناوەی** ناوچەی **هەولێر** بوو. بە هۆی پێشمەرگەبوونی دوو کوڕییەوە، بەناچاری کەوتبوە ئەو گەڕەکە هەژارنشینە لاچەپەی ناو شاری **هەولێرەوە**، کە لەگەڵ مالی باوکی من دراوسێ بوون. لە رۆژانی موفاوەزاتەکەی "ی.ن.ک" لەگەڵ "بەعس"دا، من تازە لە نەخۆشخانە بەدوای بریندابوونەکەمەوە دەرچوبوم و بۆ حەسانەوە لە مالی باوکم بووم. فەرویدوون عەبدولقادر و مەلا بەختیار بە هاوڕێتی سلاح موهتەدی و "مەلا عومەری عەسری" هاتبوونە سەردانم لە مالەوە. کاتەکە ئێوارە بوو، هەموو لە حەوشەکەدا دانیشتبوون، "مام رەحمان"یش لە تێڕادیتنەوە بە دوای هەندێ گوێگرتنەوە، فرسەتی هێنا و رووی پرسیاری لە **مەلا بەختیارکرد**: ئەرێ کاک مەلا، ئەوە ئێوە کە هەمووتان لە **"ی.ن.ک"**دا خوێندەوار و خاوەن شەهادەی بەرز بەرزن، هەموو ئاوقات و زمانزانن، بۆ ئاوا رێگای بەغداتان کردوتە رێچکەی میزی حوشترێ! بۆ چونە لای حکومەتی سەددام و "مەلا مستەفا"یشتان بە نەخوێندەوار و نەزان دەزانی! و تاقە یەکجاریش لە شاخ بۆ لای حکومەتی عیراق دانەبەزی، ناچار ئەو "سەددامە" بە پێی خۆی هاوێشتە کنی..؟ لێرەدا مەلا بەختیار بە پێکەنینەوە وەلامەکەی بۆ فەرەیدوون گێڕایەوە، کە ئەو کاتە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی "ی.ن.ک" بوو.

بێگومان گێڕانەوەی ئەو شتانە بۆ ئەوە نییە، ئێمەیش یەکلایەنە پاکانە بۆ رەفتاری ناشیرینی فلانە سەرکردە و بە شانوبالی رەفتاربەرزی فلانی دیکە بکەین، بەلکو گەرەکمە لەو پێناوەدا، رەفتاری جوامێرانەی چەندان سەرکردەی وەک "ئارام" و دەیان سەربازی

نەناسراوی کورد لە کاروانی شۆڕش و خەباتکردندا، بەرانبەر بە ڕۆڵەکانی کورد خەرمانێکە، بە کەس ناشاردرێتەوە.

ڕاستە خودی "نەوشیروان"یش لە پراکتیکی ڕۆژانەی خۆیدا لە ڕۆژانی شاخدا، بەتایبەت ئەو کات و ساتانەی من لە نزیکەوە دەمدیت، سادە و خاکی بوو و هیچ ژەمێکی خواردنی لەگەڵ پێشمەرگە جیاواز نەبوو. هەتا لە خانووبەرەکردن بۆ بارەگای خۆی و پێشمەرگەکان، هەمیشە دەست بە کار بووە. لە جەولەکردن بۆ ناوچەکانی خوارەوە، تێپەڕین بە شاخ و دۆڵ و هەوراز و نشێواندا وەک پێشمەرگەیەک بە پێ ڕۆیشتوە و ماندوو بووە. بەڵام بۆ مەسەلەی ڕەفتاری لەبەرانبەر خەڵکی کورد و دووژمنان دوو نموونە دەگێڕمەوە:

سەرەتای هەشتاکان بوو، نەوشیروان جێگری سکرتێری "ی.ن.ک" بوو. بنکە و بارەگای سەرکردایەتی لە "خڕێی ناوزەنگ"ی سەر سنووری دوو پارچەی کوردستان بوو. شەهیدی نەمر کەریم ڕەسول، کە بەر لە گرتنەکەی لەلایەن دەزگا سیخورییەکانی "ڕژێمی بەعس"ەوە، یەکێک بوو لەو هاوڕێ بەدەگمەنانەی کۆمەڵە، لەناو شاری هەولێردا. لە ساڵانی ١٩٧٥ ـەوە، لە شانی هاوڕێیەکانی دیکە، ڕۆڵی جوامێرانەی هەبوو لە سەرلەنوێ کەوتنەوە سەرپێیانی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە و یەکێتی لەو شارەدا. لە هاوینی ساڵی ١٩٨٠ کەوتوتە داوی دەسیسەی نۆکەرێکی ڕژێم و گیراوە. "مامۆستا محەمەد"ی برای لە سەرەتای پاییزی ساڵی ١٩٨٠ دا بە نهێنی خۆی گەیاندە سەرکردایەتی لە "ناوزەنگ"، بە مەبەستی بینینی سەرکردەکان، تاکو لە نزیکەوە ئەو پێشنیازەی پیاوەکانی ڕژێم بخاتە بەردەمیان، بۆ ئاڵوگۆڕکردنی لەگەڵ چەند پیاوێکی دیلی ڕژێم. بەو هیوایەی کەریم ڕەسول لە مەرگ ڕزگاری بێت. ئەو ڕۆژە نەوشیروان خەریکی کرێکاری بوو، لە دروستکردنی خانوو بۆ زستانە. مەودایەک چاوەڕوانمان کرد، تاکو دەستی بە تاڵ بوو، بەدوای ناساندنی مامۆستا محەمەد و مەبەستی سەردانەکەی لەلایەن بەندەوە، نەوشیروان بەخێرهێنانێکی ساردی ناوبراوی کرد و نەیهێنا و نەیبرد بەو جۆرە وەڵامی دایەوە: ئێوە خەڵکی هەولێر هەمیشە بۆ ئێمە خواستتان زیاتر بووە لە ئەرک، برایەکانت (ئەو دەمە دوو برای تری پێشمەرگە بوون) بەرەوە و ڕزگارمان بکەن!

لە دەمی موفاوەزاتەکەی "ی.ن.ک" لەگەڵ "ڕژێمی بەعس"دا، بەندەیش لە ڕوداێکی دڵتەزێنی مەرگەساتی چەپکێک هاوڕێی هەڵکەوتووی "کۆمەڵە و یەکێتی" لە ناوچەکانی هەولێردا، بریندار ببووم و دوای دوو مانگی نەخۆشخانە دەرچوبوم. لەلایەن ناوەندی کۆمەڵەوە بۆ سورداش داوەت کرابووم. منیش لەگەڵ "مەهدی کاوانی و "ڕیاز خدر وادی" بە یەکەوە بۆ ژەمی خواردنی نیوەڕۆکەی ئەو ڕۆژە چوینە بارەگاکەی نەوشیروان. بە

رێکەوت لە بەردەم خانووەکەی ناوەندی کۆمەڵەدا تووشی "حاجی خدراغای ئێنێ" بووم، کە خۆی و کوڕەکانی ماوەیەکی زۆر بوو پێشمەرگەی یەکێتی بوون لە بناری قەندیل. پێشتر لە دۆڵی خانەقا و گوندی وەرتێ، دۆستایەتییەکی گەرمی لەگەڵ بەندە هەبوو. لە دوورەوە باوەشی پێدا کردم و دوای چاکوچۆنی، پێیگوتم: حاجی مەمۆ بەڵکو بە کاک نەوشیروان بڵێی، وا بکات چاوم پێی بکەوێ، چونکە ئەوە چەندان سەعاتە لەو بەردەرگایە چاوەڕوانم. ئێمە لەلایەن "نەوشیروان و فەرەیدوون"ەوە بەخێرهاتن کراین و دوای هەندێ وشەگۆڕینەوە دەربارەی برینداربوونەکەمان و تەندروستی و چۆنیەتی چارەسەریکردنی بەندە کە برینەکەی سەروگوێچکەم پەریشانی کردبووم، چوینە سەر سفرەی خواردن، من فرسەتم هێناو خواستەکەی "حاجی خدراغام" بە نەوشیروان گوت. سکرتێری کۆمەڵە زۆر بە وشکی وەڵامی دامەوە و گوتی: حاجی خدراغا هەر بۆ داواکاری شەخسی دەیەوێ ئێمە ببینێ! دەنا چ کارێکی تری بە ئێمە نییە! منیش وەک ئەوەی دەڵێن، قافی هاتبوو، بە ئەسپایی گوتم: "کاک نەوشیروان ئەمن لەوە ناگەم، بۆ دەبێ سەرکردایەتیی کۆمەڵە و یەکێتی چەندان کێلۆمەتر بەخۆیان بە پێشوازیی ئەفسەرێکی دەزگای موخابەراتی رژێمەوە بچن، ئاسایی بێت! کەچی پێتان ئەستەم بێ، چاوتان بە پیاوێکی بەتەمەنی رۆژانی سەخت و ماندووبوون بکەوێ؟" لێرەدا نەوشیروان کە بەو جۆرە رەفتاری بارزانی وەسف دەکات، ئا بەو ڕەنگە رەقوتەقە وەڵامی منی دایەوە: "حاجی مەمۆ! حەز ئەکەم ئەوە بزانی، کە ئێمە ئینزباتێکی جەیشی عیراقی بە وەزیری دیفاعی عیراق و میتێکی تورک و پاسدارێک بە وەزیری دەرەوە ئەزانین. با خەڵکی وەک تۆش بۆ خۆی هەر چەقە چەق بکات!"

لێرەدا سەرردادەنەوێنم بۆ فەرمودەیەکی "هۆشی منە"ی ڤێتنامی کە دەڵێ: سەرکردە هەرچەند بەتوانا و بلیمەت بێت، بەبێ هەژان و سوتان لەگەڵ خەڵکی دەوروبەرەکەی، بەبێ خاکی بوون و ریزگرتنی ئەو خەڵکەی خەباتیان بۆ دەکات، بەبێ بەپیرەوەچوونی خواستەکانیان، هەرگیز شتێکی ئەوتۆی لەدەست نایەت بۆ خەڵک... هەر بۆخۆی سەرکردەیە.

•

**پێوەندییەکانی بزاڤی سیاسی و چەکداری کورد لەگەڵ چ دەزگایەک.!**

**(لەبەینی بارزانی و شادا هیچ جورە ریکەوتنیکی سیاسی یا قانونی نەبو..)ل/٣٣**

ئەوە دەستنیشانکردنی خەوشێکی ئاشکرای کاروانی سەرانی حیزبی کوردە، کە دەیان ساڵە کورد بەدەستییەوە دەناڵێنێ و باسکردنی مایەی دەستخۆشی کردنە. بەڵام نەوەک هەر بەتەنیا مستەفا بارزانی لە ئانوساتێکی دیاریکراودا وا بوویێت، بەڵکو ئەو خەوشەش

لەگەڵ مێژوی سیاسی کورد، بە سەرتاپای کاروانی تێکۆشانیدا شۆڕ بوەتەوە. بۆیە هێنانەگۆڕێی بۆ مەبەستی نادیاریکراو، لە هەر جۆرە مۆرکێکی لۆجیکیی لێکۆلینەوەی زانستی و سودبەخش، بە دوورمان دەگرێ. پێوەندی دیبلۆماسیی دامودەزگای سەرکردایەتی حیزب و بزاڤی چەکداریی کورد، بە دەزگای وڵاتانی دەوروبەر، بەزۆری تاکە کەسی بووە و زۆرتر تەنیا بە ئاگاداری سەرکردەی پلەبەرزی حیزبەوە بووە. ئەوجا ئەو پێوەندییەیش هەمیشە شاراوە بووە. لەزۆربەی کاتدا، یەکلایەنە دەهۆڵی بۆ ژەنراوە و پاشان پێوەندییەکانی کورد، وەک لایەنی لاواز و بێدەرەتان بە لایەنی دەرەکیی بەهێزی خاوەن دەوڵەت بووە. ئەو پێوەندییەیش هەر لە نووکەوە لەگەڵ دەزگا سیخورییەکانی داگیرکارانی کوردستان و لە رێگای ئەوانیشەوە بە دەزگا سیخوڕی و سەربازییەکانی دیکەوە بووە. ئیتر دەبێ پێوەندییەکی لەم جۆر و ئاستەدا، کامە رێکەوتنی سیاسی و قانوونی لێ بکەوێتەوە کە نەوشیروان تەنیا بۆ لەنگکردنی تایتەرازوی مستەفا بارزانی هێناویتییە گۆڕێ.

دەبوو بۆ پشتڕاستکردنەوەی سوچدارکردنی بارزانی، نموونەگەلێکی لەو رێکەوتنە سیاسی و قانوونیانەی سەرانی دیکەی شۆڕشی نوێ و گوڵان، یان هەر حیزبێکی ناو پاوانی خەباتی کوردان لە سەرتاپای کوردستان بە نموونە بهێنایەتەوە، تاکو کەسێک قسەی بۆ نەکرایە. بۆیە ئەو خەوشە هەر بەتەنیا یەک سەرکردە ناگرێتەوە، بەڵکو تاکو هەنووکەیش لە ڕەوشی هەر جۆرە پێوەندییەکی دەسەڵاتی کوردان بە تایبەت بە رژێمە داگیرکارەکانی کوردستان و دەوڵەتە زلهێز و ئەوانەی دیکەوە، نەچووەتە بواری ئەوجۆرە رێکەوتنە سیاسی و قانوونییە بەرچاوەی ناوبراو مەبەستییەتی.

**هەڵگێرسانی شۆڕشی کورد لە "عیراق"دا..**

(بۆچی شۆرشی کورد هەمیشە لە عیراق دا ئەتەقیتەوە، لەکاتیک دا هەلومەرجی ژیانی سیاسی کورد لە عیراق دا باشترە لە هی کوردەکانی تورکیا و ئیران و، ژمارەشیان لەوان کەمترە؟) ل/٢٢، ٢١

لە بەسەرکردنەوەی ئەو پەیڤانەی سەرەوە، هەمان شێوازی قسەکردن و نووسینی بەرپرسە خۆ بەمەسئولزانەکانی دەیان ساڵەی بەسەرچووی حیزبی کوردی، کە وەک مۆدەیەکی باوەشێنکەری دوبارەبووەوە، تەقلە بەزاراوەی کوردستان لێدەدات. بە جۆرێک هەتا بەسەر زاریدا نەهاتووە، وەک چۆن راگوزارانە کوردستانی باکوور، کوردستانی خۆرهەڵات بە **کوردەکانی تورکیا و ئێران** ناودەبات و ناوی کوردەکانی ژێر دەسەڵاتی رژێمی سوریا ناهێنێ. گوتەیەکی رۆشنبیر و بیردۆزی کۆمەڵایەتی گەورەی تورک

"اسماعیل بیشکچی"مان دەخاتەوە بەرچاو، کە دەڵێ: لەناو کوردەکان خۆیاندا، کوردستانی **تورکیا، ئێران، عیراق و سوریا هەن، بەلام بە تەنێ کوردستانی کوردستان نییە..!**

ناونەهێنانی بەشێک لە خاکی نەتەوەکەی خۆت، هەرچەند بچووک و بۆ هەر مەبەستێکی شاراوە بێت، بە تایبەت لەلایەن سیاسەتمەدارێکی ناسراوی بەناو "کوردستانی"، هەتا لە باوەشی یادەوەرییەکانی خۆیدا، نوقسانییەکی گەورەیە، تەنیا بۆ بەهەندهەڵنگرتنی دۆزی کورد و خاکەکەی نەبێت، لەقاونەدانی سیاسەتی تەعریب، تواندنەوەی **کورد** لەو پارچەیەدا نەبێ، بۆ چیترە..؟

هەروەها جێی خۆیەتی، لێرەدا لەو سەرکردەیەی "کوردەکانی عیراق" بپرسین، ئەگەر دۆزی کورد وەک ئەو گوتەنی، لەو "عیراقە"ی ژێر سێبەری دەسەلاتی بەعس و سەددام، ئەوەندە باشتر بووە، لەو هەلومەرجە سیاسییەی کوردستانی باکوور و رۆژهەلات و خۆرئاوای بچووک، ئەدی بۆچی، بۆ بەرژەوەندی کێ..؟ شۆڕشی نوێمان لە کوردستانی باشوور هەلگیرساندەوە..؟

لە لاپەڕە٢٤ – ٢٨ ی ئەو کتێبەدا، نووسەر بە کۆمەڵێک زانیاری و روونکردنەوەی لوجیستیکیی گرنگی ئێرە و ئەوێی ناونەهێنراو، ناوەڕۆکی کتێبەکەی دەوڵەمەند کردووە، سەبارەت بەو روداوانەی سالانی ١٩٧٤ - ١٩٧٥ قەوماون. کە بونەتە سەرچاوەیەکی زیندوو بۆ ئەوانەی رۆژێک لە رۆژان تۆژینەوە، دیراسەی مێژوویی شۆڕشی ئەیلول ١٩٦١ - ١٩٧٥، دەرکەوت و ئەنجامەکانی بکەن.

**رێکەوتنامەکەی جەزایر و شۆڕشی ئەیلول و...**

**(کوبونەوەی شا و سەددام لەگەل یەکتری و ریکەوتنەکەیان، بو بەرزانی و سەرکردایەتی بزوتنەوەی کورد روداویکی کتوپری چاوەری نەکراو بو./.ل٢٨../ ٩ ی مارت ریککەوتنی جەزائیری شا/ سەددام پشیوییەکی زوری لەناو بنەمالەی بارزانی و سەرکردایەتی پارتی و لە سەرانسەری کوردستان دا دروست کرد، زوریان ئەگریان و نەیانئەزانی چی بکەن.)ل/٢٩**

تۆمارکردن و گێڕانەوەی رووداوێکی تراژیدیاوی جەرگبڕی لەو جۆرەی نەتەوەکەمان، کارێکی هێجگار گرنگ و پڕ سوود دەبوو، ئەگەر نەوشیروان بە سووک و ئاسانی، هەر بە تەنیا تانەئامێز بۆ سەرکردایەتیی مستەفا بارزانی، جدییەتی باسوخواسەکەی کاڵ نەکردایەوە. ئەگەر خۆیشی لەو سەروبەندەدا لەناو چەقی ئەو کارەساتەدا بوایە، رەنگبێ ئەو خەملێندانانە روومەتی دەرخستنیان باشتر بۆ دەرەخسا، دڵنیام ئەو دەمە تووشی میتۆدی یەکلایەنەی بەتەنیا سوچداردەرهێنانی سەرکردایەتی لەوێ رۆژگاردا نەدەبووەوە.

لەوێ ڕۆژاندا، بەندە، شانبەشانی دەیان هاوڕێی دیکەی کۆمەڵە، وەک پێشمەرگەیەک لە کاری میدیایی، بەشداری شۆڕش بووم. ڕاستە لەگەڵ بڵاوبوونەوەی دەنگۆی "ڕێکەوتننامەکەی جەزایر"دا، پشێوی و بێئاگایی کنەی کردبووە نێوان شیرازەکانی شۆڕش و سەرکردایەتییەکەی. بەڵام بە شێوەیەکی مەیدانی، تێکڕای خەڵک؛ گەورە و بچووک، سیاسەتمەدار و ڕۆشنبیر، پێشمەرگە و مەسئول، خوێندەوار و جوتیار، هەر هەموو تێکرا تووشی شۆک و شپرزەیی هاتبوون. لە سەرەتای کارەساتەکەدا، لەگەڵ ئەو بارودۆخە ناهەموارەدا، چرپەی موقامەت و چەکدانەنان لێرەولەوێ دەبیسترا. هەتا بۆ خۆیشم بەدوای هەڵاتە هەڵاتەی هێزەکانی پێشمەرگەی ناوچەکانی هەولێردا، یەکەمجارم بوو کارەساتی تێکشکان و ڕووخانی ئاوا ورەپڕوکێنی نەتەوەکەم ببێنم. تا بڵێی وڕوکاسی و بەرچاوتاریکی هەموو یەکێکی گرتبووەوە.

ڕووداوێکی کتوپڕی لەو جۆرە بۆ خەڵک و هەتا شۆڕشیش، چاوەڕواننەکراو بوو. سەرکردایەتی بارزانی و هەتا سەرجەمی حەشامەتەکەیش، تا ئەو ڕۆژە لەو باوەڕەدا نەبوون، ڕژێمی ئەوسای ئێران هەر وا بە ئاسانی دەستبەرداری یارمەتی یەکجارەکی دەبێت. ئەوان وایان دەزانی ئەوەیش سیناریۆیەکی دیکەی مانۆڕەکانی سیاسەتی دەوڵەتی و هەرێمیی ناوچەکەیە، لە چەشنی گەمەکانی ڕابردوو. بەبێ ئەوەی ئەو فاکتە مێژووکردەی لاپەڕەکانی زنجیرە ئاشبەتاڵەکانی دەمی شکان و ڕووخانی ئیمارەتەکانی ئێرەوئەوێی کوردستان، خەباتی بێوچان و هەوڵدانە بێهودەکانی شێخ مەحمودی نەمر، ئاشبەتاڵ و ڕووخانی کۆماری جوانەمەرگی مهابادی کوردستانی ڕۆژهەڵات، تراژیدیای خۆبەدەستەوەدانی شێخ سەعیدی پیران و قازی مەحەمەد لەبیر مابێت. کە هەمیشە مێژوو ئەوەمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە کورد لەدەمی لێقەومانی ئاشبەتاڵدا، بێ پشت و پەنا ماوەتەوە و خۆیشی عەقڵ و لۆژیکی بیرکردنەوەی خۆبەخۆیی و وەرگرتنی بڕیاری بەکۆمەڵی گونجاوی لەبیرچووەتەوە.

بێگومان سەرکردایەتی ئەودەمی شۆڕش، لەو ڕۆژ و مەیدانەدا، بەرپرسیاری سەرەکی بوون، بەڵام خۆ ژمارەیەکی بەرچاوی سەرکردەکانی ڕەوتی "م.س"ی ڕابردوو و "قیادەی مەرکەزیی حیزبی شیوعی و کاژیک و کۆمەڵە" و سەرکردایەتییەکەی و خەڵکانێکی بێشوماری خاوەن بڕوانامەی بەرز، نووسەر و ڕۆشنبیر و هونەرمەندی زۆرورزەبەندە هەبوون. بەڵام بێجگە لەو هەوڵدانە لاوازەی کۆمەڵە بۆ موقاوەمەت، کە ئەودەم دەیان هاوڕێی کۆمەڵە چوونە ناوچەی ماوەت و پێنجوێن، دەنا هیچ لایەن و کەسێکی تری سەرگۆڕەپانەکە، نەهاتوونەتە دەنگهەڵبڕین بۆ درێژەپێدانی موقاوەمەت و شۆڕش! بە کورت و کرمانجی، ئاشبەتاڵی شۆڕشی چواردەساڵەی کورد لەوێ ڕۆژدا، بەتەنیا

مەسئولیەت و ئاشبەتاڵی سەرانی شۆڕش نەبوو، بەڵکو ڕەشماڵی ئەو کارەساتە بەسەرهەموو لایەکەوە بوو، کە جارێکی دیکە لە مێژوودا دووپات بووەوە. باسکردنی ئەو واقیعە تاڵەی کارەساتەکە وەک خۆی، تاکە زامنی زیاتر لێوردبوونەوە و شەنوکەوکردنی ئەو ئەزموونە جەنجاڵەیە بۆ پەند و عیبرەت لێوەرگرتن.

**کۆمەڵە و نەوشیروان..**

بەدرێژایی لاپەڕەکانی بەشی سەرەتای کتێبەکە (ل/٧ - ٦١) نەوشیروان هەر لە پەراوێزەوە و لێرە و لەوێی نووسینەکەیدا، بۆ هەندێ مەبەستی نادیار، قسە دێنێتە سەر ناوهێنانی کۆمەڵە. تەنیا بە ناڕاستەوخۆ سەرەتاکانی ئەو هەقیقەتەمان لە بەرگی هەندێ دەستەواژە بۆ دەردەخا، کە مام جەلال کەراکتەری سەرەکی کۆمەڵە بووە هەتا ساڵی ١٩٧٥. ئەو هەتا لەلایەن "مام جەلال"ەوە پێوەنەکراوە، خەبەرێک لە پێوەندی خۆی بە خودی ڕێکخستنی کۆمەڵەوە باس ناکات. دیارە لەو هەموو بینەوبەردانەی جۆری گێڕانەوەکانی، سەبارەت بە دۆزی سەرەتایی بەرێوەبردنی کۆمەڵە و سەرەتاتکێکردنی لە سێبەری ڕووداوەکانی خەباتی چەکداری، دیزەبەدەرخۆنەکردنی هەوڵدانە پڕ لە فیداکارییەکەی ڕۆژانی لیقەومانی کۆمەڵە لەساڵی ١٩٧٥ بەدواوە، کە لەلایەن کاراکتەری موقاوەمەت و خۆبەدەستەوە نەدان، "ئارام" و ئەو دەیان هاوڕێیەی بەگیان و هزری ئەوکاتی خۆیان کۆمەڵەیان لە مەرگ ڕزگار کرد و زەمینەیان بۆ لەدایکبوونی یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەسەرخاکی کوردستان ڕەخساند، کە لە دەرەوەی کوردستان جاڕی دامەزراندنی درابوو. نیشانەیەکی حاشاهەڵنەگرە لە ڕەشکردنەوەی مێژوی خەباتی گیانفیداکارانەی مەیدانی کۆمەڵە و تەنیا بۆ مەبەستی ئەوەیە تێکرای سەرووەرییە پڕ قوربانییە بێشومارەکانی کۆمەڵە، بۆ کاریزمابوونی خودی خۆی لە سێبەری "مام جەلال"دا بگێرتەوە. ئەوەتە لەبری گێڕانەوە بەگیانێکی لەخۆبووردوانە، هاتووە شێوازێکی پڕ لە تەمومژی گرتوتە بەر و بەدەمی خۆی تەنیا نامە و پێوەندی "مام جەلال"ی کردۆتە سەرپشکی هەر جۆرە پێوەندییەکی بە کۆمەڵەوە، چونکە هەرگیز بە خوێنەر ناڵێ، ئەودەم ئەو لە کۆمەڵە چ کارە بووە، چلۆن پێوەندییەکی بەو ڕێکخستنەوە هەبووە کە دوایی لە ڕەوتی خەباتی چەکداری، بەدوای شەهیدبوونی "ئارام" دەبێتە کاراکتەری سەرەکی لە هەمان ڕێکخستندا!

(کومەلە، ریکخستنیکی بچوک بو. بەلام کادروئەندامی باشی پی گەیاند بو. خوی ئاشکرا نەکرد بو. لەبەر ئەوە وەکو حیزبی سیاسی خەلک نەیان ئەناسی. زوری سەرکردە و ئەندامە پیشکەوتوەکانی چوبونە ریزی شورشەکەوە. ریزەکانی کومەلەش لەبەر یەک ترازا بو. کە ئاشبەتال بو لەپیش دا بە هیوای مانەوە و، دریژەدان بون بە شورش. بو ئەو مەبەستە پیوەندییان لەگەل قیادەی مەرکەزی وسەرانی کاژیک و، هەندی لە فەرماندەکانی پیشمەرگە کردبو، کەسیکی ئەوتو بە دەنگیانەوە نەهات بو. ئەمانیش نائومید بوبون و بە کومەل گەرانەوە بو عیراق.)ل/٣٢

ئەمە باسکردنی یەکێکە کە لە ساڵی ١٩٧٨ەوە، تاکو هەڵوەشاندنەوەی لە ساڵی ١٩٩١دا، کاراکتەر و مەسئولی سەرەکی کۆمەڵە بووە. خوێنەر تووشی هەڵوەستە دەکات، بەتایبەت بە رووی ئەمجۆرە تێکەڵ و پێکەڵییەی لە چۆنیەتی جلیتکردنی رستەکانی وەک ئەوەی دەڵێ: "ریکخستنیکی بچوک بو. بەلام کادر و ئەندامی باشی پێگەیاند بو!" بێگومان هەمو ئەو زانیارییە سەرەتاتکییانەی ئەوشیروان، لەبەر ئەوەی زادەی پێزانینی پراکتیکی و مەیدانیی خۆی نەبوە و لە خەڵکانی دیکەی وەرگرتوە، بۆیە هیچ ئاماژەیەک بۆ سەرچاوە و ناوی کەس ناکات. دەنا دەبو بەلانی کەمەوە، سەرەتاکانی کۆمەڵە و مێژووی خەباتەکەی بە هەند هەڵگرتایە و هەرچۆنێک بوایە پوختەیەکی ئەو مێژووەی تۆمار بکردایە، بۆچوونی خۆیشی بە تێری سەرپشک بکردایە.

لێرەدا رووی پرسیارمان لە نووسەر دەکەین و دەپرسین؛ بۆچی بە خۆی رانەفەرمووە، سەبارەت بەو هەڵوێستە نا روونەی کۆمەڵە لە زەمان و زەمینی ئاشبەتاڵدا، کە هەر هیچ نەبوایە، ئەگەر وەک چاودێرێکی لایدەش بوایە، رای خۆی لەسەر ئەوە تۆمار بکردایە، کە بۆچی کۆمەڵە لە سەرەتادا بە گەرمی بانگاشەی بۆ درێژەپێدانی خەباتی چەکداری کرد و ژمارەیەک لە کادرەکانیشی بۆ ناوچەکانی سوورێن بەرێکرد! لە کاتێکدا هێشتا هێزەکانی رژێمی بەغداد، نەپەرژابوونە سەر داگیرکردنی تێکرای ناوچە ئازادکراوەکان، دانانی ئۆردوگا و تەپکەی سەربازی، دامودەزگا سەرکوتکەرەکانیان لە سەرتاپای کوردستانی باشوور جێگیر نەکردبوو. هێشتا بەشێکی زۆری خەڵکی کورد لەبەرانبەر رژێم، چەک بەدەست بوون و ئامادەی درێژەپێدانی بەربەرەکانی بوون. بەلام بەهۆی نەبونی رابەرانی مەیدانی رۆژی لێقەومان، جورئەتی شۆڕشگێرانەی ناو جەرگەی کۆمەلانی خەڵک، گشت سەرکردە و بنکردە، رەدووی ئەوە کەوتن "لەگەڵ عامی دەچینە شامی"، بە لێشاو تەسلیم بە رژێمی بەعس بووینەوە. هەروەها یەکێک لە خامۆشییەکانی ئەو نووسینە، ئەوەیە کەهەر بەدوای ساڵێک، یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە دەرەوەی خاکی کوردستانی باشووردا، جاڕی هەڵگیرساندنی تێکۆشانی چەکداری دەدات، کاکی نووسەر کەم و زۆر باسی ناکات! لەو کاتەیدا کە رژێمی عیراقی، کونج و کەلەبەری خاکی

کوردستان نەمابوو، مۆڵگە و تەپکەی تێدا جێگیر نەکات. بەڵێ نەوشیروان هەر وەک لە ئاست گێڕانەوەی سەرجەلەی مێژووی کۆمەڵە، بەشێکی زۆر گرنگی ژیانی سیاسی رابردووی خۆی بێدەنگی هەڵبژاردوە، ئاوایش بە رووی ئەو باسوخواسە گرنگانە خۆی لێ نەبان کردووە. هەر بۆیەش ئاشبەتاڵ لە ساڵی ١٩٧٥دا، تەنیا ئاشبەتاڵی **پارتی** نەبوو، بەڵکو ئاشبەتاڵی **کۆمەڵەیش** بوو لە خەباتی چەکداری، ئەوجا چ جیاوازییەکی هەبووە، لەوەی لە عیراق یان لە **ئێران** بگیرسێتەوە! خەملێندانی دوورەوڵاتی نەوشیروان کە گوایە، **کۆمەڵە** بە هۆی چوونەریزی شۆڕشی ئەیلولەوە، ریزەکانی لەباریەکتری ترازابوو! ئەمە لەسەر ئەرزی واقیعدا دروست بە پێچەوانەوە بوو. بەبێ ئەوەی بە راشکاوی نەیاریی خۆی دەربخات، لەو چوونەی بەشی زۆری هاوڕێیەکانی کۆمەڵە بۆ ریزی شۆڕشی ئەیلول. بەندە یەکێک بووم لەو ئەندامانەی کۆمەڵە کە چووبوومە شاخ، دەتوانم ئەو شایەتییە بدەم کە یەکێک لە خاڵە بەهێزەکانی ئەوێ رۆژێی تێکۆشانی **کۆمەڵە**، هەڵوێستی چاونەترسانەی بوو لە بەشداریکردنی خەباتی چەکداری خەڵکی کورد لە شۆڕشی ئەیلولدا. ئەو هەنگاوە بۆ کۆمەڵە و هاوڕێیەکانی، هەم ئەزموونێکی گەورەی پڕ دەرس و فێربوون بوو، کە **کۆمەڵە** لەماوەی ئەو ساڵەدا، بە پراکتیک کەوتە مەیدانی قاڵبوونەوە و بەدیهێنانی ئاسۆیەکی فراوانتر بۆ گەشەکردن و پتەوتربوونی شیرازەی رێکخستنەکانی. هەمیش **کۆمەڵە** بەو هەنگاوە بە جورئەتانەی، خۆی لە تێکرای ریزەکانی خەڵکی کورد جیانەکردەوە، لەو خەباتە چەکدارییە بەشداری ئازارەکانی خەڵکی بوو.

ئیتر نازانم نەوشیروان بۆ وێنەیەکی ئەو لەیەکترازانەی شیرازەکانی کۆمەڵەی تۆمار نەکردوە! ئەگەر سەرەداوێکی دروستی ئەو خەملێدانە بەدەستەوە بووە! لەو ساڵەدا بەندەیش وەک ئەندامێکی چالاکوانی **کۆمەڵە**، سەرەتا وەک مامۆستای قوتابخانە لە ناوچەکانی خۆشناوەتی و دواتر وەک کارمەند لە **ئێزگەی دەنگی کوردستان/** بەشی کوردی لە ناوچەی چۆمان، تا رادەیەک بە کار و چالاکی کۆمەڵە ئاشنا بووم. کۆمەڵە لەو ساڵەدا، بەتایبەت دوای ئەوەی لەگەڵ ئەنوەر شاکەلی بەجووتە بە ناوچەکانی کوردستانی رۆژهەڵاتدا بە ئەرکی ئێزگەی دەنگی کوردستان، چوینە ناوچەکانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان لە سنوورەکانی سلێمانی و کەرکوک و قولایی گەرمیان، بە مەبەستی کۆکردنەوەی ئەدەبیاتی پێشمەرگە و نووسینی ریپۆرتاژ لەو بارەوە. من یەک بەخۆم لەو ناوچانەدا کە پێیاندا سوڕاومەتەوە، بە شێوەیەکی خورپەیی هەستم بە چالاکی و لە نزیکەوە درکم بە هەبوونی دەنگ و ڕەنگی شیرازەی رێکخستنەکانی کۆمەڵە کردووە. بەڵام بە هۆی ئەو بارودۆخەی تێیدا دەژیان، رێکخستنەکان هەتا ئەو رۆژەی بیرۆکەی دامەزراندنی رێکخستنێکی نوێ و دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری لە شاخەکانی

کوردستانی باشوور لە دەرەوەی وڵات گەڵاڵە نەببوو، تابڵێی نهێنیپارێز و ژێرزەمینی بوون. نە ڕژێمی بەعس لە بەغداد و نە حیزبەکانی کوردستان و عیراق بە هەبوونی کۆمەڵەیان دەزانی، چ جای ئەندامێکی کۆمەڵە لەلایەن ڕژێمەوە گیرابێت! کەچی هەر بەدوای کۆبوونەوەی خەڵکانی سەر بەو بیرۆکەیەی سەرەوە لە "شامی عەرەبی"دا، دەستپێکردنی ناردنی نامە و نامەکاری بۆ ناوەوەی وڵات ، هاتوچۆکردنی تەتەرەکان لەنیوان سەرکردایەتی بیرۆی ناوبراو، سەرکردایەتی کۆمەڵە لە ناوەوەی کوردستانی باشووردا، تێکرای ئەو سەرکرداتییەی ناوەوە بە هۆی هەڵەیەکی ڕێکخراوەیی، ناسینی هەموو ئەندامەکانی لەلایەن ئەو لیژنەی ڕێکخستنی کۆمەڵە لە بەغداد، بەکۆمەڵ _ لەبری ئیعترافەکان _ ئاشکرا بوون، سەرکردەکانی کۆمەڵە لەوێ ڕۆژاندا، لە جیاتی هەڵبژاردنی خۆ حەشاردانی ناوەوەی کوردستان و درێژەپێدانی سەرپەرشتیکردنی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە، زۆر پەلەپروسکێیانە ڕێگای چوونە ئێران، بیرکردنەوە لە گەیشتنە "شام"یان گرت، بەڵام بە ئاسانی لەلایەن دامودەزگای ئەو زەمانی دەسەڵاتداری ئیرانی گیران و تەسلیم بە دەسەڵاتدارانی عیراق کرانەوە. ئیتر شاڵاوی ئاشکرابوون و ئیعترافاتی چەندان لە گیراوەکان، بە شێوەیەکی تراجیدیاوی شیرازەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵەی گەیاندە سەر لێواری هەڵوەشانەوە، کەچی لەو بارودۆخە ناهەموارەدا، دەستپێشکەری **"ئارام"** بە هاوڕێیەتی دەستەیەک هاوڕێی جەربەزەی ئەوێ ڕۆژێ، کە سەرباری ئەوەی ئەوانیش فەرمانی گرتن و ڕاوەدوونانیان لەلایەن دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ڕژێمەوە بۆ دەرچووبوو، گیانلەسەردەستانە خۆیان کردە سووتەمەنی، کۆڵەگەی سەرلەنوێی گرتنەوەی شیرازەی ڕێکخسنەکانی کۆمەڵە، ئەوجا هەنگاونان بۆ دروستکردنی مەفرەزە چەکدارییە سەرەتاییەکانی هۆشیارکردنەوە و جاردانی خەباتی چەکداری.

بەڵێ لە ئاست باسنەکردن، خۆنەکردنە خاوەنی ئەو ڕاستییانە کە بە قوربانییەکی زۆری گیانی هاوڕێیانی کۆمەڵە تۆمار کراوە و نەوشیروان بەرزەفڕانە لە دوورونزیک ئاوڕی لێ نەداوەتەوە، نیشانەیەکی ئاشکرایە لەوەی ئەو بۆ نزیکەی پازدەساڵان بە ڕاگوزاری، بۆ مەبەستێکی تایبەتی بوەتە کاراکتەری سەرەکی بەڕێوەبردنی کۆمەڵە..!

### گەڕانەوە بۆ کوردستان و موتیڤەکانی نەوشیروان..

(دوستایەتی من لەگەل مامجەلال نەگەرایەوە بو سالی ١٩٦١، بو ئەو کاتەی لیپسراوی لقی سلیمانی پارتی بو. چەند جاری تەلەفونی بو کردم و نامەی بو ناردم، هەوال و دەنگوباسەکانی پی نەگەیاندم و، بیروبوچونەکانی خوی بو رون نەکردمەوە، منیش بیروبوچونەکانی خومم بو باس نەکرد. داوای لیکردم خوم ئامادە بکەم بو بەشداری لەو ریکخراوە تازەیەدا کە خەریکی

دامەزراندنیتی و، بو گەرانەوە ولات. ئەگەرچی ماوەیەکی دریژ بو من لە کوردستان دووربوم، بەلام/ ئیلتزامی ئەخلاقی و ئەدەبی/ بە کومەلە و مام جەلالیەوە بەست بوم.)ل/٤١ _٤٢

(جاریکیان لە وەلامی نامەیەکی دا، بو ئەوەی دلنیای بکەم لەوەی من هەر لەسەر بەلینە کونەکەی خوم ماوم،...... بەلینم دایە هەر کاری بو دەسپیکردنەوەی شورش دەست پی بکەن، من واز لە هەمو شتیکی خوم ئەهینم لە ڤییەننا و، لەگەلیان ئەبم..)ل/٤٢

لە پێشەوە گێڕانەوەی رادەی قوربانیدان بە خوێندنی بەرز، لە بەرۆکی وڵاتێکی ئەورووپی خۆشی وەک **نەمسا**، لە زەمان و زەمینی ئەوێ رۆژاندا، لە شانی هەموو یەکێک نەهاتووە. وەک خۆی نووسیویەتی، بە دڵنیاییەوە بۆ راستگۆیی بەڵێن، ئیلتزامی ئەخلاقی و ئەدەبی گەڕاوەتەوە. ئەوە هەنگاوێکی شۆڕشگێڕانەی پڕ لە خۆبردەیی کەموێنەی نەوشیروان بووە، بەڵام هەر لەبەرانبەر ئەو پەیڤانەدا، ئەگەر خوێنەر بە وردی دیقەتیان بداتێ، بە تایبەت ئەوانەی لەگەڵ دۆزی ئەو رۆژگارە ناسیارێتیان هەیە، مایەی هەڵوەستەکردنن بۆ شرۆڤەکردنێکی لەم جۆرەدا:

**نەوشیروان** دەستەواژەی "ئیلتزامی ئەخلاقی و ئەدەبی" کردوتە سەرپۆشی هەموو بیر و بۆچوونە نادیارەکانی خودی خۆی، کە بای سەرقەڵەمانەیەکی تای تەرازوی ئەو قوربانییە گەورەیەی راست ناکاتەوە. چونکە هەرگیز نابێت یەکێک بەڵێن بدات، بەبێ ئەوەی بەڵێنی موقابیلی وەرنەگرتبێت، بەتایبەت کە خەبات بۆ وڵات و خەڵکەکەی کەوتە بەرشمڕی بەڵێن و بەڵێنکاری. هەر لێرەیشەوە جارێکی دیکە نەوشیروان بە خشکەیی ئەوە دەخاتە مەبەستی دەستەواژەکانی، کە ئەو لەپێشەوە هەر تەنیا "مام جەلال"ی بە کاراکتەری سەرەکی **کۆمەڵە** زانیوە، ئەگەر نا دەبوو ناوبراو بەدوای پێوەندیپێکردنی لە لایەن "مام جەلال"ەوە، بەلانی کەمەوە ئاوڕێک لە کۆمەڵە بداتەوە و بۆ پرسەخەسوانێش بوایە لەو بڕیارە چارەنووسسازە، هەرهیچ نەبوایە کۆمەڵەی ئاگادار بکردایەوە. خودی مام جەلال لە هەموو ئانوساتێکدا ئەوەی کردووە و بۆ ئەوێ رۆژێ ئەگەر بە نامەش بوبێت، **"ئارام"ی** لەبری کۆمەڵە لە بەرنامەی خۆیان بەسەرکردوتەوە! بە کورتی لەو هەموو هێنان و بردنەدا، تەنیا بە پەراوێزکردنی ئەو کۆمەڵەیەی لێ کەوتوتەوە. کە ئەو دەمە دەنگۆی دەستپێشکەرییەکەی "ئارام" و هاوڕێیەکانی کۆمیتەی هەرێمەکانی بیستووە، بە لیفەیەکی ئەستوور دایپۆشیوە. هەروەها لەلایەکی دیکەوە بە کەسانی کۆمەڵە دەڵێ، پێوەندیی ئەو بە "مام جەلال"ەوە لە هەمێزی بەکاریزمابوونی خۆی، بۆ ئەودەم لەسەرەوەی هەر جۆرە پێوەندیی و بەرژەوەندییەکی دیکە بووە. هەروەک ئەنجامەکەیشی بەوە کەوتوتەوە، خودی نەوشیروان لە چاوتروسکانێکدا، بەبێ هیچ پاساو و دیباتێکی تارادەیەک نیمچە دیموکراتی،

له پرسکردن به ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە، کۆمەڵەی دەیان ساڵی خەبات و قوربانی یەک لەشکری پڕ ئەزموونی هەڵوەشاندەوە و زۆر بێمنەتانەیش خۆی له دەرئەنجامەکان نەبان کردوە.

لێرەوەیش بۆ جارێکی دیکە، نەوشیروان خۆی لەبەرانبەر ڕەوتی مێژوویی و چۆنیەتی دروستکردنی ئەو ڕێکخراوە (ی.ن.ک) نوێیەدا، بێدەنگ کردووە و بە دەردی نەگێڕانەوەی مێژووی سەرەتاکانی دامەزراندنی کۆمەڵەی بردووە، کە بەڕای من بە یەکێک له خامۆشییە هەرە دیارەکانی ئەو کتێبە دەخوێندرێتەوە. ئەزموونی مەیدانیی خەڵکی کورد، یەک بە خۆی لەپاڵ ئەزموونە زیندووەکانی دونیادا، له هەموو بوار و دەرفەتێکدا. هەمیشە ئەوەیان ساغ کردوتەوە، هەر سەرکردایەتییەکی ناو ڕیزەکانی خەڵک، لەسەر زێدی خۆیاندا هەڵقوڵابن، تێکڕای ستراتیژ و تاکتیکەکانیان لەسەر بناغەی بەرژەوەندی بێ پەناوپێچی نەتەوە و وڵات، سەرچاوەی گرتبێت، زۆری خەملاندن و پێشبینییەکانیان لەگەڵ ڕەوتی گۆڕان و پێشکەوتنەکان یەک هاتوتەوە و ئەنجامەکەی بە سەرکەوتوویی تۆمار کراوە. بەڵام توخمەکانی سەرکردایەتییەکی دوورەوڵات کە له پڕ وەیشومەترین کارەساتی هەرەسی خەباتی چەکداری نەتەوەکەی وجودی نەبوبێت، بێگومان هەر جۆرە بۆچوون، خەملاندنێکی تەماوی و بگرە نیوەناچڵ و بێ بناغە دەبێت. سەرکردایەتی کۆمەڵە له شاخەکانی کوردستان له دەمی ڕوودانی ئەو کارەساتەدا، سەرەتا جوامێرانە هاتەدەست، لەسەروپێدانگی ڕچەشکاندنێکی مێژوویی بەدەگمەن بوو، بۆ بەردەوامی خەباتی چەکداری له کوردستانی باشووردا، بەڵام بە هۆی نەبوونی دیدێکی بەرچاوڕونانە و لاوازیی جورئەتی شۆڕشگێڕانەی کاتی ئەزمەکان، بەبێ پاساوێکی قەناعەتپێکەر، بەخشکەیی لەو جۆرە بیرکردنەوەی بەردەوامی موقاوەمەتی چەکدارانەی ناو کۆمەڵانی خەڵکی چەک بە دەست و کەرەستەیەکی بێشومار له جبەخانەی مفت، پەشیمان بونەوە و ڕەدووی ڕەوتی ڕووداوەکانی ڕۆژ، پاساوی نابەجێی نەگونجانی بارودۆخی هەرێمی و نێودەوڵەتی کەوتن.

سروشتی دۆندی شاخ، کەژ و دۆڵی کوردستان، لەگەڵ خۆیاندا یەک نموونەی پڕ له جوانیی عیبرەت و بەنرخی گەوهەرداریيان ڕژاندوتە سەر خەرمانی دەرس و پەندەکان، کە دەڵێ: زۆرجاران ئەو کانییەی له دەمی کانییەکی دیکەوە هەڵدەقوڵێ، بەردەوام ئاوی لەبەر دەڕوات و وشک نابێتەوە.

**ڕەوتی ڕۆژگار و سەنگی مەحەک..**

(ئیمە دلیکمان بە ریکخستنەکەی کومەلە خوش بو. هیوایەکی زورمان لەسەرهەلچنی بو. بەلام روداوەکانی کوردستان کاری لەسەر کومەلەش کردبو. ناکوکی لە ریزەکانیان دا تەقاندبوەوە. تاقمیکی ریکخستنەکانی خوارەوەی کومەلە دژی سەرکرداتییەکەی راوەستابون. بە ئاشکرا کەوتبونە

جموجول و موهاتەرات و دامەزراندنی ریکخستنی تازە. سەرکردایەتی هەرچەند هەولی دابو بە ریگایەکی ئوسولی چارەی ناکوکییەکان بکا، کەلکی نەبو. سەرەنجام، بو ئەوەی لەو ئاژەوەیە دەربچن و ریکخستن لە لیدان بپاریزن، بریار ئەدەن برون بو ئیران بو ئەوەی لەویوە بچن بو سوریا..)ل/٤٨ س

زەمان سەیر و سەمەرە دەسوڕێتەوە. نەوشیروان لە رۆژانێکدا خۆی لە دەرەوەی ولاتدا بووە و پێوەندییەکی رێکخراوەیی دیاریکراوی بە کۆمەڵەوە نەبووە. دیارە بەسەرهاتەکانی ئەوێ رۆژێ لە دەمی یەکێک دەگێڕتەوە کە کەموزۆر ناوی ناهێنێ! دواییش زانیاری ناتەواو بە فەنتازیای خۆی دەهۆنێتەوە، بەوەی کە گوایە؛ (بو ئەوەی لەو ئاژەوەیە دەربچن و ریکخستن لە لیدان بپاریزن. بریار ئەدەن برون بو ئیران بو ئەوەی لەویوە بچن بو سوریا) کە لە راستیدا هۆی گرتنی ئەو رێگایە چەوتە و بەجێهێشتنی رێکخستنی کۆمەڵە بەبێ سەرکردایەتی، بۆ ئەوە گەڕاوەتەوە کە خۆیان لە راوەدوونان و گرتن لە لایەن دەزگائەمنییەکانی رژێمی بەعس دەرباز بکەن و وەک لە پێشتر باسم کردووە، لەبری ئیعتراف لەسەرکردن ئاشکرا ببوون.

نەوشیروان لەو هۆنینەوە نادروستەیدا، بە بەردێک دوو نیشان دەپێکێ. بە خوێنەر و مێژووی کۆمەڵە دەڵێ، کۆمەڵە لە دوورەدەستی خودی خۆی، شتێکی ئەوتۆ نەبووە و سەرکردایەتییەکەی ئەوە بووە. دوایی هەر لەسەردەستی خۆیدا، کۆمەڵە کەوتوتە سەرپێیان. ئەوجا بە خشکەیی پلار لەو سەرکرداتییە دەدات کە توانای چارەسەری تەنگەژە ناوخۆییەکانی کۆمەڵەیان نەبووە و ویستویانە خۆیان لەو گێژاوە دەرباز بکەن! نەوشیروان هەر وەک چۆن بێدەنگەی لە ناوهێنانی ئەو سەرچاوە کردووە، لە باسکردنی دۆزی ناوخۆی کۆمەڵەدا، کە بوەتە سەرچاوەی راوبۆچونەکانی، ئاوایش تەمومژاوی داری لەناو دۆزی ناوخۆی کۆمەڵە وەرداوە و نەهاتووە بە شێوەیەکی بەرچاورونانە، ئاوڕ لە چۆنیەتی تەقینەوەی ئەو ناکۆکییەناوخۆییانەی ئەوێ رۆژێی کۆمەڵە بداتەوە، کە هەر لە یەکەم رۆژی لەدایکبونییەوە، لەناو خۆیدا بە چەندان ناکۆکیی ناوەکی چارەسەرنەکراو تلاوەتەوە. بە تایبەت لە رووی فیکری، سترکتوری بنیادی رێکخراوەیی و هتد.

تێکڕای مەسەلە فیکرییەکان بە ساغنەکراوەیی، بەهەڵواسراوی بەدارێ وەکراون. دواتریش نازانم بەچ هۆکارێک و چۆن ئاوەها یەکلایەنە، کرۆکی ئەو هەڵوێستەی رێکخستنەکان بە مهاترات ناوزەد دەکات! نیشانەیەکی ئەو جۆرە موهاتەراتانەمان بۆ دەرناخات! خۆزگە سیاسەتمەدارەکانی کورد نە خۆیان ئەوەندە لەخۆبایی بونایە، نە ئەوەندەیش گەمەیان بە هەستونەستی خەڵکی دیکە بهاتایە. دەبێ ئەو وەزعەی (تەنگەژە ناوخۆییەی) نەوشیروان و هەوادارانی (لەدەمی جیابوونەوەیان، کە شتێکی غەریب و

موهاتەرات نییە) تووشی سەرجەم جەستەی "یەکێتی نیشتمانی کوردستان"یان کردووە، بە چەند هۆقەی ئەو جۆرە مهاتراتە بکێشرێ..! بەو جۆرە شەرعە دروست هەر ئەوەیە، ئەوەی بە خۆی دەیکات بە هەر بیانویەک بێت داهێنان و گۆڕانە، بەڵام ئەوەی یەکێکی دیکە کردویەتی (لەبارودۆخکی زۆر جیاواز) و دەیکات هەر تەنیا موهاتەراتە..!

لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئاوڕێک لەو دۆزە ناوخۆییەی ئەوێ ڕۆژێی کۆمەڵە بدەمەوە، کە بەندە لەوان ڕۆژاندا، لەناو خودی ڕوداوەکان بووم. بێگومان پشێویی و سەرلێشێواویی ناو شیرازەکانی ڕێکخستنی سنووردار و بچوکی کۆمەڵە و مقۆمقۆی ئەندامەکانی خوارەوە بۆ چەندان فاکتەر گەڕاوەتەوە. یەکێک لەو فاکتەرانە، خودی ئەو سەرکردایەتییە ناسەقامگیرە لە ڕووی جۆری باوەڕبەخۆبوون و بە کۆمەڵە بوو، کە لە بڕیاردانە چارەنووسسازەکان خاوەنی جورئەتی شۆڕشگێرانەی وەک بڕیارەکەی "ئارام" و هاوڕێیەکانی نەبوون؛ کە ئەوانیش فەرمانی ڕاوەدوونان و گرتنیان هەبوو لەلایەن دەزگا ئەمنییەکانی ڕژێمەوە، کە هەر لە کوردستان مانەوە و کەوتنە خەباتی ژێرزەمینی، هەتا دەمی دروستکردنی مەفرەزەچەکدارەکان و دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری، کۆمەڵەیان لەسەرنگونبوون دەرباز کرد.

سەرانی ئەو دەمی کۆمەڵە بەو خۆنەگرتن و هەنگاونانی پەلەکارانەیان، نەوەک هەر زیانی گەورەیان بەخودی کۆمەڵە گەیاند، بگرە بۆ خۆیشییان بە گەورەترین قوربانی و پێشکەشکردنی گیانی پڕ قارەمانێتی خۆیان تەواو بوو. بێگومان ئەو دڵەڕاوکێیەی سەرانی کۆمەڵە و پاشگەزبوونەوەیان لە درێژەپێدانی خەباتی چەکداری لە دەمی ئاشبەتاڵی کورد و شۆڕشی ئەیلول و ناکۆکییە زۆروزەبەندەکانی پێکهاتەی فیکریی کۆمەڵە، زەمینەیەکی گونجاوی خوڵقاندبوو بۆ تەقینەوەی ناکۆکییەکانی نێوان بەشێک لە ئەندامانی خوارەوە، کە بە شێوەیەکیش هەر لە سنووری ڕێکخستنەکانی شاری سلێمانی بوو. سەرکردایەتی کۆمەڵە، بەبێ ئەوەی توانای ڕووبەڕووبوونەوەی هەبووبێت، دیزەبەدەرخۆنەیانکردوە و بە هەڵواسراوی بۆ قەدەریان بە جێهێشتوە، کە دواتر ئەو هەمو بارە قورسەی تەقینەوەی ناکۆکییەکان بۆ (ئارام)ی بەحەوسەڵە و خاوەن پشوو و جورئەتی شۆڕشگێرانەی کەموێنەی ئەوێ ڕۆژگار ماوەتەوە. بە هەناسەیەکی بێماندووبوون و موجازەفەکردن بە گیانی خۆی، شەونخونی ژیانی ئیختفایی ناو شار و لادێ، تارادەیەکی زۆر چارەسەری کاتی بۆ دۆزیبوونەوە، ئەو ئەندامانەیش بەشێکی زۆریان گەڕانەوە ناو کۆمەڵە و درێژەیان بە خەباتکردن دا. هەرچەندە چەند دانەکیان بەناوی "ڕەنجبەران" گیران و لە سێدارە دران، کە نەوشیروان بەیەک وشەیش نە باسی ئەوان، نەهەنگاوە چاونەترسەکانی ئارام و

هاوڕێیە جەربەزەکانی هەڵناسەنگێنی کە دواتر بە حازرەکی هاتنە سەر ڕەوسەی بەرهەمەکانیان.

لە شوێنێکی دیکەی ئەو کتێبەدا، نەوشیروان درێژە بە گێڕانەوەکەی خۆی دەدا و دەنووسی:

(پاش چەند هەفتەیەک کە حکومەتی ئیران لە پینجوین تەسلیمی حکومەتی عیراقی کردنەوە، ئینجا زانیمان. بۆ ئێمە ئەمە ڕوداویکی چاوەڕێ نەکراو بو. بەشی لە هیواکانی داروخانین. ریکخستنەکانی کومەلە کەوتنە بەر هیرشی ڕاونان و گرتن. هەندیکی گیراو هەندیکی خوی شاردەوە)ل/ ٤٨_٤٩

بەڵێ نەوشیروان بەردەوامە لەوەی بە شێوەیەکی سەرزارەکی، ئەو ڕووداوە گرنگانە تۆمار بکات، سەبارەت بە لاپەڕەکانی مێژووی کۆمەڵە. بەداخەوە هەتاکو ئێستاکە یەکێکی بە جورئەت، لە سەربازە گومەکان دەرنەکەوتوە، کە باسکی لێهەڵکات بۆ ساغکردنەوەی نهێنییەکانی ئەو ڕووداوانە و واقیعییانە پەردە لەسەر ڕاستییەکان لابدات، ڕێگا بە فەنتازیای ئەم و ئەو بگرێت کە هەر لەناو ڕووداوەکانیش نەبوونە، بە مەزندەی یەکلایەنەی خۆیان، ڕووداوەکانیان بە داوێ وەکردووە. هەروەک چۆن پێشتر لە بەرانبەر چۆنیەتی ئاشبەتاڵی ساڵی ١٩٧٥ دا، هەمو هۆکارەکان و سوچی ئەو کارەساتەی بۆ تاکەکەس (بارزانی مستەفا) گێڕاوەتەوە، بە هەمان میتۆدی بیرکردنەوەی خۆی، تاکە کەس "مام جەلال" بە دامەزرێنەری "ی ن ک" دەناسێنی، کە تا ڕادەیەکی زۆر، پێکانی نیشانەیەکی زەقی ڕەوتی بزاڤی کوردایەتییە، سیمای ئاشکرا و زاڵی سەر ئەو ڕێبازەیە، هەمیشە هەر لە بنەڕەتەوە تاکە سەرکردە بڕیاردەری هەموو شتێک بووە، بە فەرهەنگی حیزبایەتی ناو کوردەوارییەوە دەقیگرتوە. دەبوو کاکی برا بە پێی ئەو شارەزایی و ئاشنابوونەی بە سەرەتا، دەمی گۆڕانکارییە جەوهەرییەکانی بەر ڕەوتی جوڵانەوەی سیاسی، جڤاتی، فیکری و ئابووری کە لە دونیادا کەوتبوە هەنگاوهەڵگرتن، ڕاشکاوانە لەو بیرکردنەوە سەرەتایە هەڵوەستەی بکردایە و ڕچەی ئەو تەقلیدە کلاسیکییەی بشکاندایە، لە چاک و خراپ هەموو شتێک بۆ تاکە سەرکردە نەگێڕدرێتەوە، نەوەک هەر درێژەی پێبدرێت. دیارە جیهانی ئەمڕۆ و وەرچەرخانە بلەز و پێشهاتەکانی هەروا لە ختوخۆرایی، لە شەو و ڕۆژێکدا نەشونمایان نەکردووە، بەڵکو سەرەداوی ئەو بارودۆزە نوێیە لە ساڵانی حەفتاوە جۆزەرەی دەرکردووە و بەخۆکەوتوە، کەچی لەناو بزاڤی کوردایەتیدا، چ ئەوانەی بە هەڵکەوت و بە مەکرزیی لەوگۆڕە بونەتە سەرکردەی حیزبی، هیچ جۆرە نیشانەیەکی گۆڕان لە کەسایەتی و ناوەڕۆکی بیرکردنەوەیان سەری هەڵنەداوە.

هێشتا لەلای ئەوان هەر هەمان هەوار و بوارە. مەودای بیرکردنەوەی تێروتەسەل، باوەڕبوون بە خەڵک، پراکتیزەکردنی سەرەتاکانی دیموکراتییەت و داهێنانی میتۆدەکاری بە کۆمەڵ و بیرکردەوەی ناو ریزی ئێش و ئازارەکانی خەڵک، بە هەندزانینی راوبۆچونی دەرەوەی خۆیان، ئەوجا تاووتوێکردنی بارودۆزی دەرەکی لەتای تەرازوی ئەو کەرەستەیە، هێشتا بە شێوەیەکی بەرچاو نەکەوتوتە بەر کاریگەری رەوتی ئەو گۆڕانکارییانەی دونیاوە. لێرەدا پێش ئەوەی لەو باسە تەواوبین، بەپێویستی دەزانم لە باوەشی سەربردەی سیاسی خۆمەوە، بەو تێڕوانینەی خۆم سەبارەت بە سەرهەڵدانی "ی.ن.ک" تۆزێک بۆ دواوە بگەڕێمەوە. یەکێتی نیشتمانی کوردستان وەک هەمان ئاکار و سوخەتی ئاسایی بەردەستی هەڵبژاردەیەکی دەرەوەی هەناوی کۆمەڵی کوردی و لەسەر ویست و دەستپێشکەری تاکە کەسی لە دایک بووە، بە هاندان و پشتیوانی هێزی هەرێمیی لە تارماییدا، تارادەیەکی زۆر دوور لە پێداویستە بەرجەستەکانی هەڵگیرساندنی خەباتی چەکداری، بێگوێدانە واقیعی مەیدانی ناو کۆمەڵانی خەڵک، بگرە تەنیا بە هەبوونی فاکتەری سیاسەتی دڕندانەی رژێمی بەعس بەرانبەر کورد، پارسەنگی دەستکردانەی بۆ راستکراوەتەوە، ئەگەر هەڵە کوشندەکەی رژێمی بەعس لە داگیرکردنی وڵاتی کوێت نەبوایە، ئەوە تێکڕای ئەو خەبات، بزاڤە چەکدارییەیش بۆ بەر سێبەری بەرژەوەندییەکانی گەمەی سیاسی، بۆڕبۆڕێنی دەسەڵاتی نێوان داگیرکەرەکانی کوردستان رێچکەی گرتبوو.

ئەرکی نەوشیروان بوو لەو فرسەتەدا، راشکاوانە گرێکوێرە شەتەکدراوە پڕ مەرگەسات و قوربانییە بێشومارەکان بکاتەوە. بەڵام مەگەر هەر خۆی بزانی بۆ قورقەپی (بێدەنگی) لێ کردوون. بەڵێ دامەزراندنی "ی.ن.ک" بە هەمان کاراکتەر و کەرەستەی دروستکردنی کۆمەڵەوە بووە، لە کەشوهەوای ئا.: بەتاڵی خەبات و شۆڕشی چەکداری چواردە ساڵەدا. کەچی کۆمەڵە لە پێودانگی هەڵوەشاندنەوەی رەوتی مەکتەبی سیاسیی (پ.د.ک)ی ناسراو بە (جەلالی) سەری هەڵدابوو. بە کورتی هەر لە دامەزراندنی کۆمەڵە تا رادەیەکی زۆر کە لە هەمان کەرەستەی پڕ فەشەل لە ژیانی سیاسی و سەرباری هەندێ سەرەداوی روانگەی بیرکردنەوەی کۆپیکراو و لاساییکەرەوە، بووە. ئەوجا دامەزراندنی "ی.ن.ک" بە هەمان میتۆد و هەمان کەرەستە، وەک چیراوکەیەکی ناو بازنەی بۆشی بێکۆتایی و هەتا هەنووکەیش ئەو گەڕەلاوژێیە درێژەی هەیە. کە مەدایەکی زۆر ئەزموونی سروشتی دیموکراتییەت، ئازادی پێ تەنگەتاو دەکرێ، بەبیانوی بەڕانگژبوونەوەی وێنە ناشیرینەکانی ئەزموونی دەسەڵاتی کوردی، یاری بەتێکڕای دۆزە چارەنووسسازەکانی کوردەوە دەکرێ. چونکە سەیرکەن، بە هەمان کەرەستەی سەقەتی تژی لە دیاردەی دزێوی گەندەڵی، بەڵام داپۆشراو بە هەندێ دروشم، وەک ئەوان نەبوون لەناو دەسەڵاتی

حیزب، بەتایبەت لەشاخدا، بەشی شێریان هەبوو، لە گەورە و بچوکی بڕیار، دانان، دامەزراندنەکان هاوبەش، مەسئولی سەرەکی بوون. ئێستا کە بەم مۆدیلە رەنگکراوەی هەمان ناوەڕۆک، رۆڵەکانی خەڵکی کورد بۆ ئەزموونێکی دیکەی نادیار هەڵدەرێژن..!

نەوشیروان هەروەک چۆن لە باسکردنی دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداریی "شۆڕشی نوێ"دا هەر جارەی شتێک دەڵێ، بەبێ ئەوەی ئاگای لە پەیڤەکانی پێشەوەی خۆی بێت. لە لاپەڕە ۹۲دا دەیەوێ خوێنەر بخاتە سەر بڕوای ئەوەی کە بڕیاری هەڵگیرساندنەوەی ئەو شۆڕشە بۆ نامەیەکی دکتۆر خالید، ئەوجا نامەیەکی ئارام دەگەڕێتەوە. ئەگەر نەوشیروان وەک خۆی نووسیویەتی: (ئیلتزامی ئەخلاقی و ئەدەبی) بە کۆمەڵەوە بەهەند هەڵبگرتایە، ئاوا چۆن بە دوورودرێژی باسی ئەو نامەیەی "دکتۆر خالید"ی کردوە، کە خستوویەتیە پێشەوەی ناوهێنانی نامەی "ئارام"ەوە، دەبوو کورتەیەکیشی لە نامەکەی ئەو سەرکردە مەیدانییە لەخۆبردووەی کۆمەڵەی بۆ خوێنەر تۆمار بکردایە..!

بە پانتایی لاپەڕەکانی نێوان (۷ هەتا ٦١) نەوشیروان هەوڵی داوە بە هەموو شێوەیەک قسە و باسەکانی رژێمی بەعس و سەرکردە دیکتاتۆرەکەی بکاتە پشت و پەنا و پاساوی گۆڵکردن لە ماڵی بارزانی و سوچداردەرهێنانی یەک لایەنەی ئەو سەرکردایەتییە لە تێکڕای بەسەرهاتەکان و ئەنجامەکەی لە کارەساتی ئاشبەتاڵدا. وەک ئەوەی سەددام و رژێمەکەی خاوەنی پێشبینی، راستی دەرکەوتنی بۆچوونەکان و سەرچاوەی پشت پێبەستنی شۆڕشگێڕان بن! بەڵام مێژوو هەم گەمژەلی ئەو "سەددام"ەی دەرخست، لە بێهودەبوونی بۆ تەفروتوناکردنی نەتەوەیەکی ستەمدیدە و بزاڤە رزگاریخوازەکەی، هەمیش رووی ناشیرینی سیاسەتە دیماگۆگیەکەی دەرکەوت لە رەوتی سیاسەتی گەمە فاشیلانەکەی نێودەولەتیدا، کە لەپێشەوە بە لەناوچوونی خۆی و نادروستیی بۆچوون و بەندوباوەکانی بە کۆتا هات.

(کۆمەلە ریکخستنیکی پتەوی دامەزراندبو..)ل/٤١. ئەم دەستەواژەیە و پێچەوانەکانی کە لەدواتر دەینووسمەوە، بەڵگەیەکی بەرچاوی ئەو شێوازەی نەوشیروانە لەونووسینەدا، کە بەبێ ئەوەی زەحمەت بداتە بەر خۆی، تەنیا بە ڕستەیەک باسی ناوەڕۆکی ئەو جۆرە ریکخستنە پتەوە بکات و بەڵگە بۆ ئەوقسەیە بهێنێتەوە و لەبەرانبەر دەرئەنجامەکانی دانەمێنێ! کەچی وەک ئەوەی لەبیری چوبێت لە لاپەڕەکانی پێشەوەتر نووسیویەتی:

(کومەلە ریکخستنیکی بچوک بو...(ل/٣٢) و لەبەرئەوە وەکو حیزبی سیاسی خەلک نەیان ئەناسی. (ل/٣٢) و ریزەکانی کومەلەش لەبەریەک ترازابو... (ل/٣٢).

راستە بەرزونەویکردنی کۆمەڵە زۆرتر بەپێی ئەو باسوخواسانەوە بووە کە خۆی مەبەستی بووە، بەڵام بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرن بۆئەوەی کە ناوبراو لەوێ ڕۆژاندا نەک هەر پێوەندییەکی ڕێکخراوەیی بە کۆمەڵەوە نەبووە، بگرە لە دوورونزیکەوە بە چالاکی، دۆزی ناوەکی و دەرەکی کۆمەڵە ئاشنا نەبووە.

پێکهاتەی کۆمەڵە، بەشێوەیەکی سەرەکی لە خوێندکارە بزێوە چەپە هەوادارەکانی باڵی مەکتەبی سیاسیی کۆن لە شارەکانی بەغداد، سلێمانی، کەرکوک، هەولێر، خانەقین پێک هاتبوو. سەرەتا تاکوتەرا کرێکار، پێشمەرگەی هەژار و نەداری ئەو ڕەوتەی تێکەوتوە، هەتا ڕۆژانی هەڵگیرسانەوەی شەڕی نێوان کورد و ڕژێمی بەعس لەو قاوغە بەرتەسکە خولاوەتەوە. لەگەڵ هەنگاونانی کادرە ئەساسی و دەسرازەیەک لە ئەندامانی، بۆ چونەشاخ و ناو ڕیزەکانی کۆمەڵانی خەڵک لە شۆڕشی ئەیلولدا، هاوڕێیانی کۆمەڵە لەو جغزە تەسکە چونەتە دەرەوە، بە شێوەیەکی زۆر نهێنی و لە سێبەری پێشمەرگایەتیدا، چالاکانە بەناو خەڵکدا بڵاو بوونەتەوە و بە خەباتی شۆڕشگێرانەی فیعلی ناسیار بوونە، تاکو لەسەردەستی نموونەیەکی بەدەگمەنی وەک "ئارام"، بە هاوشانی یەک چەپکە هاوڕێی لەخۆبردوو، بە دوای بەجێهێشتنی ڕێکخستنەکان لەلایەن سەرکردەکانییەوە، سنگیان داوەتە بەر گرتنەوەی کۆمەڵە و بە هەر شێوەیەک بێت وزەیەکی نوێی وەبەرخۆدانیان بەبەردا کردوتەوە. بەدڵنیایی دەیڵێمەوە، ئەگەر ئەو دەستپێشخەرییەی "ئارام" و هاوڕێیەکانی نەبوایە، نە نەوشیروان دەهاتە بن دەواری ڕێکخراوەیی ئەو کۆمەڵەیە، نە "یەکێتیی نیشتمانی کوردستان"یش دەبووە خاوەنی ئەو لەشکرە پرگیانبازییە، بگرە کۆمەڵەیش لەوپەڕی دەستپێوەگرتنی لەلایەن هەریەکێکی دیکەوە، هەرگیز لە ئاقاری هێڵەکانی بزووتنەوەی ناو یەکێتی و خەتی گشتی تێپەڕی نەدەکرد. کە نەوشیروان هەتا دەمی پێش زانینی هەواڵی شەهیدبوونەکەی "ئارام"، بە چەند وشەیەکیش بێت باس لە ڕۆڵی جوامێرانەی ئەو مرۆڤە ناکات..!

بێگومان خاڵی هەرە لاوازی کۆمەڵە و گەشەنەکردنی هەتا ڕۆژانی بەشداریکردنی لە شۆڕشی ئەیلولدا، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەو ڕێکخراوە لە دامێنی ئەزموون و ئەزمەی ناوەکی ئەجندای سەرکردایەتی ڕەوتی "م.س" لە دایک ببوو. هەر لە یەکەم هەنگاوەوە هەوێنی یەک تێکەڵەی ناکۆک لە ڕووی بیرکردنەوەکانی ئەوێ ڕۆژی و هەمان کەرەستەی ئەو ئەزموونە خامۆشە بوو. ئەوجا تەمومژی بەرنامەی کاری کۆمەڵە، ڕەدوکەوتنی مۆدەی چەپڕەویی سەردەمەکە، هۆکارێکی دیکەی بارودۆخی ناهەمواری ئەو ڕێکخراوە بووە. بەڵام "ئارام"، کە خۆی لە دەرەوەی ئاقاری کۆمەڵەدا، مرۆڤێکی بەهرەمەندی بلیمەت و بوێر بوو. دەبوو نەوشیروان کە خۆی یەکێک بووە لەو کەرەستەیەی سەرەتایی

دامەزراندنی، بە بەرچاوڕوونی و مۆدرینانە، ئاوڕ لەو ڕاستییانە بداتەوە، نەوەک هەر بەتەنیا لەیەکترازانی ڕێکخستنەکانی بۆ فاکتەری سەرکردایەتییەکەی بگێڕێتەوە..!

نەوشیروان دەستخۆشانە پەنجەی لەسەر خەمساردیی مەسئولەکان داناوە لە تۆمارنەکردنی یادەوەرییەکانیان کە بە زیانێکی زۆر گەڕاوەتەوە و بەشێکی زۆر لە کونج و کەلەبەر و کۆستەکانی خەباتی نەتەوەکەمان بە شاراوەیی ماونەتەوە. لێرەیشدا بەتەنیا باسی ئەو نامیلکەیە دەکات کە دکتۆر مەحمود عوسمان لەوان ڕۆژانی دوای ئاشبەتاڵی ١٩٧٥دا نووسیویەتی و لە سنوورێکی هێجگار تەسک بڵاو بووتەوە. ناوەڕۆکی نامیلکەکەیش زۆرتر لە عەلەیی سەرکردایەتی بارزانی نووسراوە و جێگای هەڵوەستەکردنە.

### شۆڕشی ئەیلول و هەڵدانەوەی هەندێ باسوخواسی گۆمەڵە

(لە بەینی بارزانی و شادا، هیچ جورە ڕیکەوتنیکی سیاسی یا قانونی نەبو..)ل/٣٢

لە پانتایی پانۆرامای نووسینەکەی نەوشیروان سەبارەت بە "بارزانی مستەفا"وە، هەمیشە هەوڵیداوە یەکلایەنە تێکڕای خەوشەکانی بزاڤی سیاسی و چەکداریی کورد هەر تەنیا بۆ بارزانی بگێڕێتەوە. وەک ئەوەی بەدرێژایی کاروانی خەباتی چەکداریی کۆن و نوێی کوردان، هەر لە بەینی سەرکردایەتی شۆڕش و ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان، ڕێکەوتننامەیەکی سیاسی و قانونی نەبووە. قەدوباڵای سەرکردەکانی دیکە بەرێکەوتنی لەم جۆرانە دەبریقێتەوە! بێگومان ئەگەر نەوشیروان بە شێوەیەکی گشتگیرانە بۆ ئەو خەوشەی بزاڤی کوردایەتی ئەسپی مەبەستەکانی تاو بدایە، هەنگاوێکی ڕچەشکێنی لە مێژووی ڕێبازی کوردایەتی تۆمار دەکرد، بەڵام بەم یەکلایەنییە، تا ڕادەیەکی زۆر لە نرخی دەستنیشانکردنی ئەو خەوشەی هەمێزی سیاسەتی کوردانی کاڵ کردوتەوە.

لێرەدا بەرجەستەبوونی سیاسەتی نەبوونی هیچ ڕێکەوتننامەیەکی ئیمزاکراوی یاسایی لەنێوان سەرانی حیزبی کورد، بە دەزگا ئیستخباراتییەکانی دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان، دەمانباتەوە سەر ئەوەی بڵێین؛ لەو ڕۆژەوە جولانەوەی نەتەوەیی و سیاسی کورد لە هەموو پارچەکانی کوردستان کەوتوتە سەرپێیانەوە، هەر لە ئیمارەتەکانەوە، بگرە تا دەگاتە ڕاپەڕین، بزاڤە چەکدارییە زۆرروزەبەندەکان، وەک بنیشتە خۆشە بە میرات بۆ سەرانی حیزب و دەسەڵاتدارانی سیاسەتمەداری کورد ماوەتەوە، باکگراوندێکی پەردەئاسای خراپی بۆ ڕەوتی تێکۆشانی کوردان داداوەتەوە و هەریەک لەو سەرکردانە کەموزۆر دووپاتیانکردوتەوە. واتە پێوەندی ژێربەژێرەکی لەگەڵ داموەزگای داگیرکەرانی کوردستان خەونی شەووڕۆژیان بووە. بەبیانوی بەدەستهێنانی دەسکەوتی مادی و مەعنەوی.

ئەوجا جۆری ئەو پێوەندییانەش، بەکێ و چ جۆرە دامودەزگایەک! خاڵێکی دیکەی رووی ئەو جۆرە پێوەندییە پڕ لە گومانانەیە، کە هەمیشە بە چەندان کەڕەت زێتر لە دەسکەوتەکان، بەزیان بۆ کورد گەڕاوەتەوە. هەتا پێش دامەزراندنی حکومەتی هەرێمی کوردستان، گەورە و بچوکی حیزب و گروپە کوردە ئۆپۆزیسیۆنەکان، چ بە ئاشکرا و چ بە پەنادزە، یان بە مامەحەمەییکردنەوە بێت، راستەوخۆ ئەو پێوەندییانەی نەوشیروان، بەو ناوە ناویان دەهێنێ. لەگەڵ دەزگا سیخورییەکانی وەک موخابەرات، ئیطلاعات، میت و ساواک، شتی لەم جۆرەی رژێمەکان بووە. بگرە ئەو دەزگایانە لە زۆربەی حالەتاکاندا , هەوڵیانداوە بە شێوەیەک لە شێوەکان رۆڵی بەرپرس بگێڕن، چونکە خودی ئەو پێوەندییانە بە ویست و ئارەزوی بەرژەوەندیی هاوبەشی یەکسانەوە نەبووە، چ جای بە پرس و رای تێکڕای حیزب و خەڵکەوە بووبێت! واتە پێوەندی پەراوێزییانەی دەوڵەتێکی خاوەن توانا و سیستەمی حوکمڕانی بەرچاو بووە لەگەڵ سەرکردایەتی حیزبی جوڵانەوەی نەتەوەیەکی ستەمدیدە و لاواز و بێدەرەتانی وەک کورد. بۆیە دەبێ ئەو پێوەندییانە چۆن بووبێت، ئاوا باس بکرێن کە پێوەندیی ژێرەکی و پەنادزەی کۆڵانە نادیارەکان بووە. نەوشیروان کەموزۆر ئامادە نییە خۆی لەو راستییانە بدات، ئیتر نازانم رێکەوتنی سیاسی و قانوونی لەکوێ!

( ئیران ... هەمیشە خەریکی تیکدانی هەولی چارەسەرکردنی بە ئاشتی مەسەلەی کورد بو.)ل/٣٢

نەوشیروان بە شێوەیەکی سیستەماتیکی هەوڵیداوە گۆڕەپانی سیاسەتی سەرەتاپای پاکتاوکردنی کورد لەلایەن رژێمی بەعس، کاڵ بکاتەوە و یەکلایەنە ئۆباڵی چەپەڵانەی هەڵگیرساندنەوەی شەر لەگەڵ نەتەوەی کورد لە کوردستانی باشووردا لە کۆڵ ئەو رژێمە سووک بنوێنێ و لە ملی هۆکاری دیکەی بهاوێ کە کەس نازانێ بۆچی؟ کەنارگیرکردنی یەکلایەنەی بەعس لە تراژیدیای مانۆڕی نێودەوڵەتیی نێوان زلهێزەکانی ئەوێ رۆژێ، کە رێکەوتنە شوومەکەی جەزائیری ساڵی ١٩٧٥ی لێ کەوتەوە، بە هەر لۆژیکێک بۆ ئەو گرێکوێرەیە چەقی بەستوە کە تەنیا لە سەرچاوەی رقوقینەوە ئاو دەخواتەوە.

(ئاشتبونەوەی عیراق و ئیران جەزرەبەیەکی کاریگەری لە کورد دا. بەعس ئەو هەلەی قوستەوە بو جیبەجی کردنی پلانەکانی تەهجیرو تەعریب و تەبعیس..)ل/٣٥

وەک ئەوەی پەرێزی بەعس , پێشتر و هەتا دەمی ئەو رێکەوتننامە شومە، هەلی لەم جۆرەی نەبوبێت، بەم رێکەوتنە هەڵگرتەی بگر و بکوژرێی بۆ هەڵکەوتوبێت. نەوشیروان بەم قسانەی سەبارەت بە درووێنەکردنی سەرووەرییەکانی خاکی کوردستان و رۆڵەکانی، بە سووک و سەلیمی بۆ بەرژەوەندی رژێمی بەعس بە حەپەلوش داوە و وەک ئەوەی شاڵاوەکانی؛ گرتن و راونان، ئازار و ئەشکەنجەدان، دەرکردنی دەیان هەزار کوردی فەیلی لەسەر زێد و ناو ماڵوحاڵی خۆیان لە نێوان ساڵانی ١٩٧١ هەتا ١٩٧٤ هیچ نەبوون!

یان پاکتاوکردنی ڕەگەزی دانیشتوانی کورد لە ناوچەکانی ژەنگار و تەلەعفەر و دەوروبەری موسڵ و کوردە و گوندنشینەکانی کەندێناوە و قەراج لە ناوچەی مەخمور لەساڵی ١٩٦٣دا، کار و کردەوەی دڕندانەی بەعس نەبوون! دەرکردن و ڕاگوێزانەوەی توخمە کوردەکانی کۆمپانیای نەوتی کەرکوک، خانەقین و دوبز بۆ دەرەوەی ئەو شارانە و هێنان و دەمەزراندنی عارەب لە شوێنەکانیان لە چ هەڵێک بەعس پیادەی کردبوو! پاکسازی و بژێرکردنی سوپا و هێزە ئەمنییەکان و وەزارەتە گرنگەکانی عیراق، بە هەوێنی چ ڕێکەوتنێکی کورد هەلی بۆ بەعس سازاند کە ڕاستوچەپ بکەویتە قەلاچۆکردن و قڕکردنی توخمی کورد لەو شوێنانەدا! ئیتر بۆ دەبێ نەوشیروان ئاوا لە ئاست ئەو ڕەوشە تاریکەی بەعس، بەر لە ڕاستییە مێژووییەکانی ڕووی ڕەشی بەعس بگرێ و بەرچاوی خوێنەر لێڵ بکات، بەوەی کە بەعس هەتا پاش ئەو ڕێکەوتنە بەدەستنوێژ بووە و لەگەڵ ئەو ڕێکەوتنە فرسەتی بۆ هەڵکەوتوە! هەروەها بۆ ئەو هەموو پێزانینەی خۆی سەبارەت بە پراکتیکی وەحشیگەرانەی بەعس هەر لە یەکەم ڕۆژی هاتنە سەر حوکمەوە قورقەپ خستوە! دیارە خواستی نەوشیروان تەنیا و تەنیا بۆ سوچداردەرهێنانی لایەنی سیاسی کوردی نەیاری خۆی بووە، بەبێ ئەوەی منەتی بەوە بێت کە ئازاری ڕوحی خەڵک دەدات کە قوربانی دەستی ئەو بەعسە بوون. بەم لاسارییەی ئازارێکی زۆری گیانی خەڵکی کورد دەدا و زیانێکی گەورە بە ڕەوتی ڕاستودروستی هەرجۆرە لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی دەواری چیرۆکی خەباتی نەتەوەیی دەگەیەنێ. بێگومان ڕوانین و هەڵسەنگاندنی گشتلایەنەی دۆزی پێوەندییەکانی بزاڤی کوردایەتی، بە تایبەت چەکدارییەکەی، خزمەتێکی گەورە و بە کەڵک بە داهاتووی نەتەوەکەمان دەگەیەنێ. دیارە ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان بۆ مسۆگەرکردنی لەپێشەوەی بەرژەوەندییەکانی خۆیان، نکۆڵییان لەو پێوەندییە نەکردوتەوە کە هەمیشە بە قازانجی ئەوان گەڕاوەتەوە، کە نەوشیروان لە دووروونزیکەوە باسی ناکات، چونکە خۆیان لایەنی بەهێز، کورد لایەنی لاواز و ناچار و دەستەپاچە بووە. سەرانی حیزبی کوردیش بەپێی عەقڵپێداشکانی خۆیان و بەرژەوەندییەکانیان، بەپێی ئەمری واقیع، هەرگیز لێی نەسڵەمینەتەوە لە هەموو پێوەندییەک و لە هەر ئاستێکدا، بەو ئامانجەی کە قازانجی لێ وەرگرن و بەخەیاڵی خۆیان دۆزی کورد بەرەو پێشەوە بەرن کە نەوشیروان نایەوێ بەلایەوە بچێ، دەرکەوتەکان تاوتوێ بکات.

**بێهودەیی رۆڵی ئارام..!**

ئەوشیروان بەدوای پشتگوێ خستنی ئاشکرای رۆڵی "ئارام" و هاوڕێیەکانی لە گرتنەوەی رێکخستنەکانی کۆمەڵە و سەرلەنوێ بەسەرپێخستنەوەی ئەو رێکخراوە، دواتر زۆر بە ناچاری و بە شێوەیەکی تەماوی ئەو وشانەی تۆمار کردووە.

(هەندێ لەو ئەندام و کادرانەی لەم شالاوە دەربازبوبون. هەولیان دا ریکخستنەکە بگرنەوە. بەلام هەندێ لەوانەش گیران وکارەکەیان سەری نەگرت.)ل/٦٤

ئەوشیروان بەبێ ئەوەی زەحمەت بداتە بەر خۆی و بە راستییەکان ئاشنابێت، تاکو باسوخواسەکان بە روونی بگێڕتەوە، بۆئەوەی هەرهیچ نەبێت، بوارێکی ئاسایی بخوڵقاندایە، بۆ پێداچونەوەی مێژووی سەروەرییەکانی کۆمەڵە. دوایی هەر لە خۆیەوە دەڵێ (بەلام هەندیک لەوانەش گیران و کارەکەیان سەری نەگرت) بەبێ ئەوەی بەڵگەیەک بۆ گێڕانەوەکانی بهێنتەوە، یان هەر هیچ نەبێت بە ڕاشکاوی ناوی ئەو هاوڕێیانە تۆمار بکات کە ئەو (هەوڵدانە) یان کردووە و ئەو (هەندێ)یە کێ بوون کە گیران، بۆ کارەکەیان سەری نەگرت! ئەدی نازانم ئەوشیروان هاتە سەر بەرهەمی کێ و چ کۆمەڵەیەکی خرا بەردەستی، ئەو کۆمەڵەیە لە ئەفسانەی سەرپشتی چ کەشتییەکەوە هەڵقوڵا!

دواتر هەر خۆی بە ناوهێنانی ناچارییانەی "ئارام"، نادروستی ئەو خەملێدانەی خۆی دەردەخات، کە نووسیویەتی:

(شاسوار جلال کە دوایی بە کاک ئارام ناوی دەرکرد، لەوانە بو بەر دەس نەکەوت بو، شارەزای ریکخستن و زوری ئەندامەکان بو. هەر زو هەولیکی زوری دا بو گرتنەوەی پاشماوەی ریکخستنەکەو، ریکخستنەوەی.)ل/٦٤

ئەگەر یەکێک خۆیشی لەناو مەسەلەکان نەبوبێت و لە بێئاگاییش بەسەر ئەم باسوخواسە گرنگە بکەوێ، ئەوەک هەر ناهەموارییی هۆنینەوەکانی ئەم گێڕانەوەی بۆ دەردەکەوێ، بگرە لەوەیش دەپرسێ، بۆ قسەکانی نێوان ئەم دوو دەستەواژەیەی سەرەوە لەگەڵ یەکتری کۆک نایەنەوە؟ کە بەندە ئەو دەمە یەکێک بووم لەو هاوڕێیانەی، سەرباری ئیعتراف لەسەرکردنم لەلایەن چەردەیەک لەوانەی گیرابوون و هۆی نەگیرانیشم، ئەوە بوو کەسیان بەتەواوی نەیاندەزانی ناوی باوک و باپیری من چییە. هەر یەکەیان بە ناوێکەوە بۆمنیان تێکۆشی بوو. بەندە لە بەشێکی سەرجەلەی یادەوەرییەکانی خۆمدا، بەتێری ئەو قەزاوەتەم گێڕاوەتەوە، کە ئەو دەم لەسەر راسپاردە و پەیامی ئارام لە سنووری چالاکی خۆم لە ناوچەکانی هەولێردا، زۆر بە ئەسپایی و لە دووری رێکخستنەکانی رەسمیی هەولێر، بە هاوکاری و بەشداری چەند هاوڕێیەکی تاکوتەرا، شیرازەیەکی دیکەی رێکخستنێکی سێبەرمان دروست کردبوو، کە بەدوای گیران و لەبەریەکتر هەڵوەشانەوەی ئەو

ڕێکخستنەی پێشتری هەولێر، بەمرووری زەمەن سەرتاپای هاوڕێ باوەڕپێکراوەکانی شیرازە پچڕاوەکانمان یەکانگیر کردەوە. بەبەشێکی زۆری ئەو ڕاستییانە ئاگادارم و ناتوانم لە دەستکاریکردنیان بێدەنگەی لێ بکەم.

بەراستی ئەو جۆرە باسکردنە هاکەزاییە، بێ سەرچاوەیەی نەوشیروان سەبارەت بە ڕۆڵی ئارام، لە ڕۆژگارێکی سالانی دژواری سەختی توانا پڕوکێنی نێوان کۆتایی ١٩٧٥ هەتا ١٩٧٧، تەنیا مایەی ئازاردانی ویژدانی زیندووە و یاریکردنێکی زۆر بێمنەتانەیە بە قوربانی و ڕوحی نەمری دەیان سەربازی ون، کە گیانی خۆیان کردە سووتەمەنی نەکوژانەوەی تروسکایی کۆمەڵە و ڕزگارکردنی لەسەرەمەرگدا.

ئەو ڕۆژگارە مەگەر هەر بە یەکێکی بەدەگمەنی وەک ئارام و ئەو دەیان هاوڕێیە تاکوتەرایانە هەزم کرابێت، کە ڕوح و جەستەی خۆیان کردە قەڵغانی پاراستنی بەردەوامی کۆمەڵە. کەچی لە باروودۆخێکی هێجگار ئاسایی و ژیانی ئازادی و هەڵهاتنی جۆزەرەی سەرکەوتن، لەلایەن خەڵکانی دیکەوە بۆ مەرامی سەرچیخچونی سیاسەتکردن و چاکەدانەوەی ئەو مێژووە پڕ سەروەرییە، بەڕۆژی ڕوناک و لەپەناقەلای یەک لەشکری شەهید، ئەو کۆمەڵەیە توانرایەوە.

ڕۆڵی لێهاتوویی گیانفیداکارانەی "ئارام" لەوەدا بوو، کە بە پێچەوانەی خەڵکانی دیکە، لە پێش هەموو شتێکەوە بەتەنگ ڕزگارکردنی خۆیەوە نەبووە. سەرباری ناتەواوی جەستەیی و ئەو باروودۆخە دۆزەخ ئاسایەی ئەوێ ڕۆژێ، سینگی داوەتە بەر مەسئولیەتێکی مێژوویی و بەوپەڕی جورئەتی شۆڕشگێرانەوە لەپاڵ هاوڕێ دلێرەکانیدا، سەنگەری موقاوەمەتی گەرم کردوە و دوور لە بارەگای گەرموگوڕ و هێزی زۆروزەبەندی پارێزگاری و دوور لە هەر جۆرە کۆمەکێکی ناوەکی و دەرەکی، لەناو جەرگەی کۆمەلانی خەڵک، بەپشتیوانی مەفرەزە سەرەتاییە رووتەڵەکانی کۆمەڵە، وانەی کۆڵنەدانی گوتوتەوە. ئەوەیش تەنیا لەپێناوی ڕزگارکردنی کۆمەڵە، گەرمکردنی سەنگەری موقاوەمەت و بەجێنەهێشتنی هاوڕێ لێقەوماوەکانی لە بێ سەرکردەیی. دەنا دەرچونی "ئارام" بۆ دەرەوە و ڕزگارکردنی پیستی خۆی، یان خۆ مەلاسدانی لە بنکەیەکی دوورەدەستی مەترسییەکان زۆر ئاسان بوو. چونکە هەم زمانزان و ڕۆژنامەنووسێکی دونیادیتە بوو و خاوەن هاوسەرێکی هاولاتی ولاتێکی لایدە (بێگانە) بوو، هەمیش لەپێش گیرانی ئەندامانی کۆمەڵە، هیچ جۆرە سەریەشەیەکی لەلایەن دامودەزگا ئەمنییەکانی ڕژێمەوە نەبوو، بۆ سەفەرکردنی دەرەوە. کەچی نەوشیروان بۆ هەر مەبەستێک بێت، پەردەپۆشی لەو ڕۆڵەی "ئارام" کردووە. بەلام بۆ باسکردنی کۆبوونەوە و چالاکیەکانی فلان و فیسار لە شوێنەکانی وەک ئەورووپا و شام، کە دوور لە هەر جۆرە ترس و

راونانێک و تۆقاندنی دەزگا ئەمنییەکان بووە، زۆر بە دووروودرێژی شتەکان دەگێڕێتەوە. لە کاتێکدا نەوشیروان ئەو شتانەی بڵاو کردوتەوە، دەیان ساڵ بەسەر رووداوەکان و شەهیدبوونی "ئارام" تێپەڕیوە، کەچی ئێستاکەیش بە شێوەیەکی شیاو، باس لە رۆڵی قارەمانانەی "ئارام" ناکات، تاکو ئەرکی سەرشانی خۆی سوک بکات!

ئەو "ئارام"ەی، بووە مایەی سازدانەوەی رێکخستنێکی خاوەن سەدان کادر و پێشمەرگە بۆ کۆمەڵە، یەکێتی و خەباتی چەکداری و کەسانی دیکە هاتنە سەر ترۆپکی بەرهەمەکانی. بەراستی کەسایەتی کاریزمایی "ئارام"، داستانی جوامێرییەکانی وەک ئەستێرەیەکی گەش بە ئاسمانی سەرکەوتنەکانی خەباتی شۆڕشگێڕی ئەوزەمان، کوردایەتی، مرۆڤایەتی دەجریوێنن و هیچ دەنگێک گەورەیی ئەو مرۆڤەی بۆ ناسڕێتەوە.

نەوشیروان لە کۆی باسی کۆمیتەی هەرێمەکاندا، ناوی هەموو ئەندامەکانی وەک خۆی نووسیوە، بەڵام دیسانەوە سەبارەت بە عوبدولرەزاق، وەک درێژەدان لە دەستکاریکردنی راستییەکان، بەبێ هیچ بەڵگەیەک نووسیویەتی:

(عەبدورەزاق پاش ماوەیەک لەگەڵیان تیک چوبو، هاوکاری لەگەڵ نەکردبون، بەلام سەرپەرشتی ئەو رێکخراوانەی کرد بو کە ناسی بونی.)ل/٦٤

هێشتا دوو لەو هاوڕێیانەی کۆمیتەی هەرێمەکان، سالار و مەلا بەختیار بە ژیان ماون، کە نەوشیروان ناوی هێناون. وەڵام دانەوە و راستکردنەوەی تەواوی هەڵوێستی خۆکێشانەوەی ئەو برادەرە بۆ ئەوان دەهێڵمەوە، بەڵام دەبوو نەوشیروان بۆ راستی قسەکانی سەبارەت بە تێکچوونی ناوبراو لەگەڵ کۆمیتەی هەرێمەکان و سەرپەرشتیکردنی ئەو رێکخراوانەی[35] کە گوایە ناسی بوونی. نەوشیروان هیچ روونکردنەوەیەک، یان ناو و سنووری ئەو رێکخراوانە دەرناخات.! من دڵنیام لەناو دڵ و دەروونی هەندێ مرۆڤ، بەتایبەتی لەناو هەندێ کەسایەتی کورد، بە یەک سوخەتی دواکەوتووی خۆ ناشیرینکردن فرچکی گرتوە، کە تژییە لە رقوقینە بەرانبەر هەتا هاوڕێ نزیکەکانی رۆژێک لە رۆژانی خۆیەوە. هەر ئەوەندە بەسە، رۆژێک رەخنەیەکت لێ گرتبێ و هەتا سەر وەک ئەو بیر نەکەیتەوە، هەمیشە کۆیلەی بیروبۆچوونەکانی ئەو نەبیت، ئیتر ئەو کەسە مەسئولە هەر ئەوەندەی گەرەکە کە دەسەلاتی بۆ دەخولقێ، بە رقێکی ئەستووری قەتماخەگرتوو، تەرووشک بەیەکەوە دەسوتێنن، هاوڕێ ماندوونەناسە رەسەنەکانی رۆژانی تەنگانە پشت گوێ دەخەن،

---

[35] ئەو دەمە رێکخراو لەناو شیرازەکانی رێکخستنی کۆمەڵە هێشتا دروست نەببوو، بەڵکو ئەوەی هەبوو هەمووی خەت و خنوتی پچرپچر بوو، بەتایبەت دوای پەککەوتنی کۆمیتەی کۆنی هەولێر لە ساڵی ١٩٧٧دا.

خەڵکێک قیت دەکەنەوە کە لە رۆژە سەختەکاندا، کێرفی خەباتکردنی دابەزیوە و تەنیا کاسبی ماڵی خۆی بووە.

### هۆکارەکانی دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری..

(نامەکانی لە د. خالیدەوە ئەهات. هەروەها نامەکانی کاک ئارام هەموویان پێ یان لەسەر دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکدار دائەگرت.) ل/٩٢

نەوشیروان لەمەڕ دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری و بڕیارلێدانەکەی، دیسانەوە سەرێکی ئەو بڕیارە چارەنووسسازە بۆ نامەکانی ناوەوەی کوردستان دەگێڕێتەوە. چونکە سەرکردایەتی "ی.ن.ک" زۆرتر بۆ بیر و خەملاندنی خۆیان ئەو بڕیارەیان لەلایەن خۆیانەوە دابوو. هەر لە یەکەم رۆژی لەدایکبوونی یەکێتییەوە، خەباتی چەکدارییان کردبووە پەیامی جاڕدان و ئاشکرابوون. وەک ئەوەی نەوشیروان قسەوباسەکانی سەبارەت بە چۆنیەتی پێوەندی خۆی بە "مام جەلال"ەوە لەبیر چوو بێت!

ئەو دەمە رژێمی بەعسی سوری، نەیاری باوککوژەی بەعسی عیراقی بوو. لەو دەرفەتە بۆ کارتێک دەگەڕا بۆ گەمەکردنەکانی لەسەر گۆڕەپانی عیراقی، بەو مەبەستەی لە کۆی سیاسەتی هەرێمی، لەنێوان جەمسەرەکانی ئەوێ رۆژێی نێودەڵەتیدا، جێپێیەک بۆ خۆی ببینێتەوە و مامەڵەی پێبکات و لە کاروانی ململانێکانی لەگەڵ ئیسرائیل بە پلەی یەکەم بە سوود بۆی بگەڕێتەوە. دیارە ئەو کارتەیش لەو رۆژەدا، کارتی هەرزانبەهای کورد بوو، کە بتوانن لە سێبەریدا بە مەرامە تایبەتییەکان بگەن. ئەوەبوو گلۆپی سەوزیان بۆ سەرانی حیزبی کوردی کوردستانی باشوور و باکور هەڵگیرساند، کە هەندێ لە رێکخراوە فەلەستینییەکان رۆڵی کارئاسانییان تێدا بینی. لەلایەن یەکێتی لەپێشەوە و پاشان پارتی "قیادە موقتە" ئەو فرسەتەیان قۆستەوە و بوونە بەشێکی بەشداری ئەو سیناریۆیە نوێیە و گەمەی هەرێمیی و نێودەوڵەتییان لەژێر دەواری شرۆڵی کوردی بەگەڕخستەوە.

دیارە سەرەڕمەکانی ئامانجی رژێمی سوری لەو گەمەیەدا، چەند سەرە بووە، هەروەک لە ئەنجامەکانی دەرکەوتوون. سورییەکان لەپاڵ ئەوەی گەرەکیان بوو لە پەنای کارتی کوردەوە، پیلان و هەڕەشەی شەڕانگێزی بەعسی عیراق لە خۆیان بەدوور بگرن و کورد بکەنە قەلغانی پاراستنی خۆیان، ئەوجا لە ئەجندای سیاسییانەوە ئەوەیان پێشبینی کردبوو، کە رۆژێک لە رۆژان قوربانییەکانی نەتەوەی کورد دەکەنە دیاری، دەسکەلای سەوداکردن لەگەڵ رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان، هەروەک لەگەڵ تورکیا بەرۆژی ئاشکرا کردیان، هەروەها لەسێبەری هەنگاوی بەپەلەی دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری

لە کوردستاندا، رژێمی سوری زەمینەیەکی سەرلەنوێی بۆ شەڕی بێهودەی نێوان یەکێتی و قیادەی موقەتە رەخساند. سەرلەنوێ تۆوی ئەو پەتا مەرگەساتەی بۆ کورد کردەوە بە دیاری.

مەیدانی بیانوهێنانەوەکانی نەوشیروان بۆ هەڵگیرساندنەوەی خەباتی چەکداری، ئەوەندە دەستکورتن کە نەیتوانیوە بە هیچ پشتوپەنایەک دەوڵەمەندیان بکات. تەنیا ئەوە نەبێت بە خشکەیی بە خوێنەر بڵێ، ئەوە بڕیاری دەرەکی و تاکەکەسی بووە. بە هیچ جۆرێک تخونی فاکتەرە بنەرەتییەکانی هەڵگیرساندنی تێکۆشانی چەکداری نەکەوتوە. کە دەبوو بەدوای ئەو ئاشبەتاڵە گەورەیەدا، سەرانی حیزبی کورد هەر هیچ نەبوایە بۆ بڕیارێکی وا چارەنووسساز، پرسە خەسوانێکیان بە کۆمەڵانی خەڵکی کورد بکردایە، تەنیا بۆ ئارەزوی ئەم و ئەو مل کەچ نەبوونایە. چونکە لە سەرتاپای مێژووی زنجیرە راپەڕینەکانی کورد بەگشتی، خەباتی چەکداری بەتایبەتی، هەمیشە لە زەمینەیەکی ناسروشتی، بەکەرەستەیەکی لاوازوچرووک، کۆپیکردن و چاولێکەری یەکلایانەی ئێرەوئەوێی دونیا شۆڕش بەرپاکراوە. لە ئەنجامدا دوژمنان گەمەی خۆیان لەگەڵ کردووە، داگیرکەران تەراتێنی مانۆڕەکانی بەرسێبەری بەرژەوەندییەکانیان ئەنجام داوە.

بەوڕەنگە، ئەگەرچی خەباتی رەوای خەڵکی کورد، لەبەرانبەر زوڵموزۆری داگیرکەرانی وڵاتەکەی، دەرکەوتەیەکی مێژووکرد بووە و کوردایەتی وەک جوڵانەوەیەکی سیاسیی خەڵک لە پێناوی مافی رزگاری و سەربەخۆییدا بووە، بەڵام هەمیشە ئەو خەبات و بزاڤە رەوایە، لە رێگای چەکدارییەوە تووشی بەتوشی چەندان گرێکوێرەی دوبارە و چەندبارەبوەوە بووە. هەرگیز ئەو خەباتە چەکدارییە وەک هەنگاوێکی تەندروست، سروشتی بەردەستی خەڵکی کورد هەڵنەقوڵاوە، دوور لە زروفوزەمەنی گونجاوی بەر رەوتی ئامادەباشیی فاکتەرە سەرەکییەکانی بووە.

**(مامجەلال نامەی بو کومەلە و خالید سعید و عەلی عەسکەری نوسی کە دەس بکەن بەناردنی مەفرەزەکان بو شاخ. لەسوریاشەوە چەند مەفرەزەیەک ئەنیرن بو بادینان. بە تەما بوین ئەوان ناوچەی سوران ئاوا بکەنەوە. ئیمەش بادینان، بەمجورە هەردو لا یەک بگرینەوە.) ل/٩٢**

لە پێشەوە دەبوو نەوشیروان، دەستپێکی ناردنەدەرەوەی مەفرەزەکان بۆ شاخ لەلایەن ئەم و ئەودا، باسی هەبوونی مەفرەزە سەرەتاییەکانی کۆمەڵەی بکردایە و ئەو سەروەرییەی کۆمەڵەی نەخستایە پەنا و پەسیوان. دیارە سەرانی یەکێتی بە فەنتازیای خۆیانەوە، بۆ خۆیان نەخشەیەکی ئامادەکراویان هەبووە و بەبێ ئەوەی بە عەمەلی لەگەڵ ئەمری واقیعی سەر ئەرزی کورستان یەک بێتەوە. ئەوان لەلایەن خۆیانەوە بەهارێکی دوو زەردێنەیان پێشبینی کردبوو. لەو رۆژەدا ناوچە سنوورییەکان، بەتایبەتی کوردستانی باشوور

بەگشتی، لەلایەن دامودەزگای سەربازی و ئەمنی رژێمی عیراقەوە تەنرابوو. نازانم بە چ هێز و مەفرەزەیەکی سەرەتایی نەشارەزا و بێئەزموونی ئەفسوناوی، سەرتاپای کوردستان بەیەکەوە دەبەسترێتەوە! ئیتر ئەگەر خەیاڵپڵاوی نەبێت، چەند مەفرەزەیەکی، وەک کە خۆیان دەڵێن؛ بێ ئیمکانیات، چۆن چۆنییەک لە کتوپڕێکەوە مەڵبەندەکانی سۆران و بادینان بەیەکەوە گرێ دەدەن!

(ئەوسا ئیمە باوەرمان نەئەکرد بنەماڵەی بارزانی زات بکا چەکدار بنیریتە سەر پیشمەرگە، یا ئەگەر بیەوی دوای ئەو ئاشبەتالەی ئەوان کردویانە کەسانی هەبن بە قسەیان بکەن و پیشمەرگەیان بو بکوژن..) ل/٩٢

بەڕاستی هەموو یەکێکی بێئاگا، دەبوو ئەم قسانە بکات، بەڵام نەدەبوو ئەو بیکات! چونکە خۆیشی چاک بەو راستییە ئاشنایە، کە هەموو ئەو کەرەستەیەی ئەو ناوی هێناون بۆ دامەزراندنی یەکێتی، یەکە بەیەکەی سەرکردەکانی، هەر زۆربەیان کادر و ئەندامی ئەو رەوتەی باڵی "م.س" بوونە، سەرباری نوشستی و پەرتەوازەی سەرەتای حەفتا و بەشداریکردنی مەسئولیەتی ئاشبەتالی ١٩٧٥، زۆربەیان لە بەرپرسیارێتی ئەو کارەساتە بێبەش نەبوون، کەچی لەگەڵ بانگاشەی هەڵگیرسانەوەی شۆرش، خەڵک رەدوی هەمان سەرکردایەتی کەوتوون و خۆیان بۆ بەکوشت داوە. ئەوە بوەتە قەدەری هەنووکەیی کورد و هیچ گرنتییەکی ترووسکایی جارێ نابینرێ بۆ کۆتایی هاتنی. ئیتر بۆ دەبێ ئەو دیاردە ناتەندروستە هەر بەتەنێ بۆ بنەماڵەی بارزانی قوت نەدرێ! ئەگەر ناوبراو هەر بەتەنیا بەنموونەی بنەماڵەی بارزانی ئەم دەرکەوتەی باس نەکردایە و بە شێوەیەکی گشتی لە باوەشی قسەوباسەکانی سەرجەم رەوتەکانی بگرتایەوە، دڵنیام کارەکەی مایەی دەستخۆشی لێکردن بوو. چونکە ئەوە مەگەر لە شانی نەتەوەیەکی ستەمدیدەی کڵۆڵی وەک کورد بێت، کە زۆر بەسانایی ئەوەی پێ قبووڵ بکرێ! کە مایەی هەڵوەستەکردن و لێکۆڵینەوەیەکی گشت لایەنییە. تاکو راستی و دروستییەکان بخرێنە بەردەم نەوەکانی داهاتوو. راستە لەناو بزاڤی سیاسی و چەکداری کورداندا، یەک دەسرازە لادان، خەوش لەلایەن تاک و سەرکردە، رەوت و هەتا حیزبەوە پیادە کراون کە تەنیا بەفیڕۆدانی قوربانییەکان، لەناوبردنی سەروەرییەکانی بەچاوەوە بوە، کەچی خەڵکی کورد لە خۆشی و ناخۆشیدا، بەدوایان کەوتوون، بۆ پەیام و فەرمودەکانیان، سەمای بەفرەخوێن بەباداکردنی قوربانییەکانیان کردوە!

نووسین و بەسەرکردنەوەی رووداوەکان، بە زووڵمکردن لە مێژوو هەتا سەر برناکات. مرۆڤی بەرچاو ڕوونی ویژدان زیندوو، لەگەڵ رەوتی سەرجەلەی ژیان لە بەرانبەر نەتەوەکەی، واقیعی دەبێ و رێگا بە حەزەکانی نادات سواری شەپۆلی رەوتی

ڕووداوەکانی ڕۆژ بێت. ڕاستە بەندەیش وەک نەوشیروان لە هەرەتی تەمەنی خۆمەوە لەگەڵ باڵی "م.س" و دواتر لە هەمێزی کۆمەڵەوە لە ڕیزەکانی "ی.ن.ک" لە سەنگەری نەیاری حیزبی، سیاسی و پێشمەرگەیی سەرکردایەتی بارزانی بوومە، بەڵام گومان لەوەدا نییە، کە ئەوانیش وەک هەر مرۆڤ و سەرکردەیەکی دیکەی ئەو نەتەوەیە، لەناو ڕەوتی ڕووداوە سیاسییەکان، هەوڵدان و خەباتی شاخەکاندا، بێبەری نینە لەو نەهامەتییانەی بەسەر نەتەوەکەمان هاتووە. هەر هەموو خامۆشییەکان لە کۆڵی ئەوان کۆ نەبووتەوە. چونکە ئەوانیش لەپاڵ ئەو مەسئولیەتە، کە بۆ پەنجا ساڵ زیاترە لە کاروانی خەباتکردندان و بێوچان و سڵەمینەوە قوربانی بێشوماریان بەخۆیان، بنەماڵە، عەشیرەت، ناوچەکەیان داوە. لەسەر ئاستی ناو خەڵکی کورد و دونیادا، بە داکۆکیکار و سەرکردەیی مێژوویی کورد ناسراون. خودی شەهید "ئارام" لەو بارەوە خاوەنی بەرچاوڕوونییەکی بە دەگمەنی ئەوێ ڕۆژێی ناوەڕاستی حەفتاکان بوو، کە دەیگوت: "سەرکردایەتی بارزانی بە قسەی بریقەدار، درۆشمی موزایەدەکارانە ناسڕێنەوە، تاکە ڕێگای کوردایەتی هەر لەیەکگەیشتن، ململانێی سیاسی، دیموکراتی و هاوکاری سیاسی و جڤاتییە. چونکە ئێمە ئەندامی یەک نەتەوە و ڕۆڵەی یەک خاکین، با بیرکردنەوە و هەتا پراکتیک و ئایدیای سیاسیمان یەک نەبێت." بەڵی بارزانییەکانیش دەیانتوانی وەک هەر یەک لەو عەشیرەتانەی دیکەی کوردستان، لەگەڵ ڕژێمەکانی یەک بەدوای یەکی عێراق تەبا بن، پشت لە دۆزی ڕەوای نەتەوە و خاکەکەیان بکەن و لەوسەرەوە بەسەلامەتی بۆی دەرچن.

بیرکردنەوەی کورتبینانەی بەشێکی سەرانی سیاسەتچی کورد، هەتاکو هەنووکەیش، سەرباری ئەو هەموو سەردانە لە بەردی مەحەکە، هەر بەردەوامن. داروەردان لە برینەکان و کولاندنەوەی یەکلایەنی و سووتاندنی چاک و خراپ بەیەکەوە بۆ خاتری خاتران، بۆ تێکرای خەڵکی کورد زیانبەخشە.

بەئاگایی لە گۆڕانکارییەکانی سیاسی و ڕووداوەکانی جیهاندا، بۆ هەڵسانگاندن و پێداچوونەوەی بەسەرهاتەکانی چیراوکەی خەباتی دووروودرێژی نەپساوەی هەر خەڵکێک، بە بەرچاوڕوونییەکی سوودبەخش، بۆ بەرەو هەڵهێنانی ئاسۆیەکی گەش و نوێ، کرۆک و دەستمایەی هەموو هەنگاوێکە بۆ شیتالکردنەوەی بازنە ئاڵۆز و گرێکوێرەکان لەو خەباتەدا. با سەروگوێلاکی خۆیشی بگرێتەوە. چونکە گوتار و نووسینەوەی نوێ، بە هەمان میتۆد، هەمان زەخیرە و کەرەستەی ئەزموونی کلاسیکی کۆنینە، بەتەنیا ناکرێ، بەڵکو زۆرتر جورئەت و داهێنانی بوێرانە مایەی ئەوەن کە مێشک و دەروونی نەوەکانی ئێستا و داهاتووی پێ ئاوبدرێ و ڕاستییەکان ڕۆشن بکرێنەوە. بەڵام چی بکەین، یەکێک لە خاڵە کوێرەوەرییەکانی پانتایی کاروانی مێژوومان، ئەوەیە کە خەڵکانی سیاسی و خۆ بە

سەرکردە خوێندنەوە، هەمیشە فرچکیان بەوە گرتووە و هەنووکەیش لەسەری بەردەوامن. ئەوەندە بەسە، بە سەرکردە، حیزب، رەوت و چی و چی تر، ناووناوبانگ دەربکەن، خەڵک بیانخوێنێتەوە و سێبەری خۆیان ببیننەوە. ئیتر بەبێ ئەوەی بەلایانەوە مەترەح بێت، چییان بۆ کورد کردووە و چی دەکەن، هەر بەتەنیا ئەوەی خۆیان کردوویانە و دەیکەن، هەر ئەوە بەراست و دروست دەزانن. وەک کالایەک بانگاشەی بۆ دەکەن، کەچی ئەوەی خراپ و نارەوایە بۆ پەرێزی شپرێوی نەیارەکانیانی دەگێڕنەوە!

بەدرێژایی ئەو مێژووەی بەشێکی زۆری سەرانی حیزبی کورد، هەمیشە بەڵێن و گیاهێنانەچۆکی دەزگا ئەمنییەکانی دوژمنە سەرسەختەکانی نەتەوەکەمانیان پتر لە لا مەبەست بووە، لەوەی لەگەڵ نەیارە سیاسی و حیزبییە کوردییانەی خۆیان تاووتوێ بکەن. بەڵێ یەکێک لە هەڵە هەرە دیارە عەسکەری و سیاسییەکانی سەرکردایەتی شۆڕشی نوێی کوردستانی باشوور، ئەوە بووە لە سەرەتادا، ناوچەی بادینانیان کردوتە چەقی مەبەستییان، کە دیارە بۆ ئەوە بووە، بە بەردێک دوو چۆلەکە بپێکن. لێرەدا نەوشیروان راستگۆیانە پەنجەی خستوتە سەر ئەو فاکتانە، لەوەی ناوچەکانی بادینان هاوتەریبی خواست و زەمینەی گونجاوی هێزەکانی یەکێتی نەبووە. بەلام مل بەوەدا نانێ کە بۆچی سەرانی "ی.ن.ک" سوور بوونە لەسەر ئەوەی، هەر دەبێ لە ناوچەکانی بادینانەوە دەست بە شۆڕش بکەنەوە. ئەگەرچی یەکێتی بەناچار بوو بە ناوچەکانی بادینانەوە مەفرەزەکانی بگەیەنێتەوە قولایی کوردستان.

دیارە ترۆپکی ئەو هەڵە گەورەیەی یەکێتی بەوە تەواو بووە، سەرلەنوێ سیناریۆی شەڕی بێهودەی کوردکوژی براکان، وەک میرات پەخش کراوەتەوە و کوڕی خوێن لەبەرچواندن و مژدانەی شۆڕشی نوێی پێ گەرم کراوە. لەو سەروبەندەدا، یەک راستی حاشاهەڵنەگر خۆی زەق کردوتەوە، کە نەوشیروان کەموزۆر خۆی لە قەرە نەداوە و تروسکایی نەخراوەتە سەر، ئەویش ئەوەیە، کە ناوچەی گونجاو، هێزی بزوێنەر و خەڵکی شارەزای ئەو ناوچەیە، ناسیار و شارەزا بە ئاقاری بست بەبستی ناوچەکان و ئاشنا بە خەڵک و دانیشتوانەکەی گرنگن. بەکورتی یەکێتی و پارتی لە هەڵگیرساندنەوەی شۆڕشدا، بە چاولێکەری و ڕقی ئەستووری نەیارییەکی هەتا سەرئێسقان خۆکوژ، هەمان هەڵەیان دووپات کردوتەوە. لەوەی، کە یەکێتی لە سوریاوە مەفرەزەی عەسکەری و سیاسی ناردوتەوە ناوچەیەک، کە هیچ سەرەتا و پێگەیەکی رێکخراوەیی و سیاسی نەبووە. سەرباری هەبوونی هەندێ چەک و تفاقی لۆجیستیکی سنوردار، لەبەرانبەر مەفرەزەکانی پارتی، کە شارەزا و خەڵکی ناوچەکە و خاوەن پێگەیەکی بەهێزی رابردوو بوون. ئەو مەفرەزانەی یەکێتی بەوپەڕی دڵرەقییەوە قەتلوعام کران، کە خاڵێکی رەشی ئەو مێژووەن.

به هەمان ڕەنگ لەناوچەکانی "سۆران"دا، مەفرەزەکانی "پارتی"یش کە بەشێوەیەکی دەستکرد لە "ئێران"ەوە، بە ئیمکانات، پۆشتەیی ڕەوانەی ئەو ناوچانە کراون، بەرگەی مەفرەزەکانی "یەکێتی"یان نەگرتووە و لە ناوچەکان دەرکراون. چونکە بەو ڕەنگەی بادینان، ئێرەش پێگەی دیاری هێزی یەکێتی بووە، سەرباری ئەوەی هیچ ئیمکاناتێکیان نەبوو، بەڵام لە ڕووی ڕێکخراوەیی و هەبوونی مەفرەزە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە بە شێوەیەکی سروشتی کە ئاشنای ناوچەکە، ناسیاری خەڵکەکە بوون. ناوچەکانیان بۆخۆیان کۆنترۆڵ کردبوو.

سەبارەت بە دروستکردنی هێزی پێشمەرگەوە، لەلایەن "یەکێتی"یەوە، نەوشیروان بەم چەشنە پێناسەی دەکات:

(سەرانی کومەلە، پیوەندییان لەگەڵئەفسەرە گەنجەکان کردبو. پێشمەرگەکانیان بەزوری لە خەلکی شارەکان دروست ئەکرد و ئەیان ناردن بو دەرەوە/.../ سەرانی بزوتنەوە، دانیشتوانی لادیکان و عەشائیریان ساز ئەدا و، پاش ئەوەی کە خویان چونە شاخ، هیزی چەکداریان لی پیک هینان. زوری نەخایاند سەدان کەس لەکەسانی ناوداری عەشائیر هاتنە ریزی پیشمەرگەوە.... هیزیکی گەورەیان پیک هینا. دەیان بارەگایان دانا. مەفرەزەکانی کومەلە لەچاو ئەوان دا بوبون بە کەمایەتی.) ل/٩٣

هەر یەکێکی بێئاگا لە باسوخواسەکانی ئەوێ ڕۆژێ، ئەو پەیڤانەی سەرەوەی نەوشیروان بخوێنێتەوە، گومان دەکات، ئەوە قەزاوەتی هاوڕێیەکی کۆمەڵە بووبێت. چونکە جارێ لە پێشەوە، ئەوەندەی کۆنە ئەفسەری ڕیزەکانی شۆڕشی ئەیلول لەلایەن خودی نەوشیروان و ڕەوتی کەسانی باڵی کۆنی "م. س" لەناو بزووتنەوە، لەوجۆرە کەسانەیان لەگەڵ بوو، هەرگیز لەگەڵ ئەو چەند ئەفسەرە تاکوتەرایەی ڕیزی کۆمەڵە لە ناوەوەی کوردستان یەک نایەتەوە و نازانم بە چ ئامارێکی بەردەست ئەوەی لە قەپان داوە! مەگەر یەکێکی وەک هاوڕێ و کوڕانی ڕۆژی تەنگانەی وەک ملازم عومەر، شەهید ملازم جوامێری لێ دەرچێت، نازانم ئەو ئەفسەرە گەنجانە کێ بوون کە کۆمەڵە پێوەندی پێوە کردبوون و هەتا سەر لەگەڵ کۆمەڵە بووبن و هاوڕێی کۆمەڵە بون..؟

یەکێک لە هەوڵ و تەقەلا سەرەتاییەکانی "ئارام"، کە لەگەڵ ئەوەی بەتەواوی ئارەزووی خۆی، خەباتی چەکداری هەڵنەبژاردبوو و کۆمەڵەیش هیچ بەرنامەیەکی خۆئامادەکردنی لە هەگبەدا نەبوو بۆ چوونە شاخ، بە هۆی فشاری گرتن و ڕاوەدوونانی هاوڕێیان، بەناچاری ملی ئەو هەورازە هەزار بەهەزارەیان گرتبوو. بەڵام بەندە وەک شاهیدێکی زیندووی هەڵوێست و بیرکردنەوە ورد و بە حەوسەڵەکانی "ئارام". شایەتی ئەوە دەدەم کە ئارام هەر لە یەکەم هەنگاوەوە خوازیاری ئەوە بوو، ستروکتورێکی نوێ

دابهێنێ لە چۆنیەتی پێکهاتەی مەفرەزە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە و بە شێوەیەکی سروشتی و هەنگاو بەهەنگاو زەمینە بۆ هێزێکی پێشمەرگەی نوێی کوردستان، بە چەندایەتییەکی فراوانی باوەشی چلۆنایەتییەکی تۆکمە برەخسێنێ. دیارە مەبەستی هەرە سەرەکی "ئارام"، بریتی بوو لە سەرمەشقی بەدیهێنانی زەمان و زەمینی گونجاو بۆ نەوەی نوێی شۆڕشگێڕی قاڵبووەوەی ناو کۆڕی خەباتی ڕێکخراوەیی و پێشمەرگەیی خاوەن رابردووی کەمخەوش، بۆ خولقاندنی دەیان کادر و سەرکردەی دڵسۆز و لێوەشاوەی ئەو مەیدانە. بەڵام چ دەکەی لەگەڵ بارودۆزی سەختی ئەوێ ڕۆژێ و تەنیاباری ئارام لە نەبوونی ئەو کەرەستە پێویستەی زامنکاری ئەو ئامانجە لەلایەک، لە سەرێکی دیکەوە، ئەوجۆرە رەوش و بیرکردنەوە داهێنانە نوێیە، بۆ قوتابخانەی سیاسی چەندان قۆناغی خەباتی چەکداری، حیزبی رەنگاورەنگی کوردی قوت نەدراوە. لە پێشەوە "ئارام" باجەکەی بە مەرگی خۆی دا، هەر لە ڕێگاوە ئەو بیرکردنەوە توشی کۆستی خۆی هات.

بەڵێ سەرکردایەتی لەمێژینەی سیاسیی کوردی، کە خاوەنی ئەزموونێکی تژی لە خەوش و خامۆشییە و سەرکردایەتییەک، کە بە کوڵاوی، خاوی و برژاوی، سواری ئەسپی چارەنووسی کوردان ببوو لە شاخەکاندا. مەسەلەی هێزی پێشمەرگەی ڕێکخراو، خاوەن ترادوشونی شۆڕشگێڕی و زاڵبوونی ڕێکخستنی ریزەکانی خەڵکی بۆ هەزم نەکراوە. هەمیشە هەموو خەون و خۆزگەکانیان بە هێزی فشۆلی زۆروبۆر و گەندەخۆر (گەندەڵ) دیوە. کە ئەو جۆرە هێزە لە دەمی شکست و لێقەومان، وەک شێرەبەفرینەی بەرگزنگی هەتاو تواوەتەوە، کەوتوتە مشەخۆری و تەسلیمبوونەوە بە دوژمن و سەرلەنوێ لولەی تفەنگی لە براکەی خۆی کردووە.

لیرەدا جێگای خۆیەتی قسەوباس ببەمەوە سەر دیاردەی گەندەڵی لەناو ریزەکانی کۆمەڵی کوردی، کە دیسانەوە وەک شایەتحاڵێک زۆرم لە نموونەگەلی سەرەتاکانی بڵاوبوونەوەی گەندەڵی لەسەر دەستی مەسئولەکان لەوێ ڕۆژاندا، لەلایە. ئەوجۆرە هێزە دزەی کردوتە ناو شادەمارەکانی تێکڕای کۆمەڵی کوردی، ئەمڕۆکە زۆر بەگران باجەکەی دەدەین و کەسیش لەو مەسئولیەتە مێژووییە بەدەرنییە. بەڕاستی نەدەبوو نەوشیروان لەو ویستگەیەی لە قەپاندانی هێزی کۆمەڵە و بزووتنەوە، بەو شێوە تەماوییە شتەکان تێکەڵوپێکەڵ بهۆنێتەوە، گەمە و دەستکاری راستییەکانی سەرەنجام و سەروەرییەکانی یەک لەشکر لە شەهیدان و هاوڕێ قارەمانەکانی بەژیان زیندووی ئەوێ ڕۆژێ، هەرزان بکات.

نەوشیروان پاش دەیان ساڵی دوای ئەو بەسەرهاتانە، کە دەستخۆشانە لە دیدی بەرمەیدانی خۆیەوە، تۆماری کردوون، دەبوو لە ئاست دەرئەنجامەکانی ئەو بەسەرهاتانە، ریالیستی بوایە و لە بەرانبەریان بێدەنگ نەبوایە. چونکە ئەو هێزە فراوانە عەشائیر و

زۆروبۆرە، لەچاو هێزە سەرەتایی و بچوکەکەی، کە کۆمەڵە پێکەوەی نابوو، بەدوای شکستی پلانە تەماوییەکان و هێرشی توندوتیژی هێزەکانی رژێمی بەعس، نەبوونی پشتگیری و کۆمەکی بێشوماری دەرەکی. هەروەک چۆن بە پەلەپرووسکێ و بە شێوەیەکی نا ئاسایی لە دەوری ناو و ناوبانگی کۆنینەی سەرکردەکان گردببوونەوە، ئاواش بە ماوەیەکی کورت و خێراتر، ئەو هێزە زۆر و فراوانە توایەوە، زۆربەیان تەسلیم بە رژێم بوونەوە، بگرە دەیان گۆژمە جاش و مەفرەزەی خاسەی راوەدوونانی پێشمەرگەیان لە سێبەری دامودەزگا سیخوڕییەکانی رژێم پێکەوە نا. کەچی ئەو هێزە بچوکەی کۆمەڵە کە زۆرتر لەناو رێکخستنی شارەکانەوە دروست کرابوون، جوامێرانە و بەسەرەتاییترین کەرەستە و شرە تفەنگ و ئەوپەڕی بێئیمکانەتی، بەرگەی ناخۆشییە سەختەکانیان گرت و لە چاوترووکانێک نەتوانەوە و رۆژ بەدوای رۆژ گەشەیان کرد. ئەو هێزە بەرچاوەی "یەکێتی"یان پێک هێنا. بە دڵنیاییەوە ئەگەر کۆشش و ماندووبوونی "ئارام" و هاورێیەکانی ئەو مەفرەزە سەرەتاییانەی کۆمەڵە نەبوایە، بێگومان ئەو سەرچاوەیەش ئەو جۆرە هێزەی لێ دروست نەدەبوو. ئەگەر بەدوای شەهیدبوونی "ئارام"یش، شوێنەکەی لە بەرێوەبردنی کۆمەڵە و سەرپەرشتیکردنی هێزە چەکدارەکەی، بە "هاورێ"ی هاوشێوەی خۆی پڕ ببوایەوە، بۆ درێژەدان بەو رێباز و پەیامەی "ئارام"، وەک سەرەتایەک پیادەی کردبوو، بێگومان کەس بۆی نەدەکرا لە دەرەوەی کۆمەڵەوە، سواری کۆڵی ئەو بەرهەمە ببێت و لە دوا مەنزل تەفروتونای بکات و ئەمرۆکەش کۆمەڵە وەک هێز و رەوتێکی بەرچاو لەمەیدان دەبوو.

(ینک لە سوریا و ق.م لە ئیران کەوت بونە جموجول. ئەم دو ریکخراوە بە ئەندازەیەک لەگەل یەک ناکوک بون. هەریەکەیان ئەی ویست ئەوی تر لەناو ببات. ئەم ناکوکییە رەنگی دابوەوە هەم لەناو ریزەکانی مەفرەزە چەکدارەکان و، هەم لە جموجولی سیاسی ئەم دو لایەنەدا لەناوەوە و دەرەوە.) ل/٩٦،٩٧

ئەم ساغکرنەوەیەی نەوشیروان بەو ئەمری واقیعە تفت و تاڵەی ئەزموونی قوتابخانەی سیاسیی کوردان، لە تراژیدیای چیراوکەی شەڕی کوردۆلۆژیی بێهودەی براکان، لە زەمان وزەمینێکی هێجگار دژوار، کە داگیرکەرانی کوردستان لەپاڵپشتیکردنی بەرجەستەیی رژێمی بەعس و بەعس بەنوێنەرایەتی هەموویان لەسەر ئاقاری قەلاچۆکردنی نەتەوەکەمان تەراتێنیان بوو، کەچی سەرمایەی بەمیرات گواستراوەی سەرانی حیزبی کورد، زەقنەبوتی شەڕی کوردکوژی بەقوڕگی کوردەوە دەکرد. بۆیە ددانپێدانەکە لە پێشەوە دەستپێشکەرییەکی بوێرانەیە، نەوشیروان بەرۆژی روناک پێمان دەڵێ.. ئەوە سەرانی پارتی و یەکێتی بوون، لە بەرگی هەڵگیرساندنی، شۆڕشێ نوێ و

شۆڕشی گولاندا، بڕیاری شەڕی یەکتریان داوە، بەیەکەوە لە جێبەجێکردنی ئەو مانۆڕە بەقازانجی دوژمنان، قوربانی نەتەوەکەیان بە فیڕۆ چواندوە. بەڵام بە هیچ جۆرێک خۆی لە قەرەی ئەوە نادات، کە ئەم جۆرە خەوشە پڕ مەرگەساتەیان بە چ جۆرە زەخیرەیەکی لێوان لێو لە هەزارویەک پڕوپاگەندەی حیزبی چەواشە داگرتوە، بۆ کرمێکردنی هەستونەستی خەڵکی کورد لەبەرانبەر یەکترییەوە.

بەو جۆرە هەروەک چۆن، لە هەر چەشنە هەڵگێڕ و وەرگێڕکردنی تاووتوێکردنی سەرەداوەکانی گفت و بەڵێنە شەکراوییەکانی دۆستانی دەرەکی، بەتایبەت سورپاییەکان، کە لە دەموزاری نووسەری ئەم کتێبە شوکرانەی بەسەر داباریوە، بەبێ ئەوەی بای سەرەموویێک، راشکاوانە شتێکی ئەوتۆی بەرهەمەکانی ئەو کۆمەکانەمان بۆ بەداوەوە بکات، کە بای ئەو هەموو سوپاسگوزارییە بکات لە پەراوێزی دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری لە کوردستاندا. کەچی هەر لەو بوارەدا خودی نەوشیروان کە لە باوەشی ئەورووپای شارستانی گەڕاوەتەوە، بۆ تۆزقاڵێک توخونی فاکتەری نائومێدی کۆمەڵانی خەڵک ناکەوێت و سەبارەت بە خەبات و قوتابخانەی سیاسی کوردی، بەجۆرێک خۆی لێنەبان کردووە، وەک ئەوەی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان، دەستیان بۆ رەحمەتی دەستپێکردنەوەی خەباتی چەکداری پان کردبێتەوە. دیارە ئەو پشتگوێخستنەیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، تاکو لەگەڵ سەرخانی بیرکردنەوەکانی ئەوێ ڕۆژێی خۆی ناکۆک نێتەوە. چونکە خۆیشی باش ئەوە دەزانی فاکتەری نائومێدیی خەڵک لەوێ ڕۆژاندا، هۆی بەرپابوون و نەبوونی هەر جۆرە خەباتکردن، ڕووبەڕووبونەوەی نەتەوەیەکە بەرانبەر ستەم و هەڕەشەی قڕکردنی نەژادی.

بەڵێ هەروەک نەوشیروان هێمای بۆ دەکات، سەرانی **یەکێتی و پارتی** "ق.م" بەبێ هیچ گوێدانێک بە فاکتەری نائومێدیی خەڵک، لە ڕقبەرقی یەکترییەوە، هەر یەکەیان لەپەنا هاوکاریی ڕژێمێکی داگیرکەری پارچەیەکی کوردستان، بۆ درێژەدان بە لاساری خۆیان، بەپەلەپرۆسکێ جاڕی "شۆڕش"یان لە بەرگی خەباتی چەکداری داوە. دەستپێکردنەوەی سەرەتاکانی شەڕی براکان "شەڕی ناوخۆی بێهودە" یان کردوتە سەرمەشقی ئەو جاڕدانە، و سەرلەنوێ قەتماخەی برینە کۆنەکانیان بە خوێنڕژاندنی نوێی ڕۆڵەکانی کورد کولاندوتەوە.

(ئەبێ لەم سەروەرییەدا کورد بەرێز لێ نانەوە چاکەی سوریا، بەتایبەتی هی سەرۆک حافز ئەسەدی لەبەرچاو بێ.) ل/٧٧

لە فەرهەنگی بیرکزدنەوەی بەشێکی زۆری سەرانی حیزبی کورد، هەموو دەستلەپشدان و پێوەندییەکی هێزەسیاسییەکانی کورد بە دەزگا ئەمنییەکانی داگیرکەران،

بە سەروەری بۆ کورد لەقەلەم دەدرێ و دەبێ خەڵکی کورد بەدەستنوێژەوە دوعا و شوکرانەیان بۆ بنێرێ..! دەبوو لەپێشەوە نەوشیروان یەکێتی لە شوێنی کورد بەکار بهێنێ، چونکە رژێمی سوریا هەرگیز بەناوی کوردەوە، شتێکی باشی بۆ کورد نەکردوە، بەڵکو راستر ئەوەیە کە شتی بۆ یەکێتی کردووە و پێوەندییەکانی لەگەڵ سەرانی یەکێتی بووە، هەروەک چۆن هەمان پێوەندی بەسەرانی "پارتیی"یەوە هەبووە. بەڵام بۆ نەتەوەی کورد بە گشتی و ئەو بەشەی نەتەوەی کورد و کوردستان، کە بەتۆبزی و ئاگر و ئاسن بە خاک و خەڵکی وڵاتی عارەبییەوە لکێنراوە و خوێندوتەوە. هەروەک رژێمە داگیرکەرەکانی دیکەی کوردستان، لە تەفروتوناکردنی کورد درێخییان نەکردووە. ئیتر نازانم بە چ چاووڕوویەک، بۆ چ سەروەرییەک کورد بەرێزلێنانەوە چاکەی سوریا لەبیر نەکات! سوپاسگوزار بۆ سەرۆکی سوریای عارەبی دابمینێ! دەبێ لەو فەرهەنگی دەمچەفتانەی مەدەلاییکردن بۆ سەرانی رژێمە داگیرکەران، ئەوە قەدەری کورد بێت، کە وڵاتەکەت داگیر بکەن، لە خێروبێرەکەی بدزن و خەڵکی کورد لەسەر زێدی خۆیدا بە سواڵکەر بهێڵنەوە. ئەوجا هەرخۆشمان بە قەرزار و شەرمەزاری عەرشی ئەو دەسەڵاتدارانە بزانین..! هەر لەو باسوخواسەدا، **نەوشیروان** وەڵامی خودی ئەو میهرەبانییەی خۆی دەداتەوە کە شایەنی ئەو شوکرانە و پێزانینە بێت. لە تەنگەی کتێبەکەی خۆیدا سەبارەت بەو ئەمەکدارییەی رژێمی سوریا و سەرۆکەکەی، ئەو کارە نا مرۆڤانەیان هەتا بەرانبەر ناوی **کوردی**، نووسیویەتی:

**(حکومەتی سوری ناوی دیرکی کرد بو بە مالکیە،هەروەها ناوی کوردی هەمو گوندەکانی گوری بو بە ناوی عەرەبی.) ل/١٠٣**

بەڵام نەوشیروان لێرەدا ئەو کارە چەپەڵەی رژێمی سوریای لەژێر ناوی حکومەتی سوریای تۆمار کردووە، وەک ئەوەی حافظ ئەسەدی قارەمان بەگۆڕینی ناوی کوردی بۆ ناوی عارەبی نەزانیبێ! بانێک و دووهەوا بێت..!

لە کۆڵەپشتی خەباتی خەڵکی کورد، هەمیشە دەزگا سیخورییەکانی رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان، لەناو پەرێزی شپرێوی قوتابخانەی سیاسیی کوردی، بە چەپ و راستییەوە، لەگەڵ رەوتی رووداوەکان قۆشمەی خۆیان کردووە. بۆ پاراستن و بەردەوامبوونی ئەو جۆرە پەرێزە، لەپێناوی پاراستنی بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت و رژێمی خۆیان، کە نەوشیروان کەموزۆر، نەوەک هەر خۆی پێوە ماندوو نەکردوە، بگرە مەبەستی نەبووە، رووناکی بخاتە سەر ئەو تەوەرە تاریکەی کاروانی پێوەندی و پێکەوە هەژانی نێوان دوو جەمسەری لە ناوەرۆکدا دژ بەیەکتری.

بەکورتی لە درێژەی یادەوەرییەکانی نەوشیروان بەگشتی، باس لە فاکتەرە بزوێنەرەکانی دەستپێکردنی خەباتی چەکداری کراوە، کەموزۆر هیماشی بۆ ئەوە کردووە کە هەر هەموویان لە ئاستی زەمان و زەمینی هەڵگیرساندنی خەباتی چەکداری نەبوونە. بەڵام ئەوە بەخۆی رانابینی کە راشکاوانە دان بەوەدا بنێت، کە بۆچی وەک سوخەتێکی دوبارەبووەوە، ملیان بەو راستیانە نەداوە و هەر سووربوونە لەسەر جاڕدانی یەکلایەنەی دەستپێکردنەوەی ئەو جۆرە خەباتە. وشەکانی نەوشیروان لەو کتێبەدا، نیشانەکانی ئەوەیان لەگەڵ خۆدا هەڵگرتووە کە سەرانی حیزبی کورد، بۆ جاردانی بڕیارە چارەنووسسازەکانی کاروانی سیاسەتکردنیان، تاکە یەکجاریش گوێیان بە خەڵکی کورد و واقیعی بارودۆخ نەداوە. بگرە زۆرتر ئەو جۆرە بڕیارەیان بە بەڵێن و گفتە شەکراوییەکانی سەر زاری توخمەکانی دەزگا سیخورییەکانی ئەو رژێمانە هەڵواسیوە، کە دوژمنی باوککوژەی کوردن. لەم پێناوەدا هێزی لەبننەهاتووی کۆمەڵانی خەڵک کراوەتە پێخۆر و پەراوێزی بەئەنجام گەیاندنی پلانە نادیارەکانیان.

**دیسانەوە کۆمەڵە..**

(بو من هەلیکی باش رەخسا بو هەندی لە زانیارییە کونەکانی لەسەر یەزیدی خویندبومەوە تاقی بکەمەوەو، هەندی شتی نوی یان لی فیربیم، سەرەتا سلیان لی نەکردمەوە. منیان بە کومەلە ئەناسی و، پیش منیش نمونەیەکی خراپی کومەلەیان دی بو. وایان ئەزانی منیش لەو تیپەم. زوری پی نەچو سلەکەیانم رەواندەوە. بوین بەدوست و ئاشنا.)ل/١٠٦

نەوشیروان لەگەڵ شۆڕبوونەوەی بەناخی بابەتە هەڵبژاردووەکانیدا، لە هەر شوێنێک هەلی بۆ هەڵکەوتبێ، بەبێ موناسەبە دریخی نەکردووە لە پلار گرتنە کۆمەڵە و بێئەرزشکردنی هاوڕێیەکانی. هەتا کار گەیشتوتە ئەوەی هەر جۆرە رەفتارێکی شەخسیی ناجۆری هاوڕێیەکی کۆمەڵە، بۆ سەروگێلاکی خراپی خودی کۆمەڵە دەگێڕتەوە و خۆی لێ هەڵاوێردووە. نازانم ئەو خۆجیاکردنەوەی بە ئاشکرا لە پای چی و بۆچی..؟ خۆزگە بەخۆی رابفەرمواية لەپاش دەیان ساڵ، بەکورتی باسی ئەو نموونە خراپەی ئەوێ رۆژێی ئەندامێکی کۆمەڵەی بگێڕایەوە، تاکو لەو نموونە خراپەی کۆمەڵە ئاگادار دەبووین، کە دیارە کۆمەڵەیش لە نموونەی ناشیرین بەدەرنەبووە، بۆ ئەوەی خوێنەر لەگەڵ نموونەی بەر سێبەری بەژن و باڵای پراکتیکی رۆژانەی نموونە باشەکەی بەراورد بکردایە.

(هەر لەو نزیکانە پاش گیرانی هەندی لە ئەندامەکانی کومەلە لە بەغدا ئیبراهیم عەزو، ئەنوەر شاکەلی و ئیبراهیم عەبد عەلی کە هەرسیکیان ئەندامی کومەلە بون و فەرمانی گرتنیان دەرچوبو، بەپی لەسنور پەرینەوە و گەیشتنە سوریا.) ل/١٠٩

لێرەوەیش نەوشیروان زۆر بلەز بەسەر باسکردنی گیرانی هەندێ لە هاوڕێیانی کۆمەڵە لە شاری بەغداد تێدەپەڕێ. بای ئەوەندە زەحمەت ناداتە بەرخۆی، کە هەر هیچ نەبێ لەسەر زاری ئەو سێ هاوڕێیە فیداکارە، بە کورتەباسێکی ئەوان ناوەڕۆکی کتێبەکەی سەبارەت بە کۆمەڵە دەولەمەند بکات. هەڵوێستی جوامێرانەی پڕ لە گیانبازی موجازەفەکارانەی ئەو هاوڕێیانە بەرز بنرخێنێ، کە هەر هیچ نەبێت، بای قوربانیدانی بێنموونەی ئەو هاوڕێیانە بکات، کە وێنەی بەدەگمەنی مرۆڤی شۆڕشگێر، دڵسۆزی بەرمەیدانی ئەوێ ڕۆژێی کۆمەڵە بوون. چونکە دووان لەو هاوڕێیانە بەژیان ماون، ئەوانە نەوەک هەر هاوڕێیەکی لێهاتوی ریزەکانی کۆمەڵە بون، بگرە کادر و مەسئولی شیرازەکانی رێکخستن بوون. شارەزایی تەواویان لەسەر دۆزی کۆمەڵە، کوردستان و عیراق هەبوو. من دڵنیام ئەگەر ئەو مرۆڤە بوێرانە، تاسەر لەگەڵ ئەجندای بیر و کردەوەکانی نەوشیروان یەکبهاتنایەوە، یان هەتا لە بەرگی پیاوێکی گوماناوی وەک م. نەقشبەندی بوونایە، ئەوە بەدرێژی باسیان دەکرا و هەنگاوی دلێرانەیان بەرز رادەگیرا. کەچی سەبارەت بە دکتۆر مەحمود عوسمان، بە جۆرێک کەوتوتە هۆنینەوەی هەڵوێستی ئەوێ ڕۆژێی بەرانبەر سەرکردایەتی بارزانی، کە مرۆڤ دەخاتە گومانکردنەوە، لەوەی نەوشیروان لەبەرانبەر نمونەی د. مەحمودیش ساتمەی نەکردبێ!

(یەکێ لە کارە هەرە گرنگ و مێژوییەکانی ئەم کومیتەیە بلاوکردنەوەی نامیلکەیەک بو بەناوی/ تقیم مسیرە الثورە الکردیە وانهیارها والدروس والعبرالمستخلسە منها.. و بلاوکردنەوەی حسابی داهات و خەرجی شورش و ، پارەی پاشەکەوت کراو بو، تا ئەوسا کەس نەیئەزانی لە کوبونەوەی شا_ بارزانی دا چی وتراوە و ، حسابی جولانەوەکە چون بوە.) ل/١٠٣

یەکێکی تر لە خەوشە دیارەکانی بەشێک لە کادر و رابەرانی قوتابخانەی حیزبی سیاسی کوردان، هەر لە زووەوە لە دەواری شڕی سیاسەتکردندا، رێچکەی نەپساوەی خۆی گرتووە، لەناو رەوتە چەپەکانەوە بگرە تا دەگاتە راستڕەوەکان، بریتییە لەوەی کادر و مەسئولەکان هەتا ئەو کاتەی خۆیان لەناو حیزب بە دەسەڵات و قەلەمڕەون، کاربەدەستی سەرەکین و دەسەڵات و دەستکەوتی خۆیان مسۆگەرە، ئەوە سەری زمان و تەشکی بەرەیان لە داکۆکیکردن لەو حیزبە دەدرێ! لە هەموو بینەوبەردەیەک لە مەلیک مەلیکترن. کەچی هەر ئەوەندە بەسە خودی خۆیان لە پلەی مەسئولیەت داکەلان، ئەوە تەختی ئەو حیزب و سەرکردایەتییە دەهەژێنن. لێی هەڵدەگەرێنەوە و قازانج سەری مایە دەخوات. بێگومان دکتۆر مەحمود کارێکی خراپی نەدەکرد، ئەگەر لەو نامیلکەیدا، هەوڵی ئاوڕدانەوەیەکی رەخنەگرانەی لە رۆڵی رابردووی خۆیشی بدایەتەوە، لە رۆژە خۆشەکانیش چۆن هەڵسوڕاوە.

قسەکردن سەبارەت بە بودجە، حساباتی شۆڕشی ئەیلول و سەرکردایەتی بارزانی بەتەنیا ئەو خەون و خۆزگەیە تێر ناکات. بگرە ئەو گرێکوێرەیە هەر لە چیرۆکەکەی "مریشک لە هێلکەیە، یان بەپێچەوانە" دەکات. من لەلای خۆمەوە دەست خۆشی لێ دەکەم بۆ هێنانە گۆڕێی بابەتێکی لەوجۆرە بۆ بەرچاوی خەڵک، ئەگەر لەوێ زەماندا بۆ مەبەستی نادیار و کڵ لەچاوکردنی کۆمەڵانی خەڵک نەبوبێت. نەوشیروان دەبوو لە پێشەوە بە سەرجەلەی کاروانی تێکڕای ئەو حیزب و ڕەوتە سیاسییانەدا بهایەتە خوارەوە. ئاوڕێکی لە خشتە و ئاماری بودجە و داراییان، بەتایبەت لە رابردوو، ئەوجا ئێستا بدایەتەوە، تاکو بەو دوعایەمان بگوتبایە ئامین. نازانم لە کامە حیزب و لە کیهان کۆنفرانس و کۆنگرە کە خۆی بەشداری تێدا کردووە، لە قەڵەمڕەویدا پشکی هەبووە، لەو بوارەدا خەبەرێک هەبوە..؟

لێرەدا یادگار و بەسەرهاتێکی خودی خۆمتان لەو بارەوە بۆ دەگێڕمەوە. پاییزی ساڵی ۱۹۸۰ بوو، زۆر نەبوو بەندە چووبوە شاخ و پێشمەرگایەتیکردن لە شۆڕشی نوێدا. بە هۆی بەشداریکردن و بەڕێوەبردنی بەشێکی شیرازەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵە لە خەباتی ژێرزەمینی شارەکاندا لە نێوان ۱۹۷۵ تا سەرەتای هاوینی ۱۹۸۰ و ئەندامبوونی سەرکردایەتیی ناوخۆی ڕێکخستن، بە هەرپێوەرێک بێت، پلەی ئەندامێتی سەرکردایەتی کۆمەڵەم پێ درابوو، کە ئەورۆژە نزیکەی بیست ئەندام دەبوون. لە یەکێک لە کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتی کۆمەڵە، کە لە بارەگایەکەی نەوشیروان کرا، بەندە سەبارەت بە هەندێ کەموکوڕیی ڕێکخستنی ناو هێزی پێشمەرگە و خودی دەستەی حیمایەی مەسئولەکان، لەگەڵ "عەلی بچکۆڵ"دا، هاوڕا بووم و پاشان لە فرسەتێکی دیکەی قسەکردنی خۆمدا، هەر ئەوەندە بەس بوو، چەند پرسیارێک لە چەندوچۆنی دارایی کۆمەڵە و چۆنیەتی سەرفکردنی بوروژێنم. نەوشیروان لێم هەستایە سەرپێیان و خەرێک بوو بەقسە، زیادەڕۆییم لە بەرانبەردا بکات، وەک ئەوەی پێم لە تەختەی چروک نابێ و باسی شتی بڤەم کردبێ، بەڵام ماڵیان ئاوابێت، ملازم عومەر و عەلی بچکۆل بەدەنگ هاتن و کەوتنە خاوکردنەوەی. خۆ من کفرم نەکرد، تەنیا پرسیارم کرد، ئیتر بۆ دەبێ، بەتوندی و خۆ ڕاست و چەپکردنەوە وەڵامم بدرێتەوە. دڵنیام ئەگەر هەڵوێستی جوامێرانەی ئەوان نەبوایە، هەر ئەو ڕۆژە شۆڕشبەدەر دەکرام. کە بۆ دواتریش هەر بەگران بەسەرمدا کەوت، باجی زۆرم داو ئەو بارەم بۆ ڕاست نەکرایەوە.

بۆ بەڵگەی ڕاست و ناڕاستی قسەکانم، خۆزگە نەوشیروان لەدوای هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵەدا، خشتەیەکی بۆ دارایی ئەو چەند ساڵەی دەستبەکاربوونی وەک سکرتێری ئەو ڕێکخستنە بڵاو دەکردەوە و ئەو مێتۆدە کۆنە ژەنگهەڵگرتووەی فەرهەنگی حیزبەکانی

کوردستانی هەڵتەکاندایە، میتۆدی شەفافی بکردایە سەرمەشق بۆ نەوەکانی داهاتوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا، ئەو هەنگاوەی دکتۆر مەحمود، لەباوەشگرتنە یەکلایەنەکەی، سەرباری هەر جۆرە پتکوپلاریک بۆ تەنیا بەرزکی سەرکردایەتی بارزانی، دیسانەوە دیاردەیەکی نوێی ئەو کاروانە جەنجاڵەیە و دەبوو سەرانی کورد ئەو تەقلیدە ژەنگاوییە هەڵتەکێنن. لە دیزەبەدەرخۆنەکردنی ئەو سەروەت و سامانەی لە پاشۆڵی حیزب و کوردایەتی بەسەریەکیانەوە ناوە، لەدەمی ئاشبەتاڵی شۆڕش و حیزب، یان هەڵوەشاندنەوەی ناوەکیی حیزب، لە کانیاوی جورئەتی لەخۆرادیتنەوە، تێکرای بودجە و حساباتی حیزب و شۆڕش، لە پێشەوە بخەنە بەردەم کادر و ئەندام و هەوادارەکانی خۆیانەوە، ئەوجا بەرچاوی کۆمەڵانی خەڵک.

**خیش و خیشکاری...**

نەوشیروان لە زۆر شوێنی ئەم کتێبەدا، بە موناسەبە و بێ موناسەبە، لەژێر ناوی خیشکردنەوە، دیسانەوە کەوتوتە سەروکێلاک کوتانەوەی هەندێک لەو کادرانەی کۆمەڵە، کە لە خەڵکە ئەساسییەکانی ڕۆژانی سەخت و دژواری خەباتی شار و شاخ بوون. هەموو سامانەکەیان گیانی خۆیان بوو، ئەویشیان کردە سووتەمەنی بەردەوامی کۆمەڵە و خۆیان بۆ خەبات، کوردایەتی، یەکیتی و شۆڕش بەخت کرد. کەچی نەوشیروان بە خۆی رافەرمووە بەو ناوەوە پێیان ڕابوێری، یان ئەو هاوڕێیانەی بەژیان ماون و لە ڕۆژانی لێقەوماندا، نموونەی خۆڕاگری و وەفاداری بوون بۆ کۆمەڵە و لەسەرەتاکانی شۆڕش، نەبەردییان دەنواند. بەڵام دوایی بەهەر بیانوێک بێت، سەری خۆیان هەڵگرتووە، شاخ و کۆمەڵەیان بۆ مەسئولەکان بەجێهێشتوە. بە شێوەیەکی توانج ئامێز، گاڵتە پێکردنەوە کەوتووتە وێزەیان. بەبێ ئەوەی ڕاشکاوانە بچێتە بنج و بنەوانی گێڕانەوەی بیانوەکانیان، خیشکردنی ئەو خەڵکانە، مەسئولانە بە ناخی ئاووهەوای ئەوێ ڕۆژێی بێزاربوون و بێزارکردن، نیگەرانییەکان و ماندووبوونی ورەپروکێن لە کوڕی خەباتدا شۆڕبێتەوە، کە یەکێک لە سەرچاوەکانی بەرچاوی ئاوارەبوون و پاشەکشە لە خەباتی شاخ بووە.

کە باسی خیشی ئەو هاوڕێیانە دەکات لە نموونەی شەهید عزیز مەحمود، هاوڕێی بەوەفای کۆمەڵە، ملازم عومەر و ئەوانی دیکەوە، دەبوو بۆ جارێکیش باسی کەرەتێکی دەسرازەی خیشکردنەکانی خۆی بگێڕایەوە، وەک ئەوەی هیچ جارێک کەلوپەلەکانی کۆ نەکردبێتەوە و نەکەوتبێتە گەفی بەجێهێشتنی شۆڕش و گەڕانەوە بۆ ئەورووپا، کە بەدڵنیاییەوە حاڵەتێکی ئاسایی و غەریب نەبووە، بەتایبەت لەو چرکەساتانەی مرۆڤ تووشی فشاری دەروونی خۆی دەبێت، هێز نییە بتوانی بەرگەی ئەو ڕەفتارە بگرێ کە خۆی

دەیکات. لێرەدا بە پێویستی دەزانم ئەوەیش بخەمە سەر سەکۆی مەبەستەکانم، بەتایبەتی بەرانبەر عزیز مەحمود کە هاوڕێیەکی گیانی بەگیانی ڕۆژانی خوێندنی زانکۆی بەغداد و ریزی ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە بوو. ڕۆڵی گیانبازانەی هەبووە لە بڵاوکردنەوەی دەنگ و ڕەنگی کۆمەڵە لە شارەکانی بەغداد و سلێمانی و کەرکوک، هەتا هەولێر و بادینانیش، بەتایبەت بەدوای هەنگاونانی "ئارام" و هاوڕێیانی بۆ سەرلەنوێ گرتنەوەی کۆمەڵە. عەزیز بە جووتە لەگەڵ سەربازی نەناسراو جەمالەڕەش، دوو لە گورجوگۆڵترین هاوڕێیانی کۆمەڵە بوون لەوێ ڕۆژی لێقەوماند. مەردانە هاتبوونە دەست و لەناو شار و شاخدا، کەناڵێکی بەبڕشتی پشت و پەنای هەوڵدانەکانی "ئارام" بوون، بۆ گرتنەوەی شیرازە پەرتبووەکانی ڕێکخستن لە سەرتاپای کوردستان و بەغداد. دواتریش ئەو دوو مرۆڤە قارەمانە خۆشی لە خۆ نەدیوە، بەتەواوی ئارەزووی خۆیانەوە، لەشانی ئارام و هاوڕێیەکانیان چوونەشاخیان هەڵبژارد و درێژەیان بەو خەباتە سەختەی ئەو ڕۆژەدا. هەتا گیران و توشبوونیان، وەک هەندێ لە گیراوەکانی هێئە خاسەی کەرکوک دەگێڕنەوە، لە نموونەی هاوڕێیانی لەژیاندا، قاسم عەزیز و تەلعەت خدر، ئەوجا دیدەنی تایبەتی خۆم بۆلایان لە ڕۆژی پێش لە سێدارەدرانی مامۆستا عەزیز لە موسل. هەردووکیان نموونەی قارەمانێتی و خۆڕاگری نەوەک هەر بۆ خۆیان، بەڵکو بۆ ئەو هاوڕێیانەیش کە لە زیندانەکان بوون، مایەی لێفێربوون و وانەدانەوەی خۆڕاگری و پاراستنی نهێنییەکانی کۆمەڵە بوون.

**تێشکانی نەفسی و سیاسی..**

**(هەر چەندە سەفەرەکەمان 3 حەفتە زیاتر درێژەی نەکیشاو، هەمو بەسەلامەتی گەیشتنەوە سوریا، بەلام بەراستی ئەمە تیشکانیکی نەفسی و سیاسی ناخوش بو. بومن تەجروبەیەکی دەولەمەن بو بو روژگاری داهاتوم. هەندی لەوانە هاوبەشی ئەم ریپیوانە سەرنەکەوتوە بون. خەتای منیان ئەگرت و، بەیەکجاری چونە ئەوروپا..)ل/١٢٧**

یەکەمجارە نەوشیروان ڕاشکاوانە تێشکانی نەفسی و سیاسی ناخۆش، لەو کتێبەدا بەسەر زاری گوزەر دەکات، بەڵام ڕستەکانی وا هۆنیوەتەوەکە، کەس نازانی بەراستی مەبەستی تێشکانی خۆیەتی، یان بەشدارانی ئەو ڕێپێوانە؟ دەکرێ بپرسین ئەگەر مرۆڤ سەرکردەی مەفرەزەیەکی شۆڕشی نوێ بێت، تەنیا بە یەک جەولەی سێ هەفتەیی، فاشل و تووشی تێشکانی نەفسی و سیاسیی گەورەی ئاوا بێت، ئەدی ئەگەر لە دەمی ئاشبەتاڵدا، مەسئولی هەموو شۆڕش بێت، دەبێ تووشی چ جۆرە ڕووخان و نوچدانێک بێت! هەروەها خوێنەر بۆی هەیە، لێرەدا تووشی هەڵوەستەکردن ببێت، کە چۆن نەوشیروان لە ئاست

خیشکردنی هاوڕێیەکانی دەکەوێتە گاڵتەپێکردنەوە، کەچی تێشکانی نەفسی و سیاسی خۆی دەبێتە مایەی دەوڵەمەندبوونی تەجروبەکانی خودی خۆی لە داهاتودا..! ئەتۆ بڵێی ئەو برادەرانەی ئەوێ ڕۆژێ کە لەگەڵ نەوشیروان بوون لەو ڕێپیوانە، گوایە چونەتە ئەورووپا، یەکێکیان بەژیان نەمابێت! کە لەوبارەوە قەزاوەتی خۆی بکات، کە لە لای خۆیەوە ئەوانیش بە فاشیل لە قەڵەم دەدات و بۆیان دەکاتە سەرمایەی چوونە ئەورووپا. بەبێ ئەوەیش بە خۆی ڕابفەرموێ کە ناوی چەند دانەیەک لەو بەشداربووانە تۆماربکات. کە وەک هەر یەکێکی دیکەی بەشێکی سەرانی سیاسی کورد، هەموو تێشکان و سەرنەکەوتنێکی سیاسی لە خۆیان بە دوور دەگرن، بەپێی ئەو لەخۆڕادیتن و لەو کەرەستەی بەردەم و دەوروبەریان. ئەویش هۆکاری تێشکانە نەفسی و سەرنەکەوتنە سیاسییە گەورەکەی، هەر لەسەرەتای یەکەم هەنگاوی شۆڕشی نوێ، ئۆباڵەکەی دەخاتە ملی بەشداربووەکانی دیکەوە و ڕەخنەکانیان داماڵەخاس دەکات و خۆی سەلامەت دەهێڵێتەوە..!

(فەرهاد شاکەلی لە قسەکانی من (توشی خیبە امل) بو، بگرە وەکو ئەلین قوشقی بو. خویشی ماوەک بو توشی سەر لی شیوانی سیاسی بو بو، ئەیویست بەیەکجاری بچێ بۆ ئەورووپا، وازی لەیەکیتی و کومەلە هینا... پاشان رووی کردە سوید. وازی لە شیعر هینا. بەلام فیری موهتەراتی سیاسی بو.)ل/١٢٨ — ١٢٩

بەشێکی زۆری بەڕێوەبەرانی حیزب و شۆڕشی کوردان لە هەموو بارودۆخێکدا، بەبێ گوێدانە ڕیزگرتنی هەست و نەستی ئەو خەڵکەی بە هەر شێوەک بێت، لێیان کۆبوونەتەوە، وەک میراتگری خەڵکی کورد، مامەڵەی حەزونەزی خۆیان لەگەڵ ئەندامان کردووە و لە شەرعی ئەواندا، هەر یەکێک کە بە ئارەزووی خۆیەوە، ڕێبازی خەبات و حیزبایەتی گرتووە، دەبێت بۆ هەمیشە کۆیلەی بەردەستی ئەوان بێت، لە هیچ وردودرشتێکدا، ئەو ئەندام و مرۆڤە نابێ هەر بڕیاردانێکی خۆی بەدەست خۆیەوە بێت، یان خاوەنی ئازادیی بڕیاردان بێت، بەتایبەت لەو شتەی کە پێوەندی بە خودی کەسایەتی خۆیەوە هەیە، لە درێژەدان بە خەبات و کاری سیاسیدا، یان وازهێنان لە خەباتی حیزبایەتی و سیاسەتکردنەوە. ئەوە مۆرکی بەرچاوی پراکتیکی ئەو جۆرە سەرکردانەیە، کە مافی ئارەزوومەندانەی بەشداریکردن و درێژەدان بەو خەباتەیان، لە مرۆڤەکان قوتکردووە. لەو جۆرە فەرهەنگە دواکەوتووەدا، هەر یەکێک بوو بە ئەندامی حیزبی، دەبێ هەتا سەرگۆڕەکەی ەەر حیزبییەکی گوێڕایەڵ و کوڕە عاقڵەکەی حیزب و بەستەزمان بێت. من نموونەی فەرهاد شاکەلی وەک شەخسی فەرهاد باس ناکەم، چونکە خۆی لە ژیاندایە. بەڵکو باس لە سوخەت و ئاکاری ئەو سەرکردایەتییە دەگێڕمەوە، کە لەو بوارەدا، تەڕ و وشکیان بەیەکەوە ئاگر تێبەرداوە. دیارە هەوڵ و تێکۆشان بۆ خەڵک و وڵات، وەک شتێکی

ڕەوا و دروست، بە شێوەیەک لە شێوەکانی ئەرکی سەرشانی هەموو مرۆڤێکی ئاساییە و ڕوومەتی دروستی ڕەوابوونەکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە هەموو مرۆڤێک ئارەزومەندانە، بە حەزی خۆیان ئەو ڕێبازە سیاسییە دەگرنەبەر و بەنرخترین سەروەری و گیانی خۆیانی بۆ بەخت دەکەن. هەر ئاوایش بەتەواوی ئازادیی خۆیانەوە، بڕیار دەدەن لەوەی لە چەقی ڕێگا بوەستن و بە هەر بیانوێک بێت پاشگەز ببنەوە و لەو ڕێگایە ئاشبەتاڵ بکەن. کە میتودی بیرکردنەوە و کارکردنی زۆربەی سەرانی حیزبی کوردی، ئەو ئازادییەی تاکی مرۆڤی قبووڵ نییە. بەڵام سەیرەکە لێرەدا ئەوەیە، کە یەکێکی دونیادیتە و ئاشنا بە گۆڕانکارییەکانی شارستانییەت، خاوەن پراکتیکی کەشوهەوای خوێندنی سیاسەت لە زانکۆیەکی بەرزی ئەورووپی، پیادەی ئەو میتۆدە دەکات و پاش دەیان ساڵ ئەزموون، سووره لەسەر بەکارهێنانی. نادروستی ئەو جۆرە پراکتیکە و لەگەڵ سەرچێغ چوونەکەی، سەبارەت بەوەی کە گوایە فەرهاد شاکەلی لەوێ ڕۆژەوە وازی لە شیعر هێناوە یەکدیتەوە! وەک ئەوەی لە دەلاقەی ئەو جۆرە بیرکردنەوانەدا، هەر شاعیر، پزیشک و ئەندازیارێک، ڕۆشنبیرێک وازی لە حیزبایەتی بەردەستی فلان و فیسار سەرکردە هێنا، ئەوە لە سیفەتی پزیشکی، شاعیری، ئەندازیاری، ڕۆشنبیری دەشورێ. لە ئاسۆی بیر و کرداری پڕ تەمومژی ئەو جۆرە کۆنتراکچییانەوە، هەریەکێکی شاعیر یان ڕۆشنبیر کە لە حیزب ئاشبەتاڵی کرد، هەر لێدوان و پەیڤینێکی سیاسی بدات، ئەوە بە موهاتەراتی سیاسی ناوزەد دەکرێ. واتە هەتا ئەو مرۆڤەی وەک هەویری خاو بچێتە بەردەست سەرانی سیاسەتکاری کوردی، دەبێ هەمیشە گوێڕایەڵ بێت، ئەگەر وانەبێت، ئەوە چۆن پێشمەرگە چەک دەکرێ، ئەو مرۆڤەش لە ڕوناکبیری، هەتا خوێندەواری داماڵەخاس دەکرێن. ئەوجا دەبێ مەزەندە، خەمڵێندانە عەنتیکەکانی ئەو زاتە مەسئولانە، سەبارەت بە سەروەری، لاپەڕە گەشەکانی کۆمەڵانی خەڵک، لە عەرشی فەلەک تەقلە بە چ زڕە خەونێکەوە لێ نەدات..!

ئەو جۆرە شێوازەی نووسینی نەوشیروان، هەر لە دەستووری جەنگەڵ دەکات، ئەوەی بەهێز و دەسەڵاتدارە، خاوەن ڕابردوویەکی پڕ مەسئولیەتە، ئەوجا ئەو مەسئولیەتە لە هەر کوێیەک بێت و هەرچییەک بێت، یان میزاجی عەشیرەت و عەشیرەتکاری لە مێشک دەخولێتەوە، ئەگەر بۆ خۆیشی خاوەن عەشیرەت، تەکیەی شێخایەتی و سیخوڕێکی گەورە بووبێت، ئەوە چەند قەد باشترە. لەگەڵ ئەوانەیش زەنگین و خولاپێداون، لە حەوشەی شەرعی ئەو پیادەکارانەی دەستووری جەنگەڵ، دەبێ هەمیشە ئەو زاتانە سەرکاری حیزب و شۆڕش و کوردایەتی بن. لە پێیودانگی ئەزموونی بەندە لەو کاروانە سەر بە گۆبەندەدا، بە شێوەیەکی سیستەماتیکی لەلایەن بیر و کرداری سەرانی لەو جۆرە، هەر ئەو زاتانە

دانەخۆرە دەکرێن، وەک دەروێشی گوێڕایەڵ، بە گوێکاری مامۆستا رادەهێنرێن. بەڵام ئەوانەی خاوەن کەسایەتییەکی بەرچاوی خۆیانن، هەرگیز ئامادەی ماستاوکردن و خولانەوەی بەر سێبەرەکان نین. رۆژێک لە رۆژان هەڵوێستێکی نەیار بە مەملەکەتی سەرکردەیان دەربڕیوە، دەبێ شاربەدەر بکرێن، هەتا مێژووی خەبات، ماندووبوونی رۆژانی سەخت و قوربانییەکانیان بسڕێتەوە و گوم بکرێن.

هەر لەو بوارەدا. نەوشیروان بەردەوامە لە باسکردنی گاڵتە ئامێزانەی، بە خاوەن هەڵوێست و رای جیاواز. هەروەک لەلاپەرە ١٢٩ دا نووسیویەتی:

(یەکی لەم خویندکارانە تازە لە عیراقەوە هات بو. دوستی کومەلە بو. لە کلیەی هندسە وەرگیرابو. ناوی شەمال بو. شەمال لە هیچی کەم نەبو، موچەی مانگانەی ئەوەندەی موجەکەی من بو. پارەی کتیب و کەلوپەلی زانستگاشیان بو دابو.)ل١٢٩

دیارە ئەو شەماڵ ناوە کە نازانم کێیە، وەک هەڵوێستێکی سەرچڵی کوردانە، راستگۆیانە هەستونەستی خۆی دەربڕیوە، لەلای خۆیەوە ئەوەی بۆ قبووڵ نەکراوە، ملکەچی سیستەمی رژێمێک بێت کە هاونیشتمانییە کوردەکانی بە دڕندانەترین شێوە چەوساندوتەوە. دیارە ویژدانی رێگەی پێ نەداوە و چاوی بەرایی نەداوە، لەو سێبەرەدا بخوێنێ. نەوشیروان لەسەرزاری "شەماڵ"دا وا دەگێڕێتەوە:

(من ناتوانم لە ولاتیک دا بخوینم کوردی تی دا بچەوسیتەوە. کورد لە سوریا نەچەوسینریتەوە لەبەر ئەوە منیش تاقەتی خویندنم نیە)ل/١٢٩

لە ئەنجامی ئەو جۆرە بەرخوردەدا، بەتایبەتی لە ریزەکانی کوردایەتیدا، لەسەر دەستی مەسئولەکانی بەرساباتی ئەو جۆرە هزر و پراکتیکەوە، دەیان کادر و مرۆڤی وڵاتپارێز، خاوەن هەڵوێستی رۆژانی سەخت، دڵڕەنجێنراو، پەراوێز کراون. بەشێکیان بەناچاری سەری خۆیان هەڵگرتوە و لە غەریبایەتی گیرساونەتەوە. پراکتیکی لەو جۆرە تەنیا بووەتە مایەی ئەوەی دەیان رۆڵەی پاک و خەباتگێڕ "قوشقی" بکرێن و لە کاروانی خەباتی سیاسی و رێکخراوەیی دووربخرێنەوە. لەبەرهەمدانی کارای ئەو مەیدانە بۆ نەتەوەکەمان قوتکراون و تەنیا کەنارگیرییان بۆماوەتەوە. ئەوەتە بەرۆژی ئاشکرا ئەو کەلەبەرەی کەوتوتە جەستەی بونیادی کەسایەتی نەتەوەکەمان، بە هیچ یەکێک لەو خاوەن پراکتیکانە پڕ ناکرێتەوە و تەنیا نەتەوەکەمان زیانبەخشی سەرەتا و کۆتاییە.

**عەشیرەتی ستەملێکراو و فریاد بۆ کردنیان..**

**(لە سەرەتای سییەکانەوە دوژمنایەتییەکی خویناوی لە بەینی برادوست و بارزانییەکان دا هەبوە.**

**دانیشتوانی برادوست چەند جاری لە ژێر گوشاری چەکداری بارزانی و هاوپەیمانەکانیان دا**

**ناوچەکەیان چول کردوە. کشاونەتەوە بو تورکیا یا چونەتە دەشتی هەریر و هەولیر.)ل/١٤٠**

نەوشیروان لە پەراوێزی مەبەستەکانی، سەبارەت بە راستی و دروستی ناوەڕۆکی گێڕانەوەکانی، گەرەکیەتی خوێنەر هەڵەداوان بکات، دەنا کێ هەیە لە کوردستان بەوە نەزانێ، چ عەشیرەتێک جاش و لە شانی هێزی رژێم بووە و کێ پێشمەرگە و لە بەرەی شۆڕشدا بووە؟ لەو پێناوەدا وەک ئەوەی نهێنی ستەملێکراویی عەشیرەتێکی کورد ئاشکرا بکات، فریادیان بۆ دەکات و خەمخۆرانە کەوتوتە راڤەکردنی ئاوارەبوونیان لەسەر زێدی خۆیاندا. بەچەندان لاپەرە پێناسەی بارودۆخ، دۆزی مێژویی و باری جوگرافی ناوچەکەیانی کردووە و دەست خۆشانەی گەرەکە. بەڵام بە هەمان هەناسەی رابردووەوە، لە باوەشی نەیاری کۆنینە لەگەڵ بنەماڵەی سەرکردایەتی بارزانیدا، دیسانەوە یەکلایەنە و رەپ و راست، تەنیا ئۆباڵی ناکۆکی نێوان دوو عەشیرەتی کۆمەڵی دواکەتووی کوردەواری، ناحەقییەکانی بۆ ئەستۆی عەشیرەتی بارزانییەکان گێڕاوەتەوە. کە تا رادەیەکی زۆر غەدر لە راستییە بەرمەیدانییە مێژووییەکان دەکات. سیاسەتمەداری کورد ئەوەندە بەربێن تەسکانە، بۆ خاتری دەم و رۆژ، پایە و شوێنی دوێنێی خۆی بەزوویی لەبیر دەکات، دەنا هەندێک لەو رۆژانەی نەوشیروان باسەکان دەگێڕێتەوە، خودی خۆی کادری پارتی و پێشمەرگەیەکی هەڵسوڕاوی شۆڕشی ئەیلول بوو. ئەو رۆژە سەری زمان و بنی زمانی کادرانی پارتی و شۆڕش، پیاهەڵدانی سەرشان و باڵی هەڵوێستی جوامێرانەی بارزانییەکان بوو، لە خۆدانە باوەشی شۆڕش و پێشمەرگایەتیکردن. هەر لەو دەمەشدا برادۆستییەکان، بەسەرۆکایەتی برا گەورەکانیان بە بیانوی نەیاری و بەربەرەکانیکردنی بارزانییەکان، کەوتبوونە هەڵەیەکی گەورەی پڕ لە شەرمەزاری و پشتکردن لە نەتەوەکەی خۆیان. دەستییان لەگەڵ دوژمنانی کورد تێکەڵ کردبوو، چەکی جاشایەتییان لەشان بوو، بەرۆژی روناک لە بەرەکانی شەڕی دژ بە شۆڕش و پێشمەرگەدا، بەشدارییان کردووە. هەموومان لەبیرمانە کە رژێم چۆن بۆ پاراستنی بنکە و مۆڵگاکانیان بەکاری هێناون، بە تایبەت لە ناوچەکانی دەوروبەری شاری هەولێردا. بێگومان دیرۆکی ناکۆکی و نەیاریی نێوان عەشیرەتەکان، لە نێوان سنوورە دەستکردەکانی نێوان پارچەکانی کوردستاندا، رابردوویەکی لە مێژینەی هەیە. دامودەزگای سیخوڕیی داگیرکەرانی کوردستان دەستێکی باڵایان هەبووە. هەرگیز سوچەکەی بەتەنیا، بەشی شێر بەر بارزانییەکان ناکەوێت، بەتایبەت بارزانییەکان بەدرێژایی ئەو دیرۆکە هەر لەگەڵ

بەرەی نەتەوەکەی خۆیاندا بوونە. بەو هەڵوێستەیان لەلایەن داگیرکەرانەوە، هەمیشە شەڕیان پێ فرۆشراوە و کۆسپ و تەگەرەیان بۆ رایەڵ کراوە، بەتایبەت لە رێگای هاندانی عەشیرەتە هاوسنوورەکانی ناوچەی بارزانییەکان، بۆ پەلاماردان و تالانکردنیان، ئەزیەتدانی ژن و منداڵ و پیر و پەککەوتەکانیان. ئیتر ئەوانیش ئەوەندەی بۆیان کراوە بەرپەرچی هەر جۆرە زۆردارییەکی ئەو نەیارییەیان داوەتەوە. لە ئەنجامدا بوونەتە بەشێکی سیستەماتیکی لە پێکهێنەر و بەشداری کاری بەرچاوی شۆڕشی کوردستان. ئەوجا ئەگەر هەر کەموکوڕی، لادانێکیان لە رەوتی کوردایەتی هەبووبێت، لە رووی راستی ئەو حەقیقەتە کاڵ ناکاتەوە، چونکە هیچ هێز و لایەنێک لەو مەیدانە بێ خەوش نییە. ئەزموونی کەس لەوەی دیکە لە ئاستی خامۆشییەکان کەمتر نییە و کەس لەو کاروانەدا فریشتە نەبووە.

### تەسلیم بونەوەی پێشمەرگە و بوونیان بە جاش..

(مديرية الاستخبارات العسكرية.. دەیان مەفرەزەی تایبەتی دامەزراند بەتایبەتی لە کونە پێشمەرگەکانی ق. م. ئەمانە بەژمارە کەم بون، بەلام زەلامی درو گورج وگول و پیاوکوژ یان تی دا کۆکردبونەوە.)ل/١٤٨

سەیرە هەر جاشێکی خائین بە وڵات و نەتەوەکەت، بە زەلامی ئازا، دڕ و گورجوگۆڵ پێناسە بکرێ! کە ئەوەی خەڵکی کورد، بەتایبەت گوندنشینەکان دیویانە، کامە پێشمەرگەی زۆر ئازا و قارەمان، کە لە مەیدانی نەبەردی و بەرگریکردن لە خاک و نەتەوەکەی بە هەر بیانوێک کۆڵیداوە و تەسلیم بە دوژمن بوتەوە، دواتر ئەگەر بە هەر هەنجەتێک بێت، چەکی دوژمنی لەشان کردووە و لە بەرانبەر ناوی پێشمەرگە و هەڵمەتی ئەواندا، تابلێی زەلامێکی ترسنۆک و تەوەزەلی لێ دەرچووە. سەرباری ئەوەی لە مەیدانی هێرشکردنە سەر پێشمەرگەدا، بە هەموو جۆرە ئیمکانیاتێکی رژێم لە هێزی سەربازی، دەبابە و بەتایبەت کۆپتەر، هەتا بە فڕۆکەی جەنگیش پشتیوانی کراوە، کەچی ئەو جاشانە هەمیشە لە بەرەی شەڕی پێشمەرگەدا شکاون و رایانکردووە. راستە لە ئاست خەڵکی بێدیفاعی گوندەکان، شوان و گاوان، رێبواری بێچەکی ئێرە و ئەوێ و دەستەخرۆ و دەمچەفت، جاشی دڕ و پیاوکوژ بوون، یان تەنیا لە کەمینێکی شەو و ئیخبارییەک، نامەردانە توانیویانە دەست لە پێشمەرگە بوەشێنن. ئەگەر وا نەبوایە و ئەو جاشانە بەرانبەر بە پێشمەرگە، ئەوەندە زەلامی دڕ و گورجوگۆڵ بوونایە! نەدەبوو یەک پێشمەرگە بە زیندوویتی بمایەتەوە و خەباتی چەکداری هەبوونی هەبوایە. چونکە هەمیشە ژمارەی جاشەکان سەدان، هەزاران کەرەت لە ژمارەی پێشمەرگە زیاتر بووە.

لێرەشەوە نەوشیروان یەکلایەنە خۆی لە راستی دیاردەی تەسلیمبوونەوەی پێشمەرگە و بوونی بە جاش دەدزێتەوە. گوایە ئەوە تەنیا پێشمەرگەکانی پارتی (قیادەی موەقەتە) بوون تەسلیم بوونەتەوە و بوون بە جاشی دڕ و زەلامی گورجوگۆلی پیاوکوژ، وەک ئەوەی هیچ پێشمەرگە، مەفرەزە و هێزی دیکە تەسلیم نەبوونەتەوە و چەکی جاشێتییان هەڵنەگرتووە! دەبوو کە ئەو باسەی هێناوەتە گۆڕێ، راشکاوانە بکەوتایە شرۆڤەکردنێکی ئەو دیاردە دزێوە، دەستی تەنیا بەسەر لایەنێکی نەیاری سیاسی خۆی نەهێنایە، کە دەیان ساڵی بەسەردا تێپەڕیوە. بەراستی ئەو دیاردە زەقەی پەراوێزی شۆڕشی نوێی نەتەوەکەمان، جێگای هەڵوەستە لەسەرکردنە. لەلایەکەوە وەک بەسەرهاتە دڵتەزێنەکان دەگێڕنەوە، فاکتەری سەرەکی لە دیاردەی ئەم جۆرە تەسلیمبوونەوە و بوونە جاشی دڕ! یەکێک لە هۆیە بنەڕەتییەکانی، لە دەستمایەی شەڕی بێهودەی برایەکان سەرچاوەی گرتوە، کە نەوشیروان کەموزۆر تخونی ناکەوێ و ئاماژەیەک بۆ ئەو زەمینەی دیاردەی جاشێتی ناکات.

بێگومان سیاسەتی سەرانی حیزبە بەشداربووەکانی ئەو شەڕە نگریسە، ئەوەی بە هزر و مەزەندەیان داهاتووە بۆ لەناو بردن و بڕینەوەی یەکتری، درێخییان نەکردووە. هەتا پەنایان بردوتە بەر ئەو شێوازە چەپەڵەوە، کە هیچ دوور نییە، مەفرەزە و هێزە دوورەدەستەکانی خۆیان بۆ ئەوە تاوداوە کە لەکاتی تەنگانە و فشاری لایەنی نەیار، یان وەرسبوون لە خەباتی پێشمەرگانەی شاخدا، لەگەڵ دوژمن و دامودەزگا سیخورییەکانی پێوەندی بگرن. لە پشتەوەیش گورزی نامەردانە لە پێشمەرگەکانی هێزی نەیاریان بدەن و تەسلیم بە رژێم ببنەوە و دواتر ببن بە جاش و درێژە بەکارە چەپەڵەکانیان بدەن. چونکە دەسرازەیەک رەوەجاش پەیدا ببوون، کە هەر کۆمەڵێکیان بۆ خۆی تەنیا شەڕی جدی لەگەڵ پێشمەرگەی حیزبێکی دیاریکراوی نەیاری مەبەستی خۆی دەکرد و پێشمەرگەی شەهید دەکردن. کەچی چاوی لە مەفرەزە و پێشمەرگەی حیزبی خوازراوی مەبەستی خۆی دەپۆشی و بگرە کارئاسانی و هاوکاریشی دەکردن لە پەراوێزی ئەزموونی خەباتی شاخدا. دەیان نموونەی زەقی نەشاراوەی ئەم هێز و ئەو هێزەی دیکەی لێ کەوتوتەوە، هەر یەکێک نکوڵی لێ بکات، سەری خۆی دەدا لە کۆستی قوربانییە بەفیڕۆچووە بێشومارەکانی هەموو لایەنەکان و باشترین نموونەیش هەنووکە دەیان فەرماندەی رەوەجاشی بەرتەبارەی ئەنفالی بەدناو و نۆکەری بەرئاخوری رژێمی بەعس، بەبیانوی ئەوەی لەوان رۆژان، گوایە خەتی مایلی ئەوان بووە، هەتا ئەمرۆکەیش لەبن باڵی ئەو حیزب و ئەو حیزبی خەباتی شاخ مەلاس دراون و بەو بیانوە دەپارێزرێن.

هەروەها فاکتەرێکی تری، تەسلیمبوونەوەی پێشمەرگە و بوونە جاش، بریتییە لە چۆنیەتی پێکهاتەی چەندایەتی و چلۆنایەتی خودی هێزی پێشمەرگە خۆیەوە. هەم لە رووی هۆشیاری، تێگەیشتنی رەوایی بوونە پێشمەرگە، هەم لە بواری شارەزایی سەرەتا ئەساسییەکانی خەباتی پێشمەرگانە، ئەگەر لە باشترین حاڵەتدا هەبووبێتن، ئەوە تا بڵێی لاواز و لەرزۆک بوونە. تەنیا لەسەردەستی "ئارام" هەنگاوی بۆ هاوێشتراوە، کە سەرەتایەکی نوێی پێشمەرگایەتی دابهێنرێ. دەنا سەرانی خەباتی شاخ، هەردەم خەونیان بەوە بینیوە کە هێزی چەکداری زۆروبۆر، لە بەرگی ژمارەی هەر چەند زۆری پێشمەرگە بەدەوری خۆیاندا ببیننەوە، ئەوجا خودای دەکرد، وڵات بە فویەک دەچوو بە ئاسماندا. دیارە رژێمیش لەو جۆرە گۆمە لیڵ و شێلوەدا، زۆر وەستایانە مەلەی خۆی کردوە.

**سوپای داگیرکەری رژێمی عیراق..**

(جەیشی عیراق لە کوتایی مانگی مارتەوە هێرشێکی زۆر فراوانی بو سەر هەمو ناوچەکانی کوردستان دەس پی کرد. هەمو ئەو فیرقانەی لە موسل، بادینان، هەولیر، کەرکوک، سلیمانی مول درابون بەشدار بون. کەلکیان لە شارەزایی هەمو ئەفسەرە شارەزاکانی جەیش وەرگرت و، پرسیان بە هەندی لە کونە فەرماندەی هێزوبەتالیون و سەرلقی شورشی ئەیلول ئەکرد.)ل/١٤٩

نەوشیروان لە شانی باسکردنی بارودۆخی ئامادەباشیی لەشکر و هێزی سەربازی رژێم بۆ پەلاماردانی بنکە و مەکۆی پێشمەرگەکانی شۆڕشێ نوێ، بە خۆی رانافەرموێ ئەو جەیشە بە سوپای داگیرکەر ناوببات، بگرە لێرەوەیش کەوتوتە پلارگرتنی یەکلایەنەی کاربەدەستەکانی رابردووی شۆڕشی ئەیلول بەتەنیا، کە لەژێر رکێفی دەسەڵاتی رژێم بوون. جارێ لە پێشەوە، راستە زۆرێک لەوانە پرسیان پێ کراوە. پاشان رژێمی بەعس بۆ بنبڕکردنی بزاڤی کورد لە شار و شاخەکاندا، هەرگیز درێخی نەکردووە لە سودوەرگرتن لە هەموو ئەو کەس و تاقم و لایەنانەی رۆژێک لە رۆژان لەپاڵ هێزی رژێم چەکدار بوونە، یان تەسلیم بوونەتەوە، هەر لە کاربەدەستەکانی شۆڕشی ئەیلولەوە، بگرە تا دەگاتە هەندێ لە کادر و مەسئولەکانی رەوتی مەکتەبی سیاسی کۆن، حشع و کوردەجاشەکان، بەبێ جیاوازی. کەچی نەوشیروان خۆی لە ناوهێنانی بەشێکییان دەگرێ! چونکە ئەو رۆژە لەناو هەموو ئەو تاقم و تەدارەکانەی کورد، کە لە سێبەری بەعسدا بوون، پۆستی وەزیری و راوێژکاری تایبەتی موخابەراتی، دەزگا سیخورییەکانی دیکەیان هەبووە. ئەوانە بەرەسمی رێنماییکاری سوپای داگیرکەری رژێم بوون لە چۆنیەتی، پەلاماردانی پێشمەرگەدا.

(جەیشی عیراق لە شەڕەکانی دا زووتر پشتی بە زەبروزەنگ، کوشتن و برین ، سوتاندن و ویرانکردن ، ئەبەست ، بەپی ی سەرەتاکانی.. (شەلم کویرم، کەس نابویرم) و ، سوتاندنی تەرو وشک بەیەکەوە .)ل/١٤٩_١٥٠

پەیڕەوی دڕندانەی لەشکری داگیرکەری بەعس، لەبەرانبەر نەتەوەیەکی ستەمدیدەی بێپشت و پەنا، دیارە شتێکی نوێ نەبووە، بەدرێژایی خەباتی چەکداری لە کوردستاندا. ئەوە مۆرکی بەرچاوی ئەو سوپایە بووە، بۆ بەدەستهێنانی سەرکەوتنی سەربازی و تێکشکاندنی روحی موقاوەمەتی خەڵکی کورد. راستە لەشکری بەعسییەکان لە بەکارهێنانی هەر جۆرە رەفتارێکی فاشستانە نەسلەمینەتەوە و وەک دوژمن هەڵسوکەوتیان کردووە. دەبوو ئەو کارە چەپەڵانەی رژێم لەگەڵ خۆیدا، کاردانەوەیەکی پۆزەتیفانەی بەسەر ئاراستە و ئاکاری سەرانی هێزی پێشمەرگەی کوردستان بخولقاندایە، لە رووی قوڵبوونەوە و چاکتر قاڵبوون لە خەباتی شۆڕشگێڕیدا. کەچی هەر ئەو پەیڕەوە قێزەوەنەی لەشکری داگیرکەر، لێرەولەوێ بوەتە وێردی لاساییکردنەوەی کوێرانەی ئەو پراکتیکە دیکتاتۆرییە، لە مامەلە و هەڵسوکەوتەکانی بەر مەیدانەکانی شەڕی ناوخۆی بێهودەی برایەکاندا. لەسەر دەستی سەرانی پێشەوەی هێزەکانی پێشمەرگە لەبەرانبەر یەکتریدا، لە شەڕی نارەوای کوردکوژی نێوان حیزبە چەک بەدەستەکانی شاخ و دواتر شار لە کۆن و نوێدا، بۆ قڕکردنی یەکتری سود لەو جۆرە پەیڕەوەی لەشکری داگیرکەر وەرگیراوە. ئەزموونی خەباتی چەکداری کوردستان دەیان نموونەی لاسایی کردنەوەی رەفتاری ئەو لەشکرە دڕندەیەی لە هەگبەدایە، بەتایبەت لە بواری وێنەی قێزەوەنی گوللەبارانکردنی بەکۆمەڵی پێشمەرگە و کادری بەدیلگیراو و خۆبەدەستەوەدەری پێشمەرگەی لایەنێکی کورد بە لایەنێکی دیکەوە. ئەوکارە چەپەڵە بە فەرمانی سەرکردەکانی لایەنی سەرکەتوو لەو جێگایە، بە دەستووری جەنگەڵ ئاسا لەلایەن کادر و پێشمەرگەکان ئەنجام دراوە. کە بۆ هەر مرۆڤێکی ویژدان زیندوو، خۆ لەقەرەدانی ئەو راستییە تاڵ و تفتانە، پێویستی بە جورئەتێکی شۆڕشگێڕانەی پڕ لە خۆڕادیتنەوە هەیە، هەتا ئەگەر سەرووپۆتەلاکی خۆیشی بگرێتەوە. لە پێناوی لەقاودانی ئەو کارە چەپەڵانەی لاساییکردنەوەی فاشستەکانی بە روومەتەوە بووە. کە دیارە بە رەخنەلەخۆگرتن و هەڵوەستە لەسەرکردنیان و داوای بووردنکردن، مایەی داهێنانی ئاراستەیەکی نوێ و زەمینە خۆشکەرە بۆ ئەوەی لەدرێژەپێدانی سەرانی کورد، جارێکی تر خەڵک باوەڕ بە قسە و گفتەکانیان بکات. نەوەک بە شێوازی تەنیا قەرزارکردنەوەی دوژمنان و پەردەپۆشکردنی رووی ناشیرین و زیانبەخشی کردەوەکانی ناوەکی خۆیان.

(یەکێک لە نیشانەکانی فاشیزم لە سەرانسەری دنیادا، پێشێل کردنی سەربەستی ویژدانە. واتە زەوت کردنی مافی ئازادی دەربڕینی بیروڕای سیاسی، فەلسەفی، کومەلایەتی، دینی، مەزهەبی جیاجیایە. فاشیستەکان کە دژی مافی بیروباوەڕی ترن، بەهەمو ریگەوشیوەیەک هەول ئەدەن بو سەپاندنی بیرورا تایبەتییەکانی خویان و لەناوبردنی بیرورِاکانی تر بەئاگرونەسن.) ل/١٥٠

نەوشیروان بەدوای پێناسەکردنی واقیعییانەی فاشیزم، دەبوو رچەشکێنانە ئاوڕێکی بەلای پەرێزی پۆخلی هێزە ناوەکییەکانی خۆماڵی بدایەتەوە و بۆ داهاتوویش، ئاراستەیەکی داهێنەرانەی بۆ رێبازی کوردایەتی نەخش بکردایە. بەلام یەکێکی تر لە لاسارییەکانی ئەو تیپەی سەرانی کورد لە کاروانی خەباتدا، بریتییە لەوەی کە کوێرانە لاسایی هەندێ لە کار و کردەوەکانی دوژمنان، بەتایبەت بەرانبەر بە هاوبیرەکانی خۆیان بکەنەوە. بە جۆرێک تا ئەو دەمەی خۆیان، بێهێز و لاواز و هیچ لەبارانەبوون، یان لەگەڵ بەرژەوەندییە کاتییەکانیان هاتووتەوە، ئەوە دیموکراتیەتی سەرکاغەزیان لێ تکاوەتەوە ئازادپەروەری مەیدانی خەبات بوونە و سادە و ساکار و خاکی بوون لە بەژن و بالایان هەڵوەریوە، باسی سەربەستی ویژدانیان کردووە! کەچی هەر ئەوەندە خۆیان لە سێبەری تفەنگ و دەسەلاتی سەرکۆلی کەلەکی رەوتی رووداوەکان دیوەتەوە، یەکسەرە پەیدانی لەخۆباییبوون و تەماشاکردنی خەڵک لە بورجی عالییان لێداوە. هەرجۆرە موزایەدەیەکی دوێنێیان لەبیرچووەتەوە و کەوتوونەتە پیادەکردنی ئەو کاروکردەوە چەپەلانەی، دوێنێ کە خۆیان لەبەری بەدادەداد بوون.

چەند جوان دەبوو نەوشیروان لەوپێناوەدا بەگیانێکی لەخۆبردووانەی بەخۆداچوونەوە، یەک دوو نموونەی بەرمەیدانی پراکتیکی خۆییمانی بۆ بگێڕایەوە، لەو پێشێلکردنەی سەربەستی ویژدانی هاوڕێیانی و تاکی مرۆڤی کورد. لێرە و لەوێ لەلایەن سەرانی کوردەوە، ویژدانی سەدان و هەزاران مرۆڤی کوردی ئازادیخواز پێشێل کراوە، مرۆڤە خاوەن هەڵوێستە دیموکرات و ئازادیپەروەرەکان، بەردەوام توشی گێچەڵ و دەردی سەری هاتوون و ئازاردراون. سەربەستیی ویژدان خۆی لەناو بازنەی ویژدانێکی زیندوو سەرەتاتکێ دەکات، مرۆڤی خاوەن ویژدانی زیندوویش، هەرگیز لەسەر ئازادی بیروباوەر، زۆر بۆ سەروەرییەکانی مرۆڤ و لەقالبدان و زەوتکردنی بڕیاردانی خۆیی نابات. نەوشیروان لەپاش ساڵانێکی زۆر، دەیتوانی هەندێک لەو کردەوە ناهەموارانەی رۆژانی شاخی لەقاوبدایە، تاکو خەڵکانێکی زۆرتر و بەجەوهەرتر، باوەڕیان بە گۆڕانی بکردایە.

**وشەی ناسک و زانیاری دەمی خەڵک..**

نەوشیروان لە بەشێکی زۆری لاپەڕەکانی ئەم کتێبەدا، بەدەیان زانیاری و پێناسەی بەرهەمی ماندووبوون، شارەزایی زمان و کەلتور و جوگرافیا، مێژوو و دابونەریتی کوردەواریی زۆر سەربازی نەناسراوی وەرگرتوە و بە وشەی ناسک و پاراو تۆماری کردوون. یەک سەرچاوەی زیندووی لە زانیاری خوڵقاندوە، کە دەبوو بۆ ئەمانەتی مێژوویی، ناوی خاوەنەکانیان تۆمار بکات، تاکو خاوەنە رەسەنەکانیشیان تیشکی گەش و پرشنگداری ئەو کارەیان بەرکەوتایە. هەر بەو هەناسەیە، نووسەر هەتا لەگەڕانەوە سەر راپۆرت، باسوخواسی زیندان و خەباتی رێکخراوەیی، هیچ ئاماژەیەک بۆ خاوەنەکانیان ناکات. هەروەک بۆ نموونە نووسیویەتی:

(لیرەدا راپورتیکتان پیشکەش نەکەین هەڤالیکی تی کوشەرمان، کە خوی شایەتیکی ئەم ئەشکەنجەگایە بوە، پاش دەربازبونی نوسیویتی..)ل/١٥١

بەبێ ئەوەی خوێنەر بەناوی خاوەنی ئەو راپۆرتە ئاشنا بکات، درکاندنی ناوەکەی لەلای خۆی گلداوەتەوە، بەبێ ئەوەی کەس بزانی بۆچی..؟

**سەرەتاکانی دیاردەی شرەخۆری و گەندەڵی...**

(پیشمەرگەکان بو پیویستییەکانی تەننورەکە دەرگایەکیان دەرهینا گونکی لەسەر ببرن و هەندی تەنەکەی بەتالیان بو ئاو تی کردن برد بو بنکە. بو روژی دوایی پیویستیان بە هەندی شتی تر بو چون لە مەخفەرەکە ببەن هیچی تی دا نەمابو. خەلکی ئاواییەکە دەرگا و پەنجەرەکانیان دەرهینا بو، هەروەها هەمو تەنەکە پر و خالییەکانیان برد بو. تا ئەو کاتە لەترسی سزادانی بەعس نەیان ویرا بو دەستی لی بدەن، بەلام دوای ئەوەی پیشمەرگە دەستکارییان کرد، ئەوانیش بیانویان دەس کەوت بو ئەوەی لە پاشەروژدا ئەگەر هیزی حکومەت گەرایەوە، توبالەکەی بخەنە ملی پیشمەرگە.)ل/١٥٨

نەوشیروان بوێرانە لەگەڵ باسوخواسەکانیدا، نیشانەیەکی گرنگی لە ئەزموونی پاشەگەردانیی پێشمەرگەدا، کە دیارە بە بەرچاوی مەسئولەکان و رەزامەندی ئەوانەوە بوە، پێکاوە. وەک نموونەیەک ئەو شرەخۆرییەی لێرەدا باسی دەکات، بەدڵنیاییەوە ئەوەندە شتێکی گەورە نەبووە کە شایەنی ناوهێنان بوبێت، بەڵام وەک سەرەتایەک نموونەیەکی زۆر کۆنکریتی و زەقی چۆنیەتی سەرهەڵدان و گەشەکردنی سەرەتاکانی دیاردەی دزێوی شرەخۆرییە لەکاراوانی خەباتدا، کە هەمیشە پێشمەرگە بە بەرچاوی مەسئولەکانەوە، لەمەیدانی پاشەگەردانیدا، بۆ شرەخۆری خاترجەم کراون. ئەو سەرەتایە بوەتە سەرمەشقی کنەکردنی لەشکری ئارئاپ. کاروانەکەمان دەیان نموونەی تاڵانکاریی وەک

رووداوەکانی راوڕوتی بێتواتە لەساڵی ١٩٨٣دا و ئەوانەی مەیدانی شەڕی ناوخۆدا لەگەڵ خۆ هەڵگرتووە، کە هەر لەو جۆرە سەرەتایەوە ڕیچکەی بەستوە. ئەوەیش زۆرتر لەبەر خاتری ئەوە بووە ئەو جۆرە هێزە، لە بەردەم رەشماڵی قەڵەمڕەوی مەسئولەکان بمێننەوە و هەمیش دانەخۆرە بکرێن و بۆ داهاتوو پارێزەری دەسکەوتە شرەخۆرییەکانی گەورە و گەورەتری لێپسراوەکان بن. لە نموونەی شرەخۆرییەکەی بەربەستەکەی بێخمە لەدەمی راپەڕینی بەکۆمەڵی خەڵکی کوردستان لە ساڵی ١٩٩١دا و شاڵاوی شرەخۆرییەکانی رزگارکردنی کەرکوک.

بەڵێ ئەوە سەرەتایەکی زۆر جەوهەریی پەیدابوونی دیاردەی گەندەڵییە لەناو شادەماری حیزب و سەرکردایەتی و دەسەڵاتدا. سەرەتایەکەی بە قەدوباڵای خەباتی چەکدارییەوە ڕیچکەی بەستوە. هەنووکە هەر یەکێک لەو مەسئولانە، دەمی دەکاتەوە دەستی چەوری خۆی بە سەری ئەوەی دیکە دەسرێتەوە! کورد زۆر جوانی گوتوە، کە دەڵێ: گەورە ئاو دەرێژێ، بچووک قاچی خۆی تێدەخات.

نەوشیروان لە پەراوێزی ئەو شرەخۆرییە بچووکەوە، کە دەکرا بە شێوەیەکی ئاشکرا، لە بەشدارییپێکردنی خەڵکی گوندەکە لە حەپەلوشکردنی کەلوپەلە بەجێماوەکانی رژێم، دەستی بەسەردابگیرێ و ببەخشرێتەوە، نەوەک خەڵکەکە بە چاولێکەری پێشمەرگەی بەرچاوی مەسئولەکان بەدزی، پاشماوەی شتەکان ببەن. هیچ بەدواداچوونێکی نەکردووە لەو جۆرە پاشەگەردانییە و بگرە لەسەر ناوی حکومەت و ترس لە میری و پێشمەرگەکان، خەڵکەکە سەرەتا دەستیان بۆ شتەکان نەبردووە.

**جیڤارا و پێشمەرگەیاتی کوردان..**

**(راستیەکەی، هەرچەند لە خوم و هاوریکانم ورد ئەبومەوە، ئەو مەرجانەی گیڤارا بو پیشمەرگەی دانابو، بەتایبەتی لە روی توانای لەش و کول هەلگرتن و ریگا رویشتنەوە، لە ئیمەدا نەبو.)ل/١٥٨**

بە ڕێز و حورمەتێکی زۆرەوە بۆ هەر پەیڤ و پەیامێکی جیڤارا، کە دیارە لەنێو ڕێنماییەکانی پێشمەرگایەتی ئەودا، جۆرە جیاوازییەک لە ژیانی پێشمەرگایەتی لەگەڵ پێشمەرگە و مەسئولدا نەبووە. ئەوەی جیڤارا ئاراستەی بۆ کردووە، پێشمەرگەی شۆڕشگێر لە نموونەی "ئارام" بووە، کە وەک جیڤارا گیانی خۆیان بۆ ئەو راستگۆییە کردە قوربانی. نەوشیروان زۆر دروستی فەرمووە، کە ئەوان بە هیچ سەرەداوێکەوە بۆ ئەو هەلومەرجانەی جیڤارا شتێکیان بە داریێ وەنەکردوە. بەڵام نابێ بەندەیش لە چاوی پەیڤەکانی ئەودا لە ئاست پێشمەرگەی کورد چاو بنوقێنم و لە بناری ئەو هەورازە بڵندەوە قسەیەک نەکەم.

ئێمە وەک کۆمەڵە و یەکێتی و کورد بەگشتی، دەیان و سەدان پێشمەرگەی هەلومەرجەکانی ناوەڕۆکی پەیامەکانی جیڤارامان هەبووە، بەڵام رابەر و مەسئولی لە نموونەی جیڤارا و "ئارام"مان نەبوە. جیڤارا و "ئارام" هەر وەک پێشمەرگە دەژیان، لەگەڵ ئەواندا بوون لە جەولە و گەڕان و سوڕانەکاندا، وەک پێشمەرگە تێکەڵ بە شەڕوشۆڕ و نەبەردییەکان بوون، هەر ئەو نان و خۆراکەیان هەبوو کە بەدەست پێشمەرگە دەکەوت. وەک هەر پێشمەرگەیەکی سادە، هەمان جلوبەرگی دڕوون و پێڵاوی لاستیک و دڕاوی پینەکراویان لە پێ بوو. ئەگەر سواری ماشێن ببونایە، لەگەڵ پێشمەرگە لە دواوە سوار دەبوون، کەس لە پێش و پاش پاسەوانیان نەبوو. جێگای ژیانی تایبەتی، بارەگای خۆشگوزەرانیان وەک هەر پێشمەرگەیەک بوو. کەچی هەر لێرەدا وەک ئەزموونی خودی خۆم، هێشتا لە بیرم نەچوەتەوە و لە شار و شاخدا ئەوەی دیومە، دەیگێڕمەوە و دەپرسم، مەگەر تاکوتەرای مەسئولەکانی لێ دەرچێت، کە لە رۆژانی پێشمەرگایەتیدا، وەک هەر پێشمەرگەیەکی ئاسایی بە نانەڕەقە تێرایی نەوس و سکی داهاتبێت. کەسێکی گوندنشین، رەوەندی رەشماڵە کۆچەرییەکان ماوە، لەسەر خواردنی نابەدڵی کاکی مەسئول، دارکاری نەکرابێت و دەستدرێژی نەکرابێتە سەر پیرۆزییەکانی! کامە مەسئول وەک پێشمەرگەی گیانفیدا و لەخۆبردووی بەرانبەر مەترسییەکانی شەووڕۆژ، هەمان جلوبەرگی پینەکراوی پۆشیبی، پێڵاوی لاستیکی بە هاوین و زستانە لە پێ بوبێت و تفەنگی شڕوشەقی لەشان بێت و نەبەردی خولقاندبێ! کامە مەسئول لە گوزەران و ژیانی رۆژانەی خێزان و ناو بنکە و بارەگادا، بە گیرفانی بەتاڵ، کۆداک فەوری چەند ژەمە، ژووری بەکۆمەڵ و رووتوڕەجاڵ ژیاوە! کەچی نەوشیروان چەقی ئەو هەموو جیاوازییەی ژیانی نێوان پێشمەرگە و مەسئولەکانی بەوە تێکەڵ کردوە، کە گوایە لە رووی توانای لەش، کۆڵهەڵگرتن و رێگا رۆیشتنەوە، هەلومەرجەکانی جیڤارا لەگەڵ پێشمەرگەی کورد نەهاتوتەوە.

ئەوەندەی من لە ناوچەکانی هەولێر، سلێمانی و سەرسنوورەکانی نێوان پارچەکانی کوردستان و ناوچەی بادینان پێی بزانم و دیتبێتم، پێشمەرگەی زۆر هەبوون، سەرباری لەڕولاوازی و گرفتی جەستەیی، لە هەڵگرتنی کۆڵەپشتی تژی لە کتێب، نامیلکە و خۆراک لە کاتی پێویست و رۆژانە بەدەیان کاتژمێر، سەرباری هەر جۆرە مەترسییەک، بەبێ سڵەمینەوە رێگاکانی هەتا سنوورە قاچەغەکانیان بڕیوە، کۆڵیان نەداوە و لەگەڵ رێنماییەکانی جیڤارا هاتونەتەوە .

**بوێریی نەوشیروان و قورقەپی نەیارە سیاسییەکانی..**

یەکێک لەو خاڵە گەشانەی بەر ئەو دەستپێشکەرییە بوێرانەی نەوشیروان دەکەوێ، گێڕانەوە و نووسینەوەی ئەو بەسەرهاتانەی ڕۆژانێکی هێجگار پڕ تێکەڵەی ڕووداوی جۆراوجۆرە، کە دەستخۆشانەی گەرەکە. بەڵام گێڕانەوەکەی بەپێی سەلیقە و حەزی ناو دڵ و دەروونی خۆیەوە جلیت کردووە. بێگومان ئەگەر کەسانی پارتی، "ق. م"ی ئەوێ ڕۆژێ، ئەوانیش بە خۆیان ڕابفەرمووایە، هەر هیچ نەبوایە لە دیدی خۆیانەوە، گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتانەیان تۆمار بکردایە، کە بەشێکی زۆری ئەو کتێبە سەروپۆتەلاکیان دەگرێتەوە. دیارە ئەو بوارە هەر بەتەنیا بۆ دەستپێشکەری بە جورئەتانەی نەوشیروان نەدەمایەوە، لە هۆنینەوەی کەشوهەوای پاکتاوکردنی پەرێزی سیاسەتەکانیان.

(هەر لەو ماوەدا نامەیەکم پێ گەیشت بە ئیمزای/سەرپەست/ یەکێ لە بەرپرسەکانی ق. م داوای کردبو، لەبەر ئەوەی هەندێ ڕوداوی تازە هاتوتە پێشەوە بەپەلە یەکتر ببینین.) ل/ ١٥٨ _١٥٩

کارە دزێوەکانی کوشتنی بە کۆمەڵی پێشمەرگەی مەفرەزەکانی یەکێتی لە ناوچەکانی نێوانی سنووری بادینانی کوردستانی باشوور و کوردستانی باکوور لەسەر دەستی پێشمەرگەکانی پارتی "ق. م" بەتایبەت تیرۆرکردنی شەهیدان، عەبدولڕەحمان ژەنگاری، ئیبراهیم عەزۆ و هاوڕێیەکانیان لەکەیەکی ڕەشن لە تۆماری لاپەڕەی خامۆشییەکانی ئەندازیارانی خۆشکردنی زەمینەی سەرلەنوێی هەڵگیرساندنەوەی شەڕی ناوخۆی کوردکوژی. خۆزگە یەکێک لەو مەسئولانەی پارتی ڕاشکاوانە، پاکتاوکردنی ئەو پێشمەرگانەی دەخستە ڕوو، کە ئەوان بە چ بیانوویەک قەتلوعامیان کردن! کە لێرەدا خوێنەر درک بەوە دەکات، لەو زەمان و زەمینەدا، نەوشیروان بە خۆی و تاکە یەک پێشمەرگەوە لەناو هێزەکانی "ق. م" سەر دەردەهێنی، شەویش لەناویان ماوەتەوە و کەسیش هیچی لەو نەکردووە! هەروەک خۆی دەڵێ: (شەو لەگەڵ فازل (فازل جەلال) و چەند کەسێکی کەیان پێکەوە لە ماڵێکدا ماینەوە) ل/١٥٩

ئەوەی لێرەدا مایەی بەشوێنداچوونە، لەو بوارە پڕ تەمومژەدا، بەدرێژایی سەرجەلەی کاروانی شەڕی ناوخۆی کوردکوژیی براکان، بەزۆری ئەو شەڕە بە درووێنەی گیانی ئەندام، کادر و پێشمەرگەی سادە و ئاساییەکانی خوارەوە قەتماخەی گرتوە، مەگەر تەنیا تیرۆرکردنی عەلی عەسکەری، د. خالد سعید، حسین بابەشێخی لێ دەرچێت. سەرانی حیزبە شەڕکەرەکانی ئەو بوارە، بە هەر بیانوویەک بێت، گیانی مەسئولە دیارەکانی یەکترییان پاراستوە، کەچی بەرانبەر گیانی ئەوانەی خوارەوەیش، وەک ئاگر بەربێتە پوش، ئاوا درێخییان بە خەڵکی خوارەوەی یەکتری نەکردووە. گەلۆ دەبێ نهێنی ئەو گومەزەیە

چی بێت! ڕاستە نەوشیروان لەو سەروبەندەدا، باس لە ڕێکەوتنی خۆیان و سەرانی "ق. م" دەکات بۆ دڵنیابوون لە یەکتری و دەگێڕتەوە..

(کوبونەوەی بەیانی لە گورەپانی گوندەکەدا بەبەرچاوی کادرو پیشمەرگەکانیانەوە بو، ئەوەبو تەبلیغمان بکەن لەبەرئەوەی ینک زۆری خروقاتی کردوه، بی ئاگاداری ق.م چەکی هیناوەتە کوردستان، هەندی ئەندامی ئەوانی بە توهمەی جاسوسی کوشتوە.. ئیتر ئەوان التزام بە ریکەوتنەکەوە ناکەن و بەنەبوی دانەنین و ئەگەر ینک چەک بهینی ئەوان ئەی گرن.) ل/١٥٩

نەوشیروان بەبێ ئەوەی زەحمەت بداتە خۆی لەو پێناوەدا و ڕووناکی بخاتە سەرحەقیقەتی ئەو بیانووانەی "ق. م"، کە خوێنەر نازانێ بۆ بێدەنگی هەڵبژاردوە. کەچی لەناکاو بادەداتەوە سەر تاوانبارکردنی مستەفا بارزانی و سوچی ئەو شەڕوشۆڕانە بۆ قسەکانی ئەو دەگێڕێتەوە، هەروەک دەڵێ:

(چەند سالی دوای ئەوە بیستمان.. مەسعود هەوال و ناوەروکی ریککەوتنەکەی بە تەلەفون دابو بە موحسین دزەیی لە واشنتون. تا ئەویش بە مەلامستەفای بلی. موحسین ئەم هەواڵە بە خوشییەوە بو بارزانی باس ئەکا. کورەکەیان د. نجمەدین کەریم و د. شەفیق قەزازیشی لی ئەبی. بارزانی لەباتی ئەوەی رەزامەندی دەربیری جنیویکی ناشیرین بە مەسعود ئەدا لەسەر ئەوەی لەگەل مامجەلال ریککەوتنی ئیمزاکردوە.) ل/١٥٩

لەو گێڕانەوەیەدا، وا دەردەکەوێ سەرانی "ی.ن.ک" ئەو قسانەی "بارزانی" یان لە یەکێک لەو سێ کەسە بیستوتەوە، کە لێرەدا ناویان ڕیزکراوە. بەڵام بەپێی هەر هزر و مەزەندەیەکی لۆجیکییەوە، کەس بەو تیورە قەناعەت ناکات کە مرۆڤێک لەسەرەمەرگدا بێت، لە دووری هەزاران کیلۆمەترەوە، وا لەناکاو کاردانەوەی بەسەر بڕیارەکانی ناوەوەی کوردستان هەبێت!

(مەلا مستەفا تەمەنی لە حەفتا تی پەری بو. بەهوی نەخوشی (شیرپەنجەی سی) یەوە لەسەرەمردن بو. ئەبو دەرسی حیکمەت و گیانی لیبوردن و بەتەنگەوە هاتنی قازانجی کوردی بە کوروشاگردەکانی دا بدایە. بەم هەلویستەی دوای مردنی خوی دوژمنایەتییەکی خویناوی بە میرات بو کورەکانی و نەوەکانی و، عەشیرەتەکەی و حیزبەکەی بەجی هیشت.. سەدان کوردی بیتاوانی تی دا کوژرا.) ل/١٥٩

ئەو پەیڤانەی بەدەمی مەلامستەفاوە گوتراون، خۆزگە خەڵکانی وەک موحسین دزەیی و دکتور نجم الدین و دکتور شفیق قزاز لەو بارەیەوە دەهاتنە گۆ، تاکو لە تەواوی پەیڤەکانی بارزانی لەو موناسەبەتەدا دڵنیا بوینایە. مایەی پشتڕاستکردنەوەی ئەو ڕاستییێکانەی نەوشیروان ساغ دەکاتەوە، کە هەمیشە فەرمانی سەرکردە، هەتا ئەگەر لەسەرە مەرگیش هوڕینە بکات، ڕێوڕەسمێکی هێجگار پڕ پاشەگەردانی بۆ نەوەکان بە میرات کردووە. بەڵام

هەر لەو روانگەیەوە، ئەگەر "نەوشیروان"یش پاش ئەو دەیان ساڵەی کۆچی دوایی مستەفا بارزانی، بە هەناسەی تەنیا پەریز شێواوی بەرمەیدانی پراکتیکی خۆیان لە رابردوو و ئەوجا گەردەنئازایی بۆ سەرکردەیەکی مێژوویی نەتەوەی کورد، کە وەک دەرکەوتەیەکی دیرۆکی لە رابردوومان جێگای خۆی گرتوە، هەنگاوی دوو لایەنی هەڵگرتایە و بە هەمان مەبەستی دەرسدانەوەی تیوری بۆ نەوەکان، بە چاوێکی رەخنەگرانەی پۆزەتیڤ، بەلای کار و کردەوەکانی خۆی و رەوتەکەی ئاوڕی بدایەوە.

بێگومان سەرمەشقێکی نوێی بۆ داهاتوو دادەهێنا. چونکە تەنیا هەناسەی پڕ لە گیانی برایەتی و هەستکردن بە مەسئولیەتی مێژوویی بەرجورئەتی بەخۆداچوونەوە، لەپێشەوە، عیبرەتوەرگرتن لە هەڵەکانی رابردوو و دەبێتە سەرچاوەیەکی بەردەست بۆ ئەوەی خەوشەکانی خەباتکردنمان درێژە پێنەدەین و برینەکانی جەستەی تێکۆشانی نەتەوەکەمان ساڕێژ بکەین. بێگومان سەروەرییەکی هێجگار گەورەیە، ئەگەر تەقلیدی بەخۆداچوونەوەی لەخۆرادیتنەوە لەلایەن سەرانی قوتابخانەی سیاسی کورد پیادە بکرایە. گریمان ئەوە مستەفا بارزانی هەروەک نەوشیروان خۆیشی نووسیویەتی: (لە سەرەمەرگ، موڕێنەی کردوە) لە بارودۆزێکی ناهەمواری دواتروسکایی رووناکی ژیان و لە دەمی تەنگەژەی هەست و نەستی مەرگدا، قسەی خراپی کردبێت. ئەدی خۆ سەرانی مەیدانی حیزبە شەڕکەرەکانی ناوخۆ، لەوپەڕی تەندروستی باش و ژیانێکی ئاسایی و هەبوونی دەسەڵاتی بەرسێبەری تفەنگی شاخدا بوون. بۆچی ئەوان نەکەوتوونەتە خۆیان، پەچەکرداری ئەو شەڕوشۆڕانەیان نەنواندوە. هەر بۆ نموونە خودی نەوشیروان لە پانتایی کتێبەکەیدا، ئەگەر ئەوەندەی لە تانەدان لە نەیارە سیاسییەکەی و بەشان و باڵ هەڵگوتنی خۆیان لە مەیدانی ئەو پاشەگەردانییەدا، بای مەودایەک بەلای دژایەتیکردنی ئەو جۆرە شەڕە بێهودەیە و هەڵوێست لێوەرگرتن و بەربەرەکانی کردنی ئاوڕی بدایەوە و لاسەنگی هەڵسەنگاندنەکانی راست بکردایەوە، ئەوا کاروانی خەباتی کوردان بە هەنگاوی گەورەتر دەچووە پێشێ.

سەروکاری ئەو روداوانەی رابردوو، مەبەست سالانی نێوان ١٩٧٥ هەتا ١٩٨٥، کە بەشێکی بەرچاو لە مێژووی خەباتی نوێی نەتەوەکەمان دەگێڕتەوە، بەبێ خۆ لەقەرەدانی راشکاوانەی زەخیرەکانی دەستتێوەردانی دەرەکی لەناو هەناوی بزاڤی کوردایەتیدا، دیارە نیوەناچڵ خۆی دەنوێنێ، هەڵسەنگاندنەکان رووە و سەرچیخبردنی خوێنەر شۆڕدەبێتەوە و رەوتی راستییەکان هەڵەداوان دەکات. ئەوجا سەرباری یەکلایەنەی تەرەفگیریی بێ ئەملا و ئەولا، نەوشیروان کەموزۆر بۆ ئەو لایەنە حەساسە ئاوڕی نەداوەتەوە. کە کەلەبەری ئاشکرای بەر رەوتی گێڕانەوەکانی دروست کردووە و بە هیچ جۆرەک قامک ناخاتە سەر

ڕۆڵی دەزگا سیخوڕییەکانی ئەو ڕژێمە داگیرکەرانەی کوردستان، کە خودی خۆی لە نزیکەوە بە پێوەندییەکان ئاشنا و لە زۆر دەمدا، سەری داوی ئەو پێوەندییانە بەدەست خۆیەوە بووە. تەنیا ئەوە نەبێت کە زۆر بەپارێزەوە، لێرە و لەوێ ئاماژەیەکی نیوەناچڵ دەکات. هەروەک نووسیویەتی:

(شیخ کوکس یەکی لە نەوەکانی شیخ عوبەیدوللا لەعیراقەوە هەلات بو بو تورکیا. لە شەمزینان دانیشت بو. وەلامی نارد بو کە نوینەرانی حکومەتی تورکی ئەیانەوی هەندی لە بەرپرسەکانی جولانەوەکە ببینن. کات و شوینی یەکتر بینین دانرا. نوینەری تورک لەکاتی دیاری کراودا هاتە گوندی روباروک لەبەری تورکی روباری سەرکەم. د، خالید چو بو دیتنی. کابرا لەم دیتنەدا گوت بوی، لە ئەنقەرەوە هاتوە. ئەیەوی بزانی سەرکردەکانی ئەم جولانەوە تازەیە کین. ئامانجەکانیان چیە. هەلویستیان بەرانبەر حکومەتی تورک چونە. پیوەندییان لەگەل حیزب و ریکخراوە کوردییەکانی تورکیا چیە. پیویستیەکانیان جیە و داواکانیان لە حکومەتی تورکی چیە؟) ل/١٦٠

نەوشیروان گەرەکیەتی خوێنەر لە گەمەی تاووتوێکردنی تەمومژاوی وشەکان، بەوە هەڵەداوان بکات، کە ئەوە حکومەتی تورکیایە بە خۆی نوێنەری بۆ لای ئەوان ناردووە، بەبێ ئەوەی ناو، کار و پلە و شوێنی ئەو نوێنەرەی بە بیر مابێت! کە گومان لەوەدا نییە ئەو زەلامە، یەکێک لە کاربەدەستەکانی دەزگای میت، یان پۆلیسێکی ئەمنیەتی تورکی ئەو دەڤەرە بووە. بە جۆری قسە و پرسیارەکاندا بە هەموو کەینوبەینەکانی، ئەم جولانەوە تازەیە، ئاشنا بووە. دەنا ئەتو بڵێی حکومەتی تورکیا ئەوەندە تامەزرۆی پێوەندی بووبێت لەگەڵ شۆڕشی نوێی کوردستانی باشووردا! ئەم داننانەی نەوشیروان هەرچەندە زۆر بلەز باسی هێناوەتە گۆڕێ و خێرایش دەیپێچێتەوە، دیارە هەنگاوی دوای سەرەتای پێوەندییەکانی میتی تورکییە بە سەرانی پارتی "ق. م"، کە ویستوویانە بە هەمان ڕەنگ لەگەڵ سەرانی "یەکێتی"یش ئەو پێوەندییە ساز بکەن.

نەوشیروان بە درکپێکردنەوە، دەستپێشکەری ئەم پێوەندییەی بۆ تورکەکان گێڕاوەتەوە. بەبێ ئەوەی لەبیری بێت کە ئەو هەموو هاتووچۆیەیان بەناو خاکی ئەو وڵاتەدا، بەتایبەتی گواستنەوەی چەک، جبەخانە بە لۆری و ماشێنی گەورە بۆ ناوچەکانی سەر سنووری کوردستانی باشوور، هەر وا بە قودرەتی یەکلایەنەی ڕێکخراوە کوردییەکانی کوردستانی باکوور نەبووە، بێگومان چاوپۆشی دەزگا سیخوڕییەکانی ڕژێمی تورکی لەشان بووە کە نەوشیروان نایەوێ ناوی بهێنێ!

ڕژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان، هەرگیز لەوە نەسڵەمینەتەوە، بەردەوام مرومۆی خۆیان کردووە بۆ دانەخۆرەکردنی سەرانی حیزبی کورد و پێوەندی پێوەکردنیان لەپێناوی بەڕێکردنی بەرژەوەندییەکانیان لەسەر بنیادی سیاسەتی دوو فاقییانەیان بەرانبەر خەڵکی

کورد و حیزبە سیاسییەکان. لە لایەک بە ئاگر و بە ئاسن هەتا ئاقاری قەلاچۆکردن، ئەگەر بۆیان مەیسەر بوایە، بەربوونەتە گیانی خەڵکی کورد لەو پارچەیەی کوردستان کە لە ژێر رکێفی دەسەلاتیانە، لەلایەکی دیکەوە بە زمانی شیرینی لەخشتەبردن پێوەندییان بە بزافی چەکداری و سیاسی بەشێکی دیکەی کوردستانەوە کردووتە مەیدانی مەشقی مانۆرە چەپەڵەکانیان، لەسەر ئێسک و پروسکی کوردی بەستەزمان. بۆیە رژێمێکی باوککوژەی وەک تورکیا لەوان رۆژاندا، چۆن دالدەی مەفرەزەکانی پارتی "ق.م" داوە، ئاوایش دەکاری لەگەڵ "ی.ن.ک"یش دەست تێکەڵ بکات. بۆ ئەوەی ئەوانیش لە شانی رژێمە داگیرکەرەکانی دیکەی پارچەکانی کوردستان، بەشی خۆی گەمە بە کارتی کورد بکات و لە سۆنگەی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆیدا، خوێنی هەڵمژێ. لەو بوارەدا باشتر سیناریۆی شەڕی کوردکوژیی برایەکان گەرمتر بکات و هەتا عەشیرەت، حیزب و رێکخراوەکانی کوردستانی باکوور تێوە بگلێنی و زەلکاوەکە شێلوێ تر بکات. نەوشیروان بەدوای دەیان ساڵ لە بەچاپگەیاندنی گێڕانەوەکانی خۆیدا، هەنووکەیش بە خۆی رەوا نەبینیوە، لەجیاتی بەشی تورکی، بەشی عیراقی، ناوی راست ورەوانی **کوردستانی باکوور و باشوور** بهێنێ..!

**یەکترنەناسین و نەخوێندنەوەی یەکتری..**

(لە هەمان کات دا خەلکی گوندی ماسیروش ئاگاداریان کردم کە چەند کەسیک لە بەرپرسەکانی یەکیتی گەیشتونەتە لای ئەوان داوایان لی ئەکەن بیاننیرین بوسوریا. من ئەو هەوالەم بەلاوە زور سەیر بو. تاقمی بەرپرسی یەکیتی بەبی ئاگاداری ئیمە، بەسەر ئیمەدا باز بدەن و، بیانەوی بچن بو سوریا) ل/١٦٥

تاووتوێکردنی ئەو پەیڤانەی ئێرە لەگەڵ بەبیرهێنانەوەی فەنتازیای پێکەوە گرێدان، یەکگرتنەوەی هێزەکانی یەکێتی لە مەڵبەندەکانی سۆران و بادینان یەکنایەتەوە کە نەوشیروان لە پێشەوە باسی کردووە. چونکە بە قسەیش، لەدوای ساڵەهای ساڵ، ئەوە بە نەوشیروان هەزم نەکراوە، کە بەبێ ئاگاداری و پێزانینی خۆی ئەو هەتا لە ناوەوەی کوردستان، مەسئولانێک هەبن، چ کۆمەڵە و بزووتنەوە، ئەو نەیانناسی! ئەوجا چ جای بەناوی یەکێتی! ئەوەیش بەڵگەیەکی دیکەیە لەوەی نەوشیروان چ جۆرە خوێندنەوەیەکی بۆ "ئارام" و کۆمەڵە لەناوەوەی وڵات، لەوێ رۆژێ هەبووە. هەنووکەیش نەسڕاوەتەوە کە بە هیچ جۆرێک ناویان ناهێنێ، سەرەداوێک لێرەوەیش ناخاتە بەردەست خوێنەر، کە پێوەندیی ئەم لە دەمی گەڕانەوە وڵات و بوونە مەسئولی بێ ئەملاوئەولای یەکێتی لەگەڵ کۆمەڵە، "ئارام" لە چ ئاستێک و چۆن بووە! دیارە بەکارهێنانی پەیڤی "تاقم/ زۆر سەیر/

بەبێ ئاگاداری ئێمە/ بەسەر ئێمەدا باز بدەن" هەموویان نیشانەی پشتراستکردنەوەی وشەکانی مەبەستی بەندەن.

**(لە گوندەکە هەواڵی میوانەکانم پرسی. منیشیان برد بۆ لای ئەوان. جگە لە فازیل جەلال (عادل) ی قیادەی موقەتە، من کەسیانم نەناسی. بەخێرهاتنم کردن و لێم پرسین.. ئێوە کێن؟ زۆریان پێ ناخۆش بو، بەتورەییەوە ئەوانیش لە منیان پرسی.. تۆکێی؟ وتم، من فلانم بەلام ئێوەکێن و بۆچی هاتونەتە ئێرە بەبێ ئاگادلری ئێمە؟ مەلابەختیار هەڵی دایە وتی.. من مەلابەختیارم نوێنەری کۆمەڵەم ، ئەوە کاک رەسول مامەندە نوێنەری بزوتنەوەیە، ئەوە کاک عەلی کۆیە سەبەخۆیە. ئەویش فازیل جەلالە نوێنەری ق. م . وتم.. بۆچی ئەچن بۆ سوریا و چ کاریکتان لەوێ هەیە. وتیان.. ئەچین بۆ سوریا مامجەلال ئەبینین و، کیشەی ئێوەو قیادەی موقەتە چارەسەر ئەکەین.) ل/١٦٦**

جارێ لە پێشەوە، نەوشیروان لەگەڵ خۆی ناکۆک دەکەوێتەوە کە لەلاپەڕەکانی پێشوتر لەسەر زاری هەمان نوێنەری "ق. م"، کە گوایە خۆیان لە هەموو جۆرە رێککەتننامەیەک لەگەڵ "یەکێتی" دەکێشننەوە، و رێگا نادەن بەو ناوچانەی سنووری بەرقەڵەمڕەوی ئەواندا، "یەکێتی" چەکوچۆڵ بۆ هێزەکانی بگوازنەوە! لەناو ئەوانەی لێرەدا ناویان هاتووە، مەلابەختیار و فازیل جەلال هێشتا لە ژیاندان، ئەو باسوخواسانەی ئەوێ ڕۆژێ لە لای ئەوانیشدا هەیە، خۆزگە ئەوانیش لەو بارەیەوە، یادەوەرییەکانی خۆیان دەگێڕایەوە. بەڵام لەو دەستەواژانەیشدا، نەوشیروان بە دەمی خۆی، زۆر بەپارێزەوە نەبوونی هەر جۆرە پێوەندییەکی ئەوی ڕۆژێی بە کۆمەڵەوە، بە رابەری "ئارام" دەردەخات. بە ئاشکرا ئەوە ساغ دەکاتەوە کە بە بەرپرس و کادرەکانی، نەوەک هەر کۆمەڵە، بگرە هەتا ئەوانەی بزووتنەوە و سەربەخۆکانیشی نەناسیوە. ئەوەشی هەتا بەدوای دەیان ساڵ بۆ قبوڵ نەکراوە، کە بەبێ ئاگاداری خۆی و لەپشتی خۆیەوە، خەڵکێک هەبن کە لەناو "یەکێتی"دا مەسئول بن و ئەو پێیان نەزانێ! هەروەها بە هەمان رەنگ هەتا مەسئولەکانی کۆمەڵە و بزووتنەوەیش، دیارە بە هەبوونی نەوشیروان، مەسئولیەتییەکەی لەناو یەکێتی ئاگادار نەبوونە، کە خۆیشی هیچ شتێک لەوبارەوە نادرکێنێ! هەر وەک خۆی نووسیویەتی: **(لە وەڵامەکانی من و جوری رەفتارم دلگیربون و باوەریشیان بەقسەکانم نەبو.) ل/١٦٦**

لێرەدا خوێنەر لە وشەکانی نەوشیروان ئەوە دەخوێنێتەوە کە "ئارام" وەک کاراکتەری سەرەکیی ئەو کاتی کۆمەڵە، هاوڕێیەکانی کۆمەڵە و بزووتنەوە بە گشتی، لەگەڵ هەڵگیرساندنی سیناریۆی شەڕی ناوخۆی برایەکاندا نەبوونە. بگرە وەفدیان ناردووە بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی نێوان سەرانی یەکێتی و پارتی لە سنوورەکاندا. بەڵام دیارە ئەو بڕیارەی هەستکردن بە مەسئولیەتی مێژوویی کۆمەڵە لەسەر دەستی "ئارام"دا، بەبێ

دەستتێوەردانی ئەم و ئەو نەچوەتە خانەی پێشوازیکردنەوە و بەوپەڕی راشکاوی، بەجورئەتانە دان بە جیاوازی بیر و کرداری خۆی لەگەڵ هاورێیانی ناوەوە دەنێ و نووسیویەتی:

(مامجەلال سواری ولاخ بو، من پیادەبوم، لی ی پرسیم.. وەزعی ولات چونە؟ وتم.. ئیستا ماندوم لەم هەورازەدا ناتوانم زۆر قسە بکەم، بەلام هەر ئەوەندەت پی ئەلیم، ئیمە.. ئەوانەی دەرەوە، لەگەل ئەم برادەرانەی ئیرە، هەر ناوەکەمان یەکە، ئەگینا لە هەمو شتیک دا جیاوازین. وەزعی شورشەکە بەهوی هیرشی جەیش و تەسلیم بونەوەی پیشمەرگە خراپە. ئەبی خەریکی هەلسانەوەی بین، بەجی هیشتنیان لەم کاتەدا عەیبە ئەگینا هەر لیرەدا پیشنیارم بونەکردی بەکام ریگادا هاتوی بەهەمان ریگادا بگەرییتەوە بو دەرەوە.) ل/١٦٧ _١٦٦

وێنەی مام جەلال بە سواری وڵاخ و شەکەتیی خۆی بە پیادەیی لە سەرکەوتنە هەورازێکی رێگایاندا، دیمەنێکی جوان و سەرنج راکێشە لە چۆنیەتی پێوەندی خۆی بە "مام جەلال"ـەوە. وەک دەسکە گوڵێکی مەبەستەکانی قەد و باڵای بیرکردنەوەکانی خۆی، بۆ روونکردنەوەی رووداوەکان بەکاریان دەهێنێ، لەوەی کە ئەوان لە دەرەوە لە چ جۆرە کەش و هەوایەک بریاری شۆڕشیان داوە، کە لە پراکتیکدا جیاواز بووە بە سەرەتاکانی ئەوێ رۆژێی بیر و کرداری ئەوانەی کۆمەڵە و بزووتنەوە لە ناوەوە، بەتایبەت لە مەیدانی ناکۆکی، شەڕوشۆڕی ناوخۆییدا.

گێرانەوەی نەوشیروان تیشکێکی گەشە بەسەر هەموو بەسەرهاتەکاندا و نیشانەیەکی ئاشکرای ئەوەشن کە ئەوان هەر لە دەرەوەرا لە دەریای فەنتازیای شۆڕشێکی گەورەی خاوەن هێزی پانوپۆڕی ئامادە بوونە. کەچی گەردەلوولی واقیعەکە، و رەوتی رووداوەکان بە پێچەوانەی حەزەکانیان هەڵیکردووە و دەبوو شانی بدەنە بەرێ. لێرەدا خوێنەر هەست بەو راستگۆییەی نەوشیروان دەکات کە بەدوای دەیانساڵیش جوامێرانە هەستی پەشیمانبوونەوەی خۆی لەوێ رۆژێدا نەشاردوتەوە، کە دیارە لەو رۆژەدا چەند بێزار و کز بووە. ئەگەر لەو زەمان و زەمینەدا مام جەلال نەگەڕابوایەوە کوردستان، گریمانی دەستهەڵگرتنی ئەو لە شۆڕش، زۆر بەهێز خۆی نواندووە. بەڵام دڵنیام کاریگەری و ماندانی مام جەلال لە هەر جۆرە شکستی دەروونی و رووخانی یەکجارەکی، پەشیمانی کردووتەوە لەوەی بگەڕێتەوە دەرەوە، کە کەموزۆر هێمای بۆ ناکات.

(مامجەلال قسەکانمی پی ناخوش بو، بەتایبەتی هەمو چەند سەعاتی بو گەیشت بوەوە کوردستان، چاوەروانی هەوالی خوشتری ئەکرد. بەلام زور زو تیگەیشت لەم قسانەدا من ناهەق نەبوم.) ل/١٦٧

نەوشیروان دیسانەوە لەگەڵ وشەکانی پێشەوەی خۆیدا یەکنایەتەوە، بەوەی کە لەجیاتی ئەوەی دان بە تێشکانی دەروونی خۆی و چۆنیەتی ورەبەردانەکەی بگێڕتەوە، کەوتوتە پاساودانەوەی کە گوایە دواتر "مام جەلال"یش هاتووتە سەر قسەکانی ئەو! ئەدی ئەگەر وا بووە بۆ وازی نەهێنا و نەگەڕایەوە دەرەوە! هەقی و ناهەقی قسەکانی نەوشیروان بەوە پشتراست دەبووەوە، ئەگەر بوێرانە باسی لە هەڵوێستی ئەو دەمی "مام جەلال"ی وێنە بگرتایە، کە ئاستی ورەبەرزی و گەشبینی مام جەلال لە هەموو تاوە ترسناک و دژوارەکاندا بەناوبانگە. هەمیشە پشت و پەنای کۆڵنەدان و بەردەوامی هەڤاڵەکانی بووە. بۆ بەڵگەیش هەر خودی نەوشیروان لە لاپەڕەکانی پێشوتر، باسی ئەوەی گێڕاوەتەوە، کە خۆی نامەی بۆ مام جەلال نووسیوە و لە نامەکەی هەوڵی داوە کە بەزووترین کات بگەڕێتەوە کوردستان و چیتر خۆی دوانەخات. کەچی بەدوای دیتنی نوێنەرەکانی کۆمەڵە و بزووتنەوە، گۆڕاوە و دڵەڕاوکێ فشاری بۆ هێناوە و هەوڵی داوە پەشیمانی بکاتەوە.

**فاکتەرەکانی هەڵگیرساندنەوەی خەباتی چەکداری شاخەکان..**

لە لاپەرەکانی ١٦٧–١٧٠، نەوشیروان بە درەنگوەخت، کەوتوتە تاووتوێکردنی راشکاوانەی فاکتەرەکانی بەرپاکردنی خەباتی چەکداری، کە دروست بە پێچەوانەوە، لەگەڵ زەمان و زەمینی هەڵگیرساندنی خەباتی چەکداری نەهاتوتەوە. بەبێ ئەوەی هیچ یەکێک لەو دوو هێزە سەرەکییەی (یەکێتی و پارتی) جاڕدەری ئەو شۆڕشە چەکدارییە، خاوەنی هەر جۆرە ئەفسانەیەکی شاراوە بن، بێجگە لە هەندێ پشتیوانی شاراوەی دەرەکی، کە خۆی لە گفتی نادیار دیوەتەوە. بەڵام نەوشیروان خۆی لە قەرەیان نادا و بە دیدێکی بەرپرسیارانە، دوای دەیان ساڵ ئەو خەیاڵپلاوییەی ئەوێ دەمی سەرانی ئەو دوو حیزبە شرۆڤە ناکات و نهێنییەکانی چۆنیەتی هەڵگیرساندنەوەی ئەو خەباتە چەکدارییە ناخاتە روو. چونکە هەتا ئێستایش خەڵکێکی زۆری نەتەوەکەمان بە حەقیقەتی رۆژی جاڕدانی خەباتی چەکداری لە لایەن کامە هێزەوە بووە، نازانێ! "نەوشیروان"یش لەلای خۆیەوە، هەنگاوی دەستپێشکەرانەی کۆمەڵە لە ناوەوەی وڵات بە رابەری "ئارام"، لە ناردنە شاخی مەفرەزە سەرەتاییەکان، ناخوێنێتەوە و بگرە پشتگوێی خستوون. لەوەی یەکەم چەخماخەی خەباتی چەکداریی نوێ، لەسەر دەستی کۆمەڵە و ناردنەدەرەوەی مەفرەزە چەکدارەکانی کۆمەڵە بووە. هەروەها بیرۆکەی بیر و کرداری تاکە سەرکردە، لەبریاردانی جاڕدانی خەباتی چەکداری لە قاو نادات، بگرە کەوتوتە پەردەپۆشی و بەم رستەیە خۆی پەڕاندوتەوەکە دەڵێ:

(بەمجورە یەکیتی لە هەمو لایەکەوە بە دوژمن گەمارو درابو، تەنیا هیزی کە ئەبو پشتی پی ببەستی. هیزی کومەلانی خەلک بو.) ل/١٦٨

بێگومان ئەو پەیڤانەی نەوشیروان، سەبارەت بە خەباتی چەکداریی خەڵکی کورد لە پێناوی ئازادی و موقاوەمەتی شاڵاوی لەناوبردن، نەقشی سەربەردن و لەسەر ئێسک وپروسکی رۆڵەکانی بە شێوەیەکی مەیدانی پیادە کراوە. هەمیشە کۆمەڵانی خەڵک کراوەتە سوپەر و پەرژینی هەڵسانەوەی هەر جۆرە سەرکردایەتییەک لەژێر هەرجۆرە دروشم و بەرنامەیەکی تاکتیکی. ئەزموونی خەباتی کوردایەتی بەقەد بالای خۆی، ئەوەمان بۆ ساغ دەکاتەوە، کە کۆمەڵانی خەڵکی کورد بەردەوام وەک کێڵگەی تاقیکردنەوە، بیروباوەڕ و رێبازی جۆراوجۆری بەسەردا تاقی کراوەتەوە. من بەدڵنیاییەوە ئەوەم لەو کاروانە درک پێکردووە، ئەگەر سەرانی حیزبی کورد بەو ئاراستە دروستە، سەرجەمی سیاسەت و ستراتیژی نەتەوەییان لەسەر پشتیوانی کۆمەڵانی خەڵک بە شێوەیەکی سەرەکی پیادە بکردایە، دیارە سەرکەوتنی کورد و لەسەرپێوەستانی لە بواری سەربەخۆیی و ئازادیدا هەنگاوی گەورەی بڕیبوو. نەوشیروان لەو روانگەیەوە، بابی سەرەداوێک لە چۆنیەتی پشتبەستن بە کۆمەڵانی خەڵک، سیاسەتەکانیانی روون نەکردووتەوە و ئاراستەیەکمان بۆ دەستنیشان ناکات، کە سەرانی ئەو حیزبانە لەوی رۆژاندا، بۆ رووبەڕووبونەوەی دوژمنان گرتبویانە بەر!

بەراستی ئەوە یەکێکە لە نوقسانییەکانی ئەو کتێبە، کە هەر باسەکان دەکاتەوە، دوایی بلەز بەسەر بەدەستەوەدانی ئەنجام، خۆی دەبوێرێ. هەروەک ئەوەی بەدوای گەیشتنەوەی مام جەلال و یەکگرتنەوەیان، نەوشیروان مەسەلەی هاتن و لەئامادابوونی نوێنەرانی کۆمەڵە، بزوتنەوە و پارتی "ق.م" بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکان ناوچە سنوورییەکانی نێوان کوردستانی باکوور و باشوور، بنگۆم دەهێڵتەوە، بەبێ هیچ ئەنجامێک بەجێی دەهێڵی! بە هەمان رەنگ کە لە لاپەڕەکانی نێوان ١٧٠ - ١٧٣ دا، سەبارەت بە پێکهاتەی بزووتنەوە و کۆمەڵە، زانیارییەکانی خۆی تۆمار دەکات و کەموزۆر دەربارەی هێڵی گشتی شتێکمان پێ ناڵێت، کە وەک دۆمەڵان لە ناوچەکانی گۆستێ هەڵقولاوە!

هەر سەبارەت بە چۆنیەتی کارکردنی بزووتنەوە و کۆمەڵە و چۆنیەتی بەڕێوەبردنی کاروبارەکانی خەباتی چەکداریی شاخ، نەوشیروان بوێرانە ئەو راستییە دەگێڕتەوە کە ئەوان، سەرکردایەتی دەرەوەی وڵات، دامەزرێنەرە سەرەکییەکانی یەکێتی "مام جەلال و نەوشیروان" لە رووی بیرکردنەوە و پراکتیکەوە، جیاوازییەکی دیاریان لەگەڵ سەرکردایەتی ناوەوە هەبووە. بەڵام شتەکان بەباسکردنی تەنیا جیاوازی پێکهاتەی سەرکردایەتیی ناوەوەی وڵات قەتیس دەکاتەوە و بۆ جەوهەری ئەو جیاوازییانە شۆڕنابێتەوە، کە هەبوون! هەر وەک نووسیویەتی:

(دەستەی دامەزرینەر لە دەرەوەی ولات بو، سەرانی کومەلە و بزووتنەوەنەیان توانی بو لەسەر دیاریکردنی ئەندامەکانی (سەرکردایەتی ولات) و ژمارە و دابەشکردنی ئەرک و فرمانەکانیان ریک بکەون. وەکو چارەسەریکی کاتی و مامناوەنجی تا گەرانەوەی مامجەلال، لەسەر ئەوە پیک هاتبون (سەرکردایەتی دوانە) بو ناوچەکان دروست بکەن/.../ پیچەوانەی (یەکیتی ویست و بریاردان) و (یەکیتی کاروجیبەجی کردن) بو. ناکوکی و رقەبەری دروست ئەکرد و، کارەکانی دوا ئەخست و، لەگەل بەریوەبردنی باشی کاروباری شورش دا نەئەگونجا.) ل/١٧١

نەوشیروان بەبێ ئەوەی ناوی کەس لە بزووتنەوە و کۆمەڵە بهێنێ، زۆر بە خشکەیی هێڵی راست و چەپ بەسەر چۆنیەتی پێوەندی و سەرەتاکانی درووستبوونی هاوکاری و پێکەوەژیانی دوو رەوتی سیاسی لە قاو دەدات. لە روانگەی خۆیەوە، ئەو هاوپەیمانییەتە هەڵدەوەشێتەوە کە لەسەر دەستپێشکەری "ئارام" و هەڤاڵانی بزووتنەوە ساز ببوو. راستە ئەو شێوە کار و هاوپەیمانییەتە سەرەتاییەی ئەوێ رۆژێ، چەندان گرفت و ناتەبایی وەختی لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو. نەوشیروان لەبری روونکردنەوەیان بەگشتی، پەردەیان بەسەردا نەدات. تەنیا لایەنە نەگەتیڤە سەرەتاکانی ئەو هاوپەیمانییە دەهۆنێتەوە، لە پێناوی رایەڵکردنی رەوابوونی پلان و دەستووری کاری خۆیان، وەک ئەوەی ئیتر هەر جۆرە ناکۆکیەکی نێوان لایەنە پێکهێنەرەکانی "ی.ن.ک" بوبێتە هەڵم و ئاسمانی بەرنامەکانی بەرێوەبردنی شۆرش هەر هەموی ساماڵ و بێ تەمومژ بوبێت! هەڵدانەوەی ئەو لاپەرەیە لە چیرۆکی کاروانی خەباتی کوردان، ئەوەندە کۆلان و کەلەبەری تاریکی تێدایە، کە مرۆڤ دەبێ چرایەکی زۆر گەشی دۆزینەوەی باریکە رێچکەی هەڵسەنگاندنی بەدەستەوە بێت، تاکو ئاراستە و لایەنە گەشەکانی ئێرە و ئەوێی تێدا بدۆزێتەوە و کۆشش و کاری دەستپێشکەری جوامێرانەی سەربازە نەناسراوەکان بەرز بنرخێنی.

بۆیە ئەرکی نەوشیروان لەو سەروکارەدا، هەر وا بەراگوزاری بەسەر ئەو سەرەتایانەی پێوەندییەکانی مەیدانی نێوان بزووتنەوە و کۆمەڵە تێناپەرێ و بە هەناسەیەکی بەرپرسیارانە، کە دواتر جڵەوی بەرێوەبردنی کۆمەڵەی گرتوتە دەست، ئاورێکی بەربێن فراوانی لێ ناداتەوە و نایکاتە سەرمەشقی پێکەوەخەباتکردنی ئەو هێزانە. چونکە ئەو ناکۆکی و گیروگرفتانە ئەگەر دواتر زۆر خەستتر نەبوبانەتەوە، ئەوە سەری نوازشمان بۆ ئەو پشتگوێخستنە دادەخست.

ئەگەر نەوشیروان بەقەدەر بەشێکی وەسفی پلانی خۆیان بۆ بەرێوەبردنی یەکێتی و شۆرش، بەسەر باسی ئەو بەرپوەبردنەی سەرەتاکان بکەوتایە، کە تۆزێک لە قوربانیدان و ماندووبوونی ئەو هاورێ و هەڤاڵانەی تێر بکردایە، کە لەو رێگایەدا سەر و گیانی خۆیان

بەخت کرد، دڵنیام سەروەرییەکی گەورەی تۆمار دەکرد و لاپەڕەکانی کتێبەکەی پێ گەش دەکردەوە.

**یادانەوە سەر باسوخواسی کۆمەڵە..**

(سەرانی کومەلە گەنجی خوینگەرم و توندرەوبون، خویان بە نوینەری بیری پرولیتاریا و بزوتنەوەیان بەنوینەری بیری بورجوازی ئەزانی.) ل/١٧١

نەوشیروان بەپێی بڕیاری لەپێشینە و بیرکردنەوەی حازرەکیی، بە مەبەستی لەقاودانی سترکتوری پێکهاتەی ئایدیۆلۆژی و فەلسەفی ئەوان ڕۆژانی کۆمەڵە، بەبێ هیماکردنە هەرجۆرە سەرچاوەیەک بۆ دەستکاریکردنی سەروەری و لایەنە گەشەکانی بیرکرنەوەی کۆمەڵە لەوێ ڕۆژاندا، کەوتوتە بەکارهێنانی دەستەواژەی بێ بنج و بنەوانی وەک ئەوەی کە دەڵێ: "کۆمەلە خۆیان بە نوێنەری پرولیتاریا ئەزانی" بەبێ ئەوەی پێمان بڵێ پرۆلیتاریای کوێ! بێگومان لەناو هەموو ڕێکخستنێکدا، تاکوتەرای ئەندام و کادرەکان بۆ خۆیان، هەر لەخۆیانەوە کەوتونەتە خۆبادان بە هەندێ دەستەواژەی زل و زەلام کە لە پراکتیکدا تۆزیان نەشکاندووە. بۆیە بەدڵنیاییەوە لەناو  کۆمەڵەیشدا، دەنگۆی لەم جۆرە بانگاشە بێناوەڕۆکانە هەبووە، تاکوتەرای ئەندامانی کۆمەڵە ئەو خەیاڵپلاوییەیان پێوە دیار بووە کە تا رادەیەکی زۆر کۆمەڵە لێێ بەدوور بووە. کۆمەڵە هەرگیز لە هیچ بڵاوکراوە، بەرنامە و پەیامێکەوە، خۆی بە نوێنەری پرۆلیتاریای کورد لە قەڵەم نەداوە و ڕێکخستنێکی سەرەتای وەک بزووتنەوەیشی بە نوێنەری بورژوای کورد نەناساندووە. ئیتر بۆ نەوشیروان باس لەو سەرچاوەیە ناکات کە ئەم زانیارییەی لێ وەرگرتووە! ڕاستە بەشێکی زۆری هاوڕێیانی کۆمەڵە لەو زەمان و زەمینەدا، وەک نەوشیروان دەڵێ "گەنجی خوینگەرم بوون" و لەناویشیاندا زۆر هاوڕێی توندڕەو هەبوون. کە دەبێ مەبەستی توندڕەوی فیکری بێ، دەنا لە کاروانی شۆڕشی کورداندا، زۆربەی هەرە زۆری بەشداربووەکانی، بە سەرکردە و بنکردەوە، بەبێ هەر تولێرانس (تەحەمول) و لۆجیکێک لە ڕووی هەڵسوکەوتی ڕۆژانەدا توندڕەو بوون و لەناویاندا خودی نەوشیروان لە هەموو ڕوویێکەوە یەکێک بووە لە هەرە توندڕەوەکان.

نەوشیروان دەیەوێ بە خوێنەر بڵێ، کە کۆمەڵە بەر لە دەستبەسەراگرتنی خۆیەوە، چەند ڕێکخستنێکی دەستەپاچە و ئەندامەکانی گەنجی هیچ لەبارانەبوو بوون. ئەوە ئەگەر هەر لە هەواری تێکەڵەی کوردەواری مایەی هەزمکردن بێت، کە کاراکتێری سەرەکی کۆمەڵە لە بەرگی پێشمەرگایەتی شاخ، تێکڕای سەروەرییەکانی ئەو ڕێکخستنە بۆ سێبەری

قەڵەمڕەوی خۆی بەتەنیا بگێڕتەوە و ماندووبوونی سەربازە نادیارەکانی گوم بکات!
**نەوشیروان بەهەمان هەناسە دەڵێ:**

**(کومەلە، وەکو ریکخراویکی سیاسی هیشتا لەناو خەڵک دا خوی ئاشکرا نەکردبو. بەشیکی سەرکردەکانی لەزیندان دابون. ئەوانەش کە کومیتەی هەریمەکانیان دروست کردبو لەژیانی سیاسی دا کەم تەجروبە و لەژیانی پێشمەرگەیاتی دا بی تەجروبە بون. گەنجی نەناسراو بون و هەمویان ناوی خویان گوری بو. هەریەکەیان مەفرەزەیەکی کەمی لەگەڵ بو زوریان بی چەک بون.) ل/١٧١**

راستە کۆمەڵە رێکخراوێکی بچوکی منداڵدانی رەوتێکی هەڵوەشاوە بوو، بەڵام لە مەیدانی خەباتکردنی سیاسی و هەتا پێشمەرگەیی، خاوەنی دەیان کادری لێهاتووی سیاسی بە ئەزموونی خەباتی جەماوەری بوون، لە نموونەی، خاڵە شەهاب، مامۆستا جەعفەر عەبدولواحید و "ئارام" و خودی نەوشیروان.. هتد. هەروەها لە بواری پێشمەرگەییدا، عەلی بچکۆل، ئیبراهیم عەزۆ، ملازم جوامێر، ملازم عومەر، سیروان تاڵەبانی، حسن خۆشناو، سەید کەریم، سابیر رەسول و دەیان رۆڵەی دیکەی قاڵبوەوەی شاخی هەبووە.

دیارە لە فەرهەنگی نەوشیروانەوە، شایستەی خوێندنەوە نەبوونە. هەروەها ئەزموونی دروستکردنی مەفرەزە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە و ناردنەدەرەوەیان بە رابەری "ئارام"، یەکێکە لەو سەروەرییانەی کۆمەڵە، کە وەک سەرمەشقێکی بەرچاو بۆ گەشەکردنی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان، گروند و کەرەستەی ئامادەکراو بووە، کە نەوشیروان خۆی لێ نەکردوتە میوان. بێگومان ئەو قەوانە کلاسیکییەی ناو قوتابخانەی سەرانی حیزبی کورد، کە هەمیشە زرەخەونیان بەناوی زل و دێی وێران بینیوە. لەو باسوخواسانەی نەوشیروان بەزەقی دەخوێندرێتەوە. دەنا کادر و سەرکردەیەکی وەک "ئارام"ی هەڵقولاوی رۆژە سەختەکانی تەنگەژەی کۆمەڵە، کە خاوەن یەک خەرمانی مەعریفە، نووسەر و رۆژنامەنووسێکی بلیمەت، سیاسییەکی زمانزان، قاڵبوی کوڕی خەباتی رێکخراوەیی، بۆ کۆمەڵە و یەکێتی و شۆڕشی نوێ پێویست بوو، یان سەرکردەیەکی ناوزڕاوی بەر چەندان ئەزموونی پڕ فەشەل..!؟

دواتریش بێجگە لە کەسایەتی مام جەلال، کامانەن لەو سەرکردانەی وەک نەوشیروان، ئەوانەی ئەو بە خەڵکی بەئەزموونیانی زانیوە، کامانەیان لە "ئارام" و هاوڕێیەکانی کۆمەڵە بە ئەزموون و سەرکەوتوتر بوون..!؟ بۆ ناو گۆڕینەکەیش، ئەوە هەر هاوڕێیانی کۆمەڵە بەتەنیا ناوی خۆیان نەگۆڕیبوو، بگرە خودی "نەوشیروان"یش ماوەک ناوی خۆی لێنابوو "مەولود"، ئەو رۆژە هەم مۆدیلی شۆڕشگێری بوو! هەمیش کارێکی پێویست بوو، لە پێناوی پاراستنی کەسوکاری ناوشارەکانی بەردەستی دامودەزگاکانی رژێم. ئەو رۆژانەیش زۆربەی، هەتا مەسئولە ناودارەکانی مەبەستی نەوشیروان، لە سەرەتادا

مەفرەزەی بچوک و بێ چەک بوون و ئیمکانیاتی چەکداری لەو ئاستە سەرەتاییە بوو. هەر بۆ نموونە خودی نەوشیروان لەو لاپەڕانەی پێشەوە، دەگێڕێتەوە کە خۆی تەنیا پێشمەرگەیەکی لەگەڵ بووە.

(بزوتنەوە، تازە دامەزرابو، بەلام سەرکردەکانی هەمو کەسایەتی ناسراوبون. هەریەکەیان رابردووی دریژی لەکاری سیاسی و لەژیانی پیشمەرگایەتی دامەبو. خەلکی زوریان لە شارولادی ئەناسی. سەرانی ئیلەکان و کویخای گوندەکان ریزیان لی ئەگرتن و بەقسەیان ئەکردن.) ل/١٧١،١٧٢

راستە بزووتنەوە وەک ڕێکخستنێکی نوێی منداڵدانی ڕۆژانی ئاشبەتاڵی ساڵی ١٩٧٥ی شۆڕشی چەکداریی چواردەساڵە، لەسەردەستی کۆمەڵێک سەرکردە و کادری عەسکەری و سیاسی تێکەڵەی هەردوو ڕەوتی پارتی "باڵی کۆنی م. س و سەرکردایەتی بارزانی" هاتبووە دامەزراندن، کە کەموزۆر لە هەموو خامۆشییەکانی ئەو شۆڕشە لە بەرپرسیاری بێبەش نەبوون. ئەزموونی تاڵوتفتی خەڵکی کوردستان تێری بوو لە خەوشەکانی ئەو سەرکردە و کادرانە.

نەوشیروان بۆ مەبەستی نادیار باسی ناکات! گەرەکیەتی ئەوانەمان بە بەراورد لەگەڵ سەرکردە و کادرە گەنجە پەرێز پاکەکانی کۆمەڵە، لێ بکاتە پاڵەوانی مەیدان. دیارە مەیدانی عەمەلی بەپێچەوانەی حەزەکانی نەوشیروانەوەیە، کە بەدوای دەیان ساڵیش هەر سوورە لەسەر ئەو خەملاندنە نادروستانە، هەتا لە فەنتازیای حەزەکانیدا، سەری بۆ ئەنجامەکان نەلەقاندوە، ئەو خەیاڵانە هەر تەنیا وەک خەونی حەزی بەرتەونی بێ ریس و خوری بەجێمان. چونکە سەرباری کۆبوونەوەی وەختی، جۆری هەڕەمەکی خەڵک لە دەوروبەریان، کە لەگەڵ فشاری هێزەکانی رژێمی عیراقی، هەر ئەو سەرکردە ناسراوانە وەک سەلکە پیوازی سپی بەتەنیا مانەوە و ئەو کەسایەتییە ناسراوانە لەبیری خەڵکەکە چونەوە و بە شەپۆل تەسلیم بە رژێم بوونەوە. هەروەها سەرباری ئەو هەموو ئەزموونەی هەیانبوو لە بواری سیاسی، پێشمەرگەییدا، پانۆرامای ڕووداوەکانی ئەوان ڕۆژان، لەبەرانبەر ئەو هێزە بێشومارەی رژێم، نەوشیروان هیچ ئەفسانە و موعجیزەیەکی ئەو توخمانەمان بۆ ناگێڕێتەوە، تاکو لەبەردەم خۆڕاگریی گەنجە بێئەزموونە نەناسراوەکانی کۆمەڵە بۆیان بخوێنێ..! بە پێچەوانەوە قارەمانێتی هاوڕێیانی گەنجی بێ ئەزموونی کۆمەڵە لە زیندانەکانی رژێم و هەڵمەتی گیانفیداکارانەی پێشمەرگە سادە و نەناسراوەکانی کۆمەڵە، لێرەولەوێ داستانی ئەوتۆیان تۆمارکردووە، کە دەیان و سەدان سەرکردەی بە ئەزموون و ناسراوی بەرپێناسەی ئەزمونی نەوشیروان لە ئاستیان دەستەوەستان بووە، کە بە خۆیشی شایەدی بۆ داون. هەنووکەیش لەناو سەرانی حیزبەکانی کورد، وەک پێویست گوێ بە وزەی گەنج و نوێ نادرێ. هەمیشە ئەوە بووەتە میرات، کە ئەوەی ڕۆژانێک

سەرکردەبوەە، بۆ هەر بارودۆخێک بێت، ئەو کەسانە بونەتە خاوەن رابردووی درێژ، کەسایەتی ناسراو، بەئەزموون، بەبێ ئەوەی ئاوڕ لە خەرمانی تەنیا پوشوپەلاشی بابردەڵەی بەرهەمەکانیان بدرێتەوە. بەڵکو گرنگ ئەوەیە ئاغای گوندە! من لە نەوشیروان دەپرسم، ئەو هەموو پیاهەڵدان و گوتنە زیادەی بۆ بەژن و باڵای ئەو سەرکردە بەئەزموون و کەسایەتییە ناسراوانەی خاوەن رابردووی درێژی سیاسی و پێشمەرگایەتی، بۆ لەکاتی لێقەومانی رووداوەکان، سەرباری هەبوونی هێزێکی زۆروزەبەند بەدەوروبەریانەوە، بەرگەی فشاریان نەگرت و ئەو هەموو پیاهەڵدانە بۆ کوێ چوو..!؟ بۆچی سەرانی ئێل و کوێخای هیچ گوندێک بەهیمدادیان نەچوون! بگرە هەتا بەشێکی ئەو هێزەی بەردەستی خۆیشیان، لێیان کشانەوە و لە مەیدانی رووبەڕووبوونەوە پاشەکشەیان کرد و بەشەپۆل تەسلیم بە رژێمی بەغداد بوونەوە!

(سەرانی کومەلە، ئەوانەی لە برادوست بون.. سالار، مەلا بەختیار، ئازاد هەورامی، عومەری عەبدوللا کوبونەوەکیان کرد. ئارام نەهات بو کوبونەوەکان. منیشیان بانگ کرد بو کوبونەوەکە. هەمویان داوایان لی کردم منیش یەکی بم لە نوینەرەکانی کومەلە. من خوم پیم خوش نەبو. زوریش بەهانەم هینایەوە بو ئەوەی واز لەمن بهینن و بە راشکاوی وتم.. لیتان ناشارمەوە من باوەرم بە کومونیزم نیە) ل/١٧٢

هەمو یەکێک گوێ لەو گێڕانەوەیەی نەوشیروان بگرێ، ئەگەر بە تەواویش لەوە نەگات کە نەوشیروان هەر لە سەرتاوە کارێک و حەزێکی دیکەی هەبووە. ئەوە گومان لە تێکڕای گێڕانەوە و بۆچوونەکانی دەکات، کە مادام ئەو لە سەرەتاوە و زۆر بە راشکاوی باوەڕی بەو فەلسەفەیە نەبووە، کە کۆمەڵە ئیدیعای پێوە دەکرد، واتە؛ فەلسەفەی مارکسیزم لینینیزم. ئیتر چۆن بە خۆی رافەرمووە هەتا لەگەڵ خۆیدا ئەو دیماگۆگیبوونەی ورد بکاتەوە..! دیارە بەوە ئۆقرەی دڵ و دەروونی پاساو داوەتەوە، کە ئەو چەقی بڕیاری خۆی داوە، لەوەی بە شێوەیەکی مەنهەجی و ئەجندای چەند سەرە، بڕیاری درووێنەی قرشەی بێسەروبەری ئایدیۆلۆژیی کۆمەڵە بکات و کەسایەتی "ئارام" کۆسپێکی گەورە بوو، بەڵام بەختی یار بووە لەوەی "ئارام" لە ئانوساتێکی زۆر ناهەمواری ژیانی کۆمەڵەدا، وەک لە مەیدانی عەمەلی دەرکەوت، بە شەهیدبوونەکەی هەموو خەون و خۆزگەیەکی هەوادارەکانی ئەو فەلسەفەیە لەناو کۆمەڵە کاڵ بێتەوە و بواری ئاسان بۆ بیرکردنەوەکانی دیکەی ئەم و ئەو دەیسەر بێت.

خوێندنەوەی وردی پەیڤەکان، بەتایبەت کە بەدوای دەیان ساڵ نووسراون و بڵاو کراونەتەوە، لە لایەک یەک موسداقییەتی بەدەگمەنی کەسایەتی نەوشیروان دەردەخات، کە نموونەی لە کاروانی سیاسی کوردان کەمە و بە هیچ جۆرێک لەو چەقبەستنەی خۆیدا، بۆ

بنکۆڵکردنی کۆمەڵە و داماڵەخاسکردنی لە ناوەڕۆکی فەلسەفی نکۆڵی نەکردووە و دواتر بە ئاشکرایی نووسیویەتی:

(راستییەکەشی ئەوە بو، توشی/ خیبە امل/ بو بوم لی یان، ئەمویست بی ئەوەی دلیان بشکینم، تیکەلاوی کاری ناو کومەلە نەبم. جگە لەوەش کەسانی وەکو کاک خالید و عەلی عەسکەری رەئیان وابو بەهەمومان ریکخستنیکی تازە بە گویرەی پیویستییەکانی شورشەکە دابمەزرینین، جیگەی بزووتنەوەو کومەلە و خەتی گشتی بگریتەوە.) ل/١٧٢

کرۆکی بیرکردنەوەی نەوشیروان هەر لە سەرەتای هاتنەوە و بوونە سەرکردەی "ی.ن.ک"، ئەگەر کۆمەڵە وەک مەوجود بەردەوام و "ئارام" لە ژیاندا بوایە، ئەوە هەر بەبێ کۆمەڵەیش، بریتی بووە لە دامەزراندنی رێکخستنێکی تازە، بەبێ ئەوەی دەستمایەی ئەو (خیبە امل) بوونەی روون بکاتەوە، کە بە هەموو لێکدانەوەیەک کردوویەتییە پێشقاوڵی دیوی دووەمی شاراوەی فیکری خۆی، لە دروستکردنی حیزبێکی تازە لەگەڵ کەسانی خاوەن ئەزموون و کەسایەتی ناسراوی چەندان ساڵەی بەرێوەبردنی شۆڕش! کەچی هەمان نەوشیروان کە هەموو خۆزگەیەکی لە دامەزراندنی ئەو جۆرە حیزبە بۆ مەیسەر بووە، لەدوا هەنگاویدا کۆمەڵەی هەڵوەشاندووتەوە، بەدوای دەیان ساڵی دیکەی ئەو تاقیکردنەوەیش، لە دیمانەیەکی رۆژنامەوانی لەگەڵ "دەزگای گولان"دا، پەشیمانی خۆی لە هەنگاوی ئەو هەڵوەشاندنەوە دەردەبڕی، بەبێ ئەوەی هۆی پەشیمان بوونەوەکەیمان بۆ روون بکاتەوە.

نەوشیروان لە بەرۆکی دەربڕینی خۆزگەکانی خۆیدا، هەروەک چۆن بەردەوام قزگەتەنگی و بێحەوسەڵەیی بەردەوامی خۆی بۆ نەشاردراوەتەوە، ئەوەی لەبیر چوەتەوە کە لە سەرەتای گەڕانەوەی بۆ باوەشی یەکێتی و شۆڕشکردن، هەر خۆی فەرموویەتی، ئەو بۆ خاتری "پێوەندی ئەخلاقی و ئەدەبی بە مام جەلال و کۆمەڵە"، بڕیارێکی لەم جۆرەی داوە. راستە نەوشیروان راستەوخۆ و ناراستەوخۆ بە بەرنامە کاری بۆ تواندنەوەی کۆمەڵە کردووە و هەوادارەکانیشی بەبێ ئەوەی راستەوخۆ پێی بزانن رەدووی کەتوون و سەرکەتوانە **کۆمەڵە**یان لەگۆڕ ناو، خۆیان بەسەلامەتی دەرچوون. بەڵام لایەنێکی دیکەی ئەو پرۆسەیە، بریتی بووە لەوەی، سەرانی دیکەی کۆمەڵە بەدوای شەهید بونی "ئارام"، بێ سەر ماونەتەوە و "ئارام"ێکی دیکە دروست نەبووە، کە خاوەنی ئاراستەیەکی تێر و بارتەقای مەترسییەکان بێت. بەڵکو ئەو هاوڕێیانەی هاوبیری "ئارام"، وەفاداری سەروەرییەکانی کۆمەڵە، بە شەهیدبوونی ئارام تووشی شۆک هاتوون، لەرووی لەخۆ رانەدیتن، هەتا ئاقاری لاوازی سەقامگیرییان بەسەرەتاکانی بیرکردنەوەکانیان، لێلی ئاسۆی بیروکرداریان لە بواری پراکتیکی، کاڵبوونەوەی ئەو سترکتورەی "ئارام" لە

سەرەتای دارشتنی بوو بۆ کۆمەڵە و شۆڕش، لەوەی کۆمەڵە دەبێ هەموو پشت و پەنایەکی بە بیروباوەڕ و کۆمەڵانی خەڵکی ڕەشوڕوت، زەحمەتکێشی ستەمدیدەی کورد ببەستێتەوە و نەبێتە دەسکەلای گەمەی سیاسی ناوەکی و دەرەکی. زەمینەیەکی لە بار و گونجاوی بۆ کار و بەرنامەی نەوشیروان لە گرتنەدەستی یەکجارەکی کۆمەڵە ڕەخساند. ئەوجا بەربوونی بەرپاشۆڵی لێبووردنی گشتی، چەندان سەرکردە و کادری کۆنینەی زیندانەکان، هاتنە شاخ و لەژێر کاریگەری سالانی زیندان و هەناسەی تۆڵەسەندنەوە لەو سەرکردەوکادرانەی ڕۆژێک لە ڕۆژان بەدەوری "ئارام"ەوە بوون (لەئەنجامی بە هەڵە خوێندنەوە و تێگەیشتنی ڕاپۆرتی شوبات کۆمیتەی هەرێمەکان کە لەلایەن خودی "ئارام"ەوە وەک پێویستییەکی مەوزوعی بەجورئەتانە بۆ ئەوێ ڕۆژێی لە ئەزمەدابوونی کۆمەڵە و باروودۆخە ناهەموارەکە نووسراوە، زۆر بلەز، بوونە تەواوکەری پراکتیکی کارەکانی بەرنامەی کۆنترۆلکردنی کۆمەڵە، هەنگاونان بەرەو تەسفیەکردن، ڕاونان، ترۆکردن و پەراوێزکردنی بەدەیان هاوبیرەکانی فەلسەفەی 'م. ل". بە جۆریک ئەو هاوڕێ و کادرە وەفادار و دڵسۆزانەی سەرەتاکانی کاروانی خەباتی بێوچانی کۆمەڵە، نەوەک هەر نەیانتوانی کۆمەڵە لە بەرەوفەوتان دەرباز بکەن، بەڵکو تارادەیەک ژمارەیەکیشیان بوونە پێخۆری ئەو ئاراستە زاڵ و بەدەسەلاتەی بەڕێوەبردنی کۆمەڵە، نکارین بەر لە تواندنەوەی کۆمەڵە بگرن، چەندان هاوڕێش بوونە سووتەمەنی بەرانگژبوونەوە و گیانی خۆیان کردە قوربانی بۆ ڕێگرتن لە مانەوەی کۆمەڵە، دەیانی دیکەش لە حەژمەتان، بێهودەیی و نائومێدیان لە ڕووبەڕووبونەوە، ئاوارەبوون بەرەو هەندەران و کەنارگرتن، بوونە بەردی بن گۆمێیان هەڵبژارد.

هەروەها لێرەدا، نهێنی ئامادەنەبوونی "ئارام" لەو کۆبوونەوانەی سەرانی کۆمەڵە لە دۆڵی گۆستێ، تەلەسمێکی دیکەی خواستەکانی "نەوشیروان"ە، کە خۆی لێ بی دەنگ هێشتووتەوە. بەگوێرەی گێڕانەوەکانیش بێت، مایەی هەڵوەستەکردنە و جێی پرسیارکردنە لە کەسانی بەژیان زیندووی وەک ملازم عومەر، مەلابەختیار و سالار، کە چۆن بەبێ "ئارام" کۆبوونەوەکانی سەرانی کۆمەڵەیان بردووتە ئەو شوێنە! حەق وایە لەم بارەیەوە قەزاوەتی خۆیان بکەن. بەندە لە دیدی ناسین و پێزانینی بیرکردنەوەکانی "ئارام"ەوە، ئەو ئامادەنەبوونەی بەوە دەخەملێنم، کە "ئارام" ئینسانێکی مرۆڤ پەروەر و وڵاتپارێزیکی بێپەروا بوو. سەرکردەیەکی دونیادیتە و سادە و ڕاستگۆ بوو. ئەوەی مانۆڕ و بڕیاری دەمدەمی بوو، لە مێشک و دڵودەروونە گەورەکەی کەپرەی نەکردبوو. لە ئەزموونی ژیانی سیاسیدا، لە نزیکەوە بە قوتابخانەی حیزبی کوردی و کەرەستە و پێکهاتەکەی ناسیار بوو. زۆری مەبەست بوو لەو فرسەتە سەخت و دژوارە چەتونە ناچارییەی خەباتی نهێنیی و

ئاشکرای شاخ، سەرەتای ڕێکخراوێکی مارکسیی تۆکمە بخاتە سەرپێیان. دەرکردنی ئۆرگانی "ئالای شۆڕش" یەکێک بوو لەو هەنگاوانەی بەدوای سەرلەنوێ گرتنەوەی شیرازە لەیەکترازاوەکانی کۆمەڵە، خۆی پێوە خەریک کردبوو. وەک قادر عزیز لە ڕۆژگارێکی پێشمەرگایەتی گێڕایەوە و گوتی: تازە کاک "ئارام" ژمارەیەکی ئالای شۆڕشی بە چاپگەیاندبوو و چەند دانەیەکی گەیاندبووە بنکەکانی یەکێتی لە دۆڵی گۆستێی حیزبان، لە سەرەتای ساڵی ١٩٧٧. دیارە لەجیاتی دەستخۆشی و دڵپێخۆشبوون، هەندێک لەوانەی گوایە کۆمەڵەبوونە، ئەو ژمارەیەی "ئالای شۆڕش"، ژانی پێکردوون و تەزاندوونی. کە "شسە کوێر" چۆن لەو بێ ئیمکانیات، دوورەدەستی و بارودۆخەی ژیانی دژواری پێشمەرگایەتی لەو ناوچانەی گەرمیان، ڕۆژنامەیەک بەم ناوەڕۆکە دەربکات.

دیارە مەبەستی سەرەکی "ئارام". لەو دەرفەتەی شاخدا، یەکەم هەوڵدانی بوو لە رووی فیکرییەوە، لەپێناوی سازدانی مەشقی ساغبوونەوە، جێگیربوونی هێڵی سیاسی ئەوێ ڕۆژێی کۆمەڵە بوو، لەپاڵ نەشونماکردنی بەرپابوونی خەباتی نوێی چەکداری. بەڵام لەگەڵ شەهیدبوونەکەیدا، تروسکایی ئەو چرا گەشەیش کوژایەوە. هەرچەندە ساڵانێکی زۆر دواتر ناوی "ئالای شۆڕش" لە بەرگێکی دیکەوە، بەڵام بە هەناسەیەکی سوار و کاری پەلەپروسکێوە، هەوڵی زیندووکردنەوەی بیرۆکەی شەهید "ئارام"ی دایەوە. بە هۆی ناهەمواریی بارودۆخی بابەتی، کاڵفامی و دەمچەفتی فاکتەری زاتی، باوەڕنەبوون بە ئازادی و چاوپێهەڵنەهاتنی دەسەڵاتدارانی بەرسینەری تفەنگی شاخەکان، بەدوای تەمەنێکی پڕ لە فەشەل، پووکایەوە.

بەندە، لەگەڵ برا و هاوڕێی کاروانی خەباتم، پشکۆ نەجمەدین لەسەر مەشقی گێڕانەوەی ئەو ئەزموونەی "ئالای شۆڕش"داین. هەر یەکەمان لە دید و پراکتیکی زەمان و زەمینی خۆیدا، چونکە هەردووکمان لەگەڵ مەلا بەختیار، لەشانی شێخ عەلی، سەرەتای بیرۆکەی ئەو ئەزموونەمان خستوتە گاگۆڵەکردنەوە و دامەزرێنەری "ڕێکخراوی ئالای شۆڕش" بووین. لەپێناوی رزگارکردنی گێڕانەوەی ئەزموونەکە؛ دەربازکردنی لە دەستکاریکردنی نەبەستاوی. ئەوجا داهێنانی مێتۆدی هەڵسەنگاندن لەلایەن خودی بەشداربووە سەرەکییەکان، وەک ڕچەشکاندنی ئەو تەلیسمی هێشتنەوە و پەردەپۆشکردنی نهێنییەکانی ئەو ئەزموونە روون دەکەینەوە.

**نەهاتنی ئارام و کەسی سەر بە رژێم..**

(کاک ئارام نەهات بۆ برانوست و بەشداری کۆبونەوەکانیش نەبو. چەند کەسی، یەکی لەوانە کادریکی کومەلە دوایی دەرکەوت سەر بەرژیم بو. بە نامە و بە قسە لە کاک (ئارام)ـیان گەیاند بو، کەوا مەمجەلال ریزی ئەندامەکانی کومەلە ناگری و ئەگەر ئەویش بچی ریزی ئەویش ناگری.) ل/١٧٢،١٧٣

یەکێک لەو میتۆدانەی بە زەقی جێپەنجەی بە سەرتاپای ئەم کتێبەوە دیارە، نەوشیروان بەردەوام، کە باسی شتێک دەکات، کە پێویستی بە روونکردنەوەی زیاتر هەیە. لە جێگای مەبەست هیچ نالێ و دوایی لە شوێنێکی دیکە دێتەوە سەری و باسی دەکات. هەر وەک چۆن سەبارەت بە نەهاتنی "ئارام" بۆ کۆبوونەوەکانی دۆڵی گۆستێ، لەپێشەوە هیچ نالێ، کەچی دواتر یەکلایەنە "ئارام" قەرزار دەکاتەوە و گوایە بە خۆی و هەر لە خۆیەوە نەهاتووە! گوایە "ئارام" کەوتووتە ژێر کاریگەری قسەوقسەلۆکی کادرێکی کۆمەڵەوە، کە وەک نەوشیروان دەڵێ: "دوایی دەرکەوتوە کە سەر بەبەعس بوە". بەبێ ئەوەی بەخۆی رابفەرموێ، پاش دەیان ساڵ ناوی ئەو کادرە بدرکێنێ! ئەوەیش بەدەردی ئەو دەسرازە تەلیسمە دەبات، کە بە ئاسانی ئاشکرا نەکرێت.

جارێ لە بەراییەوە، ئەگەر "ئارام" بە هاوڕێ و هاوبیرە نزیکەکانی خۆی؛ مەلا بەختیار، سالار، ئازاد هەرامی و ملازم عومەر باوەڕ نەکات کە لەشانی "ئارام"دا سەرکردایەتی مەیدانی کۆمەڵە بوون و لەو کۆبوونەوانەی کۆمەڵە و یەکێتی لە دۆڵی گۆستێدا بەشداربوون، کێ بەوسەردولکەیەی نامە و قسەی هاوڕێیەکی دیکەی کۆمەڵە دەڵێ ئامین! کە نەوشیروان لە هەر شوێنێک مەبەستی بوبێت، درێخی نەکردوە لە شکاندنی کۆمەڵە و ناوزڕاندنی ئەندامەکانی. من نازانم بۆ دەبێ لە ئاست ناوهێنانی ئەو برادەرە قوڕقەپی لێکردووە، بەتایبەتی وەک خۆی دەڵێ، دواتر دەرکەوتووە سەر بەرژێمی بەعس بووە.

بەو شەرعەی باوەشی هەندێ لە سەرانی حیزبی کوردی، نابێ کەسی سیخوڕ ئاشکرا بکرێن، وەک عوملەی سەعبە بۆ دەمی پێویست بە نهێنی مانەوەی مەبەست بووە، مەگەر تەنیا ئەو فاولەی سەرانی یەکێتی دایان، لە ئاشکراکردنی کادر و مەسئوله فایلدارەکانیان، کە لەپێشەوە بۆ خۆهەڵکێشان بوو، دواتر کە زانییان لە داهاتوو بەگران بەسەریان دەکەوێ، لە بەدواداچوونی ئەوفایلدارانە، قورقەپییان لێکرد..! دەنا لە زۆر شوێنی دیکەوە، نەوشیروان لە ناوهێنانی خەڵک نەسڵەمیتەوە، کەچی بۆ قەرزارکردنەوەی "ئارام" لە هۆی نەهاتنەکەی و ئاشکرانەکردنی ناوی ئەو کادرە، بەناو سیخوڕە، دیسانەوە وەک تەلیسم بەدارێ وەدەکرێ!

بێگومان سەرباری ئەوانەیش لە خوێندنەوەی دووبارەی ئەو دەستەواژەیەدا، نەوشیروان لەژێر ناوی نادیاری "پیاوی رژێم"، کە دەبێ بۆ مەقسەدی خۆی، ئەو پیاوە

جێگای باوەڕی "ئارام" بووە، لەوەی بەو ڕاپۆرتە بێ بنچ و بنەوانە باوەڕی کردبێ! کە تەنیا تەموژ بەدەوری ئاسمانی پاکو بێگەردی "ئارام" بەباداکردنە، لەوەی "ئارام"یش سەرەداوێکی پێوەندی بە ڕژێمەوە هەبووە لە ڕێگای ئەو ئەندامەی کۆمەڵەوە، کە گوایە پیاوی ڕژێم بووە. دیارە بە ناوهێنانی ئەو پیاوەی ڕژێم، نەوشیروان هەموو گومان و مەزەندەیەکی لە مەبەستە نادیار و تاڵەکانی خۆی دەڕەواندەوە.

سەبارەت بەوەیش کە "ئارام" لە ترسی ئەوەی مام جەلال ڕیزی نەگرێت، نەچووە بۆ ئەو ناوچەیە! دڵنیام "نەوشیروان"یش، بەوە دەزانێ، "ئارام"ێکی ڕەقوڕووتی تەنیابار، هەموو سەروەت و سامانەکەی تەنیا ئەو کەسایەتییە سادە، پڕ لە خۆشەویستی، ئیسک سوک و قسەخۆشەی سەردڵان بوو، کە هەر یەکێک بەراگوزاریش تووشی ببوایە و قسەی لەگەڵ بکردایە، دەچووە قوڵایی دڵییەوە و خۆشی دەویست و بەدەست خۆی نەدەبوو هەندی دونیایەک ڕیزی دەگرت. بەدەیان دەرفەت بووە "ئارام" بۆ یەک جار لەگەڵ نەیارە فیکری و دژەکانی کۆمەڵە دانیشتوە، هێمنی گفتوگۆ و ڕیزگرتنە ئینسانییەکەی، بەئاسانی قەناعەتی بەو کەسانە گۆڕیوە. دەیان نموونەی لەم جۆرە لە هەگبەی هەموو هاوڕێیانی "ئارام"دا هەیە. .

'ئارام" ئەوەندە لە خۆی و فەلسەفەی خەباتی بەباوەڕ و خاوەن قەناعەت بوو، بەقەد قورسایی کێوی پیرەمەگروون، لە ئازایەتی و نەترسان، بوێری و جورئەت تژی بوو. ڕاستە "ئارام" مرۆیەکی نەرم، ڕەوشت بەرز و ویژدان زیندوو بوو و ڕیزی هەموو یەکێکی دەگرت، بەڵام لە ئاست هەر زەلامێکی لوتبەرز و لەخۆبایی سێبەری دەسەڵاتی تفەنگ و خەڵکی بەژاوەژاو، لووتکەیەکی هەڵوێست و خاوەن جورئەتی ڕووبەڕووبونەوە بوو. "ئارام"ێک لە ڕۆژە تەنگەتاوەکانی کۆمەڵە (١٩٧٥ – ١٩٧٦) لە بەرانبەر جەبەڕوتی زوڵم و زۆرداری ڕژێمی بەعس کوڵی نەدابێ و ژیانی خۆشەویستی و جەستەی لەڕولاوازی خۆی کردبێتە سووتەمەنی دەربازکردنی کۆمەڵە و هەڵگیرساندنەوەی خەباتی پێشمەرگایەتی. "ئارام"ێک لە بەرپەرچدانەوەی لادان، زیدەڕۆیی و دەستدرێژیکردنە سەر سەروەرییەکانی خەڵکی ستەمدیدە، لەلایەن ئەو کەسە بەئەزموون و کەسایەتییە ناسراوانەی ماوەیەکی دووردرێژ بەڕێوەبەری شۆڕش بوون، وەک نەوشیروان بەشان و باڵیاندا هەڵدەڵێ، "ئارام" بەخۆی و هێزی بیروباوەڕەکەی، ڕووبەڕوو، پەنجەی لە چاوی ئەوانە ناوە، بە وانەی شۆڕشگێری و ڕیزگرتنی خەڵکی، ئامۆژگاری کردوون و دەرسی داون. ئیتر دەبێ کێ هەبووبێت، "ئارام" ترسی لێ بوو بێت و ڕیزی نەگرێ..! پاشان ئەوەندەی بەندە لە خودی "ئارام" خۆیم بیستووە، کە سەربارێ هەر ڕا و بۆچوونێکی ئایدیۆلۆژی و هەڵوێستی چینایەتی، چ جۆرە پێوەندییەکی پڕ لە ڕیزگرتن لە نێوان خۆی و

"مام جەلال"دا هەبووە، هەتا نەوشیروان بە نابەدڵی، خۆیشی چەند جارێک باس لە نامەگۆڕینەوەی هەردووکیان دەگێڕتەوە. ئەو کەسانەی لە نزیکەوە بەو پێوەندییە ئاگادارن، دەتوانن قسەی خۆیان بکەن. بێگومان "ئارام" بەو نەچوونەی بۆ دۆڵی گۆستێ، هەڵەیەکی تاکتیکی نواندووە، لە سێبەری ناردنی هاوڕێیەکانی تێیکەوتووە.

(کومەلە لەسالی 1970 ەوە دامەزرا بو بەنهینی ریکخستنی دروست کرد بو. بەلام گیرانی شەهاب و هاوریکانی و جەندین کەس لەئەندامەکانی کومەلە و خوشاردنەوەی بەشیکی تریان تەگەرەی لەپەرەسەندنی دابو. کومیتەی هەریمەکان کە دوای ریکخستنی کومەلە لە شەهید ئارام، سالار، مەلابەختیار و شەهید ئازاد پیک هات بو. جگە لەوەی هەمویان لەداوودەزگا ئەمنییەکانی رژیم راکردو بون. هەموشیان گەنجی کەم تەجروبە و نەناسراوبون. لەناو شارەکان دا ژمارەیەکی کەم کەسانی شارەزای وەکو جەمال تاهیر، شازاد سائیب، حەمە جاوشین مابون بوکاری ژیر زەمینی.) ل/١٧٤،١٧٥

لێرەیشەوە، میتۆدی داماڵەخاسکردنی ماندووبوون و قوربانی کەم وێنەی "ئارام" و یەک دەسرازە لە هاوڕێیەکانی دیکە بەردەوامە و راگوزارانە بەسەر ناوهێنانیان تێدەپەڕێ. ئەو دەستپێشکەری و شاندانە جوامێرانەی ئەوێ ڕۆژێی ئەو هاوڕێیانەی دیکە بەهەند ناخوێنێتەوە. هەتا هەڵوێستی چاونەترسانەیان لە رووبەڕووبوونەوەی هێزە دڕندەکانی رژێم، کەوتنە خەباتی نهێنیی ژێرزەمینی و دواتر چوونە شاخ، لە فەرهەنگی نەوشیروان بە "راکردو"ی دەزگا ئەمنییەکانی رژێم ناوزەد کراون!

پاشان لە چاوی خۆیەوە زۆر بە شپرێوی و بە پەیڤی "خۆ شاردنەوە" هەڵوێستی جوامێرانەی ئەو هاوڕێیانە سووک دەنوێنێ و وەک ئەوەی خۆی لەو ڕۆژە لەناو شارەکان بووبێت و شانی دابێتە بەر راستکردنەوەی باری لەنگ و کەوتووی کۆمەڵە! نازانم بۆ ئەو (شارەزا) بەتەنیا بۆ جەمال تاهیر و شازاد و حەمە چاوشین بە کار دەهێنێ، کە ئەوەی من پێی بزانم و لە نزیکەوە کارم لەگەڵ کردوون، جارێ بەگوێرەی شازاد وەک مرۆڤێکی لێهاتوو، راستە زۆر کاری جوامێرانەی لە رێکخستنی پێوەندی نێوان ناوەوە، لە رێگای "ئارام"، کە بە هۆێ هێژا م. عەزیز مەحمودەوە بووە، لەگەڵ دەرەوە بەتایبەتی لەگەڵ مام جەلال ئەنجام داوە. هەر بەدوای شەهیدبوونی "ئارام"یشەوە چووەتە دەرەوەی وڵات و هیچ پێوەندییەکی راستەوخۆی ئۆرگانیکی بە رێکخستنەکانەوە نەبووە. من دڵنیام کەسانی دیکە لەشانی مەلابەختیار و سالار، کە ماون، بەم راستییانە ناسیارن کە ئەو دەمە نەوشیروان لە دەرەوە بووە و ئاگای لەم بارودۆخە نەبووە. حەق وایە نهێنییەکان زیندەبەچاڵ نەکەن، خەبات و قوربانیدانی چەندان سەربازی نەناسراو دیزەبەدەرخۆنە نەکرێت. ئەوجا شازادی جوانەمەرگی رووداوێکی دڵتەزێنی هاتوچۆ لە کوردستاندا، بەر لە

مەرگی خۆیەوە، لە دیمانەیەکی تەلەفزیۆنی "کورد سات"دا، کە بەدوای مەرگی بڵاو کرایەوە، دروست بە پێچەوانەی قسەکانی "نەوشیروان"ەوە، سەربڵندانە باسی ڕۆڵی دیار و ئاشکرای "ئارام"ی هێناوەتە گۆڕێ. لەشانی دڵسۆزی و مرۆڤێکی ڕەوشت بەرزدا، بەوپەڕی لەخۆبردنەوە ڕووداوەکانی ئەوێ ڕۆژێی گێڕاوەتەوە، کە تێیدا باس لەوە دەکات ئەو خۆی لە کاری ڕێکخراوەیی ناوشارەکان ڕۆڵێکی نەبووە، ئەو تەنیا هاوکاری و کارئاسانی دەگێڕتەوە کە لەوان ڕۆژاندا پێشکەش بەو هاوڕێیانەی کردووە. خودی بەندە لە سەرەتای ساڵی ۱۹۷٦ لە ڕێگای حەمە قەرەداخی، کە ئەویش لەگەڵ شازاد لە مەحکەمەی سلێمانی کاریان دەکرد، ڕاسپاردەی هاوڕێیانی زیندانم لە نامەیەکی پێچراوە گەیاندە دەستی، کە بیگەیەنتە دەست مامۆستا عەزیز، تاکو بەدەستی "ئارام" بگات.

پاشان بۆ حەمە چاوشین، کە لەم ساڵانەی دوایی لە ئەنجامی نەخۆشیدا، کۆچی دوایی کردووە، هەتا نەوشیروان خۆی نەهاتوتە ناوچەکانی شارباژێڕ و لەخۆیەوە پێوەندی بەرەفیقە ناسیاوەکانی خۆی نەکردووە، هەتا "ئارام" شەهید نەبووە، هەتا مامۆستا جەمال تاهیر لەلایەن دەزگای ئەمنی ڕژێمەوە نەگیرا، هەرگیز هەڵسوڕاوێکی بەرچاوی ناو ئەو سەربازە نەناسراوانە نەبووە کە بەردی بناغەی سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی کۆمەڵەیان بەتایبەتی لەشاری سلێمانی و دەوروبەری داناوە "کۆمیتەی هەڵمەت" و خەتوختوتەکانی دیکە. من لاریم لەوە نییە، کە "کاکە حەمە"یش پیاوێکی چاونەترسی ڕۆژی تەنگانە بوو. ئەویش لەلای خۆیەوە هێڵێکی تەنزیمی سەرپەرشتی کردبێ، بەکورتی لەپاش گیرانەکەی دووەمی جەمال تاهیر، لەدەمی دروستکردنی کۆمیتەی سەرکردایەتی ڕێکخستنەکانی ناوخۆ، بە نامەی خودی نەوشیروان هاتورتە پێشەوە، لە کۆتای ساڵی ۱۹۷۸دا بووەتە مەسئولی یەکەم و بوێرانە شان بەشانی چەندان ئەندامی دیکەی شارەکان سەرپەرشتی ڕێکخستنەکان کراوە. لەگەڵ بەربوونی جەمال تاهیر لە زیندان و دەربازبوونی کاکە حەمە لە ڕاوەدوونانی دەزگای ئەمنی سلێمانی، دەرچونی بۆ شاخ و ڕۆیشتنی یەکسەرەی بۆ دەرەوەی وڵات، بەندە بەنوێنەرایەتی ڕێکخستنەکانی ناوخۆ بە قاچاخ چوومەتە ناوەندی کۆمەڵە لە "خڕی ناوزەنگ". دوای کۆبوونەوە و دیدەنی لەگەڵ نەوشیروان و مەلابەختیار وەک ئەندامانی ناوەندی و سەرپەرشتیاری ڕێکخستنەکانی ناوخۆ، ئەوجا بڕیاری ئەوە دراوە کە م. جەمال وەک مەسئولی سەرکردایەتیی ناوخۆی کۆمەڵە دیار کراوە. بێگومان کەس ناتوانی لە قارەمانێتی حەمە چاوشین و جەمال تاهیر زمانی لەل بکات، بەڵام هەم بەر لەوان و لەشانی ئەوانەوە، دەیان سەربازی بەتواناو بەجورئەت و فیداکاری کەموێنە هەبوون، کە گیانی خۆیان، ماڵ و کەسوکاریان کردبووە سووتەمەنی سەرلەنوێی بوژاندنەوەی دەنگ و ڕەنگی کۆمەڵە. کە دیارە نەوشیروان کەموزۆر نە ئاگای لێ بووە،

نە پێیانەوە ناسیار بووە، یان پەراوێزی کردوون و حەق وابوو مەلا بەختیار، کە بە سەرەتاکانی درووستبونەوەی کۆمەڵە لەناو شارەکاندا لە هەمووان زیاتر ئاشنایە، لە هەموو کەس زۆرتر بە تێکڕای ئەو کاروانە چالاکی نواندووە، بگرە بۆ مێژوو دەیڵێم، جارانجار بەبێ گوێدانە هەر جۆرە مەترسییەک بەردەوام هاتوچۆی شارەکانی وەک سلێمانی و هەولێری کردووە و هیمەتی زۆری نواندووە لە کەوتنەسەرڕێی ڕێکخستنەکان.

ئەوجا من لەوە سەرم سوڕماوە، کە نەوشیروان بەو هاوڕێیانەی وەک "ئارام"، سالار، مەلا بەختیار، ئازاد هەورامی دەڵێ، خەڵکی ڕاکردوو و کەمتەجرووبە و نەناسراو، کە تەنیا لەبەر ئەوەی لە پرۆسەی خەباتی شاخدا، نەبوونە ئامێرێکی کتومتی هەواداری ئەجندایەکی نادیار، کە خەڵکانی دیکەی پێ کەویی کرابوو. مەبەستی سەرەکی نەوشیروان لەو هەموو گێڕانەوەیەدا، پیشاندانی ئەجندایەکی لاواز و لەباربردنی ئەو سای کۆمەڵە بووە، کە خۆی قەڵەمڕەوی نەبووە. لەو پێناسەدا، هەتا لەگەڵ خودی بیرکردنەوەکانی خۆیدا کەوتوتە پەچەکردارەوە. چونکە ئەو لەلایەک هەموو توانج و پلارێکی کە ئاراستەی سەرکردایەتی بارزانی دەکات، گوایە بەتەمەن گەورە، عەشائیری و گوندی و دوور لە ڕۆشنبیریی شاری بوونە، کە هەر بەپێی ئەجندایەکەی نەوشیروان خۆیەوە، کەس ئەوەندەی بارزانی ناسراو، شارەزا و خاوەن ئەزموونێکی زۆروزەبەند نەبووە. کەچی هەر بۆ ڕەتکردنەوە و نەخوێندنەوەی ڕۆڵی "ئارام" و هاوڕێیەکانی لە گرتنەوە و سەرلەنوێ بنیادنانەوەی کۆمەڵەدا، ئەوان کوڕی شاری، نەناسراو و کەمتەجروبە و گەنجی نەشارەزا لە خەباتی پێشمەرگایەتی و شاخ ناونووسییان دەکات. بەڵام شتێک سەبارەت بە ناسراوی و تەجروبە زۆر و شارەزایی ڕەفیقە هەرە نزیکەکانی خۆی دەرناخات!

کۆمەڵە بەر لە تێکشکانە سەرەتاییەکەی، دوای ڕۆیشتنی سەرکردایەتییەکەی و چوونیان بۆ ئێران پاشان گیران و ڕادەستکردنەوەیان بە دامودەزگای ئەمنی عیراق. لەسەردەستی "ئارام" و لەخۆبردوویی دەیان هاوڕێی گیانفیداکار، ئاقاری تەقلیدی ئاشبەتاڵی یەکجارەکی و قاوغی تەنگەژەی ڕێکخراوەیی و ئایدیۆلۆژیی جارانی بەزاندوە، بەتایبەت لە ڕەتکردنەوە و بەلاوەنانی کۆپیکردنی تیوری سەقەتی سێ جیهانییەکەی ماوتسی تۆنگ. سەرباری هەر جۆرە فشار و زەبروزەنگێکی دڕندانەی ڕژێم، کۆمەڵە بەدەستپێشکەری ئەو دەسزازە هاوڕێیە، لە جاران چالاک و چوست تر کەوتوتەوە سەرمەشقی خۆڕێکخستنەوە و دەنگ و ڕەنگی خۆی بەناو کۆمەلانی خەڵکی شار و لادێ بلاوکردوتەوە. ئەزموونێکی نوێی لە بەرخۆدان و کەوتنەوە سەرڕێیانی خولقاندووە. قورسایی ئەو بارە قورسەی ئەوێ ڕۆژێ، مەگەر هەر بە "ئارام" و ئەو هاوڕێیانە

تەحەمول کرابێت و مانەوە و زیندوویێتی کۆمەڵە، بۆ رابەری "ئارام" و کاری بێوچانی دەیان سەربازی نەناسراو دەگەڕێتەوە.

من یەک بەخۆم، ئەوە دەخەمە بەرحوکمی ویژدانێکی زیندوو و لە نەوشیروان دەپرسم: کێ بوو ئەو کەسەی سەرباری هەموو مەترسییەک، بە شەوێکی زستانی زریان و رەشەبای کوێستانەکان[36] بە هۆی پچڕانی پێوەندییەکانی رێکخستنەکانی ناوەوە و ناوەندیی کۆمەڵە لە شاخدا، بۆ را و بۆچوون لەسەر تۆکمەکردنی سەرکردایەتیی ناوخۆی کۆمەڵە، کێ بوو ئەو هەموو مەترسییانەی خستبووە ژێر پێ، بۆ بەردەوامی و سەرکەوتنی کۆمەڵە و شۆڕش، لە رۆژانی نەورۆز گەیشتە ناوەندیی کۆمەڵە؟ کە بە هەر بیانوێەک بێت لەلایەن نەوشیروان، خەبات و ماندووبوونی لە کتێبەکەدا سڕاوەتەوە!

هەڵسوکەوتی دواکەتوانەی کەرەسیسە هەڵهاتووی بەشێک لە سەرانی حیزب و شۆڕشی چەکداریی کۆن و نوێ، کە وەک ئاکارێک فرچکیان پێوەگرتوە. هەتا دەمی خەبات و ماندووبوونی بێوچانی پڕمەترسییە، ئەوە هاوڕێ، هەڤاڵ و پێشمەرگە گیان لەسەردەستەکان ناویان هەیە و بە شان وباڵیاندا هەڵدەگوترێ، بەتایبەتی ئەوانەی بێ هەر جۆرە ورتەکردنێک لە رۆژە سەختەکان سەپانی گوێڕایەڵی و بەگوێکەری مامۆستان. بەڵام هەرکە هاتە سەردەمی دەستکەوت، پلە و پایەی سێبەری حەسانەوە و گێڕانەوەی سەروەرییەکان، ئەوە بەبێ یەکودووکردن، کۆتری بەختکرانەوە و بەخشندەیی، تەنیا لەسەر ئەوانە دەنیشێتەوە، کە دەتوانن لە هەموو بارودۆخێک ماستاو بکەن. کە سەری زمان و بنی زمانیان پیاداهەڵدانی مەسئولە و زۆر بەزەحمەت لەبەر خزمی خەزوور، براو ژن برا، کوڕ و برادەرە ملۆزمە گوێڕایەڵەکانییان، جێگای هیچ هاوڕێیەکی دوێنێی رۆژانی تەنگانە بێتەوە. بەتایبەتی ئەوانەی رۆژێک لە رۆژان دەنکە گەنمێکی رەخنەی بەبادادایە و خاوەن هەڵوێست بوونە سەبارەت بە رەتکردنەوەی بۆرە پیاوی و کۆیلەیی هەتا سەر. چونکە ئەو جۆرە کەسانەی هەڵوێستیان هەبووە، لە رۆژە سەخت و دژوارەکان خەباتیان کردووە، خەڵکی نەناسراوی بێ شانوشەوکەت، بێ تەجروبەی چۆنیەتی ماستاوکردن و گەنجی نەشارەزای خۆ نەگونجاندنی هەموو بوارێک نەبوونە. لەم روانگەوە نەوشیروان تەنیا خەبات و ماندووبوونی هاوڕێ نزیکەکانی خۆی بەسەردەکاتەوە و بەرچاوڕونانە،

---

[36] عومەر نۆغەرانی ناسراو بە عومەرۆک، کە بەژیان ماوە و شایەدی ئەوەی لەلایە، کە رێپیشاندەر و کارئاسانکارمان بوو بۆ سەفەری چونی ئەو شاخانە و وەک رێنمایی و دڵسۆزی گوتی، دڵم بە گەنجێکی وەک تۆ ژان دەکات، ئەگەر بۆ من دەیکەی بەم شەوە خۆت توشی هەلاکەت مەکە، مەرگ و نەگەڕانەوەت مسۆگەرە، ئەو رێگایە رێگای هات و نەهاتە، سەرباری سەرما نفوراتەکەی، مەترسی بۆسەی هێزەکانی رژێم زۆرە، دەربازبوون ئەستەمە.

ئاوڕی لە خەبات و قوربانی خەڵکانی تێکۆشەری خەباتی ژێرزەمینی و نهێنیی شارەکانی دیکەی کوردستان نەداوەتەوە. وەک ئەوەی ئەو خەڵکە تێکۆشەرە ماندوونەناسانەی شاری کەرکوک، هەولێر، خانەقین، بەغداد و بادینان، هەر لە ئاسمانەوە بۆ بەردەسەڵاتی قەڵەمڕەوی نەوشیروان باریون و لە کون فەیەکونێک هەڵقولابن!

ئەزموونی خەباتی کۆمەڵە هەرگیز، تەنیا بە خەباتی چەند تێکۆشەرێکی ناوچە و شارێکی دیاریکراوی کوردستان نەخولقاوە! بەڵکو بەری ڕەنجی دەستەجەمعی قوربانیدان و تێکۆشانی دەیان و سەدان رۆڵە و سەربازی گومە، کە دیارە لە قودیلەی بچوک و لە قزگەی تەسک جێگای نابێتەوە و بەهەند هەڵناگیرێ.

هەر مرۆڤێکی بەویژدان و هوشیار لە ئاوڕدانەوەی بەو ئەزموونە پڕ سەروەرییەی کۆمەڵە لە بواری موقاوەمەت و ڕووبەڕووبونەوەی ڕژێمی بەعس، ناتوانێ نکوڵی لەوە بکات، کە هەتا لە سنووری ناو شاری "سلێمانی"یش، ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە، هەر بەتەنیا لەسەردەستی تەنیا چەند هاوڕێیەکی تاکوتەرای برادەری گیانی بەگیانی ئەم و ئەو نەکەوتوتە سەرپێیان و گەشەی نەکردووە. بەڵکو ئەوە وەک زیندانییەکان و شەهیدبوونی پۆل پۆلی مەیدانی خەبات تۆماریان کردووە و لەگەڵخۆیان دەیگێڕنەوە، شایەتحاڵی چالاکی، شارەزایی دەیان سەربازی دیکەی نەناسراویان تۆمارکردوە.

من دڵنیام ئەگەر جەمال تاهیر، شازاد، حەمە چاوشین لەژیان بوونایە، هەرگیز ئەوەیان بۆ قبووڵ نەدەکرا، کە خۆیان شارەزا و "ئارام" نەناسراو و گەنجی کەم تەجروبە بێت. چونکە ئەوانە زۆرتر بەدوای دەستپێشکەرییەکەی "ئارام" کەوتوون، نەوەک بەپێچەوانەوە. نەوشیروان لە گێڕانەوەی ئەو خەرمانە شێواوەی مێژووی کۆمەڵە، لە ریزکردنی ناوی ئەندامەکانی سەرکردایەتیی هەرێمەکان، بەپێچەوانەی لاپەڕەکانی پێشوتر، لێرەدا ناوی شەهید عەبدولڕەزاق" قوت کردووە و سەرەداوێکی ئەو ڕێکخراوانەی لەوێ ڕۆژاندا ئەو بەرێوەی دەبردن، بەدەرناخات کە لە لاپەڕەکانی پێشەوە بەو ناوە تۆماری کردووە!

**بزوتنەوە، دامەزراندن و ڕێکخستنی فراوان..**

(بزووتنەوە ریکخراویکی تازە دامەزرا بو لەو کادرانەی پدک کەلەئیرانەوە گەرابونەوە. لەبەر ئەوەی زۆریان دورخرابونەوە بو خواروی عیراق و، لەژیرچاودیری دەزگا ئەمنییەکاندا بون، نەیان توانی بو ریکخستنی فراوان دروست بکەن. عەلی عەسکەری و عومەر مستەفا، رسول مامەند، تاهیر عەلی والی هات بونە ریزی پیشمەرگایەتییەوە و چەند کەسیکی وەکو سالح یوسفی، عەلی هەژار، کاربو گەلالی لەناو شارەکان دا بو خەباتی ژیر زەمینی لە بەغدا بون.) ل/١٧٥

باسوخواسه بێ سەرچاوەکانی نەوشیروان، هەتا بزووتنەوەشی گرتوتەوە. لەجیاتی خاوەن ماڵ کەوتوتە وەسفکردنیان، بەو ئاراستەیەی خۆی مەبەستی بووە. سەبارەت بەوانیش لەگەڵ ئەو پیاداگوتنەی لاپەڕەکانی پێشوتر، مەسئولەکانی خەڵکی ناسراو و بەتەجرووبە بوونە، ناکۆک کەوتوتەوە. بەلام ئەوەندە هەیە بۆ ئەوان پاساوی (لەبەر ئەوەی زۆریان دوورخرابونەوە بۆ خوارووی عیراق و، لەژێرچاودێری دەزگا ئەمنییەکاندا بون،) هێناوەتەوە، لەوەی کە نەکارینە رێکخستنێکی فراوان دروست بکەن.

ئەوەندەی بەندە پێی ناسیار بێت، بزووتنەوە بە هۆی وەرگرتنی هەموو جۆرە خەڵکێک لە ریزەکانیاندا، بەبێ گوێدانە هەر جۆرە باکگروندێکی ئەو مرۆڤە، تا رادەیەکی باش لە ناوچەکانی هەولێر و کۆیەدا رێکخستنێکی بنکە فراوانیان پێکەوە نابوو. کادرە کاراکانیان لە نموونەی کاردۆ، عەلی هەژار لە هەولێر دادەنیشتن و خەریکی ئاوقاتیکردن بوون. دیارە مەبەستەکانی نەوشیروان لێرەدا، کە بزووتنەوەیش وەک کۆمەڵە لە بواری رێکخستنەوە بچوک دەکاتەوە، ئەجندای کەمکردنەوەی کاردانەوەی کادرە تێکۆشەرەکانی هەر دوو رێکخراوەکەیە؛ بزووتنەوە و کۆمەڵە، لە رووبەڕووبونەوەی بەعس و دامودەزگا سەرکوتکەرەکانیدا.

بیرۆکەی دروستبوونی بزووتنەوە، بۆ رۆژانی دوای ئاشبەتاڵی کورد لە ساڵی ١٩٧٥ دا دەگەڕێتەوە. کۆمەڵێک مەسئول، کادری پێشمەرگەیی و سیاسیی هەردوو رەوتی سەرکردایەتی؛ بارزانی و رەوتی کۆنی "م.س" تێیدا بەشدار بوون. جاڕدانەکەی ماوەتەوە بۆ دوای تەسلیمبوونەوەی هەموویان بە رژێمی بەعس و دواتر لە عیراق بانگی دامەزراندنیان داوە، کە زۆرتر بە هیوای ئەوە بوون، رژێمی بەعس بۆ گفتوگۆ و خۆگونجاندن و وەرگرتنی لچکێکی دەسەلات، ئاوڕیان لێ بداتەوە. من وەلامدانەوەی زیاتر بۆ خودی برادەرەکانی بزووتنەوە دەهێڵمەوە.

**کۆبونەوەکانی سەرانی یەکێتی..**

(کوبونەوەکان کەلە ٣١_٨ دا دەستی پی کردبو لە١٢_٩_١٩٧٧ دا کوتایی هات) ل/١٧٥

نەوشیروان وەک هەر سەرکردەیەکی ئاسایی حیزبەکانی کوردستان، پوختەیەکی ناوەڕۆکی کۆبوونەوەکان، بەتایبەت لە بواری موناقەشەکانی چۆنیەتی ساغبوونەوەی بەرنامەی سیاسی یەکێتی و شۆڕشەکە، شتێک ناڵێ. بەلام سەبارەت بە دانان و دامەزراندنی هەیکەلی سەرکردایەتی و ئەو هەموو دامەزراوە زۆروزەبەندە ناپێویستەی ئەو رۆژە، بە دوورودرێژی قەزاوەتی کردووە. هەر لە میتۆدی شۆڕشێکی ئامادەی خاوەن لەشکری ساز و دامودەزگای گەورەی هاوردە دەچێ! بەجۆرێک سەرانی ئەو شۆڕشە

نوێیە بە چاولێکەری سەرانی شۆڕشی ئەیلول، بەتایبەت لە سالانی پێش ئاشبەتال، هەموو خەون و خەیالیان لە لای فەنتازیای "ناوی زل و دێی وێران" بووە، کە ئەوەش یەکێکە لە خالە جەوهەرییەکانی جیاوازی بیرکردنەوە و میتۆدی کاری "ئارام". "ئارام" هەرگیز لەگەل ئەوەدا نەبووە کە دامودەزگای گەورەی بێناوک، لەو بارودۆخە سەرەتاییەی خەباتی چەکداری دابمەزرێت، بەلکو بەرنامەی کاری کۆمەلە لەو رۆژەدا، کە بزاڤی چەکداری "لە پڕێکەوە نابێت بە کوڕێک" خوازیاری گەشەکردنێکی سروشتی و ئاسایی، بەپێی ئەو زەخیرە و ئیمکانیاتەی بەردەست بووە. بەلام دیارە "ی.ن.ک" و پارتی لەبەرانبەر یەکتری لە قۆشمەدا بوون، زۆر بەپەلە و بەبێ گوێدانە پرینسیپی پشتبەستن بە کۆمەلانی خەلکەوە، بەناچاری دەستیان بۆ هەموو کون و کەلەبەرێک بردووە، بۆ دەرەقەتهاتنی ئەو هەموو ئەرکەی رووبوڕوویان ببوەوە، لەبارەی قورسیی خەباتی چەکداری و بەرێوەبردنەکەی. کەچی یەکێک لە مۆرکە بنەڕەتییەکانی فەلسەفەی کارکردنی "ئارام" ئەوە بوو، خەباتی چەکداری نوێ و خەباتی شۆڕشگێرانە هەمیشە لە باوەشی خەلک نەشونما دەکات، بەتایبەت بۆ هاتنە مەیدانی وزە و خەلکی نوێی خاوەن باوەڕ. نەوەک وەک نەوشیروان چەقی لەسەر ئەوە بەستبێ کە بەشێوەیەکی دەستکرد، مەسئولیەتی تاپۆکراوی بەردەستی دەستەیەک مەسئولی ناسراو، شارەزا و خاوەن ئەزموونی دووروودرێژی بەرێوەبردن هەبێت لە کاروانی خاوەن ئاشبەتال لەدوای ئاشبەتال و نوشست بەدەم نوشستەوە بن.

بە کورتی "ئارام" لەسەر مەشقی بیری ئەوەدا بوو، کە ستروکتورێکی نوێی رێکخراوەیی و خەباتی پێشمەرگایەتی دابهێنێ. هەر بەو نیازەیش کۆمەلەی تاودابوو، لە ناردنە شاخی مەفرەزە چەکدارییە سەرەتاییەکانی هوشیارکردنەوە و بانگاشە و خۆئامادەکردن بۆ بزاڤی چەکداریی نوێ، بە ئامانجی هەنگاونان بەرەو لوتکەی موقاوەمەت و سەرلەنوێ بنیادنانەوەی گروندی یەکگرتوانەی کاروانی خەبات و زیندووکردنەوەی یەکگرتویی ریزەکانی کوردایەتی و سڕینەوەی ئاسەواری زاراوەی شەڕی ناوەکی نگریس و بەلاوەنانی زاراوەی "دوژمن" بە قەدوبالای هەر لایەنێکی کوڕی مەیدانی خەباتدا.

باوەڕی "ئارام" لە بواری سیاسی و رێکخراوەییدا، لە بیروبۆچوونی ناو خەلکەوە سەرچاوەی گرتبوو، کە ئەویش هەر بۆڕبۆڕینی سیاسی و مونافەسەی حیزبیی دوور لە بەکارهێنانی چەک، لەنێوان حیزبە چەکبەدەستەکانی شاخ، تاکە زامنی سەرکەوتنی گەورەیە. چونکە بزاڤی خەباتی ئەو رۆژە لە هەموو شتێک زیاتر پێویستی بە راستکردنەوەی لاسەنگی تەرازوی هێز هەبوو، بۆ بەرژەوەندی نەتەوەکەمان. راستە ئاشبەتال کوستێکی گەورە بوو، بەلام سارێژکردنی بەیەکترکوشتن و سڕینەوەی یەکدی

نەبووە، بگرە تەنیا بانگی شۆڕشی نوێ و مسداقیەتی خۆی لە بانگکردنی خەباتی دەستەجەمعی و پێکەوەگونجانی هەموو لایەنەکانی خەڵکی کورد دەدیتەوە.

نەوشیروان لە گەرمەی گێرانەوەی باسوخواسی کۆبوونەوەکانی سەرکردایەتیی "یەکێتی"دا، راشکاوانە کەوتوتە وێنەگرتنی بوێرانەی فاولێکی دیکەی گەمەی سەرانی حیزبی کوردی، کە وەک سوخەتێکی فرچک پێگرتووی ئەو قوتابخانەیە، خوێنەر لە سۆراغی کەشوهەوای ئەو کۆبوونەوانە دادەبڕێ و بازدەداتە ناو جیهانی گاڵتەکردنی سەرکردەکان بە رۆڵەیەکی خوارەوەی ریزەکانی پێشمەرگەی دەوروبەریان.

(ئەو چەند روژەی ئەم لیکولینەوەیەمان ئەکرد لای کەس باسمان نەئەکرد لەبەر ئەوە بەسەلامەتی تەواو ئەبو. حەسەن خۆشناو قسەی لەلا رانەئەوەستا. روژیکیان کاک عەلی بە میوانیمان هات بو. حەسەن سەرگوزشتەکەی بو گیرایەوە. کاک عەلیش حەزی بە سوعبەت و گالتە و فشقیات ئەکرد. عەبدوللای (بەبێ ئەوەی ناوی تەواوی بنووسی) بانگ کرد و، پی ی وت..( ئەوانەی کومەلە پیت رائەبوین و بوگالتە تویان کردوە بە لیپسراوی خویان). عەبدوللا جنیویکی سراوەندە هەمو ئەوانەی پی ی رائەبوین و کەوتە/ تحدی/ کەس ناتوانی بەو رابویری. ل/١٧٦

(کاک عەلی ئەمەی بو خوشکردنی بەزمەکە کرد بەلام بە پیچەوانە شکایەوە، عەبدوللا وازی هیناو، ئیمەش کارەکەمان لی تیکچو. پاش چەند حەفتەیەک عەبدوللا بەیەکجار بیزار بو لە پیشمەرگایەتی. گەرایەوە سوریا و لەویوە چو بو ئەورویا.) ل/١٧٧

بەشێکی زۆری سەرانی حیزبی کوردی، کە خۆیان بە میراتگری دۆزی کورد دەخوێننەوە، هەمیشە بەخۆیان رافەرمووە، رۆڵەکانی خوارەوەی بەردەستی خۆیان، بە زەخیرە و مادەی گەمە، هەتا گاڵتەوگەپ بخوێننەوە و هەرکاتێک زەوق و سەلیقەیان حەزی بە سوعبەت و گاڵتەکردنەوە هەبووبێت، ئەوە بەبێ ئەوەی سنوور بۆ پێڕابواردنی خۆیان بناسن و گوێ بە هەستبریندارکردنی ئەو مرۆڤە بدەن، لە هەر جۆرە گاڵتەوگەپێکی گەمە پێکردنێکی یەکلایەنە نەسڵەمینەتەوە! بە لایشیانەوە گرنگ نەبووە ئەو کەسە بریندار دەکەن و ئەو فشارە بە هەموو کەسێک قبووڵ ناکرێ. ئەومرۆڤە واز لە پێشمەرگایەتی و خەباتکردن دەهێنێ! ئەو نموونەیەی نەوشیروان دەیگێڕتەوە، بەراستی نموونەی یەک سەرجەلەی بێکۆتایی ئەو بوارەیە، دەیان پێشمەرگەی قارەمان و کادری دڵسۆز کە هەموو خۆزگە و ئاواتێکیان خەبات و پێشمەرگایەتی بووە، لە پاشڵی گاڵتەوگەپی مەسئولەکانەوە، دڵیان رەنجاوە و "قوشقی" بوونە و تەنیا بە زیان بۆ نەتەوەکەمان گەڕاوەتەوە.

**خەون و خۆزگەی موفاوەزات..**

بێگومان لە گۆڕەپانی خەباتی سیاسیدا، گفتوگۆکردن و پێکەوە دانیشتنی نەیارەکان بۆ لەیەکترگەیشتن و ڕێکەوتن لەسەر بەرنامەیەکی هاوبەش، هەروەها موفاوەزات لەدەمی هەرجۆرە خەباتێک و ڕاپەڕینی چەکداری لەنێوان هێزەکانی بەرەی نەتەوە و دوژمن، یەکێکە لە تاکتیکەکان بۆ تێرکردنی ستراتیژی خەبات و موقاوەمەتی ڕەوایی تێکۆشانی نەتەوەکی ستەملێکراو. بەڵام دیارە ئەو گفتوگۆ و موفاوەزاتە، خۆی لە خۆیدا، هونەرێکی زۆر سادە و ئاسان نییە. لێزانین و شارەزایی تەرازوی هێز، ڕەوتی چاک و خراپی بەرێوەچونی و نیەت و ئارەزوو، دەوری بنەرەتی دەبینن لە سەرکەوتن، یان فەشەلی ئەو گفتوگۆ و موفاوەزاتە.

لە کاروانی خەباتی نەپساوەی کورد بەگشتی و لە شۆڕش و خەباتی چەکداری بە تایبەتی، موفاوەزات و وەک دەڵێن؛ "مفە حەیاتەکە"، هەر لە یەکەم هەنگاوەوە، سەرتاپای خەون و خەیاڵی بەشێکی زۆری سەرانی حیزبی کوردی و کادر و پێشمەرگەی گرتووە. هەمیشە خەونیان پێوە دیتوە و بۆ هەر جۆرە "مفەیەک" لەگەڵ دوژمندا، هەلەکەسەمایان لەبەردا کردووە و بۆی شاگەشکە بوون. چەندان بیانویان بەدوای یەکترییەوە جلیت کردووە، چونکە لە سێبەری هەموو موفاوەزاتێکی شۆڕش و حیزبەکان لەگەڵ ڕژێمدا، مەسئول و دەسەڵاتداران بە شێوەیەکی سەرەکی لە سێبەری حەسانەوەنەتەوە و بە بیانوی سەرلەنوی خۆ تۆکمەکردنەوە، بەشێکی زۆری ئەو مەسئولە سەربازی و سیاسییانەی کورد سوودمەندی سەرەکی بوونە. ئەوجا ئەوەی زۆرتر لەو دیرۆکەدا جێی سەرنجە و هەڵوەستەکردن هەڵدەگرێ، خاڵی خەوش لە نموونەگەلێکی زۆری چیراوکەی موفاوەزەتەکاندا، لایەنی کوردی لەدەمی ئینشقاق، دژە سەنگەری ناوەکی و ناتەبایی ناو ماڵی کوردی، پەنای بۆ گەمەی موفاوەزات لەگەڵ دوژمن بردوە. بەو خەیاڵەی لەبەرانبەر نەیاری ناوەکی و لە سێبەری تەڵخی "دوژمن"ی دوێنێ، ببن بە شێرەکڵۆی مەیدان و تەونی کوردایەتییان ئاڵۆز کردووە. ئەگەر نا، یەکەم گرەوی بردنەوە و مەرجی سەرەکیی ڕەوابوونی موفاوەزات، دیارە لەپێشەوە یەکڕیزی و یەکگرتوویی هێزەکانی بەرەی خەباتی نەتەوە و وڵاتە، وەک پشتیوانی بەر مەیدانی ئەو موفاوەزاتە خۆی دەبینێتەوە.

(هەر لەو ماوەیەدا عیراق بەهۆی شیخ محەمەدی لولانەوە وەلامی بو سەرکردایەتی ینک نارد بو گفتوگو. ....سەرکردایەتی عیراق لە کاغەزیکی سپی بی سەرناو و بی ئیمزا بە مەرەکەبیکی سەوز بەخەتی سەددام حسین .... نارد بو) ل/١٨٠

لێرەدا نەوشیروان بەدەستپێکی مەبەستەکانی خۆی لە پلارگرتنە لایەنێکی ناو یەکێتی، روناکی زۆرتری خستوتە سەر و دەڵێ:

(سەرکردایەتی بزووتنەوە هەر لەسەرەتاوە کە مات بونە شاخ ، بەهیوا بون ئەوە ببێتە گوشاری بو سەر بەعس و ناچار بی بو گفتوگو و ریک کەوتن. ئەمەیان لە بەیانیکی دریژا بە عەرەبی لە لوبنان و دەرەوەی ولات راگەیاند بو. بەرپرسەکانی تری بزووتنەوە لە کوبونەوەکانی ک س/ ینک دا بیروبوچونی خویان دەربارەی گفتوگو لەگەل سەرکردایەتی عیراقی نەدەشاردەوە. راستیەکەی سەرکردایەتی یەکیتی یش نەی ئەتوانی بە ئاسانی داوایەکی عیراقی بو دەسپیکردنی گفتوگو بو چارەسەرکردنی بە ئاشتی گیروگرفتی کورد لە عیراق دا رەت بکاتەوە.) ل/١٨٠

نەوشیروان بەبێ دەربڕینی گومانێک لەو کاغەزە سپییەی بە سەوز نووسراوە، بە نامەی "سەددام حسین"ی دەخوێنێتەوە. من لەوە تێناگەم، ئەگەر سەددام نامەی لەم جۆرەی نووسیبێ، چ پێویستی بەوە هەبووە، ناوی خۆی نەنووسیبێ، کە هەر لە نووشتەی شێخێک دەکات، وەک دوعای چاکبوونەوەی بۆ نەخۆشێک کردبێ! دواتر دەکەوێتە بیانوهێنانەوە بۆ رازیبوون بە وەڵامدانەوەی ئەو کاغەزە و دەڵێ:

(رەتکردنەوەی باسیکی لەو بابەتە بیانوی ئەدا بە کەسانیکی تر، سەرکردایەتی ینک تاوانبار بکەن بەوەی کە شەر بو سوریا ئەکەن نەک بوکورد.) ل/١٨٠

هێنانە پێشەوەی بیانوی لەو جۆرە و باسکردنی دوای دەیان ساڵی بەسەرچوو، خۆی لە خۆیدا نیشانەی ئەو دووکەڵەن، کە بەری ئاسمانی شۆڕشی نوێی گرتبوو، کە نەوشیروان هەر بە تیلکلێدان هیمای بۆ دەکات و دواییش هەوڵی رەواندنەوەی دەدات. بەڵگەشمان ئەوەیە، بۆ دەبێ پاش ئەو دەیان ساڵە، نەیەوێ ناوی ئەو زاتانە ئاشکرا بکات کە گوایە هەواداری موفاوەزات بوون لەگەڵ رژێم و تەنیا بە "*کەسانێکی تر*" ناوزەدیان دەکات..!

لە خوێندنەوەیەکی هێمنانەی ئەو دەستەواژانەی نەوشیروان لەو کتێبەدا سەبارەت بە موفاوەزەتەکەیان لەگەڵ رژێمی بەعس نووسیویەتی، چەند دەستەواژەیەکی وەک "گیروگرفتی کورد/ بەهیوابوون ئەوە ببیتە گوشاری بو سەر بەعس" مایەی سەرنجن. هەموو ئەو دۆزە دژوارەی رژێمی بەعس بەسەر نەتەوەی کوردی هێنابوو، لە لای نەوشیروان بۆ چوارچێوەی تەسک و تروسکی "گیروگرفتی کورد" .خەست بووەتەوە. وەک ئەوەی رژێمی بەعس هیچ پێشینەیەکی پڕ کوێرەوەری لەگەڵ ئەو دۆزە نەبووبێت و تازە کەوتبێتە سەرمەشقی چارەسەرکردنی لەناو بازنەی "گیروگرفت"ێکی راگوزاری ئەو رژێمە لە عیراقدا. ئیتر کە سەرکردەیەکی شۆڕشی نوێ، ئەو جۆرە پێناسە پڕ نوقسانییەی بۆ دۆزی رەوای نەتەوەکەی هەبووبێت و بەدوای دەیان ساڵ، بەوپەڕی جورئەتەوە دەری بخات، بۆ نابێ

خەڵکانی عارەب، فارس و تورک، دۆزی کورد و کوردستان، بە گیروگرفتێکی نۆرماڵی ناو وڵاتەکانی خۆیانی بزانن!

پاشان نەوشیروان دیسانەوە ئەو هەموو بەشانوباڵدا گوتنەی لاپەڕەکانی پێشوتری خۆی لەبیر چوتەوە، سەبارەت بە دروستبوونی بزووتنەوە و ناسراویی سەرکردەکانی. کەچی لەو وشانەی سەرەوە هەم بێهودەیی و بێمایەبوونی مەبەستەکانی خۆی لەم بارەیەوە، هەمیش راستگۆیانە پەردە لەسەر کەشوهەوای ئەو رێکخستنە هەڵدەداتەوە و مەبەستی راستەقینەیان دەردەخات.

بەڵام دیارە گەمەی بەعس بە کارتی حیزبی کوردی و بەکارهێنانی هەندێ لەو "سەرکردە ناسراوانە" بۆ بەڕێوەبردنی سیاسەتی چەواشەکردن، زۆر نهێنی گەورەی لەگەڵ خۆی زیندە بەچاڵ کرد و هەندێ لەو کەسانەشی بۆ کورد بە پاڵەوان تۆمار کرد.

لە درێژەی ئەو باسەدا، نەوشیروان بەدوای ساڵانێکی زۆری ئەو بەسەرهاتە، زۆر بە شێنەیی و خشکەیی، بەزمانێکی پلارگرتن، لە وەڵامی کاغەزەی عیراقدا، ئاوا باسی ئەو خواستانە دەکات:

(خواستەکانی کورد کەم و سادە و رەوان بون. زمانی نووسین و دەربرینەکانیشی لە مەسەلەی عەرەبی و فەلەستین دا، لە هی بەعسییەکان دور نەبو، بگرە لەوانیشی تی پەراندبو.) ل/١٨٢

درکاندنی ئەو راستییەی وەک نەخشی سەربەرد بە تەوێڵی سیاسەتی هەندێک لە سەرانی حیزبی کوردییەوەیە، لەلایەن "نەوشیروان"ـەوە، هەناسەدانێکی دڵخۆشکەرانەیە و مایەی دەستخۆشی لێکردنە، کە خۆیشی لە دارشتنی ئەو جۆرە رێبازە پشکی خۆی لەو مەسئولیەتە هەیە. سەرانی قوتابخانەی حیزبی کوردی، سەرەتای خامۆشییەکانی سیاسەتەکەیان لەوەوە لەنگەری گرتوە، کە هەر لە نووکەوە، پێش ئەوەی لە هەر موفاوەزاتێک بیریان لە داخوازییەکانی کورد کردبێتەوە، جارێ زوو لە خەمی ئەوە دابوون، عیراقیبوونی خۆیان مەلیکانە دەربخەن و بەتەنگ دەرخستنی سەروەرییەکانی عەرەبان ٬بەگشتی و فەلەستینییەکانەوە بوون بەتایبەتی. هەروەک چۆن ئەو ئیسلامییە کوردانەی بەدرێژایی مێژووی پڕ کوێرەوەریی رابردوومان، بەپێچەوانەی خەڵکانی عاقلی عارەب، تورک و فارسە ئیسلامەکان، کە هەمیشە لە ناوەندی ئایین و خواپەرستیدا، لە پێشەوە، خواستە نەتەوەییەکانی خۆیان کردوتە پێشقاولی هەنگاونان و بە رۆژی ئاشکرا ئەو ئایینەیان کردوتە سوپەر و فلتەری گەڵاڵەبوونی پرۆسەی ساغبوونەوە و گەشەکردنی نەتەوەکەی خۆیان و ئایین و خودایش بەسەرکەوتن پاداشتی داونەتەوە. کەچی موسلمانە کوردەکان هەتا هەنووکەیش یەکلایەنە، هەموو خۆزگە و خواستێکی نەتەوەی خۆیان، بەبیانووی ئایین و خوداپەرستی، خستوتە خزمەت کەواسووری بەر

خواستی ئیسلامی و داگیرکەرانی عارەب، تورک و فارسان، کە بەدڵنیاییی خودایش لێی بێبەرییە، چونکە لە پەراوێزی ئایینەوە، نەتەوەکەی خۆیان کردوتە پێخۆر و قوربانیی نەتەوەی عارەب، تورک و فارس.

هەروەها بەشێکی زۆری کۆمۆنیستە سەرچیخچوەکانی کورد، لە سیبەری مۆنۆپۆلی بیرکردنەوەیان لەلایەن فەلسەفەی سەقەتی حیزبە بەناو کۆمۆنیستەکانی وڵات و پەنادیواری رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان، ئەوەندەی بۆ ئەوئەجندای سیاسییەی رێنماییان کردوە و بۆیان مەیسەر بووە، دۆزی نەتەوەی جیاوازی کوردی خۆیان، کردوتە بەرایگێڕی پان عارەبیزم و تورکچیایەتی، پان ئێرانیزمی کۆن و نوێ و لەو سەرەوەیش دەستبەتاڵ و مایەپووچ دەرهاتوون. بەرۆژی رووناک نەتەوەکەی خۆیان کردوتە پەرژینی پاراستنی سەروەریی عیراق، تورکیا، ئێران و سوریا، کە رژێمەکانیان بە ئاگر و ئاسن هەوڵی تواندنەوەی نەتەوەکەیانی داوە، لە ختوخۆڕایی و یەکلایەنە بیرۆکەی نەزۆک و بێ بنجوبنەوانی "برایەتیی کورد و عارەب و تورک و فارس"یان بۆ کورد بە میرات کردوە، بۆ قازانج و بەرژەوەندی نەتەوەکانی سەردەست.

ئەوەتە بەشێکی سەرانی حیزب و شۆڕشی کوردیش، بە بیانووی خۆگونجاندن و هەنگاونان بەپێی زەمەن، بە هەمان هەناسەسوارییەوە تەنگەتاون، هەتا لە بچووکترین چوارچێوەدا، بۆ رازیکردن و خۆشکردنی دڵی سەددام، هەستی خۆیان دەربڕن، لە ناساندن و وردکردنەوەی خواستە رەگەزپەرستانەکەی نەتەوەی عارەب لە عیراقدا، سەروەرییەکانی خاکی عارەبی و کێشەی رەوای فەلەستینی! کەچی رۆژێ نەمان بیستووە و نەخوێندراوەتەوە، کە عارەب، یان فەلەستینییەکان لە گفتوگۆیەکانیان لەگەڵ ئیسرائیلدا، لەنێو خۆیاندا، بۆ یەک جاریش، باس لە رەوابوونی خواست و دۆزی کورد بکەن!

هەر نەتەوەیەک بە گشتی و رێکخراوە سیاسی و سەرکردایەتییەکانیان بەتایبەتی، ئەگەر نکارن سەبارەت بە رەوابوونی خواستە نەتەوەییەکانی نەتەوەی خۆیان لە بەرانبەر رەقیبەکەیان، بە جورئەت و لەخۆرادیتنەوە، بەباوەڕ بن، دەبێ بەرانبەر دۆزی نەتەوەی سەردەست و کێشە ئاڵۆزکاوەکانی وەک فەلەستینییەکان چییان بۆ بکرێت..!

دەیان ساڵە، خەڵکی کورد، بەناوی سیاسەت و بیروباوەڕ، یەکێتی خاک و پاراستنی سنووری ئاسایشی نەتەوەی عارەب، تورک، فارسەوە، لەلایەن دامودەزگای ئەو رژێمە داگیرکەرانەوە، رۆژانە سووکایەتی پێ کراوە و دەکرێ و مامەڵەی مرۆڤی کۆیلە و پلە دووی لەگەڵدا دەکرێ، کەچی هەردەبێ بەشێکی زۆری قوتابخانەی حیزبی کوردی و سەرانی، گرەو لەسەر رازیکردنی ئەو رژێمانەوە بکەن.

**دیسانەوە قیادەی موەقەتە و شەڕی براکان..**

لە ئاست شەڕی براکاندا، نووسەر بەبێ پێچوپەنا نووکی قەڵەمەکەی بەبێ سرەوتن کردوتە سەرە ڕمی مەبەستەکانی لە مەیدانی بەردەوامبوونی ئەو نەزیفەی جەستەی بریندارى کوردایەتییەوە. بۆ ئەو پاشەگەردانییە، هەروەک چۆن خۆی لە زۆر شوێنی ئەم کتێبەدا، کەوتوتە لەقاودانی کاری قێزەوەنی پێشمەرگەکانی قیادەی موەقەتەی پارتی لە پاکتاوکردنی پێشمەرگەی مەفرەزە سەرەتاییەکانی یەکێتی لەناوچەکانی بادینان و سەر سنوورەکان. ئەویش بە هەمان میتۆدی بیرکردنەوەی سەرانی قیادەی موەقەتە، لە بانگاشەی جێبەجێکردنی دیوی دووەمی ئەو سیاسەتە چەوتە لەسەر دەستی پێشمەرگەکانی یەکێتی، لە ناوچەکانی سۆران بۆ پاکتاوکردنی پێشمەرگەکانی ئەوان، درێغی نەکردوە.

(هەر چەندە دەرکردنی هێزەکانی قم لە ناوچەکانی سلیمانی لە بەرنامەی کاری ئیمەدا بوە) ل/١٩٥

(کویخاکانی مەنگور نەیان ئەویست پشێوی بکەویتە ناوچەکەوە، ویستیان ببن بە ناوبژیکەر لە بەینی ئیمە و چەکدارەکانی قم دا. ئیمە قوبولمان نەکرد.) ل/١٩٦

هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی چیراوکەی خەوشەکانی حیزبەکانی کوردی لە شاخدا و سیاسەتی بێهوودەی دووبەرەکیی سەرانی خەباتی چەکداری، بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگریان بەرەو رووی ئاڵۆزی هەڵگیرساندنی شۆڕشی چەکداری پێکەوە ناوە. بەشێکی زۆری هەردوو لای سەرەکی ئەو مەیدانە، بەرانبەر بەفیڕۆدانی خوێن و قوربانیی شەڕی برایەکان، مەسئولیەتی مێژوییان پێ براوە. جێبەجێبوونی پلانی دوژمنە سەرسەختەکانیان بەخۆرایی ئاسان کردووە. نەوشیروان گێڕانەوەی ئەو کۆپیکردنەی رەفتاری ناشیرینی سەرانی رەقیبە سیاسییەکەی بەرانبەر بە پێشمەرگەکانیان، بەبەردەوامبوونی شەڕەکە فۆرمۆلە دەکات، راستگۆیانە لەگەڵ هەست و نەستی خۆی لەو رۆژە و ئێستا تێکەڵیان دەکات.

ئەوە نیشانەیەکی زەقی لەیەکچوون و هەڵگرتنەوەی کردەوە خراپەکانی نێوان لایەنە ناکۆکەکانی دەواری کوردایەتیە، کە هەمیشە لە شتە ناهەموارەکان و پیادەکردنی تەفروتوناکردنی یەکتر، بێپەروا لاسایی یەکتریان کردوتەوە. ئەوەی دوێنێ بۆ نەیارەکەیان مایەی تاوان و کاریکردەی قزەوەن بوو، ئەمرۆ خۆیان بە هەمان هەناسە دووپاتی دەکەنەوە، کە دەبوو بە پێچەوانە بوایە، هەر لە کارە باشەکاندا، هەنگاوی بەرەو پێشەوەبردنی بزاڤی کوردایەتی یەکتریان بقۆزتایەوە و تەواوکەری ئەو پرۆسەیە بوونایە بۆ خزمەتگەیاندن بە نەتەوەکەمان.

سەیرەکەیش لێرەدا، وەک نەوشیروان زۆر راشکاوانە دانی پێدا ناوە، لایەنە شەڕکەرەکان، درێژەیان بە سیاسەتی لاساری شەڕی کوردکوژی یەکتر داوە، بەبێ ئەوەی

هیچ ریزێک لە هەست و نەستی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان رابگرن و گوێ بە نارەزایی کوێخوا و گەدا، نەدار و زەنگین، منداڵ و پیر، ژن و پیاو و گەنج و پیری کورد بدەن.

بێگومان هەتا ئەو رۆژەی سەرانی حیزبی کورد، بە گیان و هەناسەی تۆڵەسەندنەوە لە یەکتری، کە لە مەیداندا زۆرتر تۆڵەسەندنەوە لە خەڵکی کوردە، لەسەر مایەی قوربانییەکان، خەمل لە حەزەکانیان بدەن، رق و قینەی پەنگخواردوی کۆنینە، پاشقول لەیەکتری گرتن، بخەنە شوێنی سنگ فراوانی، لە یەکتر بوردن و قبولکردنی یەکتری لەپێناوی سارێژبونی برینەکانی رابردووو، هەرگیز لە ئاستی هەڵهێنانی ئاسۆیەکی نوێی گەشدا نابن.

**گەڕانەوە سەرئەندامانی کۆمەڵە..**

نەوشیروان لە گێڕانەوەی گاڵتە و شۆخییەکانی لەمەڕ هەڵسوکەوتی رۆژە سەخت و دژوارەکانی ژیانی پێشمەرگایەتی هاوڕێیە دێرینەکانی کۆمەڵە بەردەوامە، کە لێرەولەوێ ناوییان دەهێنێ:

(سەیرم کرد هاوری جەبارو ولاخەکەی ئەو هوی دواکەوتن و تیکدانی ریزی کاروانەکەن. منیش بە تورەییەوە پیم وت/ مردوت مری ئەوە چیتە؟ بوچی لەناو ئەم کاروانە دریژەدا هەر ولاخەکەی تو ئەکەوی؟/ یەکسەر وتی،/ چوزانم، قابیلە من پاشقولی لی بکرم. خوی ئەکەوی!/) ل/١٩٧

(ماموستا عزیز، پیاویک بو بەخو وە بو، دەنگی گەورە و سمیلی زل، پوزەوانەی لی هەلکیشا بو، خەریکی بارکردنی ولاخەکەی خویان بو، نەیزانی بو چونی بار بکا. لەکاتی توندکردنی گوریسەکەدا پی ی لەورگی نیسترەکە گیر کرد بو. نیسترەکە هەلی تیزان بو.... ماموستا عەزیز نمونەیەک بو لەو پیشمەرگانە شارییانەی بەتەواوی بیگانە بون بەژیانی لادی و بەژیانی پیشمەرگایەتی.) ل/١٩٨

هەر لەو لاپەڕانەدا، هاتوتە سەر هەڵوێستێکی بێزاری یەکێکی وەک ملازم عومەر، بەم رەنگەی دەگێڕتەوە:

(لەناو غەل/یک دا لەسەر بەفرەکە مولازم عومەر چوارمەشقی دانیشت بو شتی ئەنوسی. بەلامەوە سەیر بو،...... لیم پرسی.. ئەوە چی ئەکەی؟ وتی.. نامە ئەنووسم. وتم.. بۆ کی؟ وتی.. بو تو! وتم.. من ئەوە خوم لەبەر دەمتا راوەستاوم چ پیویست ئەکا نامەم بو بنوسی؟ وتی.. ئیستقالە ئەنووسم لە پیشمەرگایەتی!) ل/٢٠٠

خەباتی چەکداریی شاخ و پێشمەرگایەتی بۆ رۆڵە گیان لەسەردەستەکانی کورد بەگشتی و بەتایبەتی خەڵکی شار، خۆی لە خۆیدا ئەزموونێکی پڕ تاڵوتفتی بوو. ئەو رۆژانەی نەوشیروان باسیان دەکات، رۆژانێکی تژی لە دەردەسەری جۆراوجۆر بوو. ئەوە تەنیا بەوان ئەندام و کادرە ماندوونەناسەکانی ئەو هێزە سەرەتاییانەی خەباتی چەکداریی نوێ

و کومەڵە بە هەزارویەک دەردیسەر لە دەرەقەتی هاتبوون. هەر ئەوان بوون، خۆڕاگرانە بەرگەی ناخۆشییە لە ژمارنەهاتووەکانیان گرتبوو و سەرفرازانە شانیان دابووە بەر سەختییەکانی ژیانی رۆژانە. بەڵام دیارە نەشارەزاییان لە بارکردنی وڵاغ و باربەستن بە هیچ جۆرێک نەگەیشتوتە بالای دڵسۆزی و کۆڵنەدانیان لە خەباتی شاخ و پێشمەرگایەتیدا. هەرگیز نەبوەتە بڕوانامەی سەرکەتوویی خەڵکی شار لە کاروانی ئەو جۆرە خەباتەدا.

لێرەدا ئەوەی تەنیا بۆ یەک رۆژ لەگەڵ خودی نەوشیروان لەوێ رۆژاندا پێشمەرگایەتی کردبێ، بەوە ناسیارە، کە خۆیشی لە زۆر هەڵسوکەوتی قلسبوونی ماندووبوونی رێگا و هەڵگەڕان بە هەورازی چەتون، تینوێتی و نەبوونی ئاو و مەترسییەکانی رووبەڕووبوونەوەی هەموو تاوێکی شەڕی دەستەویەخەی نابەرانبەر، لە چ دۆخێکی دەروونی پڕ تورەو و توندی و ناهەمواری نا پێویست بووە. کە بەرای من بۆ زۆربەی ئەو خەڵکە سەیر نەبووە، مەگەر تەنیا تاکوتەرای کادر و پێشمەرگەی لێ دەرچوبێت. بەندە زۆر پێشمەرگەی لادێییشم دیتوە، لە هەڵسوکەتی لەگەڵ وڵاخ و بارکردنی ئەو پرۆفیشنالە نەبووە کە نەوشیروان مەبەستییەتی. دەکرا نەوشیروان بە گیانێکی رێپیشاندەرانە، ئامۆژگاری ئەو هاورێ شارییانە بکات و چۆنیەتی راپەڕاندنی ئەرکەکانیان بۆ روون بکاتەوە، کە دیارە لەوێ رۆژاندا، ئەرکی پێشمەرگە هەر تفەنگ لەشانکردن، چالاکی پێشمەرگانە و رۆیشتنی شەوانە نەبووە. بەڵکو ئەو ئەرکانەیشی لەگەڵ بووە، کە ئەو بە تەنزەوە باسی کردون.

**گرتنی کادری دیموکرات و تەسلیمکردنەوەیان..**

یەکێک لە خامۆشییە هەرە زەق و دزێوەکانی جەستەی کاروانی خەباتی چەکداری و مێژووی نەگبەتییەکانی خەڵکی کورد، بە پێچەوانەی خواست و رەوایی دۆزی نەتەوەیی بووە و بە شێوەیەکی بەرچاو روومەتی خەباتی کوردایەتی پێ ناشیرین کراوە. لە هەمێزی ئەو خەباتە چەکدارییەی شاخەکاندا و لە بەرگی پێشمەرگەدا، بگرە هەندێ جاران لە سێبەری ئاراستەی تاکتیکی سیاسی سەقەتدا، رۆڵەکانی کورد بەوپەڕی شەرمەزارییەوە، کەوتوونەتە تیرۆرکردنی پێشمەرگە و کادری حیزب و لایەنی سیاسیی کورد لە پارچەکانی دیکەی کوردستاندا، کە تەنیا بە قازانجی دەسیسە و پلانی گڵاوی داگیرکەرانی کوردستان و خۆشکردنی دڵی دوژمنانی کوردایەتی بووە. لەو کاتەیدا داگیرکەرانی کوردستان بەرۆژی ئاشکرا و ئەوەندەی بۆیان کرابێت و بۆ هێزەکانیان لوابێت، لە هاوکاریکردنی هێزی یەکتری رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستان، لە راوەدوونانی پێشمەرگە نەسلەمینیتەوە. بۆدروێنەکردنی گیانی شۆڕشگیرانی کورد لە هەر پارچەیەک بووبێتن. ئەو

سیاسەتمەدارانەی هەتا ئیستاکە یادەوەرییەکانیان نووسیوەتەوە، کەموزۆر بۆ خاتری خاتران، ئەو لایەنە پڕ کوێرەوەرییەیان فرامۆش کردووە، بێمنەتانە بازیان بەسەرداوە. بەڵام نەوشیروان بەجورئەتانە، راگوزارانە، تەنیا بە نموونەیەک، ئاوڕی لەو دیاردە دزێوە داوەتەوە و دەڵێ:

(سالح خوی و فەقی قادری کوری پیشمەرگە بون. قادر کادری بزووتنەوە بو لەناوچەی قەلادزە. بە فیل دو کادری دیموکراتی گرت بو و، تەسلیمی ساواکی کردبون.) ل/٢٠٢

نەوشیروان لەسەروبەندی گلەییکردن لە "حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئێران"دا، لەسەر ئەوەی گوایە دیموکرات هاوشان لەگەڵ "قیادەی موەقەتە"، کەوتوتە ناوزڕاندنی یەکێتی لە ناوچەکەدا. ئەو بەسەرهاتەی گێراوەتەوە، بەبێ ئەوەی هیچ کۆمێنتارێک لەسەر چارەنووسی ئەو تۆمەتبارانە بدات و لە ئەنجامی کارەکەیان خەبەرێک بگێرتەوە! بێگومان ئەو تاکە روداوە ئەوەمان دەخەنە بەرچاو، کە بەردەوام خەڵکانی نۆکەر و خائین لە بەرگی پێشمەرگەی ئەم و ئەودا، لە هەر جۆرە کارێکی قێزەوەنی وەک ئەمە نەگەڕاونەتەوە. ئەزموونی چەکداری کوردان، دەیان وێنەی مەرگاساتی لەم جۆرەی بەدەمەوە بووە و زۆربەی لایەنەکانی سەر ئەو گۆڕەپانە لێی بەرپرسیارن، چونکە لەپێشەوە خەباتی کوردایەتی هیچ پەچەکردار و هێڵی سووری دژ بەم کارانە دیاری نەکردوە.

نەوشیروان لەنێوان لاپەڕەکانی ٢٩٧ هەتا ٢٩٩ دا، بەبێ هیچ پێشەکییەک و پێویستبوون، لەناکاو پەڕیوەتەوە سەر تۆمارکردنی ئەو هەست و نەستە پەنگخواردووەی، کە بەدەیان ساڵ لەناو دڵ و دەروونیدا هاتوچووە، بەرانبەر بە بەرخوردی هەندێک لەو کوردانەی کوردستانی رۆژهەلات، کە لە سەردەمی سەرەتاکانی شۆڕشی ئەیلولدا پەڕیبوونەوە کوردستانی باشوورو. هەروەک نووسیویەتی:

(کە شورشی ئەیلول دەستی پی کرد هەندی لە مانەش چونە ریزی شورشەکەوە. جولانەوەکە لە ناوچەکانی سلیمانی و هەولیردا لە سەرەتادا توشی نیشتنەوە و کشانەوە بو. ئەمان ئەوەیان بە هەل زانی بەو داوودەزگای چاپەی هەیان بو کەوتنە بلاوکردنەوەی شتی بەناوی (دیسان بارزانی) یەوە. لەم بلاوکراوەیەدا ستایشیان لە بارزانی ئەکرد و، توانج و تانەیان لە ریکخراوەکانی پارتی ئەدا. تۆوی ناکوکی و دوبەرەکییان ئەوەشاند) ل/٢٩٨

لێرەدا بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەک بکاتە پشتیوانی گێڕانەوەکانی، ئەو کوردانەی رۆژهەلات بە نانەوەی هۆکاری ناکۆکی و دووبەرەکیی نێو ماڵی کوردی لە کوردستانی باشووردا ناوزەد دەکات، کە هەموو قەباحەتەکەیان بریتی بووە لە ستایشکردنی مستەفا بارزانی و هیچی دیکە نا!

(ئیمه له کونگره بوین، که راگرتنی شەر له نیوان شورشی کورد و حکومەتی عیراق دا راگەیەنراو، گفتوگوی بارزانی_ عارف دەستی پی کرد. ئەوەش سەرەتای لەت بونی پارتی و، هەلگیرسانی شەری ناوخو بو.) ل/٢١٠

نەوشیروان لەو کتێبەدا، زۆرجاران و له زۆر شوێندا، چەندان لاپەڕەی بۆ هەندێ بابەتی لاوەکی تەرخان کردووه، بەلام برووسکه ئاسا بەسەر یەکێک له رووداوه هەره تراژیدییەکانی جەستەی خەباتی کوردایەتی، مالی کورد و تێکۆشانی چەکداری و سیاسیی کوردستانی باشووردا تێپەڕیوه. تەنیا بەو چەند وشەیەی سەرەوه، دیقەتی خۆی داوەتێ، که خۆیشی لەوان رۆژاندا، به پراکتیک بەشداری ئەو جۆره سەرەتایەی لەتکردنی ریزەکانی خەباتی چەکداری کوردی کردووه.

ئەو رۆژانەی نەوشیروان باسیان لێ دەگێڕێتەوه، کەوتنه سەرپێیانی سەرەتای کاروانی کارەساته دلتەزێنەکانی شەڕی کوردکوژی براکانی یەک حیزب بوو. دەبوو بەچاوی سەرکردەیەکی بەئەزموونی ناو ئەو چێراوکه پڕ مەرگەساته، ئاوڕ لەو سەرەتایه بداتەوه و زەمینه و هۆکارەکانی بخوێندایەوه و دەرکەوتەکانی دیزەبەدەرخۆنه نەکردایه. بگره لایەنه شاراوه و نەناسراوەکانی روون بکردایەوه. چونکه چلکاوی شەڕەکانی "قیادوی موەقەته و ی.ن.ک" به دەسرازەی سەرەتاکانی ئەو کەرتبوون و لەیەک دابڕانەی ئەوان رۆژان رێچکەی نەگبەتییەکانی مەرگەساتی هەمێزی کوردایەتی پێچرابووەوه.

## خۆ تەسلیمکردنەوەی پێشمەرگه..

له گەرمەی باسوخواسەکاندا، نەوشیروان هەر له لاپەڕه ٢١١ دا، بلەز، باس له تەسلیمبوونەوەی به کۆمەلی ئەو خەلکه دەکات که به هەڕەمەکی و بگره بەراگوزاری ببوونه پێشمەرگه. ئەو جۆره پێشمەرگانه، سالی ١٩٧٧ مەیدانەکانی بەرگریکردنیان له خاک و نەتەوەکەیان چۆل کردووه. بەبێ ئەوەی خۆی لەقەرەی ئەوه بدات و باوەش له زەمان و زەمینی گردبوونەوەی نا رێکخراوی ئەو خەلکه بگرێ، سەبارەت به چۆنیەتی بوونه پێشمەرگه و توانای سەرانی خەباتی چەکداری بۆ رێکخستنیان و هەتا چەکدارکردنیان تاووتوێ بکات و بۆ خوێنەری روون بکاتەوه.

راسته تەسلیمبوونەوەی بەکۆمەلی ئەو خەلکه، لەپێشەوه سەرچاوەی لەوه گرتبوو، که پەلاماردانی هێزەکانی رژێم بۆ سەر هێزه سەرەتاییەکانی پێشمەرگەی شۆڕشی نوێ، ئەوەنده توندوتیژ بوون، که له توانای ئەو خەلکه پەرش و بلاوه بێچەک و تفاقه نەبوو. پاشان بەبێ ئەوەی لابکاتەوه به لای فاکتەرێکی سەرەکی دیکەی تەسلیمبوونەوەی

بەکۆمەڵی ئەو خەڵکە، کە هۆی سەرلەنوێ هەڵگیرساندنەوەی شەڕی خۆکوژی بێهوودەی براکان بووە، وەک یەکەم کۆستی بەربەست لە گەشەنەکردنی ئاسایی خەباتی چەکداری، باشترین هاندەری سەرگرتنی پروپاگەندەکانی شۆڕشی چەواشە بوو، بۆ تەسلیمبوونەوەی بەلێشاوی ئەو خەڵکە. دەبوایە نەوشیروان هەموو ئەو پەیڤ و گوتەی خۆی بیرنەچووبایەوە، کە دەربارەی بێمووددکردنی سەرکردە و هاوڕێیە چەربەزە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە کردوویەتی. لەوەی کە خەڵکی کەم ئەزموون و نەناسراو بوونە و نەیان توانیبوو، خەڵکێکی زۆروبۆری لەو جۆرەی، کە بەکۆمەڵ تەسلیمبوونەوە، کۆ بکەنەوە. کەچی خەڵکانی دیکەی بە ئەزووموون و ناسراو، ئەو حەشاماتە زۆرەیان بە دەورەوە ئاڵا بوو. لێرەدا ئەوەی لەبیر نەماوە و خێرا باس لە تەسلیمبوونەوەی بەکۆمەڵی ئەو لەشکرە زۆروبۆرە دەگێڕتەوە، کە پێشتر بەشان و باڵی سەرکردەکانیاندا هەڵدەلی. لەچاو ترووکانێکی پێشمەرگایەتی سەخت و دژواری ئەوێ رۆژێ بۆ باوەشی رژێم گواستویانەوە و ئەو سەرکردە بە ئەزموون و شارەزا و ناسراوانەیان بە دەست بەتاڵی هێشتەوە!

**بوونەمەسئولی هەرێم و دەستپێکی هەنگاوهەڵگرتنی..**

(من کە گەیشتمە ناوچەکە هەمو فەرماندەی کەرت و مەفرەزەکان و، کادرەکانی هەریمەکەم بانگ کرد..... هەریمەکەم گیروگرفت و کیشەی قولی تیدا بو./.../ بەرەللایی و پاشەگەردانی بلاوبوبوەوە، بە زور و بە بیانوی پوچ پارەیان لە خەلک سەند بو، لە هەندی جیگا بەبی سوچ و تاوان لە خەلکیان دابو. هەندیکیان سەرسەریەتییان کردبو. بە ئاشکرا عارەقیان خواردبوەوە.) ل/ ٢١١-٢١٢

لێرەدا نەوشیروان راشکاوانە دەست لەسەر هەندێ دیاردەی بەرچاوی پەراوێزی پاشەگەردانی، گەندەڵی لە خەباتی چەکداریی دژواری ئەوێ رۆژان دادەنێ، بەبێ ئەوەی پاش ئەو هەموو ساڵە، دەستنیشانکردنەکەی دیاردەی پردانە سەروەرییەکانی مرۆڤ، کوشتن و تیرۆری سیاسی غەدراوی بگرێتەوە! ئەوجا بۆ پەردەپۆشکردنی ئەم زێدەڕۆییە توندڕەوانە، بە ئەسپایی کەوتوتە بەسەرکردنەوەی رەفتاری ناشیرینی دوور لە رەوشتی بەرز و ناشۆڕشگێڕی پێشمەرگایەتی لەناو ریزەکانی خەڵک لە سنووری ئەو هەرێمەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان نەوەک (هەرێمەکەم) کە تازە بووەتە ئامر هەرێمی، کە دیارە بەشی هەرە زۆری پێشمەرگەکانی ئەندامی کۆمەڵە بوون.

بێگومان مەبەستی هەرە سەرەکی نەوشیروان، گەرەکیەتی بە بەردێک چەند نیشانەیەک بپێکێ. لە سەرێکی بە خوێنەر دەڵێ، کە ئەو پێشمەرگە و کادرانەی کۆمەڵە لە پێش هاتنی خۆی و بوونی بە مەسئولی هەرێمەکە، وەک خۆی گوتەنی هەر لە خەڵکی؛

"سەرسەری، عارەقخۆر، پروپوچ، تاوانکار" پێک هاتبوون و بۆ ناوزڕاندنی هەڵسوڕاوانی کۆمەڵەی پێش خۆی بەو ئاکارە ناشیرینانە ناوزەدی کردوون. بەبێ ئەوەی بە یەک نموونەی ئەمری واقیع، یەکێکی سزا دابێت و بۆمانی بگێڕێتەوە. پاشان لەپەراوێزی ناوزڕاندنی ئەو پێشمەرگانەی ئەوێ ڕۆژێدا، زەمینەی بۆ کار و گفتاری خۆی خۆش کردووە و دەڵێ:

(هەولێکی زۆرم دا ئەو گیروگرفتانە چارەسەر بکەم. تەبایی لە نێوان کۆمەلە و بزوتنەوە دروست بکەم.) ل/٢١٢

نەوشیروان لەو هەنگاوهەڵگرتنەی بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان تا چەند سەرکەوتوو بووە و چۆن هەرێمەکەی بە جێ هێشتووە! هیچ بۆخوێنەر ناگێڕێتەوە!

لەو باسوخواسەدا، ئەوەندە وشەی فەرماندەی کەرت، مەفرەزە و کادرەکان ڕیزکراوە، ئەوەی بە بارودۆخی ئەوێ ڕۆژێی پێشمەرگایەتی و ژمارەی پێشمەرگەکان ناسیار نەبێت، لەو هەموو هێنان و بردنەدا، وا دەزانێت ژمارەی پێشمەرگەکانی ئەو هەرێمە هەزاران پێشمەرگە بووە. لەڕاستیدا، زۆربەی ئەو مەسئولانە تاکوتەرا چەند پێشمەرگەیەکی بە ژمارە کەمیان لەگەڵ بووە و ئەگەر هەر خۆشیان بەتەنیا نەبووبن! ڕاستە لە پاڵ لایەنە گەش و پڕ سەروەرییەکانی خەباتی پێشمەرگایەتیدا، پێشمەرگە ماندوونەناسە گیان لەسەردەستەکان کە هەمیشە سەربازی نەناسراوی سەرکەوتنەکان بوون، نەوشیروان کەم وزۆر لەم کتێبەدا بەسەریان ناکاتەوە. بەڵێ هاوکات لەپاڵ ئەم لایەنە گەشەشەوە، ژیانی پێشمەرگایەتی، بەتایبەت لە ڕۆژە سەخت و دژوارەکانی نێوان سالانی ١٩٧٦ تا کۆتایی سالی ١٩٨٠ بۆ هەموو تاکێکی کورد نەهاتووە، تێکڕای ئەو مرۆڤانەی نەتەوەکەمان، بەبەزم و نەریتی ئەو جۆرە پێشمەرگەیاتییە، سەرکەوتوو نەبوونە.

چەندان دیاردەی تژی لە کار و کرداری ناشیرین، بە جەستەی ئەو کاروانەوە دەلەنگێتەوە. کە هەرە دزێوەکەیان دیاردەی شرەخۆری، ڕاوڕوتکردن و غەدرکردن لە خەلکی گوندەکان، لە بەرگی پێشمەرگەدا، کە دیسانەوە نەوشیروان خۆی لێ نەکردوتە خاوەن و بەلایەوە نەچووە، بگرە دەتوانم لێرەدا، بەسەرەتای بلاوبوونەوەی دیاردەی گەندەڵی بخوێنمەوە کە لەوان ڕۆژانەوە لە بەرگی خەبات و پێشمەرگایەتییەوە جۆزەرەی کردووە.

دەبوو نەوشیروان لە پەراوێزی ئەو دەستپێکەی قامک خستنە سەر بەشێکیان، بەلانی کەم شیکردنەوەیەکی بەرمەیدانی بکردایە سەرقەڵەمانەی بەتەنگەوەچوونی خۆی لە بنبڕکردن و سنووردانان بۆ ئەو دیاردانە و وەک چەپکە گوڵ لە یەخەی خەبات و شۆڕشی بدایە. نەوەک دواتر، لەپاش نزیکەی دەساڵان، لەلایەن خودی "نەوشیروان"ـەوە، هەر باسکردنی ئەو دیاردانە گومەرگ و باجی مەرگی بە چاوەوە بووە. تێکۆشەرێکی وەک

"عەلی بچکۆل"ی ڕۆژانی تەنگانەی کۆمەڵە و یەکێتی، لەسەری شاربەدەربکرێ. کە هەر بەتەنیا لەسەر وتارێکی تەنز ئامێزی لەسەر ئەم جۆرە دیاردانە، کەوتوتە بەر شالاوی ڕاوەدوونان، ئاوارەکردنی و دوورکەوتنەوەی ناچاری لە مەیدان.

## ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە لە شاردا..

لە خوێندنەوەی ئەو لاپەڕانەی نەوشیروان بۆ ڕۆژانی ئامرهەرێمبوونەکەی لە ناوچەی شارباژێر نووسیویەتی، خوێنەر درک بەوە دەکات کە لە لایەن نووسەرەوە، بە شێوەیەکی دیار کۆمەڵە و ڕێکخستنی ناو پێشمەرگەکانی هەرێمەکە جێگای مەترەحی کەموزۆری فەرماندەی هەرێم نەبووە. کەچی بۆ پێوەندیکردن بە ڕێکخستنەکانی ناو شاری سلێمانییەوە، دوور لە هەر جۆرە دیسپلینێکی ڕێکخراوەیی، لەپشتەوەی "ئارام"ی کاراکتێری سەرەکی ئەو کاتەی کۆمەڵە و کۆمیتەی هەرێمەکانەوە، دەستی خستوتە ناو ڕێکخستنی شارەوە و نووسیویەتی:

(ئەمەم بە هەل زانی نامەم بو هەندی لە هاوری کونەکانم، لە وانە شازاد و، جەمال تایەر نووسی. هەندی (مارک) ی ئەلمانیم لە مامجەلال وەرگرت بو بو خەرجی هەریم دام بە عزیز بیدا بە شازاد بومان بگوریتەوە.) ل/٢١٣

ئەگەر نەوشیروان دەستپێکی ئامرهەرێمبوونەکەی لە شارباژێردا، هەر لە یەکەم فرسەتەوە نەکەوتبێتە سەرەتای هەنگاونانی بۆ دەستبەسەرداگرتنی یەکجارەکی کۆمەڵە، بنکۆڵکردنی دەسەلاتی "ئارام" و کۆمیتەی هەرێمەکان و پێشێلکردنی هەر جۆرە سەرەتایەکی ڕێکخراوەیی، ئەوە بۆچی وەک سەرەتایەکی ئاسایی و وەک ئەندامێکی کۆمەڵە، لەپێشەوە پێوەندییەکی ئۆرگانیکی بە سەرپەرشتیکاری ڕەسمیی ئەوسای کۆمەڵەوە نەدەکرد!

ئەو پێوەندیکردنەی نەدەکردە پردی هەر جۆرە تاووتوێکردنێکی کارە سیاسی و سەربازییەکان! نەخوێندنەوەی "ئارام" و کۆمیتەی هەرێمەکان لەلایەن هەر یەکێکەوە بێت لە بەرگی ئامرهەرێمیدا، تەنیا قبوڵنەکردنی ئەو سەرکردایەتییەی ئەوێ ڕۆژییە کە بە نەوشیروان هەزم نەکراوە. بگرە هیچ نرخێکی بۆ دانەناوە و خۆی لە سەرەوەی ئەوان و هەموو کۆمەڵەوە داناوە. تەنیا ئەو هاوڕێ نزیکانەی ڕابردووی خۆی بەسەرکردوتەوە، کە پشتی پێبەستوون و لە پشتیوانییان دڵنیا بووە. هەموو جارێک نەوشیروان بیەوێ بەناچاری ناوی "ئارام" بهێنێ، لە پێشەوە زەمینەی ناوهێنانەکەی بەباسکردنی تانەئامێزی لە ئەندامێکی کۆمەڵە بەستوتەوە و هەروەک دەڵێ:

(بەدریژایی ریگا لەگەل عومەر [ دیارە مەبەستی ملازم عومەرە ] پیکەوە بوین، هیچ ئارەزوویەکی نەبو بچی بو بەری قەرەداغ و کاروباری هەریمی قەرەداغ وەربگری. تاقەتی لە پیشمەرگایەتی چو

بو ئەیویست ریگە بدری بچی بو دەرەوە. حەزی ئەکرد جاری هەر لەگەل من بمینیتەوە. لەو رووەوە نامەمان بو ئارام نووسی و، من بیروراکانی خوم دەربارەی هەلومەرجی کوردستان و جولانەوەکە بو رون کردبووەوە و، هەولم دابو زور لەو قسە ناراستانەی پی یان گەیاند بو، راست بکەمەوە. وەلامی نامەکانی بو نووسینەوە و..... لەگەل ئارام وا ریک کەوت بوین، دوای ریکخستنەوەی کاروباری هەریمی قەرەداغ بپەریتەوە بو لای ئیمە و ماوەیەک بەیەکەوە بین.) ل/ ٢١٥ _٢١٦

دیارە بۆ ئەو دۆخەی، سەبارەت بە مرۆڤی رۆژی تەنگانە و پێشمەرگەی ماندوونەناس، ملازم عومەر، نەوشیروان باسی دەکات، بەندە قسەیەکی نییە، چونکە ئەو هێشتا خۆی لە ژیاندایە. بەڵام ئەوە بە خۆم رادەبینم، لە بەرانبەر ئەو خەمڵێدانەی نەوشیروان لە تاقەتچوونی ملازم عومەر لە پێشمەرگایەتی، ئەگەر لەوێ رۆژێدا هاورێیەکان تووشی هەر جۆرە موعاناتێکی تایبەتی بووبن، زۆر ئاسایی بووە لەبەرانبەر ئەو بارودۆخە دژوارەی ئەوێ رۆژێی پێشمەرگایەتی. بەردەوامیی ملازم عومەر، کۆڵنەدانی و بەرگەگرتنی بێ پسانەوەی، هەتا مانەوەی لە شاخ بۆ رۆژانی راپەرینی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانی باشوور، بەرووی رژێمی بەعس، گرەوی لەو خەمڵدانە سەرچێخچوونەی نەوشیروان بردوتەوە. لەو سەروبەندەی نەوشیروان بەدوای ساڵانێکی زۆری دابڕانی لە کوردستان و بێئاگایی لە بارودۆخی ناوچەکان و نەبوونی هەر جۆرە پێوەندییەکی رێکخراوەیی بە کۆمەڵەوە، دەبوو لە پێشەوە، بە بەرچاوتێرییەکی پڕ لە پەرۆشی و نرخاندنی خەبات، قوربانی ئەو هاورێیە گیانفیداکارانەی کۆمەڵەوە، بەر لەوەی پێوەندی بە هاورێ تایبەتییەکانی جێگای باوەڕی خۆیەوە، دەبوو وەک سەرەتایەکی ئاسایی رێکخراوەیی، جارێ پێوەندی بە "ئارام"ەوە بکات، هەم بۆ چاوساغی و هەمیش بۆ رەواندنەوەی هەموو گومانێکی "ئارام" لە بۆنکردنی پەراوێزکردنی و نەخوێندنەوەی!!

بێگومان یەکێک لە خامۆشییە زۆروزەبەندەکانی جەستەی خەباتی کوردایەتی، ئەوەیە کە تێکۆشەرەکانی، بەتایبەتی ئەوانەی لە رۆژانی تەنگانە خۆیان کردوتە سوتەمەنی، کەموزۆر، نەوەک هەر خاوەنی چاوبەیەکتری هەڵنەهاتن نەبوونە و یەکتریان نەخوێندوتەوە، بگرە هەمیشە و لە پێشی پێشەوە، هەموو خەون و خەیاڵیان لە هەمێزی خەوندیتن بەشکستی هاوڕییەکانی خۆیانەوە لەنگەری گرتووە. لەو بارەوە نەتەوەی کورد زیانی زۆر گەورەی لێ کەوتووە. من بەو پەڕی راشکاوی ئەو حەقیقەتە تاڵە، تەنیا بۆ کۆنە رق و خۆپەرستی دەگێڕمەوە.

ئایا ئەگەر نەوشیروان لەپێشەوە "ئارام"ی بدیتایە، لە نزیکەوە ئەو قارەمانێتی و رۆڵی جوامێرانەی ئەوی لە گرتنەوەی کۆمەڵە و سەرپەرشتیکردنی مەفرەزە سەرەتاییەکانی شۆڕشی نوێی بنرخاندایە، بۆ خۆی سەرووەرییەکی گەورەی تۆمار

نەدەكرد!! لێرەدا نابێ ئەوەیش لەبیر بکەم، دیسانەوە بەدوای دەیان ساڵی ئەو بەسەرهاتانەوە، نەوشیروان راستگۆیانە هەست و نەستی خۆی تۆمارکردووە و بەدوای شەهیدبوونی "ئارام"یش نەیتوانیوە ئەو حەقیقەتە بشارتەوە. دیارە بازدانی نەوشیروان بەسەر کۆمیتەی هەرێمەکان و "ئارام"دا، کە ئەو رۆژە سەرکردایەتی رەسمی کۆمەڵە بوون، با هەر گەنجی کەمئەزموون و نەناسراویش بووبن. لەوە خۆی دەدزێتەوە کە گەرەکی بووە، بەو پارەوپولەی بۆ شاری رەوان کردوتەوە، جێ پێی خۆی قایم بکات و بەو کەرەستەیەی ئەوێ رۆژێ بڵێ، من لە هەمووان دەستڕۆیشتوترم، لە کاتێکدا هیچ مەسئولێکی کۆمەڵە و یەکێتی لە ناوچەکەدا، فلوسێکی قەڵپی لە گیرفاندا نەبووە!

**سیمای خەباتی چەکداری و پێشمەرگایەتی..**

(ئەم تاقمە جگە لەوەی لە رووی سیاسییەوە لەگەل ئیمە ناکوک بون ، وەکو باندیکی ناسیاسی جەردە رەفتاریان لەگەل خەلکی ئەکرد. خەریک بو ئابروی شورش و پیشمەرگایەتییان ئەبرد. پارەی زوریان لە خەلک ئەسەند. ریگایان بەکاروانی قاچاغچی ئەگرت. لە خەلکیان ئەدا. خەلکیان ئەکوشت. لەوەش خراپتر دەستدریژییان ئەکردە سەر ناموسی خەلک و لەماڵی هەندی لە پیاو ماقول و ریشسپییەکانی ناوچەکە بە توبزی بەزمی خواردنەوە و رابواردنیان ساز ئەکرد.) ل/٢١٨

راستە نەوشیروان بوێرانە کەوتووتە لەقاودانی خەسڵەت و رەفتاری هەندێ بەناو پێشمەرگەوە، کە مایەی دڵخۆشییە، بەڵام ئەگەر لە چارەسەرکردنی ئەو دیاردە ناشیرینانە، بەشێوازێکی دووفاقەیی چارەسەرکردنیانی پشتگوێ نەخستایە، بێگومان سەرقافڵەی رچەشکاندنی لەو بارەوە بەردەکەوت. لێرەدا باس لە ئاکاری پێشمەرگەکانی لایەنێکی سیاسیی نەیاری سەرگۆرەپانەکە دەکات، سەبارەت بە پاشەگەردانی و بەرەڵڵایی ناو بەرگی ناوی خۆشەویستی پێشمەرگەدا، بێپەروا بڕیاری پاکتاوکردنیان دەدات، کەچی لەبەرانبەر چارەسەرکردنی هەمان هەڵسوکەوتی پێشمەرگە و کادرەکانی ناو هێزەکەی خۆیەوە، هەر وەک خۆی لە لاپەڕەکانی پێشوتر باسي کردووە، لە ناوزڕاندنی ناوی پێشمەرگە و ناشیرینکردنی روومەتی خەباتی چەکداری، کەمتریان نەکردووە، لە هەر جۆرە چارەسەرێک بێدەنگەی لێ دەکات، بگرە بابەتەکەیش لەبیر خوێنەر دەباتەوە.

مۆرکێکی دیکەی خەوشە زەقەکانی خەباتی چەکداریی شاخ، بەتایبەت لە زەمان و زەمینی خەباتی چەکداریی نوێدا، تێکڕای حیزبە چەکدارەکان، بەبێ ئەوەی شەرم لە بەژن و باڵای خەبات بکەن، زۆرتر خەریکی شەڕەدەنووکی دژ بەیەکتری و بنکۆڵکردنی سیاسەتی یەکدی بوون. لەوگۆڕەوە و بەئاسانی دوژمنە سەرسەختەکانی خۆیان شاگەشکە کردووە. لەپاڵ ئەوەدا زۆرترینی دیاردە دزێوەکانی شڕەخۆریی کادرەکانیان و

جەردەیی و ڕاوڕوتی چەکدارە بەناو پێشمەرگەکانیان، کردووتە ماکی زیوانی نێوچەوانی پێشمەرگەی یەکترییەوە. لەو سەرەوە دەستی چەوری خۆیان بە سەروگوێلاکی یەکترییەوە سڕیوەتەوە و ناوی پێشمەرگە، شۆڕش و خەباتی چەکدارییان لە بەرچاوی کۆمەڵانی خەڵک خۆشەویست نەکردووە. بەبێ ئەوەی لایەنێک لەو لایەنانانە بە دۆی خۆی بڵێ ترشە! کە مایەی سەرنج و جێی هەڵوەستە لەسەرکردنە.

هەموو لایەنەکان و هەر یەکەیان بە ڕێژەیەک، ئەگەر لە لایەنەکەی ئەم لا و ئەو لای خۆی زیاتری بەر نەکەوتبێت، ئەوە هەرگیز کەمتر نەبووە. هەر بۆ بەڵگەیش چەندان نموونە هەن، کە بەشێکی سەرانی ئەو حیزبانە، لەو کاتەی فلان و فیسارە مەسئولی پێشمەرگە، کادری حیزبێکی دیاریکراوی نەیاری خۆیان، سەرتاپای گیان و ڕەفتارەکانی تژی بووە لەو پاشەگەردانیانە. هەتا لەگەڵ حیزب و لایەنی نەیار بوە، چی خراپە پێی گوتراوە، بگرە درێخی نەکراوە کە لەبەرچاوی خەڵک سوک و چرووک بکرێ، بە هەزارویەک تۆمەتی دیکە ناوی لێ نراوە. بەڵام هەر ئەوەندە بەس بووە، ئەو مەسئولە گەندەڵە ڕووی هەڵوێستی خۆی گۆڕیوە و کەوتوتە سەنگەرگۆڕین بە لای ئەو حیزب و مەسئولانەی تادوێنێ چی خراپ بوو بۆیان ڕایەڵ دەکرد، ئیتر ئەو مەسئول، پێشمەرگە و کادرە نەوەک هەر لە هەموو جۆرە ڕەفتارە ناشیرینەکانی پێش سەنگەرگۆڕینەکەی پاک دەبووەوە، بەڵکو دەبووە پێشمەرگە و کادرێکی قارەمانی کەموێنەی نەبەردی. چاکتر دەستی والا دەبوو نەوەک بۆ دەستهەڵگرتن لە گەندەڵی، بگرە ئەوجارەیان لە بەرگی قارەمان و پاڵەواندا، دەکەوتە پیادەکردنی بەرفراوانتری دیاردە دزێوەکانی گەندەڵیی کۆمەڵایەتی، جەردەیی و هەتا دروستکردنی پێوەندی ژێربەژێرەکی بە دامودەزگا سیخورییەکانی ڕژێم. ئاشکرابوونی ئەو فایلەی مەسئول و کادرەکان، نموونەی مشتێکی ئەو خەروارەن، بەبێ ئەوەی دەسەڵاتێک بتوانی لە گوڵ شیرینتریان پێ بڵێ. بگرە هەمیشە ئەو کادر و پێشمەرگە پاک و ئازا و دڵسۆزانەی ڕۆژانی تەنگانە لە بەربەرەکانیکردنی ئەو کەسانەی خاوەنی ئەو گەندەڵییە بوونە، لە لایەن مەسئولە بالاکانی حیزب و شۆڕشەوە، مایەی نیگەرانی و کەوتنە بەر پتکوپلاری وەرسکردن بوونەتەوە. تاکو هەر ناڕازیبوون و بەربەستێکیان بۆ دروست نەکەن لە دانەخۆرەکردنی ئەو توخمە گەندەڵانەی، کە بە حەق تووی سەرەتایی دیاردەی گەندەڵییان لەژێر ناوی خۆشەویستی پێشمەرگەوە لە ڕیزەکانی حیزب، شۆڕش و کوردایەتی چاندووە، کە نەوشیروان بە هیچ شێوەیەک تخونی نەکەوتووە.

بەکورتی هێشتا لە فەرهەنگی بەشێکی زۆری سیاسەتوان و سەرکردەی حیزبەکان و زمانحاڵیان ئەوەیە، کە ئەندام و هەوادارەکانیان و بەگشتی مرۆڤی کورد، دەبێ هەمیشە

کۆیله و دەستەمۆی تەنیا فەرموودەکانیان بێت و هەر جۆرە هەڵوێست و ئازادییەکی قسەکردن و هەبوونی بیروڕایەکی جیاواز، کوفرە و ئەو کەسە دەبێ رەجم بکرێ.

بۆ ئەوەی زۆر لە باسەکەی خۆمان دوور نەکەوینەوە، ئەو دەستە جەردە و چەتەیەی نەوشیروان، وەک ئامرهەرێمی شارباژێر فەرمانی پاکتاوکردنی داون، ئەو رۆژە پێشمەرگەی قیادەموقەتەی پارتی بوون، کە هەندێک لەو باندە پێشتر پێشمەرگەی یەکێتی بوون. بە دڵنیایەوە ئەگەر لەگەڵ هێزی پێشمەرگەی یەکێتی بوونایە، یان جێگۆڕکێیان بکردایە بۆ ناو هێزەکەی بەر قەڵەمڕەوی خۆیەوە، ئەوە هەرگیز نەوشیروان بڕیاری پاکتاوکردنی نەدەدان. هەر چ جۆرە موحاسەبەی ئەو باندەی هەرێمەکەی خۆی کردووە (لە سەرسەری، جەردە، پیاوکوژ) ئاوایش ئەوانی دەبەخشی و دەکەوتە دیزەبەدەرخۆنەکردنی گەندەڵییەکانیان. دڵنیام نەوشیروان لە هەمووومان چاکتر بەوە ئاشنا بووە، کە لەناو قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی پێشمەرگەیی خودی خۆیدا، چەندان ئاغا و باندی غەدر و چەتەیی هەبوون، کە هەموو چالاکی و کرداری "پێشمەرگانەیان" تەنیا ئازاردان و زۆڵمکردن بووە بەسەر سەروەرییەکانی مرۆڤ و ئازاردانی جوتیارە زەحمەتکێشەکان، کە کەموزۆر باسیان ناکات و ناویان ناهێنێ!

**کوژرانی ئارام..!**

> (ئیوارەیەکیان لە گوندی/ چاژ/ بوین ئاگاداریان کردم کە یەکی لە سلیمانییەوە نامەیەکی بەپەلەی بو هیناوم. نامەکەیان بو هینام. نامەکە لە کومیتەی هەلمەتەوە بو. ئەوسا کومیتەی هەلمەت ناوی ریکخستنی سەرەکی کومەلە بو لەناو شارەکانی کوردستانی عیراقدا. لە نامەکەدا بویان نووسی بوم کە روژی ٣١/١/ ٧٨ مەفرەزەیەکی جاش بە ریکەوت چونەتە گوندی تەنگیسەر لە قەرەداخ. کاک ئارام خوی لەو گوندەدا شاردبووەوە. کە جاشەکان ئەبینی تفەنگەکەی ئەکاتە شانی و ئەیەوی بە خیرایی لە ئاوایی دەربچی. جاشەکان بەدی ئەکەن و تەقەی لی ئەکەن. کاک ئارام ئەپیکری و هەر لەوی دا گیانی دەرئەچی.) ل/٢٢٨

وەک ئەوەی مەرگی مرۆڤێکی وەک "ئارام"، بەتایبەتی ئەو مەرگەی بەدەستی جاشی رژێمەوەیش بێت، هەر بارتەقەیای وشەیەکی رەقوتەقی "کوژران"ـە. نەوشیروان هەتا بۆ ئەدریسی ئەو کارەساتەی مەرگی "ئارام" پەیڤی شەهید بەسەرزمانی گۆ ناکات!

ئەوەی ئەم وشانەی سەرەوە بەوردی بخوێنێتەوە، گومانی زۆر بۆ دەخەملێ لە ئاست پەیڤە بەکارهاتووەکان، لەبەرانبەر ئەو رووداوە دڵتەزێنە و لەبەراییدا، خوێنەر درک بە هەستونەستی ساردوسڕی بێ ریاکشونی هەر جۆرە هاوڕێیەتییەکی نەوشیروان بۆ "ئارام" دەکات! ئەوجا نووسیویەتی "مەفرەزەیەکی جاش"، کە زۆر لە راستییەوە نزیک

نییه، ئێستایش خەڵکی ئەو گوندە بەژیان ماون، کە ئەو هێزە گەورەی ڕژێمی بەعس چەند و چۆن بووە! ئەوەی من لە سەردانێکم بۆ سەرمەزاری "ئارام" لەو گوندەدا گوێبیستی گێڕانەوەی شاهیدە زیندووەکانی گوندەکە بووم، ئەوە بوو، ئەو هێزەی دوژمن، زۆرتر بە سەربازی هێزی تایبەتی و بە پشتیوانی چەندان کۆپتەری جەنگی و ڕەوەچاشی زۆرەوە خەریکی کەوماڵکردنی سەرجەمی ئەو ناوچەیە بوونە، کە جاشەکان بۆ شەویش لەو گوندە ماون. ئەوان "ئارام" یان ناسیوە و لەبەر سامی گەورەیی ئەو مرۆڤە خۆشەویستە، هەم تەرمەکەیان لەگەڵ خۆ نەبردووە و هەمیش نکوڵییان لە ناسینی کردووە. خەڵکی گوندەکەیان ڕاسپاردووە کە بەرێز و بایەخەوە بینێژن. چونکە گەورەیی و خۆشەویستی "ئارام"، بە جۆرێک بەناو کۆمەڵانی خەڵکی ستەمدیدە پەنگی دابووەوە، بگرە هێزە چەکدارە خۆماڵییەکانی شۆڕشی چەواشەیش لە ناوچەکەدا، لەو سام و گەورەییە سڵەمینەتەوە.

پاشان وشەی "بەڕێکەوتەکەیش لە جێگای خۆیدا نییە، چونکە ئەو چەند ڕۆژە هێزەکانی دوژمن لە ناوچەکە بەردەوام خەریکی کەوماڵکردنی بەری قەرەداغ بوونە. هەروەها بۆ پەیڤەکانی (هەر لەوی دا گیانی دەرئەجی) دا، بلەز کۆتایی بە گێڕانەوەی ئەو کارەساتە دەهێنی، کە لە ڕاستیدا "ئارام" شتی نهێنی لە گیرفان بوە و دیارە جوامێرانە لە سەرەمەرگی گیان دەرچونیدا، هەموو ئەو شتانەی شاردوتەوە و شوێنی پێکرانەکەی گۆڕیوە، تاکو ئەو شتانە نەکەونە دەست دوژمنەوە. نەوشیروان لە سەرزاری نامەی "کۆمیتەی هەڵمەت"دا، زۆر بلەز کارەساتی شەهیدبوونەکەی دەگێڕتەوە، گوایە لەو گوندەدا "ئارام" خۆی (شاردوتەوە)، بەبێ ئەوەی بەرانبەر حەقیقەتی ڕووداوەکە زەحمەت بداتە خۆی و بچێتە بنجوبنەوانی ئەو ڕووداوە دڵتەزێنەوە.

نەوشیروان بەدوای دەیان ساڵ بەسەر شەهیدبوونی "ئارام"دا، نەکەوتووتە ڕەواندنەوەی هەر جۆرە گومانی قسە و قسەلۆکێک دەربارەی هەوڵ و تەقەلای پەراوێزکردنی "ئارام" لە کەراکتێری سەرەکیی کۆمەڵەوە. دەبوو وەک خۆی دەڵی، "ئارام" هاوڕێیەکی نزیکی خۆی بووە، دەبوایە ئەو هاوڕێیەتییە ئەوەندەی بەبەرەوە بوایە، کە هەر هیچ نەبێ بەراگوزاریش بوایە، سەرێکی لەو ناوچە و ئەو گوندە بدایە و بەوردی لەو ڕووداوە جەرگبڕەی بکۆڵییایەوە، تاکو هاوڕێیەتییەکەیانی تێر بکردایە.

(کومیتەی هەلمەت بە داخ و پەژارەیەکی بی ئەندازەوە ئەو هەوالەیان بومن نووسی بو. هەروەها باسی دەوری کاک (ئارام)یان کرد بو لەسەرپەرشتی و ئاموژگاری ریکخستنی نهینی شارەکاندا. شەهید بونی کاک ئارام جگە لەوەی خەمیکی گەورەی بە هاوریکانی ئەدا. بوشاییەکی گەورەی لە ژیانی ریکخراوەیی دا دروست ئەکرد.) ل/٢٢٩

بۆ یەکەم جارە نەوشیروان، وەک فەرماندەیەکی سەربازیی هەریمی شارباژێری یەکێتی نیشتمانی کوردستان لەوێ رۆژدا، راستەوخۆ بەدوای زانینی مەرگی "ئارام"، ناوی کۆمیتەی هەڵمەت بهێنێ، کە پێشتر هەر لە رێگای کۆنە برادەرەکانییەوە، ئەو پێوەندییەی بە خشکەیی فەراهەم کردوە و ئەوجا هەر لەسەر زاری کۆمیتەی هەڵمەتیشەوە، زۆر بەناچاری و پەلەپروسکێ، دان بە رۆڵی "ئارام" دێنێ و وەک لە دەشتی هەولێر دەڵێن: "ئاوێ بینە و دەستان بشۆ!".

نەوشیروان بەدوای دەیان ساڵی شەهیدبوونی "ئارام" و لەگۆڕنانی تێکڕای خودی کۆمەڵەیشەوە، ویژدان و ئارەزووە تایبەتییەکانی تەنیا رێگای ئەوەیان داوە، کە هەر لە دوو توێی نامەیەکی کۆمیتەی هەڵمەتی رێکخستنەکانی شار، زۆر بەدرەنگی بەناوی "ئامۆژگاری"یەوە، ددان بەسەرپەرشتیکردنی رێکخستنەکانی کۆمەڵە لەلایەن "ئارام"ەوە "تەنیا" لەناو شارەکاندا بنێ! کە هەموو هاوڕێیەکی ویژدان زیندووی کۆڕی خەبات و خاوەن وەفاداریی هاوڕێیانەی ئەوێ رۆژان و تێکۆشەری کۆمەڵە، بەوە ناسیارن کە لەسەر دەستپێشکەری بەرمەیدانبوونی، "ئارام" و دەیان هاوڕێی دیکە، کۆمەڵە بەدوای کەوتنە سەرلێواری هەڵوەشانەوە و لەناوچوونی ئەوێ رۆژانی ساڵی ١٩٧٥، بە گیانفیداکاری دەربازکراوە. سەرلەنوێ لەبەر رۆشنایی عەقل، بیرکردنەوە و ئەزموونی خەباتی سیاسی و توانا و جورئەتی شۆڕشگێڕانەی ئەو "ئارام"ەدا، کۆمەڵە لە شار و شاخدا کەوتووتەوە گاگۆڵەکردن. ئەوەی دواتر هاتووتە سەر بەرهەمی "ئارام" و هاوڕێیە کۆڵنەدەرەکانی ئەوێ رۆژان. دیسانەوە هەر لە پەراوێزی ناوهێنانی نامەی کۆمیتەی هەڵمەتدا، نەوشیروان لە لایەکەوە بەخشکەیی، رۆڵی "ئارام" لە سازدانی مەفرەزە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە و ناردنەدەرەوەیان بۆ شاخ، قوت دەکا و بە هیچ شێوەک باسی ناکات. لەجیاتی ئەوە بە ئەسپایی و لەژێر تارمایی پێوەندییە ژێربەژێرەکییەکان بە رێکخستنەکانی شارەوە، (لە رێگای رەفیقە نزیکە کۆنەکانی) بە مەرگی کتوپڕی "ئارام" دەزانێ! ئیتر بەتەواوی زەمینەی بۆ سازاوە کە زۆر بەپەلە، هەر لەسەر زاری نامەی کۆمیتەی هەڵمەتەوە جاڕی مەسئولی یەکەمی کۆمەڵە بۆ خۆی بدات.

(کومیتەی هەلمەت دلوایان لی کردوم لیرە بەدواوە لەباتی کاک ئارام من پەیوەندییان لەگەل ببەستم. سەرپەرشتی کاروچالاکییەکانیان بکەم.) ل/٢٢٩

نەوشیروان ئەوەندە بلەز کەوتوتە دەرخستنی سەرەداوی بیرکردنەوەکانی لە دەست بەسەراگرتنی کۆمەڵەدا، هەتا بەدوای دەیان ساڵیش بەوە رانەگەیشتوە، بەچەند وشەیەکیش بێت، ئەو هەستونەستە (هاوڕێیەتییەی خۆی لەگەڵ "ئارام"دا) هەبووە، لەکات و ساتی کارەساتی دڵتەزێنی مەرگی "ئارام"دا تۆمار بکات. هێشتا دڵۆپە خوێنە گەشەکانی

"ئارام" وشک نەببوونەوە، جارێ زوو لە خەمی ئەوەدا بووە (لەسەر داوای نامەی کومیتەی هەڵمەت) جاری بەرپرسیاریتی خۆی ساغ بکاتەوە.

دەبی یەکێک هەبێت، ئەوەندە کاڵفام بێت و بۆ گێڕانەوەی لەو جۆرە گریانی بێت و بەوە بڵێ ئامین کە "کۆمیتەی هەڵمەت"ێک لەو ڕۆژەدا، راستەوخۆ لە لایەن کۆمیتەی هەرێمەکانەوە بەڕێوەبراوە، تەنیا سەرپەرشتی ریکخستنەکانی سلیمانی و هەندێ خەتوختوتی ئیرە و ئەوێی کردووە، هەر وا لە ختوخۆرایی و بەبێ هیچ مانۆڕێکی پێشەکی، هەر لەخۆیانەوە و لەپشتی کۆمیتەی هەرێمەکانەوە، کە سەرکردایەتی رەسمی ئەو کاتەی کۆمەڵە بوو، نامەی لەو جۆرە بۆ ئامرهەرێمێکی عەسکەری بنووسن و رێکخستنەکانی شاری لەقەبەر بکەن..!

لێرەدا هەر جۆرە سەرچیخچوونێک لەو بەسەرهاتەدا، بۆ ئەوەمان تاو دەدات، کە رێکخستنەکانی کۆمەڵە، هەر لەبنج وبنەوانەوە، زۆرتر لە رێکخستنی ئیدارەدانی چەندان گروپ، دەستە و تیپی نارێک و نەگونجاو خەملیوە. هەتا کۆشش و هەوڵدانە پڕ بایەخدارەکانی "ئارام" بۆ بنیادنانی رێکخستنێکی مارکسیزمی خاوەن ستروکتورێکی نوی لەگەڵ شەهیدبوونەکەی کاڵ بووەتەوە و لەسەر دەستی ئەوانەی دوای خۆیەوە زیندەبەچاڵ کراوە. بێگومان دەبێ ئەو راستییەیش بگوترێ، کە بە دوای شەهیدبوونی "ئارام"ەوە، کۆمەڵە سەرلەنوێ کەوتوتەوە قەیرانی نەبوونی سەرکردەیەکی لێهاتوی کوڕی خەبات، کە بتوانی بەدوای ماوەیەک شوێنی "ئارام" پڕ بکرێتەوە. ئەو شەهیدبوونە و چۆنییەتی پێکهاتەی هاوڕێیانی کۆمیتەی هەرێمەکان و مانەوەی تارمایی کەسایەتی مام جەلال بەسەر کۆمەڵەدا لەوێ ڕۆژاندا، بۆ نەوشیروان هێلکەی دوو زەردێنە بووە.

(کاک ئارام دوستیکی نزیک و خۆشەویستی من بو. لە بیروباوەردا لەیەکەوە نزیک بوین. لە دامەزراندنی کومەلەدا لە گروپەکەی ئیمە بو.) ل/٢٢٩

راستە "ئارام" دۆستی نزیک و خۆشەویستی هەموو هاوڕێیەکی تێکۆشەری کوڕی خەبات بوو. ئەوەیش راستە، کە سەرەتای کاروانی خەباتی "ئارام"یش لەگەڵ رەوتی باڵی "م. س/جەلالیزم"، کەوتوتە سەرپێیان و گەشەی کردووە. بەڵام "ئارام" یەکێک بوو لەو مرۆڤە داهێنەرە تاکوتەرایانەی سەر گۆڕەپانی سیاسەت، کە زۆر بەوردی کەوتوتە بەخۆداچونەوە و خۆتەیارکردنێکی راستگۆیانە بە سەرەتاکانی ئەو فەلسەفەیەی باوەڕی پێ پەیدا کردبوو و رزگارببوو لە جومگەی دۆگماتیزمی چەقبەستوی ناو ئاراستەکانی کوردایەتی و ئەزموونی پڕ خامۆشی ئەو شێوازە حیزبایەتییە کلاسیکییە دەقگرتوەی ناو کۆمەڵی کوردی بەلاوە نابوو.

"ئارام" بەبێ فروفێڵ باوەڕی بە فەلسەفەی مارکسیزم/ لینینیزم هەبوو و وەک سەربازێکی نەناسراو کۆششی خۆی بۆ چینە زەحمەتکێشەکانی نەتەوەکەی تەرخان کردبوو، خەباتی بێوچانی دەکرد بۆ سڕینەوەی مۆرک و ئاسەواری ڕەوتی سیاسی پابەند بە میزاجی سەرکردەی تاکەکەسی و دەستەگەری توندڕەوی چەپ و ڕاست. هەموو بیروباوەڕەکانی خۆی بەڕۆژی ڕووناک دەردەبڕی. دوژمنی باوککوژەی مانۆڕ و پلانی دەستەگەری بوو لەناو هاوڕێیەکانی خۆیدا. هەرگیز لە بەرەی هیچ دەستە و تاقمێک نەبووە لە دژی یەکێکی دیکە، بەڵکو هەڵگری بێ پێچ و پەنای ئاڵای ئەو فەلسەفەیە بوو، کە ئیدیعای پێوە دەکرد. هەر بۆیە لەو پێناوەدا هەتا دوا هەناسەی خۆی، بێ سڵەمینەوە لە ناخۆشییەکان، ڕیزی خەبات، گۆڕەپانی ناو هاوڕێ و خەڵکی ستەمدیدەی نەتەوەکەی بەجێ نەهێشتوە. هەموو سەروەت و سامانی خۆی، کە گیانە زیندووەکەی بوو، لەو ڕێگایەدا پێشکەشی کرد.

"ئارام"ی ڕوت و ڕەجاڵی بێ پشت و پەنای ناوەکی و دەرەکی، بە قەڵەمەکەی دەستی، ڕاستگۆیانە و دوور لە دەستکەوت و پلەوپایە، هەمیشە لەوەیشومەکانی خەبات وەرهێنابوو. "ئارام"، وەک خەڵکانی سەربڵندی، وەک "فواد قەرەداغی"، کە یەکێکە لە دامەزرێنەرە سەرەتاییەکانی کۆمەڵە، دەگێڕنەوە، لە ساڵی ۱۹۷۰ی سەرەتای هەوڵدانەکانی پێکهێنانی کۆمەڵەی مارکسی- لینینی لەگەڵ گروپی خاڵە شەهاب بووە. "ئارام" لە ساڵی ۱۹۷٤ لە شانی دەیان هاوڕێی کۆمەڵەدا بە پراکتیک بەشداری بەرچاوی لەناو دەزگاکانی بەڕێوەبردنی شۆڕشی ئەیلول کردبوو، لەگەڵ ئاشبەتالیش ئامادە نەبووە، بۆ هیچ بڕوبیانوییەک کوردستان بەجێ بهێڵێ، کە بەدڵنیاییەوە لە هەموو کەس زیاتر زەمینە و بواری چوونەدەرەوەی وڵاتی بۆ مەیسەر بووە، کەچی بە پێچەوانەی ئەوەی، بەدوای دەربازکردنی پێستی خۆیەوە بێت، هاتووە خەباتی ژێرزەمینی شار و دوایی شاخی هەڵبژاردوە.

"ئارام" بە پراکتیکی، ڕۆژانە لە سەروچاوەی بیروباوەڕەکەیدا، خۆی لە هەر جۆرە ئاکار و ڕەفتارێکی ڕقوقینە و خۆبەزلزانین و نازوفیزکردن بەسەر خەڵکەوە دەرباز کردبوو. گەرەکی بوو بە بەرنامەیەکی پشودرێژانە کۆمەڵە، لە بڕینی قۆناغی دەستەپاچەیی فیکری و ساغنەکردنەوەی مەسەلە هەڵواسراوەکان بەو ئاقارەدا بپەڕێنێتەوە و بە وەرچەرخانێکی چلۆنایەتی، ئاسایی بیگوازێتەوە بۆ ڕێکخراوێکی تۆکمەی داهێنەری ناو ژانەکان و سارێژکردنی برینەکانی جەستەی خەڵکی کورد.

نەوشیروان دەبوو بۆ تێرکردنی قسەکان: (لە بیروباوەڕ لەیەک نزیک بووین) بە چەند نموونەیەک ئەو لەیەکنزیکبوونەیانی بەدەستەوە بدایە. چونکە ئەو لەبیری چوەتەوە لە

لاپەرەی ۱۷۲ دا، بەزاری خۆی دەڵێ: "من هیچ باوەڕێکم بە م.ل نەبووە." نازانم ئەو هاوبیر و باوەڕییەیان لەکوێ بووە! بەڵام "ئارام" هەتا بەر لە شەهیدبوونەکەیشی، کە بەندە چەندان جار بەدیداری گەیشتووم و راستگۆیانە هەڵگری ئەو بیروباوەڕە بوو، بەبێ ئەوەی تامەزرۆی عەرشی دەسەلات بێت و خەون بە پلەوپایەی بەرسییەری تفەنگی شاخەکان ببینی.

نەوشیروان وەک چەندان لاپەرەی لەسەر شتی لابەلای وەک راوەکەو پڕکردوتەوە، نەدەبوو لاپەرەیەکیش لەسەر رۆڵی "ئارام" و چۆنیەتی ژیاندنەوەی کۆمەڵە بنووسیبایە، کە تامی (دوستیکی نزیک و خوشەویستی من بو) ی لێ بهاتە و بواری بۆ هەر جۆرە خەمڵێن و بیرکردنەوەیەکی گوماناوی بڕەوەندایەوە!؟

نەوشیروان کاتێک دیدەنی خۆی لەگەڵ "ئارام"دا دەهێنێتە پێشەوە، کە هەواڵی مەرگی ئەوی بیستوە. من لە لای خۆمەوە لەوە ناگەم، بۆ "نەوشیروان"ێک بتوانی لەوپەڕی سنوورە دەستکردەکانی نێوان کوردستان باشوور و باکوور، بەناو ئەو هەموو مەترسییەی ئەوێ رۆژاندا، بێ گوێدانە سەختییەکان بگاتە قولایی ناوچەکانی سلێمانی/ شاربازێر، کەچی نەتوانێ بۆ دیدەنی "ئارام"ی دۆستی دێرینی بگاتە ناوچەی قەراخ! کە بۆ "**نەوشیروان**"ی تازەفەرماندەی هەرێمی شاربازێر زۆر پێویست بووە، تاکو لە نزیکەوە و لە دەمی "ئارام"ەوە، بە بارودۆخەکان ئاشنا بێت و بەیەکەوە تاوتوێی کارەکان بکەن! یان لەو لایشەوە بۆچی "ئارام" کە لە هاتوچۆکردنی ناوچەکان بێ پەروابووە، کەچی بۆ دیتنی ئامرهەرێمێکی نوێ، کە هاورێیەکی نزیکی کۆنینەی خۆیەتی، وەک کە نەوشیروان دەڵێ، نەتوانی بۆ بەری شاربازێر بپەڕێتەوە! بێگومان شەهیدبوونی کتوپڕ و چاوەڕواننەکراوی "ئارام"، شاباشی خواست و زاڵبوونی هەر مەبەستێکی ئەو جۆرە گێڕانەوەی نەوشیروانە.

(مولازم عومەر دەمیک بو تاقەتی لە پیشمەرگایەتی چو بو. بە زور خوی رائەکیشاو ، لی ی بو بو بە کوردەناموسی. لە زۆر شتی بچوک دلگیر ئەبو.) ل/۲۳۵

وەک ئەوەی نەوشیروان لەو بینەوبەردەیەدا، بە "ملازم عومەر"ی گرتبێت. هیوادارم ملازم عومەر خۆی لەو سەروبەندە بێتە دەنگ و بە گێڕانەوەی یادەوەرییەکانی ئەوێ رۆژان، رووناکی بخاتە سەر ناوەڕۆکی بارودۆخی ئەوکاتی پێشمەرگایەتی و ئەو شتانەیش رۆشن بکاتەوە کە پەیوەستن بە "ئارام" و بە زانیارییەکانی، خاڵە تەمومژاوییەکان ساغ بکاتەوە.

**بانێکە و دوو هەوا..**

نەوشیروان بەدوای گەڕانەوەی بەرەو مەکۆی سەرکردایەتی "ی.ن.ک"، کەوتوتە گێڕانەوەی هەندێ لەو رەخنە و ئاراستانەی کە لە دەمی ئامرهەرێمبوونەکەی رووبەڕووی کراونەتەوە:

(لە گەڕانەوەماندا کاک خالید راپۆرتێکی سیاسی و پێشمەرگەیی درێژی بو مەکتەبی سیاسی نوسی. گلەیی لە منیش کردبو کە نەرم بوم لە سزادانی ئەوانەدا) ل/٢٣٢

(زور کەس سکالایان لە دەست هەندێ لە فەرماندەی مەفرەزە و بەرپرسەکانی ناوچەکە لەلاکردم و شکاتیان لی ئەکردن. چاوەروان بون سزایان بدەم. بەلام من لەوکاتەدا سزادانی ئەوانەم بە چاک نەئەزانی. چونکە هەندیکیان ئەچونە ناو قم و، هەندیکی تریان یاخی ئەبون.) ل/٢٣٣

(دەرسیم بو پاساودانی موخالەفەکانی ئەیوت، من پیشمەرگەی دەستە سەرەتاییەکانم، جەماعەتی کاک ئارام بوم. کاک ئارام نەماوە بویە شەرم پی ئەفروشی.) ل/٢٣٦

گێڕانەوەکانی نەوشیروان سەبارەت بە هەڵسوکەوتەکانی خۆی وەک فەرماندەی هەرێم، زۆرتر لە فیلمێکی بێدەرهێنەر دەچێ، کە هەموو رۆڵەکان بەر خۆی کەوتوە و کەسێک لەو کادر و فەرماندانەی دیکە، داری لەسەر بەرد دانەناوە! لێرەدا ئەو ئاکارەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە بەشێکی زۆری سەرانی خۆ بەمەسئولزانی کورد، ئەوجا لە هەر پلە و پایەیەکدا بن فرچکیان بەوە گرتووە. ئەوەی لە خەیاڵ و بەپێی ئارەزووی حەزەکانی خۆیان مەیسەر بوبێت، هەر ئەوەیان پێ راست بووە و هەر ئەوەیشیان کردووە. ئەنجامەکەی هەر بە خۆیشیان پاڵەوانی مەیدان بوونە و خەڵکەکەی دیکە پیوازی سپی کردووە!

بەڵێ لە خوێندنەوەی درشت و وردی سەربردەکاندا، نەوشیروان ئەوەی بە لایەوە گرنگ نەبوبێت، باسی رێکخستن و رۆڵی کادرەکانی کۆمەڵە، بزوتنەوە و یەکیتییە و بەئاشکرا و بەتەواوی پشتگوێی خستوە و تەنیا ئەگەر وەک ماددەی شۆخپێکردن لێرە و لەوێ ناوی هێنابن.

هەروەها خوێندنەوەی پەیڤەکانی نەوشیروان ئەوەشمان پێ دەڵێ، کە لە مەنهەجی ئەودا نەبووە، هیچ کەسێک لەوانەی بەرشمری قەڵەمڕەوییەکەی خۆی، کە هەر خۆی بە سەرسەری، عارەقخۆر، پیاوکوژ و غەدرکاری بۆ سەرگیانی خەڵک ناوزەدیان دەکات، سزای پێویستی خۆیان وەرگرتبێت. بە بیانووی ئەوەی نەوەک لێی هەڵگەڕێنەوە، یان بچنە ریزی هێزی "قیادەی موەقەتە"ی نەیار و شتی لەم جۆرە! کەچی بۆ هەمان باندی خاوەن رەفتاری ناشیرینکردنی پێشمەرگەی قیادەی موەقەتە، وەک تای تەورداس کەوتوتە جاڕدانی پاکتاوکردنیان! بەراستی ئەو پراکتیکە لە بنەڕەتەوە، کرۆکی دانەخۆرەکردن و

چاندنی تۆوی گەندەڵیی گیانی هێزی پێشمەرگە و شۆڕش بووە. هەر یەکەیان دەستی چەوری خۆی بە سەری ئەوەکەی دیکە سڕیوەتەوە، کە سەرکردایەتی حیزبە چەکدارەکانی شاخ بە پلەی یەکەم لێی بەرپرسیار بوون.

زۆر چاکم لەبیرە، ئێمە لە ناوچەکانی خۆشناوەتیدا، کادرێکی ڕێکخستنی کۆمەڵەمان لەسەر پڕدانە سەروەرییەکانی ژنی گوندێک لە ئەندامیتی کەرتی ڕێکخستن سزا دا و ڕەوانەی سەرکردایەتیمان کرد. کەچی لەو سەرەوە پاداشتیان کرد و وەک ئەندامی ناوچەی یەکێتی، تەنیا بۆ ڕاپۆرتنووسین لەسەر ئێمە، ڕەوانەی خوارەوەیان کردەوە! بە ڕاشکاوی دەیڵێم لە پەراوێزی پراکتیکی مەسئولێکی وەک نەوشیروان، کە یەک شتی خراپی بۆ خۆی نەهێشتوتەوە، پەرێزی پەشۆکاو و شێواوی کردار و ڕەفتاری بەشێکی زۆری ئەو جۆرە مەسئولانەی دیکە بەدەرنەبووە و مایەی دروستبوونی لەشکری ئاڕئاڕ و مشەخۆر و تالانکەری ناو بەرگی پێشمەرگە بووە و هەرچی دیاردەی دزێوی گەندەڵی و پاشەگەردانی لە لایەن بەناو پێشمەرگە، کادر و مەسئولەکانییان لە دژی خەڵک، شۆڕش، کوردایەتی و ڕێکخستن کراوە، لە گوڵ ناشیرینتری پێ نەگوتوون. کەچی ئێستا لە ڕۆژگاری دەسەڵات و پەیدابوونی سەروەت و سامان، دیاردەی گەندەڵییان کردووە بە کراسەکەی عوسمان! وەک ئەوەی ئەوە ئەوان نەبوونە لە ڕابردوودا، لەو جۆرە ڕەفتارانەیان کردووە، بەڵام پشت و پەنای زۆر لەو جەردە، سەرسەری، پیاوکوژ و زۆردارانە بوونە و بگرە قەڵغانی پاراستنیشیان بوون.

**سەرکردایەتی کۆمەڵە و هەڵبژاردن...**

**(سەرکردایەتی پیشوو، کومیتەی هەریمەکان لە کونفرانس یا کوبونەوەیەکی فراوان دا هەڵ نەبژیردرابون. هەر دوکیان خویان شەرعیەتی تەنزیمییان بە خویان دا بو.) ل٢٥١/٢٥٢**

دیارە هەموو مەبەستی نەوشیروان لێرەدا، ئەوەیە کە هەم پێمان بڵێت، هاوڕێیانی (سەرکردایەتی پیشوو)، کە خاڵە شەهاب و هاوڕێیانی، بۆخۆیان لە بارودۆخێکی ناهەمواری خەباتی ژێرزەمینی و نهێنی شارەکاندا بەرێوەبەری کۆمەڵە بوون. دواتر کۆمیتەی هەرێمەکان، کە "ئارام" و هاوڕێیەکانی دەگرتەوە. وەک دوو گروپ، سێرەی ئەوەیان لێ دەگرێت، کە بە دەستکرد و ناشەرعییان دەخوێنێتەوە و بە سوکوسەلیمی خەڵتانی سڕینەوەیان دەکات. بەبیانوی ئەوەی، کە نە بەکۆنفرانس و نە لە کۆبوونەوەی فراوان هەڵبژێردراون. بەبێ ئەوەی زەحمەت بداتە خۆی، کە ئەو لاپەڕانەی مێژووی کۆمەڵە تاووتوێ بکات و سەرەتایەک بۆ قوربانیدانی ئەو هاوڕێیانە هەڵسەنگێنی، بەتایبەت کە خۆی بەدوای کار و قوربانیدانی ئەوانەوە، بوەتە مەسئولی یەکەمی کۆمەڵە.

بەم روونكردنەوە ناتەواوەی سەرەوە، لە لای خۆیەوە زەمینەی بەشەرعیبوونی خۆی وەک كاراكتێری سەرەكی كۆمەڵە ساغ دەكاتەوە. بەوەی ئەو لە ئەنجامی هەڵبژاردنی كۆبوونەوەی فراوان و كۆنفرانسدا ئەو مەسئولیەتەی بەدەست هێناوە. شرۆڤەكردنی ئەو بابەتە گرنگە بۆ ئەو هاوڕێیانە بە جێ دەهێڵم، كە لەوان رۆژاندا، شەرەفی ئەندامبوونی سەركردایەتی، كۆمیتەی هەرێمەكانیان هەبووە و ئێستایش لەژیاندان.

لە درێژەی ئەو باسوخواسەدا، نەوشیروان هەر بەو روونكردنەوەی سەرەوە دڵی ئاوی نەخواردوتەوە، بگرە زۆرتر باسكی لێ هەڵكردووە و بەم وشانەی خوارەوە، بەڵگەی بۆ خەملێنەكانی خۆی قیت كردوتەوە و دەڵێ:

(كومەلە كومیتەی سەركردایەتی یان مەكتەبی سیاسی یان ناوەندیكی نەبو سەرپەرشتی هەمو ریكخستن بكا. ئورگان و بلاوكراوەی نەبو. كاك ئارام یەک هەولی دابو ئورگان بو كومەلە دابمەزرینی. یەک ژمارەشی لی دەركردبو. ئیتر هیچی بە دوادا نەهات بو.) ل/٢٥٢

سەرانی كۆمەڵە، خاڵە شەهاب و هاوڕێیانی، كە لە دامەزرێنەرانی سەرەكی كۆمەڵە بوون و هەتا رۆژی رۆیشتن بۆ ئێران و گیران و تەسلیمكردنەوەیان بە رژێمی عیراق، سەرپەرشتیكاری مەیدانی رێكخستنەكان بوون. ئەوەندەی ئاویان لەدوو بێرێ هاتبێت، نكۆڵیان لە گەشەكردنی كۆمەڵە نەكردووە، كۆمەڵەیش لەوان رۆژاندا ئۆرگانی رێكخراوەیی خۆی هەبووە بەناوی "ئاڵای سوور" و سێ ژمارەی لێ دەرچوە، كە نەوشیروان كەموزۆر باسی لێوە ناكات.

بەدوای ئەوانەوە "ئارام" و هاوڕێیانی، بە شێوەیەكی كاتی، بۆ گرتنەوەی رێكخستنەكانی كۆمەڵە، لە زروفێكی تەنگەتاوی بێ وێنەدا، كۆمیتەیەكیان بەناوی كۆمیتەی هەرێمەكان دروست كردووە و كۆمەڵەیان بەرێوەبردوە. ئەوەندەی بەندە پێی ئاگادار بێت، هەردو لایان لەو هاوڕێیانە، هەرگیز خۆیان بە سەركردایەتیی شەرعیی كۆمەڵە نەدەخوێندەوە، بگرە هەموو خۆزگە و خەونێكیان بۆ هاتنەپێشەوەی زەمان و زەمینێكی گونجاوی بەستنی كۆنفرانسێک بوو بۆ كۆمەڵە. بە مەبەستی ساغكردنەوەی مەسەلە هەڵواسراوەكان و هەڵبژاردنی سەركردایەتییەكی هەڵبژێردراو. بەڵام رووداو و رێكەوتەكان ئەو چانسەی بۆ نەرەخساندن، كە بۆ نەوشیروان خوڵقا. هەروەها ئەو هاوڕێیانە بەتایبەت خاڵە شەهاب، مامۆستا جەعفەر عەبدولواحید و "ئارام"، هەرگیز باوەڕیان بە ناوی زل و دنێ وێران نەبوو. گەرەكیان بوو كۆمەڵە بە شێوەیەكی ئاسایی و سروشتی گەشە بكات. لە كۆنفرانسی دروست و سروشتی ئەو سەركردایەتییە هەڵبژێردرێ، نەوەک بە پارەسوان و تۆبزی، مانۆڕكردن و یەكتر نەخوێندنەوە. بۆ زانیاری خوێنەریش ئەو ئۆرگانەی "ئارام" و هاوڕێیەكانی لە بارودۆخی ئەوێ رۆژێی شاخ بۆ كۆمەڵە دەریان كرد، ناوی "ئاڵای شۆڕش"

بوو، كە نەوشیروان لە ناوهێنانەكەی قورقەپی لێ كردووە. شەهیدبوونەكەی "ئارام" بووە مایەی زیندەبەچاڵبوونی ژمارەی دووەمی ئەو ئۆرگانە، كە بۆ چاپكردن ئامادە بووە.

**كادرەكانی كۆمەڵە....**

(كادرەكان هەمو گەنجی تازە پیگەیشتو بون. سەرمایەی روشنبیری گشتی و ماركسی و ئەزمونی سیاسی و پیشمەرگەییان كەم بو.) ل/٢٥٢

وەک فۆرم، نەوشیروان راستییەكی حاشاهەڵنەگری پێكاوە، بەڵام بەبێ ئەوەی ناوەڕۆكی ئەو (كەم بو)ە بۆ زەمان و زەمینی خۆی تاووتوێ بكات. ئەگەر هیچ مەبەستێكی ژێرەكی لەپاڵ نەبوایە، دەبوو وەک هاوڕێیەک، سەركردەیەكی لەناكاوی رێكخستنی كۆمەڵە، دوور لە تەنیا دەرخستنی لایەنی لاوازی فیكری، كە دیارە لە بارودۆخی خەباتی ژێرزەمینی و قوربانی لە رادەبەدەر و فیداكاری كەمنموونەی ئەو كادرانە لەوان رۆژاندا، كە وەک خودی نەوشیروان شانسی دەرچوونە ئەورووپا و خوێندنی زانكۆ پێشكەوتوەكانی دونیایان بۆ نەسازاوە، تاكو لە بواری رۆشنبیری و مەعریفیی شانیان لە شانی ئەو بدایە. تەمنیشیان، بێجگە لە خاڵە شەهاب، ئاوقەرانی تەمەنی نەوشیروان نەبووە، كە خاوەنی ئەزموونی سیاسی و پێشمەرگایەتی بوو بن. دەبوو ئەو گیانبازیی و قوربانیدانی ئەو كادرە گەنجانەی لەباوەش بگرتایە، لەنموونەی ئاكارە بەرزەكانی "ئارام"، بەپیر گەشەكردن و قاڵبوونەوەیان بچوبوایە، نەوەک ئاوا یەكلایەنە بۆ ئەو مەبەستەی خۆی، بە رووتوقوتی دەستی خۆی بە خەبات و ماندووبوونیان بسڕێتەوە. هەموو مەبەستەكەی لەوەدا خۆی دەبینێتەوە، كە دەیەوێ بە خوێنەر بڵێت، كە كادرەكانی كۆمەڵە لە رۆژانی بەر لەوەی خودی نەوشیروان دەست بەسەر كۆمەڵەدا بگرێ، لە ئاستێكی نزمی رۆشنبیری و بێ ئەزموونی سیاسی و پێشمەرگایەتی بوون. بەدوای بەدەستەوە گرتنی كاروباری بەڕێوەبردنی كۆمەڵە، كادرەكان گەشەیان كردووە و بوونەتە خاوەن ئەزموون!

(مەلا بەختیار بە هەڵەدلوان چو بو قەرەداغ هەندی لە كادرەكانی كومەڵەی كوكردەوە، وای ئەزانی هەرچی لە قەرەداغ جیگیر بی ئەبی بە سكرتیری كومەڵە.) ل/٢٥٢

لێرەیش نەوشیروان پەیڤی سكرتێری كۆمەڵە بە مەبەست دەهێنێتە گۆڕێ، كە گوایە "ئارام" خۆی بە سكرتێری كۆمەڵە خوێندووەتەوە! بەبێ ئەوەی هیچ بەڵگەیەک لە دەرەوەی "ئارام"، خۆی هیمای شتی لەم جۆرەیان كردبێت، یان "ئارام" لە شوێنێک بە خۆی ئیدیعای شتی لەم جۆرەی بەسەرزماندا هاتبێت!. چونكە دیارە یەكلایانانە لە خەملێدانی خۆی دەڵێ (هەرچی لە قەرەداغ جیگیر بی ئەبی بە سكرتیری كومەلە). ئەوە تەنیا "ئارام" بەر لە شەهیدبوونەكەی ، ناوچەكانی قەرەداخی كردبووە بنكەی سەرەكی سەرپەرشتیكردنی

کۆمەڵە. هەموو یەکێک دەزانی مەبەستی نەوشیروان تەنیا پلارگرتنە لەو مانەوەی "ئارام" لەو ناوچەیە.

ئەگەر بەشێکی زۆر لە هاوڕێ نزیکەکانی "ئارام"، چ لە شاخ و چ لە شاردا، بەژیان نەماون، بەڵام هێشتا چەندان هاوڕێی دیکە دەژین و بۆ ئەو ڕۆژانە شاهیدی زیندوون، لەسەر ئەوەی "ئارام" نازناوی سکرتێری کۆمەڵەی بەسەرزاردا نەهاتووە، تەنیا بە هۆی شایستەیی خۆی و خاوەن ئەزموونی لەمێژینەی کۆڕی خەباتی ناو خەڵک و ئاکاری هێمنانەی دوور لە تەنگەتاوبوون و شێوازی قەناعەتپێکەرانەی پاراو لە توندوتیژی و ڕەتکردنەوە، کە هەموویان بەیەکەوە ببوونە مایەی ئەوەی "ئارام" بەبێ هەر پشتیوانێکی دەرەکی و ناوەکی و بەبێ سێبەری هێچ ڕەمزێکی ناسراوی کوردایەتی، ببوە داینەمۆی ئەڵقەی ناوەندیی هەڵسوڕاندنی کارە سەخت و دژوارەکانی کۆمەڵە.

بێگومان ئەگەر "ئارام" شەهید نەبوایە، زۆر لەگین بوو، قەرەداخ بۆ مرۆڤێکی پێشڕەوی داهێنەر و سەرکردەیەکی هەڵقوڵاوی ناو ئێش و ئازارەکانی خەڵک، بۆ خاوەن هەڵوێستێکی شۆڕشگێرانەی دەموساتی خۆی، "ئارام" ببوایە قەڵای ڕەمزێکی خاوەن بەرهەم و قەرەداخ ببوایە قەڵایەکی بەرچاو و مەکۆی یەکجارەکی شۆڕشگێڕان.

**کۆبونەوەی فراوان و بەشداربووەکان..**

(زۆری ئەوانەی داوام کردبون بێن بۆ کۆبونەوە هات بون. تەنیا ئەوانە نەهات بون کە ئاگادار نەکرابون، یان نەیان توانی بو شوێنەکانی خویان بەجی بهێلن.) ل/٢٥٢

نەوشیروان بە زمانی خۆی و بە کوردییەکی پاراو تەعبیر لە مێتۆدی کارکردنی ئاسایی خۆی دەکات، کە دەڵێ: (ئەوانەی داوام کردبون) بە ڕۆژی ئاشکرا هەر خۆی بە بڕیاردەری ئەوەل و ئاخیر خوێندوتەوە، هەتا لەو بەسەرهاتەی بەستنی کۆبونەوەی فراوانی کۆمەڵەدا، حسابێکی بۆ کەس نەکردووە، لەوەی هاوڕێیان بە شێوەیەکی سروشتی و لە ڕێگای ئۆرگانی ڕێکخستنەوە، کە تا ئەو کاتە کۆمیتەی هەرێمەکان بوون، بۆ ئەو کۆبوونەوە بانگ بکرێن.

لێرەدا مرۆڤ دەبێ قسەیەکیش بۆ ئەو ڕاستییە بکات، کە بەدوای شەهیدبوونی "ئارام"ەوە، کۆمەڵە هەتیو ماوەتەوە، کەسێکی تری بەتوانا و لێوەشاوە لەوێ ڕۆژاندا لە مەیدانەکە نەبووە، کە بۆ پڕکردنەوەی شوێنەکەی "ئارام"، شان لە شانی نەوشیروان بدات، کە یەکەم هەنگاوی داواکردن لە نەوشیروان بووە، بۆ بوونە نوێنەری کۆمەڵە لە کۆبونەوەکانی دۆڵی گۆستێی سەرکردایەتیی یەکێتی نیشتمانی لە ساڵی ١٩٧٧دا،

نموونەیەکی ئەو راستییەیان پشتراستکردووتەوە. هەر لەوی رۆژان ئەو هاوڕێیانە، سەرەتای بەرخوردی دەست و پێ سپییەتی خۆیان بە نەوشیروان شاباش کردووە.

سەرنج
ئەو پەرەگرافانەی لە کتێبی (لەکەناری دانوبەوە بۆ خڕێناوزەنگ) وەرگیراوە و ژمارەی لاپەڕەکانی نووسراون، هەروەک خۆیان گواستراونەتەوە و دەستکاری نەکراون.
هیوادارم لە دەرفەتێکی دیکەی بواری تەمەن، بتوانم خوێندنەوەی رەخنەگرانەی خۆم لە کتێبی (پەنجەکان یەکتری دەشکێنن) بخەمە بەرچاوتان.

کۆمەڵە، لەگەڵ دروستبوونیدا، لاوازیی و چەندان تێکەڵەی فیکری و سترکتوری ڕێکخراوەیی پێکهاتەی لەمێژینەی فۆرم و ناوەڕۆکی بەرچیراوکەی حیزبایەتی کوردی، بە میرات گواستبووەوە ناو پێکهاتەی خۆیەوە. کە خۆی لە نەبوونی سەرکردایەتییەکی ساغبووەوەی ناو بوارەکانی ئایدیۆلۆژی و بەتوانا لە مەیدانی مارکسیزم/ لینینیزمدا، کە ئەودەمە فیکر و ڕێبازی خەباتی بەشێکی گەورەی جیهان بوو لە دژی ئیمپریالیزم و سەرمایەداری، لەپێناوی سۆسیالیزم و کۆمونیزمدا و وەک مژدەیەک شایی پێوە دەکرا. ئەوجا بێئەزموونی ودەستوپێسپیەتی لە بەڕێوەبردنی ململانێی ناوخۆیی و دەرەکی بینیوەتەوە و لەگەڵ تەمەنی خۆیدا درێژەی پێداوە.

ئەگەر دەستپێشکەریی "ئارام" و هاوڕێیەکانی لەدوای بەجێهێشتنی ڕێکخستنی کۆمەڵە لەلایەن سەرکردایەتییەکەی نەبووایە، ئەو ڕێکخراوە لە ساڵی ١٩٧٥ـەوە کۆتایی هاتبوو. پاشان لە پەراوێزی خەباتی چەکداریی بەتوبزی و هەڵگیرسانی جەنگی عیراق – ئێراندا، لە ڕووی چەندایەتییەوە گەشەکردنێکی بەرچاوی بەخۆوە دیتوە و بە ڕووکەش بووەتە جێگای ئومێدی زەحمەتکێش و چینە هەژارەکان. بەڵام لە ناوەڕۆکدا سەرقۆزی بنئالۆز بووە.

ڕۆژەکانی گەشەکردنی ئومێدبەخش و چاوەڕوانکراوی کۆمەڵە، لەسەر دەستی دەستەیەک دەسەڵاتداری ڕیزەکانی خەباتی چەکداری لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، هەتا هاتووە کۆمەڵە بەرەو دەمی داشکانی یەکجارەکی پەلکێش کراوە. چونکە ناکۆکی و نەیارییەکانی نێوان سەرکردەکان بەدوای شەهیدبوونی "ئارام" و بەتایبەتی دوای چونەشاخی پاشماوەی سەرکردایەتیی کۆنی کۆمەڵە؛ ئەوانەی لە ساڵی ١٩٧٩ بە لێبوردنی گشتیی ئازاد کران، لەپاش کۆنفرانسی یەک و دووەوە، کە ناکۆکییەکان زۆرتر شەخسی بووە و مایەی سەرهەڵدانی سەرەتاکانی پوکاندنەوەی کۆمەڵەی بەدەمەوە بووە، لەسەر دەستی ئەوانەی سواری ڕەوتی شەپۆلی داماڵینی کۆمەڵە بوون. هەڵگەڕانەوە لە هەموو ئەوسەرەتا فیکرییانەی کۆمەڵە خۆی پێ باداوە، بەزەقی دەرکەوتوون و بەرنامەڕێژی بۆ کراوە و بە عەمەلی پیادە کراوە.

ناکۆکیەکانی نێوان مەسئولەکانی کۆمەڵە زۆرتر، چاوبەیەکهەڵنەهاتن و دروستکردنی تۆمەتی بێبنەما بۆیەکتری بووە، کە بۆ سەرەتاکانی سوخەتی ناتەبایی ناوخۆیی سەرانی کورد بەگشتی دەگەڕێتەوە. من یەکبەخۆم کە هێشتا نەچووبوومە شاخ، هەستم بەو نارێکییانەی سەرکردایەتی کۆمەڵە نەدەکرد، بەتایبەت لە ڕۆژی گرتنی یەکەم کۆنفرانسی کۆمەڵە، لە بەهاری ساڵی ١٩٨١دا، کە بە کۆنفرانسی مالیمۆس ناسراوە و ئەو کۆنفرانسەی بە هۆی تەقینەوەی ناکۆکییە شەخسییە بێ بنجوبنەواکانی هەر جۆرە بیروبۆچونێکی

فیکری سەرچاوەی گرتبوو. کۆنفرانس لەجیاتی ئەوەی سەرکردایەتییەکی هەڵبژێردراو بۆ کۆمەڵە بەرهەمبهێنێ، لێرەوە ڕۆژەکانی فەشەلی یەک لەدوای یەکی "کۆمەڵەی مارکسی-لینینی" بە زەقی دەرکەوتوون و ناڕێکییەکان بە ئاشکرا دەبینران.

"هێڵی زیندان"، ئەوانە بوون کە لە زیندانی بەعس بە پاشۆڵێک گومان و بەڵێننامە و بە لێبوردنی گشتی دەرباز ببوون و ماوەیەکی کەم بوو هاتبوونە شاخ. هەرچەندە هەموو پلە و پایەکانی ئەندامێتی کۆمەڵەیان وەک خۆی پێدرابووەوە! بەڵام لە ڕووی مەیدانی خەباتی پێشمەرگایەتی، تا ڕادەیەکی زۆر خۆیان بە کەمدەسەڵات دەزانی. ئەو دەمە لە دەوروبەری مەڵبەندی سەرکردایەتیی یەکێتی و کۆمەڵەدا، کەوتبوونە هۆنینەوەی بازنەیەکی هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی هێز و توانا لە پێناوی جێپێلەقکردنی برادەرانی دەسەڵاتداری ناو هێزی پێشمەرگە.

دیارە نەوشیروان مستەفا وەک کاراکتێری هەرە بەهێزی ئەوێ ڕۆژێی دوای مەرگی "ئارام"، لەو بارودۆخەدا، لەجیاتی ئەوەی وەک مەسئولێکی دونیادیتە و بێ ئەم لا و ئەو لای لایەنگری و لەپێناوی بەڕێوەبردنی کۆمەڵەدا بەو ئاقارەی کە خزمەت بە گەشەکردنەی کۆمەڵە دەکات، بەشێوەیەکی نا بەرپرسیارانە، بە خشکەیی کەوتبووە پشتگیری و هاندانی "هێڵی زیندان"، کە هەتا ڕۆژانی کۆنفرانسیش بەندە یەکێک لەوانەی لەو بازنەیەدا خۆم دەدیتەوە، شتەکانم بە زەقی هەست پێ دەکرد.

هەروەها لایەنەکەی دیکە کە خاوەن ماندووبوونێکی لە ڕادەبەدەر و کوڕی ڕۆژانی تەنگانەی گرتنەوەی کۆمەڵە و هەڵگیرسانەوەی خەباتی چەکداری بوون، ئەوانە بوون کە پێیان دەگوترا، "پاشماوەی کۆمیتەی هەرێمەکان" و تابلێی بەربێن تەسک و خاوەن هەستی ئەوپەڕی ڕەهابوون بوون. بەکورتی، ئەو دەمە سەرەتای ئەو ناکۆکییە شەخسیانە، هیچ سەرچاوەیەکی فیکری نەبوو، بەڵکو مەسەلە فیکرییەکان دواتر بە شێوەیەکی تا ڕادەیەک دەستکرد لێرە و لەوێ رایەڵ کران. سەرەتاکانی بیروبۆچوونی عیراقی و کوردستانیبوون، وەک کاڵایەکی گرانبەها کرایە بەر جەستەی ناتەباییی شەخسیی نێوان مەسئولەکان و ڕووی حەقیقی ناتەباییی پێ داپۆشرا.

ئەگەر کەسایەتی مام جەلال نەبوایە، هەر بەدوای کۆنفرانسی یەکەوە، هەندێک لەو مەسئولانە لە کۆمەڵە تەرە دەبوون، بەڵام بەهەوڵدانی ئەو سەرلەنوێ لە سەرکردایەتی کۆمەڵە پەرچ کرانەوە، بەبێ ئەوەی هیچ یەکێک لە ناتەباییەکانیان چارەسەر بووبێت. بە تایبەت لەنێوان بەرەی نەوشیروان و هێڵی زیندان لە بەرامبەر سالار بە پلەی یەکەم و مەلا بەختیار بە پلەی دووەم. بە جۆرێک ئەگەر لە کۆبوونەوە ڕەسمییەکان بووبێت، هەتا زۆر بەدەگمەن نێوانیان هەبووە و گفتوگۆیان بەیەکەوە کردووە.

لەو سەروبەندەدا هەر هاورێیەکی کۆمەڵە هاتوچۆی هەر بارەگا و دەزگایەکی کردبێت، یەکسەر مۆری کەوتنە بەرەی ئەو کەسە مەسئولەی لێدراوە و لە لایەنەکەی دیکەوە نەیاریی لەگەڵ کراوە. بە جۆرێک زەمینەی ئەوەی خۆش کردووە هەر لایەک بۆ خۆی بەدوای زەمینەی ناکۆکیی فیکری بگەڕێ. فەرەیدوون عەبدولقادر لەو بارەیەوە ڕۆڵی دیاری هەبووە، کە بە چەند نووسینێک کەوتە شەنوکەوکردنی کوردستانیبوونی یەکلایەنیی کۆمەڵە و توانج و پلارگرتنە لایەنەکەی تر و ناوزەدکردنیان بە عێراقچی! بێگومان ئەو لایەنەیش لە جیاتی وەڵامدانەوەی بابەتییانەی ئەو ناوزەدکردنە، وەک پەرژینێک بۆ خۆگەرمکردنەوە و داکۆکی لەخۆکردن، کەوتنە سەرەداو لە تەشیکردنی خەباتی سەرتاسەریی کرێکاران و یەکێتیی چینی کرێکار و ناونانی لایەنی دیکە بە وردە بورژوازی و بورژوازی سازکار و شتی لەم جۆرە. هەردوو لا لە پراکتیک و بونیادی کەسایەتی و سەرچاوەی فیکر و هەتا پراکتیکی رۆژانە و لە دونیای فانتازیای خۆیان، یەک جۆرە مەلەیان دەکرد. درێژەپێدانی نەیاری شەخسی بووە پەیامێک کە دەیان کادر و هاورێی دڵسۆزی کۆمەڵەی پێ سەرگەردان و مایە پووچ کرد.

لەپاش هەموو نەگبەتییەکانی ئەو کێشمەکێشە ناوخۆییەی مەسئولەکانی کۆمەڵە، کە بە حەق بووە سەرچاوەی بەرپابوونی هەڵمەتێکی فراوانی دیراسەکردن، خوێندنەوە و خۆماندووکردن بۆ تێگەیشتنی مارکسیزم و لینینزم لە ریزەکانی خەباتی شاخدا، بەتایبەت لە ناو کادرە خوێندەوار و حیزبییەکاندا، بە جۆرێک سەرتاپای بنکە و شیرازەکانی رێکخستنی لە شاخ گرتبووەوە. بەڵام بۆ رێکخستنی شارەکان لە سنورێکی زۆر تەسک دابوو. چونکە زۆربەی رێکخستنەکانی ناو شار راستەوخۆ پێوەندییان بە خودی "نەوشیروان"ەوە هەبوو.

نەشونماکردنی مەسەلە فیکرییەکان و نووسینەکان لەسەر یەکتری، رۆژ لەدوای رۆژ لە برەو دابوون. لەگەڵ دروستکردنی کەرتەکانی رێکخستنی کۆمەڵە لەناو هێزی پێشمەرگەدا، دیسانەوە ئەگەرچی لە وەڵامی ئەو گەشەکردنە بەرفراوانە چەندایەتییەی کە هێزی پێشمەرگەی یەکێتی لە پەراوێزی شەڕی عیراق _ ئێران بەخۆوەی دیتبوو، دەبوو شیرازەیەکی رێکخراوەیی کۆمەڵە لەناو خەڵکی دەرەوەی شارەکانیشدا، بە ئاشکرا لە سێبەری هێزەکانی پێشمەرگەوە، گەشە بە رێکخستنی خۆی بدات. بەڵام لەو زەمان و زەمینەی لەدایکبوونی کەرتەکانی رێکخستندا، لەگەڵ خۆیاندا زەمینەیەکی پڕ بینەوبەردەی ساغنەکراوەی فیکری و ئایدۆلۆژییان سەبارەت بە مارکسیزم- لینینزم و مەسەلەی نەتەوایەتی و خەباتی سەرتاسەری چینی کرێکار و مەسەلە نێونەتەوەییەکان سازاندبوو.

که تاڕادەیەکی زۆر لەگەڵ کەشوهەوای سەرکردایەتی زاڵی کۆمەڵە بۆ ئەوەی چاکتر و بەرمەیدانتر ئەو چوارچێوانە تەتەڵە بکات، یەکنەدەهاتەوە.

لەبری ئەوەی وەک سەرەتایەکی نوێ مامەڵەیان لەگەڵ بکات، نەوەک هەر زۆر لە دواوە بوو و بگرە خودی سکرتێری کۆمەڵە لەگەڵ هەموو ئەو بارودۆخە ماندەرەی بۆی خوڵقابوو کە ئیدارەیەکی بەرچاو ڕوونانەی ئومێد بەخشی ڕێکخستنی کۆمەڵە بدات، پەیتا پەیتا کەوتە دەربڕینی هەست و نەستی ڕاشکاوانەی خۆی، کە ئەو هیچ باوەڕێکی بە مارکیسیزم- لینینیزم و مەسەلە ئایدۆلۆژییەکانی کۆمەڵە نییە، کە خۆی پێ بادەدا. کەوتە لەباربردنی سەرەتاکانی ئەو کەشە نوێیە، بەبێ ئەوەی لە لایەن کۆنفرانسەوە ساغکرابنەوە، بگرە هەر هەموو سەرەداوەکان بۆ ڕۆژی خۆی دواخرابوون.

نەوشیروان بە پراکتیک کەوتە بەربەرەکانێکردن و هەتا ڕاوەدوونانی ئەو کادر و هاوڕێیانەوە، کە بە ئاشکرا بانگەشەی ئایدۆلۆژی مارکیسیزم- لینینیزمیان دەکرد. بەڵام لەو لایشەوە هەوادارانی مارکیسیزم- لینینیزم شارەزاییەکی ئەوتۆیان نەبوو کە لە ئاستی گەمەی مەیدانەکەدا بن. لە بواری جورئەتی شۆڕشگێرانەدا، تا بڵێی کاڵفام بوون، کە ڕاشکاوانە ڕوو بەڕووی کارەکانی نەوشیروان و هەوادارانی ببنەوە. هەموو لایەک بۆ خاتری گەشەکردنی (ی.ن.ک) و بەرژەوەندی تایبەت و تاقەتچوونی هەندێک، لە خەباتی پێشمەرگایەتی هەر خۆیان بە شتەکان هەڵواسیبوو.

بەکورتی کۆمەڵە سەرکردەیەکی لێهاتووی لە نموونەی "ئارام"ی ئەوێ ڕۆژگاری نەبوو، کە مەسەلەکان بۆ ئاقاری یەکجارەکیی ساغبوونەوە، زیاتر لە یەکتر نزیکبوونەوە و گیانی هاوڕێیانەی خزمەتکردن بە کۆمەڵە بەڕێوە ببات. تەنیا مابوەوە سەر ئەوەی هەر یەکە لە لای خۆیەوە، بەپێی خەملێدان و میزاجی خۆیەوە داری لە مەسەلەکان وەردەدا. بۆ مێژوو دەڵێم هەتا ناچارکردنی بەشێک لەو هاوڕێیانەی لەپاش کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە، بەتایبەت لە ساڵی ١٩٨٥ دا، هیچ ئەندام و کادرێکی کۆمەڵە ڕێکخستنی جیاوازی لەناو ڕێکخستنی کۆمەڵە نەبووە. بەڵکو ئەوەندەی من پێی بزانم، کە لەناو چەقی دژایەتییەکاندا بووم، کەسێک بیری لەو جۆرەی نەبووە و مەنهەجی کارکردنی نەبووە، بەڵکو هەتا کۆنفرانسی سێیەمیش ئێمە لەبەرامبەر ئەو هێڵەی تر، کە زۆربەی کۆمەڵە بوون لە فۆرم دا، خۆمان بۆ ئەوە تاودابوو کە کۆنفرانسی سێ بکرێتە کۆنفرانسی وەرچەرخان لە ساغکردنەوەی فیکر، بەرنامە و مەسەلەکانی دیکە و سەرکردایەتییەکی تۆکمە و شایستەی بۆ هەڵبژێردرێ.

ڕاستە لە ڕووبەڕووبوونەوە و بەرپەچدانەوەی هەڕوگیفی لایەنی دەسەڵاتداری کۆمەڵە و بڵاوکردنەوەی چەندان وتاری تانە ئامێز بە مارکسیزم- لینینیزم و گاڵتەکردن بە

سەروەرییەکانی خەباتی چینایەتی، چەند کادر و ئەندامێکی کۆمەڵە، بە تایبەت لە ناوچەکانی هەولێر و سلێمانی و هەتا لەناو بنکەکانی سەرکردایەتی، چەند وتارێکی دەستنووسیان بەناوی هاوڕێیانی کۆمەڵە، سەبارەت بە مارکسیزم- لینینیزمبوونی کۆمەڵە، شەڕی نگریس و بێهودەی ناوخۆ، شەڕی بەرەکانی ئێران و موفاوەزاتکردن لەگەڵ ڕژێم و چۆنیەتی پێکهێنانی پارتی پێشڕەوی زەحمەتکێشانی کوردستانی باشوور و مەسەلە دیموکراتی و چینایەتییەکان و ناوەرۆکی خەباتی چەکداری، بڵاو کردەوە.

بێگومان بڵاوبوونەوەی ئەو نووسینانە بە شێوەیەکی فراوان سەکۆیەکی باشی بۆ لایەنی سەرکردایەتیی دەستڕۆیشتوی کۆمەڵە ڕەخساند، کە چەپ و ڕاست بکەونە هۆنینەوەی تۆمەتی عیراقچێتی[37] و دروستکردنی ڕێکخستن لەناو ڕێکخستنی کۆمەڵە و چەندان تۆمەتی ناراستی دیکە، بەبێ ئەوەی تاکە یەک بەڵگەی ساغکراوە هەبووبێت.

ڕاستە لەناو هاوڕێیانی کۆمەڵە، بەتایبەت خوێندکارەکانی زانکۆ کە هاتبوونە شاخ، تاکوتەرا هەبوون، لەژێر کاریگەری چەندان ڕێکخراوی چەپی بچوکی ژێر کاریگەری بانگەشەکانی کۆمەڵەی ناو حزبی کۆمۆنیستی ئێران، یان چەپەکانی دیکەی ئێران، لێرە و لەوێ باسیان لە باوەڕی خۆیان دەکرد سەبارەت بە عیراق و کوردستان و مەسەلە فیکرییەکان. ئەوانە لەلایەن هەندێ هاوڕێی کۆمەڵەوە داڵدە درابوون و دژایەتی کردنیان بە ڕاست نەدەزانرا. ئەمە ببوە مایەی کوفر و لادان لەو ویست و ئارەزووانەی سەرکردایەتی دەسەڵاتداری کۆمەڵە بیری لێ دەکردەوە، لە پێناو شکاندن و شەڕپێ فرۆشتنی هاوڕێیانی خۆیان.

زۆرچاکم لەبیرە لە کۆنفرانسی دووەمی کۆمەڵەدا، من کە ئەندامی کۆنفرانس بووم و لە ساڵی ١٩٧٠وە لە ریزی کۆمەڵەدا بووم. بۆ خەبات و گەشەکردنی کۆمەڵە قوربانی زۆرم دابوو، بەتایبەت لە ڕۆژانی سەرنوێی ڕابوونەوەی کۆمەڵە، لە نێوان ساڵانی ١٩٧٥ – ١٩٨٠دا، لەپاڵ چەندان هاوڕێی دیکە ڕۆڵی ئاشکرام هەبووە و وەک کورە هەژارێکی ڕەشوڕووت، لە کۆنفرانس ئەوەم پێقبوڵ نەکراوە کە ئاغایەک، لە دوای هاتنەدەرەوە بۆ پێشمەرگایەتی، بەبڕیارێکی خشکەیی، دەکرێتە ئەندامی کۆنفرانس و بە ڕاشکاوی ڕەخنەی خۆم گرت. لە لایەن هاودارانی دەسەڵاتدارەکانەوە، هەر ئەوەتە نەکەوتنە گوللە بارانکردنم و بە جۆرێک دژایەتییان کردم، کە لە کاتی هەڵبژاردن و دەنگدان، بە ڕۆژی ئاشکرا بانگەشەیان کردبوو، کە هیچ ئەندامێک دەنگ بە من نەدات. هەتا ئەو هاوڕێیانەشیان

---

[37] دیسانەوە بۆ مێژوو دەڵێم، تا دروستبوونی ئاڵای شۆڕشیش، ئەو مەسەلەیە بە خێتۆخۆڕایی بە ملمان داهێنرا و خۆیشمان لەو ئاست، جورئەتە ڕاشکاوە نەبووین کە بەرپەرچیان بدەینەوە، دەنا ئەو تۆمەتی عیراقچێتی هەتا لەناو ئاڵای شۆڕشیش ئاسەوارێکی لێنەکەوتەوە.

تێگەیاندبوو کە لە شارەوە بە نهێنی بۆ کۆنفرانس هاتبوون و چەند دانەیەکیان لە نزیکەوە هاوڕێی شەخسی خۆم بوون و پێیان گوتم، کە ئەو دەمەی ناوی تۆمان نووسیوە، لەلایەن دەسەڵاتدارەکان ناوەکەم رەشکراوەتەوە. ئەوە نموونەی خودی دەسەڵاتدارەکانی ناو کۆمەڵە بوو. دواتریش هەر لەلایەن ئەوانەوە چەندان سەرتیپ، مەسئولی عەسکەری و پێشمەرگە راسپاردراوە بۆ تیرۆرکردنم. بەڵام ئەوان ئامادە نەبوونە یەکێکی وەکو من بۆ خاتری چاوپێهەڵنەهاتن و جیاوازی بیر و بۆچوون بکوژن.

ناتەباییەکان بە جۆرێک پەرەیان سەندبوو، دەسەڵاتدارانی ناو کۆمەڵە، تێکڕای ئەو هاوڕێ و ئەندامانەیان پشتگوێ خستبوو، کە لەگەڵ بیر و بۆچوونەکانی ئەوان یەک نەدەهاتنەوە. ئەو هاوڕێیانەیش ئامادە نەبوون وەک راپۆرتنووس و ئەڵقەلەگوێ هەڵسوکەوت بکەن. من یەکێک لەوان بووم، کە گوایە ئەندامی مەڵبەندی کۆمیتەی بەڕێوەبەری کاروباری یەکێتی بووم لە ناوچەکانی هەولێر و کارەکانی ڕاگەیاندنی مەڵبەندم رادەپەڕاند. بەدرێژایی ئەو ماوەیە، چ لە لایەن خودی کەرتەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵەوە، کە لە سنووری مەڵبەندەکە بوون، چ لە لایەن ناوەندیی کۆمەڵەوە، ڕۆژەک لەڕۆژان بە نووسراو، یان بە شەخسی لە منیان نە پێچایەوە. بگرە زیاتر سیخوڕیم لەسەر دەکرا و ئەوەندەی بۆیان کرا بەربەرەکانییان کردم. بەڵام نەوەک هەر سەرکەوتوو نەبوون، بگرە تەنیا شەرمەزارییان بۆ مایەوە. چونکە بەندە لەگەڵ چەندان هاوڕێ و دۆستی کۆمەڵە لەو بەشی ڕاگەیاندنە، یەک زنجیرە چالاکی ئەوەندە ڕێکوپێک و سوودبەخشمان ساز دابوو، کە هەم لە لایەن بەشێکی زۆری جەماوەری کۆمەڵە و یەکێتی، لە ناوچەکانی هەولێر و هەمیش لەناو کۆمەڵانی خەڵک دەنگی دابووەوە و ببوینە جێگا متمانە و بنکەی ڕووتێکردنی خەڵک. کاتێکیش هەستم کرد مەڵبەندەکە لە لایەن سەرکردایەتیی کۆمەڵە بەگشتی مایەی پشتگیریکردن نییە، ئارەزوومەندانە لە ئەندامێتی مەڵبەند دەستم هەڵگرت و چووم لە گوندی نازەنینی خۆشناوەتی دانیشتم.

گرینگترین ئەو مەسەلانەی هاوڕێیان باسمان دەکرد، بریتی بوون لە:

- زیاتر، گەرمتر و ڕاشکاوانەتر پابەندبوون بە سەرەتاکانی مارکسیزم – لینینزم لە کاروباری ڕێکخراوەییدا.
- بڵاوکردنەوەی مەسەلە دیموکراتییەکان و خولقاندنی سەرەتاکانی گیانی دیموکراتی لەناو کۆمەڵەدا، لەسەرەوە بۆ خوارەوە و بەربەرەکانیکردنی تاکڕەوی، خۆسەپاندن و رەتکردنەوەی لایەنی دووەم.

- بەربەرکانیکردنی شەڕی بێهودەی ناوخۆ و هەوڵدان بۆ لە یەکتر نزیکبوونەوە لەگەڵ هێزە چەکدارەکانی تری گۆڕەپانی کوردستان بۆ پێکەوەنانی یەکڕیزی و یەکێتی کارکردن لە ڕووبەڕووبونەوەی هێزەکانی ڕژێمی عیراقدا.
- بەلاوەنان و دوورکەوتنەوە لە دەستتێکەڵکردنی شاراوە لەگەڵ دامودەزگای سیخوڕیی ڕژێمە داگیرکارەکانی کوردستان و هەروەها ڕەتکردنەوەی هەر جۆرە گەمەکردنێکی موزایەدەکارانە، لە بەشداریکردن و چوونە بەرەی شەڕی دژ بە هێزی داگیرکەرێکی دیکەی کوردستان و قوربانیدانی بەخۆڕایی.
- قوڵکردنەوەی پێوەندیی شۆڕشگێڕانە بە کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانەوە و بەشداریپێکردنی خەڵک لە مەسەلە چارەنووسسازەکان و پرسپێکردنیان.
- ساغکردنەوەی مەسەلەی کوردستانی، یان عیراقیبوون بە گیانی هاوڕێیانەی دوور لە ڕەتکردنەوە و بەلاوەنانی یەکتری.
- بایەخدان بە ڕێکخستن و سەرپشککردنی پرینسیپەکانی ڕێکخراوەیی مارکیسیزم-لینینیزم بۆ بەڕێوەبردنی کۆمەڵە.
- هێنانەپێشەوەی کادرە شۆڕشگێڕ و کورە جەربەزە ئازاکانی خەڵکی ڕەشوڕووت لە پێدانی مەسئولیەت و پەراوێزکردنی خەڵکی بێ توانا و ماستاوچی و گەندەڵ. واتە خەڵکی شایستە، لە شوێنی شایستە دابنرێ.
- بەربەرەکانیکردنی دیاردەی جەردەیی و ڕاوڕووت و سیماکانی ناشیرنکردنی کادر و پێشمەرگە.

لەپاش ڕووداوە نائاسییەکانی کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە و دەرچوونی زیاتر لە ٧٠ ئەندامی کۆنفرانس بۆ دەرەوەی هۆڵی کۆنفرانس، لەسەر چۆنیەتی تاوانبارکردن و شت خستنە سەر ئەو هاوڕێیانەی پەیوەست بوون بە مارکسیزم- لینینیزمەوە و شەرپێفرۆشتنیان، کە گوایە ڕێکخستنمان لە ناو ڕێکخستنی کۆمەڵەدا دروست کردووە. دوای ئەوەی چەندان هاوڕێی بێلایەن، لە نموونەی شەهید ئازاد هەورامی، ملازم عومەر و دلێری سەید مەجید بۆ هێمنکردنەوەی بارودۆخەکە و قەناعەتپێکردنی مەلا بەختیار و ڕازیکردنی بۆ گەڕانەوە بۆ ناو کۆنفرانس، کەوتنە نێوان، بە شێوەیەکی پینەوپەڕۆکردن هەڵبژاردن کرا و تەنیا مەلا بەختیار بۆ سەرکردایەتی کۆمەڵە دەرچوو. بەلام دەسەلاتدارەکانی ناو کۆمەڵە، بە هۆی دەرچوونی زۆربەیان بۆ سەرکردایەتی، زیاتر بواریان بۆ خوڵقا. بە پێچەوانەی ئەو بەڵێن و گفتانەی دابوویان بۆ هێمنکردنەوە و بەخۆداچوونەوەیەکی بەپرسانە لە چارەسەرکردنی پشێوییەکانی ناو ڕیزەکانی کۆمەڵە،

زۆر بە ئاشکرا و بەپێی پلانێکی ئامادەکراو، بەدوای کۆنفرانسەوە کەوتنە لادان و دوورخستنەوەی چەندان کادر و هاوڕێی تێکۆشەری کۆمەڵە لەناو ڕیزەکانی ڕێکخستن، لە شاخ و شاردا. بەشێوەیەکی زۆر ڕەق و دوور لە هەموو گیانێکی هاوڕێیانە، دادگایەکی لێکۆڵینەوەیان بۆ دەستەیەک لە هاوڕێیانی ناو شار و شاخ پێک هێنا. چەندجارێک لێکۆڵینەوە و لێپرسینەوەی بێ بنجوبنەوانیان لەگەڵ کردن، بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکیان بەدەستەوە بێت، یان شتێکیان بۆ ساغ ببێتەوە، بەڵکو تەنیابە بە مەبەستی تۆقاندن و هەڕەشەکردن بوو لەو هاوڕێیانە، کە دەبێ واز لە بیر و بۆچوونەکانی خۆیان بهێنن و وەک پاکانە و پەشیمانی، خۆیان بخەنە سەر قاچوقولی دەسەلاتدارەکانی کۆمەڵە و جارێکی دیکە لەو جۆرە هێڵەی کۆمەڵە لانەدەن.

ئەو دادگایە، نەوەک هەر هیچی بۆ ساغ نەکرایەوە و بە هیچ سەرەداوێک لەو تۆمەتانەی سازیان دابوو بۆ ئەو هاوڕێیانە بەشتێک نەگەیشتن، بگرە هەر ئەنجام و بڕیاری ئەو دادگایەشیان نەدیتەوە. ئوسلوبی هەڕەشاوی و ترساندنەکەیان، نەوەک هەر نەبووە پێکانی مەبەستەکانیان، لە گوێڕایەڵیی ئەو کۆمەڵە هاوڕێیە، بەڵکو زۆرتر بووە مایەی هاندانیان، کە بە ڕاشکاوی لە شوێنی خۆیان لەناو کۆمەڵەدا هەڵوەستە بکەن.

دیارە لەو بارەیەوە، نابێ کاریگەریی و کاردانەوەی خراپی مەسەلەی خەباتی چەکداری لەسەر هاوڕێیان، کە زۆربەیان دڵسۆزیی، وەفاداریی و خۆشەویستییان بۆ یەکتری لە لایەک و جۆری شالاو و هەڵمەتی ڕاوەدوونانیان لە لایەن دەسەلاتدارانی کۆمەڵەوە لە لایەکی ترەوە، کە بەزۆری زۆردارەکی ناچاری کردن بیر لە خۆیان بکەنەوە.

لێرەوە بیرۆکەی ئەڵقەکانی ڕۆشنبیری، سەرلەنوێ وەک گەڕانەوە بۆ سەرەتاکانی دروستبوونی کۆمەڵە لە ساڵی ١٩٧٠ – ١٩٧٤ بووژایەوە. چەندان زنجیرە لە شاخەکاندا دروست بوو و کەوتینە خۆمان. بەبێ گوێدانە هەر جۆرە مەترسی و هەڕەشەیەکی دەسەلاتدارانی کۆمەڵە، کە بە پشتیوانی هێزی پێشمەرگەوە، ئەوەی بۆیان کرا درێخییان نەکرد. دەتوانم بڵێم لەو سنوورەی خۆم پێی ئاگادار بووم، لە ناوچەکانی هەولێر، لەناو شارەکاندا یەک دەسرازە ئەڵقەی ڕۆشنبیری و پێوەندیی هاوڕێیانە سازبوو.

لەو سەروبەندەدا موفەوەزاتی یەکێتی لەگەڵ ڕژێمدا، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ڕوو لە نشوستی و بەربەستی زیاتر ببوو. ئێمە لە ناوچەکانی هەولێر، بۆ ناو شار و هێزەکانی پێشمەرگە، دوو شێوازی تەواوکەری یەکتریمان گرتبوو. بریتی بوون لەوەی بۆ ناوشارەکان، خەبات بۆ ئەوە بکرێت ڕوو لە خەڵکی نوێ، گەنجەکان بەگشتی، ئەوجا خەڵکی ڕەشوڕووت، کرێکار و زەحمەتکێشەکان بکرێت. بۆ پێکەوەنانی گروندێکی چینایەتیی ڕاستگۆ، پاشان دیراسەکردنی فەلسەفەی مارکسیزم – لینینزم، ئابووری،

مێژووی کورد، جوگرافیای کوردستان و شارەزایی پەیداکردن لە بواری مەسەلە کۆمەڵایەتی، سیاسی و ڕێکخراوەییەکان، کە دەستەبەری مەیدانخۆشکردن بێت بۆ پێکەوەنانی ڕێکخراوێکی نوێ. لەناو هێزی پێشمەرگەیشدا، بازنەسەرەتاییەکانی ڕۆشنبیری بۆ هەمان مەبەست بە شێوەیەکی زۆر نهێنی دروست بوو. لە ناوچەکانی هەولێردا، وەک پێویست هەتا گوێمان بەو بیر و بۆچوونەکانیٚ خۆمان نەدا، پێمان باش بوو کە هەر هاوڕێیەکی کۆمەڵە و ناو هێزی پێشمەرگە، ئەگەر لەگەڵ بیر و بۆچوونەکانی ئەو بازنە ڕوشنبیرییانە دایە، دەبێ لەپێشەوە لە ئەندامێتی کۆمەڵە و یەکێتی وازبهێنێ و بەڕەسمی دەستیان لێ هەڵگرێ. ئەگەر چەکەکەیشی هیی ئەوانە تەسلیمیان بکاتەوە، بەڵام نە ئێمە خۆمان پێی پابەند بووین، نە توانیمان هاوڕییانی ناوچەکانی سلیمانی، بەتایبەتی بەو سەرەتایە دروستە قەناعەت پێبکەین.

ئێمە لە ناوچەکانی خۆمان خەریکی کاری خۆمان بووین. بەتایبەت بەندە لەدوای دەرچوونی فەرمانی گرتن و کوشتنم لەلایەن سەرکردایەتیی ئەو کاتی کۆمەڵەوە، زۆر بە نهێنی و شاراوەیی هاتووچۆی ناوچەکانم دەکرد. لەگەڵ هاوڕێیە هاوبیرەکانمان، بە پراکتیک زنجیرەیەک کۆبوونەوەمان ساز دابوو. ئەوەی بیرمان لێ نەکردبووەوە، دەرچوون بوو لەناو یەکێتی، بە تایبەت لەناو هێزی پێشمەرگەدا، چونکە سەرەتاکانی دەستپێکردنەوەی شەڕ لەگەڵ ڕژێم بە ئاشکرا دەرکەوتبوو.

بیرمان لەوە دەکردەوە، هاوڕێیانی ناو هێزی پێشمەرگە وەک ئیلتیزامی ڕێکخراوەیی، هەموو پێوەندییەکی ڕێکخراوەیی بە کۆمەڵە و یەکێتی بپچڕێنن و تەنیا وەک پێشمەرگەیەک لەناو هێزی یەکێتی بمێننەوە. بەڵام نە دەسەڵاتدارەکانی ناو کۆمەڵە دەستیان لە ئازاردان و سزادانی هاوڕێیان هەڵگرت و نە هاوڕێیانی ئێمەیش لە ناوچەکانی سلیمانی، بەتایبەت ئەوانەی لە بنکەکانی سەرکردایەتیی یەکێتی و ناوچەی قەرەداغ بوون، ئەوەیان قبووڵ بوو، کە بەڕەسمی واز لە ئەندامێتی ڕێکخراوەیی ناو کۆمەڵە و یەکێتی بهێنن. زۆر چاکم لەبیرە، بەر لە جاڕدانی ئاڵای شۆڕش، لە نامەکانی خۆماندا وەک ڕا و بۆچوون بۆ ئەو هاوڕێیانەی ناوچەکانی "سلیمانی"مان نووسیبوو، با لە بنکە و دەزگاکانی یەکێتی و کۆمەڵە بکشێنەوە. سەرەتا بێلایەنیی خۆیان جاڕ بدەن و وەک مرۆڤێکی سەربەخۆ خۆیان بناسێنن، لەپێناوی ئەوەی هەم لە لای خۆمانەوە ئازاد بین کە لە ڕۆژانی دواتر بەپێی بیر و بۆچوونەکانمان، چی دەکەین، هەمیش هەموو جۆرە بینەوبەردە و پەڵە هەوری ڕەشی پروپاگەندەکان بڕەوێننەوە، کە گوایە ئێمە ڕێکخستنمان لەناو ڕێکخستنی کۆمەڵەدا دروست کردووە. بەڵام ئەو هاوڕێیانە گوێیان بەو بیر و بۆچوونانە نەدا. ڕووداوەکانیش ئەوەندە خێرا و بلەز هاتن، لە دایکبوون و جاڕدانی دروستکردنی "ئاڵای شۆڕش" زۆر بە نائاسایی

و ناسروشتی راگەیانرا. دیارە دەسەڵاتدارانی ناو کۆمەڵە، وەک ئەوەی هەنگوینیان لە دار دۆزیبێتەوە، بە پێچەوانەی هەر جۆرە ئازادییەک و هەر وەفایەکی سەرەتایی گیانی هاوڕێی و بە دیموکراتی یەکتر قبوولکردن، بێپەروا کەوتنە جێبەجێکردنی پلانی لەباربردنی ئەم لەدایکبوونە بلەز و خەوناوییە. بە شێکی زۆری ڕێکخستنەکانی "ئاڵای شۆڕش"یان لەبری زۆربەی مەسئولەکانییەکەوە لە پەلوپۆ خست.

زۆرجاران بۆ شکاندنی گیانی "ئاڵای شۆڕش" هەزارویەک بانگەشەی ئەوە کرا، کە گوایە ئێمە لەگەڵ رژێم هاوکاری و گفتمان هەیە ! یان بەندەیەکی وەک من بە پسولەی جاشێتی لە نێوان شارەکان و ناوچەکانی هێزی پێشمەرگە گوزەر دەکەم، بەبێ ئەوەی سەرەداوێک، یان بەڵگەیەکیان بە دەستەوە بێت. ئەنجامەکانیش ئەوەیان لەگەڵ خۆ ساغ کردەوە، مەگەر تاکوتەرا لە هاوڕێیانی "ئاڵای شۆڕش"، لە ناچاریی لێرە و لەوێ ، بەهۆی فشاری هەمەلایەنەوە، پێوەندی بە ڕژێمەوە کردبێت، دەنا هیچ هاوڕێیەکی دیاری "ئاڵای شۆڕش" لە پێوەندی بە هێزەکانی ڕژێمەوە، فایلدار نەبووە.

زۆرێک لە بەرپرسانی کۆمەڵە و یەکێتی، لە کات و دەمی دەستکەوتنی بەڵگە و زەخیرەی دەزگا سیخوڕییەکانی ڕژێم، لە سەرتاپای کوردستان ئەوەیان بۆ ساغ بووەوە، کە ئەوان چەند لەو بەندوباوە ناڕاست و بێبەڵگە بوون و بگرە بە پێچەوانەوە، چەندان مەسئول، کادر و ئەندامی سێبەری سەرکردایەتیی زاڵی کۆمەڵە سیخوڕ و فایلدار بوون.

دروستبوونی "ئاڵای شۆڕش"، کە نەدەبوو لە هەناوی ڕووداوی شێواو و ئەو زەمینە لەرزۆکە لە دایک ببێت، لەدایکبوو!. دەبوو ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکان بە ماوەیەکی دوور و درێژتر، درێژە بە خەبات و تەلاشی گۆشکردنی بیری مارکسیزم- لینینیزم و سەرەتاکانی ئایدۆلۆژی بدات. دەبوو کەموزۆر خۆمان لە قەرەی خۆمەڵاسدانی ناو بازنەی هێزی پێشمەرگەی کوردستان نەدایە. ڕاستە هەرەشە و پەلاماردانەکانی دەسەڵاتدارەکانی کۆمەڵە لە سێبەری هێزی پێشمەرگەدا، فشارێکی لە توانا بەدەر بوو. بە دەیان هاوڕێ و هەواداری بیروبۆچوونی ئەڵقە ڕۆشنبیرییەکان، بەتایبەت لە شاخدا، کەوتنە بەر ئازاردانی جەستەیی، گرتن و ڕاوەدوونان. هەتا ناچارکردنیان بە تەسلیمبوونەوە بە ڕژێم. بەڵام لە پێشەوە خۆنەناسین و نەناسینی زەمینەی نالەبار و دۆخی خەباتی چەکداری ئەوێ ڕۆژێ، هەر ئەوەی لێ هاتە بەرهەم کە دیتمان.

ئەندامەکانی "ئاڵای شۆڕش"، سەرباری قوربانیدانێکی سنووربەزێن، زۆر دەستوپێسپی بوون لە هەڵسەنگاندنی بار و دۆخەکە. بگرە تەنیا لەگەڵ ڕق و قینەی دەسەڵاتدارانی سەرکردایەتیی دەسترۆیشتووی کۆمەڵە، بێ هەر جۆرە بەرنامەیەکی ساغکراوە، کەوتینە قۆشمەیەکی دۆڕاوەوە. بەتایبەتی زۆرینەی ئەندامانی دەستەی

سەرپەرشتیکردنی ئاڵای شۆڕش، "ئەڵقەی ناوەندی"، لە لایەک بۆ هەستونەستی پاک، دڵسۆزی، خۆشباوەڕی و زۆر بێپەروا بوون لە کاردانەوەی، هەنگاوەکانی سەرانی کۆمەڵە. خۆیان کردە لوقمەیەکی ئاسان، لە قوژبنێکی تەسک و ترسکدا هەنگاویان دەنا. بە جۆرێک زۆربەی مەسئول و کادرە دیارەکانی "ئاڵای شۆڕش"، بێجگە لە بەندە و ئەوانەی هەولێر، بە قسەی مەلا بەختیارمان نەکرد، بۆ چوونە قەراخ و بە ئیختفا لە شارەکان مانەوە، ئەوان لەجیاتی ئەوەی بەناو خەڵک و ناوچەکاندا بڵاو ببنەوە، هەموویان نزیک و بەدەوری یەکتری، لە یەک ناوچەی دیاریکراوی چەقی هێزی چەکداری بەردەستی سەرکردایەتی کۆمەڵە، هەڵس و کەوتیان دەکرد. یەک لایەنە بە هەندێ گفت و قسەی سەرزاری کوردانە، سەرچیخ چووبوون، خاوەن پلان و بەرنامەیەکی گشت لایەنە و رەچاوکاری هەڵگرتەی هەمە جۆر نەبوون.

**چەند وشەیەکی بەرایی پێویست..**

لەدەستپێکی خوێندنەوەی بەشی یەکەمی یادەوەرییەکانم، ئەوە دەخەمە بەرچاوی خوێنەر، کە جوامێری و سەربڵندی مرۆڤێکی وەک شەهیدی دەستی تیرۆر.. (عەلی مام حاجی قادر) ناسراو بەوریا گچکە نەبوایە، ئەو بەرهەمە ئەگەر بڵاویش بکرایەوە، بەمجۆرەی هەنوکە نەدەکەوتە بەرچاوان.. دیارە دڵسۆزی وگیانی هاوڕێتی نێوانمان لەگەڵ وریا ـ ی نەمر، ئەوەندەی بەبەرەوەبوو، کەبەدوای دەرچونی ناچاری بەندە بۆ هەندەران بەمەبەستی چارەسەرکردنی بریندارییەکەی سەرم و دوورکەوتنەوەی چەندان ساڵی من لەبۆ وڵاتی شەکاوەی(هێمن بونەوەی تەندروستیم لەسایەی ئەو وڵاتە) سوید ومانەوەی وریا ـ ی راستگۆ لەگەڵ وەیشومەکانی تێکۆشانی ئاڵای شۆڕش، ئەو دەفترۆچکەی تۆمارکردنی سەرنجەکانی بەشێکی فیلمی کاروانی سەربەگۆبەندی بۆ پاراستبوم.. وێڕای سڵاوناردن بۆ گیانی پیرۆزی (وریا) ئەو بەشەو بەشی دووەمیش دەکەمە دیاری وەبیرهێنانەوەی رۆژانی هاوڕێتی ئەو چەپکە شەهیدە.. کە وریا بەدوای هەموویان شەهید بوە.. مەناف.. رێباز و نەبەز.. دڵشاد (جەمال).. سەپان و خەلیل تورکمان.. دکتۆر ئازاد وکامەران و رێبوار.. لوقمان (ناسراو بە کاروان).. وشیار (ناسراو بە هەڵۆ)..محەمەد ئاقوبانی.. رشیدی مام موراد.. سۆران دیان.. دیاری مەلا ئاژگەیی..مام دارا.. هتد کەهەموویان رۆژێک لەرۆژان لێرەولەوێ تەواوکەری یەکتری وسوارەی تەبارەی بەرهەمی بیروباوەڕەکانی **ئارام ــ** نەمر بون..

ئەو زانیارییانەی من سەبارەت بەئاڵای شۆڕش، زۆرتر ناوچەکانی هەولێر دەگرێتەوە. هیوادارم لە کەم و کورتی بە سەرم بکەنەوە.

**سەرجەلەی رۆژمێری ژیانم لە باوەشی ئاڵای شۆڕشدا..**

لە کۆتایی ساڵی ١٩٨٤ـەوە هەتا مانگی ئابی ساڵی ١٩٨٥، سەرەتا بە هۆی برینداربوونەکەم و ژنهێنانمەوە، دواتر سەرلەنوێ خەباتی ژێرزەمینی، بەهۆی "ئاڵای شۆڕش" و یاخیبوونی ناچاری لە دەسەڵاتی "ی.ن.ک" لە شاخ و قاچاخبوونم لە رژێمی بەعس. ماوەیەک بەنهێنی لەناو شار و چەند گوندێکی دەوروبەری هەولێر دەژیام. بە زۆری لە گوندی ئۆمەراوە لە ماڵی خوشکێکم. گوندی چەغەمیرەی کەندیناوە لە ماڵی پورێکم. شارەدێی بەحرکە لە ماڵی سدیق حاجی یوونس و لە ناو شاری هەولێریش لە ماڵی باوکم، خەزورم و شەهید فرهادە شەل، کە کادرێکی کرێکاری هەڵسوڕاوی ناوشاری ریزەکانی کۆمەڵە بوو، کە دوای گیرانی لەلایەن دەزگای ئەمنی هەولێرەوە، بە ئەشکەنجە شەهید کرا. لە ماڵی یوسف دەرگەلەیی، کە یەکێک بوو لەو هاورێیانەی رۆڵی جوامێرانەی لە بڵاوبونەوەی دەنگوڕەنگی کۆمەڵە بەناو خەڵک لەناو شاری هەولێر هەبوو و دوای گیرانی لەژێر ئەشکەنجە شەهید بوو. لە ماڵی حەیدەر جوکل، کە ئەندازیاری کشتوکاڵ بوو، بەرپرسی رێکخراوی کۆمەڵە بوو لەناو شاری هەولێر و لەلایەن دامودەزگا ئەمنییەکانی رژێم شەهیدکرا، ئەوجا ماڵی حمید کەرکووکی، کە کرێکارێکی دۆستی کۆمەڵە و هاولینگی بەندەبوو. لە ماڵی حەیدەر سویری، کە جوتیارێکی هاوڕێی کۆمەڵە بوو. لە ماڵی مەحەمەد حاجی عبدە، کە دۆستێکی گیانی بەگیانی تەمەنی منداڵی و خوێندن و درێژایی ژیانمە. لە ماڵی خوشکەکانم، ماڵی سدیق و قادرەدرێژ، کە دوو لە هەڵسوڕاوە گورجوگۆڵەکانی کۆمەڵە و دواتر ئاڵای شۆڕش بوون لەناو شاری هەولێر و دەوروبەردا و، هتد. پاش نامە و نامە گۆڕینەوە و سەردانی هاورێیانی ناو شاری "سلێمانی"م کرد. چەند جارێک بە قاچاخ و بۆ مانگێک زیاتر لە ماڵی شێخ جەمال و حەمەرەئوف بووم، کە بەرپرسی سەرەکیی رێکخراوی ئاڵا بوو لە ناوچەکانی سلێمانیدا.

جارێکیان مەلا بەختیار بە نهێنی هاتە هەولێر بۆ دیتنی هەندێ برادەر، لەوانە سەفینی مەلاقەرە، کە فەرماندەی تیپی قەرەچوغی "ی.ن.ک" بوو. بەندە و مەلا بەختیار بە چاوساغیی حەیدەر سویری، بە موجازەفەیەکی سەرچڵانە، بە سەیارە لە هەولێرەوە چووینە ناوچەی شەمامک. پێشتر من "سەفین"م بەشەو و بە نهێنی لە گوندی چەغەمیرەی کەندیناوە، لە ماڵی هاشم نوری دیتبوو، کە خوێندکار و چالاکوانێکی ریزەکانی کۆمەڵە و ئاڵای شۆڕش بوو. گفتی ئەو یەکتردیتنەی دابوو کە هەتا ئەو شەوە من بۆ کۆبوونەوە لەگەڵ شەهیدان قاسم کرێکار و هاشم شەمامکی چووبووم، کە دوو کادری لێوەشاوەی کۆمەڵە و بەنهێنی هەڵسوڕاوی ئاڵا بوون لەناو هێزی پێشمەرگەی دەشتی هەولێر. ئێمە لە گوندی شەمشولە، لە شوێنی دیداریکراودا، زۆر چاوەڕوانی "سەفین"مان کرد. کەچی

ئەهات و لە گەڕانەوەدا کەوتینە کەمینی پێشمەرگەکانی کەرتی ڕەنجەی کۆنەحسک و ڕەنجە خۆی سەرێکی بەناو سەیارەکەدا کرد و کە ئێمەی بینی، بە واقوڕماوی، هەر ئەوەندەی گوت: دەرچن و لەوناوە نەمێنن!

ئەوجا ناردنی ڕاوبۆچوونەکانمان بۆ کۆبوونەوەی جاڕدانی ئالای شۆڕش، بە یەکەم قوربانیی هاوسەرەکەم و خۆم تەواو بوو، کە مەرگی نۆبەرەکەمان بوو، بە هۆی ناردنی هاوسەرەکەمەوە بۆ هێنانی بڕیار و ئەنجامەکانی کۆبوونەوەی دامەزراندنی ئالای شۆڕش و دواکەوتنی لەگەڕانەوەدا. مەلا بەختیار لە دوا نامەیدا، سەرباری ڕەخنەیەکی زۆر لەو برادەرانەی لە ئەورووپا هاتبوونەوە سەر سنوورەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات، کە سالار و جەعفەر بوون و بەناوی ئەڵقەی ناوەندیی ئالای شۆڕشەوە، ئاگاداری ئێمەی لە ناوچەکانی هەولێر کردەوە، کە بەبێ ئامادەبونی خۆم، بەندەیان بەیەکێک لەو ئەندامانەی ئەڵقەی ناوەندی هەڵبژاردبوو، بەڵام بەناوی ڕێناس بادینی، بۆ شاردنەوەی ناوە ئاشکراکەی خۆم لە کاتی هاتنەپێشەوەی ڕووداوی کتوپڕدا. کە یەکسەر پێوەندی بەو برادەرانەی سەر سنوورەوە بکەم. ئەوە بوو لە لایەن سالارەوە ئاگادار کرامەوە کە تا زووە ئەو ژیانە نهێنییە بە جێ بهێڵم و بەرەو لای ئەوان بچم. ئەوان چەند ڕێ و شوێنێکیان بۆ دانابووم، کە پێیدا بڕۆم، بەڵام دوای سۆراغ و پرسکردن، نەوەک هەروا نەبوو، بەڵکو سەرتێداچوون بوو، ئەگەر بەوان ڕێگادا بڕۆیشتامایە.

چەپکە هاوڕێیەک لە گرتن و ڕاونان لەلایەن هێزەکانی "ی.ن.ک" دەرباز ببوون. چەند ڕۆژێک بوو بە چەکەوە پەڕیبوونەوە گوندەکانی خەیلانیان و لەوێ بەنهێنی خۆیان داڵدە دابوو. ئەوانیش نامەیان بۆ نووسیبووم چی بکەن، چۆن بپەڕنەوە و بگەنە لای ئەو برادەرانەی سەر سنوور، کە پێشتر هاوڕێیان، سۆرانی دیان، وەرزێر، وریا قادر و گۆران ڕۆیشتبوون. بۆیە من دوای هەندێ مرومۆکردن، هانام بۆ هاوڕێی ڕۆژی تەنگانە (سدیق بەحرکەیی) برد، کە هەم لەناو ڕیزەکانی ڕێکخستنی کۆمەڵە و دواتر لەناو ئالای شۆڕش لە شاری هەولێر جێگای دیار بوو. بەتایبەت ئەو لە شارەدێی بەحرکە چەندان شانە و ئەڵقەی ڕۆشنبیری دروست کردبوو و لە ناوچەکانی بەڕانەتی، شارەزا و ناسیاوی زۆری هەبوو. قەلابەی هەبوو و چکڵ و چەو و لمی دەهێنا و دەبرد. چاو نەترسانە بە دەنگمەوە هات، چووە گوندەکانی بەڕانەتی، چەندی گەڕان و سۆراغی کردبوو، هیچ مەفرەزەیەکی حزبی شیوعی و پارتی نەدۆزیبوەوە، کە ئەورۆژانە تاک و تەرا لەو ناوچەیە وجودیان هەبوو. شەو لە ماڵی باوکم هاتە لام، کە بەدوای مەرگی جگەرگۆشەکەمانەوە بۆ دیتنی هاوسەرەکەم بە نهێنی لەوێ بووم و ماوەیەک بوو چاوم پێی نەکەوتبوو. بۆیە بە پێویستم زانی ئەگەر بە مەرگی خۆشم تەواو بێت، دەبێ پێش ئەم سەفەرە چارەنووس نادیارە

ببینم. هێشتا یەک دوو سەعات نەدەبوو لەگەڵ "نەجیبە خان" دوو بەدوو تێر قسەمان نەکردبوو، کە سدیق لێمان بە ژووریێ کەوت. پاش چاک و چۆنی و بەخێرهێنانی، گوتی کوڕی چاک دەمی دڵداری نییە، هاوڕێیان لەگوندی "سەرکەند" چاوەڕوانت دەکەن و دەبێ هەنووکە خۆت کۆکەیتەوە و هەر ئەمشەو بچینە "بەحرکە" و بۆ بەیانی زوو بەڕێ بکەوین. "نەجیبە" پڕی چاوی فرمێسک بوو و گوتی دیارە بەیەکجاری بە جێم دەهێڵی. چونکە زۆر جاری دیکەیش بە جێم هێشتبوو. ئەوجا زۆرتر کرایەوە گوتی: دایکم پێش شووکردنم پێی گوتم، کچم شووکردن بە پێشمەرگە واتای هەناسە هەڵکێشان، تەنیایی و خۆخواردنەوەیە. بەڕاستی قسەکەی ڕاست دەرچوو. منیش هەر ئەوەندەم بۆ کرا، لە بەرچاوی سدیق و دایکم، نیوچەوانم ماچ کرد و بەگەرمی لەباوەشم گرت، فرمێسک بە چاوەکانی منیشەوە ڕێچکەی بەستبوو. دایکم بە دڵدانەوەی هەردووکمان، هەمێزی پێداکردین و گوتی، کچم تۆ بەشێکی لە عەباس و لە ئێمەیش، ئەگەر عەباس بۆ تۆ و ئێمە بێت، ئەوە ساغ دەبێت و یەکتر دەبینینەوە...

دوای ماڵئاواییکردن لە ژنەکەم و تێکڕای ماڵەوەمان، دایکم لەگەڵ من لە پێشەوەی سواری قەلاب بوو و بەرەو شارەگوندی "بەحرکە"ی کەناری هەولێر بەڕێکەوتین. شەومان لەوێ کردەوە و بەیانی بەتەنیا لەگەڵ سدیق ڕێگای گوندی "سەرکەندمان" گرت. یەکەمجار لە بەستۆرەوە بەرەو گوندەکانی سنوری بەرانەتی ملمان لە ڕێگا نا، بەو هیوایەی لەوێوە ڕێگای قەدبڕ هەبێت بۆ ئەو شوێنە. کە گەیشتینە کەناری گوندی "سەرسول" گوتم، سدیق بۆ لەو گوندە ناپرسی، نەوەک دوایی هەڵەداوان ببین و تووشی گوڵمەزێک ببین! من لەناو قەلابەکە مامەوە، دوو کلاشینکۆف و دەمانچەیەکمان پێبوو، کە لەناو گونییەکمان دانابوون لە پشتەوەی قەلابەکە و تایەیەکی گەورەی لەسەر بەسترابووەوە. پاش ماوەیەک سدیق هاتەوە و بە پێکەنین گوتی، دیارە تۆ لەم ناوە شارەزای، قسەکەت ڕاست دەرچوو. لێرەوە ڕێگا نییە، تەنیا بۆ سوڕانەوەی ئەو دیوی مەسیف هەیە، کە زۆر جێگای مەترسیە و هەموو گوندەکانیش جاشن. ناچار پاشەوپاش گەڕاینەوە و هاتینە ئۆردوگای بەستۆرە و چووینە ماڵی "تەیبە ڕەش"، کە ئەوانیش لەماڵ نەبوون، ناچار چووینە ئۆردوگای پیرزین و چەکەکانمان لەوێ لە ماڵی دۆستێک دانا، کە سدیق دەیناسی، بۆ ئێوارە هاتینەوە بەحرکە و دووبارە بەدوای نەجیبە و دایکم نارد و هەردووکیان لەگەڵ کۆمەڵێک خواردن هاتنە ئەوێ و شەوەکەمان بەیەکەوە بەسەربرد.

بەیانی سەرلەنوێ بەڕێکەوتینەوە، بەڵام ئەمجارەیان بەڕێگای جادەوە بەناو "مەسیف، کوڕێ و حوجران"دا تێپەڕین. لە هیچ بازگەیەک لێیان نە پرسین، چونکە دونیا هێشتا هاوین و گەرم بوو. بۆ پاش نیوەڕۆ گەیشتینە "سەرکەند". لە چەند کەسێک سۆراغی

پێشمەرگەمان کرد، کەس نەیگوت پێشمەرگە لێرە هەیە و هەتاکو دەمە دەمی عەسر، دیسانەوە بەناچاری گەڕاینەوە بەرەو بەحرکە و پێش ئەوەی لە گوند دەربچین، پیاوێک داوای لێکردین تا مەسیف هەڵیگرین. کابرا هات لەگەڵ من لە پێشەوە سوار بوو. پاش بەڕێکەوتن، لێم کەوتە پرسیاران و دوای گوتنی ناوی خۆی، کە "حسین سەرکەندی" بوو، دواتر بووە پشت و پەنامان لەو گوندە و هەمیشە خانەخۆیی خۆم و پێشمەرگەکانی ئاڵای شۆڕش و هەتا ماڵ و منداڵەکانیشمان بوو. بەداخەوە دوایی بیستم لە کارەساتی یەکی شوبات لە لقی ٢ ی پارتی لە هەولێر شەهید بووە. حسین سەرکەندی پرسی ئەوە چیتان لێ بزربووە، دەڵێی بەدوای شتێکدا دەگەڕێن؟ ئێمەیش پێمان گوت برایەکمان بەگەر پێشمەرگە کەوتووە! هەر چیەکی دەپرسی، گومانی لە وەڵامەکەی ئێمە هەبوو. تاکو مەسیف، گوتی ئەگەر دەچنە هەولێر منیش لەگەڵتان دێم و ئێمەیش گوتمان نا دەچینە ئۆردوگای بەستۆڕە و لەوێ خزممان هەیە و دەمێنینەوە. گوتی باشە هەتا سەرجادەکە دێم، ئیتر کە گەیشتینە ئەوێ، حسین لەسەر جادەکە دابەزی و ئێمە دوبارە چووینە ماڵی تەیبە رەش، شتە قاچاغەکانمان لەوێ دانا و پاش چاخواردنەوەیەک بەرەو بەحرکە بەڕێکەوتینەوە. کە هاتینە سەرجادەکە دیتمان  حسین هەر وا لەوێ ماوە و کەس هەڵینەگرتووە و ناچار دووبارە سەرکەوتەوە. ئەوەبوو پێش ئەوەی بگەینە بازگەی هەولێر، گوتمان ئێمە دەچینە ماڵەوە لە ئۆردوگای پیرزین و ئەومان لەسەر جادەکە دابەزاند و گەڕاینەوە بەحرکە. من یەکسەر بە سەیارەکەی مام کەمال، کە هاوڕێیەکی دڵسۆزی خۆمان بوو، چوومە ماڵی "فەرهادە شەل"ی نەمر لە بەستەپیازە و شەوێ لەوێ بووم. بۆ بەیانی چوومە ماڵی حەیدەر جوکل، کە ئەو دەمە بەرپرسی ڕێکخراوی ناو شاری کۆمەڵە بوو. تا رادەیەک سۆزی هاوڕێیانەی لەگەڵ ئاڵای شۆڕش و بەندە هەبوو و لە ڕێگای دوو برازاکانیەوە کە هەردووکیان هاوڕێی ئاڵای شۆڕش بوون. جێگای باسە لەناو ئەندامانی ڕێکخراوی ناو شاری کۆمەڵەیش، مامۆستا یوسف دەرگەلەیی، لە پێش گیران و شەهیدبوونەکەی، هەوادارێکی شێلگیری ئاڵای شۆڕش بوو و لەگەڵ شەهید حەیدەر جوکل، راستەوخۆ پێوەندییان بە بەندەوە هەبوو. چەند جارێکیش ئاگادارییان کردوومەتەوە کە وریای خۆم بم، لە شاخ خەڵکیان ناردووتەوە شار بۆ تیرۆرکردنی بەندە و هەر بۆیەش، ڕۆژانێکی زۆر لە ماڵیان بە نهێنی ژیاوم و هاوکاری زۆریان کردووم.

جارێکیان لە ماڵەکەی حیدەر جوکل بووم، بە سودفە ئەو ڕۆژە، خۆیان لە ژورێکی دیکەی ماڵەکە، کۆبونەوەی ڕێکخراوی ناوشاری کۆمەڵەیان هەبوو. منیش لە ژوورێکی دیکەدا بووم. دەمی نیوەڕۆ خێزانەکەی حیدەر کە خواردنی بۆ هێنام، لە بیری چوبوو، دەرگای ژوورەکە دابخات. لەو دەمەدا کوڕە بچکۆڵەکەیان، سەری هێنایە ژوورەوە و

ئەوەک هەر سەرەدیقانێی لەگەڵ دەکردم، بگرە بە هەموو دەنگی خۆی لەسەریەکەوە، دەیگوت، لێدە عەلۆ برنج و گۆشت بخۆ! ئەوە بوو حەیدەر بەهەڵەداوان، هات و دەرگاکەی داخستەوە و کوڕەکەی بێدەنگ کرد.

من پێشتر فرهادە شەلم ڕاسپاردبوو بچێ سۆراغی؛ مەهدی کاوانی و ئەوانی دیکەم بۆ بکات و خەبەرەکەم بۆ بباتەوە لای دایکم. پاش دوو ڕۆژان بە هۆی "ئەحمەد کەریم"ی برازای حەیدەر جوکل، هاتە لام. نامەی هاوڕێیانی بۆ هێنام، کە سبەینێ لە گوندی سەرکەند لە ماڵی حمد کامۆ چاوەڕوانم دەکەن. گوایە مەفرەزەیەکی پارتی بەناوی "جلال – ئازاد" لەوناوەن و ئامادەن ئێمە لەگەڵ خۆیان بۆ ناوچەی برادۆست و لۆلان ببەن. ئەوەبوو ماڵئاواییم لە دۆستی جوامێر حەیدەر جوکل و ماڵ و منداڵەکەی کرد و چیتر ئەو پیاوە سەربڵندەم نەدیتەوە. بۆ شەو خۆم گەیاندەوە ماڵی سدیق لە بەحرکە. بەیانی دووبارە وەختی نیوەڕۆ چووینە ئۆردوگای بەستۆرە و لە ماڵی تەیب تفەنگەکانمان هەڵگرت. لە ٨/١٩ بە قرچەی نیوەڕۆ بە بازگەکان تێپەڕین و بۆ سەعات ٢ ی پاش نیوەڕۆ گەیشتینە گوندەکە، کە بەپێی نامەی مەهدی، لە ماڵی "مام حمد کامۆ"مان پرسی و لەو دەمەدا مەهدی و فرهاد دەرکەوتن، بە پیرمانەوە هاتن و چووینە بن کەپرێکەوە، کە لە خوار گوندی بوو، پاش ماوەیەک مەناف و ڕێبازیش دەرکەوتن، کە دوو ڕۆڵەی چاونەترس بوون.

لەگەڵ هاوڕێیان بەیەکتری شاد بووینەوە، سدیق بۆخۆی گەڕایەوە شار و ڕێکخستنەکان و خۆیم ڕووبەڕووی هاوڕێیانی ناو شار کردەوە، کە ئەو دەمە ڕێکخراوێکی گورجوگۆڵ و چالاکمان لە شار دروست کردبوو. هەموو هاوڕێیەکان ڕۆڵەی بەجەرگ، چاونەترس و وزەی نوێی خەباتکردن بوون و بە چەلەنگی بەریان لە کاری خەباتی نهێنی گرتبوو، لە نموونەی "د.لوقمان"ی نەمر، شەهیدان شێرکۆ و د. ڕشید، ئاسۆ و دایکە قارەمانەکەی نازەنین خان و حەمەی برای، کاکلە ڕەش و خێزانە قارەمانەکەی، سەلاح سەربەندی، کاردۆ مەحەمەد، هەروەها خەلیل نازەنینی، قادرە درێژ، دایک و خوشکەکانی، سامی هادی و ماڵەکەی، حەسەن خونچە، حەبیبەخان.... هتد (بەداوای بووردن لەوانەی ناویانم لەبیر نەماوە، یان من نەمناسیون.

لەو چەند ڕۆژەی لەو گوندە و دەوروبەری بووین، لەگەڵ هاوڕێیان کۆبوونەوەی چڕوپڕمان کرد؛ دەربارەی بەرنامەی کار، یەکترپاراستن، وریابوون لە خۆمان و دەوروبەرمان و گفت و بەڵێنی هاوڕێیانەمان بۆ یەکتری دووپات کردەوە. زۆربەی کات بەو مەفرەزە بچوکەوە، لەو چەند گوندەی ناو خەیلانییان دەخولاینەوە، کە لە مشورخواردنی ئەوە بووین، بە چ ڕێگایەک و چۆن خۆمان بگەیێنینە برادۆست و بەرەو

لۆلان بچین. هەر لەو ماوەیەدا، لە نزیکەوە پێوەندی توندمان بە هاوڕێیانی شارەوە هەبوو. کاکلەڕەش و سدیق بەحرکەیی لە ئاقاری گوندی سەرکەندی هاتنە دیدەنیمان، ئەو دەمە کاکل بەرپرسی یەکەمی ناوشار بوو، بەندە بەتەنیا لەگەڵیان کۆبوومەوە و چۆنیەتی پێوەندی داهاتوومان دەستنیشان کرد و جفرە کۆدێکی سادەمان بۆ دەمی نامە گۆڕینەوە دانا. من ئەدرێسی هاوڕێیانی سلێمانیم پێدان بۆ پێوەندیگرتن بە هاوڕێیانی ئەڵقەی ناوەندیی ئاڵای شۆڕش لە قەرەداغ. دیارە برادەرانی یەکێتی بە بوونی ئێمەیان زانیبوو.

شەوێکیان بۆ دیدەنی لەگەڵ ئاسۆ ئەحمد لە ماڵی یەکێک لە خزمەکانی، شەو درەنگانێ لەگەڵ مەناف و ڕێباز چووینە گوندی ماوەران، چاومان بە ئاسۆ کەوت. هەموو دەسەلاتێکی سەرپەرشتیکردنی بەشێکی ئەڵقە رۆشنبیرییەکانی ئاڵای شۆڕشمان پێدا، هەندێ پارەیشی لە دایکی قەرز کردبوو و بۆی هێنابووین. پێش ئەوەی ماڵەکە بەجێبهێڵین کە هێشتا بەرەبەیانێکی زوو بوو، کوڕێکی[38] ماڵەکە، کە خوێندکاری ئامادەیی بوو لە شەقڵاوە و زۆر هۆگرمان بوو. لێرەدا یەکسەر ڕووی لە من کرد و گوتی ئەگەر تۆ "حاجی مەمۆ"ی ئەوە نامەیەکم بۆ تۆ پێیە، چونکە بەو عەینەکەی چاوت و شیوەت، کە وەسف کراوە، دەبێ هەو بیت. منیش گوتم ڕاستە "حاجی مەمۆ" هاوڕێی ئێمەیە، بەلام ئێستا لەگەڵمان نییە. ئەوکاتە ناوم لە خۆم نابوو "نەورۆز"، گوتم من "نەورۆز"م و نامەکەی دایە دەستم. تومەز ئەو کوڕە ئێوارەی پێشووتر لە نێوان جادەی شەقڵاوە و ماوەران توشی ئەو هێزی پێشمەرگەیە ببوو، کە برای نەمر سابر رسول مەسئولیان بوو و بەدوای ئێمەدا دەگەڕان، بمانکوژن، یان بمانگرن. پێشتریش هێزێکیان ناردبووە گوندی گۆڕەشێری بن مەسیف و "عەلی مەسیفی"یش لە ڕێگای دۆستێکمان لەو گوندە، نامەیەکی بۆ نووسیبووم و ئاگاداری کردبوومەوە. بەلام سابیر وەک وەفایەکی ئەو هەموو ساڵەی هاوڕێیەتی، خۆشەویستی نێوانمان چ لەشار و چ لە شاخدا، سەرباری هەندێ ناکۆکیی بیر و بۆچوون، نامەی بۆ نووسیبووم، تکای برایانەی لێ کردبووم کە ئەگەر ناشگەڕێمەوە ناو یەکێتی، جارێ لە ناوچەکە نەمینێم، ئەمری گرتن و کوشتنم هەیە بە ژیان و بە مردن، خەڵکی خراپیش زۆرن کە ڕەنگبێ لە دڵسافی خۆت، دەستت لێ بوەشێنن. تکای لێ کردبووم کە زۆر ئاگاداری خۆم بم لەو گوندانەی دەوروبەری شەقڵاوە نەبم.

---

[38] ئەو کوڕە زۆر هەوڵیدا لەگەڵ ئێمە ببێتە پێشمەرگە، بەبێ ئەوەی بزانێ ئاڵای شۆڕش چییە. بەلام بنەماڵەکەی بەرەچەڵەک لەگەڵ چەپ و حیزبی شیوعی سۆزیان هەبوو. ئێمەش هەندێ ئامۆژگاریمان کرد کە خوێندنەکەی تەواو بکات. من لە بیرم نەماوە ناوی چی بوو.

جێگای خۆیەتی لێرەدا ئەوەیش باس بکەم، کە لە بەهاری ساڵی ١٩٨٥دا، بە نهێنی چوومە دۆڵی هیران و نازەنین و دۆڵی بالیسان بۆ هەندێ کاروباری ڕێکخراوەیی و دیتنی ئەڵقە ڕۆشنبیرییە سەرەتاییەکانی هەردوو ناوچەکە. ئەوەبوو لە دۆڵی بالیسان لەنێوان گوندی مێرگەسەر و هەرمک، لەگەڵ دوو هاوڕێی دیکە بەپێ دەچووینە گوندی زێوە بۆ ماڵی "کێخوا حسن"ی زێوە کە پیاوێکی وڵاتپارێز و کوردپەروەرێکی نموونەیی بوو. لە ڕێگا توشی مەفرەزەیەکی پێشمەرگەکانی سابیر رسول بووین، کە بارەگایان لە گوندی چیوەی حاجی سەلام بوو. دیار بوو فەرماندەی مەفرەزەکە منی ناسیبوو، کە چووبوەوە وەکو دەڵێن، چوغلی کردبووم. برادەرانی یەکێتی هەندێکیان بەخۆکەوتبوون بە تایبەت ئەوانەی حەزیان لە ئازاردان و ڕاوەدوونانی ئێمە بوو، خۆیان ئامادە کردبوو بێنە سەرمان، بەڵام لە پێشیانەوە سابیر رسول و کاکەمین، برای بەڕێز خالد حاجی کە هەردووکیان فەرماندەی کەرت بوون لەو تیپە، خۆیان لەو خەڵکانە تورە کردبوو کە حاجی مەمۆ لەو ناوە چی دەکات، ئەمە درۆیە! کابرای چوغلکەریشیان تەمبێ کردبوو کە لەو چوغلکردنەی خۆی پەشیمان ببێتەوە. هەزاران کەس هەیە چاویلکەی لە چاوە، حاجی مەمۆ ناتوانێ بێتە ئەو ناوچەیەوە! هەتا سابیر رسول گوتبووی، بەخودای ئەگەر ئەو بێت، ئەوە حاجی تایەری مێرگەسەر دەزانێ، بڕۆنە ماڵی ئەو بزانن وایە یان نا ! ئیتر مەفرەزەیەک لەگەڵ خالد حاجی هاتبوونە مێرگەسەر، گوندەکەیان پشکنی بوو، "حاجی تایەر"ی نەمریش کە دۆستێکی زۆر نزیکی من و هاوڕێیانی ئێمە بوو، ئەو ڕۆژە هێشتا منی نەدیبوو، پێی گوتبوون من خۆم لەسەر حاجی مەمۆ دەگوڕمەوە، بەڵام ئەوم نەدیتوە، باوەڕیش ناکەم لەو ناوە بێت. بۆ شەوەکەی، کە ئێمە لە "هەرتەل و زێوە" گەڕاینەوە، بەرەبەیانی بوو، چووینە ماڵی حاجی تایەری ڕەحمەتی، لە خەومان ڕاکردن بۆ نان و چای خواردن. مام حاجی تایەر هەر واقی وڕما، گوتی کوڕە ئەوە تۆ لە عاسمان هاتی، بەدوای مەرگی خۆتدا دەگەڕێی! پاش هەندێ هەواڵپرسین و کاروباری ژیان. گوتم مام حاجی هاتووم بۆ ماڵئاوایی، دەڕۆم بۆ دەرەوە، گوتم با چاوم پێیان بکەوێ. پاشان لەوێ بە تەنیا بە سواری ماشێن بە ناوچەی خەلیفان گەڕامەوە. ماشێنەکە دۆستێکی خۆمان لێیدەخوڕی، کە لە شەقلاوەوە هاتبوو و من نەمدەناسی. لەگەڵ هاوڕێیان گفتمان هەبوو کە ئەو بەیانییە لەو ماڵە دەبم. ئەو کات، کە لە جادە و بەناو شارەکان دەسوڕامەوە، زۆرتر بە ئیجازەی لیژنەی تەنسیقی نێوان حکومەت و یەکێتییەوە، کە لە ڕێگای محسن کەریم ژمارەیەکی زۆرمان لێ چاپکردبوو، یان بە ئیجازەی عەسکەریی "سەباح"ی برام، کە دکتۆری بەیتەری بوو و ئەو دەم لە ڕانیە سەرباز بوو، یان هەر بە دەفتەری خدمەکەی ئەو، کە هەردووکمان زۆر پێکدەچین، سەرباری جیاوازی دەساڵان لە تەمەنی نێوانمان. کەچی

بیستم برادەرێک کە هەزارویەک لاوچاکیمان بەسەریەکەوە هەبووە، لە ڕێبازی نوێی بەردەستی بەبێ ئەوەی بەڵگەیەکی بەردەست بێت، لەسەری نووسیبووم، کە من بەهەوییەی جاش خەفیفە (ئامر سریەی جاش خەفیفەی حکومەت) لە شارەکان دەسوڕێمەوە! تێکۆشەری شۆڕشگێڕ دەبێ ویژدانی لە هەموو خەڵک زیندووتر بێت، بەلام دیارە لەناو کورد و سیاسەتی کوردۆلۆژی هەموو شتەکان لە سەرچاوەی ویژدانێکی پووت و میزاج سەرچاوە دەگرێ.

ئیتر پاش خوێندنەوەی نامەکەی سابیر رسول، کە دیار بوو خۆی و هێزەکەی، هەر ئەو شەوە بۆ گوندەکانی بەرەکە و کەوەرتیان گەڕابوونەوە، بە ڕێککەوت توشی فرهاد و مەهدی نەبوون، کە بە هەندێ کاروبار بۆ ئەو دوو گوندە چووبوون! ئێمە بەرەبەیانی گەڕاینەوە گوندی سەرکەند و بۆ رۆژی دواتر لەگەڵ هاوڕێیان یەکترمان دۆزییەوە. شەوەکەی ئاغای گوند، مام رشید کە خۆی ئامرسریەی جاش خفیفە بوو، دۆستی پێشمەرگە و شۆڕش بوو و زۆربەی خەڵکی گوندەکە چەکداری بوون، هاوکاری هەموو لایەکیان دەکرد. ئێوارەی ئەو رۆژە، بە کوڕەکەی مام حەمەد کامۆ، بەناوی دەعوەتکردنەوە، بانگی ماڵی خۆی کردین. ئێمەیش بێ سڵەمینەوە، "حوسێن سەرکەندی"مان لەگەڵ خۆ برد و بووینە میوانی و زۆریان خزمەتکردین. بەدوای چای خواردنەوە، مام رشید رووی قسەی لێمان کرد و گوتی: ئێوە نزیکەی هەفتەیەکە لە دەوروبەری سەرکەند دەسوڕێنەوە، خۆشتان دەزانن، ئێمە چەکداری حکومەتین، زۆر بە کەمی لە گوندین، خەڵکی گوندی لێتان رازین کە بە رۆژ لە گوندی نامێننەوە و منیش مەمنونتانم. بەلام خەبەرمان هەیە، جەماعەتی یەکێتی بە تەمان بە هێزێکی زۆرەوە، لەو یەک دوو شەوە، بۆ دەستوەشاندن لەو مەفرەزە بچوکەی ئێوە، پەلاماری ئەو گوندە بدەن. منیش نامەوێ گوندەکەمان لێ تێک بچێ، ئەگەر بەبەردەوامی لەو گوندە بن، ئێمەیش توشی گێچەڵی شەڕی جەلالییەکان دەبین. تکاتان لێ دەکەم، هەم بۆ سەلامەتی گوندەکە و هەمیش بۆ خۆتان، ئەو چەند شەوە لەو گوندە نزیک مەبنەوە. ئێمە خۆشمان پێش ئاگادارکردنەوەکەی ئەو، مەهدی و فەرهاد پێشنیازی ئەوەیان کردبوو، بۆ دیتنی ئەو مەفرەزەیەی پارتی، با بەرەو گوندی "خەتیبیان" بەرێکەوین. ئەوە بوو بەدوای بەجێهێشتنی ئەو ماڵە و ماڵئاوایی لە حسین سەرکەندی، لە نێوان خۆمان کۆبوونەوەیەکمان کرد و پێشنیازەکەی هاوڕێیانمان پەسند کرد.

شتە زیادەکانمان لەگەڵ تفەنگێک لە ماڵی عەلی مام حەمەد کامۆ شاردەوە/ شەوەکەی لەو گوندە پەڕینەوە ئەوبەری گوندی زێوکە، سەرێکمان لە مام حاجی حسین خۆشناو دا، کە لەوان رۆژە ناخۆشانەدا زۆر بەکەڵکمان هات. تا بەرەبەیان لەوێ ماینەوە و لەگەڵ

زەردەپەڕدا، ملی ڕێگای زوورگەکانی ئاودیوبوون بۆ دیوی خەتیبیانمان گرت. نانی نیوەڕۆمان لە ماڵی "ئەسعەدی ملا ئەحمەد" ی خوارد، کە لەناو کەپران بوون. لەوێ لەگەڵ "جەلال سۆرەبانی"ی پارتی یەکترمان دیت و گوتی، هەتا جەژنی ڕەمەزان بۆ ناوچەی لۆلان ناگەڕێمەوە، ئەگەر بخوازن بەیەکەوە لە ناوچەکە دەبین، ئەگەر دەشتانەوێ ئێمە لە ڕێگای هەڤالانی خۆمان بەسەیارە ڕەوانەی (بێخمە) تان دەکەین و لەوێش خەڵکمان هەیە هەتا بناری "برادۆست"تان دەبەن. ئەوە بوو لەگەڵ هاوڕێیان هەندێ مرومۆمان کرد، هەموو پێمان چاک بوو، ئەگەر موغامەرەیش بێت، چیتر درەنگ نەکەوین و هەر خۆمان تەسلیمی ئەوان بکەین و بەو ڕێگایەدا بڕۆین. هەر پێنجیشمان چەکمان بەدەستەوە بوو، بڕیاری ئەوەمان دابوو، تەنیا مەرگ دەبێتە بەرهەمیان، ئەگەر توشی هەرشتێکمان بکەن. چونکە لەنزیکەوە ناسیاریمان پێکەوە نەبوو. ئەوان "فەرهاد و مەهدی"یان وەک بنەماڵەی کاوانییان دەناسی و تاڕادەیەک باوەڕمان پەیدا کردبوو.

بە هەر شێوەیەک بوو، بۆ پاش نیوەڕۆ "جەلال و ئازاد"ی پارتی، جێبێکی لاندرۆڤەریان بۆ پەیدا کردین و بە چەکەوە سوار بووین، بەو نیوەڕۆیە بەناو ئەو ڕەبایانەی ڕژێم بە لاڕێ و ڕێی خۆڵی ئەو گوند بۆ ئەو گوند، دەمە دەمی ئێوارە ئێمەیان گەیاندە سەر ئاوی بێخمە، دروست لەوێ کابرایەک بە چوپێکەوە لەم بەرەی ئاوەکە چاوەڕوانی دەکردین. لە جێبەکە هاتینە خوارەوە، نهێنی خۆمان بە کابرا گوت و جێبەکە گەڕایەوە. خاوەن کەلەک کە هەریەک چوپی پێبوو، گوتی هەر جارە و یەکێکتان دەپەڕێنمەوە. لەو دەمەدا سەیرمان کرد کە جاشەکانی ناو ڕەبیەکەی سەرەوە، هەموو هاتینە سەر تەپۆلکەی سەر ئاوەکە، هەرئەوەتە داوای هەوییەمان لێ ناکەن! کابرای کەلەکەوان وای دەزانی ئێمەیش پارتین و گوتی مەترسن ئەوانە ناسیاوی ئێمەن، دۆستی شۆڕشن. خۆمان بێ دەنگ کرد، بەڵام تا ڕادەیەک پەرت بووین و هەر یەکەو پەنا بەردێکمان گرت، وامان بە چاک زانی یەکەمجار مەهدی کاوانی بپەڕێنێتەوە، کابرا بەمەلە چوپەکەی بردە ناو ئاوەکە، دارەکانی لەسەر دانا کە مەهدی سواربێت، بەڵام مەهدی پێی سەرچیخ چوو و کەوتە ناو ئاوەکەوە، ڕێباز چاپوکانە فریای کەوت، لە ئاوەکەی دەرهێنا، خستیە سەر چووپەکەوە و لە خنکان ڕزگاری کرد، خۆشی چەک و شتەکانی دایە مەهدی و بە مەلە لەگەڵ کابرای کەلەوان پەڕینەوە. هەردووکیان لەوبەر دامەزران، کەلەکەوان بۆلای ئێمە گەڕایەوە و ئەوجا بەندەی پەڕاندەوە، دواتر فەرهاد و مەناف گەیشتن.

دونیا تاریک ببوو، کەلەکەوان چوپی فشکردەوە، پێشمان کەوت و ئێمەی بردە ماڵێکەوە کە هەڤاڵی پارتی بوون، گوتی کاری من لێرەوە تەواو و ڕۆیشت. خاوەن ماڵ هەر ئەوەتە بەخێرهاتنی کردین، کە زانی ئێمە هەڤالانی پارتی نین، چونکە تفەنگەکەی

مەناف، بووە مایەی گومان لێکردنمان، هەرگیزیش ئێمەی نەدیتبوو. هەموو نهێنییەکی ئێمەش ئەوەبوو هەڤاڵانی "سالار" ین بۆ لای "فرەنسۆ" دەچین. دوای ئەوەی پێمان گوت، ئێمە شارەزا نین بەڵکو ڕێپیشاندەرێکمان بە کرێ بۆ بگرێ، تاکو درەنگانی شەو ماینەوە، ئەوجا دوو کەسی بەناوی "ئەحمەد و کەریم"ی بە ٦٠ دیناری بۆ پەیدا کردین. ئەوانەش ئێمەیان بەڕێگایەکدا برد، مەگەر هەر بزن بتوانێ پێیدا هەڵگەڕێت! بۆ شەو زۆر هیلاک بووین، بەتایبەت بەندە، وزەی ڕۆیشتنم نەما بوو و لاقەکانم بەدوامدا نەدەهاتن. ناچار بنگەوەڕە شاخێکمان دیتەوە کە ئەوان شارەزا بوون، چک چکە ئاویشی لێ دەهاتە خوارەوە. دیاربوو ئەو "ئەحمەد و کەریم"ـە نیازیان لەگەڵمان باش نەبوو، گەرەکیان بوو ئێمە هەموو بخەوین و لەوێ مارکوژمان بکەن و چەک و گیرفانەکانمان بکەنە دەستکەوت. بەڵام هۆشیاری ئێمە، کە من و مەناف یەکێکمان لە دەرەوەی بن گەوەڕەکە و ئەویترمان لەژێر گەوەڕەکە پاسەوانیمان گرت. ئەو دوو ڕێپیشاندەرە زۆریان هەوڵدەدا ئێمەیش بخەوین، ئەوان یەک و تفەنگیان پێبوو، هەردووکیانمان چەککرد، بەبێ چەک پاڵکەوتن، بەرەبەیان مەخزەنی تفەنگەکانمان لێوەرگرتن و پێش خۆمان دان، ئیتر ترسیان لێ نیشت و بەبێ پرتە و بۆڵە ئێمەیان گەیاندە ئەو دیوی بێخمە و لە دۆڵی نێوان لووتکەکانی چیای پێرس، چوینە گوندی سۆسێ. لەوێ زۆر قسەم بە هەردووکیان گووت، چاویان لە بەر خۆ نابوو و رووی تەماشاکردنی ئێمەیان نەبوو، بەڵام دیسانەوە پارەکەم دانێ و ڕۆیشتنەوە. لەو گوندە نان و چایمان خوارد، یەکێکمان بەناوی خالد هەتا کۆلەکان لە بناری چیای بێکرێس، بە کرێ گرت. بەرانبەر چیای برادۆست کە بارەگای پێشمەرگەکانی حیزبی شیوعی لێ بوو. لە سەرەتای ڕێگاکەوە توشی مەفرەزەیەکی هەمان حیزب بووین کە "عەلی حاجی نادر و جوتیار عوسمان"یان لەگەڵ بوو لە زەمانی خوێندنی ئامادەیی یەکترمان دەناسی. پێکەوە لە سەرچاوەی کانییەک دانیشتین و زۆریان ڕێز لێگرتین کە زانییان ئێمە ئاڵای شۆڕشین و بەندەشیان ناسییەوە کە فلان کەسم. ئەوەبوو"عەلی" خالدی ئێزن دا و چەندی کردمان پارەی ئەوەندەی وەرنەگرت. عەلی گوتی خۆم بە کارێک دەچمە ئەو گوندانە، هاوڕێیەکی بەناوی شاخەوان، کە کەرکووکی بوو لەگەڵمان هێشتەوە، سۆراغی چوونمان بۆ ناوچەی لۆلان لەگەڵ باس کرد و گوتی، ئێوە بڕۆن لەو گوندە چاوەڕوان بن، هەتا خۆم دەگەڕێمەوە و هەوڵ دەدەم کارئاسانیتان بۆ بکەم .

بۆ شەو هەرشەش پێشمەرگە گەیشتینە گوندی بێکرێس، کە کەوتووتە بناری چیای بێکرێسەوە لە بەرانبەر چیای برادۆست، نزیک زێی بادینان، کە بە کەناری گوندەکانی بلە و بارزان، بۆ گەرووی تەنگەژەی بێخمە شۆڕ دەبێتەوە. لەو گوندەدا چەند خێزانێکی بارزانییە رزگاربووەکانی شاڵاوی ئەنفالکردنیان لە ساڵی ١٩٨٣دا، لەسەر ئاسەواری

کەلاوەی ویرانکراوی گوندەکە، چەند خانوێکیان بۆ خۆیان قیت کردبوەوە، بە ڕوتوڕەجاڵی ژیانیان تێدا بەسەر دەبرد. ئێمە میوانی ماڵی مام خەلیل بووین، ئەو مرۆڤەی سەرباری ژیانێکی پڕ لە بەلەنگازی، یەک لووتکەی چاوتێری و سەربڵندی بوو، ڕاستە پیاوێکی کەمدوو بوو، بەڵام خوێن شیرین و ڕوومەتگەش بوو. بەخێرهاتنی گەرمی کردین و لەگەڵ ئەوەی تەنیا یەک ژوور و ساباتێکیان هەبوو، بەتێکەڵی لەگەڵ ژن و منداڵە هەراشەکانی دانیشتین. ئەوەندە ماندووبوم، وەک ماڵی خۆم، یەکسەر پشتمکردەوە، لە جێگاکەی خۆمدا، قاچم درێژکرد و خەو بردمییەوە.

لە ١٩٨٥/٨/٢٦، بە چاوساغیی ئەو پێشمەرگەیەی حشع، کەوتینە سوڕانەوە بەو گوندە ئاوەدانکراوانەی ناوچەکە، کە لەلایەن ڕژێمەوە بە ناوچەی یاساغکراو لەقەڵەم درابوو. یەکەم گوندێکی ئاوەدانکراوەی بەرچاو، گوندی سەیدان بوو، خەڵکەکەی هەموویان لە بارزانییە دەربازبووەکان بوون. بەو ژیانە سەرەتاییەی بۆ خۆیان پێکەوەیان نابوو، ڕازی بوون و زۆربەیان چەکداری ماڵی خۆیان بوون. هەر لەو گوندە بەندە سۆراغی ماڵی باوکی "حەفسەتخان"م کرد و ناوی "مەلا سەلیم"یان بۆ هەڵدام. کە چوومە ماڵی "سەلیم"ێکیان، دوای بەخێرهێنانمان، پیاو و ژنێکی تەمەنی چل ساڵە بوون، زۆر بەڕێز، گران و سەنگین بوون، بەپێکەنینەوە، گوتی ئەوەش هەر ماڵی خۆتانە، ئەو "سەلیم"ی ئێوە بۆی دەگەڕێن، ئەوە ماڵی لە گوندی پێشەوەیە، واتە گوندی بێکرێس. ئیتر لەوێ ڕۆژەوە دوای ناساندنی خۆمان کە پێشمەرگەی ئالای شۆڕشین، دۆستێکی جوامێرمان پەیداکرد و دواتر بوە پشت و پەنامان. هەر بۆ نموونە، پاش زیاتر لە ساڵێک، جارێکیان لەگەڵ بەکر خۆشناو و سورە بە یەکەوە لە ناوچەی بادینان دەگەڕاینەوە، لە بەردەم گوندی سەیدانەوە، لەناکاو کەوتینە ناو پێشمەرگەکانی ئەوهێزەی "ی.ن.ک"، کە بەرەو بادینان دەچوون. هەندێک لەو چەکدارانە کە لە ماڵی کاک سەلیمی بوون، پرکێشی ئەوەیانکردبوو، پەلاماری ئێمە بدەن، بەڵام سەلیمی جوامێر دەستی دابووە تفەنگەکەی خۆی و هاواری لێ کردبوون، هەر کەسێک دەستدرێژی بکاتە سەر ئەو پێشمەرگانەی ئالای شۆڕش، ئێمە شەڕی دەکەین! ئیتر ناچار ئەوانەی "ی.ن.ک" کشانەوە و دەورەیان بەرداین و تەنیا شەرمەزارییان بۆمایەوە. هەرچەندە دواتر کە ئازاد هەورامی بەو هەواڵەی زانیبوو، کورتە نامەیەکی بۆ من نووسیبوو کە تێیدا داوای بووردنی کردبوو.

هەر لەم گوندەدا، "سەلیم"ێکی دیکە هەبوو، لەناو خەڵکی دێیەکە بە قۆشمەچی ناسرابوو، تا بڵێی قسە خۆش و پڕ فشە بوو، هەر دەتگوت لەناو خەڵکی شار ژیاوە. هەندێ جاران بە فشەیش بوایە، لە پەیداکردنی ئازوقە یارمەتی ئێمەی دەدا. شەوەکەی لەو گوندە ماینەوە، بۆ ڕۆژی دواتر لەسەر قسەی "سەلیم"ی خۆش فشە، بە زێی بادینان، بە

شرە کەلەکێک پەڕینەوە ئەوبەر و نانی بەیانیمان لەو تەنیا ماڵەی گوندی "شانەدەر"ی کەناری ئاوەکە خوارد. ئەو کاتە تەنیا چەند مێردمنداڵێکی کیژ و کوڕ لەگەڵ ژن لە ماڵ بوون. پیاوی ماڵەکە بە سەفەر چووبووە گوندی کەلەکین! منداڵەکان هەتا باوکیان نەهاتبووەوە، ڕێزێکی زۆریان گرتین، گەورە و بچووک لە دەورمان کۆببوونەوە و بەدیتنمان شاگەشکە بوون، بەتایبەت کە زانییان ئێمە پێشمەرگەی ناوچەکانی هەولێرین، بە دڵ غەریبی خەڵکی ئەو شارەیان دەکرد و لە گێڕانەوەی کۆمەکی خەڵکی ئەو شارە تێر نەدەبوون.

لەپڕ خاوەن ماڵ گەیشتەوە ماڵ، دۆخەکە سەراونخون بوەوە، کابرا بە دڕدۆنگی و بەسەری زمان بەخێرهێنانی کردین. ئێمە زوو لە خۆمان گەیشتین، خێرا ماڵەکەمان بە جێ هێشت، بۆ هەڵەداوانکردنی ئەو پیاوە، بە ئانقەست سۆراغی ڕێگای برادۆستمان کرد، لە پەنا و پێچەکانی ناو دارستانە چڕەکەی بناری چیای برادۆست، ڕێگامان بەرەو گوندی "فەقێیان" گۆڕی. دیارە لەو هێنومنهێنەدا، شاخەوانی حشع ڕابەرمان بوو، بۆمان بە پەرۆش بوو. گوندەکە هەر سەعات و نیوێک دوور بوو. خۆیان دوو ماڵ بوون. ئێمە بەدوای ڕەجەب ناوێک سۆراخمان کرد، کە ماڵی یەکەم بوو. دوای بەخێرهێنانێکی دۆستانە، بەتایبەت کە زانییان لەلایەن مەلا سەلیمی بێکرێسەوە بۆ لایان ناردراوین. زۆریان ڕێزگرتین، سەرباری لێقەوماویی خۆیان، بۆ نیوەڕۆ فراڤینێکی گەرموگوڕیان بۆ ئامادەکردین و دۆیەکی زۆرم خواردەوە. بە خراپیی باری تەندروستیمەوە، لە ژێر ساباتەکەیان سەرخەوێکم شکاند. بۆ عەسرەکەی لەگەڵ ڕەجەبی خانەخوێ کەوتمە باسکردنی مەبەستی سەردانەکەمان. ڕەجەب ڕاشکاوانە وەڵامی دامەوە و گوتی: هەرگیز ئەو نکاری لەو ڕۆژەدا بەگەرمان بکەوی، چونکە لەو ڕۆژانەدا ڕژێمی عیراق ناوچەی لۆلانی گرتووتەوە، ناوچەکە بوەتە بەرەی جەنگی عیراق _ ئێران و پێشمەرگەی حیزبە کوردییەکان لە ناوچەکە کشاونەتەوە. ئێمە بەو هەواڵە زۆر نیگەران بووین، ڕەجەب و برایەکەی بۆ دڵدانەوەمان، کەوتنە ڕێنماییکردنمان کە یەکێکی شارەزای دەشتی بەرازگر بدۆزینەوە و بە دۆڵی خواکورکدا، دکارین بگەینە بنکەی فەرەنسۆ حەریری، کە ئەو کاتە بەرپرسی لقی دووی پارتی بوو. هەمان کات لەو دۆڵەدا، بنکە سەرەکییەکانی حیزبی شیوعی عیراقی بەدرێژایی دۆڵەکە، و حسک لە گوندی شوشان بوو. بۆ درەنگی ئێوارە، بە دڵگرانی بە ڕێگای خۆماندا گەڕاینەوە سەر زێ و بەو کەلەکەی بەیانی بۆ بەری گوندی بێکرێس پەڕینەوە.

شەوەکەی چوینە ماڵی ئەو "سەلیم"ەی کوڕی مەلا محەمەد کۆلەکی و باوکی "مەلا نەمر"، کە زۆر خزمەتیان کردین، بە تایبەت کە زانییان من کوڕی ئەو پیاوەم لە

لیقەومانەکەیان لە ئۆردوگای قوشتەپە دوو گەنجی ئەو بنەماڵەی لە قورگی ئەنفالکردن دەرباز کردبوو. شەوەکەی لەگەڵ مەفرەزەکەی عەلی حاجی نادری حشع یەکترمان گرتەوە. جێگای باسکردنە هەر لە ماڵی باوکی "مەلا نەمر" بووم، دوو ژنە بارزانی، کە بە قاچاغ لە هەولێرەوە هاتبوون و دەستە خوشکی حەفسەتخانی خوشکە گەورەی سەلیم بوون، میوان بوون و دیاربوو چاک ماڵی باوکی بەندەیان دەناسی، هەتا ناوی هاوسەرەکەشمیان دەزانی. لە ڕێگای ئەو دوو ژنەوە، نامەیەکی ئاسابیم بۆ نەجیبەخان و ماڵەوە و نامەیەکی کورتیش بۆ ڕێکخستنەکانی ئالای شۆڕشی ناوشار نووسی، بەڵام وشەکان هەریەکەیان جفرەیەک بوون کە پێشتر لەسەری ڕێکەوتبووین. بە کورتی هەواڵی ساغ و سەلامەتی و نیازی خۆمان لە ڕۆیشتن بۆ لای برادەران بۆ نووسیبوون. هەروەها ئاگادارم کردبوونەوە، کە هەر شتێکیان بۆ ئێمە هەبوو، دەتوانن بیگەیەننە ماڵی سەلیم. ئێمە لە نزیکترین فرسەت دەگەڕێینەوە و لەو ناوچەیە بنکە دادەمەزرێنین. ژنەکان بەوپەڕی ئامادەباشی نامەکانیان لێ وەرگرتین، بەبێ ئەوەی کەسی دیکە پێی بزانن، ئیتر ئەو ماڵە بووە وێستگەیەکی نهێنی هاتوچۆی تەتەر و پۆستەکانمان. بە تایبەت هەتا خۆم و دڵشاد و وریا قادر لە ناوچەکە بووین. ئەو بنەماڵەیە نەوەک هەر لە بارزان، پشت و پەنامان بوون، بگرە هەتا لەئێرانیش، بۆ من وەکرێکی شاراوە و مسۆگەر بوون.

دوو ڕۆژان لەگەڵ کۆی مەفرەزەکەی حشع بەو گوندانە سوڕاینەوە. خەڵکەکە لەبەر کەمی و بگرە نەبوونی ئازوقە بۆ خۆیان و منداڵەکانیان، چجای بۆ مەفرەزەیەکی بیست پێشمەرگەیی لێمان بێزار بوون! زۆربەیان ئەو خێزانە بارزانییانە بوون، کە بە کولەمەرگی لەو ڕەشبگیرییەی ڕژێمی عیراق ڕزگاریان ببوو. بە چاوقایمی و لەسەر پێست و ئێسکوپروسکی خۆیان، لێرەولەوێ خانولۆچکەیەکیان بۆ ماڵ و منداڵەکانیان قیت کردبووەوە و بە ژیانێکی زۆر سەرەتایی شوکور بوون. منداڵەکان گەورە و بچووک لە خوێندن و قوتابخانە بێبەش کرابوون، دەبوو ڕۆژانە لە شانی دایک و باوکەکانیان بە دارکەری، زەوی کێلان، خانووکردن، دروێنە، لەوەڕاندنی ئەو تاقولۆقە بزن و کاریلە، چێڵ و گۆلکانەی هەیانبوو، ڕۆژوشەو بەیەکەوە گرێ بدەن. بازرگانە کوردە چاوچنۆکەکانی شەڕیش لە ناوچەکەدا، کەلوپەلە پێویستەکانی گوزەرانیان بە نرخێکی خەیاڵی و بەوپەڕی دڕندانە پێ دەفرۆشتن. ئەو مرۆڤانە لەوێ ڕۆژاندا، لووتکەی خۆراگری و بەرخۆدان بوون. هەتا سەرودەمی شاڵاوەکانی ئەنفالکردنی دەنگی موقاوەمەتی کورد لە شاخەکاندا، بەو ژیانە سەربڵند بوون. ئامادە نەبوون زێد و واری خۆیان چۆڵ بکەن و ڕوو لە ئاوارەبوون و ژیانی ڕەزیلبوونی ئێران بکەن. دەبێ هەڵوێستی جوامێرانەی ئەو خێزانە بارزانییانە لەو بارودۆخدا، لە لاپەڕەکانی خەباتی نەتەوەکەمان بخوێنرێتەوە و لەبیر

نەکرین. ئەوە بوو دیسانەوە، هیچ کەسێکی شارەزامان دەست نەکەوت بۆ سەفەرەکەمان بە دەشتی بەرازگردا. ناچار عەلی حاجی نادر، دوو کادر (جوتیاری هەولێر و جوتیاری کەرکووکی) ی بۆ ئامادەکردین، کە چاوساغیمان بۆ بکەن هەتا لای قاتعی هەولێری حشع لە ناوچەی کافی لە بەری بادینان.

ڕۆژی ٨/٢٩ بوو لە گوندی "سەیدان"ەوە بەرەو گوندی ئەرکان چووین، کە لە دەمی ئاوی زێیەکەوە بوو و شەوێ لەوێ خەوتین. بەیانی بەرەو گوندەکانی شرێ، هەڕنی، هەرکێ بەرێکەوتین، شەومان لەو گوندە بەسەر برد. بۆ ڕۆژی دواتر بە گوندی "چواربۆت"ەوە تێپەڕین، بە گەرووی دۆلی پلنگان سەرکەوتینە سەرەوە، زینی نێوان دوو لووتکە شاخان کە یەکێکیان لووتکەکانی مەتین بوو، ئەوی دیکەشیان زنجیرەیەکی گارابوو. لەو سەرزەمینەدا گوندێکی خۆش هەبوو، نزیکەی بیست ماڵ دەبوون، خزمی یەکتر بوون، بەناوی گوندی "بانێ"، کە خەڵکەکەی تەنیا خەریکی بزن بەخێوکردن و دار و مازووکردن بوون، زۆر میواندۆست و چاوتێر بوون. دیار بوو زۆربەی ژمەکان پێشمەرگەی نێوان ناوچەکانی بادینان و بارزان، لەگەڵیان هاوبەش بوون. شەو لە "بانێ" لە مزگەوتەکە خەوتین، بەیانی سەرلەنوێ بەسەر ماڵەکان دابەش بووین، من و ڕێباز چووینە ماڵێکەوە کە بەداخەوە ناوم لەبیر نەماون، بۆ لەمەودوا بوونەدۆستمان، چەند جارێک ڕێگام بەوێدا کەوت، هەر دەچوومە ماڵی ئەوان، زۆر بەڕێز بوون. ئەو ڕۆژە گەیشتینە قاتعی هەولێری حیزبی شیوعی، لەلایەن مستەفا حاجی ڕەحمەتی، ناسراو بە "ابو سیروان" پێشوازیمان لێ کرا. چەند شەوێک مێوانیان بووین، ئەوانیش وایان پێ باش بوو، کە چاوەڕوانی مەفرەزەیەکی هەرێمی کوردستان بکەین کە مقریان لە گوندی "مەڕانە" بوو، تاکو لەگەڵ ئەوان بچین بۆ دۆڵی خواکورک. بەلام سەیرم کرد زۆر دوا دەکەوێ، وامان بە چاک زانی ئێمەی ئالای شۆڕش، بچین لە خوارەوەی گوندی "کافێ" لەگەڵ برادەرانی لقی هەولێری حیزبی شیوعی بژین، کە زۆربەیان ناسیاو و برادەری شارمان بوون. بەتایبەت مام عەلی کوتک، مام عەلی حاجی تایەری قازیخانەیی و کوڕەکانی، چەمال دیبەگەیی، مامۆستا سەفەر، کانەبی گەڕەشێخانی و چەندانی دیکە کە ناوەکانیانم لە بیرنەماوە.

هەتا رۆژی ١٩٨٥/٩/١١ چاوەڕێ بووین. ئەو ماوەیە لەگەڵ مام عەلی حاجی تایەر سەردانێکی بارەگایەکی پارتیمان کرد، کە لە لاپاڵێکی گوندەکە بوون. زوبێر و شەماڵ، کادرێکی گەڕاوەی "حیزبی شەعب"یان لە لا بوو. پێشوازییەکی گەرمیان کردین، ئەو دەمە نێوانیان لەگەڵ قاتعی حیزبی شیوعی سارد بوو، هەتا "ابو ربیع و ابو سیروان"یش پێیان خۆش نەبوو مام عەلی لەگەڵ ئێمە بێت، بەلام مام عەلی وەک ناسیاو لەگەڵ من

هەڵسوکەوتی دەکرد، کە برادەر و دۆستێکی گیانی بە گیانی باوکم بوو لە ژیانی گوندی نێوان "شێخانا، قازیخانە، باشتەپە، عەلیاوە" لە ناوچەی دەشتی هەولێر، زۆر گوێی بە حیزب نەدا. نیوەڕۆ لەلایان مایەنەوە و زۆریان تەکلیف کرد کە شەو لەلایان بین، بەڵام من بۆ دڵڕاگرتنی برادەرانی حیزبی شیوعی و بەبیانوی سەفەر بۆ بادینان رازی نەبووم. زبێر و شەماڵ زۆریان لوتف نیشان دا، کە ئامادەی هەموو هاوکارییەکن بۆ ئێمە لە ناوچەکە، ئەگەر نیازمان دانانی بارەگایە، چیمان بوێ بۆمانی دەکەن. ئێمەیش بە سوپاس و پێزانینەوە وەرمانگرت، من دەستپێشکەری ئەوەم کرد، کە ئەوان خۆیان کوڕی ناوچەکەن، بمانەوێ و نەمانەوێ خەڵکەکە هەمووی هەم کەس و کاریانن، هەمیش زۆرتر بەقسەی ئەوان دەکەن، بۆمان ڕوونکردنەوە کە حیزبی شیوعی هەمیشە دۆستایەتی گەرمی لەگەڵ بارزانی نەمر هەبووە و بارزانی ڕێزی لێ گرتوون، هەنووکە ئەوان لەو ناوچەیە گیریان خواردوە، بارودۆخەکەی ئێرە زۆر ناهەموارە بۆ ژیانی پێشمەرگەکانیان، بەڵکو جەنابتان قسە لەگەڵ خەڵکی گوندی بکەن، ئەوەندە سەریەشەمان بۆ دروست نەکەن. ئەوەبوو زبێر و شەماڵ هەردووکیان بە سنگفراوانییەوە قسەکانی منیان وەرگرت و هەموو سەرنج و گلەییەکانی خۆیان و خەڵکەکەیان لە بەردەمی مام عەلی باس کرد، ئامادەیی خۆیان نیشاندا کە سبەینێ سەردانی قاتع بکەن و لەنزیکەوە لەگەڵ "ابوسیروان" و ئەوانی دیکە دابنیشن، چ گیروگرفتێک هەیە چاری بکەن. بەدڵخۆشی بەڕێیان کردین و مەودایەکیش لەگەڵمان هاتن.

ئێمە گەڕاینەوە لای بنکەی سریەی هەولێر، مام عەلی یەکسەر کە ماڵەکەی لە نێوان هەردوو لادا بوو، بۆ لای "قاتع" ڕۆیشت. ئێوارە نەببوو، "ابو سیروان" خۆی هاتە بنکەی هەولێر و لەگەڵ ئێمە دانیشت، لەنزیکەوە سوپاسی کردین کە ئێمە ئەو دەستپێشکەرییەمان کردووە بۆ نەهێشتنی ئەو ساردییەی نێوان "قاتع"ی حیزبی شیوعی و برادەرانی لیژنەی ناوچەی ئاکرێی پارتی لە ناوچەکەدا. گوتی بەیانی نیوەڕۆ ئێوەیش لە "قاتع" لەگەڵ برادەرانی پارتی دەعوەتن. دواییش مژدەی ئەوەی داینێ کە ڕەنگبێ سبەینێ مەفرەزەکەی هەرێم بگات، ئەوانیش پۆستەی خۆیان ئامادەکردووە بۆ بەرێکەوتن بەرەو بادینان و لەوێوە بەرەو دۆڵی خواکورک. ڕۆژی ٩/١٧، دانی ئێوارە لە گوندی "کافێ" بەرەو بادینان ڕێگامان گرت. لە مەفرەزەکەی هەرێمی کوردستانیش چەند برادەرێکی ناسیاوی هەولێریی تێدا بوو، هەروەها "مزەفەر چاوشین"یان لەگەڵ بوو، کە ناوی لە خۆ نابوو "سلیم"، گوایە یەکێتی و نەوشیروان ئەمری گرتنیان دەرکردووە، بەو بیانوەی خەت مایلی حشع بووە! ئێستاکەیش حشع بە زەماڵە دەینێرتە دەرەوەی وڵات، کە فیعلەن دوایی ناردیانە بولگاریا بۆ خوێندن. هەروەها مەفرەزەکەی قاتعی هەولێریش مامۆستا سەفەری لەگەڵ بوو، کە دەتوانم بڵێم یەکێک بووە لەو مرۆڤە جوامێرانەی لە ژیاندا دیتومە، هاوڕێیەکی بە

هەڵوێست و قسە خۆش، هەموو گیانیشی ڕاستگۆیی و ڕەوشتبەرزی بوو، لەشانی "ئەبو احلام"، چەندانی دیکە بۆ لای پزیشک دەهاتنە قاتعی بادینانی حیزبی شیوعی.

بۆ شەوەکەی لە گوندی "یەک ماڵ"ی بەری چیای گارا لامان دا، من و چەند پێشمەرگەیەکی حیزبی شیوعی کە "سعدون" عەرەبی تێدا بوو، دیار بوو ئەو مەسئولی یەکەمی ڕەتلەکە بوو، پێکەوە بۆ ماڵێک دابەشکراین، کە تەنیا ژن و پیاوێک لە ماڵەکە بوون. ئامر مەفرەزە عەسکەرییەکەی ئەو چەند کەسەی حیزبی شیوعی ناوی هەژار بوو. لە ماڵەکە پاش دانیشتن و بەخێرهێنان، کابرا پرسی، هوون مشەن؟ هەژار وەڵامی دایەوە، نەخێر مشەمان نایەت هەموو ساغین! کابرا لەجێی خۆی بێدەنگ بوو. منیش زانیم هەژار لە مەبەستی کابرا حاڵی نەبووە، وادەزانی زاراوی بادینی دەزانی، کەچی پرسیارەکە مانای وابوو کە ئێوە زۆرن؟ پاش نەختێکی تر پرسییەوە هۆن بلەزن؟ دیسانەوە هەژار بواری کەسی نەدا، بە تووڕەیی وەڵامی دایەوە، نا بۆ دەلەرزین! ئیتر من چیتر خۆم بۆ نەگیرا، لە حریتەی پێکەنینم دا، هەژار زیاتر تووڕە بوو، بەڵام بەسەر خۆم نەهێنا و بە چرپە پێمگوت، براگیان من حیزبی شیوعی نیم و میوانم، بەڵام تۆ کە لە زاراوەی بادینی تێناگەی بۆ تووڕەدەبی! لێرەدا سعدون کە دیار بوو لە کوردی دەگەیشت، بە هەژاری گوت: هاوڕێ بێدەنگ بە و ئەو هاوڕێیە لە تۆ باشتر تێدەگا، ئەو کابرایە چی پرسی، پێمگوت، برا ئەو دەپرسی ئێوە بەپەلەن؟ ئیتر هەموویان دایانە پێکەنین، هەژاریش داوای بووردنی لە من کرد، پیاوەکەش زۆر سوپاسی کردین کە هەنووکە لە یەکتر حاڵی بووینە، ئەوجا خواردنمان بۆ هات. پاشان یەک و بەتانیمان وەرگرت، چووینە سەربانی دیاریکراو، هەموو لەوێ خەوتین، بەڵام بەحراسات دانانەوە. دیسانەوە من و هەژار بەیەکەوە نۆبەتمان بەرکەوت. بۆ ڕۆژی دواتر بەرێکەوتین، نیوەڕۆ گەیشتینە گوندی "بییە" کە گوندی "ساردکێ"یش زۆرێک لە پێشتر بوو، بەڵام نەکەوتبووە سەر ڕێگاکەی ئێمەوە. بۆ دەمی عەسر بە گەلی "بییە"دا پەڕینەوە نزیک جادەی ئامێدی، تا دەمەدەمی ئێوارە لەناو کەندەڵانەکانی خۆمان مەڵاس دابوو، چونکە تێکرای دەورووبەری جادەکە بە ڕەبییەی سەربازی تەنرابوو.. بۆ تاریکبوون زۆر بەپارێز، یەک یەکە لەسەر جادەکە پەڕینەوە.

گارا دوو زنجیرە شاخی تێک قژقژاوی بەرانبەر یەکە، دۆڵەکانی یەکجار پڕدارستان بوو، دیمەنی دڵگیری هەبوو، بەڵام ئاوی زۆر کەم بوو، هەردوو زنجیرە چیایەکە لەم سەر و لەو سەرەوە لەیەکتری نزیک دەبنەوە. بۆ درەنگانی شەوێ گەیشتینە گوندی "سگێ"، بەشێکی ماڵەکان دیان بوون، کە ئێمە بۆ نانخواردن بەر ماڵێکی دیانی قسەخۆش هاتین، لەگەڵ درەنگی شەویش خواردنێکی گەرموگوڕ و بەگۆشتیان دەرخوارد داین، دیار بوو خودانی ماڵەکە بە چاویلکەکەی منەوەی گرتبوو، هەر دەیگووت دەبێ پێکێک عارەقم لەگەڵ

بخۆیتەوە، تۆ هەر لە برادەرێکی من دەکەیت کە ئێستا لە بەغدایە. دڵم نەشکاند، ئەو پێکەی بۆی تێکردم، بە دوو جاران فڕم کرد، بەڵام دوایی لە ڕێگا زۆر تەمبەڵ و خەواڵوی کردم، ژانە سەری دەرخوارد دام.

ڕۆژی ٩/١٩ گەیشتینە گەلی "سێ گەریان" و گوندی "سەرگەلی"مان بەسەرکردەوە و بەرەو گوندی "بناڤێ" هەنگاومان هەڵگرت. دوای نانخواردنی نیوەڕۆ پەڕینەوە بۆ بارەگاکانی قاتعی بادینانی حیزبی شیوعی و بۆ ئێوارە درەنگانێ گەیشتینە سەریان، کە دۆڵێکی هێجگار سەخت و پڕ داروبار بوو. ئەوچەند ڕۆژە زۆرتر لەگەڵ "سەفەر/سالار" ئاشنایەتیمان پەیداکردبوو. سەیرم کرد زۆر ناڕازییە لە سیاسەتی حیزبی شیوعی و هەتا رەخنەی توندی لێ دەگرتن. ئێمە خۆمان، کە پێنج پێشمەرگەی ئاڵای شۆڕش بووین، وەک پەنجەی یەکدەست هەڵسوکەوتمان دەکرد، کە زۆر لە پێشمەرگەکانی حشع گونجاوتر بووین، ئەوان بە هەردوو مەفرەزەکەی هەرێمی کوردستان و قاتعی هەولێر، ٢٠ پێشمەرگە دەبوون. لەگەڵ ئەوەش پێشتر بە بێتەل ئاگاداری یەکتر بوون، کەچی هیچ کەسێک لە قاتعی بادینان پێشوازی لێ نەکردین و کەسیش بەخێری نەهێناین، تەنیا ئەوانەی حشع کە برادەر و دۆستیان لەوێ هەبوو، بەتایبەت عەرەبەکان یەکتریان بەسەر کردەوە. ئێمەش ئەوانەی ئاڵای شۆڕش و کوردەکانی حیزبی شیوعی، کەس پێی نەگوتین ماڵتان لەکوێ! هەمووومان بە حەپەساوی لە پەنا دیواری سەربانێکەوە تەماشای یەکترمان دەکرد. لێرەدا سالار/ مامۆستا سەفەر زۆر تووڕەبوو، هاواری لە "ابو احلام" و سعدون کرد و پێیگوتن، قەیدی ناکات ئەوە ڕیزی ئێمەی هاوڕێیانی کوردی حیزب ناگرن، ئەدی ئەو میوانانە تاوانیان چییە، بۆ کەس ڕێ و شوێنێکیان نیشان نادات...!

من بیستبوم کە بارەگای لقی ١ ی پارتی لەوبەری ئاوەکەیە و دکتۆر جرجیس لەوێیە. گوتم دیارە لێرە جێگا و شوێنیان نییە. بەڵکو ڕێگای چونە لقی ١ی پارتیمان نیشان بدەن.، زۆر مەمنوون دەبین. دیار بوو سەعدون[39] غیرەتی هەستا، شوێنەکەی خۆی و پێشمەرگەکانی بۆ ئێمە چۆڵ کرد، کە سەربانێک بوو. بەڵام مامۆستا سەفەر هەر هاواری دەکرد، قسەی بە "ابو احلام" دەگوت، کە ئاوا خۆی بێدەنگ کردووە. پاش مەودایەک دەستی سەفەرم گرت و پێکەوە سەرکەوتینە سەربانەکە، لەسەر هەندێ شرە بەتانی دانیشتین. ئەوجا هەر سعدون هەندێ نان و پەنیری قوتی بۆ هێناین کە هەمووومان برسیمان بوو. لەبیرمە چەندم کرد، سەفەر هیچی نەخوارد، شەوەکەمان زۆر بەدڵگرانی

---

[39] سەعدوون، کە لەم ساڵانەی دوایی پلەی گەیشتبووە ئەندامی مەکتەبی سیاسی حشع و ژنێکی کوردی هێنابوو، بەداخەوە لە ڕێگای بەغدا بەدەستی تیرۆریستان شەهید بووە.

بەسەر برد. بۆ بەیانی خۆمان چووینە سەرئاو، لە ڕێگای "مزەفەر چاوشین"ی نەوسن، قەلێکمان کڕی و لەسەر ئاوەکە بەدەم خۆشوشتن و پاککردنەوەی جلەکانمان، لەوێش بەبەشداری سەفەر تەشریبی گۆشت قەلمان خوارد.

بۆ ڕۆژی دواتر سەیرم کرد لەلایەن "مەهدی حافز و تۆما تۆماس"ەوە هەر بەتەنیا منیان بانگ کردووە بۆ ژوورەکەیان بۆ چاوپێکەوتن و مشورخواردنی سەفەرەکەمان. خەریک بوو نەچم، بەڵام هاوڕێیانم ناچاریان کردم دەبێ هەربچم. ئەوە بوو کە چوومە ئەوێ، بەگەرمی پێشوازییان لێ کردم. هێشتا دەوری سەعات ١٠ی بەیانی بوو، تەکلیفی نانخواردنی بەیانیان لێ کردم، کە خواردنەکەیان ماست و هەنگوین و پەنیر و هێلکە بوو، سوپاسم کردن، گوتم من لەگەڵ هاوڕێیان نانم خواردووە. پاش تەواو بوونی قسە و باسەکانمان، گوتیان بەیانی بەڕێدەکەون، بەڵام ڕێگا پڕمەترسی و زۆر ناخۆشە، ڕەنگبێ ماوەیەک بەناو خاکی کوردستانی باکوردا (تەبیعی ئەوان گوتیان بەناو خاکی تورکیا دا) دەڕۆن، دەبێ زۆر وریای خۆتان بن، پێشمەرگەکانی ئێمە هەموویان کورد نین، نابێ لەکاتی لێقەومان بەجێیان بهێڵن، زۆر تەکلیفی ئەوەیان کرد کە نیوەڕۆ بەتەنیا لەلای ئەوان نان بخۆم کە سەر و ژووری پۆشتە و پەرداخی سەرەنجراکێشەریان هەبوو، لەنێوانیشیانەوە لە بەرهەیوانێکی دڵگیر، جێ و بالینگانیان دانابوو. کە بەڕێیان کردم، سەیرم کرد ئەوە "بامیە" چاک دەکەن بۆ فراڤینی نیوەڕۆ، پەشیمان بوومەوە، بەڵام تازە گەڕانەوەم بە جوان نەدەزانی، چونکە من زۆر حەز بەشیوی بامیە دەکەم، ئەو ڕۆژەش هەتا شەو لەگەڵ "سەفەر" پێکەوەمان بەسەر برد. داخی گرانم هیچی دیکەم نەدیتەوە، کە دواتر لەناو شار گیراو، لە ژێر ئەشکەنجەدا گیانی لەدەست دا. ئەو مرۆڤە گەورەیە بۆ کۆمەڵی کوردی زۆر سوودبەخش بوو، بەتایبەت لە قولایی ئێش و ئازارەکانی خەڵکی دەوروبەری دەگەیشت، هەستکردنی زۆر تەڕ و ناسک بوو.

لەڕۆژی ٢١ی مانگی نۆ لە قاتعی بادینانەوە بە "دۆڵی زیوە"دا سەرکەوتین. گوندەکانی وەک "بناڤێ، کورکو، دەرگونی، باجیا" هەنوکەش لە بەرچاومن کە چەند رووت و ڕەجاڵ بوون، دەتگووت کەپری سەفەرین بەو یالانەوە نووساون. بە نزیک گوندەکی فەلاندا تێپەڕین، نانی نیوەڕۆمان لە گوندی "شێڤی خواروو" خوارد، کە گوندێکی پڕماڵ و قەرەباڵغ بوون. بۆ پاش نیوەڕۆ بەو گوندانەدا تێپەڕین؛ کارۆکە، کورکە، سارکێ، شاجە و شەوێ لەوێ ماینەوە .

٩/٢٢ بوو، بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە گوندی "چۆم جوو"، کە یادگاری ڕۆژانی "قاسمە ڕەش"ی نێوان هەردوو کوردستانی باشور و ڕۆژهەڵاتی بەبیر هێنامەوە. ئێرەش وەک فرۆشتگایەکی ئازاد بوو، هەموو کەلوپەلێکی تێدا دەست دەکەوتن. خواردنگە و چایخانەکی

زۆری لێ بوو، لێرە بوو تووشی "ئەبو راستی" بووین، کە بەماڵ و منداڵەکانییەوە بە پێچەوانەی ئێمە بۆ خوار دەگەڕایەوە. دیسانەوە "مزەفەر چاوشین"ی چەمبەری پێمانەوە نووسا، دەیگوت هەر دەبێ دەعوەتم بکەن و یەک دوو نەفەر گۆشت و کەبابی خوارد و هەر تێر نەدەبوو!! ڕۆژ ڕۆژی زگ تێرکردنی ئەو بوو. ئیسراحەتێکی باشمان کرد و بۆ بەرەبەری ئێوارە بەڕێکەوتین، شەوەکەی لە هەورازی گوندی "باوند" ماینەوە. بۆ بەیانی بە دۆڵێکی زۆر سەختدا ڕێمان بڕی، لە هەواری گوندێکی ڕاگوێزراوی مزوورییەکانەوە نانمان خوارد، بە کەلەک لە ڕووباری "شینێ" پەڕینەوە، کە ئەم بەر و ئەو بەری هێجگار پڕ سەوزایی جوان و ڕازاوە بوو. ئاووهەوایەکی هێجگار سازگاری هەبوو. ئێوارە گەیشتینە ناوچەی ڕێکان، و هەواری گوندی "پێندرو". شەو درەنگانێ خۆمان گەیاندە هەواری گوندی "ئێدلبێ" و ماڵەکان هەموویان لە مزوورییە ئاوارەکان بوون.

بەیانی٩/٢٤ گەیشتینە سەر کانی و ئاوێکی سازگاری بناری شاخی بەرانبەر شارۆچکەی "شێروان مەزن" و لە بەرانبەر سەنگەرەکانی سوپای ڕژێمی عیراق، پشوویەکمان وەرگرت. ئێوارە گەیشتینە سەر کانییەکی بەردەمی گوندی "درێ"ی وێرانکراو. لەوێ خەریکی نانخواردن بووین، پێشمەرگەکان، ئەوانەی جارێکی تر بەو ناوە داهاتبوون، چوون هەندێ ترێی ڕەشمیری دنک گەورەیان هێنا، لەناو ئاوی کانییەکەیان دانا، بە هەموومان کەوتینە سەری. لەو دەمەدا یەک دەستە پێشمەرگەی چوست و پۆشتە و پەرداخ پەیدا بوون، کە مەفرەزەیەکی ناوچەی زاخۆی پارتی بوون و بۆ ڕاژان دەچوون. هاتن لە دەوروبەری کانییەکە ڕونیشتن، دوای پرسیار و وەڵام یەکێکیان کە دیار بوو مەسئولی ناوچە بوو، لە "مەناف"ی پرسی ئەو تفەنگەی پێتە ناوی چییە! پاشان هەر سەیری ئێمەی دەکرد کە هەر پێنجمان وەک دەستە چۆلەکەیەکی تەرە بەدەوری یەکتری کۆببووینەوە. هەر لە خۆیەوە گوتی، ئەو گوندە ڕووخێنراوەی دەیبینن، گوند و هەواری شەهید "عبدالرحمن جسیم"ە، کە جەلالیەکان لە قەندیل شەهیدیان کرد، ئای ئەگەر جەلالییەکم دەسەت دەکەوێ، دەبێ چی لێ بکەم! منیش سەیرێکی هاوڕێیانی خۆم کرد، زۆر لە قسەکەی قەڵس بووم. گوتم: هەڤاڵ ئێمە ئەو پێنج پێشمەرگەیە هەتا پێش چەند مانگێک جەلالی بووین! من هەر ئەوەندەم گوت و نەگووت، لە چاوترووکانێک هەمووخۆیان کۆکردەوە، بەپەلەپروسکی ئەو ناوەیان بەجێهێشت. سەعدون کە بەرانبەرمان دانیشت بوو، بە عەرەبی پێیگوتم، ئەوانە لێرەش لە جەلالییەکان دەسڵەمینەوە! لەمەودوا ئاگاداری خۆتان بن، هەتا دەگەنە هاوڕێیان، خۆتان کەشف مەکەن هەر بڵێن ئێمە شیوعین! گوتم هاوڕێی بەڕێز زۆر سوپاس، بەڵام ئێمە بۆ درۆ بکەین، ئێتر ئەوە چەکمان پێیە و خۆمان لە کەس بە کەمتر نازانین.

ڕۆژی دواتر، هێشتا ڕۆژ هەڵنەهاتبوو، بەدەم ڕۆیشتنەوە، تا ڕادەیەک هەموومان دەستمان لەسەر دڵمان بوو. کە بە گوێرەی پڕوپاگەندەکان، هەنووکە نا هەنووکە توشی قەرەقۆلی سوپای تورکی دەبین و دەبێ شەڕی دەستەویەخەیان لەگەڵ بکەین تا رزگارمان دەبێ. بەڵام دیار بوو سعدون عاقلییەکی زۆری کرد، کە بەرۆژ، دانی بەیانی کە هەرگیز ئەوان بەهزریان دانەهاتووە، بیست پێشمەرگەیەک بە ڕۆژی ڕووناک بەناو ئەو خاکەدابێت، کە لە ژێر کۆنترۆلی ئەوان دایە. ئەوان زۆرتر شەوانە خۆیان لە مەلاس دەنا، هەر لەبەر ئەوەیش بوو ئەو وەرزێر و ڕەنجبەرانەی لەناو کێڵگە و پەنا گوندەکانیان توشیان دەبووین، بە واقوڕماوی سەیریان دەکردین. بەڵام هەموومان زۆر چاپوک تێپەڕین، لە هیچ شوێنێک ئەو چوار سەعاتە ئیسراحەتیشمان نەکرد. بە شاخەکەدا هەڵگەڕاین، پەڕینەوە بەری کوردستانی باکوور، سنوورمان بەزاند، نزیکەی ٤ سەعاتێک پێیدا تێپەڕین، دوای پەڕینەوەی بەری کوردستانی باشور سەعات ٨،٥ ی ئێوارە گەیشتینە سەر ڕووباری ناو دەشتی بەرازگر و سەعات ١،٥ ی شەو گەیشتینە گوندی "حەیات"، کە هێشتا بۆنکرووزی سووتانی خانووەکان مابوو. ئێمە بەبێ ئەوەی پێی بزانین، ڕۆژی پێشووتر سوپای عیراق لە هێرشێکی بۆسەر ناوچەکە، و سووتاندنی گوندەکە گەڕابووەوە. ئەوانەی ئاڵای شۆڕش لەگەڵ مزەفەر چاوشین چووینە خانوێکەوە، کەوتبوە بناری شاخێکەوە و دەستی لێنەدرابوو، پاش دانانی حەرەسیات، ئەوانی دیکە خەوتین، نۆبەتی بەرەبەیان بەر خۆم کەوتبوو، تازە دونیا بەرەو ڕووناکبوونەوە دەچوو، لەسەر بانەکە چوومە خوارەوە، خانووەکە دەرگای پێوە نەمابوو، بەڵام ڕێکو بەرچاو بوو، برادەرانی حیزبی شیوعی لەو لاوە خەریکی چالێنان و ئامادەکردنی قاوەڵتی بەیانی بوون. منیش پێش ئەوەی ئەوانەی خۆمان بەخەبەر بهێنم، سەیری ناوەوەی خانووەکەم کرد. تەماشام کرد لەسەر تاخچەی بنەبانی، چەند دەفتەرێکی گەورەی وەک دەفتەرەگەورەکانی حساباتی دوکاندارەکان هەیە. بەڵام دەستم نەگەیشتێ، ناچار دوای بێدارکردنەوەی هاوڕێیان، هەموو هاتن تەماشایان کرد. ئەوەبوو مەناف خۆی کورکردەوە و ڕێباز چووە سەر پشتی، دەفتەرەکانی هێنایە خوارەوە و کە سەیرم کرد، ئەوە هەموو دەفتەری تەنزیمات و کار و چالاکیی ناوچەی مێرگەسۆری پارتی بوون. نازانم لەوێ لەبیریان چووبوو، یان لە پەلەپرۆسکێی بەجێهێشتنی ناوچەکە، فریای ڕزگارکردنی نەکەوتبوون. ناو و شوێن و ئەدرێسی شیرازەی هەموو ڕێکخراوەکانی پارتی لە مێرگەسۆر، سیدەکان، سۆرانی تێدابوو. ئەوانەی ناوی شیرازەکانی ڕێکخستن بوون هەموویانم لە دەفتەرەکە هەڵپچڕی و تەقەت هەڵمگرتن. دەفتەرەکانی دیکەشمان هێنا بۆ ئاگرکردنەوە و چالێنان سوودمان لێ وەرگرت. مزەفەر زۆری هەوڵدا ئەو شتە نهێنییانەی شیرازەی ڕێکخستنی بدەمێ.

بۆ ڕۆژی ٩/٢٥ بەناو دۆڵی خواکورک کەوتین، بەڵام چ دۆڵێک، لە ژێری ژێرەوە لەهەندێ شوێن هەرئەوەتە ئاسمان دیارە . بە ماوەی زیاتر لە دوو ڕۆژ بە پێ ڕۆیشتنی پیاوی نەشارەزا نابڕێتەوە. دۆڵێکە دەتوانرێ یەک دەوڵەتی لێدانرێ، ئەوەندەی دۆڵ و شێو، قەدپاڵ و لووتکەی بەرز بەرزی تێدا دێ و دەچێ، کە من لە هیچ شوێنێکی ترم نەدیتوە. دەیان گوندی بچوک بچوکی تێدایە، هەمووشیان ناوەکانیان لە جۆری جورجان، شوشان، میسرۆک، حەیات، شوشنێ، خاسە، شێخان، زیخان، خەزنە... هتد. لێرەدا ئێمە گەرەکمان بوو لەپێشەوە سەردانی بارەگای لقی ٢ی پارتی بکەین لە "شوشنێ"، کە بەسەر شاخەکەوە بوون. لە برادەرانی حیزبی شیوعی جیابوینەوە و ڕێگایەکی دیکەمان گرت، بەڵام لە ڕێگادا، لە بەرەوەی گوندی "شوشنێ" توشی هەندێ پێشمەرگەی پارتی هاتین، گوتیان فرەنسۆ لەوێ نەماوە و لق بۆ پشتی "خرێنە"ی دوای لۆلان گواستراوەتەوە. ناچار دووبارە کەوتینەوە شوێن برادەرانی حیزبی شیوعی، کە زۆر تێپەڕیبوون. لە ڕێگادا توشی هەورازێکی زۆر ناخۆش هاتین، بەرەبەری نیوەڕۆ گەیشتینە سەری سەرەوە، لەوێش ڕێگامان لێ وون بوو. چەندێ گەڕاین و سوڕاین هیچ ڕێگایەکمان نەدۆزییەوە، لەو بینەوبەردەیە بووین گوێمان لە باعەباعی بزنان بوو، بزنەوانمان دۆزییەوە کە جۆرکێکی بەشانەوە بوو، ڕیشی زۆر هاتبوو، هەموو سەروگوێلاکی داگرتبوو، جلێکی شڕی لە بەر بوو و خەریکی شمشاڵ ژەنین بوو، بەڵام لەوەش وەستا نەبوو، لێی کۆبوینەوە و بەستەزمانە زۆر لێمان ترسا، چونکە لە هەموو لایەکەوە دەورمان گرتبوو، جارێ گوتمان مامەی شوان زۆرمان برسییە! ئەویش پیاوانە جۆرکەکەی لە ملی کردەوە و چی وردە نان و پەنیری پێی مابوو هەمووی لە بەردەمی ئێمە دانا، کە لەبرسان زۆرمان پێخۆش بوو. شوانە لە قسەکانیدا دەرکەوت جادە و شاری نەدیتبوو، تەمەنی نزیکەی ٢٥ ساڵان دەبوو، بێگومان نەخوێندەواریش بوو، لەو دەمەدا چەند فڕۆکەیەکی جەنگی بەئاسمانی سەرمانەوە تێپەڕین، لەخۆیەوە گوتی ئەو سەیارانە هەموو ڕۆژێ بێرەدا دێن! گوتمان بابە ئەوە فڕۆکەیە و بۆمان ڕوون کردەوە، سەیارە لەسەر جادەی خۆڵ و قیرتاو دەڕوا و فڕۆکە بەئاسمانەوە هەڵدەفڕێ. زۆر باوەڕی بە قسەکانمان نەدەهات، هەر سەری بادەدا. دوایی زۆر سوپاسمان کرد و ڕێگای پێنیشاندایین. پاش چەند سەعاتێک گەیشتینە مەقەڕێکی حیزبی شیوعی کە "ابو عامل"ی لێبوو. لەوێش لەگەڵ "وریا و گۆران" ی خۆمان بە یەکتری شاد بووینەوە.

لێرەدا لە گوندی "میسرۆک" بۆ یەکەمجار، چاوم بە "ئەبو فاروق"ی ئەندامی مەکتەبی سیاسی حیزبی شیوعی کەوت و زۆری ڕیز لێمان گرت. دوایی من داوای ئەوەم کرد کە دەمەوێ سەردانی "کەریم ئەحمەد" بکەم، کە لە ڕۆژی ناخۆشی دوای شەڕەکانی ١٩٨٣ ی

پشت ئاشان، بەیاوەری بەندە سەفەری سەرکردایەتی یەکێتیمان لە خڕی ناوزەنگ کردبوو. پێوەندییەکی دۆستانەی خۆشمان لەو سەفەرە دروست کردبوو. ئەوە بوو بۆ عەسرەکەی بەڕێزان " کەریم ئەحمەد، ئەبو تارا و ئەبو حیکمەت"م لەوێ دیت و ماوەیکی باش بەیەکەوە دانیشتین. لەو ماوەیەدا لەلایەن برادەرانی حسک "رەسول مامەند" نامەیەکمان بۆ هاتبوو، کە ئارەزووی خۆی نیشاندابوو لەوەی ئێمە سەردانیان بکەین. ئێمەش پێمان باش بوو، هەر پێنج هاوڕێیەکەی ئالای شۆڕش بۆ ئێوارە چووینە سەردانی برادەرانی حسک، کە بارەگایان لەوبەری مەکتەبی سیاسیی حشع بوو، واتە لە گوندێکی دیکە (شوشان). ئەوانیش بەگەرمی پێشوازییان لێ کردین، بەتایبەت رەسول مامەند، کە لە رۆژانی قەڵادزێی ساڵی ١٩٧٤ یەکترمان دەناسی. لەگەڵ مامۆستا سەعد، کە هاوڕێی تەمەنی خەباتی قوتابیان لە شاری هەولێر بووین. هەروەها قادر مستەفا کە ناسیاوی هاوگوندی ژیانی جوتیاری باوکم بوو، لەگەڵ مامۆستا ئەمین، کە لە خوێندنی زانکۆ یەکترمان دەناسی و چەند برادەرێکی دیکە. بارەگایەکی زۆر شڕ و شپرێویان هەبوو، دیاربوو لە دەمی گواستنەوە بوون، شەومان لە خێمەیەکی دڕاو بەسەر برد، کە زۆر هەژارانە بوو، زۆری گلەیی لە حزبی شیوعی هەبوو کە ئەوان ئاوا بە خۆشی دەژین، لێرەش جێگای خەوتنیان پەنا خێمەی دڕاوە. لە کۆی قسەکانمان لەگەڵ یەکتری، رەسول مامەند زۆر بێزار و بێحەوسەلە ببوو. پێمگوت وابزانم ئەگەر لە قسەکانت تێبگەم، ئێوە دەگەڕێنەوە لای برادەرانی یەکێتی. لێرەدا گوتی: با پێکەوە پیاسەیەک بکەین. چووینە دەرەوە، بەم تاریکە، کە قادر مستەفا لە دوورەوەمان چاودێری دەکردین، رسول پێی گوتم، تکات لێ دەکەم ئێوە دەچنە ئێران، خەڵکی ئێرانی و ئیتلاعات دەبینن، هەتا حیزبەکانی دیکەش بەتایبەت حشع، داواکارم ئەو مەزەندەی خۆت لەسەر ئێمە بۆکەس باس نەکەی! چونکە نامەوێ لەو هاتووچۆیە، هەتا دەمی گواستنەوە بەناو ئێراندا توشی سەریەشەی زیاتر بین. من زۆر لێی پەستبووم، گوتم برادەر دڵنیابە ئەوەی بەخۆتم گوت هەتا لەلای برادەرانی خۆشمان دوبارەی ناکەمەوە: چونکە من هەمیشە لەلای خۆمەوە باوەڕی تەواوم بە ئازادی بیر و کار هەیە. ئەوەبوو هەتا شەودرەنگانی بەیەکەوە بووین. بۆ بەیانی بەرەو مەکتەبی سیاسیی حیزبی گەلی دیموکراتی کوردستان چووین، لەوێش چاومان بە سامی عبدالرحمن، وریا سەعاتی، دلشاد میران، دارا و دلێر کەوت، کە بەڕاستی هەموویان زۆریان ڕیز لێگرتین.

لە ناوچەی لۆلان گوندێک هەبوو بەناوی "خاسە"، مەقەڕێکی دیکەی حیزبی شیوعی لێ بوو و شەو لەوێ ماینەوە. بەڵام لێرەدا "ڕێباز و مەناف"مان لە لای "وریا" ی خۆمان بە جێ هێشت، هەر بەندە و مەهدی و فەرهاد رۆیشتین. لەو بنکەیەدا پزیشکێکی

پێشمەرگەی لێ بوو، تابڵێی گورجوگۆڵ و چاپوک بوو. دیاربوو زۆربەی کارەکانی بنکەکەی دەکرد، کە تەنیا چەند پێشمەرگەیەکی بە ژمارە کەمی لێ مابوو و خەریکی بارکردن بوون. ئەوەی زۆر سەرنجی ڕاکێشام، ئەو دکتۆرە هەموو بارەکانی بە خۆی بار دەکرد و دەتگوت دەیان ساڵە کاروانچییە، گوریسەکانی بە جۆرێک دەهێنا و دەبرد کە من واقم وڕمابوو. لە هەڵس و کەوتیشی لەگەڵ ئێمە، تا بڵێی میهرەبان و چاوتێر بوو.

یەکەمجار بوو لە بارەگای پێشمەرگە، لەو سەفەرەدا گوشتمان دەرخوارد بدەن. بەیانی هاتینە ناوچەی کێلەشین و بە سەیارە بەرەو "شنۆ" بەڕێکەوتین و دەمەو عەسر بوو چووینە ڕاژان. بە سالار و ئەوانی دیکە شاد بووینەوە، کە "وەرزێر و سۆرانی دیان"یش لەوێ بوون. بەڵام شەوێکی بە ڕەشەبا، کە لە هەموو لایەکەوە خێمەکەمانی ونجر ونجر کرد و خەومان نەبوو. سەرباری ماندووبوون و هیلاکی، هەر خەریکی گرێدانەوەی خێمەی دڕاو بووین، ناچار بەیانی گواستمانەوە ناو خانوێکی گوندەکە.

ڕۆژی ٩/٣٠ لەگەڵ سالار چووینە شاری ورمێ، ئەوە بۆ جاری دووەم بوو لە ژیانمدا بچمە ئەو شارەوە. جاری یەکەم لە کۆتایی ساڵی ١٩٧٤ بوو، کە بە ئەرکی ڕاگەیاندنی شۆڕشی ئەیلول بۆ یەکەمجار سەردانی ئەو شارەم کردبوو. ورمێ شارێکی زۆر دڵگیر، جوان، پاک و خاوێنە، تا ڕادەیەک ئەوەندە نەگۆڕابوو لە بەرچاوم، بەڵام ساڵی ١٩٧٤ قەرەباڵغتر دەهاتە بیرمەوە. یەکەمجار دوای دابەزین لە ئوتێلی ڕەزا، چووینە سەردانی مام هێمن لە "دەزگای چاپەمەنی سروە". ماوەی چەند سەعاتێک یادەوەرییەکانی بەغداد و بارودوخی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی کوردەواریمان لەگەڵ باس کرد. مام هێمن گوتی: عەباس مەحەمەد دەناسم کە خەڵکی هەولێرە، زۆر بەپەرۆشی و دڵسۆزییەوە باسی مهرەبانی و لاوچاکیی خەڵکی شاری هەولێری کرد. هەندێ بەسەرهاتی خۆی گێڕایەوە، گوتی کە زۆرتر لە شاری هەولێر خۆی بە غەریب و میوان نەهاتوتە بەرچاو و لە هەولێر زۆریان خزمەت کردوە.

لەو سەفەرەی ورمێدا. چووینە ئوتێلی "حافز"، کە برادەرانی حسک زۆریان لەوێ بوون، بەتایبەت "خالە حاجی و مەلا ناسح". هەر لەوێ چاوم بە هاوڕێی تەمەنی گەنجی و هەرزەکاری، سەلام گۆمەشینی کەوتەوە، زیاتر لە ١٥ ساڵ دەبوو نەمدیتبوو. هەروەها دوبارە "ابو حیکمەت"یشمان لەوێ دیتەوە. بۆ ڕۆژی دوایی، کە گەڕاینەوە ڕاژان، نیوەڕۆکەی لە لای سەرکردایەتیی پارتی دەعوەت کراین، لەپێشەوە لەلایەن فرنسۆ حەریری، مەحەمەدی مەلا قادر و خورشید شێرەوە، پێشوازییان لێ کردین. دواتر لەلایەن "فلک الدین کاکەیی، حمید سوری، دکتور ڕۆژ، فازل مەتنی، فەوزی ئەتروشی و دکتور جرجیس"ەوە بەخێرهاتن کراین. پێش نانخواردن چایەکمان لە لای عەلی عەبدوڵلا

خواردەوە و دواتر بە هاوڕێتی فلک الدین و دکتور ڕۆژ لە لایەن مەسعود بارزانی و خوالێخۆشبوو ئیدریس بارزانی میوانداری خواردنی نیوەڕۆ کراین. بەیەکەوە فراڤینمان خوارد، پاشان بەدەم چایخواردنەوە، کۆبوونەوەیەکی دۆستانەمان دەست پێکرد. دوای بە خێرهێنانمان لەلایەن سەرۆکی پارتییەوە، سالار بە چەند وشەیەکەوە سوپاسی کردن، ئەوجا ئیدریس بارزانی قسەکانی خۆی کرد، هیوای بۆ پێوەندییەکی دۆستانە و کوردانە خواست، تاکو هەموو بەیەکەوە لە ئاست ئەرکە قورسەکانی ئەم قۆناغەی تێکۆشانی نەتەوەکەماندا بین. هەر لەو دانیشتنەدا بەڵێنی هاوکاریکردنی تەواویان بۆ دووپات کردینەوە، لە بواری بنکەدانان و پێدانی مۆڵەتی وەرگرتنی یەک سەعاتی ئێزگەکەیان، بۆ پەخشکردنی بەرنامەی ڕۆژانە بەناوی دەنگی ئاڵای شۆڕش، کە بۆ ماوەی ساڵێک زیاتر بەردەوامی هەبوو، بەڵام دوایی لەسەر مەرجی یەکێتی، بۆ مۆرکردنی ڕێککەوتننامەی ئاشتبوونەوەی نێوان پارتی و یەکێتی، سەرکردایەتی پارتی بەرنامەی ڕۆژانەی "دەنگی ئاڵای شۆڕش"یان بە یەکجارەکی ڕاگرت، دواتر زۆرتر لەو بارەیەوە قسەوباسم دەبێ.

بۆ ڕۆژی دواتر چووینە سەردانی "ئیتلاعاتی ئێرانی"، چاومان بە حاجی مستەفەوی کەوت. دیار بوو حاجی مستەفەوی مەبەستی دیتنی من بوو، سەرەتا لێی پرسیم، ئایا فارسی دەزانم، گوتم کەمێکی لێ دەزانم. کاتی خۆی لە کۆلیج خوێندوومە، کەواتە بە فارسی قسەکانمان دەکەین، من و سالار بەجووتە، جار نا جار وەڵاممان دەدایەوە. حاجی مستەفەوی باسی ناوچەکانی خوارەوە، ژمارەی پێشمەرگەکانمان و سنووری ڕێکخستنەکانی لە من پرسی، من یەکسەر وەڵامم دایەوە کە ئەم زانیارییانە تەنیا بە خۆمان بەندە، من دەسەڵاتی ئەوەم نییە ئەو شتانە بۆ دەرەوەی ڕێکخستنەکەی خۆمان باس بکەم. لێرەدا حاجی مستەفەوی تۆزێک سەری خوراند، لە جێگاکەی هەستا و ئێمەی بە جێ هێشت. سالار گوتی نابوایە ئاوا بە ڕەقی وەڵامی بدەیتەوە! من پێشتر بیستبووم، کە ئەو برادەرانە لەسەر کۆنفرانسی یەک و دووی کۆمەڵەدا، ڕاپۆرتیان بۆ ئیتلاعات نووسیوە و ئەوانیش داوای ڕاپۆرتیان لەسەر کۆنفرانسی سێی کۆمەڵەیش ویستوە و برادەران گوتویانە، ئەوە (حاجی مەمۆ)بەشداری تێدا کردووە، کە ئەو هات پێی دەڵێین بۆتان بنووسێ!! پاش ماوەیەک حاجی مستەفەوی هاتەوە ژوورێ، کوڕێکی گەنجی لەگەڵ خۆی هێنابوو، بە ئێمەی ناساند و ناوی "فازل" بوو، دوای یەکترناسین و چای خواردنەوە، ئێمەیان دەعوەتی خواردن کرد. حاجی مستەفەوی خۆی خواحافیزی کرد، و ئێمە لەگەڵ "فازل" ماینەوە. یەکێکی دیکەشیان هاتە ژوورەوە بەناوی "ڕەسول"، بەجووتە لەگەڵمان دانیشتن، بەڵێنی ئەوەیان پێ داین کە شوێنێکمان وەک بارەگا لە دەوروبەری ڕاژان بۆ دابین بکەن و ئازوقە و مەسرەفی ژیانی ڕۆژانەی ژیانمان بۆ مەیسەر بکەن. ئێمەیش

لەلایەن خۆمانەوە دریخی نەکەین لە هاوکاریکردنی جمهوری ئیسلامی ئێران. لێردا من لەو "فازل"ـەم پرسی؛ مەبەستی لە هاوکاریکردنی ئێمە چییە! وەلامی دامەوە کە حاجی مستەفەوی بەدرێژی ئەوەی لەگەڵ سالار باس کردووە، ئەوان ڕێککەتوون کە چۆن و بە چ هاوکاری یەکتر دەکەین.

پاشان هاتینە سەر باسکردنی دانانی مەکتەبێکی علاقات لە ورمێ، ئەوان ئامادەیی سەرەتایی خۆیان نیشاندا، دوای ئەوەی ئێمە ستافی خۆمان بۆ ئەو کارە ئامادە دەکەین. پاش بەڕێکردنمان، ئێمە بە پێ گەڕاینەوە، لە ئوتێل خۆمان پێچایەوە و بۆ ئێوارە چوینەوە ڕازان. بۆ ڕۆژی دواتر لەگەڵ سالار کەوتینە گفتوگۆ و داوای ئەوەی لێ کردم کە ڕاپۆرتێک لەسەر کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە بنووسم، کە ئەوان لەسەر یەک و دوویان نووسیوە و گفتیان پێداون، کە من گەیشتم، ئەو کارە بکەم. سەرەتا قسەیەکی ئەوتۆم نەکرد، تەنیا گوتم، بیری لێ دەکەمەوە و ئەم کارەم زۆر پێ قورسە! پاشان لە سالارم پرسی ئەدی مامۆستا جەعفەر لەکوێیە، ڕاستگۆیانە پێی گوتم، کە لێی زویر بووە و بەبێ ئاگاداری ئەو چووەتە لای د. ڕۆژی پارتی و پسولەی چوونە تارانی بڕیوە و بەنیازە بگەڕێتەوە ئەڵمانیا. پاش هەندێ ڕاگۆڕینەوە، ئەویش پێی پەسند بوو، من بۆ هەندێ پشکنینی پزیشکی سەردانی تاران بکەم و چاوم پێی بکەوێ و بزانم مەسەلەکەی چییە!

بۆ ڕۆژی دواتر هەر بەیەکەوە لەگەڵ سالار چووینەوە ورمێ، لە ئیتلاعات پسولەی "چوونە تاران"ی منیان هەر ئەو ڕۆژە تەواو کرد. بەیانییەکەی بە ئۆتۆبوس بۆ تاران چووم. لەوێ مامۆستا جەعفەرم دۆزییەوە و هەر لەو هوتێلەش دابەزیم، کە ئەوی لێبوو. ئەودەمە "هیوا چاوشین"یش لەوێ بوو، کە بەنیاز بوو ببێتە بەرپرسی پێوەندییەکانی دەرەوەی ئالای شۆڕش لە سوریا و هاتووچۆی ..ەفارەتی سوریای لە تاران دەکرد بۆ سەفەرکردن. هەروەها "حاجی ئومێد"یش لەوێ بوو، نیازی سەفەری چوونە دەرەوەی هەبوو لەگەڵ "خەباتی شێخ جەناب و جەبار ئەمین"، کە هەردووکیان لە سوید بەسەفەر هاتبوونەوە. چەند جارێک لەگەڵ مامۆستا جەعفەر قسەم کرد و دیار بوو زۆر سەرگران بوو، وای دەرخست ئەو فێڵی لێ کراوە و باسی شتی گەورەی، وەک لەشکری ئالای شۆڕشی بۆ کراوە، کەچی چەند مانگێک چاوەڕوانی کردووە، کەس بەدەنگییانەوە نەهاتووە! دواییش زۆر بەڕاشکاوانە پێیگوتم، کاکە ئێوە هەر هەمووتان جەلالین، بەلام بەرگتان گۆڕیوە و من لەگەڵتان هەڵناکەم. منیش بە ڕاشکاوی پێم گوت، دەزانم ژیانی ئەورووپا خۆشترە و هیوادارم بە یەکجارەکی دەستمان لێ هەڵنەگری، ئالای شۆڕش هیچ لەشکری نییە، کاک "ئارام"یش، کە دەستی بە خەباتی چەکداری و سەرپەرشتیکردنی مەفرەزە سەرەتاییەکانی کرد، لەشکری نەبوو، ئیتر ئەگەر گەرەکتانە، بۆ هاتنەوە بۆ سەر

حاڵەتێکی حازر بیرتان کردۆتەوە، شتی لەم جۆرە لە گۆڕێدا نییە. من هەر لە سەرەتاوە، بازنە ڕۆشنبیرییەکانی ئالای شۆڕشم بە ئەلتەرناتیڤی سەرەکی زانیوە و کارمان بۆ لەشکر و لەشکرکاری نەکردووە. ئەوە بوو هیچ سەرەداوێکی ئومێدم تێدا نەدیت بۆ گەڕانەوە. دوایی هەندێ پشکنینی پزیشکیم بۆ برینە کۆنەکەی پشت و سەروگوێچکەم ئەنجامدا، بۆ ورمێ گەڕامەوە. بە حەماسەتێکی شۆڕشگێڕانە، بە سالارم گوت: کاکە ئێمە ئەو چەند هاوڕێیەی هەولێر کە لێرەین، دەگەڕێینەوە ناوچەکانی خوارەوە، لەسەر پێست و ماندووبوونی ڕووت و ڕەجاڵی خۆمان دەکەوینەوە خەباتکردنێکی شێلگیرانە. بەڵام سالار پێداگری دەکرد لەسەر ئەوەی بەڵکو قەناعەتم پێ بکات من لە دەورووبەری راژان بمێنمەوە، بۆ ئەوەی خۆی سەفەری ئەوروپا بکات. بۆ ڕۆژی دوایی لەگەڵ هاوڕێیان؛ سۆران، وریا، فەرهاد، ڕێباز و مەناف، خۆمان کۆ کردەوە و مەهدی و وەرزێرمان بە جێ هێشت بۆ دروستکردنی بنکەیەک لە لای ئەڵوەتان. لەگەڵ خۆمان دوو بار کەلوپەلی بنکەدانانمان کڕی و بە ماشین گەیاندنمانە لای بنکەیەکی پارتی و لەو ناوە دوو ولاغی بەرزەی بەرەڵلاکراومان گرتەوە، باری خۆمان لێنا و ناوچەی بارزان خۆت بگرە هاتین.

ئەوە بوو لە ١٠/١١ هاتینە ناوچەی دەراو، لەوێ سەرێکمان لە لقی ٢ ی پارتی دا. لەگەڵ هەڤالان فرەنسۆ و خالد ئاژگەیی دانیشتین، شەومان لە لایان بەسەر برد، کە مام هەژاریش لەوێ بوو. بە هۆی ئەوەوە بەیانی کوارگی سوورکراوەی سەر سێلمان خوارد، کە زۆر بەتام و بە لەزەت بوو. لێرەدا هەموو ئەو لاپەڕانەی شیرازەی ڕێکخستنەکانی پارتی ناوچەی مێرگەسۆرم پێ مابوو، تەسلیم بە فرنسۆ کرد، کە پێشتر دیتبووم، گفتم پێیدابوو. هەر واقی وڕما و پرسی ئەوانە لە لای ئێوە چی دەکات! سەربردەکەم بۆ گێڕایەوە، کە چۆن دەستمان کەوتوە، بە سوپاسێکی زۆرەوە شتەکانی لێمان وەرگرت و دەتوانم بڵێم ئەوە بووە مایەی ئەوەی فەرەنسۆ لەلایەن خۆیەوە لە زۆر ڕووەوە بەتەنگمانەوە بێت.

بۆ شەوی١٢/١٢ی ١٩٨٥/١٠، هاتینە دەراوی ناوچەی لۆلان. ناوچەکە بۆنی رووبەرووبونەوەی هێزەکانی عیراق و ئێرانی لێ دەهات و بنکەکانی هێزی پێشمەرگەی حیزبەکان ئەو ناوەیان چۆڵ دەکرد. ئەوانەی حیزبی شیوعی بەزۆری ئاودیوی دۆڵی خواکورک ببوون و شەو درەنگانێ گەیشتینە هەواری برادەرانی حسک، کە بۆ بەیانی بەیەکجاری باریان دەکرد، بۆ ناوچەکانی دەورووبەری خانێ و کۆنەلاجانێ. دیسانەوە چاومان بە رەسول مامەند و قادر جەباری و ئەحمەد فەقێ رەش و قادر مستەفا کەوت و پێکەوە ساوارێکی سادەمان خوارد، کە دوا ژەمە خواردنی ئەوانیش بوو لەو هەوارەدا.

بۆ ڕۆژی ١٠/١٣ گەیشتینە بنکەی مەکتەبی سیاسیی حشع و چاومان بە "ابو سلیم و ابوفاروق" کەوت. چەند ڕۆژێک لەوێمان بەسەر برد و هەندێ یارمەتییان داین و بۆ١٠/١٦ هاتینە گوندی سپیندارە و لە دۆڵی خواکوڕکەوە گەیشتینە گەرووی گۆستی و شەوورۆژێک لە هەوارەکانی گوندی "حەیات" ئیسراحەتمان کرد و دواتر بە کەناری ڕووبارەکەی دەشتی بەرازگر هاتینە خوار و شەو سەعات ٢ گەیشتینە هەواری خانووەکەی عادل بەگ، لەسەر سنووری نێوان هەردوو پارچەی کوردستان. بۆ بەیانی زوو بە بیستنی زرم و هۆڕی دەستڕێژی زۆر، خۆمان پێچایەوە و بۆ چەند سەعاتێک بەناو خاکی کوردستانی باکوور ڕۆیشتین، لە ڕێگادا لە خەڵکی ڕەنجبەر و گوندییەکان بیستمان، مەفرەزەیەکی حشع کەوتۆتە کەمینی قەرەقۆڵی تورکەکان. ئەوانە کاروانێکی زۆر بوون لە بناری گەلی ڕەش بە بەردەمی ئێمە تێپەڕین و دیار بوو مەسئولەکەیان لە پێشمەرگە عەرەبەکان بوو، پێیان خۆش نەبوو بە ڕێگای ئێمەدا بێن، کە گوایە چەند سەعاتێک دوورترە و مەترسی کەمینی سوپای عیراق لەسەر ڕێگاکەیە. گەرەکیان بوو ئێمەش لەگەڵ ئەوان بچین، منیش لەلای خۆمەوە ئەوەم بەلاوە پەسەند نەبوو، بەو شەوە بە ڕێگایەکدا بڕۆین، کە هیچی لێ شارەزا نین و لە مۆڵگەکانی قەرەقۆل نزیک دەبێتەوە. بۆڕۆژەکەی سەعات ١٠ی بەیانی، نانی سبەینێمان لە هەواری گوندی "هۆپی"ی چۆڵکراو خوارد. بۆ نیوەڕۆ گەیشتینە هەواری گوندی "دالیتە" و بۆ ئێوارە گەیشتینە "لێزێ" و لەوێ ماڵە ئاوارەکان نانیان نەداینێ و هەموو چەکدار بوون و شەو لەو دەشت و دەرە بە سگی بەتاڵ ماینەوە. بەڵام بەناچاری ئاگرمان کردەوە، کە زۆر سارد بوو. بەیانی گەیشتینە گوندی "کانی بۆت" و لەوێ حەساینەوە و سەرخەوێکی بێ ترسمان شکاند و دواتر تووشی جەلەبێک ڕەشەوڵاغ بووین و یەکێکیان بۆ خۆ کوشتبوەوە، ئێمەیش کە ٦ پێشمەرگە بووین؛ مامۆستا فەرهاد، سۆران دیان، بەندە، ڕیباز، مەناف و وریا، میوانیان بووین و تێر بە زگی برسی، گۆشتی برژاومان خوارد. پاشان بە کلکەی چیای شیرین گەیشتینە هەواری "کانی خەلان" و بۆ دوو ڕۆژی دواتر لە زێی بادینان پەڕینەوە و گەیشتینە بنکەی "سریە شوانی حشع"، کە چەندان خانوویان لە دیوی دووەمی کۆنە گوندی کۆلەکان بۆ خۆیان دروست کردبوو. هەروەها سریەی کۆیەشیان هەر لە هەواری کۆنی گوندەکە، بارەگایان دانابوو. هەر لەوێ بە دیداری ئازاد چاوشین شادبووینەوە کە هەفتەیەک زیاتر بوو لەلای ئەو برادەرانەی حشع چاوەڕوانمانی دەکرد. بە پێچەوانەی هەندێک هاوڕێی دیکەمان، لە ئەنجامی فشار و ڕاوەدوونانی دەسەڵاتدارەکانی یەکێتی، لەجیاتی ئەوەی بەناچاری تەسلیم بە ڕژێم ببێتەوە، بە هاوکاری هاوڕێیانی شارەوە خۆی گەیاندبووە ناوچەی بارزان و برادەرانی حشع دالدەیان دابوو. من کە چاوم بە برادەرانی

مەکتەبی سیاسیی حشع کەوتبوو. ئەوان نووسراوێکی فەرمییان بۆ قاتعی هەولێر لە کافێ نووسیبوو، کە هەموو هاوکارییەکمان بکەن، تاکو لە نزیک خۆیانەوە، پارمەتیمان بدەن، بۆ دانانی بنکەیەک بۆ خۆمان، کە ئەو دەمە تەنیا حشع بارەگای ئاشکرای لە ناوچەکە هەبوو.

کە گەیشتینەوە بنکەکانی حشع لە گوندی کۆلەکان، کە بریتی بوون لە کۆمەڵێ خانوو و بە کاری هەرەوەزی دروست کرابوون. هەندێکیان بۆ پێشمەرگە بوو و هەندێکی دیکەیان بۆ خێزاندارەکان بوو. لەناو ئەو خانووانەدا، خانووێکیان لە سەرەتای بنیادنان بوو، بەناوی بنکەی لیژنەی محلی هەولێر و لەو سەروبەندەدا، ئێمە لەو خانووەی تەنیشت ماڵەکەی عەلی حاجی نادر دەخەوتین کە مام رەسول و مەحەمەدیش لەوێ بوون و مرۆڤی زۆر بەرێز و جوامێر بوون. دوای ئەوەی من نامەکانم لە رێگای عەلی حاجی نادر بۆ قاتع بەرێکرد. پاش دوو رۆژان چەند مەفرەزەیەکی حشع لە قاتعەوە بەدوای یەکترییەوە گەیشتن و کە لەناویان زۆربەی کادرەکانی لیژنەی محلی حشع؛ وەک حسن کاکە، مامۆستا سەفەر، مەحمود خدر هەبوون، لەگەڵ برادەران مەحەمەد حلاق و رزگار عەنکاوەیی و چەندانی دیکە. دیار بوو بەشێکی هێزی پێشمەرگەیان بە سەرپەرشتی رزگار لەگەڵ کادرەکانیان بۆ چوونە خوارەوە ئامادە دەبوون. وەڵامی قاتع جارێ بە رزگار نەگەیەنرابوو، کە رابەری سیاسیی بەتالیۆنی و مەسئولی سەرەکی حشع بوو. پاش دیدەنیمان لەگەڵ ناوبراودا، بە فەرمی پێی راگەیاندین کە ئێمە دەتوانین هەروەک میوان لەگەڵ پێشمەرگەکانی ئەوان بژین. بەڵام ئێمە رازی نەبوین و گوتم؛ خۆم سەردانی قاتع دەکەم و ئێمە لەگەڵ مەکتەبی سیاسیی حیزبتان رێککەوتووین، کە بنکەی سەربەخۆی خۆمان دەکەینەوە. رزگار کە دەستووری موبارەکی هەبوو، لە وەڵامی من پەست بوو و لە ژوورەکە هەستا و چووە دەرەوە. پاشان ئێمەی هاورێیانی "ئاڵای شۆرش"یش بە پیاسە چووینە پەنایەکەوە و بۆ خۆمان کۆبوینەوە و تەئکیدمان لەسەر ئەوە کردەوە، کە بۆ دوو رۆژی تر چاوەڕوانیان دەکەین و هیچ جۆرە هاوکارییەکیان بەبێ بنکەی جیاوازی خۆمان وەرناگرین. لە پڕ مامۆستا سەفەر و عەلی حاجی نادر هاتنە لامان و بە پێکەنینەوە، گوتیان کۆبوونەوەتان تەواو بووە! ئەوە بوو بەیەکەوە چووینە سەرسفرەی خواردنی نیوەڕۆ. پاشان عەلی بۆ چایخواردنەوە ئێمەی بردەوە ماڵەکەی خۆی و ئاگاداری کردینەوە، کە لە سبەینێوە دەتوانین، ئەو خانووە لاچەپەی دیوارەکانی بەرزکراوەتەوە، بە هاوکاری برادەران بۆ خۆتان تەواوی بکەن و بیکەنە بنکەی خۆتان. ئێمەش بەسوپاسەوە، پێمان گوتن؛ زۆر باشە، با لە سەردانی قاتع بگەڕێینەوە.

ئەوە بوو رۆژی۱۹۸۵/۱۰/۲۸ سۆران دیان، مامۆستا فەرهاد، مەناف و وریا، وەک یەکەم مەفرەزەی ئاڵای شۆرش لەگەڵ ئەو هێزەی حشع چوونە خوارەوە و بۆ رۆژی ۱۰/۳۰

بەندەیش، بە جووتە لەگەڵ ڕێباز و بە هاوڕێتی مام عەلی حاجی تایەری حشع بەرەو قاتع بەرێکەوتین. شەوەکەی لە گوندی هۆکێ لە ماڵی مام عوسمانی باوکی نعمانماینەوە، کە گەنجێکی خوێنگەرم و هەواداری ئاڵای شۆڕش بوو. زۆری مەبەست بوو، ببێتە پێشمەرگە لەگەڵ ئێمەدا، بەلام ڕێگامان پێ نەدا و لە ناوچەکە هاوکاری زۆرمانی دەکرد. نەمان دەویست بە چەک هەڵگرتنی، سەریەشە بۆ کەسوکارەکەی دروست بێت. ئێمەی ئاڵا زۆر بە پارێزی لە ناوچەکە هەڵسوکەوتمان دەکرد و لە پێوەندییەکانی خۆماندا، ڕێگای هەر جۆرە دەست خستنە ناو کاروباری خەڵکەکە و هەر چەشنە دەست تێکەڵکردنێکمان گرتبوو. تەنیا لە رووی هاوکاری مرۆڤانە و بە تایبەتی کارئاسانیی پزیشکی کە ڕەوا (د. وەلی حاجی قادر) ببوە سەرچاوەیەکی پزیشکی بۆ فریاکەوتنی خەڵکەکە. بە جۆرێک هاوڕێیەکانی "ئاڵای شۆڕش"، نموونەی ڕێز و خۆشەویستی ناو خەڵکەکە بوون و لە دوو دیداری "شێخ مەحەمەد خالد"ی لەگەڵ بەندە، بە سوپاسەوە باسی ڕێز و خۆشەویستیی نیوان ئاڵای شۆڕش و خەڵکی گێڕایەوە.

چەند ڕۆژێک لەلای برادەرانی قاتعی هەولێری حشع بووین و زۆر بە راشکاوی جۆری پێوەندییەکانی خۆمانمان لەگەڵ باسکردن و ئەوانیش بە هەمان هەست، تەئکیدیان لەسەر ناوەرۆکی نووسراوەکەی مەکتەبی سیاسیی حیزبی خۆیان کردەوە لە هاوکاریکردنمان بۆ دامەزراندنی بنکەیەکی ئاڵای شۆڕش نزیک بە بنکەکانی برادەرانی ئەوان لە دەوروبەری گوندی کۆلەکان و نووسراویان بۆ بەرپرسەکانی خۆیان لەو بارەیەوە نووسی. پاش سەردانی هەڤاڵانی ناوچەی ئاکرێی پارتی، ڕۆژی ١١/٥ بەرەو کۆلەکان گەڕاینەوە. پێشی بگەینەوە سەر زێیی بادینان، لەو دەشتاییەی کەناری زێ و بەرانبەر بلێ و بارزاندا، دەنگ بەسەر کارەساتی تیرۆرکردنی پێشمەرگەی پارتیزان قادر مستەفای "حسک"دا هاتین، بە دەستی دەستەیەک لە هەڤاڵانی دوێنێی خۆی و تازە جیابووەوەی ژێر ناوی "ئیتجاهی دیموکراتی شۆڕشگێر"، هێشتا دکتۆر رشید و عوسمان بانیمارانی و ئەوانی دیکە لەو شوێنە بەدیار تەرمی قوربانییەکەوە بوون، کە ئێمە بەسەریان راگەیشتین و سەید عەبدوللا کەردزی و چەندی دیکەیان بە چەککراوی دەستبەسەر کردبوو. ڕووداوەکە زۆر ناخۆش بوو، بۆ مێژوو دەیگێڕمەوە، دکتۆر رەشید کە بەندەی دیت و بەرەوپیرم هات، گوتی: خۆزگە سەعاتێک پێشتر یەکترمان دەدیت و دڵنیام بە بوونی ئێوە، ئەو بەیەک هەڵشاخانەی نێوانمان نەدەقەوما و حەزمان نەدەکرد و وا کەوتەوە. ئەوە بوو برادەرانی حیزبی شیوعیش گەیشتن، عەلی حاجی نادر و مەحمود خدر کە بە پیر هەواڵەکەوە هاتبوون. بۆ عەسرەکەی بە هەردوو لامان، تەرمی "قادر

مستەفا"مان گەیاندە ئەو بەری زێێ، نزیکی سەر جادەکە و لە کەناری ڕێگاکە بەشێوەیەکی کاتی ناشتمان.

بۆ ١١/١٩ بە دەستباری برادەرانی حیزبی شیوعی، دەستمان بە خانووکردن لە بەرانبەر بنکەی لیژنەی محلی هەولێری حشع کرد. هەر لەو یەک دوو ڕۆژەش هاوڕێیان مام دارا و سامانی مەلا گچکە و دڵشاد/جەمال و ئەوانی دی گەیشتن، کە بیست و پێنج پێشمەرگە بوون. خانووەکە گەیشتبووە خۆرەبانکردن، ڕزگار مسیحی، ماڵی ئاوابێت، کە مەسئولی سیاسی بەتالیونی حشع بوو، بە پێچەوانەی بەشێکی زۆری برادەرانی خۆیان، لیمان کەوتە بیانوو و گوتی: نابێ ئێوە بنکەتان لەناو بنکەکانی ئێمەدا بێت و ناچار گواستمانەوە ئەودیوی گوندی کۆلەکان و ئەو تاکە خانووەی "ئەبو فەلاح"ی نانەوامان، لەبری ئەوێ وەرگرت و لە تەنیشتییەوە خانووێکی گەورەی زۆر ڕێکو پێکتریشمان بەدەست و قامی هەرەوەزی تێکڕای هاوڕێیانی خۆمان لەچەند ڕۆژێکدا دروست کرد، کە بەلای کەم جێگەی سی کەس دەبووەوە. لەگەڵ تەواوبوونی کاروباری دامەزراندنی بنکەکەمان، تەشکیلاتێکی سەرەتایی ڕێکخراوەیی و پێشمەرگەییمان دیاری کرد، کە "جەمال" دڵشاد مەحەمەد بوو بە مەسئولی یەکەمی ڕێکخراوەیی بنکە و هاوڕێیان وریا قادر و مامۆستا فەرهاد وەک ئەندامی کۆمیتەی ڕێکخستن و مام دارا کاوانی و سامانی مەلا گچکە وەک کۆمیتەی پێشمەرگەیی و ڕەوا وەک بەرپرسی دارایی و ئیداریی بنکە دیار کران و بنکەکەشمان ناوزەدکرد بە "بنکەی بارزانی ئالای شۆڕش" بۆ ناوچەکانی هەولێر. لەو کۆبوونەوانەدا، پلانی خۆمان بۆ گەشەپێدانی ڕێکخستن و پێوەندی بە کۆمەلانی خەڵکەوە دووپات کردەوە، هەروەها تەئکیدمان لەسەر گیانی هاوکاری و دۆستایەتی برادەرانی حشع و پارتی و ئیتجاهی دیموکراتی شۆڕشگێر و حیزبی شەعب کردەوە و بریارمان دا، لە دەمی چوونە خوارەوەی پێشمەرگەکانماندا، خۆمان لە هەموو جۆرە تەڕاتێنێک و ڕووبەڕووبونەوەیەکی هێزەکانی "ی.ن.ک" لادەین و خۆمان لە هەر جۆرە شەڕپێفرۆشتنێکیان دوور بگرین و لەو ناوچانە دوور بکەوینەوە کە ئەوانی لێ دەبن و بۆ بەڵگەش هەتا من و جەمال و مام دارا لە ناوچەکە دەبووین، هیچ جۆرە شتێکی لەم جۆرە نەهاتە پێشەوە، ئەویش هەم بۆ وریایی خۆمان و هەمیش بۆ هاوکاریی هەندێ لە برادەرانی ناو یەکێتی و هاوکاری خەڵک بۆمان، کە چەند جارێک هەتا خودی بەندە لە ناوچەکانی بەڕانەتی و خۆشناوەتی و ناو هەولێر لە بۆسە و کەمینی ئەوان بە بێ شەڕ ڕزگارمان بووە.

ڕۆژی ١٢/٢ بەفرێکی هێجگار زۆر باری و دونیای سپی کرد و ڕۆژی ١٢/٥ جەمال و مام دارا و زۆربەی پێشمەرگەکان بۆ ناوچەکانی دەوروبەری شەقڵاوە چوونە خوارەوە.

ڕۆژی ١٢/٧ مەفرەزەیەکمان بەسەرپەرشتی عبداللە شێخانی بە چیای برادۆست بۆ لای سالار و ئەوانەی زێوە بەڕێکرد، کە پێکهاتبوون لە ئازاد چاوشین و دارا گچکە و سەباح و دوو برادەری سلێمانی کە پێشتر هاتبوونە خوارەوە و لەو دیوی چیای برادۆست دوو برادەرەکەی سلێمانی، هەردووکیان لەناو ڕەبیەکانی ڕژێم لە ناوچەی دۆڵەمەریان خۆیان شاردبوەوە و دوایی تەسلیم ببوونەوە. ئەوانەی مابوونەوە بە سەلامەتی تێپەڕ ببوون کە پۆستەی "ئاڵای شۆڕش"یان بۆ کۆمیتەی سەرپەرشتی لە زێوەی کوردستانی ڕۆژهەڵات دەبرد و لەو سەرەوە پۆستە و بڵاوکراوەی دەرچویان دەهێنایەوە.

بۆ ڕۆژی ١٢/٢٥ لەگەڵ مەفرەزەیەکی حشع، کە رزگاری دیان و یادی بەخێر، مەلا حسن (توفیق رواندزی)یان لەگەڵ بوو، ئێمەش لەگەڵ سۆرانی دیان و عیزەت هیرانی و بەندە بەرەو قاتعی بادینان بەڕێ کەوتین بۆ هەندێ پشکنینی پزیشکی لەلای پزیشکێکی حیزبی شیوعی، کە باری تەندروستیم خراپبوو و دکتۆر ڕەوا و چەند پێشمەرگەیەک لە بنکە مابوونەوە.

چەند ڕۆژێک لە قاتع بووین و هەتا سۆران و عزەت لە سەردانی ناوچەی مەڕانە گەڕانەوە، کە بۆ سۆراخی هاوڕێیەک چووبوون بە هاوکاری برادەرانی ئەقلیمی کوردستانی حشع، کە بنکەیان لەوێ بوو. لەپاش دیدەنی پزیشک، سەردانێکی ئەبو سیروانم کرد و دیسانەوە، ڕەخنە و گلەیی خۆمان ئاراستەی "ابو سیروان" کرد، کە رزگاری دیان بە چاوێکی دۆستانە هەڵسوکەوت ناکات و هەتا برادەرانی خۆشتان لێی ڕازی نین. "ابو سیروان"، ڕێنمایی کردم، کە نامە بۆ مەکتەبی سیاسی بنووسم و ئەوان هیچیان پێ ناکرێت، چونکە هەموو دەیانزانی ڕزگار بۆ خۆی لەناویان بووەتە کەڵەگا و کەس ناخوێنێتەوە و لەگەڵ عەلی حاجی نادر یش نێوانی خۆش نەبوو و پاشان ئێمە گەڕاینەوە.

ڕۆژی ٢٩/٢٨- ١٢ بەفرێکی زۆر باری و دیسانەوە بەدەم ڕێگاوە زانیمان لە ناوچەی کافێ هەموو پێشمەرگەکانی ئیتجاهی دیموکراتی شۆڕشگێڕ، کە ١٢ کەس بوون، چەککراون و لە لای پارتی دەستبەسەرن. پاش چەند ڕۆژێک سەرقافلەی برادەرانی ئیتجاه، قادر عزیز گەیشتن و بە شێوەیەکی کاتی لە خانوە گەورەکەی ئێمە جێگایان کرایەوە و پاشان لەولاترەوە، کەوتنە درووستکردنی بنکەی سەربەخۆی خۆیان و تێکڕای هێزەکەیان لەوێ دامەزران، کە نزیکەی سەد کەس دەبوون. هەر لەو ماوەیەدا برادەرانی حیزبی شەعبیش، بە سەرپەرشتی دلشاد میران لە بەرانبەر ئێمە بنکەیەکی بچکۆلانەیان کردەوە. بە جۆرێک شوێنەواری کۆنە کاولەکانی گوندی کاولۆکان لەلایەن پێشمەرگەی ئەو حیزبانەوە بە دەستپێشکەری حیزبی شیوعی عیراقی، لەپاڵ ئاوەدانکردنەوەی، ببووە مەلبەندێکی بەرچاوی دیکەی موقاوەمەتی چەکداریی نەتەوەی کورد لە دژی ڕژێمی بەعس

له عیراق و تا راده‌یه‌کی زۆر بارسووکیی له‌سه‌ر گوزه‌رانی ئه‌و خه‌ڵکه که‌مگوزه‌رانه سازاندبوو، له‌وه‌ی چیتر پێشمه‌رگه و کادره‌کانی ئه‌و حیزب و گرووپانه، بۆ نانخواردن نه‌ده‌چوونه ماڵان و خه‌ڵکه‌که له دابه‌شبوونی سێژه‌مه‌ی ڕۆژانه ڕزگاریان ببوو. هه‌ر پێشمه‌رگه و کادرێک که بۆ حه‌سانه‌وه له ناوچه‌کانی هه‌ولێر ده‌گه‌ڕانه‌وه، له بنکه و باره‌گای خۆیان ده‌حه‌سانه‌وه و نانیان ده‌خوارد. ناوچه‌که به شێوه‌یه‌کی فه‌رمی له‌لایه‌ن حکومه‌ته‌وه، ناوچه‌ی یاساغ بوو، به‌ڵام له سێبه‌ری جه‌نگی عیراق ـ ئێران و سه‌رقاڵبوونی له‌شکری سوپای عیراق به‌و شه‌ڕه‌وه، ئه‌رکی چاودێریی ناوچه‌که، به جاشی خۆماڵی عه‌شیره‌ته‌کانی ناوچه‌که سپێردرابوو. ئه‌وانیش به هۆی گه‌شه‌کردنی چه‌ندایه‌تیی هێزی زۆروبۆری پێشمه‌رگه‌ی حیزبه‌کانه‌وه، به که‌می له مۆڵگانیان ده‌رده‌چوون و له‌چاو جاران که‌متر سه‌ریه‌شه‌یان بۆ خه‌ڵکه‌که و پێشمه‌رگه دروست ده‌کرد و ئه‌گه‌ر هاوکاری و کارئاسانی چه‌کداره‌کانی ئه‌و عه‌شیره‌تانه‌ی ده‌وروبه‌ری زێی بادینان نه‌بوایه، به دڵنیایی یه‌ک پێشمه‌رگه‌ی ئه‌و حیزبانه وا به ئاسانی به ئاوی ته‌نگه‌ژه‌ی بێخمه‌دا، نه‌ده‌کارین بپه‌ڕنه‌وه. هه‌روه‌ها له ناوچه‌که‌دا، هیچ جۆره داهات و گومرگ وه‌رگرتنێک نه‌بوو، تاکو ئه‌و حیزبانه له‌سه‌ری ناکۆک بن. بۆیه پێوه‌ندی نێوانیان، به‌به‌راورد به ناوچه‌کانی دیکه‌وه، له‌وپه‌ڕی گه‌رموگوڕیدا بوو. ئێمه وه‌ک ئاڵای شۆڕش له ڕووی گوزه‌رانه‌وه، له هه‌مووان ده‌ستکورتر و که‌مده‌رامه‌ت تر بووین، به هۆی نه‌بوونی هیچ جۆره کۆمه‌کێکی ده‌ره‌کی. ڕاسته ئێرانییه‌کان به‌قسه، به‌هاریان بۆمان هێنابووه چۆکان، به‌ڵام ئه‌گه‌ر ئه‌و کۆمه‌کی ئازوقه‌یه‌ی لێ ده‌رچین، که له ڕێگای براده‌رانی پارتییه‌وه، مانگانه بۆ براده‌رانمان له ئۆردوگای زێوه سه‌رف ده‌کرا، ئه‌وه‌ی من پێی بزانم، کۆمه‌کێکیان به ئاڵای شۆڕش نه‌کردووه. ئه‌ویش زۆرتر بۆ ئه‌وه بووه، که ئێمه که‌موزۆر وه‌ک تێکڕای ئاڵای شۆڕش، هه‌رگیز نه‌چووینه‌ته ژێر باری سیخوڕیکردن و هاوکاری سه‌ربازی و شتی له‌م جۆره‌وه، که له هه‌موو دیده‌نییه‌کیان له‌گه‌ڵ ئێمه‌دا، ئه‌وه‌یان به‌چاومان داده‌دایه‌وه.

١٩٨٦/١/١ شه‌وه‌که‌ی له لایه‌ن سریه‌ی کۆیه‌ی حشع، ئاهه‌نگێکی خنجیلانه ساز کرا، که له‌و شه‌وه‌دا له‌گه‌ڵ مه‌حه‌مه‌د حلاق یه‌کگرتوو بووین، به‌تایبه‌ت له‌گه‌ڵ من و دڵشاد میران، به‌رپرسی بنکه‌ی حیزبی گه‌ل به‌یه‌که‌وه ئه‌وه‌مان ڕه‌تکرده‌وه، ئاهه‌نگه‌که هه‌ر به زمانی عه‌ره‌بی و ته‌نیا به‌ناوی حشع بێت و ده‌بێ له‌سه‌ر خاکی کوردستان، زۆرتر کوردستانی بێت. مه‌حه‌مه‌د حلاق بووه لایه‌نگری ئێمه و له‌گه‌ڵ ڕزگار کردیانه قره و ڕزگار و چه‌ند عه‌ره‌بێک ئاهه‌نگه‌که‌یان به‌جێهێشت. به‌ڵام براده‌رانی ئیتجاهی دیموکراتی شۆڕشگێر، له‌به‌ر ڕزگار به‌شدارییان نه‌کرد.

ڕۆژی ١٩٨٦/١/٣ بوو، لەگەڵ برادەران مامۆستا گۆران (محمود خدر) و مام ڕەسول و ڕێبواری گەورە و سۆرانی دیان و عیزەت هیرانی چووینە دیداری ئەشکەوتی شانەدەر. بەیانی کە پەڕینەوە لە زێی بادینان، دونیا تەمتومان بوو، بەری ئاسمان گیرابوو، ترسی هێرشی ئاسمانیمان نەبوو، کە لەو ڕۆژانە کۆپتەرەکانی ڕژێم بەسەر ناوچەکە دەسورانەوە و هەر دیاردەیەکی چەکداری و قەرەباڵغیان بدیتایە، کوێرانە بۆردومانیان دەکرد. کە ئێمە گەیشتینە بناری شاخی برادۆست، تەمەکەش ڕەوییەوە و بەسەر پردێک، کە لەسەر شێوێک ڕایەڵ کرابوو، پەڕینەوە. پردەکە بە دەست لە لایەن خەڵکە زەحمەتکێشەکەی ناوچەکەوە دروست کرابوو، کە لە سەرێکەوە بە بەرزیی لێواری شاخەکەوە تەنرابوو و سەرەکەی دیکەشەوە هەڵچنرابوو، زۆر سەرەنجی ڕاکێشام! هەر لە دیمەنی چیلەوچێخی کوردەواری دەچوو کە بەیەکەوە دووراببنەوە، خەڵکەکە زۆر بە ئاسوودەیی بەسەریدا دەڕۆیشتن! ئەشکەوتی شانەدەر کەوتبووە بناری چیای برادۆست بەڕووی زێوە و بە رووکاری کاولەکانی ڕێزاندا. یەکەم جار لە لای جادەکەوە لە تەک ترومبێلێکی فرێدراوەوە سەرکەوتین و پاش کەمێک گەیشتینە ناو هەواری چەند ماڵێکەوە و سەگە درەکانیان بەتاو بۆمان هاتن، مام ڕەسولی حشع ڕووبەڕووی یەکێک لە سەگەکان بووە و سەری لەدوو ناو سەگەکە لەبەری هەڵات و گەنجێکی ڕووخۆشی ماڵەکە بە پیرمانەوە هات. شوێنەواری ئەو ماڵانە پێی دەڵێن "ئەشکەوتە"، کاتی خۆشی گوند بووە و شوێنەواری خانووەکان هێشتا بەبەرچاوانەوە و پاش هەندێ حەفتوهەشتکردن لەگەڵ ژن و منداڵەکانی ئەو خێزانانەی "سلیم و جادر"، کە هەردووکیان بەرەچەڵەک خەڵکی گۆڕەتوو بوون و زستانان بۆ ئاژەڵ بەخێوکردن لەو بنارە و پەنا شاخەی دوور لە چاوان هەوار دەخەن. نزیکەی شەش ماڵ بوون، ماڵی شەریف، مستەفا، فەرحان، مەلا ئەحمەد، کە ماڵەکەی کەوتبووە سەر تۆقەسەری ئەشکەوتی شانەدەرەوە. ئەشکەوتەکە بە هۆی ئاژەڵ تێداکردنەوە زۆر پیس و پۆخڵ بوو، ئەگەر ئەم شاکارە لە هەر شوێنێکی جیهان بوایە بێگومان دەبووە مەڵبەندی سەیرانکەران و توریستگەی بیانییەکان و سەچاوەیەکی بە پیت بوو بۆ خەڵکی ناوچەکە. بەداخەوە لێرەوە تێگەیشتم خەڵکی ئێمە تەنیا قازانجی کەسی خۆی بەلاوە گرنگە و گوێ بە هیچ شتێکی دیکە نادات. زۆر کونجوکەلەبەری ناو ئەشەکەوتەکەمان کرد، کە دەتوانم بڵێم سەرباری هاتنەخوارەوەی بەرد و لێتاوی ناوەوە، کە دەیان مۆمیای بۆ خۆی نەخش کردبوو، کە جێگای یەک ئوردووی گەورەی سەربازی تێدا دەبووەوە، کەچی لەو بارەیەوەش سوودی لێ وەرنەگیرابوو. لەو سەر کە هاتینە دەرەوە، لە بەردەم دەمی ئەشکەوتەکەوە، بە لای چەپدا، بە کونە ئەشکەوتێکی دیکە هاتین، کە ئەم سەر و ئەوسەری کونبەدەر بوو و نزیکەی ١٠٠ مەتر دەبوو، هەروەک تونێلی سروشتکرد بوو، دوایی بە

هۆی دارەوە، من بەسەریدا هەڵگەڕام و پێدا هاتمە خوارەوە، لەوە دەچوو یەکەم دەروازەی هاتووچوکردنی ئەشکەوتی شانەدەر بووبێت لە دێرزەمانەوە و کە دەروازەی هاتنەدەرەوەی ڕاستەوخۆ بەسەر چەقی ڕوانینە ڕێگاوبانی ناوچەکەیدا دەڕوانی، کە شتی ئەوتۆی لە شانەدەر خۆی کەمتر نەبوو، جێگای قوڵغی سەنگەری پاسەوانی پێشەوە و پشتەوەی هەر دیار بوو. هەر لەو دۆڵەشەوە ڕێگای پیادە بۆ گورەتوو هەڵدەکشێ بۆ ئەودیوی برادۆست. بۆ ئێوارەکەی گەیشتینەوە بنکەکانی حشع و تام و چێژێکی زۆرمان وەرگرت.

لە ڕۆژی ١٩٨٦/١/٥ دا، لەگەڵ چەند مەفرەزەیەکی حشع و برادەری ئیتجاهی دیموکراتی شۆڕشگێر، کە ژمارەمان لە ١٠٠ پێشمەرگە زیاتر بوو، بەرەو خوارەوە بەڕێکەوتین. شەو هەتا درەنگانێ بە چەند ڕەتلێک لە ئاوی بێخمە پەڕینەوە و ئەوانەی حیزبی شیوعی چوونە خوارتر و لە لای گوندی قەندیل پەڕینەوە. بەڵام ئێمە و برادەرانی ئیتجاه لە بەردەمی گوندی بێخمە، بە چەند کەلەکێک پەڕینەوە. شەوێکی هێجگار سارد بوو، ئاوەکە زۆر بە پانوپۆڕی ئاراستەی خۆی وەرگرتبوو. لە هەندێ شوێن چوار دوورگەی بچوکی دروست کردبوو، ئێمە لەگەڵ مەفرەزەیەک لە یەکێک لەو دوورگانە وەک کەمین بۆ دەمی لێقەوماوان، مابووینەوە، هەتا هەموو پەڕینەوە و لەو کاتەدا کە من دواکەس بووم، کە خەریک بوو بۆ سەر کەلەک بچم، هەر وا ئاوڕمدایەوە و دیتم لە ناوەڕاستی ئەو شوێنە، تارمایی شتی بەجێماو هەیە و ناچار گەڕامەوە، کە سەیرم کرد یەکێک خەوی لێکەوتووە و تفەنگە بی.کـ.سی یەکەی لەبن سەری خۆی داناوە. کە بەخەبەرم هێنا، حەپەسا، تاکو ناوی خۆم پێ نەگووت، باوەڕی نەکرد منیش پێشمەرگەم و ناوی سەمەد تیکالۆ بوو، کوڕێکی چوارشانە و بەژن و باڵا بەرز بوو، هێنامان لەگەڵ خۆمان سواری کەلەکمان کرد و ئێمە بە هۆی "جەمال"ـەوە، کە لەوناوە شارەزا بوو، ڕێگای قەدبڕمان گرت و بەناو پرۆژەی بێخمەدا پەڕینەوە، کەرەستەی بنیادنانی بێخمە لە بەردەستمان بوو و ئەگەر گەرەکمان بووایە هەموومان ئاگر تێبەردەدا، بەڵام بە هۆی هەستکردن بە مەسئولیەت بەرانبەر وڵات و میللەتەکەمان، کە وامان دەزانی دەبێتە پرۆژەیەکی زۆر گەورەی سوودبەخش بۆ ئاوەدانیی دەشتەکانی قەراج و کەندیناوە و دەشتی هەولێر و زرارەتی و بەرانەتی و شەمامک، کەچی نەوەک وا دەرنەچوو، لە پەراوێزی ڕاپەڕیندا، لە لایەن کەسانی فرسەتخواز، بەرۆژی ڕووناک تالان کرا و هەمووی بۆ گیرفانی تایبەت حەپەلوش بوو و سەد خۆزگە ئاگرمان تێبەربدایە!

پاشان ئێمە لەپێش ئیتجاه گەیشتینە گوندی جەمەسۆر و شەو سەعات چواری بەیانی بوو، پێش دابەشبوون لە ماڵەکان بۆ نان وەرگرتن، چووینە ئاقاری هەرەتوپەرەتی ناوچەکە بۆ خۆشاردنەوە و سەمەدمان شاردەوە و لە برادەرانی ئیتجاهمان پرسی؛ ئایا

ژمارەیان تەواوە و کەسیان نوقستان نییە! کە خۆیان بەسەر کردەوە، سەمەدێکمان نوقستانە و تازەش کەس ناتوانی بگەڕێتەوە سەر زێیەکە، کە چەند سەعاتێک دوور بوو، لەناو خۆیاندا کردیانە مقۆمقۆ! ئێستاش بەبیرم دێت ئێشەکەیان بەمل فەرهاد داهێنا، کە لە گوندی "ترپە سپیانی" ماڵی دکتۆر سەردار شەهید بوو! گوتم بابە خۆتان مشەوەش مەکەن و ئێمە لەگەڵ خۆمان هێناومانە، باش بوو خۆمان شارەزا بووین، دەنا ئێمەشتان گورگانخواردوو دەکرد. ئەوە بوو دکتۆر رشید و دکتۆر سەردار زۆر سەرزەنشتی برادەرانی خۆیان کرد، کە ئێمە و هەڤاڵێکی خۆیان بە گەورەترین چەکەوە بە جێ هێشتووە، بەبێ ئەوەی پێی بزانن!! بۆ بەیانییەکە و ڕۆژەکەی، هەتا دەمەدەمی ئێوارە لە هەرەتی لای "کەلەکین"ی فەرحان ئاغادا خۆمان مەلاس دا. مام فەرحانە ئاغا بێستانیکی هەبوو، بە ئاوی ژێر زەوی و ماتۆڕ ئاوی دەدا، هێشتا هەندێ بەروبۆمی خیار و باینجان و هەتا شووتی و شارۆخی گەورە گەورەی پێوە مابوو، پێشمەرگەکانی ئێتیجاه زۆر مولتەزیم نەبوون، بەدزی مەسئولەکانیان هەموو ئەو بێستانەیان کێلا و ڕووتیان کردەوە. بۆ ئێوارە پاش مەلابانگدان لە بەردەم مزگەوتی گوندەکە کۆ بووینەوە، فەرحان ئاغا سوخەتێکی هەبوو، نەیدەهێشت پێشمەرگە بەسەر ماڵە جووتیارەکان دابەش بێت، پیاوێکی چاوتێر و سەربەرز بوو، گوێی بە ماڵی دونیا نەدەدا، فەرحاناغا کە پێشتر لەگەڵ من ناسیاوی هەبوو، چاک و خۆشییەکی گەرمی لەگەڵ کردم و منیش برادەرانم پێ ناساند، گوتی فەرموون بچینەوە ماڵ بۆ نان خواردن، نازانم چۆن بەم دەمودەستە ئەم هەموو خواردنەیان دروست کردبوو، من لەگەڵ دکتۆر رشید و دکتۆر سەردار و نزیکەی ٥٠ پێشمەرگە چووینە ئەو ماڵە، کە دیوەخانێکی گەورەی درێژووکانی هەبوو، هەموو بە رایەخ راخرابوو، ئەوانی دیکەش بەزۆری زۆردارەکی بەسەر ماڵە جوتیارەکاندا دابەش کران.

پاش دانیشتن و هەندێ قسەوباس، دیار بوو فەرحان ئاغا بەو پەلامارەی بیستانەکەی زانیبوو، کت و پڕ ڕووی لە من کرد و گوتی: حاجی مەمۆ ئەمڕۆ شتێکی سەیر ڕوویداوە، منیش گوتم دەبێ چی ڕوویدابێت! گوتی حاجی مەمۆ وا پێدەچێت یەک گاڕانە ڕەشەوڵاغی بێگاوان بەربوونەتە ناو بیستان و باغەکەمان، هەتا شتلە تەماتەکانیشیان، کە کارکە تەماتەی پێوەبوو، هەموویان هەڵکەندووە. زۆر پێکەنیم، برادەران گوتیان ئەوە بە چی پێدەکەنی، گوتم وەڵا بە قسەی مام فرحاناغا پێدەکەنم، کە مەبەستی لەشکرەکەی ئێمەیە! سەرەتا ئەوانیش پێکەنین، بەڵام دوایی دیار بوو، "بەڵێن"، کە خۆی بە دەمراستی هەموو لایەک دەزانی و پێی قەڵس ببوو، خەریک بوو قسەی زیادی دەکرد، من وەڵامم دایەوە و نەمهێشت قسەکانی تەواو بکات و دکتۆر سەردار و دکتۆر رشیدیش هاتنە ناو قسەکان و بە مام فەرحانیان گوت، بەڕاستی دەستت خۆش بێت، پێشمەرگەی بێ عەشرونەشرمان

هەیە و سەرمان بخوا ئەوەیە لەشکرەکەمان. مام فەرحاناغاش، کە من پێشتر لە ڕێگای برادەران شێردل و سەردار تایەرەوە ناسیبووم، هەروەها ئەو ناسیاوانەی سەرکەندیش بەتایبەتی "حسین سەرکەندی" زۆری وەسفی منی بۆ کردبوو، لە دڵەوە ئێمەی خۆشدەویست و لەبەر ئێمە قسەکانی "بەڵێن"ی لە دڵ نەگرت و زۆر بەگەرمی پێشوازی لێ کردین و میواندارییەکی جوامێرانە و بۆ هەمووشمان نان و پەنیری پێچابوەوە بۆ بەیان، چونکە بەیانیان لە گوند نەدەماین.

بۆ چەند ڕۆژێک لەو برادەرانە جیابووینەوە و هەر لایەکمان بەدوای کاری خومان کەوتین و تا چەند ڕۆژێک یەکترمان نەدیتەوە. لە نزیکی ئاسەواری قەڵای دیوینی دێرین و لە بەرانبەر گوندی ڕەزگەی مام عەلی، چالاییەک هەبوو کە جۆگەلە ئاوێکی پێدا تێدەپەڕی و لە کەناری ئاوەکەوە، قۆپەنە دارستانێکی چڕ هەبوو، کە دارە بەرزەکان بە باڵای خۆیان بەری ئاسمانیان گرتبوو، زۆربەی ڕۆژان ئەو پێشمەرگانەی لەو ناوچەیە بوونایە، لەناو ئەو دارانەوە، بارگەی حەسانەوەیان دەخست و وەک بنکەیەکی خۆشاردنەوەی ڕۆژێنی لێهاتبوو. بەرێککەوت ڕۆژێکیان، چەندان مەفرەزەی جیاوازی حیزب و لایەنەکان لەوێ کۆ بووینەوە و خەریکی حەسانەوە و نانخواردنی نیوەڕۆ بووین و ئەو دەمەش پاسەوانی سەر لاپاڵی تیشەکانی ئەو زنجیرە گردۆلکانەی دەچوونەوە سەر شوورەکانی دیوین، هاوڕییەکی ئێمە بوو بەناوی پێشەوا، کە پێشمەرگەیەکی ئازا و نەترس بوو، لەپڕ چەند پێشمەرگەیەک بە پرتاو بەرەو شوێنی پێشەوا سەرکەوتن و منیش دوایان کەوتم و کە لەناو دارەکان دەرچووم، سەیرم کرد پێشەوا ڕێگای لە پیاوێک گرتووە و نایەڵێ بێتە ناو دارەکان. کابراش لەسەر هاتنە ناومان سووربوو، هەر دوو دەستی بەرەو ئاسمان هەڵدەشەقاند. منیش بانگی پێشەوام کرد، مادام بێچەکە ڕێگای بدات. پیاوەکە کە گەیشتە ناومان، ئێمە لەپێشەوەی ناودارەکان جێگامان گرتبوو، بەبێ ئەوەی سڵاومان لێ بکات، بەدەم هەڕەشە و خۆتوڕەکردنەوە، خۆی لەناومان دیتەوە. یەک دوو پێشمەرگە گەرەکیان بوو پەلاماری بدەن و بکەونە سەروگوێلاکی! هاوارم لێ کردن کەس بۆی نییە ئازاری بدات، لێگەرێن با بزانین بۆ وا پرجوێنمان دەکات! خاڵۆی جوتیار کەدیتی من بوومەتە پشتوپەنای، ئەوجا زیاتر لە من نزیک بووە و بەدەم دەستدرێژکردنەوە، سڵاوی لێ کردم و منیش بردم لەتەنیشت خۆم دامنا و چایەکمان بۆ تێکرد و مەتارە ئاوەکەی خۆم بۆ درێژکرد و زۆربەی ئاوەکەی خواردەوە، پشووی هاتەوە بەر و بەدەنگێکی کز، لەبەرخۆیەوە داروچکەی لە عەردەکە وەردەدا و پرسی: ئێوە چ حیزبێکن؟ منیش لەپێشەوە خۆمانم پێ ناساند و ئەوجا ئەوانەی لەوێ، باسی یەکە یەکەیانم کرد، کە ئەودەمە زۆربەیان لە دەوروبەرمان کۆببوونەوە. کابرای جوتیار، دوای دڵنیابوون، زۆر بە

راشکاوی داوای بووردنی لە هەمووماں کرد، لەوەی کە قسەی نابەجێی پێمان کردووە، چونکە ئەو بەدوای مەفرەزەیەکی پارتیدا دەگەڕێ، کە گوایە پێشمەرگەی وەستا یونس بوونە! کە ئەو ڕۆژە تەنیا هەڤالانی پارتی لەوێ نەبوون، دەنا حشع و زەحمەتکێشان و گەل و ئاش ئامادەبوون. جوتیارەکە وەک ئەوەی لە دڵیدا بێت، لە بەرانبەر ئێمەدا قافی هاتبێ و پێش ئەوەی دەردی دڵی خۆی بکات و لە گرفتی شەخسی خۆی بدوێ، ڕووی لێمان کرد و گوتی: دیارە لە پەیڕەوپڕۆگرامی هەریەکەتاندا هاتووە، کە حیزب لە خزمەتکردنی میللەتە..! سەرۆک و سکرتێری حیزب لە خزمەت مەکتەبی سیاسی و مەکتەبی سیاسی لە خزمەت کۆمیتەی ناوەندی و ئەویش لە خزمەت تێکڕای حیزبدایە و حیزبیش بۆ خزمەت نەتەوە و وڵات دەستەوەستانە..! براله ئەوە هەرگیز وا نەبووە و نییە، بگرە هەمیشە خەڵک لە بۆ خزمەتی حیزبە و حیزبیش دەستەوەستانە لە خزمەت کۆمیتەی ناوەندی و ئەویش بۆ مەکتەبی سیاسی و مەکتەبی سیاسیش عەبدی موتیعی سەرۆک و سکرتێرە و ئاوێ بینە و دەستان بشۆ..! بێگومان ئەودەم ئێمە هەریەکەمان بۆ ئەوکاتی بیرکردنەوە و قەناعەتمان زۆر بەتوندی وەڵامی ئەو جوتیارە کلۆڵەمان دایەوە، بەڵام هەرگیز ئەو سەری نەهێنایە بەرێ و لەسەر ڕاوبۆچوونەکانی خۆی ڕشتبوو. پاشان کەوتە گێڕانەوەی سەربردەی خۆی، کە وا بەم جۆرە توشی هەڵەداوان بووە و لەگەڵ ئێمە کۆبوتەوە. ئەویش دوو شەوی پێشووتر، درەنگانی شەوێ چەند پێشمەرگەیەک بە بریندارێکەوە، دەرگایان لێ گرتم و بە زمانێکی شیرین داوای یارمەتیدانیان لێ کردم، بەوەی بەڵکو پیکابە فلاحییەی خۆمیان بدەمێ، تاکو خۆیان و بریندارەکەیانی پێ دەرباز بکەن و بۆ سبەی شەو وەک وەعدی پیاوان، سەیارەکەم بۆ بگەڕێننەوە سەر قەبرستانی گوندی کاوانیان (زرارەتی). منیش وەک کوردێک بە قسەکانیان هەڵخەڵەتام و ئەوە سەیارە دەبینمەوە و سەرباری ئەوەش دائیرەی ئەمنی حکومەت بە خەبەرەکەی زانیوە و بەدوایدا ناردوومە، کە خۆم و سەیارەکەم بچمە خزمەتیان و ئیسبات وجوود بکەم. ئیتر ئەوەیە دەردی سەرگەردانبوونم و توشی گونە ڕەشەی خۆم بووم. زۆرمان دڵی کابرا دایەوە و بەڵێنمان پێدا، سۆراخی برادەرانی پارتی بۆ بکەین و بە نا بەدڵی ڕێگا و ڕێگا گەڕایەوە. ئێمەش مەفرەزەکەی ئاڵای شۆڕش لە جەماعەت جیا بووینەوە و بەرەو دەورووبەری شەقلاوە کێل بوینەوە. ئەو ماوەیە بە هۆی دەستکورتی و ئەو فشارەی سەرمان لە لایەن "ی.ن.ک"ەوە، بە لەباربردنی لەدایکبوونی ئاسایی و گرتنی بەشێکی زۆری سەرکردەکانی لە ناوچەی قەراخ و ڕاوەدوونانی ئەوانەی گومانیان لێ دەکردن و ئازاردانیان و هەتا کارگەیشتە ئەوەی هەر بنەماڵەیەکی دانیشتوی ناوچە ئازادکراوەکان، هەر یەکێکیان لەگەڵ "ئاش" بوایە، بە ڕۆژی ئاشکرا ئیهانەیان دەکرد و کەفالەتیان لێ وەردەگرت، کە لەگەڵ

"ئاش" نەبیت. ئەوەبوو نزیکەی ١٥ پێشمەرگەمان، چ بەناچاری گەڕانەوە ناو یەکێتی و چ تەسلیم بە رژێم بوونەوە. هەر بۆیە، هێزەکەی مابوومان بەسەر چەند مەفرەزەیەکی بچووک بچووکمان دابەش کردن. ئەو ماوەیەیش من تەندروستیم زۆر خراپ بوو، تاکو رۆژێکیان ئێوارەکەی کە لە ئیختفاوە بەرەو ئاوەدانی هەنگاومان هەڵگرت، من هێزی رۆیشتنم نەمابوو، سامان مەلا گچکە و مام دارا، کە هەر دوو برادەری دیکەمان لەگەڵ بوون، بە نۆبەت دەهاتنە بن باڵمەوە و هەندێ جاران لە دوو خۆیان پەلکێشیان دەکردم. ناوناوەش کە دادەنیشتم، خوێناوم دادەنا و چاوم رەشکەوپێشکەی دەکرد و لە تەواو لە خۆم بێزار بووم. داوای ئەوەم لێ کردن کە بەدەمانچەکەی خۆم تەواوم بکەن، تاکو چیتر بار نەبم بەسەریانەوە و رێژنەی بارانی بەتاویش بەیەکجاری شپرێوتری کردبووم و هەموو تاوێک مردنم بە چاوی خۆم دەدیت، کەچی هاوڕێیان یەک لووتکەی کۆڵنەدان بوون، جاروبار توند بەخۆیانەوە دەنووساندم، تاکو لەو لەرزوتایەی گرتبووم، گەرمم بکەنەوە. نازانم دونیا چەند تاریک ببوو، لەپڕ گوێم لە سامان بوو کە لێم دوور نەدەکەوتەوە و ئومێدی وەبەر دەنام، گوتی کوڕینە ئەو سەگوەڕە، مانای ئاوەدانی لەو چەمەدا دەگەیەنێ. دروست تا دەهات رەوینی سەگەکان نزیکتر دەبوونەوە و هەر ئەوەندەم ئاگا لە خۆ بوو، لەبن رەشماڵێکەوە خۆمان دیتەوە. دیارە هۆشم لە خۆم نەمابوو، بۆ رۆژی دواتر، دەوری سەعات یازدەی نیوەڕۆ کە چاوم کردەوە، گوراحم خۆش بوو، یەک جلوبەرگی پاکوخاوێنم لە بەر بوو، دڵنیا بووم جلەکانی خۆم نین کە قوڕ و چڵپاوی لێ نەدەهاتە خوارەوە. لەوەش سەیرتر لەناو جێگایەکی گەرموگوڕدام و نالەرزم و قۆڕەقۆڕی سکم نایەت! هەروەها کەس لە هاوڕێیان نابینم..! لەناکاو لەو دیوی چیخەکەوە داپیرەیەکی بەساڵاچوو لێم بەژوور کەوت و بەدەم خەندەوە گوتی: ئەدی ئەوە داپیرەی خۆت ساغی کردیتەوە. کە چاوم پێکەوت، برسێتیم بیرکەوتەوە و ئەو لەپێش من گوتی: کوڕم دەزانم زۆرت برسییە. منیش لەپاڵ ئەو بەپەلەپروسکێ لە دەمم دەرچوو و پرسیم: پورێ ئەدی پێشمەرگەکان لەکوێن؟ خەمت نەبێ کوڕم لە دەستێکی ئەمینداى و ئەوان بۆ شەو بەدواتدا دێنەوە و بەرەبەیان ئەو ناوەیان جێهێشتوە. هەر ئەوەندەی پورێ لە لام رۆیشت، لە چاوتروکانێکدا یەک سینی نانی گەرم و ناسکەنان و ماست و سەرتوو و پەنیرییان لەبەردانام و وەک شێتان کەوتمە سەری و هەر پێرادەگەیشتن چایم بۆ تێبکەن. پاش سک تێربوون، چاکتر هۆشم هاتەوە بەر و پرسیم: پورێ ئەوە چیتان لێ کردووم، وا چاوانم رووناک بوونەتەوە! خۆ من ئومێدم لە خۆم دانابوو..! دیارە پیرێژن کە بەو جۆرە ناهەموارە منی دیتوە و دڵی پێ سووتاوم و ئەوەی بۆی کراوە درێخی نەکردوە. جارێ لەپێشەوە بە یارمەتیی هاوڕێکانم، بەدوای گەیشتنمان، هەموو جلەکانی

خۆمیان لەبەر کردوومەتەوە و ئەو دەستە جلە پاکەیان لەبەر کردووم و یەکسەر چەند لیفە و بەرماڵیان پێداداوم و ئەوجا بە دوو ژنی ئەو رەشماڵە، بۆ سەعاتێک زیاتر لەسەرم پالەوتوون، هەتاکو ئارەقەی شین و مۆرم کردووە و پاشان کەوتوومەتە خەوێ و ئەوە بەخەبەرهاتووم. من هەر بە حەپەساوی سەیرم دەکرد. یەکێک لە ژنەکان جلەکانی خۆمی بە پاکوخاوێنی بۆ هێنام. ئەوجا پیرێژن، فەرمووی لێ کردم، بچم خۆم بشۆم و جلەکانی خۆم لەبەر بکەم. نازانم ئەو کاتەم هەتا تاریکبوون چۆن بەسەر برد و زۆرتر تامەزرۆی ئەوە بووم، لەو شوێنە هاورێیان بە ساغ و سەلامەتی ببینمەوە و نەمدەزانی چۆن لە چاکە و پیاوەتی ئەو بنەماڵە دەرچم، ئەو رۆژە هەر ئەوەم لە دەست هات کە نامەیەکیان بۆ ئەو برایەم بنووسم، کە دکتۆری بەیتەری بوو، بۆم نووسی لە پاداشتی ئەو کۆمەکپێکردنەم، ئەوەندەی بۆی دەکرێ لە یارمەتیدانیان، و خزمەتکردنیان درێخی نەکات و هەتا مەودایەک هاتوچۆی براکەمیان کردبوو. بەداخەوە بەهۆی لەناوچونی ئەرشیفە بچکۆلە تایبەتییەکەی خۆمەوە، هەموو ناوەکانیانم لەبیرچوەتەوە. شەو کە برادەران چاویان بە من کەوتەوە، لەچاو دوێنێ ساغم و هیچ ئازارێکم لێ نەماوە، تێر باوەشیان پێدا کردم و یەک دونیا سوپاسگوزاری ئەو پیرێژن و ماڵەمان کرد و بارانیش ماوەیەک بوو، لێی کردبوەوە. پاش نانخوادن و هەڵگرتنی ژەمەنانێک بۆ سبەی نیوەڕۆ، بە سوپاسێکی زۆرەوە رەشماڵەکەمان بەجێهێشت و هەتا لەو بستییەی پشت هەوارەکەیان، یەکێک بەڕێی کردین، تاکو سەگەکان پێمان نەوەڕن. لەبیرمە دوای دوورکەوتنەوە، سامان، کە لەپێشەوە دەرۆیشت، رێگاکەی روو لە شەقلاوە گۆڕی و پاشان هاتە لام و گوتی: ئەگەر لە خۆت رادەبینی، هەر ئەم شەو بە سۆرکێدا ئاودیوی سەرمەیدانی شەقلاوە دەبین و ماڵی هاورێیەکی باوەڕپێکراومان دەست نیشان کردوە و چەند رۆژێک لەوێ ئیسراحەت بکە و بەدوای پزیشکێکی ناسراو بنێرە، هەم تەداوی گوێچکەت بکەی و هەمیش لەو نەخۆشکەوتنەشت بکۆڵنەوە.

شەو سەعات دوازدەونیو بوو، نم نم بارانیش دەستی پێکردبوو، گەیشتینە ماڵەکە و سەفین لە لام مایەوە و مام دارا و سامان و مامۆستا فەرهاد، دوای نانخواردن بە رێگای خۆیان و بە چاوساغیی هێژا وەستا فەتاحی دانیشتوی شار گەڕانەوە. ئێمە نزیکی هەفتەیەک لەو ماڵە ماینەوە. تومەز هەر ماڵی باوکی سەفین بوو، زۆریان خزمەت کردم و هەر لەوێ دکتۆر فەرهاد هاتە سەردانم و پاش پاککردنەوەی خوێن و خیزاوی گوێچکەم، هەندێ فەحسیشی کردم و پێشنیازی ئەوەی بۆ کردم، ئەگەر بکرێ بە ئیختفا چەند رۆژێک سەر لە هەولێر بدەم بۆ ئەنجامدانی پشکنینی زیاتر بۆ دڵنیابوون. پاشان لەو ماڵە هاورێیانی شار، شەهید دکتۆر تاریق و قادرە درێژم دیت و ئەوانیش لێیان دووپات کردمەوە بۆ سەردانی شار بۆ دیداری زیاتر لەگەڵ هاورێیانی هەولێر. پاشان بۆ کاتی

دانراو، دەستەیەک پێشمەرگە هاتنەوە دوامان و بەر لە دەرچوونمان، باوکی سەفین داوای لێ کردین کە کوڕەکەی ئەو ببورین و لە شەقڵاوە دەمێنێتەوە و پێشمەرگایەتی ناکات، ناچار مام دارا تفەنگەکەی ئەویشی لەشان کرد و دوای سوپاسێکی زۆر بە سۆرکێدا ئاودیو بووینەوە، لەگەڵ پێشمەرگەکانی دیکە یەکترمان گرتەوە و کەوتینە جەولەکردن. تاکو دوایی بەڕێککەوت لە گوندی سەرسول لەگەڵ برادەرانی زەحمەتکێشان یەکترمان گرتەوە، کە من نیازی چوونە ناو شارم هەبوو لە ڕێگای ئۆردوگاکانی بەستۆڕە و سەیرم کرد ئەوانیش هەمان مەبەستیان هەیە بۆ چەند دانەیەکیان، وەک (بەڵێن). بۆ نانخواردنەکە پێکەوە بووین و هەموومان دیسان لە ماڵی (ئەکرەم ئاغا) نان کرا بوو، لە دیوەخانەکەی کۆ ببووینەوە، ئاغا زۆر دڵی بە ئێمە نەدەکرایەوە و زۆر دۆستی حکومەت بوو، ئێمەش بەئەنقەست نانخواردنەکەمان خستە ماڵی ئەوەوە، هەموومان لە دیوەخان دانیشتووین، دکتۆر سەردار و ئەوانە کەوتبوونە باسکردنی دۆزی شۆڕش و هەڵوێستی جیابوونەوەی خۆیان لە حسک و شتی دیکە، دوایی عوسمان بانیمارانی هەندێ قسەی کرد و ئەکرەماغا هەر سەری لەبەرخۆ نابوو، بە دارۆچکەیەک گەمەی لەگەڵ عەردەکە دەکرد، عوسمان پێی گوت، ئاغا تێگەیشتی چیمان گوت، ئەویش نەیهێنا و نەیبرد و زۆر بێ شەرمانە و چاو نەترسانە وەڵامی دایەوە و گوتی، ئەوقسانەی ئێوە لەو گوێچکەوە دێ و لەوەی دیکە تێپەڕ دەبێ، وا باشترە نانەکەی خۆتان بخۆن و زۆر قسە نەکەن. منیش هەر لێی لەبیانوو بووم، کەش و کوشێکی لەگەڵ ڕژێم هەبوو و پێمگوت. هەی گەمژە بۆ تۆ خۆ حەیوان نی! لەو گوێچکەت بێ و لەوەی دیکە تێپەڕی! ئەگەر کادرێکی بەعس، یان جاشێک قسەی بۆ بکردیتایە، ئاوات بەخۆڕا دەفەرموو! ئێمە بە مرۆڤ نازانی! گەرەکم بوو هەستم و بڕۆم، دکتۆر ڕشید و دکتۆر سەردار دەستیان گرتم، کە لەو لاو لەم لام دانیشتبوون و ڕێگای هەستانەوەیان نەدام، زۆر قسەیان پێگووت و وەک تەماتە سوور ببووەوە و هەر لێوی خۆی دەکرۆشت و گوتی، کاکی خۆم ئێمە سەرمان لێشێواوە و چاکترە ئەو ناوە بەجێبهێڵم، هەم ئێوە و هەم خۆشمان ئیسراحەت بکەین! گوتم ئەمەیانتم بەدڵە و ئێمە گوێت لێ دەگرین و قسەکانت بەشەکر بێت، بەڵام تۆ بۆ ئەو ناوە بە جێ ناهێڵی و خواردن هات. ڕۆژی دواتر تێکڕای هێزەکەی ئاڵای شۆڕش لە شوێنی دیاری خۆمان کۆبووینەوە و بەیەکەوە جەولەیەکمان بەو ناو هەواری هەرکییەکان و گوندەکانی ئەو ناوە کرد و دوایی بەندە و وریا قادر بە بیانوویەک خۆمان لە هاوڕێیان دابڕی و بۆ شەوەکەی بەپێیان خۆمان گەیاندە شارەدێی بەحرکە و یەکسەر چوینە ماڵەکەی سدیق و لە خەومان ڕاستکردنەوە.

بەیانی زوو ناردم، دایکم و نەجیبە هاتن و بەیەکەوە، دەمی نیوەڕۆ بە جیبەکەی مام کەمال بە بازگەی جاشاندا بۆ ناوشاری هەولێر تێپەڕین و لەبەر ژنەکان داوای هیچ شتێکیان لێ نەکردین. بۆ شەوەکەی چوومە ماڵی خەزوورم، کە جێگای گومان نەبوو و دواتر ماڵی خوشکێکی نەجیبە و زۆربەی کارەکانم لەوێ ڕاپەڕاند و دکتور فەرهادیش هەموو پشکنینە پزیشکییەکانی بۆ ئەنجام دام و جارێکیان بە ناچاری چوومە موختەبەرێکی نزیک قەڵا و یەکێک لە پێشمەرگە تەسلیمبووەکان دەستی لەسەر شانی دانام و گوتی: فلان ئەوە تۆش تەسلیمبوویتەوە، زۆر لێی قەڵس بووم و گوتم، تۆ باسی چی دەکەی! من ناوم "سەباح"ـە و ئەوەش دەفتەرخدمەکەم، کابرا زۆر تەریق بوەوە و گوتی، ماشەڵڵا بەیەکتری دەچن و زۆر داوای بووردنی کرد.

لەو سەفەرەی شاردا، زۆربەی هاوڕێیەکان بە هۆی گیرانی چەند هاوڕێیەکی وەک ئاسۆ و خەلیل و کاکل و دکتۆرتاریق و رشید، خۆیان شاردبووە و تەنیا دکتور سلاح و یوسف، کە وریا لەگەڵیان دانیشتبوو و منیش قادرە درێژ و هاوڕێیەکی دیکەم دیت، کە ناوەکەیم لەبیر نەماوە و ئەو برادەرانە سەرلەنوێ کەوتبوونەوە رێکخستنەوەی ناو شار و گرتنەوەی رێکخستنەکان و لەو کۆبونەوانە بە ئاشکرا کاریگەری جۆری بیرکردنەوەی هاوڕێیانی سلێمانییان پێوە دیار بوو. دوای تەواوبوونی کارەکانمان هەر لە رێگای هاوڕێیانی بەحرکەوە گەڕاینەوە و بۆ شەو لەگەڵ تاریکبوون، بە چاوڕوونی سدیق لە پێشەوە، هەتاکو لە نەبوونی کەمین دڵنیا بوین، سدیق گەڕایەوە و ئێمە بەجووتە بەدەشتی بەڕانەتی، ملی رێگامان گرت، کە سەرباری تفەنگەکانمان، سەرو کوڵەپشتێکی پڕ لە خۆراکمان بە کوڵەوە بوو، زانیبوومان، ئەو چەند رۆژەی ئێمە لە شار بووین، رژێم زۆربەی گوندەکانی راگوێزابووەوە. بەناچاری خۆراکمان بۆ خۆمان و ئەو دوو هاوڕێیەش، مام دارا و سامان هەڵگرتبوو، کە لە نزیکی بانی کوزان چاوەڕوانمان بوون. سەرەتا زۆر خێرا رۆیشتین و وریا زۆر شارەزا بوو لە ناوچەکە و هەتا سەعات یەکی شەو برمان کرد، بەتایبەتی بەندە تەواو هیلاک ببووم و زۆر جاران وریا، هەڵوەستەی لەسەر دەکردم. هەر چۆنێک بوو، خۆمان گەیاندە ناو کەلاوەکانی گوندێکی وێرانکراوەوە و تەنیا رەوە سەگێک پێشوازییان لێ کردین و هەموو بە دەورمان کۆبوونەوە و سەرنجم دان، هەموویان رووەو ئاسمان دەوەڕن، وەک ئەوەی بێزاری خۆیان لە چۆڵبوونی گوندەکە دەربدەبڕن و چەند سەعاتێک بە پاسەوانی سەگەکان خەوتین و سەعات پێنج بوو، وریا لە خەوێکی ناخۆش، بێداری کردمەوە، ماڵئاواییمان لە سەگەکان کرد و ملی باریکە رێگامان گرت، بۆ چێشتەنگاوێ لەسەر جۆگەلەیەکی سەر رێگاکەمان، قاوەڵتییەکی سووکمان خوارد و پشویەکمان وەرگرت. پێش نیوەڕۆ گەیشتینە شوێنی دیاریکراو، بەڵام

کەسمان نەدیتەوە و زۆر ئەملاو و ئەولامان کرد، بەناچاری ملی ڕێگای گوندی ڕەزگەمان گرت و هەتا بەردەم دارە زلەکەی پێش مزگەوتی گوندەکە نەوەستاین، کە داروباری لەسەرییەک نەمابوو. لەپەنا دیوارە رووخاوەکانی قوتابخانەی گوندەکە دانیشتین کە پارویێک بخۆین، لە پڕ ساسان دەرکەوت و زۆر عوزری هێنایەوە کە بە هۆی نەشارەزابوونیانەوە، زیاتر بۆ خوارتر نەهاتوون.

شەوی ١٩٨٦/١/٣١، واتە ساڵرۆژی شەهیدکردنی "ئارام"، لە مزگەوتەکەی گوندی سەرکەند کۆبووینەوە و یادەکەمان پیرۆز گرت و بۆ بەیانییەکەی مەناف بە ئەرکێکی ڕێکخراوەیی بەرەو ناوچەی زرارەتی بەرێکەوت، کە بڕیار بوو دوای چەند ڕۆژێک هەموومان بچین لەوێ لە گوندەکەی ئەوان، لە "کاوانییان" لەگەڵ هاوڕێیانی شار یەکتر ببینین. بەیانی زوو کەوتبووە کەمینی جاشەکانی ئەحمەد زێڕۆی خائین و پاش تەواو بوونی فیشەکی تفەنگەکەی، لە نزیک قەڵای دوین و بانی کۆزان شەهیدیان کردبوو. ئێمە بەرەو گوندی ماوەران دەچووین، کە ئەو هەواڵە جەرگبڕەمان پێگەیشت و گەڕاینەوە و لەگەڵ پێشمەرگەکان بەپیر هەواڵەکەوە چووین و تەرمی شەهیدمان هێنایەوە گوندی ڕەزگە و لەوێ ناشتمان. شەهیدبوونی ئەو قارەمانە گورزێکی کوشندەبوو لە تێکۆشانی ئێمەدا، کە لە هەموو ژیانی پێشمەرگایەتی خۆمدا کەم ڕۆڵەی ئاوا بە ئەمەک و هێمن و ئازا و خۆڕاگر و بە هیمەتم دیتبوو، کوڕی ڕۆژی تەنگانە بوو، هەرچەند بەتەمەن بچووک بوو، بەڵام خۆشەویستی هەموو لایەکمان بوو، بە ئەخلاقی شۆڕشگێڕانەی سەرەنجی هەموومانی ڕاکێشا بوو، بە تایبەت بەگوێرەی خۆمەوە زۆری کار تێکردم، دواتر شەهیدبوونی ڕێباز و جەمال/دڵشاد، بەیەک جار برینی "مەناف"یان کاریگەرتر کرد و وەک چەپەرۆکێکی قایم هەموو جەستەی موقاوەمەتی تەزاندم و بوونە مایەی یەک لەفاکتەرە زەقەکانی لە پاشدان و پاشەکشەی خەباتی چەکداریمان و باوەڕنەمانی خۆم بەو جۆرە خەباتە چەکدارییە ناچارییە و مایەی دەست لە پێشمەرگایەتی هەڵگرتنم و کەوتنە دوودڵی و دوایی ڕوو لە ئاوارەیی کردنم.

لە ڕۆژی ١٩٨٦/٢/٢١ من لەگەڵ مەفرەزەیەکی بچووک بەرەو بنکەی بارزان کێل بووینەوە، کە بەبێ مەناف، تاقەتی ڕۆیشتنمان بەزۆر لەخۆکردن بوو. بەناوی ئاڵای شۆڕش بەیاننامەیەکم لەسەر نووسی و لە لای برادەرانی حشع بە چاپمان گەیاند. پاش دەیان ساڵ، ئێستاکەیش گیانی مەناف، دڵشاد و ڕیباز، لەپاڵ جوامێریی و هاوڕێیەتی شەهیدان، سەعدی خەلیل، مەلا غەفور، شەوقی عەباس، حاجی ئەکرم، ئاشتی مورتکەیی، زاهیر کەرکووکی، ئەحمەد قەمبەری و قاسم کرێکار و "ئارام"ی فریشتە، بەتایبەتی دەمهەژێنن و ژیانیان لێ کردوومەتە خەونی بێکۆتایی!

لەپاش گەڕانەوەمان بۆ بنکەی بارزان، کە ناومان لێ نا، بنکەی شەهید مەناف، زۆر دڵتەنگ بووم، بە هۆی باری ناهەمواری ڕێکخراوەکەمان، بەتایبەت هەندێ برادەرمان، لەناوچەکانی سلیمانی هاتبوون، هەروەک کۆمەڵەی ئێران بیریان دەکردەوە و کاریان بۆ ئەوە دەکرد وەک ئێمە لقێکی ئەوان بین و ئەو بڵاوکراوەی قەرەداغی جارِدانی "ئاڵای شۆڕش"یان کردبووە کتێبە سورەکە و لەم لاشەوە هەندێ برادەرانی خۆمان، بەتایبەت برادەرانی پێشمەرگەی هەولێریان بنکۆڵ دەکرد بۆ نزیکبوونەوە لە حشع و تێزە فیکرییەکانیان. بە جۆرێک بارودۆخەکەی ناوخۆمان زۆر شێواو بوو، لە هەموو لایەکەوە ناخۆشی گەمارۆی دابووین، ئەم بارە ناوخۆییە بووە مایەی ئەوەی کە هەمیشە کەم دەرامەت بووین، سواڵمان دەکرد، لەماوەیەکی کورت چەندان پێشمەرگەی قارەمان و خاوەن قوربانیمان تەسلیم بە ڕژێم بوونەوە، یان گەڕانەوە ڕیزەکانی یەکێتی، کە یەک بەخۆم زۆرم پێ باشتر بوو.

رۆژی ١٩٨٦/٣/٧ لەگەڵ سامان مەلا گچکە، ، ئازاد، پێشەوا، عبداللە شێخانی و سەلام بە هاوڕێیتی فیزاللە و جاسم و برایمی گوندی فەقێیان بە ڕێگای چیای برادۆست بەرەو دۆڵی خواکورک بەڕێکەوتین. بەناو گوندەکانی دۆڵەمەڕیان تێپەڕین و لەوێ لە گوندی خەرەند، لە ماڵی مام غەزالی حەساینەوە، کەدواتر بە هۆی ناسینی ماڵی مەلا مەحەمەدی کۆلەکی بووینە ناسیاوی یەکتری و ئەو ماڵە بووە بنکەی هاتووچۆ و جێگای حەسانەوەی شەوی ئەو ڕێگایە تووشە پڕ نەهامەتی و ماندووبوونە بێئەندازەیە. مام غەزالی بارزانی کورتەباڵایەکی خوێنشیرین و هەمووگیانی قسەی خۆش بوو، منداڵەکانیشی وەک خۆی کورتەباڵا بوون، لەو گوندە هەر ئەو ماڵە ڕوویان لەگەڵ پێشمەرگە خۆش بوو. زۆر حەزی لە شەترەنج بوو. جارێکیان نەجیبە هاتە لامان لەوێوە چووین بۆ ئەودیوی سنوور و لە شنۆ ماوەیەک مایەوە شەترەنجێکی بەدیاری بۆ هێنابوو، کە زۆر دڵی پێی خۆش بوو. دواتر زۆرتر باسی دەگێڕمەوە.

بۆ شەوی دواتر گەیشتینە دۆڵی چیای ڕەش، کە دەیانگووت وەختی خۆی شێخ ڕەشیدی لۆلان بە چلەی زستان و بەفربارینda دەبوایە بە کۆڵ بیگەیەننە سەر لووتکەی ئەو شاخە بەرزەوە، کە گوایە وەحی بۆ دێت! شەو لە لای هەندێ جەلەبچی ئاگرمان کردەوە، هەتا بەیانی لەسەرمان نەخەوتین و بۆ ڕۆژی دوایی گەیشتینە گوندی میسرۆک، کە مەکتەبی سیاسیی "حشع"ی لێ بوو. لەوێ پشووێکمان وەرگرت و بەرەو بنکەکەی "ئەبو تارا" بەڕێکەوتین. بەفرێکی هێجگار زۆر باری، چەند ڕۆژێک لەوێ گیرمان خوارد، دواتر چووینە بنکەی حیزبی گەل، کە دارا و دلێر لەوێ بوون، زۆر کوڕی چاک و هاوبیر بوون لەگەڵ چەپ و شۆڕشگێریدا و زۆریان گلەیی لە سامی هەبوو، چەند شەوێکیش لە

لای ئەوان ماینەوە و زۆر ڕێزیان لێ گرتین. ڕۆژێک سامال بوو، سەیرمان کرد زنجیرەیەک پێشمەرگەی "پەکەکە" بەدوای یەکتریدا ڕێچکەیان بەستووە و بەرەو لووتکەی کێلەشین بەفریان دەشکاند و دەچوونە ناوچەکانی تەرگەوەر و مەرگەوەر. ئێمەش خۆمان پێچایەوە و شوێن پێی ئەوانمان هەلگرت، کە ئەوان دەستەیەکیان هەموو کچ بوون، بەلام چ کچە پێشمەرگەیەک، دەتگوت دەسکە تەورن و دار کەلوپارچە دەکەن، ئاوا بەفرەکەیان دەبڕی، سەرباری ئەوەش ئێمە بەوان نەگەیشتین و سەیارەیان بۆ هاتبوو، سەفەری خۆیان کردبوو، کە گەیشتینە سەر لووتکەکە لە دوورەوە چەند خێمەیەک هەلدرابوو، دلمان زۆر خۆش بوو، گوتمان ئەگەر سەیارەشمان دەست نەکەوێ، لەناو ئەو خێمانە ڕەق نابینەوە، چونکە لەگەل گەیشتینە سەر ئەو زینوێیە، یەک ڕەشەبا و زریانی هەلکرد کە هەر ئەوەتە مرۆڤی لەگەل خۆی هەلنەدەگرت، ئێمە هەموومان بەکۆمەل سامان مەلا گچکە، ئازاد چاوشین، پێشەوا، عبدالله شیخانی و بەندە و سەلام ، کە زۆر حەزی لە قسەی فشەبوو و گێژی کردبووین. ناچار خۆمان لەبن خێمەکان دیتەوە، بەلام دەتگوت سەهۆلبەندانە، ئەگەر یەک سەعاتی تر لەوێ ئۆقرەمان بگرتایە، سەدان سال لە مردن بێمنەت دەبووین! خۆمان بۆ نەگیرا هاتینە دەرەوە، باش بوو لە بنکەی پارتی گەل، سەروو پاروێ نان و هەندێ خورمامان هەلگرتبوو، کەوتینە خواردنیان و تۆزێک گەرمێ کردینەوە، بەلام خەریک بوو دونیا تاریک دەبوو. وش و هۆڕی ڕەشەبایەکەش تا دەهات ساردتر و بەگوڕتر دەبوو. ئەو زریانە لە دەم و چاومانی دەدا، وەک مارنج سواغی دەدا. لەپڕ چەند لایتێ پەیدا بوون، کە لێمان نزیک بوونەوە، هەندێ سەیارەی عەسکەری ئێران بوون. هەر خۆیان لە ئێمەنەگەیاند و دیاربوو بە جیهاز قسەیان لەگەل یەکێکی دیکە دەکرد. من لێیان نزیک بوومەوە و لەناو پێشەوەی سەیارەکان لموزیان لەولا کرد، هەر زوو ئێمەیان بە پێشمەرگەی حیزبی شیوعی خوێندەوە، چەند گوتم بابە ئێمە پێشمەرگەی پەرچەمی ئینقلابین و بنکەمان لە زێوە و ورمێ هەیە و لە ناوچەی بارزان دەگەڕێینەوە و تەقەی سەریان هات و ئاخرەکەی یەکێک داوای "بەرگەی" لێکردین،کە هیچمان لە لا نەبوو. لەو کاتەدا کۆمەلێک چەکداری جەمەدانی سوور بەسەر شاخەکە کەوتن، دلمان خۆش بوو، گوتمان ئەوانە خۆ لەو دۆزەخەدا بەجێمان ناهێلن! دیاربوو لە بادینان گەڕا بوونەوە و هەندێ پاسداریشیان لەگەل بوو، کە هەموو جلی کوردیان لەبەر بوو، ماندوو بوونمان لێ کردن، بەلام هەر ئەوەتە وەلامیان دەدایەوە و خۆیان لە ئێمە دوور خستەوە، هەموویان سواری ماشێنەکان بوون، کە جێگای زیاتر لە ١٠ نەفەری دیکەش دەبوەوە. بەلام ئەوانیش گومانیان لە ئێمە هەبوو، وەک پاسدارەکان بە "حشع"مان تێگەیشتن و نەوێران خۆیان لە ئێمە بکەنە ساحیب، تاکو کەوتنە ڕێ یەکێک لەپشتی لۆرییەکیان هاواری لە ئێمە کرد.

ئەگەر لێرە بوەستن ڕەقدەبنەوە، هەر چۆنێک بێت بە پێ بکەونە ڕێ و لەنێو ڕێگادا بنکەیەکی پێشمەرگەی پارتی هەن و ئەگەر نەگەیشتنە لای پردی سەر ئاوەکە، لە لای ئەوان بمێننەوە! نەکەن لێرە بوەستن، تازە کەس بەم تاریکیە نایەتە ئێرە! چونکە یەکێک لە برادەرەکانمان پێی گوت، بەڵکو سەیارەکمان بۆ ڕەوان بکات. ئەوان لە بەرچاوان زوو بزر بوون، ڕێگاکە هەموو پێچاوپێچ بوو، شەویش تا دەهات خێراتر ڕەشماڵی خۆی دەخست، گەردەلوولی بەفر دەتگووت لورەی گەلە گورگێکی برسییە و ڕاوی نێچیر دەکات. گوتم کوڕینە با فریای خۆمان بکەوین و ملی ڕێگامان گرت، کەم و زۆر ڕۆیشتین تادەهات بە هۆی زریان و گەردەلولی هەڵکردووی بەفر هەم ڕێگاکەمان لێ بزر دەبوو، هەمیش یەکترمان بەباشی نەدەدیت، هەموو بیری خۆم بە کار هێنا، گوتم پشتێنەکانمان دەکەینەوە و لەیەکتری دەبەستین بۆ ئەوەی هەم لەیەکتر بزر نەبین و هەمیش بۆ ئەوەی کەمردین، هەموو بەیەکەوە بین، هەموومان ڕازی بووین، تەنیا ئەو "سەلام"ـە نەبێت، کە وای دەزانی خۆی قارەمانی ئاخر زەمانە و ئێمە هەموو دەمرین و ئەو دەرباز دەبێت. ئێمە هەموو پشتێنەکانمان لەیەکتری بەست و خۆم لەپێشەوە و عبداللە شێخانی لە دواوە، چەند هەنگاوێک بەڕێکەوتین، سەلام بارەی لێ هەڵستا و هاواری کرد بەجێم مەهێڵن. ئەوەبوو ئازاد چاوشین، کە زۆر هاوبیر بوون، داوای لێمان کرد و گوتی حاجی با جێی نەهێڵین و لەسەری وەستاین، هاتە پێش عەوڵا شێخانی و ئەویشمان وەک خۆمان گرێدا و لەسەرخۆ هەنگاومان هەڵگرت.

زۆربەی کاتەکان بە لۆفەکان خۆمان دەدیتەوە و دەهاتینەوە سەر ڕێگاکە، چونکە بەفر و زریانەکە لە هەموو لایەکەوە خۆیان دەکوتایە باوەشی ڕێگاکە و بزریان دەکرد. تا دەهات دونیا تاریکتر دەبوو، دەتوانم بڵێم هەموومان دەم و چاوی یەکترمان نەدەدیت، بە بەفر و بەستەڵەک ڕاگیرابوو، هەرئەوەتە هەناسەمان دەدا، ئومێدی ژیانمان لە خۆ دانابوو، سەرباری بە پشتێن لەیەکتر گرێدانمان، دەنگمان هەر ئەوەتە دەگەیشتە یەکتری. لەو سات و دەمەدا کە ترووسکایی لە دڵ و دەروونمان روو لە کوژانەوەی یەکجارەکی بوو، عەوڵا شێخانی لەناکاو تروسکەی ئاگرلێدانێکی بەرچاو کەوت. ئەوەندەی دەنگی تێدا بوو هاواری کرد و بە هەموو هێزی خۆشی ئەوەی پێش خۆی پاڵ پێوە نا و تا گەیشتنە دەورووبەری من و هەموو بەیەکەوە، کەوتینە هاوارە هاوار! تومەز پێشمەرگەیەکی پارتی بۆ بەختی ئێمە بۆ مێزکردن هاتبووە دەرەوەی خانووەکەی ژێر بەفر و چەرخی لێدابوو تاکو بەرپێی خۆی ببینێ و عەوڵا بەرچاوی کەوتبوو، کە تاکە یەک چاویشی هەبوو. پێشمەرگەکەی پارتیش سەرەتا باوەڕی نەکردبوو کە ئەوە دەنگی مرۆڤە، بەڵکو بە دەعبامان تێگەیشتبوو، خەریک بووە بچێتە ژوورەوە، بەڵام ئێمە لە هاواری خۆمان نەکەوتین و ئەوەندەی وزەمان هەبوو

دەمانقیژاند! ئیتر دواجار گوتبووی ئەوانە خۆ بە کوردی هاوار دەکەن و هەبن نەبن ڕێگایان بزرکردووە و لەم دۆزەخەدا چۆن بە زیندوویی ماون، مەردانە چووەتە ژوورەوە و هەڤاڵێکی تری کە هەر هەردووکیان لەوێ بوون، ئاگادار دەکاتەوە و جلی ناو بەفر لەبەر دەکەن کە سەر و بەدلەی قایش بوو، بەفریامان هاتن و بەدەنگەدەنگ تێیان گەیاندین کە لەشوێن خۆمان جولە نەکەین و ئێمە چین و لێرە چی دەکەین! ئەوان هەردووکیان سەر و لایتی گەورەیان پێبوو لەناو ئەو گەردەلوول و زریانە بەشەپۆلەی بەفر هەر ئەوەتە دەدیتران، پاش مەودایەک گەیشتنە ئێمە، بەڵام زۆربەمان پەکمان کەوتبوو، لەسەر ئەژنۆ لەناو بەفرەکە چۆکمان دادابوو، لە حەولەرۆحدا بووین. بەهەر شێوەیەک بوو بە هەردووکیان چ بە خۆ خستنە بن باڵمان و چ لەپشتکردن و ڕاکێشان، هەموومانیان بە زیندوویی گەیاندە ئەو خانووەی ژێر بەفرەکەوە.

من لە لای خۆمەوە جوولەم لەبەر بڕابوو، بەزۆر جل و بەرگەکانیان لەبەر کردمەوە و بردمیانە بەر زۆپاکە و جل و بەرگی ئەو پێشمەرگانەی لەوێ نەبوون، هەموو گەرم و گوڕ بوون، یەکێکیان لەبەر کردم و نەم دەتوانی لەسەر قون خۆم ڕاگرم و بەتەنیشتەوە پاڵ کەوتم و ئەوانەی دیکەش لە من باشتر نەبوون. پاش ئەوەی هەموومان بە هۆش خۆ هاتینەوە، سەیرمان کرد سەعات چواری بەیانییە و برسێتی زگمان زەنگی خۆی لێدەدا، لێرەدا "سەلام"ی توندڕەو و چەمبەری هاتە تەکمەوە، دەستی لە ملم کرد و سوپاسی پێ گوتم، کە بە هۆی پێشنیازەکەم لە مەرگی مسۆگەر ڕزگار بوونە، بەڵام بەگوێشیدا چرپاندم کە زۆری برسییە. منیش ڕووم لەو دوو پێشمەرگەیە کرد، دوای سوپاسی زۆر گوتم، دەزانن زۆرمان برسییە! ئەوان خەریک بوو بە قونە توتکە خەو دەیبردنەوە، گوتیان ئێمە دەخەوین و لەو خەلانەی ئەو دیو، دوو کەلەشی گۆشتی کەنغەر هەڵواسراوە و بۆ خۆتان کەل و پارچەی بکەن و بیخۆن، بەدەم برژاندن، یان کوڵاندنی. ئەو دوو پێشمەرگەیە پرخەی خەویان دەهاتێ و ئێمەش خەریکی گۆشت برژاندن بووین، هەتاکو سەعاتمان گەیاندە حەوت، زگی خۆمان تێر کرد و هەریەکە لەپاڵ خۆیەوە کەوتە خەوێ.

سەعات ٢،٥ی پاش نیوەڕۆ بوو، یەک یەک لە خەو ڕابووین، خۆم پێش هەمووان ڕاست بوومەوە و سەیرم کرد ئەو دووپێشمەرگەیەی پارتی لەپەنا دەرگاوە بۆخۆیان چایان لێناوە و خەریکن نان و چا دەخۆن، چونکە تەنیا ئێسکەکانمان بۆیان هێشتبۆوەوە، بەڵام هەموو جەستەم ئاوسا بوو، هەتا دەم و چاویشم پەنما بوو، دەتگوت کوتراون. کە لە ئاوێنە تەماشای خۆم کرد ئەگەر مێشکم ئاسایی نەبوایە خۆم نەدەناسییەوە. پێشمەرگەکان ئاورێکیان لێ دامەوە و دیاربوو دڵیان پێم سووتا، گوتیان مامۆستا! گەرماو و ئاوی گەرممان هەیە، وا چاکە بۆ خۆت ئاوێکی گەرم بە خۆت دابکەی و جلەکانی خۆشت وشک

بوونەتەوە، ڕەنگبێ چێتر بێت! منیش هەستام بەگوێی ئەوانم کرد و بە شەلەشەل خۆم گەیاندە گەرماوەکە و ئاوەکە زۆر گەرم بوو، دیاربوو گیزەری کارەباییان هەبوو. ماوەیەکی باش ئاوی گەرمم بەخۆدا کرد، هەستم کرد چاکتر دەبووژێمەوە، بەڵام تاقەتی زۆرم نەبوو لەو گەرمایە ئۆقرە بگرم، تا دەهات پشووم تەنگ دەبوو، خێرا خۆم وشک کردەوە و جلەکانی خۆم لەبەر کرد و برادەران هەموو هەستا بوون و ژوورەکەیان پاک کردبووەوە، کە هاتمە دەرەوە سەیرم کرد زریان و گەردەلوولەکە نەماوە. گوتم لێرەوە بۆ سەرپردەکەی سەر ڕووباری گادەر چەند دەبێت! گوتیان هەر یەک چارەک دەبێت. ئیتر هەموو خۆمان کۆ کردەوە و پاش سوپاسێکی زۆری ئەو برادەرانە. بەڕێکەوتین و گەیشتینە سەر پردەکە، ماشێنێکی سەربازی کە ئۆردوگای لێبوو، بە پیاوەتی خۆی ئێمە هەتا شاری شنۆیە هەڵگرت و هەموومان بۆ گەرماوی یەک هۆدەیی چووین و زیاتر بوژاینەوە و لەوێ چووینە ماڵی مەحەمەد سابیر، کە هاوڕێیەکی ئاڵا و دۆستێکی گیانی بەگیان خۆم بوو و لە ژوورەکەی هەتا بەیانی خەوتین، کە "مەریوان"یش لەوێ بوو، کە یەکێک لە پێشمەرگە ئازاکانی یەکێتی بوو و وازی هێنابوو. بۆ ڕۆژی دواتر لەگەڵ مەریوان کە جیبێکی لاندرۆڤەری گچکەی هەبوو، چوینە زێوە کە بنکەی سەرەکی ئاڵای شۆڕشی لێبوو. هاوڕێیان لەبەر ڕۆشنایی نامەیەکی مەلا بەختیار، کە لە ڕۆژانی گیرانەکەی لە لایەن یەکێتییەوە، بۆ بەندە و سالاری نووسیبوو، لیژنەیەکی سەرپەرشتی کاتییان بۆ ڕاپەڕندنی کارەکانی ئاڵای شۆڕش دانابوو، کە لەم هاوڕێیانە پێکهاتبوو؛ سالار، بەندە، ئاسۆ عەلی، عیماد ئەحمەد، کەریم عوسمان و دوایی مامۆستا سەلام عبدوڵلا بۆ علاقات و "مامۆستا عادل"یشی بۆ زیاد کرا، بۆ سەرپەرشتی ڕێکخستنەکانی ناو شارەکان. بەڵام زۆری نەبرد ئەویش هاتە بنکەی زێوە. ئەو دەمە بنکەی زێوەی جمەی دەهات و قەڵەباڵغ بوو، نزیکەی ١٠٠ هاوڕێی لێ کۆببووەوە و بەشێکیان بێ ئیشوکار هەر خەریکی پرتە و بۆڵە بوون. چەند کۆبوونەوەکی لیژنەی سەرپەرشتیمان ئەنجامدا، کە "حەمەئاوات و مەلا یاسین"یش لەسەر پێشنیازی بەندە بەشدار دەبوون. تارادەیەک ڕا و بۆچوونەکانیان لە چاو برادەرەکانی دیکە میانڕەوانە و لەژێر کاریگەری بیری توندڕەوانەی هەندێکی دیکەی ئەو هاوڕێیانە نەبون ، کە دروست ئەو دەمە وەک کۆمەڵەی ئیرانی، مەنسور حیکمەت بیریان دەکردەوە و هەڵسوکەوتیان دەنواند و "ئاڵای شۆڕش"یان ئیفلیج کردبوو. سالار گەرەکی بوو، من هەر لە زێوە بمێنمەوە و خۆی بەپەلە سەفەری دەرەوە بۆ کۆمەک پەیداکردن و لای منداڵەکانی لە سوید بکات.

بارودۆخی گوزەرانی ژێر جەمەلۆنەکانی زێوە زۆر سەخت بوو، لە ماوەیەکی زۆر کەمدا، نزیکەی بیست کەسێک وازیان هێنا و هەریەکە بە لایەکەوە قوچاندی و هەر بۆ

نموونەش، یەکێکی وەک جەلالی حەمەی محە، کە تەنیا یەکێک بوو لەو چەند سەرتیپەی هاتبوونە ریزی ئالای شۆڕش بە نزیکەی ٤٠ پێشمەرگەوە، بەماوەیەکی کورت کەمتر لە ٢٠ پێشمەرگە لە ژێر ئەو جەمەلۆنە ساردوسڕانە، بە دەست بەتاڵی مابوونەوە. لە کۆبوونەوەکاندا زۆربەمان لەسەر ئەوە سووربووین کە چەند بنکەیەکی دیکەی لە جۆری ئەوەی بارزان، لە ناوچەی ئالوەتان، لە سەر سنووری بناری قەندیل و پشدەر و قەلادزێ و بناری سورێن بکەینەوە و هاوڕێیانی زێوەی لەسەر دابەش بکرێ. هەندێ لە هاوڕێ و پێشمەرگەکان زۆر دڵسۆزانە ئامادەی بوون و سەرەتا بە شێوەیەکی خاووخلیچ بۆ ئەو دوو شوێنە چوون، بەڵام دیسانەوە بە هۆی دەستکورتی لە رووی دارایی و ڤیتۆی یەکێتی بۆ نەگەیشتنە ناوچەکانی خوارەوە و ئامادەنەبونی یەکێک لە برادەرانی لیژنەی سەرپەرشتی، بێجگە لە بەندە، سەرباری تەندروستی خراپ و هەر جۆرە مەترسییەک، سەرپەرشتی و هاتوچۆی بنکەی بارزان و ناوچەکانی هەولێرم دەکرد، بۆ ئەوەی لەپاڵ پێشمەرگەکان بچنە ئەو بنکانەوە و تەنیا دانیشتن و مۆلخواردنەوەی ژێر جەمەلۆنەکانیان لاباشتر بوو. من سەفەرێکی بەپەلەی تارانم کرد و هەندێ پشکنینی پزیشکیم بەهۆی برادەرێکمەوە، کە لە گەڵ "حیزب اللەی شۆڕشگێر" کاری دەکرد، لەلای دکتۆر خالسی نەخۆشخانەیەکی خوارووی تاران ئەنجام دا و خێرا گەڕامەوە زێوە و سالاریش سەفەری دەرەوەی کرد. بە هۆی ئەوەی گفتم بە برادەران دابوو، دوای کۆبوونەوەیەکی لیژنەی سەرپەرشتی، خۆم بۆ سەفەرێکی دیکەی رێگای هاتونەهات سازکرد و ئەبوبکر خۆشناومان بۆ بەرێوەبردنی کاروباری راگەیاندن لە زێوە بەجێهێشت.

ساڵی ١٩٨٦ بوو لە زێوە بەرەو خواکورک بەڕێکەوتین، هێشتا بەفری سەر رێگای ئەو کوێستانانەی بەتەواوی نەتوابووەوە و بەنزیکەی ٧ سەعات بەناو شێلاوەی بەفردا رۆیشتین. مام هێدی، کە زۆر نەبوو بە مەفرەزە لە قەندیلەوە، لە جەولەی ناوچەکانی دۆڵی شەهیدان و باڵەیی گەڕابوەوە و حەزی لە مانەوە لە زێوە نەبوو، عبدالالە شێخانی، پێشەوا و ئەوانەی ترم لەبیرنەماوە. زۆربەمان بەتایبەتی لە نشێوەکاندا دەخلیسکاین و پشتی سەرمان بەعەردی دەکەوت و بە دەردەسەرییەکی زۆر گەیشتینە گوندی شێخان لە دۆڵی خواکورکدا. ئەو سەفەرەمان زۆر خێرا بوو، تەنیا رۆژێک لاماندایە لای بنکەکەی "ئەبو تارا" و پشوویەکمان وەرگرت، چونکە پێشتر لەگەڵ مەفرەزەیەکی پارتی، گفتمان هەبوو لە گوندی شوشان یەکتر بگرینەوە، کە ئەوانیش تەنیا سێ پێشمەرگە بون و دەهاتنە خوارەوە و شارەزایی تەواویان لە رێگاکان هەبوو.

بۆ رۆژی دواتر لە گوندەکە یەکترمان گرتەوە و یەکسەر بەرێکەوتین و شەومان لە کەلاوەکانی گوندی حەیات بەسەر برد. لە قەدپاڵێکی رێگاکەوە، شانە هەنگوینێکی

پراوپڕمان لەناو دارێکی گەورە بە هۆی مام هێدی و ع. شێخانی ڕنییەوە و مەتارەکانی خۆمان و قوتییە بەتاڵەکانی ئەو گۆشتەی خواردبوومان، دوای خواردنی مشە، هەموویانمان لێ تژی کرد بوو کە لەو شەو و ڕۆژەی ڕۆیشتنی بەرەو برادۆست زۆرمان بەکەلک هات و شەنگ و تاقەتێکی باشی پێ بەخشیبووین. من زۆر بەوردی سەرنجی ڕێگاکەم دەدا، تاکو ئەوجارە لە گەڕانەوە، پێویستمان بە کەس نەبێت و خۆمان بەڕەی خۆمان لە ئاوێ دەربکەین. ئێوارەکەی بەدرەنگەوە گەیشتینە ماڵی مام غەزالی بارزانی لە گوندی خەردەن و پشوویەکی باشمان دا و پێشمەرگەکانی پارتی بەر ماڵێکی دیکە کەوتن. دوای هەندێ باسوخواسی ناوچەکە و ڕێگاوبان لەگەڵ مام غەزالی، یارییەکی شەترنجمان کرد. دیاربوو ژنەکەی مام غەزالی زۆر نەخۆش بوو، تەکلیفی ئەوەی لێ کردم، ئەگەر لە هەولێر دکتۆرێکی باش بناسم و ژنەکەی ببەنە لای، منیش وەک ئەوەی لە فرسەتی وا بگەڕێم، گوتم: بەسەر چاوان و نامەیەکم بۆ دکتۆر فەرهاد نووسی، کە هاوکارییان بکات. لەناو نامەکەدا، چەند وشەیەکم بۆ ماڵەوەی خۆمان نووسیبوو، کە ئەگەر نەجیبەخانی هاوسەرم بۆی دەلوێ، بەهۆی حەفسەتخانی خوشکی مەلا سەلیم بۆ سەرەتای مانگی چوار بێنە کۆلەکان. مام غەزالی بە مەمنوییەوە نامەکەی گەیاندبوو، دکتوری ناوبراویش کۆمەکی زۆری کردبوون.

دەوری سەعات دوازدەی شەو لەسەر جادەی مێرگەسۆر پەڕینەوە و بە ڕووی چیای برادۆست سەرکەوتین و بۆ بەیانی لەسەر تۆقەرەی چیایەکە، کانیاوێکی خۆش و دڵگیر هەبوو، بەبێ مەترسی سەرخەوێکی باشمان شکاند و پاش نانخواردنێکی سادەی بەیانی کە لە ماڵی مام غەزالی سەر و هێلکەی کوڵاویان بە نانەوە بۆ دانابووین. دەوری سەعات ١٠ی بەیانی بەرەو خوارەوە گلۆر بووینەوە، بەڵام کە نزیکی گردولکەکانی سەر کەناری زێیەکە بووینەوە، بە مەودا و وریایی ڕۆیشتین و بەسەلامەتی بەرەو بنکەی بارزان هەڵکشاین.

پاش چەند ڕۆژێک نەجیبەخانی هاوسەرم بە بارێک خواردەمەنی و کۆمەڵێک کتێب و گۆڤارە ئەدەبییەکانەوە گەیشتە لامان و نامەی هەندێ لە برادەرانی شاری هێنابوو، کە تێیدا هەواڵی خۆش و ناخۆشی تێدابوو. نەجیبەخان چەند ڕۆژێک مایەوە و شەوێک لە ڕێگای سالح سورچی[40] و بەهاوڕێتی "ڕەوا و دارا"وە کە سالح یادی بەخێر بەخۆیشی

[40] کە وەک کادرێکی پارتی بە تەنیا لەگەڵ ماڵ و منداڵەکانی لە گوندی "بێکرێس"ی خوارەوەی گوندی کۆلەکان، بنکەیەکی دانابوو، لەگەڵ بەندە و ئێمە پێوەندی زۆر خۆش بوو، هاوکاری زۆری دەکردین، بەتایبەت بۆ پەیداکردنی ئازوقە و هاتوچۆی ناو عەشیرەتی سورچییەکان. بەر لە ئەنفالەکان لە ناوچەی هەریر شەهید بوو.

بەگەرمان كەوت و چوينە گونديكى سورچييان، كە چەند خزميكى سالحى لێ بوو و هەموويان چەكدارى حكومەت بوون. شەو دواى نوێژى عيشايێ بوو گەيشتينە گوندى و بە پەنادزە چوينە مالەكەوە، كابراى خاوەن مال خەريكى نوێژكردن بوو، لەگەل سەلام وەرگرتنەوە سەيرم كرد، زۆر ديقەتى منى داو پاشان بەخێرهێنانى كردين و لەگەل سالح يەكتريشيان ماچ كرد. پێش ئەوەى سالح باسى شتێك بكات، كابرا ديسانەوە تەماشايەكى وردى كردم كە وامزانى لەبەرچاويلكەكەى چاومەوە، مەزەندەى پێشمەرگەى "حشع"م لێ دەكات و خێرا پرسى: پێش چەند رۆژێك تۆ لەگەل كۆمەلێك پێشمەرگە بە برادۆستدا نەهاتنە خوارەوە و بۆ بێكرێس نەپەڕينەوە؟ منيش دروست وەلامم دايەوە. يەكسەر بە نەرمى گوتى، دەبێ تۆ وەلى خودا بيت! من و سالح بەيەكەوە پێكەنين. سالح لەبرى منيش پرسى: بۆ وا دەلێى و چى بووە؟ كابرا دەستى بۆ ئەو تفەنگە هەلواسراوەى ديوارەكە برد و گوتى: كورە بەو تفەنگەى تەقەم لێ كردووە و تفەنگ چروكى كرد! ئيتر چۆن وەلى نييە..! پاشان هەموو بەسەرهاتەكەى بۆ گێڕاينەوە كە ئەوان، لەگەل هاوگوندييەكى ديكەى چەكدار، لە كۆنە رەبايەيەكى سەربازى لە بۆسە دانيشتوون و ئێمەش بەبێ ئەوەى ئاگامان لە شتێكى لەم جۆرە هەبێت، بە وريايى و مسافەى نێوان يەكترى بە ناودارستانەكە دەهاتينە خوارەوە. ئەو دەمە خۆم لە بەرايى هەموانەوە دەڕۆيشتم و تفەنگم لە گۆلمێ گرتبوو. جاشەكە بە هۆى ئەو عەينەكەى چاومەوە، بە فيعلى وادەزانى پێشمەرگەى "حشع"م و دەيەوێ تەقەم لێ بكات و من بپێكى و ئەوانى ديكەش هەريەكە بەلايەكەوە رادەكەن بۆ رزگاركردنى خۆيان و ئەوان دەستكەوتيان تفەنگێك و تەرمى پێشمەرگەيەك دەبێت بۆ پارە پێوەرگرتن لە حكومەت. بەلام كە تفەنگەكەى بۆ چانسى من چروك دەكا و ولداشەكەى دەيەوێ تەقەم لێ بكات، يەكسەر پێشمەرگەى دواى من لەناو دارەكان دەردەكەوى و كە دەبينى ئێمە، ئاوا بە رێكى دێينە خوارەوە و دەستى دەگرى و پێى دەلێ، ئەوانە زۆرن و بە جۆرى رۆيشتنەكەيان بە شيوعى ناچن و لە شوێنەكەى خۆيانەوە بە ئەسپايى دەكشێنەوە و بۆى دەقوچێنن.

ئيتر سالح كۆمەلێك قسەى پێ گوت كە چۆن دەستى دەچێتە كوشتنى پێشمەرگە، هەتا ئەگەر پارتيش نەبن. بۆ خاترى سالح و وەليبوونەكەى خۆيشم، كابرا گفتيدا كە سبەينێ، نەجيبەخان بە ساغ و سەلامەتى بگەيەنتە هەرير و لەوێ بۆ هەولێرى بەرێ بكات. ئێمەش سەعات يەكى شەو لەگەل سالحى گەڕاينەوە و لە رێگا هەوالى جەرگبڕى شەهيد بونى جەمال، (دلشاد مەحەمەد) لێپسراوى بنكەى شەهيد "مەناف"ى ناوچەكانى هەولێرمان بيست، لە روداوێكى پەڕينەوەى نارێكى ناو گوندى بێخمەدا. شەهيدبوونى دلشادى جوانەمەرگ، دلشادى ميهرەبان و ئينسان، كە بەقەدەر جوانى سروشتى بەهارانى

کوردستان، ناسک و دڵ گەورە بوو. کوستی لەدەستدانی ئەو هاوڕێیە سەربڵندە بۆ ئاڵای شۆڕش بەگشتی و بۆ من، سەرەتای باوەڕنەمانم بوو بە خەباتی چەکداری. لەبەرچاوونەمانی "مەناف"ی زیرەک و هێمن و خاوەن هۆش و مەعریفەت و "ڕێباز"ی بەهەڵمەت و چاونەترس و ڕووتەڵە و "دڵشاد"ی نموونەی وەفا و ڕاستگۆیی، کە پشت و پەنا بوون لەو مەرگەساتەی کاروانی ئاڵای شۆڕشدا. لەوان ڕۆژانی پڕ چەرمەسەریی ڕێکخراوەیی و منی تەندروست خراپ، مایەی جۆزەرەدەرکردنی کۆڵدان بوو لەوخەباتە مەرگەساتە ناچارییە. بەڵام بە هۆی بەڵێندانم بەو ڕەفیقانەی لە کاروانی خەبات شەهید بوون و ئەوانەش لە شانی یەکترییەوە مابووینەوە، وەک کوردە غیرەتی تا ئاوم لەدوو بڕێ هات، لە کوردستانی شەهید "ئارام" بەسەر پێیانەوە بووم. بۆ شەهید دڵشادیش، بەیاننامەیەکم بەناوی ئاڵای شۆڕش نووسی و ناردم لە قاتعی حشع بۆیان چاپکردین و لەگەڵ خۆمان بردمانە خوارەوە و بڵاومان کردەوە. ئەو ماوەیە چەند پێشمەرگەیەکی وەک خەلیل تورکمان، کە بەر لەئەنفالەکان لە دەوروبەری هەولێر شەهید بوو و فواد خانەقینیش، کە بەژیان ماوە، لەگەڵمان بۆ ناوچەکانی دەوروبەری شەقلاوە دابەزین.

من بەدوای چەند ڕۆژێک جەولەکردن لەگەڵ برادەران، ڕۆژێک لە گوندی زێوکەی حاجی حوسێن بە نهێنی مامەوە و هەر لە ماڵی حاجی حوسێن خۆی بووم، بەمەبەستی دیتنی چەند هاوڕێیەکی شاری. پاش دیدارەکانمان کە پێش نیوەڕۆ بوون، ئەو دوو برادەرەی هاتبوون بە پەلە بوون و زوو ڕۆیشتنەوە و لەسەر سفرەی نانخواردنی نیوەڕۆ بووم، کوڕێکی حاجی حوسێن بەپەلە خۆی کرد بەو ژوورەوە، کە من لەگەڵ مام حاجی نانمان دەخوارد و گوتی: بابە ئەوە ڕەوە جاشێک بەرەو ماڵی ئێمە دێن و خێرا بە کەلوپەلەکانمەوە بردمیانە ئەو ژوورەی توتنی تێدا داکرابوو. خۆم لە پەنا شەڵتە توتنە داگیراوەکان مەلاس دا. مام حاجی خۆیشی چووە سەربانی ژوورەکان و جاشەکان هەندێکیان هاتبوونە سەربانەکە و لەناویان دەنگی "توفیق بیرێژی"ی کۆنە یەکێتیم ناسییەوە کە مام حاجی زۆر بەتوڕەیی قسەی لەگەڵ دەکرد و پێی دەگوت، منیش وەک ئێوە چەکداری حکومەتم و نابێ، هەروا لەخۆتانەوە و بەبێ ئاگادارکردنەوەم بێنە سەرگوند و ماڵەکەم! توفیقیش بە زمانێکی دۆستانە بە مام حاجی گوت: ئێمە خەبەرمان هەیە یەکێکی قاچاخ لە گوندەکەتان هەیە، بەڵام هەتا بە خۆم لەگەڵدابم، کەس ناتوانی ماڵی تۆ بپشکنێ و خەڵکی لێ دەربێنیت و حەزدەکەم لە زماندانی پیاوخراپان خۆت بپارێزی و من ڕێزی تۆ دەگرم. ئەوەبوو چۆن بەپەلە هاتبوون، ئاواش بلەز ڕۆیشتنەوە. ڕەنگبێ یەک سەعاتی دیکە لەو ژوورە پڕ توتنە بمایەوە! هەر بە بوونی توتنێ دەخنکام.

ئێوارە کە هاوڕێیان هاتنەوە دوام و بۆ ڕۆژی دواتر بە لای کلکەی مەسیفی، جەولەیەکی هەتا نزیک بەستورەمان کرد و دواتر لە ئاقاری گوندی "سەرسول"ەوە بەرەو گوندەکانی بەڕانەتی بەڕێکەوتین و شەوی دواترمان لەگوندێ سەیدان بەسەر برد. لەوێ مەفرەزەکەمان، بێجگە لە بەندە و وریا، هەموویان بەرەو ناو خەیلانییان گەڕانەوە. بە قەلابەکەی سدیق بەحرکەیی، شەومان لە هەولێر کردەوە. چەند جارێک لەگەڵ هاوڕێیانی ناو شار دانیشتم و بڕیاری خۆم پێگوتن کە بەنیازی سەفەرم بۆ دەرەوە بۆ عیلاج، لە پاڵیشەوە بە پەنادزە و دەفتەرخدمەی براکەم، چەند جارێک سەردانی عیادەی دکتۆر فەرهادم کرد، بەڵام بەدرەنگی و وریایی، چونکە تەندروستیم زۆر خراپ بوو. بە هەمان ڕێگا گەیشتینەوە پێشمەرگەکان و لە گوندی بابەجیسک توشمان بەتوشی مەفرەزەکی پارتی بوو، کە خورشیدی سەرکەندییان لەگەڵ بوو، نامەیەکی هاوڕێیانی زێوەی کوردستانی ئێرانی بۆ هێنابووم. نامەی مام دارا و سامان بوو کە بۆ هەندێ عیلاجی دکتۆر مابوونەوە. هەواڵی ناخۆشی شەڕوشۆڕی نێوان برادەرانی زێوەیان نووسی بوو، کە ئەوانەی توندڕەوەکان لەگەڵ عیماد ئەحمەدی تێکگیراون و پەلاماری عیمادیان داوە، ئازاریان پێگەیاندوە و گەرەکیان بووەماڵەکەشی بسوتێنن، بەڵام دیارە وجودی ئەو برادەرانەی هەولێر، ڕێگریان کردووە و دانیشتوانی زێوە بوون بە دوو بەشەوە و داوایان لە من کردبوو بە زووترین کات بگەڕێمەوە زێوە.

ئێمە لە بنکەی شەهید مەناف بەڕێکەوتین. ئەو ڕۆژە دونیا خۆش بوو هەتاو بەدەرەوە بوو، کە هاتین لە زێی بادینان پەڕینەوە و هەتا بناری شاخی برادۆست هیچ لەگۆڕێ نەبوو. هێشتا مابوومان بگەینە ئەو کانییەی تۆقەسەری شاخەکە ، دونیا بووە تەم و مژ، بە جۆرێک هەتا سەر کانیەکە ڕێگای بەفرمان بە خۆ شکاند و لەسەر کانییەکە خەریکی ئیسراحەت بووین، بەفر دووبارە تیپی کردەوە کە هەروەک گوریس دەهاتە خوارێ. لەوێ هەستمان کرد "هیوا" تەندروستی باش نییە و ئامۆژگاریمان کرد هەر لێرە بگەڕێتەوە و دوو پێشمەرگە لەگەڵی سەرلەنوێ چوونە خوارەوە و هەتا بەرانبەر ماڵەکەی "عبدالله شانەدەری"یان بردبوو، کە ئەوان گەیشتنەوە سەر کانیەکە ئاگرێکی خۆشمان کردبووەوە و نانی ئێوارەمان لەوێ خوارد. بەڵام بەفری لێدەهات و پاشان ملی ڕێچکەی ڕێگامان گرت. لەسەر شاخەکەوە من پێش کەوتم کە لە هەمووان شارەزاتر بووم، بۆئەوەی بە ڕووی ئەودیوی برادۆست و بەسەر جادەی مێرگەسۆردا بۆگوندی خەردن شۆڕببینەوە . هەر زوو بەفرەکە هەراسانی کردین، لە زۆر شوێن هەتا سەرەوەی پشتێنمان دەکەوتینە ناو بەفر، من لە شوێنێکی زۆر قووڵ کەوتمە چاڵە بەفرێکەوە و بە پشدێن دەریان هێنام و چەند جارێکی دیکە بەرۆیشتنەوە لەناو بەفرەکە ڕنووم دەهێنا، بەڵام هەر کۆڵمان نەدا و

لەگەڵ نیوەی شەو گەیشتینە سەر جادەی مێرگەسۆر و لەسەر جادەکە کە رەشایی پتک پتک دیاربوو، زۆر بەوریایی پەڕینەوە، بەڵام دیسانەوە رەبایەکی سوپا و جاش درکیان پێکردین و لە دەمی پەڕینەوە لە هەموو لایەکەوە گوللەبارانیان کردین و لە زۆر شوێنەوە، گوللەکان بە جادەکە دەکەوتن و هەڵدەبەزینەوە، کەچی هەموومان لە پەڕینەوەکە بێمزەرەت بووین، کە خێرا گەیشتینە ئەو دۆڵەی پێش گوندەکە و دانیشتین. یەکێک لە هاوڕێیان جگەرەیەکی پێکرد کە لەبەرانبەر من لەسەر بەردێک دانیشتبوو، گوتی ئەوە بریندار بووی و قسە ناکەی؟ گوتم، بۆ چی بووە! گوتی تەماشای پێڵاوەکەی پێی چەپەت بکە! سەیرم کرد خوێن گەیشتۆتە سەر پێڵاوەکەم. هەر هۆیێکم لە خۆم زانی، چونکە تا ئەو تاوە هەستم بە هیچ نەکردبوو، هەر لەگەڵ قسەی ئەو هاوڕێیە، ژانی کەپرەی چۆکم وەک نارنجۆک بەگیانمدا تەقییەوە و بەیەکجار کاسی کردم و بە هەر شێوەیەک بوو، شەلوارەکەیان بۆ هەڵکردم هەتا سەرچۆکان، سەیرمان کرد تیشە بەردێکی هێجگار تیژ، وەک نوکە تیر چووەتە ناوەندی کەپکەی چۆکم.

یەکێک لەو هاوڕێیانە دەستی بۆ برد و دەریهێنا، بەڵام من لە حەژمەتی ئازاری چۆکم و فرکەکردنی زیاتری خوێن شۆک ببوم. بە جەمەدانییەکەی سەرم، بۆیان بەستمەوە و هەندێ جار لەکۆڵیان دەکردم و هەندێ جاری دیکە بە دووان دەهاتنە بن هەنگڵم و بەدوای خۆیاندا ڕایاندەکێشام، سەعات درەنگی نیوە شەو گەشتینە ماڵی مام غەزالی و لەوێ پاڵیان خستم. یادی بەخێر مام غەزالی وەک دکتۆرێکی شارەزا سەرەتا بۆی پاککردمەوە و دواتر بۆی چەور کردم، بەڵام ژانەکەی ئەوە نەبوو خۆی لەبەر بگیرێ، بە هەموو تاقەتم ددانەکانم لەیەکتری جیڕ دەکردەوە تاکو هاوار نەکەم! پاشان دیاربوو نوێرمە بە هەویر و هێلکە و پیوازی گەرمی بۆ لەسەر دانابووم و خەوم لێکەوتبوو، بەیانی سەعات ٥ بوو راستیان کردمەوە و لە گوندەکە وڵاخێکیان بۆ بە کرێ گرتم و هەتا سەر ئاوەکەی گوندی حەیات، چونکە لەبەر هێزەکانی ڕژێم مانەوە لەو گوندە بڤەبوو. بۆ رۆژی دواتر گەیشتینە حەیات و لە بنکەکەی سالح کۆلەکی نانمان خوارد و بۆ ئێوارە چووینە گوندی شابان و شەو لەوێ ماینەوە.

بەیانی بە گوندی "بەنی"دا هاتینە ئارموش و چەند ڕۆژێک لای برادەرانی حشع ماینەوە و ئیسراحەتێکی باشمان کرد. ڕۆژێک کە هەتاو بەدەرەوە بوو، بەرەو گوندی شێخان کەوتینە ڕێ، بەو نیازەی بۆ سەر لووتکەی کێلەشین سەرکەوین، کە ماشێن هەتا ئەوێ دەهات. دیسانەوە بەفر تێی کردەوە و چاو چاوی نەدەدیت، ناچار لامان دایە بارەگای حیزبی شەعب و دوو ڕۆژ ماینەوە.

ساڵی ١٩٨٧ بوو لە سنوورەوە بەرەو خواکورک بە پێ کوتامان، بەڵام شارەزا بووین، چونکە ڕۆیشتنی ناو بەفر، بەبێ شارەزایی موغامەرەیەکە بۆ خۆی و مرۆڤ دەبێ بۆ هەموو کارەساتێک ئامادە بێت. من خۆم تەواو شپرزە ببووم، بەتایبەتی لاقی چەپەم پەکی کەوتبوو، بەناچاری بەدوای خۆم ڕامدەکێشا. هەرچەندە شەومان بەسەردا هاتبوو، سەعات نزیکی ٩ی شەو بە هەر شێوەیەک بوو گەیشتینە بارەگای لیژنەی ناوچەی باڵەکی پارتی لە گوندی "خرینە"ی سەر سنوور و پێشمەرگەکان دەستوبرد زۆپایان بۆ چاکتر ئاگردابن و خۆمان گەرم کردەوە و کەوتینە سەر نان و پەنیرخواردن. بە هۆی بەفر و بارانی بەردەوام لەوێ گیرمان خوارد و بۆ ڕۆژی چوارەم، بەیانیەکەی سەعات ٥ بەبێ ڕاوەستان، بە نزیکەی ٩ سەعات گەیشتینە گوندی خاسۆک لە دۆڵی خواکورک. ڕێگاکان هەمووی بەفر بەستبووی، زۆر ناخۆشیمان دیت، بەتایبەتی مام هێدی لە شوێنێک خلیسکی برد و هەتا خوار چەمەکە خۆی بۆ نەگیراوە و هەموو پێستی پشتی داماڵابوو. چارمان نەبوو دەبوو ئەو بناری سیاکێوە ببڕین کە بەڕاستی ملنانێکی قیروسیا بوو! لە گوندی خاسۆکەوە بە دوو سەعات هاتینە گوندی شیخان و باران بە چاکی تەڕی کردین کە پێمان لە بەفر خۆشتر بوو. سێ ڕۆژیش لەوێ ماینەوە و بۆ ڕۆژی چوارەم ئێمە ڕێمان گرتەوە و بەفر وردە وردە لێی دەهاتە خوارەوە، دونیای سپی کردبوو و هاتینە ماڵی شێخ زادەکانی پشت (هۆر عبدالله) و لەوێ نانی بەیانیمان گۆشتاو خواردن بوو. بۆ نیوەڕۆ چووینە هەواری ئارموش و ئێوارە لە لای برادەرانی حشع ماینەوە، بەڵام چ مانەوەیەک کە بۆ زیاتر لە دە ڕۆژان بە هۆی بەفربارینەوە گیرمان خوارد. ڕۆژانێکی هێجگار ناخۆش بوو، هەمیشە خۆمان دەخواردەوە، تەنیا لە ژوورەوە دانیشتن و خواردنی سێ ژەمە بوو، کتێب ئەوەندە نەبوو بیخوێنمەوە. حەراسات و کارکردن زۆر نەبوو، هەموومانی پێوە خەریک بێت. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ بەفری زۆرتری لێدەهات، وای لێهاتبوو بەفرم خۆشنەوێ، کە هەتا هەنووکەش بۆ بەفر بە پەرۆش نیم. سەرباری بەفرەکەش ناو ناوە گوللە تۆپێکی ڕژێم کە لە دۆڵی لۆلانەوە دەهاوێژرا، بە دەوروبەری بنکەکە دەکەوت و دار و بەردی بەفری هەڵدەتەکاند!

بۆ ٢٧ی یەک، دانی بەیانی هاتینە میسرۆک و چاومان بە برادەران "ابو سلیم و ابو حیکمت و ئەبو تارا و د.عبدالرحیم عجینە" کەوت، زۆر بە دڵخۆشی پێشوازییان لێ کردین و نانی نیوەڕۆمان بەیەکەوە خوارد و دانی ئێوارە چووینە گوندی "ئارموشی سەرێ" و لەوێ لەگەڵ مەفرەزەیەکی قاتعی هەولێری حشع یەکترمان گرت، کە "ابوسلام/ نجم الدین مامۆ" لەگەڵیان بوو، دیاربوو پۆستە و پارەی بۆ ناوچەی بادینان و هەولێر دەبرد و شەو لە لای ئەوان ماینەوە، هەتا بەیانی لەگەڵ مەفرەزەیەکی دیکەی قاتعی بادینانی حشع بۆ

خوارەوە بەرێ بکەوین. وا بریار بوو هەتا دەوروبەری پشتی چیای شیرین، ناوچەی ڕێکانیان بەیەکەوە بین، دوایی ئەوان بەرەو بادینان بڕۆن و ئێمەش بەسەر "شیرین"دا سەرکەوینە دیوی لای بارزان. ئەوانەی "حشع"ی قاتعی هەولێریش نەیاندەتوانی بە "بارزان"دا بڕۆن و لێیان یاساغ کرابوو، چەندی پێمان گوتن وەرن لەگەڵ ئێمە بن بەناوی "ئاڵای شۆڕش"، بەڵام لە خۆیان ڕانەدیت.

ئێمە مەفرەزەیەکی برادەرانی "حزبی شەعب"یشمان لەگەڵ بوو، کە بەراستی برادەرانی حشع پێیان خۆش نەبوو، لەبەر ڕاگرتنی خاتری خاتران و ناحەقیشیان نەبوو، بەڵام ئێمە گوێمان بە هیچ نەدەدا و تەنیا ئامۆژگاریمان کردبوون کە هەتا دەگەینە دەوروبەری بنکەکانی کۆلەکان لە بناری چیای کۆریس، خۆیان ئاشکرا نەکەن و بڵێن ئێمە "ئاڵای شۆڕش"ین. بەیانییەکەی لەگەڵ برادەران بەرەو ناو سنووری کوردستانی باکوور هەنگاومان هەڵگرت. لە نزیک ئەو ڕێگایەی دەچوەوە لای ماڵەکەی عادل بەگ بە لای سنووری کوردستانی خواروو، ئێمە لامان باش نەبوو بەو شەوە بەناو سنووری کوردستانی باکووردا بڕۆین! بەڵام برادەرانی حشع بەتایبەتی قاتعی بادینان کە نزیکەی ٥ ولاغێک باریان پێبوو، لەسەر ئەوە سوور بوون کە بەو ڕێگایەدا بڕۆن. ئەوە بوو ئەوانەی قاتعی هەولێری "حشع"یش لەگەڵ ئێمە هاتن، چونکە ئەوانەی بادینان هەموو عەرەب بوون، کەچی پێشمەرگەکانی هەولێر کە هەموو کورد بوون کەوتنە لای ئێمە و گوتیان ئێمەش لەگەڵ برادەرانی ئاڵای شۆڕش دەڕۆین کە ڕێگاکە نزیکترە، تەنیا "ابو سلام"ی مەسئولیان پێی خۆش بوو لەگەڵ برادەرانی بادینان بڕۆن، کەچی ئەویش چاری ناچار بوو و هات بەگەر ئێمە کەوت.

لەناو مەفرەزەکەی هەولێری حشع، دوو کوڕی مام عەلی حاجی تایەر هەبوون، حازم و ناوی ئەوەکەی دیکەم لەبیر نەماوە و پێشتر یەکترمان دەناسی و یەکەمجاربوو بەو ڕێگایەدا دەهاتن و زۆرتر بڕوایان بە ئێمە هەبوو، بڕوابوونەکەشیان بە چاکی بۆیان گەڕایەوە. شەو ئێمە هەتا سەعات ٢ی شەو بە لای سنوور پەڕینەوە و لەوێ ڕێچکەی هەواری حەسانەوەمان گرت و بەرانبەر ڕەبایەکانی حکومەتی عیراق لە ناوچەی شیروانمەزن، گوێمان لە دەسترێژ و تەقەی زۆر بوو، دوایی بۆ ڕۆژەکەی بیستمانەوە کە ئەو برادەرانەی "حشع"ی بادینان کەوتونەتە کەمینی قەرەقولی تورکیا و هەموو بارەکانیان و پێشمەرگەیەکیشیان بە برینداری گیراون. زۆر نیگەران بووین، ئەوانەی حشع ئیتر کەوتنە سەر "ابو سلام" کە باش بوو لەگەڵ ئێمە هاتن، دەنا "ابو سلام" بەم شەلە شەلە، چۆن دەربازی دەبوو! هەتا هاتینە پشتی چیای شیرین بەیەکەوە بووین، ئێوارەکەی لە

یەکتر جیا بووینە و ئەوان بەرەو قاتعی بادینان ڕۆیشتن و ئێمەش بە "شیرین"دا سەرکەوتین.

بۆ شەوەکەی هاتینە گوندێک هەمووی بارزانی و هەر ٦ ماڵ بوون، بۆ نانخواردن دابەش بووین. لەسەر نان بووم لە پڕ هاوڕێیەکی خۆمان بەپەلە هاتە لای ئێمە، گوتی زووکە خەریکە ئەو برادەرەی شەعب چەک دەکەن! بلەز بۆ لایان چووم، یەکێک لە پێشمەرگەکانی شەعب گوتبووی ئێمە مەفرەزەی "حیزبی گەل"ین و کابرای بارزانیش لێی هاتبووە دەست و لە ماڵەکەی خۆی چەکی کردبوو. بە هەزار تکا هەتا وەرمان گرتۆتەوە و دڵنیامان کردوون کە ئێمە "ئاڵای شۆڕش"ین و ئەو میوانی ئێمەیە و دەگەڕێتەوە ناوچەکانی هەولێر، بەڵام خەڵکی گوندەکە دەریان کردین و نانیان پێمان نەدا. ناچار بە سکی برسی ڕێمان گرت. هێشتا زۆر دوور نەکەوتبووینەوە، دیتمان ژنێک بەدوامانەوەیە، سەیرمان کرد یەک پاشۆڵ نان و پیاز و توری بۆ هێناین و ڕێنمایی کردین کە پاش سەعاتێکی دیکە، کەلاوەی گوندێک هەیە و شەومان لەوێ بەدیار ئاگر کردنەوە و بەیانی بە شیرین ئاودیوی ئەو دیو بووین.

زستانی ساڵی ١٩٨٦ بۆ، دوو مانگ زیاتر لەژێر ڕەحمی سەرمای کوشندەی ژێر جەمەلۆنەکانی زێوە مابوومەوە، کە یەکەمجارم بوو لە ژیانم ئەو جۆرە سەرمایە ببینم، کە لەسەرمان هێلکە لە ژوورەوە ببەستێ و بەشێکی زۆری هاوڕێیان هەتا دەمەدەمی نیوەڕۆ لەژێر بەتانییەکانیان نەدەهاتنە دەرەوە، چونکە نەفتمان نەبوو، تاکو سۆبە پێبکەین. پێوەندییەکانی نێوان برادەران، بەس لە پێوەندی ڕێکخستنی هاوڕێیانە نەدەچوو! هەر کۆمەڵە برادەرێک، وەک گروپێکی سەربەخۆ سەریان بەیەکەوە نابوو. سالار سوریا و دەرەوەی لێخۆش هاتبوو، هەر ڕۆژەی بەبیانوێکەوە خۆی دوادەخست، بەتایبەت بەناوی کۆمەکی دارایی پەیداکردن لە سوریا مۆلی خواردبوەوە و ئەو زەمانەش سواڵکردنی مشەی حیزبە کوردییەکانی ڕەوتی خەباتی چەکداری لە بەرعەرشی لیبییەکان مۆدە و لوقمەیەکی مفت بوو. لەوسەروبەندە سالار، خەلیل دهۆکی، کە نوێنەری ئاڵای شۆڕش بوو لە سوریا بۆ سەردانمان لە زێوە ناردبووەوە. خەلیل بەم زستانە توشە هاتە زێوە و چەند ڕۆژێک لە لامان مایەوە و زۆر بەنیگەرانی و دڵتەنگی بۆ بارودۆخی ڕێکخراوەکەمان گەڕایەوە. من بەدوای دەیان ساڵ کە ئەو یادەوەرییانە دەگێڕمەوە، ئێستاکەش بۆ قوربانی کەموێنەی بەدەیان سەربازی گومی ئەو ئەزموونە سەربەگوبەندە، کزەم لە جەرگەوە دێت، کە ژمارەیەکیان لەم پێناوەدا شەهیدبوون و گیانی خۆیان کردە سووتەمەنیی بەردەوامی ئەودەمی ئاڵای شۆڕش. دەبێ ئەوەش باس بکەم، سەبارەت بە خۆمەوە، هەتا ئاوم لەدوو بێرێ هاتووە، بەتایبەت لە ڕووی تەندروستییەوە درێخیم لە بەردەوامبوون نەکردووە،

بەبێ ئەوەی ڕۆژێک لە ڕۆژان وەک سەرکردە و ئەو پلەیە بەرخوردم کردبێت. مەلا بەختیار بەژیان ماوە، کە لە کۆبوونەوەی فراوانی سێوسێنان بۆ جاڕدانی ئاڵای شۆڕش، بەوە ئاگاداری کردوومەتەوە کە بەبێ بەشداریکردنی خۆم، بەندەشیان لەپاڵ "مەلا بەختیار، پشکۆ، شێخ عەلی، م.محسن" بە ئەندامی ئەڵقەی ناوەندیی بەڕێوەبردنی ئاڵای شۆڕش داناوە. لە وەڵامی ئەو نامەیەی مەلا بەختیاردا، بۆم نووسیبوو کە من لە ڕووی خراپی تەندروستی و ئاستی ئایدیۆلۆژییەوە، خۆم بە شایستەی ئەندامی سەرکردایەتی ڕێکخستنی مارکسی- لینینی نابینم و تەنیا وەک هاوڕێ و کادرێکی ئەو ڕێکخستنە بەڵێنی کارکردن دەدەم. بەڵام ئەوەبوو ئەڵقەی ناوەندی، بە نهێنی شێخ عەلی ناردە لامان لە هەولێر و قەناعەتیان پێ کردم بە شێوەیەکی کاتی و هەتا دەمی بەستنی کۆنفرانسی گشتی ئەو ئەرکە لە ناوچەکانی هەولێر لە ئەستۆ بگرم. بەبێ ئەوەی ئەوەیان لێ بشارمەوە، کەمن هەر کاتێک فرسەتی چوونەدەرەوەی وڵاتم بۆ هەڵکەوێ، بەدوای چارەسەرکردنی خۆم دەکەوم. بەڵام چی لەگەڵ کوردەخێرەتی و شەرمی ڕووان و دڵسۆزی و وەفاداری دەیان هاوڕێی دەوروبەرم دەکەم، کە بۆم نەکرا هەتا دەمەدەمی ناچاربوونی یەکجارەکیم، بەجێیان بهێڵم و ئەو ڕۆژەش لەو کۆبوونەوە فراوانەی "خواکورک"دا، لە بەردەمی ئامادەبوواندا و بۆ هۆکاری باری خراپی تەندروستیم، بەتەواوی ئارەزووی خۆم، دەستم لە هەر جۆرە مەسئولیەتێکی ئاڵای شۆڕش کێشاوەتەوە. کە لەئەنجامدا هەر وڵاتی سوید و لاوچاکی و چاوتێری نەتەوەی سویدی بووە فریادرەسم و لە ساڵی ١٩٨٩ ـەوە کە بە پەککەوتەیی گەیشتوومەتە ئەو وڵاتە، هەموو چارەسەرییەکی پزیشکی گەورە و بچووکیان بۆ کردوم و لەبری کورد و وڵاتەکەی خۆم لە مەرگی بەردەستی سەقەتبوون ڕزگاریان کردوم و هەتا ئێستاش لە سایەی کاری میهرەبانی مرۆڤانەی ئەوانەوە دەژیم و هەناسە وەردەگرم.

لە دوا سەفەرمدا بۆ ناوچەکانی هەولێر، ئەم هاوڕێیانەم لەگەڵ بوو: مام هێدی، فەرهەنگ، دارا، فوئاد، جەعفەر، حمە ڕەشید، مامۆستا فەرهاد کاوانی، عبداللە شیخانی. پێش کۆتایی ساڵی ١٩٨٧، سەرەتا بە کوێستانەکانی سێ گۆشەدا بە پشتی درێ و زێوە ڕوومان لە وڵاتی خۆمان کرد. لەو سەفەرەدا هەر لە زێوەوە دوو برادەری "حشع"مان لەگەڵ بوو، بایەکی هێجگار ساردی دەهات. ڕێگا بەردەوام لەناو بەفر بوو، ڕاستە ڕێگا شکابوو و پیادە و وڵاغی پێدا چووبوو، هەتا گەیشتینە سەر دۆڵی خواکورک، پێیەکمان لەناو قوڕ و چڵپاو بوو ئەوەی ترمان لەناو بەفر بوو، بەفرەکەش بۆخۆی ڕوو لە توانەوە و نەمان بوو. نزیکەی سەعات ٢ی پاش نیوەڕۆ گەیشتینە دیوی ئەودیو، من چەند جارێک بەربوومەوە و لە کەناری جۆگەلەی ئاوی بەفرەکە جلە قوراوییەکانی خۆم پاککردەوە و

دوای هەندێ حەسانەوە بەرەو بنکەی شێخان هەنگاومان هەڵگرت، کە تازە بە پشتیوانی حشع بۆ برادەرانی "ئاڵای شۆڕش"مان کردبووەوە، کەچی ئەوانەی لەوێ کۆ ببوونەوە، هەموو لەو برادەرە توندڕەوانە بوون کە سەری زمانی و بنی زمانیان لە عەلەیی حشع بوو. پەرەگرافی چیراوکەی کۆمەڵەی ئیرانیان دەگوتەوە. بەراستی برادەرانی "حشع"یان پەست کردبوو. بە نانی خۆیان کێشەیان بۆ خۆیان دروست کردبوو. من هەموو جارێ بەو برادەرە توندڕەوانەم دەگوت؛ ئەگەر ئەنگۆ ئەوەندە دەمتان تەڕە، بۆ رازین نانی حشع و ئەوانەی دیکە دەخۆن! بەراستی من ئەو کات تێگەیشتم، کە رۆڵەکانی نەتەوەکەم، بەتایبەت تێکۆشەرەکانی، هەر وەک ئەو قسە کۆنەی ئەمین عامی رۆشنبیریی دەزگای حوکمی زاتی هەولێر، (عبدالغفار السائغ) روو لە چەند نووسەرێکی بێ بار گوتبووی، پێم سەیرە نووسەرە کوردەکان پێیان خۆشە ئەمن بن و راپۆرت لەسەر هاووڵاتی خۆیان بنووسن و برادەرەکانیان چوغل بکەن، کەچی بۆ بوونەبەعسی سەرگرانن! لێرەش تێکۆشەرەکان نانی "حشع و پارتی و ئیران"یان وەک گەزۆ دەخوارد، کەچی بانگەشەیان بۆ توندڕەوی و دوامۆدیلی مارکسیزم دەکرد. لەو کاتەدا ئەوەم لە لا ساغ ببووەوە، کە لەناو کورداندا، نوشتانەوە بۆ نان و پارە و گیرفان، هەتا سەرپێلاو ئاساییە، کەچی بۆ خۆهەڵکێشان و موزایەدەکردن بای سمێڵانی دێتێ!

ڕۆژی ١١/٢٧ دانی بەیانییەکەی بەرەو میسرۆک بەرێکەوتین، لەوێ خۆم لەگەڵ فەرهاد کاوانی، چاومان بە مەکتەبی سیاسیی حشع کەوت و زۆربەی ئەو شتانەیان بە چاومان دادایەوە کە بەڕاستی زۆر پێی بێتاقەت بووم و هەر لەوێوە بڕیاری خۆم دا کە من دەبێ هەر وڵات بە جێ بهێڵم و چیتر گوێ بە هەندێ دڵسافی و کاڵفامی و درێژە بەو کاروانە بێهودەیە نەدەم و دوای چارەسەری برینەکانی سەرم و پشت و ئەژنۆم بکەوم. چونکە ئەمانە ئەوەندە ناهێنن کە پیاو دەرزەیان بۆ بکات و ئەوەندە بێئەمەک و بێڕوو بن. بەڵام دەبوو سەفەرەکەم بکەم و هەم لە هاوڕێیان و هەم لە کەس و کارماڵئاوایی بکەم.

لەڕۆژی دواتر کاروانەکەمان، کە بە هاوبەشیی برادەرانی حشع بوو. ئەوان وڵاغیان پێبوو، هەموو بارەکانیان بارکرد، لەو ناوە کادرێکی حشع بەناوی مەحەمەد، کە گوایە کۆمۆنیستە، وڵاغێکی بۆ خۆی پێبوو کە لە ڕەوەی وڵاغە بەڕەڵاکانی گرتبووەوە، ئامادە نەبوو هەتا هیچ کۆڵەپشتەکانی ئێمە و برادەرەکانی خۆیشی لێ بار بکرێت! لە گوندی ئارموش سەرکەوتین و بە "گەلی ڕەش"دا هاتینە خوارەوە، گەلییەکی بەرفراوان و داپۆشراو بە سەوزەگیای بەر دەیان جۆگەلە بەفراوی ئەو لووتکە شاخانەی ئەم بەر و ئەو بەری، کە لە هەموو لایەوە لە جۆم و کەندەران و دۆڵەکانی، چەندان رووباری بەخوڕیان سازدا بوو، تازە خەریک بوو شوانکارەکان تاق و لۆقیان پەیدا ببوون، خەریکی هەواردانان

و چیخ و ڕەشماڵ قایمکردن بوون، سەیرەکە لێرەدا ئەوە بوو هەر ژنەکان هەموو ئەو کارانەیان ئەنجام دەدا، پیاوەکانیش بەزۆری سمێلیان بادەدا و لەبەر ئاگردان خەریکی چای خواردنەوە بوون. نانی نیوەڕۆمان لە دەم جۆگەلەئاوێکی سازگار خوارد، کە لە چەمی دۆڵی گۆستێ نزیک بوو. لە سەرەتای بەڕێکەوتنمان، ئێمەی ئاڵای شۆڕش و چەند پێشمەرگەیەکی حشع بەپێش کەوتین، ئەوانەی لە دوامانەوە بوون کە یەک کاروان وڵاغی بەباریان پێبوو، ڕێگایەکی چەوتی ڕوەو دەشتی بەرازگریان گرتبوو، دوای هاتنەوە هۆش خۆیان، گەڕابوونەوە و ئەوجا ڕێگای ئێمەیان گرتبوو، کە پاش نزیکەی دوو سەعات بە ئێمە گەیشتنەوە و بۆ شەوەکەی بەناو خاکی کوردستانی باکووردا ڕۆیشتین و لەسەر یەکێک لە ڕووبارەکان، هەواری حەسانەوەمان گرت. ئەو بەر و ئەمبەری ڕووبارەکە هەمووی دارستان بوو، لە هەموو لایەکەوە خۆمان قایم کرد، نەوەک هێزەکانی ڕژێمی تورکی شەڕمان پێ بفرۆشن. بەیانی سەعات ٤ خۆمان کۆ کردەوە بۆ پەڕینەوە لە ڕووبارەکە. لەناو برادەرانی حشع یەکێکی کەڕ هەبوو، کە خەڵکی ڕەواندوز بوو، بیروباوەڕێکی پۆلاینی بە حشع هەبوو، لە بارەگاکانی مەکتەبی سیاسی نانەوا بوو. لەگەڵ یەکێکی تریان وەک پەلیک بە ڕووت و قووتی بە مەلە سەری گوریسێکی درێژیان برد و بەو بەرەوە لە قەدی دارێکیان بەست و ئێمە یەک یەکە خۆمان هەڵکرد و هەتا پشتێن ئاوەکە دەهات، دەستێکمان بە جلوبەرگمان لەسەر مل و سەرمان بوو و بە دەستەکەی دیکەشەوە حەبلەکەمان گرتبوو، پەڕینەوە.

دواتر هاتینە ناوچەی مام ڕەش و پیرۆخ، کە سنووری دەستکردی نێوان کوردستان بوو. بۆ شەوەکەی بە درەنگی گەیشتینە گوندی زێتێ. لە پێش گوندەکە لەسەر ترۆپێکی شاخەکەوە یەک دەریاچەی بچووک هەبوو کە خەریک بوو بەستەڵەکی بەفر دەتوایەوە، نانی نیوەڕۆمان لێ خوارد و ئەو دەریاچە و قەدپاڵە شاخەکان یەک دیمەنی زۆر دڵگیریان دروست کردبوو.

گوندی زێتێ بەشێکی کەوتبووە کوردستانی باکوور و بەشێکی کەوتبووە کوردستانی باشور، تەنیا یەک پەرژینە بەرد نێوانیان بوو، ئێمە ڕێگەکەمان گۆڕی و هاتینە بەردەم چەند خانووێک، کە بەپێوە مابوو لەبەری لای خۆمان بەبێ ئەوەی پێی بزانین، دیار بوو بنکەیەکی برادەرانی پارتی بوو و بە نهێنی لەوێ دەژیان. هەڵسوکەوتیان زۆر ناجۆر بوو، ئەوەندە بێمنەت بوون، نەوەک جێگایان نەکردینەوە، بەڵکو ئامادە نەبوون ڕێگاشمان پێ نیشان بدەن، ناچار ملی ڕێچکەیەکمان گرت و بۆ شەوەکەی لە پەنا گاشەبەردان لەسەر لووتکەی دۆڵێکی هەزار بەهەزار هەوارمان گرت.

بەیانییەکەی ۱۱/۳۰ بەرەو گوندی پێندرۆ بەڕێکەوتین و پاش سەعات ۲ی پاش نیوەڕۆ گەیشتینە سەر کانییەک و هەندێ حەساینەوە. چەند نەفەرێکمان دیت و پێیان گوتین، لەو گەرووەی ئەودیو، هەندێ دووکان و لۆقلّتە هەن، کە بە ڕۆژ دەکرێنەوە و هەواری حەسانەوە و پێدا تێپەڕینی قاچاخچیەکانە. هەموومان بەو پەڕی دڵخۆشی، کە هەندێکمان پێلاوەکانی پێمان ونجڕ ونجڕ ببوو، هەر ئەوەتە بە پێخاوسی نەدەڕۆیشتین! پاش سەعاتێک لەوێ نیشتینەوە و خەریکی دەرودەرگا داخستن بوون، کە خۆشیان لەوێ دەخەوتن و هەموشیان چەکدار بوون. دوای دیتنی ئێمە دەرگاکانیان کردەوە و زۆربەمان لەوێ پێلاومان کڕی و خۆراکی ئەم ژەمەمان لەوێ خوارد، کە هەر یەکە پارەی خۆیدا، بەلام ئێمەی ئالای شۆڕش پارەی هەمووان بەیەکەوە درا. بەرەبەری شەو بوو گەیشتینە گوندی سیلتان لە پەنای پشتەوەی چیای شیرین. شەو لەوێ ماینەوە و خەڵکێکی هێجگار چاوتێر و جوامێری هەبوو، زۆریان خزمەت کردین، تا بەیانی ئیسراحەتێکی زۆر چاکمان کرد.

بەیانییەکەی تا نیوەڕۆ گەڕاین تا ئەو ڕێچکەیەمان دۆزییەوە، کە بەسەر شیرین دەکەوت. هەر ئەوەتە دیار بوو، چونکە هاتوچۆی زۆر کەمی بەسەرەوە مابوو، بۆیە بەرەو کوێربوونەوە دەچوو. لەوێ لەگەڵ برادەرانی حشع ماڵئاواییمان لەیەکتر کرد، هەندێ ڕۆیشتین و لە سەر کانییەک هەوارمان خست. ئەو نانەی، کە لەو گوندە وەرمان گرتبوو، خواردمان و زۆربەمانی تێر نەکرد، ناچار بەدەم گیا و گوڵ پەیداکردنەوە کەوتینە گەڕان و سوڕان. لەوناوە گیایەکی وەک قوڕادەی لای دەشتی هەولێری لێبوو، سەرەتا بەخۆم تامم کرد و پێم خۆش بوو، هەر یەکە و چەندان دەسکمان کرد و کەوتینە خواردنی. لەو دەمەدا فەرهەنگ/خولە، گوتی: ئای لەو ڕۆژەی تەنیا بە عانەیەک چەندان دەسکە کەوەر و تەڕەپیازمان دەکڕی! ئیتر لێمان کرد بە هەراو لەسەر خۆی بووە ماڵ کە ئەو پێشتر دەیگوت موالیدی ٦٢یە و کەچی ئێستا باسی عانە دەکات! زۆر بە چاکی بەسەر شاخەکە کەوتین و بۆ ئێوارەکەی بەسەر ماڵەکانی ئێرە و ئەوێی "بارزان"دا هاتینە خوارەوە و هەر یەکەمان لە لای ماڵێک، نانێکی ڕەقەی وەرگرت و شەو درەنگان گەیشتینەوە بنکەی شەهید مەناف.

لە تەمووزی ساڵی ۱۹۸۷دا، لەگەڵ هێژایان "بەکر خۆشناو، هیوا و دارا" و هەندێ لە برادەرانی پارتی، بە برادۆستدا دووبارە بەرەو دۆڵی خواکوڕک بەڕێکەوتین. لەو سەفەرە ژوانم لەگەڵ "نەجیبە"ی هاوسەرم و "ڕێگا"ی کچم دانابوو، کە ئەوان بۆ ئەو ڕۆژە بگەنە گوندی خەردن و ماڵی مام غەزالی. شەو کە گەیشتینە ئەو ماڵە، ئەوان هاتبوونە ئەوێ. ئێمە لەم سەفەرەدا ئەسپێکمان هەبوو، بەیانییەکەی ئەوانەی پارتی پێش ئێمە دەرچووبوون. نەجیبە و ڕێگامان سوار کرد، ملی ڕێگامان گرت و بە بناری چیای

"پیران"دا هەنگاومان هەڵگرت. مەترسیی کەمینی هێزەکانی ڕژێم هەبوو، بەڵام بە سەلامەتی و بەڕێچکۆکەی پەناوپێچ گەیشتینە سەر زاری خواکورک و سە رئاوەکە پردێکی بە داری لێ دروست کرا بوو، بەرەو گەلی گۆستی پەڕینەوە و ڕوومان لە "گەلی ڕەش" کرد. لەو هەوارەدا یەک زنجیرە ڕەشماڵی ڕەوەندان هەڵدرابوو، لە هەر لایەکەوە چەندان مێگەلە مەڕ ڕێچکەیان بەستبوو، لەو پاوانە سەوز و تەڕە دەلەوەڕان، کە هەر لە دەسرازەی پێچانەوەی لانکێکی قەدپالانی دەکرد. ژنە ڕەوەندەکان خەریکی هۆزەبانە و چیخبەستن بوون، منداڵە وردەکان بەدەم بەرخ و کاریلە لەوەڕاندن بۆ خۆیان گەمانیشیان دەکرد، سەگەکان کلکیان قیت کردبووەوە و بەگومانەوە تەماشای ئێمەیان دەکرد. دیمەنی ئەو ناوە دڵ و دەروونی مرۆڤی دەبوژاندەوە. جۆگەلە ئاوە سازگارەکانی بەر ڕێچکەی توانەوەی بەفر بە هەموو قەدپاڵێکەوە دەسرازەیان بەستبوو، دەتگوت بە خوریی سپی تەونی بەرهەمێکی نوێی کوردەواری دەهۆننەوە. لە چەند ڕەشماڵێک تێپەڕین و گەیشتینە بەردەم ڕشماڵێکی دیکەوە، کە لە کەناری ڕێگەکەوە هەڵیاندابوو، دوای سڵاوکردن فەرموویان لێ کردین، بەڵام بەکر خۆشناو و "نەجیبەخان"ی هاوسەرم مەیلی لادانیان نەبوو، کۆمەڵە ژنێک لە دەوری ئاگردانێکەوە خەریکی نانکردن بوون، من لەدواوە دەڕۆیشتم و ژنەکان بانگیان کردم بۆ خواردنی نانێکی گەرم لەگەڵ دۆ. ئەوان هەڵوەستەیان نەکرد، تەنیا خۆم لامدا و بەخێرهاتنێکی گەرمیان کردم، ژنەکان و چەند کچێکی شۆخ و شەنگ لەبەرم هەستانەوە و ڕایەخیان بۆ دانام و گوتیان ئەو ژنە چی تۆیە؟ گوتم هاوسەرمە، لەوێوە هاوارم بۆیان کرد و گوتم ئەگەر نەوەستن ئەوە بۆ خۆم لێرە دەمێنمەوە و ژنێکم دەدەنێ! یەکێک لە ژنەکان کە تادەستت پڕ بکات باڵا بەرز بوو لێم هاتە پێش و گوتی، من ئەو پیاوە ڕەدوو خۆم دەخەم. "نەجیبە"یش هەر ئاوڕی نەدایەوە. ناچار دوای خواردنی نان و دۆ، بە دڵخۆشی ماڵئاواییم لێ کردن. بۆشەوەکەی گەیشتینە "ئارمووشی سەرێ" و لە لایەن "ئەبو تارا"وە جێگایەکی پاک و خاوێنیان بۆ دابین کردین و بەیانی بۆ ئێوارەکەی گەیشتینە "شێخان"، بنکەی برادەرانی خۆمان کە چەند پێشمەرگەیەکی لێبوو.

پاش حەسانەوە و سەرلەنوێ بەرەو شنۆ ڕۆیشتین. سەرەتا بە وڵاغ تاسەر لووتکە چووین و لەوێوە بە ماشێن گەیشتینە شنۆ، مەحەمەد سابر ژوورێکی لەگەڵ ماڵی پێشمەرگەیەکی پارتی بە کرێ گرتبوو، یەک دوو ڕۆژ لەوێمان بەسەر برد، دوایی بەیەکەوە چووینە زێوە لە لای هاوڕێیان و پاش دیدار و کۆبوونەوە، چوینە ورمێ لە ماڵی مەریوان، کە ژوورێکی لە خانەوادەیەکی ئەرمەنی گرتبوو، دوو سێ شەو ماینەوە و لەگەڵ برایان بەکر خۆشناو و مەریوان بە بوسی گەورە بەرەو تاران چووین.

ڕۆژانە لەگەڵ ئەو برادەرانە سەردانی باخچە و شوێنە خۆشەکانی "تاران"مان دەکرد و نزیکەی هەفتەیەک ماینەوە. لە سەردانی ئەمجارەی دکتۆر خاڵسی کە وەک ناسیاومان لێ هاتبوو، دوای هەندێ پاککردنەوەی گوێچکە بریندارەکەم، پێشنیازی ئەوەی کرد، سەفەری دەرەوە بکەم و ئامادەیی خۆیشی نیشاندا بۆ یارمەتی دانم و منیش بە سوپاسێکی زۆرەوە، باسی بارودۆخی خۆم بۆ کرد و[41] پاشان بە هەمان ڕێگا گەڕاینەوە. "ڕێگا"ی کچم تەمەنی ٢ ساڵێک دەبوو، زۆربەی کات دەبوایە من یان مەریوان لەسەر ملی خۆمانی دابنێین و تەنیا ناو ناوە دەستی بەکر خۆشناوی دەگرت و چەند ڕۆژێکی خۆشمان بەسەر برد. کە هاتینەوە ورمێ بە ڕێگای دۆڵی قاسملو گەڕاینەوە شنۆیە و بۆ ماوەی مانگێک هەوارمان لەوێ خست و هەموو ئێواران من و نەجیبە دەستی "ڕێگا"مان دەگرت و دەچووینە جادەی سەرەکی شنۆیە و دۆندرمەمان دەخوارد نەجیبە چارشێوی لەسەر دەنا و ڕێگای کچم زۆری پێ سەیر بوو، هەر بواری بوایە لەسەر جادەش لەسەری دایکی دەکردەوە، چەند جارێک "نەجیبە و ڕێگا"م بردە نەغەدە و سابلاغ، کە "ڕێگا" مهابادی زۆر پێ خۆش بوو. دوایی ئەوانم هێنایە خانێ و لە ڕێگای ماڵی مام سابیر کورەچی چووینە گوندی "باداوێ" و لە لای برادەرانی پارتی بووین، هەندێ برادەری یەکێتی هاتنە ئەوێ کە یەکێکیان "ڕێبین" بوو. وەکو نوێنەری "ی.ن.ک" مۆرەیان لە ئێمە دەکرد، بەڵام ئەوانەی پارتی زۆر پیاوانە لەگەڵمان جولانەوە و زیاتر ڕێزیان لێ گرتین، بۆ شانسی ئێمە شەوەکەی کاروانێک لەودیوی "قەندیل"ەوە گەیشتن کە چەند کەسێکیان خەڵکی گوندی وەرتێ بوون، ئەو گوندەی زیاتر لە ساڵێکی لێ بووم و دۆستایەتیم لەگەڵ خەڵکەکەی زۆر خۆش بوو، هەموو منیان ناسییەوە و زۆریان ڕێز لێ نام و ئامادەیی خۆیان نیشاندا بۆ هەموو کارێک کە هەمبێ و بۆمی بکەن. لە ناویان مام عەولا یەک هەبوو، کە بەراستی پیاوێکی جوامێر بوو، زۆر جاران نانمان لە ماڵی خواردبوو، جیام کردەوە و گوتم مام عەولا ئەو ژنە هاوسەرمە و ئەوەش کچمانە و دەمەوێ ڕەوانەی هەولێریان بکەمەوە و ئەگەر بۆت دەکرێ هیچ بار هەڵمەگرە و کرێی چەندە دەتدەمێ و ئەوان بەسەلامەتی بگەیێنەوە شارۆچکەی قەسرێ و هەر خۆشت هەتا هەولێر لەگەڵیان بچۆ. گوتی وەی بەسەر چاوانم و بەڵام نابێ باسی پارە بکەیت و عەیبە بۆ ئێمە کار بە پارە بۆ تۆ بکەین، چونکە دوایی خزمان چیمان پێدەڵێن! گوتم، برا زۆر سوپاس و بەزۆر

---

[41] کە گەیشتمە وڵاتی سویدیش لە ئەنجامی پشکنینی دکتۆرەکانی ئەو وڵاتە، کە بووە مایەی موعالەجەکردنێکی دڵخۆشکەرانە و ئومێدبەخشی داهاتووی ژیانم و ئەوەتە لەوساوە، هەتا هەنووکە لەسەر پێیانم و دەژیم. قسەکانی دکتۆر خاڵسی ڕاست بوون و ئەگەر بۆ ماوەیەکی تر دوابکەوتوومایە، فایرۆسی ئیلتیهاباتی گوێچکەم، مێشکمی دەگرتەوە.

سەد دینارم لە گیرفانی نا. ماڵی ئاوا بێت بەیانی چەندیان لەگەڵ کرد، گوتی من بارم ناوێ و خێزان و منداڵی ئەو خزمەم پێیە، دیاربوو ئەو برادەرانەی یەکێتی زۆریان پێ ناخۆش بوو، گوتیان ئێمە تۆمان بۆ بار هێناوە، گوتی کاکە ئەگەر دەڵێن پارەکەی ئەو سەریشتان دەدەمەوە، خۆ من دیلی ئێوە نیم و دونیا ڕێی پیاوەتی لێ نەگیراوە و هەر ئەوانە دەبەمەوە. ئەوەبوو بەیانییەکەی، نەجیبە و ڕێگای کچم لەگەڵ مام عەولا و کاروانەکە بەڕێکەوتن و بەسەلامەتی بردبوونیەوە هەولێر.

هاوینی ساڵی ١٩٨٧ بوو، باری ژیانی پێشمەرگەکانی ئاڵای شۆڕش لە زێوە زۆر خراپ بوو، بەتایبەتی لە ڕووی گوزەرانەوە. لەگەڵ مەکتەبی سیاسیی پارتی قسەمان کردبوو، ئەوەندە مەیلدار نەبوون یارمەتیمان بدەن. چەند جارەکیش لە لایەن مەکتەبی سیاسیی حیزبی شیوعی دەعوت کرابووین کە بچینە خواکوڕک بۆ هەندێ گفتوگۆ و یەکتردیتن. بەتایبەت پێش چەند مانگێک ئێمە بە چاوقایمیی خۆمان یەک سەیارە پڕ دەرمان و کەلوپەلی حشع، کە لە ورمێ گیریان خواردبوو و خاڵە حاجی (حسک) دەستی پێ دەکردن. ئێمە بە پسوولەی خۆمان و بە سەیارەکەی مەریوان، کە جێبێکی لاندرۆڤر بوو و کاری پێ دەکرد، بە چەند وەجبەیەک لە ڕێگای بەرتیلدان و پسولەی ئاڵای شۆڕش هەموومان بۆ گەیاندنە "شنۆ، زێوە و دزێ"، کە هیچ کەسێک ئامادە نەبوو ئەو جۆرە موغامەرەیە بکات، ئیتر دڵنیابووین کە حشع لەم بارودۆخە ناهەموارەی گوزەرانمان، بەدەنگمانەوە دێن. لەگەڵ مامۆستا سەلام عەبدولا لە ڕێگای "زێوە - بناری سێ گۆشە"وە بەرەو دۆڵی خواکوڕک بەڕێکەوتین. مامۆستا سەلام زۆر لە خۆی ڕادەفەرموو کە لە ڕێ باش دەڕوا، بەڵام هێشتا نەگەیشتبووینە ئەو یەکەم هەورازەی کە بۆ کوێستانەکانی بەرانبەر زێوە و دزێ سەر دەکەوت، پەکی کەوت، باش بوو کاروانێک بەتەکمانەوە تێپەڕین و ولاغێکی بەتاڵیان پێبوو، هەتا لەو کوێستانە تێپەڕین، سەلامیان سوارکرد. ئێمەش لەگەڵ برایان عەبدولا شێخانی و مام هێدی بە پێ دەڕۆیشتین و هەر بای سمێڵمان دەهات. کاروانەکە ڕێگایان لە ئێمە جیاواز بوو، ئێمەش لەناو هەواری ڕەوەندەکان کە تازە هاتبوونە ئەو شوێنە، لاماندا و فراڤینمان خوارد و پاش حەسانەوە گۆچانێکمان دایە دەست مامۆستا سەلام و بەرەو گوندی "شێخان"ی یەکەم دەروازەی خواکوڕک شۆڕبووینەوە، کە ئەو کات تازە برادەرانی "پ.ک.ک" لەوێ بنکەیەکیان دانابوو، بەڵام هیچیان نەبوو، بۆ ئێوارەکەی بەرەو بنکەکانی حشع نزیک بووینەوە. لە پڕ بەسەر ماڵی برادەرێک داکەوتین کە سەلام گۆمەشینی بوو، لەناو کۆمەڵە کاشە بەردێک خێمەیەکی دڕاوی هەڵدابوو کە دروست کەوتبووە نێوان بارەگاکانی حشع و ئەوەی حیزبی شەعب، هەر یەکەیان بە قەدپاڵێکی بەرانبەری دۆڵەکەوە بوو. سەلام زۆر بەگەرمی پێشوازی لێ کردین. ئەودەم

سەلام لەگەڵ برادەرانی ئیتجاهی دیموکراتی شۆڕشگێڕ بوو، دیار بوو لەگەڵ قادر عەزیز و ئەوان نێوانی تێک چووبوو، بە منداڵەکانییەوە هاتبووە ئەو ناوەوە و کادرێکیشی لەگەڵ بوو، کە خەڵکی باداوانی هەولێر بوو. هەندێ ساواریان هەبوو، بۆیان کردینە چێشت و زۆر بەلەزەتەوە خواردمان، سەلام کە لە مەبەستی ئێمە گەیشت، کە بۆ لای حشع هاتووین، گوتی من لێرە میوانی برادەرانی "حیزبی شەعب"م، بەڵام ئەوە وەزعەکەمانە دەیبینن، منداڵەکانی زۆر کزوکۆڵ دیار بوون، لەسەر وەزعی خۆمان دڵمان پێیان سووتا. سەلام لە درێژەی قسەکانی گوتی کاتی هاتنتان باش نییە، چونکە هەردوو حیزبی "شیوعی و شەعب" چاوەڕوانی هاتنی وەفدی یەکێتین بۆ کۆبوونەوە. منیش هەر بەو درەنگە نامەیەکی بچکۆلانەم بۆ "ئەبو تارا" نارد و ئاگادارم کردەوە کە ئێمە گەیشتووین و لە لای ئەو برادەرەین، بەڵام ئەگەر بوارتان نییە بۆ دیدەنی ئێمە، ئەوە زۆر ئاساییە، ئێمە بەیانی بۆ زێوە دەگەڕێینەوە، دڵمان هیچ ناکات و زۆر ئاساییە کە برادەرانی یەکێتی میوانتانن و هیوای سەرکەوتنتان بۆ دەخوازین.

عەبدوڵا شێخانی نامەکەی برد و هێشتا دونیا تاریک نەببوو، لەگەڵ برادەرێکی حشع گەڕایەوە و وەڵامی نامەکە و ئەو هاوڕێیەی هێنابوو کە زۆر بەخێرهاتنی کردین و نامەکەیان بەناوی مەکتەبی سیاسی بوو، بەخێر هاتنمان دەکەن و نووسیبویان، ئێمە خۆمان چاوەڕێی ئێوەش بووین و بۆ هەر لایەکتان شوێنی دیاریکراومان دانەوە و فەرموون لەگەڵ ئەو برادەرەی ئێمە بەڕێ بکەون و لە شوێنی دیاریکراوی خۆتان ئیسراحەت بکەن. بەڵام بە هۆی تاریکی و هیلاکیی مامۆستا سەلام عەبدوڵا وامان بە چاک زانی شەو لە لای سەلام گۆمەشینی بمێنینەوە و هاوڕێیان "عبدولا شیخانی و مام هێدی"مان لەگەڵ ئەوەی حشع رەوانی ئەوێ کرد و خۆم بۆم نووسینەوە کە ئەو شەو لە لای ئەو برادەرەرمان دەبین.

دونیا گەرم بوو ئێمە لە دەرەوە لە پەنا گاشە بەردێک جێگامان خۆشکرد و خەوتین. بەیانی لەگەڵ خورەتاو بێدار بووینەوە و نانی بەیانیمان دەخوارد، کە سەلام گۆمەشینی لە بارەگای حیزبی شەعب بۆی دەهات و بەخۆی چوو بوو، گوتبووی ئەمڕۆ فلان و فیساری ئالای شۆڕش مێوانمانن و هەندێ نانی زیادەم بدەنێ. ئەوان زانیبوویان ئێمە لەو شوێنەین، شوێنەکەش لە کەناری ئەو ڕێچکەیە بوو، کە بەرەو بنکەکانی مەکتەبی سیاسیی حشع دەچوو. دیار بوو هەر دوێنێ برادەرانی یەکێتی "د. فوئاد مەعسووم و فەرەیدوون عەبدولقادر" گەیشتبوون و لەلای مەکتەبی سیاسی حشع بوون. سامی و برادەرانی گەل لەو ناوەدا بەبەردەممان داهاتن و ڕۆیشتن و لەناویان تەنیا دارا، کە خۆی مرۆڤێکی جوامێربوو، بەیانی باشی کرد و ئەوانەی دیکە ورتەیان لە دەم نەهاتە دەرەوە. بەتایبەت

ئەو "سامی"ییەی ئێمەی، کە بە ڕچەشکێنی مێژوویی دەژمارد، لەو شوێن و زەمانەدا هەر سڵاویشی لێ نەکردین. کە بەراستی پێمان سەیر بوو! هێشتا لە ئێمە بزر نەببوون، یەکێک لە پێشمەرگەرکانی خۆی بۆ دواوە ناردەوە و پێشمەرگەکە لە دوورەوە بانگی سەلام گۆمەشینی کرد و گوتی: کاک سەلام هەتا ئێرە وەرە، کاک سامی دەیەوێ قسەت لەگەڵ بکات. سامی ڕاشکاوانە بە سەلامی گوتبوو: کاکە ئەوە چۆن دەبێ! تۆ میوانی لەلای ئێمە! بە چ عەقڵێک ئەوانەی ئاڵای شۆڕش لە لای خۆت دادەنێی! بۆ نازانی هەڤاڵانی یەکێتی لێرەن، دوایی ئەگەر شتێک ڕوویدا! کە سەلام گەڕایەوە زۆر نیگەران ببوو، چەندی هێنامان و بردمان هەر دەیگوت، پێوەندی بە ئێوەوە نییە، بەڵام لە دەم و چاوییەوە هەر ئەوەتە لە داخان یەخەی خۆی دانەدەدڕی! من ناچارم کرد کە دەبێ بۆمانی بگێڕتەوە سامی چی پێ گوتووە! ئەوە بوو قسەکانی بۆ گێڕاینەوە. لێ لێ خەپشێ! ترێ بڕێ! زۆر دڵی "سەلام"م دایەوە و گفتم پێ دا کە من لەگەڵ "ئەبو تارا" قسە دەکەم، بەڵکو ئازووقەی ژیانی ڕۆژانەتان بۆ دابین بکەن و چی تر هاتووچۆی مقری حیزبەکەی سامی مەکە.

دوایی برادەرانی خۆمان هاتن و بە یەکەوە چووینە شوێنی دیاریکراو. من و "ئەبو تارا" لە سەربانی ئەو ژوورە پیاسەمان دەکرد سامی و پێشمەرگەکانی بە بەردەممان گەڕانەوە و سامی چاوی لە بەرخۆی نابوو. مەسەلەکەم بۆ ئەبو تارا گێڕایەوە و زۆر دڵگران بوو، گفتی دامێ کە لەگەڵ هاوڕێیانی خۆی قسە دەکات و هەر لای خۆیان هەموو ئازوقەیەکی بۆ دەنێرن. هەروەها ئەگەر خۆی پێی خۆش بێت لەو بنکانەی خوارەوە، خانوو بۆ خۆی و ماڵ و منداڵەکانی دابین دەکەن. فیعلەن بۆ ڕۆژی دوایی کە سەلام گۆمەشینی هاتە لامان و گوتی برادەرانی حشع زۆر شتیان بۆ هێناوم و هاتووم چاوم بە ئێوە بکەوێ و سوپاسی ئێوە و ئەوانیش بکەم. ئێمە لەگەڵ مەکتەبی سیاسیی حشع و ئەبو تارا چەند جارێک دانیشتین و شتەکانی نێوانمان و بارودۆخی کوردستانمان بە تێروتەسەلی لەگەڵ یەک باس کرد و سەبارەت بە بەرەی کوردستانی لەگەڵ یەکێتی، بەوردی گوێیان لە ڕا و بۆچوونەکانی ئێمە گرت و هەندێ ورده ناکۆکی هەبوو لە خوارەوە و لەگەڵ برادەرانی ئێمەدا، هەموومان باس کرد و ئامادەیی و بڕیاری خۆیان پێگوتین، کە لە ڕووی ئازوقە و لۆجیستی هاوکاریمان دەکەن بۆ کردنەوە و دانانی بنکەی ئاڵای شۆڕش لە خواکوڕک و پاشان هەندێ هاوکاریشیان کردین و هەر لەو کۆبوونەوانە بوو کەریم ئەحمد (ئەبو سلیم) ئەو ئەمانەتەی سالار لە شامەوە ڕەوانی کردبوو، تەسلیمی کردم، کە ۲۰۰۰ دۆلار و پاسەپۆرتێک بوو، کە سەفەری پێ بکەم بۆ مۆسکۆ بەمەبەستی معالجەکردنی سەرم و پشتم.

بۆ ڕۆژی دواتر بەرەو شنۆیە گەڕاینەوە، هەتا سەر لووتکەی کێلەشین بەپێ سەرکەوتین، کە دوو سەعات دەبوو، بەڵام بە هۆی باری ڕۆیشتنی مامۆستا سەلام زیاتر لە ٥ سەعاتمان پێ چوو، وەفدی پارتی بەتەکمانەوە تێپەڕین و فلک الدين کاکەیی زۆر لەگەڵمان وەستا و زۆر شتی بۆ باسکردین دەربارەی کۆبوونەوەکان و دواتر وەفدی یەکێتی لە ڕێچکەیەکی دوور لە ئێمە ئەوانیش تێپەڕین.

زەمەن هات و تێپەڕی، من و "نەجیبەخان و ڕێگا"ی کچم، جلی کوردیمان لەبەر کردبوو لە شاری نەغەدە لەماڵی مام قادری ڕەحمەتی بووین. لە ماڵی مەلا مەحەمەدی کۆلەکی داوەت کرابووین، کە لەوسەری شاری بوو، بەپیاسە هاتین و لە بەردەمی گەرەکەکە، یەک فلکەی گەورە هەبوو، کە ئێمە پەڕینەوە، "سامی عبدالرحمن" و کۆمەڵێک لە پێشمەرگەکانی، کە هەتا "وریا سەعاتی"یشیان لەگەڵ بوو و لەسەر شۆستەیەک وەستابوون، ئێمە بەنزیکیانەوە پەڕینەوە، سامی خەریک بوو بەرەو ڕوومان بێت، من ڕووی خۆم وەرگێڕا و بە دەنگێکی بڵند گوتم نەجیبە ڕووی خۆت وەرگێڕە، با نەکەوینە کەمینی مەفرەزەیەکی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان. سامی لە خۆی گەیشت و پشتاوپشت گەڕایەوە و تۆڵەی دۆڵی خواکوڕکم لێ کردەوە و مەجید ئاکرەیی کە کادرێکی کۆنی قیادە موئەقەتە و دواتر لە حیزبی شیوعی تۆرا بوو، لە ورمێ زۆر هاموشۆی یەکترمان دەکرد، چەند جارێک هەوڵیدا لەگەڵ سامی دابنیشم، من ڕازی نەبووم و ئامادەیی خۆم دەربڕی، وەک شەخسی خۆم لەگەڵ هەمووان دادەنیشم، بەڵام من لەگەڵ ئەوبرادەرە دانانیشم و هەتا ئاڵای شۆڕش چەند جارێک بەبێ من لەگەڵی دانیشتن و هەر شوێنێک ئەوی لێبوایە، من نەدەچووم و هەتا لە تەعزییەکەی "کاک ادریس"یش بۆ نموونە ئەوی لەگەڵ بوو، من نەچووم و مامۆستا سەلام و عیماد چوون، دوایی خۆم بەتەنیا چووم.

پاش ئەوەی لە لایەن حشع ئاگاداریان کردمەوە، کە ئەگەر دەمەوێ بچم بۆ مۆسکۆ بۆ معالجە، دەبێ خۆم بگەینمە "کابول"ی پایتەختی ئەفغانستان و لەوێ لە سەفارەتی یەکێتی سۆڤیەت کارەکانم بۆ مەیسەر دەکرێ، یان دەتوانم لەوێوە بچم بۆ شام و لە دیمەشق کارئاسانی سەفەرم بۆ دەکرێ. من ماوەیەک بوو هەندێ یارمەتی هاوسەرەکەی خۆشم پێگەیشتبوو، هەروەها لە لایەن سالار لە دیمەشقەوە پاسپۆرتێکی عیراقیان بۆ کردبووم و گەیشتبووە دەستم لەگەڵ ٢٠٠٠ دۆلار، کە ١٧٠٠ دۆلارم داوە بەو قەرزانەی لەسەر قسەی سالار وەرم گرتبوو بۆ ڕاییکردنی کارەکانی ئاڵای شۆڕش.

پاش بەڕێکردنەوەی ژن و منداڵەکەم بۆ هەولێر، کۆبوونەوەیەکی فراوانی "ئاڵای شۆڕش"مان لە دۆڵی خواکوڕک بەست و زۆر بە ڕاشکاوی و ئاشکرا دەست لە کار کێشانەوەی خۆم لە ئاڵای شۆڕش ڕاگەیاند و بە هەموو هاوڕێیە بەشداربووەکانم گوت،

که من باری تەندروستیم زۆر خراپە و دەبێ بەدوای چارەسەری خۆم بکەوم، سەرباری ئەوەش ئەو بارودۆخەی ئاڵای شۆڕش، کە هەندێ هاوڕێی لاسار، لە چەپ و ڕاست دروستیان کردووە، وزەی لەبەر بڕیوم و هیچ ئومێدێکم لە دڵ نەماوە و ئەوەندەی وزەم تێدا مابوو هەمووم کردە قوربانی ئاڵای شۆڕش، بۆیە ئامادە نەبووم بە هیچ جۆرێک بۆ پۆستی سەرکردایەتی کاندید بکرێم و دەستەیەکی نوێ هەڵبژێردرا. من شتەکانی لام بوو لە مۆر و هەندێ حسابات، هەموویم بە نووسین تەسلیم کردنەوە و بۆ خۆم لە شنۆیە ژوورێکم گرتبوو، مشوری ئەوەم دەخوارد ڕێگایەک بدۆزمەوە، کە سەفەرەکەم بکەم، بەتایبەت دوای ئەوەی لە ئێرانییەکان بێئومێد بووم و لێناگەڕێن بە ئاسمانی "ئێران"دا سەفەر بکەم. واتە گومرکی ئەوەم دا، کە ئامادە نەبووم ڕاپۆرت لەسەر کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە بنووسم لە ساڵی ١٩٨٤ دا، بەڵام من لە لای خۆمەوە زۆری پێ سەربەرز بووم، چونکە بە ئێرانییەکانم گوت، ئەگەر ڕاپۆرت بۆ ئێوە بنووسم دەچم تەسلیمی عیراق دەبمەوە و هەر هیچ نەبێت لەگەڵ ماڵ و منداڵەکەی خۆم دەژیم. بە هەر شێوەیەک بوو لە ڕێگای "فازل"ی کارمەندی ئیتلاعات، پاسپۆرتەکەم وەرگرتەوە.

من خۆم برادەرێکم هەبوو بە ناوی تحسین، کە ناوی نهێنی "مامۆستا عادل" بوو لەناو پارتی، کاتی خۆی بەیەکەوە لە کۆمپانیای دواجینی هەولێر کارمەند بووین، پێوەندیمان زۆر خۆش بوو، کوڕێکی ڕۆشنبیر و لەگەڵ بیری چەپ دەهەژا، نێوانمان گەرموگوڕ بوو، خزمێکی لە شاری زاهیدان بوو. گفتی پێ دابووم، ڕەوانەی ئەوێم بکات و ئەوان هاوکاریم بکەن بۆ چوونە کابول. من ژوورەکەم لە شنۆ تەسلیم کردەوە و کەلوپەلەکانم هەموو بەخشی و کاک مەحەمەد سابریش چووە گوندی دزێ و لەگەڵ برادەرێکی بەناوی تەحسین مەنتک دەژیا. ڕۆژێکیان سەرەتای مانگی ١١ ساڵی ١٩٨٧ بوو، ئەرشیفە بچۆلانەکەم و هەندێ دەستنووس و کتێب و نامیلکەی وەرگێڕاوی خۆم هەبوو، دەمویست بیبەم بۆ شاری نەغەدە و لە ماڵی ئەو بارزانییە دۆستانەی دابنێم، هەتاکو بزانم چارەنووسم بە چی دەگات. لە شنۆوە لەگەڵ سلاح حەمەدەمین، کە بە سلاح کەمین ناسرابوو لەگەڵ تەحسین مەنتک، کە سەیارەی هەبوو بۆ نەغەدە بەڕێکەوتین، لە بازگەکەی چوونە ناو نەغەدە ئێمەیان ڕاگرت و بەرگی عبوریان لێ داواکردین، ئەوانیش پسولەی "ئاڵای شۆڕش"یان هەبوو، بۆ ئەوان زۆر بە ئاسایی ڕۆیشت، بەڵام منیان دابەزاند. دوو جانتا پڕ لە ئەوراق و دەستنووسەکانم کردنە ئەمانەت لە لای تەحسین. بەداخەوە لێم فەوتا، کە بۆ من بیرەوەری و دەستنووسی گرنگ بوون. لەوێ منیان هێنایە خوارەوە و ئەوانیان بەڕێ کرد. منیان لە ژوورێکی دەم کراوە دانا و گوتیان چاوەڕوان بکە، ئێستا بە ماشێنی خۆمان ڕەوانەی شاری "ورمێ"ت دەکەین! تۆ لە لایەن "مدرسە"وە

داواکراوی. هەر بەیەکجار هەترەشم چوو، چونکە سەبارەت بە "مدرسە"، بیستبووم ج زیندانێکی پڕ مەینەتی سوپای پاسداران بوو لە "ئازربایجانی غەربی" و هەر یەکێک بکەوتایە ئەوێ، هەتا شەش مانگ بۆ ساڵێک کەس لێی نەدەپێچایەوە و کەسیش پێی نەدەزانی. لەو بینەوبەردەیەدا بووم، لە لای خۆمەوە هەزار و یەک بیرم دەکردەوە. بەڵام لەناکاو دووسەیارەی پڕ پێشمەرگەی بارزانییەکان گەیشتنە بازگەکە و بۆبەختی من لەناو یەکێکیاندا، یەک لەو دۆستە بارزانییەم (حەسۆ) منی دیت و گوتی، کوڕە مامۆستا ئەوە تۆ ج دەکەیت لێرە؟ گوتم حەسۆ فریام کەوە گیراوم! ئەویش مەردانە هاتە خوارەوە و سەیارەکەیان لەسەر ڕۆیشتن بوو، چووە لای مەسئولەکەی خۆیان، کە لەپێشەوە دانیشتبوو، یەکێک لە کوڕەکانی خوالێخۆش شێخ مەحەمەد خالید بوو. کوڕەکەش زۆر مەردانە هاتە خوارەوە و چوو لەگەڵ پاسداری مەسئول قسەی کرد و هەردووکیان هاتنە لای من و تێگەیشتم کە ئەوان لەسەر فەرمانی پاسداران منیان گرتووە و ڕۆژەکەش پێنج شەممە بوو، دەوامی دائیرەکان بەرەو تەواوبوون دەچوو. کاکی مەسئول بە بێتەل قسەی لەگەڵ بەرپرسەکانی بازگەکە کرد، بەڵام کەسێکی بڕیاربەدەست نەمابوون، ناچار لەگەڵ فەرماندەیەکی ئەرتەش لە نەغەدە قسەی کرد، گوێم لێ بوو، پێی گوت ئەوە دۆستی ئێمەیە و چەندان کەسی لە بنەماڵەکەی ئێمە لە دەستی ڕژێمی بەعس ڕزگار کردووە و دەبێ تەسلیمی خۆمی بکەن و من ڕۆژی شەممە دەیبەم بۆ ورمێ بۆ "مدرسە"! ئیتر کابرا ڕازیبوو، منیان وەرگرتەوە و لەگەڵ خۆی لە پێشەوەی سوار کردم و هەر کە لە بازگەکە تێپەڕین، گوتی کوڕۆ تۆ کۆمۆنیستی!!؟ گوتم، نەخێر من ئاڵای شۆڕشم: گوتی تۆیان بە تۆمەتی کۆمۆنیستی و جاسوسی سۆڤیەت گرتووە و مانەوەت لەو ناوە باش نییە و پیاوانە هات بەسەیارەکەی خۆی منی لە بازگەکەی نەغەدە ڕووەو خانێ دەرباز کرد و گوتی بۆ خۆت بچۆرەوە شنۆ و لەپێش بازگەکە وەرە خوارەوە و بە پێ بڕۆوە شار و خۆت بگەینەوە بنکەکانی خۆتان و من هەر ئەوندەم پێ دەکرێ و پێیان دەڵێم لە دەستمان ڕایکردووە!

ئیتر هەندێک لە شتەکانم لە لای دایکی حەسۆ بوو و هەر بە ماشێن چووین، شتەکانمان وەرگرتەوە و منیان لە بازگەکە تێپەڕاند و بۆ شەوەکەی چومەوە شنۆ. بە گوێی ئەوانم کرد و بە پێ چوومە ناو شار. من برادەرێکم لە شنۆ هەبوو، ئاغای حسین، چریکی فیدایی بوو، بە هۆی ئاڵای شۆڕشەوە کاری زۆرم بۆ کردبوون، چوومە ماڵی ئەوان و زۆر بەگەرمی پێشوازییان لێ کردم و شتەکانم بۆ گێڕایەوە و زۆر دڵی دامەوە، کە بەیانی زوو تراکتۆری ناسیاوێکی بۆ پەیداکردم و جلێکی کوردی ئەو ناوەم لەبەر کرد و خۆم دەمامک دا و بە قاچاغەرێ بەرەو دزێ بەڕێکەوتین. بۆ شەو درەنگ گەیشتینە ناو

گوند و یەکسەر چوومە ماڵی "مقدم سەردار" کە براگەورەی تەحسین بوو، مەحەمەد سابر و تەحسین دانیشتبوون، زۆر دڵخۆش بوون کە چاویان بە من کەوت و چیرۆکەکەم بۆ گێڕانەوە. نزیکەی ١٠ ڕۆژێک لەوێ بەدزی دەژیام و ناردم بەکر خۆشناو و مەریوان هاتن و لەگەڵ ئەوان لە ڕاژان سەرێکم لە مەکتەبی سیاسیی پارتی دا و گوتیان هیچمان بۆت پێ ناکرێ. فرەنسۆ یادی بەخێر ئامۆژگاری کردم، کە مادام من هەر دەچمە دەرەوە، وا چاکە بە تورکیادا بڕۆم و ناوی کابرایەکی قاچاخچیان بۆ پەیدا کردم، کە خەڵکی دەبرد بۆ ناوچەی گەوەڕ. شەو هاتینەوە دزێ و کابرامان دۆزییەوە و کات و شوێنی بۆ دیاری کردین. لێرەدا مەحەمەد سابر زۆر مەردانە، بڕیاری دا ئەویش ببێتە هاوڕێکام، تاکو من بەتەنیا نەبم. سەعات ١١ی شەوی ١٩٨٧/١١/١٩ بەرەو گەوەڕی بەڕێکەوتین. من و مەحەمەد سابر بەگەر کابرای کەوتین، دیاربوو قاچاخچی زۆر لێمان دەترسا، هەمیشە لە دووری ئێمە دەڕۆیشت، چ ڕێگایەک بزن پێیدا دەڕۆیشت ئێمەی بەوێدا برد، چەند جارێک ئێمەی هەڵەداوان کرد، سەرمایەکی هێجگار کوشندە بوو، ئەوەندە بەرببومەوە و بەقەد پالان هەڵگەڕا بووم، هەردوو سەرچۆک و دەستەکانم خوێنیان لێ دەهات. تاکو لە ڕەبیەی پاسدارانی سەر سنوور نزیک بووینەوە و لەناکاو گوتی، کەمینە خۆتان دەرباز بکەن، گوتم مەحەمەد، من ناتوانم بەدوایدا ڕابکەم، تۆ دوای بکەوە و لەو شەوە ساردەدا لەیەکتری بزر بووین. ناچار من بەتەنیا مابوومەوە و لەو ناوەش هەندێ شارەزابووم، خۆم بە ناچاری گەڕامەوە و بە ڕێگای ئاسایی ملی ڕێگام گرتبوو، بە کوێی ئەو گوتبووی کەمینی لێیە، دروست بەوێدا گەڕامەوە و هەتاکو هاتمە نزیک گوندی "بێ ڕاس"ی نزیک زیوە و هەتا بەرەبەیان لە قولغێک خۆم حەشاردا. هەموو گیانم خوێن بوو و لەسەرمان هەمووی بەستبووی، بەرەبەیان لەگەڵ ڕوناکبوونەوە، بە هەر شێوەیک بوو، گەیشتمەوە ئەو ماڵە، کە لێی بەڕێکەوتبووین و پاش ماوەیەکی چاک لەدەرگەدان لە خەوم هەستاندن و دەرگایان لێ کردمەوە، ناسیویانمەوە و بەگەرمی وەریانگرتمەوە، هەتا دوو ڕۆژان خزمەتیان کردم و مەحەمەدیش بۆ نیوەڕۆ گەڕایەوە هەمان شوێن. دوایی دوو ڕۆژان دوو کەسی شاری شەمزینان هاتنە ئەو ماڵە و پیاوی زۆر چاک بوون و ئێمەیان لەگەڵ خۆ هەتا شەمزینان برد.

**سەرچاوەی زەخیرەی دروستبوونی ئالای شۆڕش.**

دروستبوونی کۆمەڵە و گۆڕانکارییەکانی چەندایەتی، ڕێکخراوەیی، سیاسی، پیشمەرگەیی، کۆمەلایەتی و میدیایی، لەگەڵ خۆیدا چەندان دیاردەی ئێرەوئەوێی دەستەگەریی هەڵگرتبوو، کە لە شانی پەیدابوونی دەسەلاتی حوکمڕانیدا، دیاردەکانی

پاشەگەردانی لەبیرکردنەوە و گەشەنەکردنی ئایدیۆلۆژی و نەبوونی رابەری مەیدان، بەرۆکی گەشەکردنێکی ئاسایی و نەبوونی بە حیزبێکی خاوەن مورکی نوێی بەخۆوە هەڵمژیبوو. پێداچوونەوەی زەمان و زەمینی لەدایکبوونی کۆمەڵە بۆ ئەو ڕاوکەیە دەمانگێڕێتەوە کە لە لایەن کۆمەڵێک کادر و مرۆڤی تێکۆشەری مەیدانی سیاسەتی حیزبێکی خاوەن ئەزموونی تاڵ و تفتی دووبەرەکی کوردان؛ پارتی دیموکراتی کوردستان، بە هەردوو باڵەکەی کۆتایی شەستەکان، بە جۆرێک خودی ئەو کادر و توخمانە خۆیان تووشی یەک تەنگژەی سیاسی، هەڵوەشانەوەی ڕێکخراوەیی، تێکەڵ و پێکەڵی سەرچاوەکانی بیرکردنەوە هاتبوون. دیارە خاکی کوردستان و باوەشی خەڵکی کورد وەک کێڵگەی تاقیکردنەوەی جۆراوجۆری رەوتە فیکری و سیاسییەکان بەم ئەزموونانە فرچکی گرتوە و هەمیشە لەگەڵیان دەهەژێ.

کۆمەڵە لە هەمێزی بارودۆخێکی هێجگار ناهەموار و پرکێشەی تیۆری ئایدیولۆژیای مارکسیزم – لینینزم گەرایکردوە، واتە لە تەنگژەیەکی خودینەوە ، بۆ تەنگژەیەکی ئایدۆلۆژیی ئاڵۆزتر کەوتبووە چەپڵەلێدان بەبێ ئەوەی کادر و سەرکردەکانی خاوەن توانایەکی بەرچاوی ئەو بوارە بن و بتوانن خۆیان لەو دەریایە گێژخواردوەوە توشە دەربکەن، بەڵکو بە جۆری مەلەکردنێکی دەستکرد و سەقەتاوی، دەیان سەربازی پێ گومناو کراوە، بەبێ ئەوەی ڕۆژێک لە ڕۆژان سەرەتاکانی بیرکردنەوەی ئەم ڕێکخراوە بە راشکاوی و دوور لە تەمومژی ڕستەی چروک ، بەرنامەیەکی تیروتەسەل، شاکاری خەباتی سیاسی و ڕێکخراوەیی خۆی بە سەرەتایەکی مژدەدەرانە دەست پێ کردبێ. بە جۆرێک ئەو ئاکارە زیانبەخشە وەک ترادیشون هەتا هەنووکە پیادە دەکرێ. چونکە هەر حیزب و گروپێکی تێکۆشەر بە بێ هەر بەرنامەیەکی ساغکراوەی بێ بینەوبەردە، بێ هەڵگرتەی شیکردنەوەی جۆراوجۆری ئەم و ئەو، هەرگیز ناتوانێ بەساڵنامەیەکی ڕۆشن هەورازی سەرکەوتن ببڕی و کاروانی خەبات بە ئەنجامی چاوەڕوانکراو فەراهەم بکات.

ئەزموونی خەبات و قوربانیدانی دەیان ساڵەی کۆمەڵە پەرێزێکی شێواو و دەسرازەی پەرش و بڵاوی بەرهەمەکانی ئەو کاروانەمان بۆ دەگێرتەوە. زۆربەی سەرانی کۆمەڵە سەرباری ئاست لاوازیی ئایدۆلۆژییان لە بواری مەسەلەی مورکیسیزم- لینیزیزمدا، هەرگیز نەبوونەتە خاوەن بنکەیەکی جەماوەریی بەرفراوانی زەحمەتکێشان، بگرە هەر لە سەرەتاوە ئاوی ناکۆکیی ناوخۆیی و دووبەرەکیی بیر و کرداریان کردۆتەوە کەواسوری مەبەستە تەمومژاوییەکان. بۆیە هەڵوەشاندنەوەی کتوپڕ و گۆڕینی یەکجارەکی ڕەوتی ئاشکرای بەرەو ئاکاری دامەزراندنی حیزبێکی جەماوەریی پانوپۆر و رووکردنە ئاواتەکانی سۆسیالست دیموکراتی، خۆی لە خۆیدا ئەو راستیەیان ساغ کردەوە.

لەناو جەستەی کۆمەڵەدا، هەر لە ڕۆژانی سەرەتای درووستبوونییەوە تەونی ناتەبایی لەناو خودی سەرکردایەتی هەبووە و بەشێک لە سەرکردەکانی چ بە ئاشکرا و چ بە نهێنی ئاراستەی ڕەوتی دیکەیان هەڵبژاردووە. بە هەر هەموویانەوە لە ئاستی ئەرکی دامەزراندنی ڕێکخستنێکی پێشرەودا نەبوونە، بەڵکو زۆرتر لەگەڵ سوخەت و ڕەفتار و گوتاری تەسک و تروسکی خەونی سەوزوسووری تاکە کەسی خۆیان خولاونەتەوە. جورئەت و توانای ئەو ئاقاربەزاندنەیان نەبووە، چونکە هەموویان. بێجگە لە "ئارام"، لەناو قوتابخانەی سیاسیی حیزبیی کورداندا و زۆرتر بۆ حەز و بەرژەوەندی کەسی خۆیان ژیاون، لە سێبەردا هۆگری خەباتکردن بوونە و هەمیشە چاولێکەری و کۆپیکردنی ئەزموونی دەرەکی ئەموئەوی ناجۆر بە کوردستان و خەڵکی کورد، وێردی سەرزمان و بیرکردەوەیان بووە، نەوەک فەرهەنگی قوربانیدانەکەیان بۆ خزمەتکردن بێپەروا بۆ نیشتیمان و داهێنانی ئاسۆی گەشی سەرکەوتن بوو بێت. ئەوجا ڕەوتە چەپ و چەپڕەوەکان زۆر زەقتر تێی گلاون.

کارەساتی ئاشبەتاڵی خەباتی چەکدرای چواردەساڵەی ئەیلولی خەڵکی کورد، ئەگەر بۆ سەرجەم حیزب و لایەنە جۆراوجۆرەکانی کوردستان مایەی بەرپابوونی تەنگوچەڵەمەیەکی بارگران و پڕتراژیدیا بووبێت، ئەوە بۆ ڕێکخراوی بچووک و پەراوێزی ڕووداوەکانی وەک کۆمەڵە، یەک جیهانی هەژان و بێ سەروبەری جڵەوی بەڕێوەبردن و نەبوونی جورئەتی شۆڕشگێرانە و ئەزمەی سەرکردایەتی دانەر و داهێنەری بەدەمەوە بووە. ڕاستە کۆششی "ئارام".بەتایبەت و چەندان سەربازی چاونەترسی دیکەی ڕۆژانی سەخت و دژواری ساڵی ١٩٧٥ بەدواوە، تا ڕادەیەک هەناسەی نوێی وەبەر گیانی کۆمەڵە ناوە و بگرە لە گیانەڵای توانەوە ڕزگاری کردووە، بەڵام دیسانەوە ئەو ئەرکە قورسە لە توانای بەتەنیای کارامەیی و قوربانیدانی "ئارام" نەبوو. بێگومان هەڵگیرساندنی خەباتی چەکداری سەرلەنوێش، ئەوەندەی دیکە بارودۆخ و ئەرکەکەی دژوارتر کردوون. "ئارام" بە هاوکاریی هاوڕێیە کەمئەزموونەکانی بواری پێشمەرگایەتی و بێبنکەی جەماوەری و هەر جۆرە پشتیوانییەکی دەرەوەکی و ناوەکی، بە قوربانیدان و کاری شۆڕشگێرانەیان، سەرەتایەکی نوێیان لەگەڵ خۆیان و کۆمەڵە خستبووە دەم گاگۆڵکردنەوە، کە دەبوو هاوبیرەکانی کۆمەڵە لەسەری بەردەوام بن. چونکە "ئارام" بە بیروکرداریکی نوێی هەڵهێنجراوی بەر ڕەوتی ئەزموونە تاڵوتفتەکانی خەباتی چینایەتی و نەتەوایەتی، کاروانی دەست پێکردبوو. بەڵێ لەو کەشوهەوایە و لەناو ئەو پەرێزە شپرێوەدا، شەهیدبوونی ناوەختی "ئارام"، کۆمەڵەی بەبێ ڕابەرێکی هەڵکەوتووی مەیدانی هێشتەوە و بۆشاییەکی زۆری خستە ڕیزی هاوڕێ و هاوسەنگەرانی ئەندام و پێشمەرگە دڵسۆزەکانی کۆمەڵەوە.

بێگومان تێکۆشەرانی ڕیزەکانی کۆمەڵە هەر لە درووستبونییەوە، هەتا ڕۆژی هەڵوەشاندنەوەی، لە لایەنی گەش و خامۆشییەکانی بەرپرسیارن. ئەو هاوڕێیانەی کۆمەڵە بە چاک و خراپییەوە، زەخیرەی ئەو ڕێکخستنە بون. ناکرێ بەتەنیا ئۆباڵی خامۆشییەکان بۆ پێکهاتەی سەرکردایەتییەکەی بگێڕدرێتەوە، بەڵکو ئەو زەخیرەیە هەر ئەو جۆرە بەرهەمەی لێ هاتووتە بەر. چونکە هەرگیز بە زەخیرەی ناتەواو، شتی تەواو سەرناگرێ.

من تەنیا دوو نموونە لە بەرخورد و کرداری تژی لە گەندەڵی لە پراکتیکی کۆمەڵێک کادری هەرە دیاری خەباتی چەکداری کۆمەڵە دەهێنمەوە، کە بە ڕای من هەوێنی ئەم شالاوی گەندەڵییەی بەرۆکی مەسئولە حوکمڕانەکانی ئێستای حیزبەکانی کوردستانی باشوورە و وەک مرۆڤێکی فرسەتتەلەب و چاوچنۆک گیرفانیان بە هیچ تژی نابێت. یەکێکیان داستانی بێتواتەی ناوچەکانی خۆشناوەتیی هەولێرە، لەساڵی ١٩٨٣ دا و ئەوەی دووەمیان کارەساتی قرناقا و پشتئاشانی هەمان ساڵە، کە لە لایەن خودی سکرتێری یەکێتی و کۆمەڵەوە ڕابەری کراوە. ئەویش ڕاوڕووت و تالانی ئەو کادرە ناسراوانەی کۆمەڵە بوو، بە جۆرێک مووەلیدەی کارەبایی و ئامێری ساردکەرەوە و فریزەر بەپشتی وڵاخ بۆ ماڵە مەسئولەکان گەیەنرایە گەرمیان و دۆڵی خانەقا و بە لۆریی بچوک ڕایەخ و فەخفوری و زەخیرەی هەمەجۆرە بۆماڵی مەسئولەکان گواسترایەوە، ئەوە باسی پارەوپولی کاش و زێڕ و خشلی دزراو و گاڕانی مەڕوماڵات هەرمەکە. بەبێ ئەوەی هەر جۆرە لێپێچینەوەیەک لەگەڵ ئەو دزە ئاشکرایانە بکرێت و لەگوڵ شێرین تریان پێبگوترێ و بگرە ئەو دزەگەورانە بە پلەی گەورەتر شاباش کراون! هەر تەنیا بۆ مسۆگەرکردنی گوێڕایەڵییان بۆ فلان و فیسار سەرکردە! ڕاستە سازدان و هێنانەمەیدانی ئاڵای شۆڕش وەک یەکەم هەوڵدانێک لەناو جەستەی خەباتی چەکداریدا، بە مەبەستی گۆڕانکاری نوێ و ڕێکخستنی نوێ بوو و بگرە لە مێژوی خەباتی نەتەوەی کورد لە کوردستانی باشووردا، یەکەم هەوڵدانی نوێی ناو گۆرەپانی هێزە ناکۆکەکان و یەکەم ڕووبەڕووبونەوەی گەندەڵیی ڕێکخراوەیی و دەسەلاتبەڕێوەبردنی شاخ بووە، لەپێناوی چاکسازی و بەخۆداچوونەوەیەکی داهێنەرانە. بەلام چونکە پێکهاتەی "ئاڵای شۆڕش"یش لە هەمان زەخیرەی کۆمەڵە، سەرچاوەی گرتبوو، ئاڵای شۆڕشیش وەک چۆن بە هۆی باش نەناسینی بارودۆخ و لەخۆڕادیتنی بەڕێوەبەرەکانی و سەرچیخچوونیان بۆ هەندێ گفت و بەڵێنی دۆستی سەرزارەکی و نەیاری دەسەلاتداری مەیدانەکە، زۆر بەئاسانی لەبری گرتن و زیندانیکردنی زۆربەی بەڕێوەبەرە ئەساسییەکانی، هەر لە یەکەم هەنگاوی خۆجاڕدانی لەبار بردرا و هەوڵدانی بەشێک لە کادر و پێشمەرگە شێڕێوەکانیش هیچی لێ شین نەبوو. ئومێدەوارم لە بەشی دووەمدا، کە بەناوی (هەڵسەنگاندنی ئەزموونی ئاڵای شۆڕش)ە، بتوانم بەتەواوی سەرنج و بیروڕایەکانی خۆم لەو ڕوانگانەوە تێروتەسەلتر تەتەڵە بکەم.

**پاشکۆ**

له دووه‌م سه‌ردانمان بۆ دۆڵی خواکورک: له‌پاش گه‌ڕانه‌وه‌م له باره‌گای لقی ٢ی پارتی له گوندی خرێنه، که چه‌ند ڕۆژێک له‌وێ بووین، ڕۆژی پێش ئێمه، شوانکاره‌یه‌ک هاتبووه سه‌ردانی فره‌نسۆ، که هه‌واریان له دۆڵی خواکوڕک بوو. بۆ نانخواردنی نیوه‌ڕۆ داوه‌تی کردبوو، "فره‌نسۆ"یش دیاربوو پێی گوتبوو فلانه ڕۆژ دێم، هه‌ندێ خه‌ڵکی کۆنه یه‌کێتی له‌و ناوه‌ن، ئه‌وان به‌ره‌و خواره‌وه تێده‌په‌ڕن، یه‌کێکیان له‌گه‌ڵدایه به‌ناوی حاجی مه‌مۆ و له‌گه‌ڵ خۆم ده‌یهێنم. کابرایش له خه‌یاڵی خۆیدا حاجی مه‌مۆ که‌شیده له‌سه‌ر و پیاوێکی به‌ته‌مه‌ن پیره و هه‌ر هیچ نه‌بێت ده‌وری په‌نجا پێشمه‌رگه‌یه‌کی له‌گه‌ڵدایه. شوانکاره‌که ناوی حاجی سمایل بوو. فه‌ره‌نسۆ به ئێمه‌ی گوت به‌یانی بۆ نیوه‌ڕۆ هه‌واری ئه‌و شوانکاره له دۆڵی خواکوڕک له‌سه‌ر ڕێگاتانه، هه‌ندێ کورج بڕۆن تاکو ده‌وری سه‌عات ٢ ده‌گه‌نه ئه‌وێ، خواردنمان بۆ کراوه. به‌ڵام من ناتوانم بێم، ده‌بێ بگه‌ڕێمه‌وه ڕاژان. که ئه‌و ده‌م باره‌گای مه‌کته‌بی سیاسیی پارتی له‌وێ بوو.

ئێمه ٦ پێشمه‌رگه بووین، به‌یانی زوو له خرێنه به‌ڕێکه‌وتین، بۆ ده‌وری سه‌عات ١ له‌سه‌ر لووتکه‌کانی ناوچه‌ی لۆلانه‌وه ئاودیوی خواکوڕک بووین، پاش هه‌ندێ پرسین له‌و خه‌ڵکه‌ی له‌و لێوارانه‌ی ئه‌وێ تووشیان ده‌هاتین، قۆناغه‌که‌مان دۆزییه‌وه و پێش سه‌عات ٢ گه‌یشتین. سه‌ره‌تا حاجی سمایل زۆر به ساردی پێشوازی لێ کردین، به‌بێ ئه‌وه‌ی بمانناسی، دوای هه‌ندێ قسه‌وباس گوتی، من چاوه‌ڕوانی فره‌نسۆ و حاجی مه‌مۆ ده‌که‌م، تۆزێک له‌سه‌رمان بوه‌ستن با ئه‌وانیش بگه‌ن! هه‌موو پێکه‌وه نان ده‌خۆین. ڕه‌شماڵێکی چه‌ندان ستوون، له‌و سه‌ری هه‌تا ئه‌و سه‌ری ڕاخرابوو، دوو سه‌ماوه‌ر ئاگردرابوو. منیش له به‌رخۆ پێکه‌نیم. حاجی پیاوێکی بونیادیته و ژیر و زه‌لامێکی باڵا به‌رزی زراف بوو، زۆر به سیما و هه‌یبه‌ت بوو و گوتی: کوڕۆ به‌چی دکه‌نی! گوتم: ئه‌وه‌ی چاوه‌ڕوانی ده‌که‌ی ئه‌وه یه‌کێکیان له ته‌کته‌وه دانیشتووه! حاجی هه‌ر هۆپیکی له خۆی زانی، گوتی چما ئه‌نگۆ هه‌ر ئه‌وه‌نده‌ن! جه‌نابیشت حاجی مه‌مۆی! په‌کوو، من وامده‌زانی پیاوێکی به‌ساڵاچوویت و به لانی که‌م ٥٠ پێشمه‌رگه‌یه‌کت له‌گه‌ڵدایه، چما مام جه‌لال به‌وه‌نده که‌سه مشه‌وه‌ش بووه! گوتم بابه ئێمه یه‌کێتی نین! گوتی، ئه‌دی چین؟ گوتم ئاڵای شۆڕشین. حاجی سمایل نه‌یهێناونه‌یبرد، گوتی ئه‌ی له دایکو به‌م، ئاڵای شۆڕش چیه! ئیتر کردمانه پێکه‌نین و زۆر به ڕوحی ڕیازی جوێنه‌که‌مان وه‌رگرت، ئه‌ویش له هه‌ڵوێستی ئێمه زۆر مه‌منوون بوو و هه‌ستا پربداته ده‌ستم، گوتم بابه من ڕێگا ناده‌م منداڵیش ده‌ستم ماچ بکات، چ جای به‌ڕێز

و گەورەی وەک تۆ! ئەوەبوو خواردنەکەیان بە تێروتەسەلی لە بەردەممان دانا و تێروپڕمان خوارد، کە ئێوارەش لە بارەگای حشع نانمان نەخوارد. لەگەڵ حاجی سمایل دۆستایەتیمان خۆش بوو، دووجاری دیکە یەکترمان دیتەوە، نازانم چارەنووسی بە چی گەیشتووە. بەڵام بە حەق "مام جەلال"ی خۆش دەویست.

لەسەردانی یەکەمم بۆخواکورک .. بۆ ڕۆژی دواتر لەو سەردانەی حیزبی شەعبدا، پاش نانخواردنێکی چاک، کەوتینە باس و خواسی خەبات، پێشمەرگایەتی و بارودۆخی کوردستان. سامی قسەکانی بەم جۆرە دەستپێکرد: ئێوە ڕۆڵەی جوامێرن لە مێژووی خەباتی کورد، لەژێر دەسەڵاتی ئەو سەرکردایەتییە کلاسیکییەدا، ئێوە ڕچەشکێنی مێژوون. لە شەستەکانەوە ئەوە یەکەمجارە کۆمەڵێ گەنجی شۆڕشگێر، هەڵوێست لە بەرنامەی ئەو سەرکردایەتییە (.....) وەردەگرن و ڕێبازی کوردایەتی ڕەسەن دەگرن. کۆمەڵێک بەسەر و گوێلاکی ئێمەیدا گوت، ئامادەیی تەواوی هاوکاری و هەتا هەنگاونان بۆ دروستکردنی حزبی نوێی یەگرتووی چەپی کوردی کرد. کە بەرای ئەو کاتیشمان زۆرتر لە موزایەدە دەچوو. لێرەدا من بە هەندێ وشە وەڵامم دایەوە و سوپاسی ئەو پێشوازییە گەرمەم لێ کرد. کە نۆبەتیش هاتە سەر خامۆشییەکانی سەرانی قوتابخانەی حزبی کوردی، خۆم بۆ نەگیرا و گوتم هەڤاڵ سامی، من سەربردەیەکی ناخۆشم لەگەڵ تۆدا هەیە، ئەگەر دڵت گەرد نەگری، لە بەرچاوی هەڤاڵانی خۆت، گفتی تورەنەبوونم نەدەیتێ نایگێڕمەوە! سامی بەدڵنیاییەکی تەواو لە خۆی، گوتی ئەوجا بۆ تورەدەبم، بە گیانێکی برایانە وەریدەگرم. گوتم ئەو دەمەی جەنابت وەزیری "اعمار الشمال" بووی لە بەغداد، من لە زانکۆی بەغداد لە کۆلیجی یاسای ڕۆژ وەرنەگیرام، بەر کۆلیجی ئادابی بەشی کوردی کەوتبووم، هەر ئەو ساڵە زانکۆی موستەنسرییە کرابووەوە، خوێندن تێیدا بەپارە بوو، بەراستی حەزم دەکرد قانوون بخوێنم، بەڵام پارەی خوێندنم نەبوو. لەوێ ڕۆژاندا دۆستێکم ئاگاداری کردمەوە کە لە بەڕێوەبەرایەتی خوێندنی گشتیی کوردی لە بەغداد پێویستیان بە کارمەندێکی ڕۆژێ هەیە. ئەو کارە بۆ من پڕ بە پێست بوو، وەک لەبیرم بێت مووچەکەی ۲۷ دینار بوو، بۆشەویش دەمتوانی هەر لەوێ بخەوم، چەند واسیتەیەکم کرد هەتا گەیشتمە لای جەنابتان، نامەی "سمکۆ عەلی"ی ئامر بەتالیۆنی دەشتی هەولێرم بۆ هێنابووی، بەیانی باشم لێ کردی لە ژوورەکەت لەسەر مێزەکەتەوە سەرت هەڵنەبڕی و وەڵامت نەدامەوە، هەر ئەوەندە نەبێ گوتت، چیت دەوێ! گوتم قوربان ئەو نامەیەم بۆت هێناوە، دەمەوێ لەو کارە دامبمەزرێنی، تاکو بتوانم لە کۆلیجی قانوونی موستەنسرییە

دەوام بکەم. گوتت لە هیچ کۆلێجێکی تر وەرنەگیراوی، گوتم بەڵێ لە ئادابی زانکۆی بەغداد وەرگیراوم، گوتت کوڕم ئێمە پێویستمان بە مامۆستای زمانی کوردی هەیە، برۆ لەوێ دەوام بکە. گوتم قوربان من کوڕە هەژارم، دەمەوێ ببم بە پارێزەر، ئەو ڕچەیە بشکێنم کە هەر خەڵکی زەنگین لە قانوون بخوێنن. هیچ وەڵامت نەدامەوە، وەک دەرکردن گوتت بڕۆ دەرەوە. سامی ڕەنگی زۆر تێک چوو، هەر ئەوەندە وەڵامی دایەوە و گوتی: من کاری باشم کردووە، لەناو کارەکانم خراپیشم کردووە و یەکسەر ئەو شوێنەی بەجێهێشت. لێرەدا وریا سەعاتی و دارا، گوتیان کاکی برا ئەوە چیت کرد! تازە چاوەڕوانی هیچ شتێک مەکەن کە ئێمە لەگەڵتان هاوکاری بکەین! ئەوەبوو بەیانیش "سامی"مان نەدیتەوە و ئەو شوێنەمان بەجێهێشت، هاتینە لای برادەرانی حشع و بەرەو شنۆیە بەڕێکەوتین.

بەسەرکردنەوەی سەفەرێکمان بۆ ناوچەی مەریوانی کوردستانی رۆژهەڵات .. لێرەدا جێی خۆیەتی لەسەر ئەو "فازل"ە ی ئیتلاعات هەندێ قسە بکەم. فازل خۆی دەرچووی کۆلیجی ئەدەبیات بوو، دەستی شیعرنووسین و زەوقی مۆسیقی زۆری هەبوو، زۆر لەسەر خۆ، هێمن و دەم بە پێکەنین بوو، لەپاڵ کارەکەی خۆیدا، حەزی بە دۆستایەتی دەکرد، بەتایبەت لەگەڵ بەندە زۆر ڕاستی نواند، چونکە پسولەی ئاڵای شۆڕش (بەرگەی عبور) بەئیمزای من لە هەموو بازگەکانی ئێران بە خەڵک گیرابوو، من لەوە نەدەگەڕامەوە کە هەر کوردێک لە هەر شوێنێک کاری بە ئێمە بکەوتایە، بەتایبەتی کوردانی کوردستانی باشور لە هەموو حیزبەکان هەتا یەکێتی و غەیرە یەکێتی پسولەم بۆ دەکردن و ئیمزام دەکرد . کەچی فازل هەموو جارێ بە میهرەبانی ئاگاداری دەکردمەوە، هەر ئەویش لە کۆتاییەکەی هێمای ئەوەی دامێ، کە مادام ڕاپۆرتم نەنووسیوە بۆ ئیتلاعات لەسەر کۆنفرانسی سێی کۆمەڵە، ڕەنگبێ بگیرێم و بخرێمە بن لێکۆڵینەوە، بەتایبەت دوای ئەوەی یەکێک لەناو ئاڵای شۆڕش ڕاپۆرتی لەسەر نووسیبووم ، کە من جاسوسی (ک.ج.ب) م، تەنیا بەڵگەشی دۆستایەتی من بوو لەگەڵ حیزبی شیوعی. ئەو کاتە هەموو هاوڕێیانی ئاڵای شۆڕش لەبن جەمەلۆنەکانی زێوە کەوتبوون، لەنێوان پارتی و شیوعی دەبوو سواڵ بکەین. ئەگەر ئەو ئاگادارکردنەوە ناڕاستەوخۆیەی فازل نەبووایە، هەر لەوێ دەگیرام. دواییش هەر لە بازگەی نەغەدە گیرام، بەڵام بەڕێککەوت کوڕی خوالێخۆشبوو شێخ مەحەمەد خالید دەربازی کردم.

بە هاوکاری فازل، کە خۆی لەگەڵمان هاتە مەریوان، سەقز و سنە، کە بۆ ئەو موجازەفەیەکی گەورە بوو، لەو ڕێگایە بدات بۆ بەردانی ئەو پێشمەرگانەی ئاڵای شۆڕش، کە لە لایەن پاسدارەکانی قەرارگای ڕەمەزان لە پشتی مەریوان گیرابوون، لەسەر ئەوەی

لە بارەگاکەیان وێنەی "مارکس و لینین"یان هەڵواسیبوو. لە بیرمە، لە ڕێگای نێوان مەریوان و سەقزدا فازل پێی گوتین، ئەگەر تووشی پێشمەرگەی دیموکرات بووین، خۆم ڕزگارتان دەکەم، ئەگەر کۆمەڵەش بوون، دەبێ ئێوە من ڕزگار بکەن! مامۆستا سەلام لە ژیان ماوە، ئەو دەمە بەرپرسی پێوەندییەکانی ئالای شۆڕش بوو لە ورمێ، لەگەڵمان بوو و بەسەلامەتی گەیشتینە مەریوان. سەعات ١ی شەو چاومان بە بەرپرسی "قرارگای ڕەمەزان" کەوت، کە شوێنەکەی لەژێر زەمینێکەوە بوو، کابرا ناوی ئاغای کەریمی بوو، دەتگوت گوریلایە، لە بەرچاوی ئێمە هەر خەریکی نوێژکردن بوو، مامۆستا سەلام لەناو قسەکانی بە ئاغای کەریمی گوت، منیش باوکم (ئایات الله) بووە. ئاغای کەریمی ڕاستەوخۆ وەڵامی دایەوە گوتی ڕەنگبێ باوکت وابووبێ، بەڵام خۆت کافر و زەندیقەی، ئەگەر میوان نەبونایە، کوشتنتان حەڵاڵ بوو. بە سووربوونی ئێمە و هاوکاریی فازل، بڕیاری ئازادکردنی پێشمەرگەکانی دەرکرد، کە لە سەقز لە زیندانی پاسداران بوون. شەو سەعات ٤ بوو لە لای ئاغای کەریمی هاتینە دەرەوە، هیچ شوێنێکمان نەبوو بەو بەیانییە بۆی بچین، ناچار چووینە بارەگای پارتی لە مەریوان، بارەگاکەش تەنیا یەک دوو کەسی لێبوو، لە ترسی بۆردومانی عیراقی، کەس لە شارەکە نەمابوو، چەند سەعاتێک خۆمان لەوێ گرت، بۆ دەوری سەعات ٨ بەرەو سەقز گەڕاینەوە.

لە گەیشتنەوە سەقز، مامۆستا سەلام ڕەفیقێکی لەوێ خانووی هەبوو، بۆ ئێوارە وەعدمان لەگەڵ ئاغای فازل دانا لەبەردەم بارەگای پاسداران، هەتا ئەو کاتە خۆمان چووینە ئەو ماڵە و خەوتین. بۆ ئیوارە خۆمان کۆ کردەوە، لە شوێنی دیاریکراو ئاغای فازل چاوەڕوانی دەکردین، کە ئەو خۆی ماشێنی ئیتلاعاتی پێبوو. پاش هێنان و بردنێکی زۆر، دیتن و دانیشتن لەگەڵ بەرپرسەکانی ئەو شوێنە، پسولەی بەردانی پێشمەرگەکانی "ئاش"یان دەرکرد و گوتیان، بەیانی بڕۆن لە فلانە زیندان وەریانگرنەوە. لە ڕێگای گەڕانەوە بۆ ئەو ماڵە، بە ڕێککەوت لەگەڵ سابیر ڕەسول بەرانبەر یەکتری هاتین، پاش ماچ و موچی یەکتری، لەگەڵ مامۆستا سەلامیش بە یەکدیم ناساندن، بە پێکەنینەوە، گوتی: کەواتە ئاگام لە خۆم نییە، کەوتوومەتە کەمینی "ئاشەکان" لە شاری سەقزی خوارووی عیراقدا! بەبێ یەک و دوو، ئێمەی بردەوە ماڵەکەی خۆی، شەو هەتا درەنگانێ بەیەکەوەمان بەسەر برد، بۆ خەوتنیش ئیزنی نەداین، سابر زۆری مەبەست بوو من بگەڕێمەوە ناو یەکێتی، چەند جارێک پەیامی مام جەلالی پێگەیاندوم. _ لەگەڵ سەرەتای کردنەوەی بنکەی "ئاش" لە زێوەی مەرگەوەڕی کوردستانی ڕۆژهەلات، بیستمان کە پێشمەرگەیەکی بریندارى یەکێتی لە نەخۆشخانەکەی ورمێ دەستبەسەرە، جوابیان بۆ بەندە ناردبوو، کە

ئەو بریندارە خزمی منە، یەکسەر لەگەڵ سۆرانی دیان، خێرا گەیشتینە ئەوێ، دەبینم سابر لە بارودۆخێکی هێجگار ناخۆشی تەندروستییە، لەسەر قەرەوێڵەیەک زۆر بە کزوکۆڵی کەوتوە، هەموو گیانی برینە، تومەز کە بە برینداری بەسەر ڕێڕەوە هەڵواسراوەکەی سەفراوزەرون هێناویانە، بۆ بەختی سابر لە کۆتایی پەرینەوەکەدا، سیمەکە پساوە و لەسەر برینداربونەکەی خۆیشیەوە، بە گلۆربوونەوە کەوتووتە خوارەوە و مردنی بە چاوی خۆی دیتوە، بە کولەمەرگی رادەستی ئیتلاعاتی ئیرانییان کردبوو. ئەو دەمە پێوەندی یەکێتی لەگەڵ ئیرانییەکان باش نەبوو. ئەوانیش بە دەستبەسەریی، دەستاودەست گەیاندبوویانە نەخۆشخانە، هەر کە چاوی کردەوە و ئێمەی بینی، هەناسەیەکی قووڵ و پڕ مانای هەڵکێشا، کە بە چ چارەنووسەکی ناخۆش گەیشتووە. دوای هەندێ قسەوباس، لەسەر ئەوە رێککەوتین کە ئێمە لە ئیتلاعات وەریگرینەوە و بەرگەی بۆ بکەین، خۆی بەدوای موعالەجەکردنی خۆی دەکەوێ. ئەوەبوو یەکسەر سەردانی ئەو شوێنەمان کرد، زۆر بە ئاسانی بەرگەیان بۆکرد و لە نەخۆشخانەش تەسلیمی ئێمەیان کرد، چوین لە ئوتیلی رەزا ژوورێکی دوو قەرەوێڵەیی گرت، من شەوێک لە لای مامەوە، بۆ سبەینێ بردمە تەرمینال و بەرەو تەبریز بە رێکەوت. ئەوەبوو لەو سەفەرەمان بۆ سەقز سابیرم دیتەوە.ـ
بۆ بەیانی فازل خۆی لەگەڵمان هات و چووینە شوێنی مەبەست، هەر وەخت بوو خۆشمان بگرن، ئەگەر ئاغای فازل دووبارە فریامان نەکەوتایەوە. بۆ نیوەڕۆ پێشمەرگەکانی خۆمان لە زیندانێکدا وەرگرتنەوە، کە زۆر پیس و پۆخل بوون، لە بەردەم دەرگای وەرگرتنەوەی پێشمەرگەکان، لە پەنجەرەیەکەوە پێشمەرگەیەکی ڕیشداری دژوون، سەری دەرهێنا، کەوتە پاڕانەوە لێمان، بەڵکو هەوڵی بەردانی ئەویش بدەین. ئەوەبوو من لەگەڵ ئاغای فازل قسەم کرد کە مامۆستا سەلام هەر سەیری دەکردم، چونکە شوێنەکە زۆر جێی مەترسی بۆردومانی تۆپە قورسەکانی ڕژێمی عیراق بوو، هەر دەیگووت زووکە بابڕۆین! گوتم فازل ئەگەر ئەو پێشمەرگەیەش بەرنەدەی کە خاوەن ژن و منداڵە و پێشمەرگەی "حسک"ـە، ئەوە من لێرە ناڕۆم چونکە دووبەیانی جەژنە. ئاغای فازل ڕووی لە من کرد و گوتی، نابێ تۆ کوردبیت! چونکە ئەوان ڕۆژانە چەندان ڕاپۆرت لەسەر ئێوە دەنووسن کە ئێوە چین! کەچی تۆ هەوڵی بەردانی ئەندامی ئەوان دەدەیت.! گوتم من حەقم بەسەر کاری ئەوانەوە نییە. ئاغای فازل مەردانە بە هەر شێوەیەک بوو، ئەو پێشمەرگەشی ئازاد کرد. کابرا کە هاتە دەرەوە گەرەکی بوو بکەوێتە سەر دەست و پێمان، ڕاستمان کردەوە هەندێ پارمەتیشمان دا، کە خەڵک خێری بە خۆمان دەکرد، بۆ ئەوەی لەگەڵ پێشمەرگەکان بگەڕێتەوە بنکەکانیان. لەگەڵ فازل و سەلام بە سەلامەتی گەڕاینەوە، لە ڕێگا هەر خەریکی

شەرە شیعر و باسی ئەدەبیات بووین، کە مامۆستا سەلام لەو بارەوە لەمن تەڕدەستتر بوو، ئەو کاتە منیش چەنگە پرەی خۆم دەکرد.

هاوکاری جوامێرانەی فەرەنسۆ هەریری .. هەر بۆ نموونە زستانی ساڵی ١٩٨٦دا، بەفرێکی زۆری لێ هاتبوو، کۆمەڵێ پێشمەرگەی ئاڵای شۆڕش لە دەوروبەری "خرێنە"ی سەر سنووری سێگۆشەوە، بنکەیەکی کاتییان دانابوو، کە هێشتا لەشکری ئێرانی ئەو ناوەی نەکردبووە مۆڵگای یەکجارەکی سوپایەکەی. بوار بۆ هێزە کوردییەکانی کوردستانی باشور مابوو، هاوڕێیانی ئێمە کەوتبوونە ناو چاڵایی بەفرەوە، خانووەکەیان نقووم ببوو، دەستیان بە هیچ شوێنێک نەدەگەیشت. من ئەو ڕۆژانە لە شنۆ بووم، بەدوای شتێک دەگەڕام، تاکو ڕزگاریان بکەین کە هەر جۆرە هاتوچۆیەکی نەفەر و سەیارە بۆ ئەو ناوە نەمابوو، بە ڕێککەوت چوومە بارەگای پارتی لە شنۆ، سەرێکی "فرەنسۆ"م دا و مەسەلەکەم بۆ باس کرد، گوتی زۆر باش بوو هاتی ئەو خەبەرەت بۆ باس کردم. ئێستا پاش ٢ سەعاتی تر، دوو کۆپتەری ئێرانی بۆ ئەوێ هەڵدەفڕن، ئازوقە و خواردن بۆ ڕەبایەکانی خۆیان دەبەن، کە هەموو لەناو بەفر نقووم بووینە و چەندانیان ڕەقبوونەتەوە، وا چاکە بۆ ناردنی یەکێک لە هاوڕێیانتان، لەگەڵ پێشمەرگەکانی ئێمە بە یەکێک بە کۆپتەرەکان، خۆت بچی قسە لەگەڵ عبدالمهیمن بکەی کە ڕێکخستنی ئەو کارەی لەگەڵ ئێرانییەکان پێ سپێردراوە. ئێمە یەکسەر هاوڕێیەکمان ئامادە کرد کە وابزانم مام هێدی بوو، چووم قسەم لەگەڵ ناوبراو کرد، زۆر بە ساردی وەڵامی دامەوە و گوتی ئەوە پێوەندی بە ئێمەوە نییە، هەر جێگاش لە لای ئێمە نابێتەوە، بچۆ لەگەڵ ئێرانیەکان قسە بکە! زۆر بە دڵشکاوی هاتمە دەرەوە، چونکە دەمزانی ئێرانیەکان کەس لەگەڵ خۆیان هەڵناگرن، لە بەردەم بینایەکە هاتووچۆم دەکرد، لەو دەمەشدا بارزانی مەلا خالید کە لە لقی ٢ی پارتی لە خرێنە بوو، بروسکەیەکی بۆ فرەنسۆ کردبوو، کە برادەرانی (ئاڵای شۆڕش) هیچ ئازووقەیان نەماوە و هیچ پێشمەرگەیەکیش ئامادە نییە موجازەفە بکات و بچێ ڕێگایان بۆ بکاتەوە. فرەنسۆ بەدوای مندا دەگەڕا، لە ژوورەکەی عبدالمهیمن هاتەدەرەوە، لە گۆرەپانەکە منی دیت کە لە دەرەوە پیاسە دەکەم، بروسکەکەی بەدەستەوە بوو، هات و گوتی برادەرانتان هەموو ساغن، بەڵام ئازووقەیان نەماوە، لەگەڵ ئەو برادەرە چیت کردەوە!! لەو دەمەدا کۆپتەرەکان نیشتنەوە، پێشمەرگەکانی پارتی و ئازووقەکانیان دەبردە مەیدانی نیشتنەوەی کۆپتەرەکان. گوتم جەنابی ڕازی نییە و دەڵێ جێگامان نییە. لێرەدا فرەنسۆ خێرا هاتە دەست و گوتی: با وا بڵێ و کوا پێشمەرگەکەتان. گوتم ئەوەتا، گوتی، وەرە و لەگەڵ خۆی بردی بۆ لای کۆپتەرەکان، دیار بوو لەگەڵ عبدالمهیمن کەوتنە قسە،

فرەنسۆ بە پێشمەرگەکانی پارتی گوتبوو، لە بەشی لۆ، ئازووقە دەدەنە ئەو پێشمەرگەی ئالای شۆڕش و یارمەتی دەدەن بۆ ڕێگاکردنەوە، هەر ئێستاش بروسکە بۆ لۆ دەکەم کە فریایان بکەون. ئەوە بوو فەڕەنسۆ لەو تەنگەژەیە ڕزگاری کردین، گیانی ئەو پێشمەرگانەشی لە ڕەقبوونەوە دەرباز کرد.

قادر مستەفا و دکتۆر رشید و دەیان رۆڵەی دیکە، قوربانی بۆربۆڤینی حیزبایەتی پاشکەوتووی کاڵفامانەی قوتابخانەی سیاسەتچی کوردەوارین. هەردووکیان دوو ڕۆڵەی تێکۆشەر و دڵسۆزی بێ ئەملا و ئەو لای کوردایەتی بوون. قادر مستەفا وەک پێشمەرگەیەکی پارتیزانی سەرکەوتوو، کە لە خەباتی چەکداری نوێدا نموونەی کەم بوو، سەرباری نەخوێندەواری و لادێیی، لەگەڵ سەختییەکانی خەبات و پێشمەرگایەتی قاڵ ببوەوە، لە ناوچەکانی هەولێر بەتایبەت دەوروبەری زنجیرە گردۆلکەکانی دێدەوان و بەستی شەرغە و ئەو بەر و ئەم بەری چیای باواجی و دەوروبەری تەق تەق و ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوای کۆیە و ناوچەی خۆشناوەتی شارەزایەکی بێوێنە بوو. لە هەموو گوندێک دۆست و ناسیاوی لەگەڵ خەڵک زۆر گەرموگوڕ بوو، باوەڕێکی بەتینی بەخۆی هەبوو.

دکتۆر رشیدیش لە مەیدانی ئازایەتی و دەستپێشکەری چاونەترس و بوێر بوو. مرۆڤێکی قسە خۆش و هەمیشە رووگەش و دەم بە پێکەنین، جورئەتێکی شۆڕشگێڕانەی بەتینی هەبوو، پیاوی ڕۆژی تەنگانە و لێقەومان بوو، زۆر سەر ڕاست و جوامێر بوو، جارێکیان بەبیرمە لەگەڵ قادر عەزیزی هاوڕێی تووشی قڕە هاتبوون و بنکەکەی خۆی جیا کردبوەوە و چووبووە لێواری شێوێک، لە بناری چیای کۆریس و هەندێ کەپری دروست کردبوو. نێوانی لەگەڵ هاوڕێیانی ئالای شۆڕش زۆر خۆش بوو، حەزی دەکرد تێکەڵی یەکتر ببین، بەلام خۆ بە گەورە زانینی هەندێ لە مەسئولەکانی، ئەو خەونەیان لێ تاڵ کرد.

بیستبووم تازە چەند خوشکێکی هاتبوونە سەردانی، لە لای ئێمە شەو قادر و زرار جۆلای خاوەن نوکتەی خۆشی ڕەواندوزیان، هەواڵیان نارد کە هاوسەرەکەم لەسەر ئاوی زێ چاوەڕوانە. منیش بەڕێککەوت بە بێئەوەی ئەوان پێی بزانن، دەمزانی و خەبەرم هەبوو کە نەجیبەخانی هاوسەرم دوو بەیانی دەگات. ئەوان بە ڕێککەوت ڕۆژێک پێشکەوتبوون، منیش خۆم لە قەرە نەبرد و بۆبەیانییەکەی، ئەو ئەسپەمان هێنا، کە ناومان لێ نابوو "هۆبزەندان"، زینمانکرد و پێمگوتن بەبەردەمی بارەگای ئەوان بڕۆن و بڵێن ئەوە دەچین ژنەکەی حاجی مەمۆ دەهێنین! خۆشم یاغر یاغر چوومە ئەوێ، لەدوورەوە زرار بە پێکەنین گوتی، ئەو هاوڕێیانە بگێڕەوە و ئەمڕۆ یەکی گولانە، پێکەنین و بەزم خۆش بوو. منیش پێم گوتن وەلاهی بۆنم کردووە و کابرام تازە نانیشێتەوە! دەبێ ژنێکم بۆ پەیدا

بکەن. ئەوەبوو فرسەتم هێنا و زرارم لەگەڵ خۆ بردە لای دکتور رشید و ئەوان و هەموو ڕووداوەکەم بۆ گێرانەوە و بەخێرهاتنی خوشکەکانیم کردن و دکتور ڕشید زۆر مەردانە گوتی، کاکە سەرپشک بە کامەیانت لە خوشکەکانم دەوێ، ئەگەر خۆی ڕازی بێت، پێشکەشت بێت، منیش دوای سوپاس پێم گوت، بابە سبەینێ ژنەکەم دەگات و لە جیاتی ئەوە، وەرە لەگەڵمان بچین لەگەڵ قادر عەزیز ئاشت بنەوە. ئەویش یەکسەر هەستایەوە سەرپێیان، چووینە ئەوێ و دەستیان لە ملی یەکتری کرد و ئێمەش بۆ بەیانی نیوەڕۆکەی پاش گەیشتنی نەجیبەخان، کە کۆمەڵێ خواردنی شاری هێنابوو، دکتۆ رشید و قادر عەزیز و زرار جولا و د. سەردارمان دەعوەت کرد.

لێردا دەبێ بە یادی ئەو ڕۆژانەی لە شار بە نهێنی دەژیام، چەند شەوێک بوو لە ماڵی کاکلە ڕەش لەسەر جادەی کوران لە شوقەیەک بووین، بە نهێنی لە شار بوم، ڕۆژێکیان بەنیازی دەرچوون بووم، ئەو برادەرە، کە فەرهادە شەل بوو نەهات بەشوێنم، بەڕۆژ سەیرمان کرد ماڵی کاکل میوانێکیان هاتووە، کە بەندەی دەناسی و دۆستی یەکێتی بوو، ناچار خۆم لە سەربانەکە حەشاردا. میوانەکە ڕۆیشت و خوشکێکی تەمەن بچووکی ئەو کاتەی کەژاڵ خانی خێزانی کاکل، هەر لەخۆیەوە هاتە سەربانەکە و دەرگای بەیتونەکەی کردەوە، منی لەبەر سێبەرەکە دیت، زەلامێک بەکراس و بانتۆڵێکەوە و قژی لوس تراشاوە و سەر و کەلەیەکی زلی پێوەیە، ڕاست لە قیژەی دا و بورایەوە. ئەوان ئەوەی لە خوارەوە بوو، کەژاڵ خان و کاکل و نازانم کێی تر بوون، بەڕاکردن هاتنە سەربان و کچەیان پەلکێشی خوارەوە کرد و بۆ نەخۆشخانەیان برد. منیش زانیم دەبێ ئێرە بە جێ بهێڵم، نەوەک ئەو کچە بێتەوە هۆش خۆی و بوونی من بدرکێنێ. چەندی کاکل هەوڵی دا، خۆم بەتەنیا و تەنیا دەمانچەیەکم پێبوو، هاتمە سەرجادە و بە تاکسییەک چوومە گەڕەکێکی دیکە و شەو لە ماڵی دۆستێک تەلەفۆنم بۆ حەیدر سوێری کرد، هات و منی بردەوە ماڵی خەزورم.

**دوا وشەی بەشی یەکەمی زنجیرەی یادەوەرییەکانم..**

لەپێشەوە سەری ڕێز بۆ هاوڕێ شەهیدەکانم دادەنوێنم.
بەپێویستی دەزانم لە کۆتایی ئەو بەشەدا، ئەو قسانەش لە خزمەت ئێوەدا بکەم:
_ لە بەرابیەوە ناتوانم قەرزارباری خۆم بۆ وڵاتی سوید و میللەتی بەخشندەی سویدی پشتگوێ بخەم، چونکە من بۆ لاوچاکی بەدەنگەوەهاتنی ئەوان و لەباوەشگرتنی بابایەکی برینداری کەلاکەوتووی بێخێروبیر (بۆ ئەو وڵات وخەڵکە بەویژدان وسەربڵندە) لەوەرگرتنم وەک پەناهەندە، کە لە ساڵی ١٩٨٩ لە شاری قونیای تورکیا بەدەم برینەکانی سەر و پشتم دەتلامەوە و ئەوجا چارەسەرکردنی بەرنامەئامێزی پشودرێژانەی گرانبەها، کە هەرچەتی تەمەن و بەشی هەرەزۆری شەنگوتاقەتی خۆم بۆ خەڵکێکی دیکە و خاکێکی ترەوە بەرێکردبوو. بەڵێ لە سایەی میهرەبانی ئەوخەڵک و وڵاتە بەهەشت ئاساییە، وەک مرۆڤێکی ئاسایی کەوتمەوە سەرپێیان. هەرگیز لەبەر چاکە و جوامێریان دەرناچم. ئەوەندەی بە خۆم و بەتایبەت هاوسەرە بێناز و منداڵەکانم ئاومان لە دوو بێرێ بێت لە خزمەتکردن بەو وڵات و خەڵکی سوید درێخی ناکەین. بەندە نزیکەی دە ساڵان لەتەک ژنەکەمەوە بۆ بەخێوکردنی سەربەرزانەی زارۆکەکانمان لەوڵاتی سوید کارم کردوە، هەر لەمامۆستایەتی زمانی کوردی و کارمەندی کتێبخانە و کرێکاری چاپەمەنی وشۆرنینگ (کەلوپەڵ دابەشکردن بەسەر کۆمەڵێک شۆسک و دوکان) هەتا دەگاتە ئەوەی کەنزیکەی سێ ساڵ زیاتر کرێکاری رۆژنامەدابەشکردنی سەعات ٢ هەتا ٦ ی شەوم کردووە و پێی سەربەزم. هیوادارم لە نموونەی سوید زۆر و بێوەستان بێت.
_ ئەوجا نازانم بە چ زمان و پەیڤێک بۆ (نەجیبەخان)ی هاوسەری بە وەفا و دڵسۆز، منداڵە شیرینەکانم چیا، ڕێگا، چرا، گۆنا، لارا بدوێم و لە پشتگیری و بەتەنگەوەهاتنم، دەرفەتیان بۆ رەخساندم لەوەی بەئارەزووی خۆم جرتوفرتی ئێرە (کوردستانی باشوور بەتایبەتی) و ئەوێ بکەم، لە پشتیوانی و هاوکارییان تێربم. بە دڵنیایی ئەگەر ئەوانە لە سێبەر و پەنای سوید کۆمەکیان نەکردبام، هەرگیز من ئەوکەسە نەدەبوم و ئەو بەرهەمە نەدەکەوتە بەرچاوان. پڕ بەدڵ هیوای سەرکەوتن و خۆشگوزەرانی و وەفاداری و بەردەوامی هەستی مرۆڤدۆستی و خۆشەویستی وڵاتی کوردستان و سوید و ئەوخەڵکەیان بۆ بەئومێد دەبینم.
_ سوپاسی برایان؛ پشکۆ نەجمەدین، فوئاد قەرەداخی، کەریم کاکە، عەزیزی مەلای رەش، دارای مەلا غەفور، شەماڵ (زرار)، ئەحمەد حەمەدەمین (مامۆستای زانکۆ)، جەلال بەرزنجی، پرۆفیسۆر سەباح عەبدوڵڵا صالح (مامۆستای زانکۆ لەئەمریکا)، تەها باراوی،

